


ناوەندی ئاوێر بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
ژمارەی بڵاوکراوە: ٣٥١

**مرۆڤ و دەورو بەر**

**مەسعوود محەمەد**

بەرگ: ئاکار جەلیل کاکەوەیس
شوێنی چاپ: چاپخانەی رۆژهەڵات/هەولێر
تیراژ : (١٠٠٠) دانە
نرخ: (١٢٠٠٠) دینار
لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان/هەرێمی کوردستان
ژمارەی سپاردنی (٤٤٨) ی ساڵی ٢٠١٦ی پێدراوە

ناوەندی ئاوێر
بۆچاپ و بڵاوکردنەوە
ناونیشان:هەولێر-پشت پاریزگا-بەرانبەر دەرگای قەڵات

ژمارەی مۆبایل: 07504209495 07504242101

ئیمەیل Nawendi.awer@yahoo.com
فەیس بووک www.facebook.com/nawendi.Awer

«کۆڕی زانیاری کورد»

«مرۆڤ و دەوروبەر» - بەشی یەکەم

ئەندامی کارا: مەسعوود محەمەد

چاپخانەی «کۆڕی زانیاری کورد»، بەغدا ١٩٧٧

هەزار و پێنجسەد دانە لەم کتێبە لەچاپ دراوە.

دەست پێکردنی لەچاپ دان 05-11-1977.

مێژووی لێبوونەوە لە چاپ 14-01-1978.

لە کتێبخانەی نیشتیمانییدا ژمارە 1397ی ساڵی 1977ی دراوەتێ.

نرخی ٢٥٠ فلسە.

من مطبوعات «المجمع العلمي الكردي»

«الإنسان وما حوله». القسم الأول.

العضو العامل: مسعود محمد. مطبعة «المجمع العلمي الكردي» 1977.

«...»

لە بەرگی یەکەمی کتێبی *«حاجی قادری کۆیی»* کاتێک خەریکی توێژینەوە لە بارەی چەندوچۆنی گوێزانەوەی حاجی لە ژیانی لادێوە بۆ شارستان بووم، سەرنجی خۆم و خوێنەرم بۆ ئەو ڕاستییە ڕاکێشا کە لە دیوانی حاجی لەچاو دیوانی نالی دیاردەی گوڵ و گیا و دەشتودەری کەم ڕەنگە، هەر دەڵێی حاجی لە زووییێکەوە ژیانی دەشتودەری بەجێ هێشتبێت و مەودای چەسپانی وێنەی ئەو ژیانەی لە دڵ و بیر و فکری خۆیدا دەست نەکەوتبێت، بۆیەیە لە شیعری حاجی قادر هەر بایی دەنگدانەوەی گوڵ و گیا لە شیعری شاعیرێکی شارستاندا گوێبیستی ئەو دەنگە دەبین بە پێچەوانەی حاڵەتی دیاردەی گوڵ و گیا و دەشتودەر لە شیعری نالیدا کەوا هەتا بڵێی دیاردەیێکی دەوڵەمەند و بەبنج و ڕەسەنە، لەوە دەوەشێتەوە نالی سەرلەبەری ژیانی ساوایی و منداڵی خۆی لە نێوان گوڵ و گیا و ئاژەڵی دەشتودەردا ڕابواردبێت.

وەک دەبینیت، ئەم بەیەکدی گرتنەی دیوانی حاجی و نالی بایەخێکی زۆری داوە بە کارتێکردنی دەوروبەر لە دەروون و خەیاڵی شاعیر: لە ڕواڵەتدا وا ڕادەگەیەنێت کە شاعیر (یاخود مرۆڤ بە تێکڕایی) بەندەیێکی ملکەچە بۆ دەوروبەری ماددی، ئەو گوتەیەش بەڕاست دەگێڕێ کە دەڵێ شاعیر و ئەدەیب و هونەرمەند «ئاوێنەی واقیع»ن. لێرەدا پێوستم زانی دەستی «ڤیتۆ»ی بیروباوەڕی خۆم لە ئاست ئەم بۆچوونە هەڵبرم چونکە لە ڕاستیدا بۆچوونەکە بەشێکی یەکجار گەورەی کاریگەرایەتیی ئادەمیزادی هەستیاری خاوەن ئیرادە و هۆش و صەدان تایبەتی سەربە مرۆڤایەتی دەداتەوە بە ماددەی سارد و سڕی مردوو.

من کە دەڵێم دەستی ڤیتۆ هەڵدەبرم، بە ڕواڵەت نارەزامەندی بەرانبەر گوتەی خۆم دەردەبڕم چونکە بۆچوونەکە هی خۆم بوو، بە یەکدی گرتنەکەش هەروەها: بەڵام لە واقیعدا ڤیتۆکە بەر خۆم ناکەوێت چونکە هەر ئێستاکە لەو ڕووپەڕانەی لێرە بە دواوە دەیانخوێنیتەوە ئەم ڕاستییەت بۆ ڕوون دەبێتەوە؛ ئەوەی ڤیتۆی بەردەکەوێت بەرەیێکی فرەوانی خاوەن لێکدانەوە و شی کردنەوەی ماددین کە هەر لەوانەوە و بیر کردنەوەیانەوە بە خێرایی گومانی کزکردنەوەی «دەوری مرۆڤ» لەو تەرزە

بەیەکدی گرتنەی دیوانی حاجی و نالی دەکرێ، چونکە دەمێکە بە هۆی کەڵەکە کردنی ئەو بیروباوەڕەی دەوروبەر بەسەر مرۆڤدا زاڵ دەکات زیهنی خەڵق ئامادە بوە بۆ ئەوەی هەموو جۆرە شی کردنەوەیەکی ماددی بداتەوە پاڵ بێدەسەڵاتی مرۆڤ و زاڵبوونی ماددە.

من لەگەڵ ئەوەدا کە هیچ لاریم نییە لە گرنگی و بایەخی ماددە و دەوروبەر و هەڵکەوت و ڕووداو... هتاد لە ژیانی مرۆڤ و بەرەوپێشچوونی کۆمەڵایەتی و بزووتنەوەی مێژوو و هەموو ئەو لایەنانەی پێوەندییان بە مرۆڤەوە هەیە، دەمەوێ لە هەمان کاتدا بڕوای بێسنوور و لەحەدبەدەر بە «ماددە» و کاریگەریەتی ماددە نەکێشێتەوە سەر دزینەوەی کاریگەرایەتی و خالقیەتی «مرۆڤ» بۆ ماددە کە دەزانین مرۆڤ سەرەڕای ماددەبوونی لەش و ئەندامەکانی، گیان و هۆش و ئیرادەشی هەیە کە ئەمانە لە ماددەی مردوو دەوروبەری شەختەکردوودا پەیدا نین، ئەمەش ڕاستییکی هێندە سەرەتایی و بنجییە لە خوێندنەوەی دەفتەری کۆمەڵایەتیدا، ئەگەر تێنەخوێندرێتەوە وەک ئەوە دەبێ کە بێ فێربوونی ئەلفوبێ بمانەوێ فێری خوێندنەوە ببین. من کەیفم بە ماددە دێت خزمەتکاری مرۆڤ بێت؛ هەرچەند نەشمەوێ ئەم مەیلەم لە خۆڕایی و بێ وردبوونەوە و هەڵسەنگاندن خزمەتکاری ماددە و ئاغایەتی مرۆڤ بکات بە دەستووری کۆمەڵایەتی و مێژوو، هەرگیز ڕێ بە خۆم نادەم لە کەسیش ناسەلمێنم نەخشەکێشانی کۆمەڵایەتی و مێژوو لە ڕێی بیرکردنەوەی ماددییەوە بەشێوەیەک بێ ڕاستییان سەرەوبن بکات. دیاریشە گەورەترین سەرەوبن کردن لەم مەیدانەدا کڕنووبردنە بە مرۆڤ زیندووی هەستیاری خاوەن ئیرادە بۆ بەر ماددەی ڕەق و تەق.

من لەم باسەدا سەیرم بەوە دێتەوە کە دەبینم ئەو خاوەن بیروڕایانەی مرۆڤ بۆ ماددە نزم دەکەنەوە بە خۆیان دەڵێن مرۆڤدۆست و ڕابەر و شۆڕشگێر. واشدەزانن داڕنینی بەرگی خالقیەت و داهێنەرایەتی و کاریگەرایەتی لە مرۆڤ و بەخشینی ئەو بەرگە بە ماددەی مردوو پتەوترکردنی بناخەی فەلسەفەی ماتیریالیستە کە هەر بەلای خودی خۆیانەوە بنەمای خێر و خۆشی و بەرەوپێشچوونی مرۆڤە.

بەڕاستی ئەم تەرزە تیفکرینە وەک ئەوەیە کەیفمان بە بێهێزی چاوی مرۆڤ بێت بۆ خاتری بەرزبوونەوەی نرخی عەینەگ. دەزانم ئەو خاوەن بیرانەی کە هێزی

فەلسەفەی ماددی لە زاڵبوونی تەئسیری ماددە بەسەر مرۆڤدا دەبینن ناتوانن و ناشوێرن، بگرە بە خەیاڵیشیاندا نایەت عەینەگ و چاوی مرۆڤ بخەنە دووتای تەرازووی نرخاندن و بایەخ پێدانەوە، چونکە دیارە لەم حاڵەتەدا بەیەکتر گرتنەکە و هەڵسەنگاندنەکە هێند ناقۆڵا و کاڵ و کرچە بە هیچ زرە تەئویلێکیش ناچێتەوە سەر حیسابی مرۆڤدۆستی و ڕابەرایەتی و شۆڕشگێڕایەتی، بەڵام ئەوانیش لە خۆیانەوە نەسەلمێنن، دەقی تیۆریەکەیان و ڕاگەیاندنەکان و ئەنجامە فکرییەکانی ئەو تیۆرییە بەناچاری دەمانبەنەوە بۆ لای زاڵ کردنی عەینەگ بەسەر چاودا، دان نەهێنانی خاوەن تیۆریەکانیش بەو ئەنجامە ناقۆڵایە هەڵاتنێکیی کۆڵدەرانە، بگرە ترسنۆکانەیە، لە ئاکامی ئەو پێشەکیانەی ئەوان بە سەرچاوەی گەش و پڕ تەوژمی تیۆریەکەیانی دادەنێن: بیروباوەڕ و فەلسەفەیێک کە لە سەرەتای ڕسکان و شیرازەهۆنبوونیەوە پرشنگی بەڵێنەکانی ڕابەرایەتیی خۆی بەرەو ڕووکارێک دەهاوێژێت و مژدەی چاکە و ڕاستیی ئەو ڕووکارەمان پێ دەدات، لێی ناسەلمێندرێت هەر جارە بە بەهانەیەک چاومان لە نەهاتنەدیی ئەو بەڵێنانەی بنووسێنێت یاخود خۆی بدزێتەوە لە ئاکامی ئەو پێشەکییە فکرییانەی هەڵی نابوون بۆ دەرخستنی ڕاستی و نهێنی شتان.

ئێمە لە مەیدانی فکر و فەلسەفەدا ئەو بەردەدامەیە نین کە دامەزانان بە پێی فەندی یارییەکە جێگۆڕکێی پێ دەکەن بەردەکەش هەست بە خۆی و بە جێگۆڕکێیەکە ناکات. ئێمە مرۆڤین لە بیرمانە چیمان پێ گوتراوە، دواتریش کە لێمان داوا کرا مێشکی خۆمان داخەین لە ئاکامی چاوەڕوانکراوی ئەوەی گوتراوە دەبێ توند دەست لە هۆش و زانین و بیرکردنەوەمان گیر بکەین و ڕێ نەدەین لێمانی بدزنەوە. هەروەها کە شتێک ڕوویدا دژی ئەو بەڵێنانەی پێمان ڕاگەیێندرابوو دەبێ لێی بپرسینەوە و نەشهێڵین بەچاوبەستەکێ و بەرگ تێهەڵکێشان زەرد و سوور و ڕەش و سپیمان لێ تێکەڵ بکەن و نوختەی ڕەخنەکەمان بە فەندی زارقەڵەباڵغی تێببەن.

برنارد شۆ لە ئامۆژگارییێکدا بە قوتابیی زانکۆکانی بەریتانیای گوت، ئاگاداری خۆیان بن لەوەدا مامۆستاکانیان ئەقڵیان لێ بستێنن و چی دەیانەوێ پێیان بسەلمێنن. ئێمەش ئەگەر بتوانین وەیا بوێرین دەست لە هۆشی خۆمان گیر بکەین لە بەشێکی زۆری ئەو فڕوفێڵەی لێمان دەکرێت ڕزگار دەبین، زۆر کەسیش لەوانەی

بە هۆی گاڵتە بە هۆشی خەڵق کردن دەبنە ڕابەری پەنجەنیشان وەک ئەو شێخەیان لێ بەسەر دێت کەوا کەرامەتەکانی بە درۆ دەخرێنەوە. هەروەک کە شێخێکی تەریقەت خەبەری ڕابوونی قیامەتی لە ماوەیێکی نزیکدا بە خەڵق ڕاگەیاند و قیامەتیش دانەهات دەبێ لە شێخایەتی بخرێت و تەئویل و بەهانەی لەو زرەدرۆیەدا لێ نەسەلمێندرێت هەروەهاش کە خاوەن بیروباوەڕێکی فەلسەفی دەوری «ماددە»ی زاڵ کرد بەسەر دەوری «مرۆڤ»دا و دواتر ویستی لە ئەنجامە ناقۆڵاکانی ئەو ڕایەی هەڵێت دەبێ توند یەخەی بگیرێت و ڕووبەڕووی ئەو ئەنجامە ناقۆڵایانە بکرێت و لەسەر خۆی و بیروباوەڕەکەی حیساب بکرێت. من و تۆ و خەڵقی تریش لە بەندی قسە قەڵەوەکان و عەوام خەڵەتێنەکانی ڕەها ببین.

هەڵبەت خۆ دانووساندنمان لەوەی خاوەن فەلسەفەکان دەیڵێن هەر لەو مەیدانە بەرتەسکەی «پێشەکیی و ئەنجام»ی نەزەریەکانیان کاریگەر نابێت. بەڵکوو لە هەموو مەیدانەکانی کۆمەڵایەتی و بەرەوپێشچوون و خەبات و هونەر و ئەدەب و زانست و... هتاد نەک هەر کاریگەر بگرە لە پێویستیش پێویستترە چونکە من و تۆ و ئەوانەی پێڕەوی فەرمانی غەیر دەکەین بەڵگەی مرۆڤایەتی و ڕێز لەخۆنان و بەخۆ نازینمان لەو هەڵوەستانەدایە کە تێیدا ئازاد و ئازاین و بایی ڕازیبوون و ڕازینەبوون ئیرادەمان دەپارێزین. من هەروەک نارەحەتم لەوەدا کە دەبینم ملیۆنانی خەڵق دەستبەستراو و بێئیرادەن لە ئاست ئەو مۆدێلە جلکانەی کە مۆدەسازان بەسەر زەوق و باخەڵیاندا دەیانسەپێنن و وەک بووکەشووشە پەڕۆیان تێدەئاڵێنن، وەها و پتریش نارەحەت دەبم کە دەبینم ئاپۆرەی ڕۆشنبیران و شۆڕشگێران و خەباتکەران و ئەدیبان و هونەرەکاران بەدەست خاوەن فەلسەفانەوە وەک قورەچەورە (طین صناعي)یان لێ دێت و هەر ساتە بە پێی ئاوازگۆڕی ئەو فەلسەفانە ئەوانیش کورتتر و درێژتر و پانتر و باریکتر و سوورتر و سپیتر و «هەموو شت»تر دەبنەوە و لە بارێکەوە بۆ بارێکی تر ناناسرێنەوە. من هەرگیز پێت ناڵێم قەناعەت بە هیچ کەس و هیچ شتێک مەهێنە، من دەڵێم حورمەتی «قەناعەت»ت بگرە بەوەدا کە هەڵمەت ببەیتە سەر ئەو چەوت و چوێڕییەی لەو فەلسەفەیەدا دەیدۆزیتەوە کە کردووتە بە نێرتکی قەناعەتت... من دەڵێم مەبە دەروێشی فەلسەفەی ئاخەلێوەی صەدەی بیستەم. هەر ئەم زێدە پەرۆشەم بۆ

قودسیەتی بیروباوەڕی ئازاد بوو گێڕامیەوە سەر لێکدانەوەکەی خۆم تاکوو گومانی کز کردنەوەی دەوری خالقیەت و خوازی مرۆڤی لێ بتەکێنمەوە.

ئەم تێبینییەی ترسی «کز کردنەوەی دەوری مرۆڤ» لەو بەیەکدی گرتنەی دیوانی حاجی و نالی یەکسەر قەڵەمی پێ هەڵەنگاوتم لە باسی حاجی و بایدامەوە لای ڕوون کردنەوەی ڕاستی مەسەلەی کار تێکردن و کار تێکرانی نێوانی مرۆڤ و مادده بەو جۆرەی کە خۆم باوەڕی پێ دەکەم. کاتێک لەو ڕوون کردنەوەیە بوومەوە دیتم دەوری 80 لاپەڕەیێکی گرتۆتەوە، لەبەر ئەمە ناچار بووم لە باسەکەی حاجی قادری دەربهاوێژم، بەڵام هەر لە کتێبەکەی *«حاجی قادری کۆیی»* و لەژێر ناونیشانی «لاباسێکی گرنگ» لە لاپەڕە 156ەوە بە چەند لاپەڕەیێک چۆنیەتی مەسەلەکەم باس کرد و نموونەیێکی نووسینەکەشم خستە بەرچاوی خوێنەرانەوە، لە کۆتاییشدا بەڵێنم دا زووبەزوو نووسینەکە بڵاو بکەمەوە بە مەرجێک «هیچ بەرهەڵستێکی لە خۆم بەهێزتر نەیێ و دەستم بگرێ».

نووسینەکە هی سەرەتاکانی 1972 ـە بەڵام بەرگی یەکەمی کتێبەکەی *«حاجی قادری کۆیی»* لەبەر نەبوونی دەرفەتی لەچاپدانی وەخرا تاکوو لە ڕۆژی 1973\11\29 بە بۆنەی هەڵگرتنی پەردە لەسەر پەیکەری حاجی لە کۆیێ بڵاو کرایەوە. ئەوەی «لاباسێکی گرنگ» یش ئیشارەی بۆ کرد مایەوە تا ئیمرۆ، ڕێی بڵاوبوونەوەی بەرنەکەوتوە، ئێستاکەش کە بڵاو دەبێتەوە نۆرەبڕی لە بەرگی چوارەمی کتێبی *«حاجی قادری کۆیی»* دەکات.

دەبێ بڵێم بەو دواییە کە هاتمە سەر پاکنووس کردن و ئامادە کردنی باسەکە بۆ لەچاپدان، بەپێی داخوازی ڕوون کردنەوەی بابەتی لێکدانەوە، ڕووداو و بەسەرهات و وردە لێکۆڵینەوەی تازەشی تێکەوتوە، ناوناوە بیروباوەڕی دیکەشم تێچنین کردوە کە هەر هی خۆم بوون بەڵام ڕێکەوت دەرفەتی دەربڕینیانی نەدابوومێ. ئەم هۆیانە وایان کرد نووسینەکە لەبەر یەک بکشێتەوە و گەلێک پتر لە 80 لاپەڕە پڕ بکاتەوە هەرچەند بەشێکی کەمی لێکدانەوە و بڕوا و بیروڕا و فکری خۆمم لە مەیدانی گوریسکێشەکێی «مادده و مرۆڤ - سرووشت و هۆش» خستۆتە نێو ئامێزی ئەو لاپەڕانەوە.

وا باش دەزانم بۆ پتر ڕوون کردنەوەی سەرچاوەی ئەو بابەتەی کەوتە ژێر عینوانی «لاباسێکی گرنگ» چەند لاپەڕەیێکی بەرگی یەکەمی کتێبی *«حاجی قادری کۆیی»* کە پێوەندی بە کردنەوەی دەرگەی ئەو لاباسەوە ■ هەیە لێرەدا بنووسمەوە ■ ئەوجار یەکسەر لاباسەکەی بە دوادا بنووسم.

لە پاش لێکۆڵینەوە لە جێگە و ساڵی هاتنە دنیای حاجی قادر دێمە سەر لێکدانەوەیێکی یەکجار تایبەتی خۆم بە دەوری لێکۆڵینەکەوە. ئەو لێکدانەوەیە لە سەرەتاکانی لاپەڕە 149 ی کتێبەکەوە دەست پێدەکات بەم شێوەیەی وا لێرەدا بۆ خوێنەری دەنووسمەوە:

*«ئەمانەی خستمنە بەرچاوی خوێنەر سەرجوملەی گوتە و بیروڕای جیاجیایە دەربارەی ساڵ و جێگەی لەدایکبوون و کاتی هاتنی حاجی قادر بۆ کۆیێ. قسەیێکی تایبەتی خۆم ماوە، وەک تێبینی، لە بارەی ئەو ساڵەی هاتنی حاجی بۆ کۆیێ، لە پێشتر ئیشارەم بۆ کرد و ناوم نا بەڵگەی زیهنی. قسەکەم لە بنەڕەتدا لەسەر تەواتور هەڵ دەستێ بەڵام بەڵگەکەی زیهنی، وەک داروەکاز، باڵای لەرزۆکی ئەم قسەیەم ڕاست ڕادەگرێ: دیمەنێکی کەمڕەنگی سپیپات وەک زرەخەون یاخود وڕێنەی تادار کە هەیە و نییە... دەدیترێ و نادیترێ، لە بەراورد کردنی دیوانەکەی حاجی لەگەڵ هی نالیدا دێتە پێش چاوێکی تارمایی بین وە یا هەستی زامی کول. دیمەنەکە ئەمەیە:*

*وەک بڵێی نالی لە سەرەتای عومریەوە تا ماوەیەکی ئەوتۆ فرچکی گرتبێ بە «لادێیی» هەر لە شارەزوور و «خاک و خۆڵ» و دەشتودەر بوە و لە دەستووراتی فەلاحەتدا قاڵ بۆتەوە ■ و کەینوبەینی شۆبڕین و وەردانەوە و تۆ کردن و دروێنە و خەرماندانان و هەڵگرتن و هەموو کاروبارێکی کشتوکاڵی لێ بوە ■ بە «سروشتی مکتسب» و ناوی گژ و گیا و گوڵ گوڵاڵەی بۆ بوە بە فەرهەنگی سەرەتایی گروگاڵی منداڵەتی، وێنەی ژیان و ئەحواڵ و ڕوخساری دەر و دەشت لە ڕووپەڕەی زیهن و هەستی بوە بە نەقشی هەڵکەندراو. دەبێ بۆیە بێ، لە زۆر شوێنی دیوانەکەیدا چاندن و دانەوێڵە و وەرد و شۆ و ئاژەڵ و گوڵ و گیا وا دەبریقێنەوە ■ هەر دەڵێی تریفەی مرواری و گەوهەرە کە لە ڕشتەیێکدا وەستاییکی شارەزا و پسپۆڕ هۆندبێتیەوە. وتووێژی نالی*

*لەگەڵ دەشتودەر و گیا و گوڵ و ئاژەڵدا لە هی مرۆڤێکی لادێی ئازمووده دەکا نەک بونیژێکی خەیاڵباز. لەگەڵ مندا سرنج بدە دەوری «چەڵتووک» لەو دوو بەیتە:*

*بەحری غەزەلم پڕ لە دوڕ و گەوهەرە ئەمما*
*غەوواسی دەوێ یەعنی بە تەعمیقی بزانە*

*پڕدانەیە ئەمما نەوەکوو دانەیی چەڵتووک*
*بەحرم گوتوە نەک وەکوو گۆلی مەرەزانە*

*...»*

[لێرە بەدواوە هەموو لاپەڕەکانی 151، 152، 153 نموونەی ئەوتۆ لە شیعری نالی نیشان دەدەن کە زۆر لە نزیکەوە خەریکی ژیانی دەشتودەر و وەسفی گوڵ و گیا و ئاژەڵە تاکوو لە دێڕی کۆتایی لاپەڕە 153 لێکدانەوەکە دەست پێدەکاتەوە بەم شێوەیەی خوارەوە].

*«لەو شیعرانە و گەلێ شوێنی دیکەدا نالی کە ناوی گوڵ و دار و درەخت دێنێ ئەو شاعیرە نییە لە قامووس و کتێبان ناوی دیتوون یا لە خەڵقی گوێبیستیان بوە... نەخێر کابرایێکی دەشتەکی ئەوتۆیە سەدان جار دەستەی لێ بەستوون و لەسەریان نووستوە و ئەمدیو و ئەودیوی کردوون. بە ئاسانی نایەتە مێشکی بونیژەوە تەشبیهی زمان بکا بە «سووسنی تەڕ و پاراو» یاخود دوو چاوی خێلێک، یەکیان بە «نەشکوفتە وەنەوشە» و ئەوی دییان بە «نەیلووفەڕ» دابنێ، یاخود بەو هەموو دەسەڵات و دیقەتکارییەوە «زار و زبان و ددان و پووک» بکا بە وێنەی ناو ئاوێنە کە لە غونچەیێکی شەونم لێ نیشتوو دووبارە ببێتەوە. دەمەوێ بڵێم سەرەڕای دەسەڵاتی شاعیری و هەستی تیژ و فیکری ورد دەبێ «لەگەڵداژیان - معاشرة» یش یارمەتی نالی دابێ بۆ ئەو هەموو ئیعجازکارییە لە عاست گوڵ و گیا و درەختدا و هەر بۆیەش ئەوەندە خۆیان دە شیعری هاویشتبێ».*

*ئەم زاهیرەیەی «نباتی» بە هەردوو ڕووی «چەند و چۆن» یەوە لە دیوانی حاجی قادردا خۆ نانوێنێ. بەڵێ گوڵ و گیا و میوە و دەشتودەر لە شعیری*

هەموو شاعیرێکدا هەیە، بەڵام هەبوونی تێهەڵەنگوتن وەیا بەدوادا گەڕان و خۆ پێوە ماندوو کردن یەکجار جیاوازە لە هەبوونی «زگماک»ێکی ئاسایی کە دەڵێی پارچەیێکە لە سروشت و دەروونی شاعیر. بە ڕادەی ئەوە کە شاعیر لە نزیکەوە ڕەفاقەتی کردبێ ناوهێنان و لەکارهێنان بۆ دەربڕینی واتا و نەخشەکێشان وەستایانەتر دەبێ.

هەڵبەت ئەو ڕەفاقەتە تاکوو لە سەرەتای ژیانی شاعیرەوە بێ، پتر فرچکی پێوە دەگرێ و لە گیان و میزاجی جێگیرتر دەبێ. بۆیە من وا دەزانم نالی پلەی منداڵی و ساوایی خۆی لە دێی «خاک و خۆڵ» و دەشتودەر و نێو گیا و گوڵ و ئاژەڵدا ڕابواردبێ.

بەو پێیە و لە ڕێی قیاسی «مفهوم المخالفة»وە دەبێ کزی و کەمیی زاهیرەی «نباتی» لە دیوانی حاجی قادردا لەوەوە هاتبێ کە حاجی بە ساوایی وەیا لە سەرەتاکانی منداڵیدا لە لادێی ڕانەبواردبێ. کەواتە دەگەم بەو ئەنجامە کە ئەگەر حاجی قادر وەلادەتیشی لە کۆیی نەبووبێ دەبێ لە زوێیکەوە واتا هەر لە ساوایەوە لادێی بەجێ هێشتبێ و هاتبێتە کۆیی.

ڕواڵەتی بەیەکدی گرتنی دیوانەکەی لەگەڵ هی نالی وا ڕادەگەیەنی کە ئەم ڕەفاقەتەی سەرەتای ژیان لەگەڵ شیناورد و گوڵ و درەخت و دەشتودەردا بۆ حاجی ڕێک نەکەوتوە، بۆیەیە ئاشنایی ئەو لەگەڵیاندا هەر بەقەدەر ئاشنایی شاعیرێکی شارستانی بوە. بەڵام هەمان حاجی قادر، چونکە چەند ساڵێکی خوێندنی فەقیەتی لە نێو عەشیرەت و ڕەوەند و لەگەڵ ڕەشماڵ و مەڕ و ماڵاتدا ڕابواردوە و لە چەند بەهارێکدا خۆی لە هەوارەکانی لاجان و باڵەکەتی و دەوروبەری سابڵاغ و بێتوش دیتوە و لە تەفسیلاتی ژیانی کۆچەری و مەڕداری و گاران بەخێو کردن و خێمەنشینی شارەزا بوە بۆیە بەو هەموو دەسەڵاتی «تعبیر و تصویر» ە لە بەهارییەکەیدا وێنەیێکی لە سەدی سەد و ڕەسسامانەی ژیانی نێو ڕەشماڵ و گژەگژی دا کردنی ئاژەڵ و بێچوو تێبەردان و هەموو کەینوبەینی کۆچەری وەک تابلۆی زەیتی ئارایش دەدا و بەهار و عێلەجات و سەگ و کەحێل و مەڕوماڵ و باران و هەورەتریشقە و پەڕەوولی تاقی ئاسمان و هەموو بارێکی ئەو کارەمان بە

*چاوقووچێنێک بۆ دەخاتەوە سەر یەک. تۆ بڵێی ئەگەر بەچاوی خۆی ئەو جۆرە ژیانە و تێکهەڵقژانە و هەڵسوور و داسوورەی نەدیتبا بیتوانیبایە لە نەخشەکێشانیدا هێندە خامەڕەنگین و شیرینکار بووبا؟*

*جارێکی دیکەش سرنج بگرە لە وەسفی بیابان و ڕەمل و دڕک و داری ڕێی حیجاز کە نالی لە چەند قەسیدەیێکی «مناجاة» دا بەرەو حەج لە کانیاوی دڵی خۆی هەڵی هێنجاون. نە نالی دەیتوانی لە غەیبەوە ئەو وەسفە ئەفسوناوییەی سەحرا بکا، نەهیچ وەسفێکی وا لە سەرانسەری دیوانی حاجی یا غەیری حاجی کە دیمەنەکەی نەدیتبێ وجوودی هەیە. ئەو وێنەگرییەی نالی کردوەتی لە دەسەڵاتی تاک تاکە شاعیری هەڵکەوتوو نەبێ نییە با چووبێتە حەجیش، چ جایی ئەوەی شاعیری حەج نەکردوو و سەحرا نەدیتوو بتوانێ هەیبێ.*

*ئا ئەم تێبینیانە وا دەکەن من ئەو تەواتورە پەسند بکەم کە دەڵێ حاجی لە منداڵیێکی زووەوە، یاخود بەساوایی، هاتۆتە کۆیێ و لەوێ چاوی پشکووتوە و خوێندنی سەرەتایی دەست پێکردوە تا بوە بە فەقێیەکی فراژوو لە خوێندندا، نەبیستراوە لە گەشتەکەی باڵەکایەتی و کوردستانی ئێرانی بەپێشەوە لە کۆیێ چووبێتە دەرێ بۆ خوێندن».*

لێرە بەدواوە دەگەینە ئەو لێکۆڵینەوەیەی کە لە کۆتایی لاپەڕە 156 ی بەرگی یەکەمی *«حاجی قادری کۆیی»* ئیشارەتی بۆ کرا و لە لاپەڕە 158یش نموونەی لێ وەرگیرا، بەڵام دیسان دەڵێمەوە چی ئێستاکە بەچاپ دەگات بەرفرەوانترە لەوەی کاتی خۆی نووسیبووم. سەرەڕای بەرفرەوانی باسی هەڵکەوت و ڕووداوی ئەوتۆشی تێدایە کە لە کاتی دەست پێکردن و لێبوونەوە لە نووسینەکە جارێ ڕوویان نەدابوو.

لێرەشدا حەزم بەوە کرد کە نووسینکەم ئەو عینوانە وەک سایەبان بە سەر خۆیەوە بگرێت کە لە سەرەتاوە بەسەریەوە بوو، بۆیەش پتر لەو عینوانە کۆنە ڕازیم چونکە ساڵ بە ساڵ ڕووداو و ئەزموون ڕاستبوونی بۆچوونەکانم، چ لەو لێکدانەوەیەدا

بێت چ لە سەرلەبەری سێ بەرگەکەی *«حاجی قادری کۆیی»*دا بێت، بە ئیسپات دەگەیەنێ: بە نیازی تاقی کردنەوەی قسەکانم بگەڕێوە بۆ لاپەڕەکانی 24، 25، 26ی بەرگی یەکەمی *«حاجی قادری کۆیی»*، ئازادیشی لەوەدا هەر لاپەڕە و قسەیەکی دیکەم لەو نووسینانەدا بخەیتە بەر تاقی کردنەوەوە...

بەم هەستەی ڕازیبوونم لەوەی چەند بەینێکە نووسیومە بانگ هێشتنت دەکەم بۆ خوێندنەوە و دووبارە ئەزموونی:

«لاباسێکی گرینگ»

لێرەدا پێویست دەبینم نەختێک سەرگوزەشتی حاجی قادر بەدیار لاباسێکەوە ڕابگرم بۆ ئەوەی ئەم بەراورد کردنەی لایەنی دیاردەی «نباتی» لە شعیری نالی و حاجیدا بەو شێوە سەرپێییەی پێیدا تێپەڕێم بەرەو خلیسکی فیکری و فەلسەفیمانەوە نەبات. ئەم تەرزە هەڵوەستە لە منەوە بۆ ڕەواندنەوەی تۆز و تەم و تاریکایی بە دەوری نووسینەکەمەوە پێداویستێکە ڕاستەوخۆ لە گرتنە ئەستۆی ئەرکی نووسینەکەوە سەر هەڵدەدات چونکە یەکەم مەبەست لە نووسینی دڵسۆزانە سوودی مرۆڤە چ لە ئێستاکە و چ لە دوارۆژدا بێت.

دیارە مرۆڤی لێرە بەپێشەوە لەدەست سوود و زیان و خۆشی و ناخۆشی و کەم و زۆری دەرچوون، پێوەندیێکی ئەوان بەو شتانەوە مابێت هەر ئەوەیە ئێمە و کەسانی دوای ئێمە لە بەسەر کردنەوەی ژیان و خەبات و چاکە و خراپەی ڕۆژگاری ئەوان پەند و سوود وەرگرین. پەند و سوودی فکریش شتێک نییە کێشانە و پێوانەی بەسەنگ و بەرهەستی هەبێت، چی بەلای قەناعەت و باوەڕی خاوێن و بێفێڵەوە سوود بێت هەر خۆیەتی دەبێتە هاندەری خاوەنەکەی لەوەی دەیکات و دەیڵێت، منیش کە بزانم بیروڕایەکی دەرم بڕیوە مەترسی بەسەهوو بردنی خوێنەری لێ بکرێت دەبێت ڕووناکییکی وەها بهاوێژمە دەوروبەریەوە کە شوێن هەنگاوی تێدا بە تاریکی نەهێڵێتەوە نەکا تەلەزگەی تێدا بکات.

ئا بەم نیازەیە ڕووپەڕەی ئەم لاباسە بەڕووی خوێنەردا دەکەمەوە و چی بەڕاست بزانم ئەویانی بۆ دەخەمە سەر کاغەز، دەشزانم لەم کارەدا گەلێک فکری قاڵبیەستووی شەختەکردوو دژی خۆم دەوروووژێنم بەڵام خوتخوتەی کۆمە کردن بە دڵی خۆمدا ناهێنم چونکە زۆر حەیفە باسی حاجی قادر، کە خۆی چاکەی ڕووت بوە، بە هۆی نەفەسکورتی و کەموکەسری نووسینەکەی من سەر بکێشێتەوە بۆ بەسەهوو بردنی خوێنەر. لە خۆشم ناسەلمێنم ترسی دڵڕەنجاندنی ئەم و ئەو بکەم بە بەهانەی خامۆشبوون.

من ئەگەر ئەو ترسنۆکە سڵکردوە بم کە لە ڕەخنە و توانج و سەرکۆنە و دژایەتی مێشکوشکان هەڵ بێم چ ڕەوای هەق بوو لە سەرەتاوە دەست بۆ قەڵەم درێژ بکەم؟ کێ یەخەی گرتبووم بەدەنگ بێم؟ ئەوەی ڕاستی بێت من تاڕادەی شەیدابوون حەز لە پووچاندنەوەی هەڵەی پەرەسەندوو دەکەم، لەبەر ئەمە زۆر زەحمەتە خاترانە و کۆمە کردن و تێبینی دڵی ئەم و ئەو شتێکم پێ بنووسێت کە بە ڕاستی نازانم... بەڵێ هەموو کەس قسەی وەها دەکەن، وا منیش کردم، بەڵام با خوێنەر بەرەوان بێت لەوەدا ئایا چەند کەس قسەی زاریان و هەڵوەستی ڕاستەقینەیان وەک یەکە...!!

با لێرەدا شتێکی دیکەش بخەمە سەر ئەم قسانەم:

من وەکوو ئەو نووسەرە «ملتزم» ـەی سەربە لایەنی فەلسەفە وەیا سیاسەتی قەرارداده نیم کە قەناعەتی پێشەکی لایەنە باوەڕ پێکراوەکەی بەسەر خۆیدا هێناوە و بە پێی بۆچوونی کەسانی لە خۆی بەرەژوورتر دەڵێ و دەکات و دەنووسێت پتر لەوەی گوێ بداتە واقیع و ڕووداو و ڕاستی و ناڕاستیی شتان. قەناعەتی من وەک قەناعەتی هەر کەسێکی دیکەی زاڵ بەسەر دڵ و مێشک و دەست و زمانی خۆیدا، لە ناخی دڵ و دەروون لە ئاکامی لێکدانەوە و لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی سەربەخۆ و ئازادی خاوەنەکەی پەیدا بوو، هەر بۆیەیشە ئیمکان هەیە ئەوەی بە ئازادی قەناعەتی لە دڵی خۆیدا پەیدا کردوە بە ئاسانی واز لە هەڵەی خۆی بهێنێت، چونکە کە حەقیقەتی لێ ڕوون بۆوە چاوەنۆڕی ڕازیبوون و ڕا لێبوونی دەسەڵاتی سەرەوەی خۆی ناکات بۆ ئەوەی بڕوا بکات بە ڕەوابوونی گۆڕینی قەناعەت.

ئەوانەی بە عادەت ناوی «ملتزم» لە خۆیان دەنێن ناتوانن دان بە ڕاستبوونی شتاندا بهێنن بەر لەوەی فەتوای ئەو ڕاستییە لە دەسەڵاتی سەرووی خۆیەوە دەرچێت، دیارە مرۆڤی لاتەریکی وەک من لەوانە نیم، چونکە ئەرکی من چاوەنۆڕی فەتوا ناکات. بڕیاری پێشەکیشم پێ نادات بە ڕاستی و چەوتیی شتان، ڕێگەشم پێ لە توێژینەوەی ئازاد نابڕێتەوە شاڵڵا ئەو توێژینەوەیە بیروباوەڕی هەموو دنیای سەرەوژێر دەکرد چونکە لە حیسابی مندا هیچ تەرازوویێک بە دەرکەوتنی ڕاستیی شرایەوە داناڵەنگێت. قۆنتەراتیشم نەگرتوە لەسەر ڕاستبوونی ئەو شتانەی باوەڕیان پێ دەکەم تا ئەگەر هەڵەی یەکێکیان دەرکەوت نەختێکی سوودی قۆنتەراتەکەم لێ

کەم بکریتەوە وەک کە «ملتزم»ـە فەلسەفیەکە بە دوو پیتی نەگونجاو لەگەڵ فەلسەفە بە «التزام» گیراوەکەی ڕیزپەڕ دەبێت و ناوی لە لیستەدا ڕەش دەبێتەوە.

من «التزام» م لەگەڵ خۆمدا هەیە نەک لەگەڵ دەرەوەی وجوودم، خۆشم دوو لایەن نیم یەکیان پارەی «التزام» لەوی تریان داشکێنێت، چەند بە ئاسانی لە تینوەتیدا ئاو دەخۆمەوە هەروەهاش بە ئاسانی واز لەو باوەڕەم دەهێنم کە بە بەڵگە دەپووچێتەوە با بە هەموو عومریشم ڕێزم لێی گرتبێ. من یەکەم ئامۆژگاریم بۆ ڕۆشنبیری تازەپێگەیشتووی کورد ئەوەیە خۆی نەکاتە پاسەوانی فکرەی قاڵبەستوو... چاوی ڕەخنەی نەنوقێنێ... هەردەم ئامادەی «ڕەفز» بێت بە مەرجێک سەرلەنوێ نەبێتەوە پاسەوانی ڕەفز.

بوتپەرستی چ لە چەپ و چ لە ناوەند بێ و چ لە ڕاست هەر بوتپەرستییە، فکرەش بەوە چاک و خراپ نابێت داوای «چەپایەتی» و «ڕاستایەتی» بکات. فکرەی خراپ بەو چاک نابێت بەرەیێکی چەپرەو بیکەن بە ئایینی خۆیان، فکرەی چاکیش بەوەندە خراپ نابێت چەپرەوەکان بیکەن بە توهمە و لە ملی ڕاسترەوەکانی بپێچن. فکرە ئەگەر خراپ بێ هەر خراپە و بەند نییە بە چەپ و ڕاستتەوە.

ناشێ فەلسەفە و بیروباوەڕ قاڵبی سۆفیگەریی و دەروێشایەتی وەرگرێت، تا لایەنی «ماددییەت» یش لە فەلسەفەدا بەهێزتر بێ پتر پێویستی هەیە بە نەرم و شلی و بەرفرەوانی و باخەڵفەراحی چونکە فەلسەفەی ماددی لەسەر بنگەیێکی ڕەق کە ماددەیە ڕەگ دادەکوتێ بەتەمایشە تەفسیر هەموو شتێک بکات بە ماددە و مەعناوە. بەنموونە دەڵێم سۆزی دایک بۆ بێچوەکەی درەنگتر خۆی بەدەست تەفسیری ماددی تەسکبینەوە دەدات لەو تەفاعولە کیمیاییەی کە بەپێی دەستووری ماددی ڕەق و زەق پێک دێت، کەچی کابرایەکی «مثالی» غەیبپەرست زۆر بە ئاسانی دەتوانێ بڵێ ئەم سۆزە مەعنەوییە لەم مریشکە نەزانەوە بۆ ئەو جوجەڵانەی کە دوای دوو مانگی تر لە خۆیانی دەکاتەوە بەهرەیەکی خوداییە و لەگەڵ حیکمەتی بێپایانیدا گونجاوە بە قەدەر گونجانی تەفاعولی کیمیایی لەگەڵ ئەو حیکمەتەدا.

زۆر بەداخەوە، ئەغڵەب وا دەبێ بیرکەرەوەی ماددی ئینکاری ئەو شتە مەعنەوییانە دەکات کە لەگەڵ ڕاستە حیسابی فەلسەفە ماددییەکەیدا ناگونجێت. ئینکار

کردنەکەش هەر بە زەرەری ئەو قوتابیانە تەواو دەبێت کە وەک سۆفی و دەرویش چاویان ئەبڵەق بوە بەرانبەر وشە گەوهەرینەکانی ئەوەوە. فەلسەفەی ماددی کە هات و بنگە و سەرشاری خۆی تەسک کردەوە لە پێناو پاراستنی ئابرووی خۆی، وەها «محدود» دەبێ کە بە هیچ لێکدانەوەیەکی نیمچە ژیرانەش بایی تەفسیری ئەم جیهانە نامەحدودە ناکات.

فەلسەفەی تەسک یا دەبێ لە ئاست تەفسیری «بوونەوەر» هەڵێت و کۆڵ بدات یا دەبێ جیهان تەسک بکاتەوە بۆ ناو قاڵبەکەی خۆی، واش دەزانم ئەو ڕۆژگارانەی فەرمانی «محاکم التفتیش» و ئۆردوگای عەمەلی سوخرەی سیبریایان تێدا ڕێز لێ گیرابوو خەریکن لە ئاسۆی بەسەرچوون و برانەوەوە ئاودیوی نەمان دەبن. لێرەدا کە دەڵێم دەبێ فکری ماددی خۆی لەبەریەک بکێشێتەوە بۆ ئەوەی بتوانێ تەفسیری دیاردەی ناماددی وەکوو «سۆزی مریشک بۆ جووجەڵەکانی» بکات وەک کە بابای غەیپەرست بە ئاسانی و بێ ئەوەی «تناقض» لە باوەڕەکەی خۆیدا بکات دیاردەکەی گێڕایەوە بۆ حیکمەتی خوا.

لێرەدا هەرگیز مەبەستم ئەوە نیە بڵێم بیرکەرەوەی ماددی واز لە باوەڕی خۆی بێنێت و ببێتە خوداپەرست، خۆ ئەگەر ئەمەش بکات پەکی لایەنی ماددیی بیروڕایەکەی ناکەوێت چونکە خواپەرستەکانیش باوەڕیان بە دەستوورەکانی ماددی هەیە و فرۆک لێ دەخوڕن و شرنقە لە نەخۆش دەدەن و باراش بۆ ئاشی ئاگر دەبەن... مەبەستی من ئەوە نیە شتێکی ترە: من دەڵێم [دواتریش بە چاکی خۆم ڕوون دەکەمەوە] خۆ لکاندن بە تەفسیری ماددی ڕەق و تەق تا ئەو ڕادەیەی مرۆڤ سڵ بکاتەوە لەوەی تەفسیری «سۆزی مریشک» بە شتێکی جودا دابنێت لە تەفسیری پێک هاتنی ئاو لە ئۆکسجین و هایدرۆجین، کە دەشزانین تابڵێی لەیەکتر جودان، سەر دەکێشێتەوە بۆ ئەوەی بڵێین دابڕینی گڵاسێک ئاو لە کووپەیێک ئاو عەملیەتێکی ماددییە وەک لێکردنەوەی سەری مریشک لە لەشەکەی... ئەمەشیان دیسان وەک بڕینەوەی دەست و قاچی مرۆڤ بە مشار، هەموویان هەر عەمەلیەتی ماددین.

ئەم ئەنجامە سەیرە ڕاستەوخۆ لە سەپاندنی یەک تەفسیری ماددی بەسەر «ئاو - مریشک - مرۆڤ» «مردوو- زیندوو- هۆشدار» پەیدا دەبێت. هیچ لە کابرای

ماددیش ناسەلمێندرێ لەم ئەنجامە سەیرەی بڕیارە پێشەکیەکەی خۆی هەڵێت بەوەدا بڵێ من کە سۆزی مریشک و پێک هاتنی ئاوم گێڕایەوە بۆ تەفسیری ماددی مەبەست ئەوە نەبوو لە دوایدا بڵێم سەربڕینی مریشک و دابڕاینی پەرداغە ئاو وەک یەکن، چونکە ئەگەر ئەمەی لێ بسەلمێنین ڕێی پێ دەدەین فێڵمان لێ بکات. دەبێ لێی داوا بکەین لە سەرەتای هەڵنانی فەلسەفە ماددییەکەیدا فەرقی مردوو و زیندوو و هۆشدار بکات تاکوو دواتر لێی بسەلمێنین کە دابڕینی ئاو و سەربڕینی مریشک و دەستبڕینی مرۆڤ بەپێی فەلسەفەکەی ئەویش شتی لەیەکتر جودان. دەبێ فەلسەفەکە لە سەرەتاوە ئەوەندە بنگەی لێکدانەوە و تەفسیری تێدا هەبێت کە بایی مامەڵەت کردن لەگەڵ ملیۆنەها شتی لەیەکتر نەچوو بکات، نەک هەر جارە کە هات و کەلێنێکی تێکەوت و شت بەو کەلێنەدا تێپەڕی و بەر تەفسیرەکەی نەکەوت قوڕێکی تازەکردی «فکری ماددی» بهێنێت و کەلێنەکەی پێ پڕ بکاتەوە و بشڵێ فەرموون سەیری فەلسەفەکەم بکەن چەند ڕاست و تەواوە.

ئێمە ئەگەر ئەو پینەچیەتیە لە بیروباوەڕ و فەلسەفەیەکی تریش بسەلمێنین، با ئەو فەلسەفەیە جنۆکەپەرستن بێت، بەرانبەری دەمکوت و دەستەوستان دەبین چونکە لە هەموو پەککەوتنێکدا تەکانێکی نوێ دەداتە خۆی و لە قۆرتەکە دەردێت. چ فکری ماددی بێت و چ هەر فکرێکی دیکە بێت، لە پێشەکیەکانی و لە بنگە بنجییەکانییەوە تەواوی و ناتەواویەکەی دەردەکەوێت، نەک فەند و فێڵی پینەچیانەی دواکاتیەوە. ئەگەر ئەم مەرجەی «تەواوی و دروستی لە سەرەتاوە» نەکەین بە پێوانەی دۆزینەوەی ڕاستی و دروستیی باوەڕان ناتوانین بە هیچ باوەڕێک بڵێین ناتەواو وەیا هەڵەیە. بە نموونەیێکی سەرپێی دەڵێم، بابایەک کە گوتی «کێ دەیەوێ دە هەزار دیناری بدەمێ؟» دەبێ دەهەزار دینارەکەی هەبێ، یاخود هەر نەبێ خێرا پێی پەیدا بکرێ، دەنا ئەویش دەتوانێ بەڵێنەکە بدات و کە پارەکەی لێ داوا کرا بڵێ لێم ڕاوەستن تا بۆتانی پەیدا دەکەم.

بێ هەموو نیازێکی تایبەتی بە هەڵە دەرخستنی هیچ یەکێک لە بیروباوەڕ و فەلسەفە جوداکانی ئەم جیهانە دەڵێم فەلسەفەی تەسک و دنیای بەرین دوولایەنی یەکجار پێچەوانەی «معادەلەی فکری»ن، ناشکرێ لە قەپێلکی کەللەسەری مرۆڤدا جێیان بۆ

بکریتەوە مەگەر بە زەبری قەمچی و زمانبڕین و بەندیخانە وەیا دڵدانەوە و دەم چەور کردن...

تۆ دەزانی منیش دەزانم «مطلق» و «أزل و أبد» و نهێنیەکانی سروشت و ماددەی زیندوو و هۆشدار و دیاردەی خواز (إرادة) و خەسڵەتەکانی تری ڕوەک و گیانلەبەر و مرۆڤ... و پرسیارەکانی نیسبی و فەلەک و ئەسڵی ماددە و هەستی شەشەم و حەوتەم و صەدان و هەزاران هەزاری باسی ئەوتۆیی، خەیاڵی بێسنوور و وڕێنەی بەربەڕەڵلا و خەونی ڕەها تێیان بڕ ناکات مەگەر ترسی هێڕبوون و سەرسووڕان و گێژان پەراوێزی دەسکردیان بە دەورەوە هەڵنێت و مەودایان کورت بکاتەوە، ئەگەرنا جیهان و پرسیارەکانی بێسنوورن... نامەحدوودن، دیاریشە پێوانی ئەو نامەحدوودانە بە عەیارەی مەحدوود گەپێکی سافیلکانەیە. کە بتەوێ بزانی دەریا چەند دەولکە ئاوی تێدایە، یا دەبێ دەریاکە بچووک بکەیتەوە بۆ دەسەڵاتی دەولکە، یا دەبێ دەولکەکەت ئەوەندە زل بێ بۆ پێوانی دەریا دەست بدات، یا واز لە پێوانی دەریا بهێنیت: ئەوەندەی زانیبێتیشم کەس وازی لە دەریا پێوان نەهێناوە تا ئەوەی بە ئەنگوستیلەی دروومانیش ئاوی لێ هەڵێنجابێت... هەموو خاوەنێکی دەولکەی فکری تەسک بە زمان و بە قەڵەم وایان ڕانواندوە کە دەولکەیان بەشی دەریای تریش دەکات. زۆریشیان لەوانەن دوای هەڵێنجانی چەند دەولکەیێک دەڵێن لە پێوانەی دەریاکان بووینەوە، جا ئەگەر دەسەڵاتێکی دنیاییان لە پشتەوە بوو وەیا هێزێکی ئایدیۆلۆجی دڵخۆشکەرەوە لە ڕاگەیاندنەکانیاندا هەبوو خەڵکێکی زۆریان بەدوا دەکەوێت، بەچاوی خۆشمان دەبینین فەلسەفە ماددییەکان بەهەشتێکی سەر ئەرزی وەک بەهەشتی دینە ئاسمانیەکان دەکەن بە ڕاکێشەری مەردەم بۆ ناو باوەشی خۆیان کە بەهەشتیش دروست نەبوو بە چاو لێ زەق کردنەوە کاری خۆی دەکات.

ئەم پێشەکیانە کە وەک وتووێژێکی دەروونی نووسەر و ئاخێوەر (لێرەدا من ئەو نووسەر و ئاخێوەرەم) خۆ دەنوێنن بە بەریانەوە هەیە گەلێک شریتەی تر بە دەوری خۆیانەوە بهاوێژن هەمووشیان لە جغزی ڕەهایی فکر و پووچاندنەوەی قاڵبیەستن و شەختەکردنی فەلسەفەدا گەپڕۆکە ببەستن چونکە هەم ڕەهایی فکری بێسنوورە هەم قاڵب بەستنی فەلسەفەکانیش، وەک بە چاوی خۆمان دەیانبینین،

دیاردەیێکی بەرچاو و پەرەسەندوە. لە ڕاستیشدا دەمەتەقە هەڵستاندن بە دەوری باسەکانی فکری و فەلسەفەییەوە، بە هەموو جۆرەکانیەوە، نە کۆتایی هێنان هەڵدەگرێ و نە هیچ ئەرکێک و درێژە پێدانیشی لێ خەسارە، تەنانەت بە نیسبەت زوربەی خوێندەواری نەوباوی کوردەوە کوتانەوەی بیروڕای لێرە بە پێشەوە باسکراویش، بەتایبەتی ئەوەی ڕەخنە لەلایەنی «یۆتۆپیا»ی فەلسەفەی ماددی دەگرێت، هەر زۆر بەسوودە چونکە بەداخەوە سی ساڵ پترە خوێندەواری کورد هەرچی فکرێکی دەرەوەی جغزی ماتیریالیزم هەیە لێی حەرام کراوە.

خوێندەواری کورد هەر ئەوەندە چاوی بە فەلسەفەیێکی جودا لە ماتیریالیزم دەکەوێ کە نووسەری ماتیریالیست لە نووسینی خۆیدا و بە مەبەستی پتەو کردنی بنەمای فەلسەفەی ماددی باس لە فەلسەفەی تر دەکات و بەدرۆیان دەخاتەوە و لەباڵ یەکیان هەڵدەوەشێنێت وەک ئەوەی کە ئیماندارێک دێت و باسی زەندیق و کافر و بێئیمانان دەکات و سەرلەبەری بیروباوەڕەکانیان و ئاکارەکانیان و کردارەکانیان بە ئیشی شەیتان دادەنرێت و دزێوترین وەسفیان بۆ بەکار دەهێنێت، بەڵام لێرەشدا فەرقێکی گەورە هەیە لە نێوان زەلیلبوونی زەندیقایەتی بە دەست ئیماندارەوە لەگەڵ وردوخاشبوونی فەلسەفەی غەیری ماددی لەلایەن فەیلەسووفی ماددییەوە لەو سنوورەدا کە خوێنەری تازەپێگەیشتووی کورد دەبینێت و دەبییەت: مومکینە زەندیقایەتی لە وڵاتی ئیمانداردا باسی لێوە بکرێت وەک کە هەیە بێ ئەوەی بەسەریەوە بندرێت و لێی کەم بکرێتەوە، دواتر بە بەڵگەی ئیماندارانە هەوڵی پووچاندنەوەی بدرێت. واش بوە زەندیقی زۆر گەورە کتێبی داناوە و بڵاویش بۆتەوە، بگرە هەندێک لەو ڕەخنانەی کە زەندیقایەتی لە وشکەباوەڕی غەیبی گرتوە لەلایەن هەندێ زانای ئیماندارەوە بایەخیشی پێ دراوە. بەڵام لەو ماوەی سی ساڵەی دوایدا گەنجی کورد لە مەیدانی فکری فەلسەفی و سیاسیدا لە تاکە یەک ئاوازی ماتیریالیست بەولاوە هیچی تری بە سەربەخۆیی نەبیستوە. هیچ کەسێکیش جورئەتی نەکردوە یەکسەر ڕەخنە لە سەرچاوە و بنەما فکرییەکانی ماتیریالیست بگرێت وەیا بوێرێ بە هیچ فەلسەفەیێکی دیکەی بگرێ وەیا ببڕای ببڕای باسی نەگەییشتنە دی شتە خۆشە چاوەڕوانکراوەکانی بکات. وەیا ڕۆژەک لە ڕۆژان ژیانی

کرێکاری وڵاتێکی وەک سوید و دانمارک تەرجیح بدات بەسەر ژیانی کرێکاری ڕووسیا...

خولاسە حەرامبوونی باسی فەلسەفەی غەیری ماتریالیست لە خوێندەواری کورد گەلێک بەولای حەرامبوونی زەندیقایەتیی لەنەزەر ئیماندار تێپەڕی کردوە و دەرگای لەسەر داخراوە. هیچ موبالەغە لەوەدا نیە کە دەڵێم دیتومە مەلای کورد لە نێو ئاڵقەی تازە خوێندەواری کوردا نەیوێراوە بەڕەهایی هەموو باوەڕێکی ئایینی ڕاست و دروست و بیتەئویلی ئیسلامەتی باس بکات وەیا بە دەنگی دلێرەوە بڵێ بنەما ئابوورییەکانی ئیسلام لە کۆمیونیزم باشترە.

من لەم قسەیەمدا مەبەستم ئەوە نیە داوا بکەم لە خاوەن بیری کۆمیونیست واز لە باوەڕەکەی بهێنێت، نەک هەر ئەمەو بەس، ئەوەی بە چاوی مامڵەت سەیری نووسینەکانی من بکات دەزانێ تا ئێستا نەمگوتوە ئایینە ئاسمانیەکان ڕاستن و «وحی» هەبوە وەیا خوا چییە و چۆنە. بەکورتی و بە کوردی یەک پیت لە نووکی خامەی منەوە نەچۆتە سەر کاغەز ویستبێتی خەتێک لە نێوان ماددە و غەیب ڕابکێشێت و فەلسەفەی ماددی بۆ خاتری ئایین وەیا هەر جۆرە بیر کردنەوەیێکی میسالی و غەیبی بێ بپووچێنێتەوە. ئەوەی کردومە و نووسیومە دیارخستنی ناڕاستی و کەموکەسری ئەو بۆچوونە ماددییانە بوە کە پێویستی شی کردنەوەی بابەتی نووسین بە ملیدا بریوم.

من کە لە بەرگی یەکەمی *«حاجی قادری کۆیی»* دەوری خوێندنی فەقێیەتیم لە بەیەکەوە بەستنەوەی کوردستانی گەورەدا ڕوون کردەوە نەمگوت بابەتی خوێندنەکە چەندی ڕاستە و چەندی هەڵەیە، بگرە دوور و نزیکیش بەم لایەدا نەچووم، یاخود کە وەک کوردێک شانازیم بە ناو و ناوبانگی مەولانا خالید و کەسانی وەک ئەوەوە کرد نەمگوت مەزهەبەکەیان ڕاستە وەیا سۆفیەتی باشە. جارێ یەک تاڵی شیرازە و ڕشتەی باوەڕی خۆمم لە بارەی حەقیقەتی ئەو بنەما فکریانەی ماددی و ئاینییەوە دەرنەخستوە. وەک گوتم لەوەم پتر نەکردوە کە بە پێی تێبڕ کردنی هۆشی خۆم بۆچوونە سەراوەکانی ماددی لەو باسانەی دێنە پێشم بێ کۆمە کردن بخەمە بەر ڕووناکایی ڕەخنەوە. هەروەهاش ئەو شتە ناماددییە کاریگەرانەی کۆمەڵایەتی و مێژوویی کە فکری ماددی حەزیان لێ ناکات دەیەوێ

دەوریان کەم بکاتەوە، وەیا هەر بە جارێ نەیسەلمێنێ وەیا هەر نەبێ بە تەئویلان بۆ بەر حوکمی خۆی بیاندزێتەوە من تارادەی قەناعەتی خۆم بیانخەمەو▪ جێگەی ڕەوای خۆیان.

جارێکیان لەگەڵ ئاشنایێکی کۆمیونیستدا لە هەندێ باری تێکهەڵقژانی فکری ماددی و نامادد‌یەوە وتوویژم دەکرد، لە نێوان قسەاندا گوتم بیرکەرەوەی ماتیریالیست چ مانعێکی لەوەدا نییە ئەو حیکایەتە بسەلمێنێ کە دەڵێ دەمەو عەسر پشیلەیەک بێچوەکانی خۆی لە دێیەکی بناری شاخێکەوە ڕاگوێست بۆ ئەوبەری دۆڵی دامانە دێیەکە و بە شەو هەرەسی بەفر دێیەکەی وێران کرد و خەڵکەکەی کوشت، وەیا سەگێک لەپڕ کزی و عاجزی دایگرت و دوای چەند ڕۆژێک خاوەنە خۆشەویستەکەی مرد بەڵام هەمان ماتیریالیست ناسەلمێنێ پیاوێکی وەک «حلاج» بابی پشیلەکە «کەرامەتی» هەبووبێت. پێم گوت چۆن بە خۆت ڕەوا دەبینی سەلماندنی کەرامەتی پشیلە و ئینکار کردنی کەرامەتی مرۆڤ بە باوەڕێکی مرۆڤدۆست و پێشڕۆ و ڕاست و دروست دانێت؟ لە وەرامدا گوتی پیاوە ئایینییەکان هێندەیان فێڵ لە ئادەمیزاد کردوە و سەریان لێ شێواندوە و بۆ تەماعی خۆیانیان چەوساندۆتەوە بۆیەیە ئینکاری کەرامەتیان دەکەین. پێم گوت من ئەو وەرامەت لێ قبووڵ دەکەم بە مەرجێک داوای عیلیمانییەت و گیانی زانستپەرستی و ئینساف و... هتد واز لێ بهێنیت و دان بەوەدا بنێنیت کە مرۆڤێکی «انفعالی»یت. دەبینی من پێم نەگوت «حلاج» ڕاست دەکات یا ناکات...

جارێکی دیکەش لەگەڵ یەکێکی تری کۆمیونیست و تووێژێکی کورتیلەم بوو بەم شێوەیەی وا بۆتی دەگێڕمەوە: پێشەکییەکی عەرەبیم نووسیبوو لەبارەی دیوانی شاعیرێکی لاهووتی کورد، لەو پێشەکییەدا گوتبووم ئایین شتێک نییە لە جغزی سوودی کۆمەڵایەتی دەرچووبێت وەیا لەلایەن کۆمەڵەوە بێبایەخ و بێڕێز بووبێت، هەر بەدەم ئەو قسانەیشەوە گوتبووم ئایا ئەو فەلسەفە و بیروباوەڕە پشت لە ئاینانەی دەیانەوێ دەوری دین لە کۆمەڵایەتی و مێژوو کەم بکەنەوە بۆ خۆیان هێندەی ئایین بەردەوام دەبن؟ دەتوانن هەزاران ساڵ بژین وەک کە ئایین ژیاوە؟ ئاشنا کۆمیونیستەکەم پێی گوتم ئەوەی تۆ نووسیوتە لە بارەی تەئسیری دین و ڕێز لێ گیرانیشیەوە ڕەنگە تەواو ڕاست بێت بەڵام چ فایدە کە پیاوە ئاینییە

فێڵبازەکان ئەو تەرزە قسەیە بە زێڕ دەکڕن و لە هەواوە دەیقۆزنەوە؟ پێم گوتەوە چ سووچی من لەوەدا نییە ڕاستیکی دەیڵێم فەلسەفەیێک لێی وەتەنگ دێت وەیا خۆی تێدا زەرەرمەند دەبینێت. دەبێ ئەو فەلسەفەیە خۆی بهاوێتە سەر بارێک کە تێیدا زەرەر لە ڕاستییان نەکات نەک داوا لە خەڵک بکات ئینکاری ڕاستی بۆ بکەن وەیا درۆیانی بۆ هەڵبەستن. قابلیەتی بەردەوامبوونی باوەڕی ئایینیش پتر لە باوەڕی ماددی و فەلسەفی. ئەویش بۆ خۆی ڕاستییێکە دەبێ سەرنجی بیرکەرەوە، ماددی بێ یا هەرچی دەبێ. بۆ دۆزینەوەی سەرچاوەکانی ئەو بەردەوامبوونە ڕابکێشێت.

چەند سەیرە ملیۆنەها خەڵق لە خۆوە بە ئەرک و مەسرەفی خۆیان خەریکی بەدەوام کردنی باوەڕێک بن کە بەلای بیرکردنەوەی ماددی و عیلمانییەوە فڕی بەسەر ڕاستی و ماددە و سوودی خەڵقەوە نییە. کەچی فەلسەفە ماددییەکە کە خۆی داناوە بە ئاڵای سوود و خێر و خۆشیی گەل ئەگەر پۆلیس و عەسکەر نەیپارێزن لەوانەیە بە زوویی لە بیران بچێتەوە. من بڵێم و نەڵێم، تۆش پێت خۆش بێ یا ناخۆش، دیارە ئایین ئەو بێ بنج و بناوانە نییە لە دڵ و دەروونی خەڵقدا کە موعادەلە سەراویەکانی فەلسەفەی ماددی سەر بە کۆمەلایەتی بۆی هەڵدەنێن. هەر جارەش کە بیرکەرەوەی ماددی بەردەوامبوون و ڕێز لێ گیرانی ئایین دەدەنەوە بەو فێڵبازی و چاوبەستەکییەی پیاوە زۆرزان و عەوامخەڵەتێنەکانی شەعبەدەباز لە پێناو سوودی دنیایی خۆیان لە خەڵقی دەکەن دوو ڕاستی زۆر گەورە پێشێل دەکەن:

یەکەم ڕاستی ئەوەیە ئەگەر ئایینْ ئەو کەم بایەخ و بێبنجەیە لە دڵاندا کە بە پێی تەفسیراتی فەلسەفەی ماددی وەها دەردەچێت بۆچی مرۆڤی عادەتی بە دوو فڕوفێڵی شێخی نیوەخوێندوو واز لە ماڵەکەی خۆی دێنێت بۆ خاتری ئەو باوەڕە کەمبایەخ و بێبنجە؟ بۆچی شێخەکە ناتوانێ بە غەیری ئەو شتە «کەمبایەخ و بێبنجە» داوای ماڵی دنیا و، بگرە گیانیش، لەو خەڵقە بکات؟

ڕاستی دوەم ئەوەیە، بۆچی فەیلەسووفە ماددییەکە خۆی بە هەموو بیروباوەڕە ڕۆشن و مرۆڤدۆستەکانی خۆیەوە ناتوانێ دەیێکی فێڵبازە درۆزنەکە خەڵق بەدوا خۆیدا ڕاکێشێت ئەگەر پۆلیس و عەسکەر خەڵقی بۆ نەتۆقێنن؟ بۆ دەبێ مەرقەدی کابرایێکی مردووی هەزار ساڵە لە دوورایی هەزاران کیلۆمەترەوە مرۆڤی بێپارەی

بێدەسەڵاتی لاتی ڕووتوقووت بۆ خۆی ڕاکێشێت و بەدەوری پەڕۆ و پاڵەکەی خۆیدا خولی پێ بدات و هەزاران فرمێسکی لە چاوان هەڵوەرێنێ، هیچ حکومەت و دەسەڵاتی دینایی و چاوسوورکردنەوەش لەو کارەدا دەستی نەبوویێت؟ چۆن دەشێ وەها بە ئاسانی ئەم هێزە زلەی ئایین بە دوو موعادەلەی قوت و قرتاو بپووچێتەوە کە لە واقیعدا نەک ناپووچێتەوە بەڵکوو پتریش تاو وەردەگرێ.

دەبینی من لەم قسانەمدا ناڵێم ئەو باوەڕی یەکێکی پاکستانی بۆ سەر مەرقەدی گەیلانی ڕادەکێشێت ئاخۆ ڕاستە یا چەوتە، من تەنها دیاردەکە بە ڕووی خوێنەردا دەدەمەو، لەگەڵ هەندێک پرسیاری دوودڵانە و گومانکارانە بۆ ئەوەی پەلە نەکات لە بڕیارەکانی و خێراخێرا ڕیشی خۆی تەسلیم بە باوەڕێک نەکات کەوا، کوردیی گوتەنی، بە بەڵگە و بێ بەڵگە هەموو شتێک بە درۆ دەخاتەوە کە لەگەڵ نیازەکانی خۆیدا ناگونجێت.

لێرەدا نموونەیێکی شەڕەگەڕەکێکی نێوان بیری ماددی و ئایینیت نیشان دەدەم تاکوو تۆش وەک من سەرنجت بۆ لایەنی خێرا کردنی فەلسەفەی ماددی لە سەپاندنی باوەڕ و بەرژەوەندی خۆی بکشێت هەرچەندە لە ڕاستیدا ئەو بەڵگانەی بەسەریانەوە هەڵدەوەستێت دژی ئەو بنەما و ماکە فکرییانە بن کە فەلسەفە خۆی لە بنەڕەتدا لەوانەوە ڕسکاوە:

لە ژمارەی 2512 ی گۆڤاری «روزالیوسف» ی ڕۆژ 2-8-1976، گوتارێکی د. فوئاد زەکەریا لەژێر ناونیشانی «مارکس و افیون الشعوب»دا بڵاو کرایەوە. گوتارەکە و بڵاوکردنەوەی، ڕووپەڕەیێکی هەرای نێوان فکری چەپ و فکری ڕاستی ئەوسا و ئێستاکەی میسرمان بە ڕوودا دەکاتەوە لە هەمان کاتیشدا نیشانمان دەدا چۆن لە پێناو بەرپەرچدانەوەی هێرش و خۆ لە ڕەخنە پەراندنەوەدا ڕاستی یەکجار زل، بە نوێژی نیوەڕۆ، سەرپۆش دەکرێت، سەیریش لەوەدایە لە هیچ لایێکەوە نیشانەیەک دەرنەکەوت کەوا کەس فەرقی بەو سەرپۆش کردنە کردبێت.

وەک دیارە گوتارەکە بە گژ هێرشبەرانی سەر ئەو گوتە زۆرە مەشوورەی مارکس دیتەو، کە دەڵێ ئایین ئەفیوونی گەلانە. لە زۆر شوێنی ئایینپەرستی ئەم جیهانەشدا گوتەکە بە گەورەترین گوناهی «مارکسایەتی Marxism» دانراوە، د. زەکریا لە

دوا پێشەکیەکی دۆستانە لەگەڵ بیری ماکسدا بە پێی بەرژەوەندێک کە خۆی بۆ بەرەی مارکسیستی ڕەچاو کردوە بە تایبەتی لە نێوان مسڵماناندا، ئەمە دەنووسێت:

ولأبدأ اولا بالسياق الذي وردت فيه هذه العبارة: ففي كتاب «مقدمة لنقد فلسفة الحق او القانون عند هيجل» وهي من كتابات ماركس المبكرة يقول: «ان العذاب الديني تعبير عن العذاب الفعلي وهو في الواقت ذاته احتجاج على هذا العذاب الفعلي. فالدين هو زفرة المخلوق المضطهد. وهو بمثابة القلب في عالم بلا قلب، والروح في اوضاع خلت من الروح. انه افيون الشعب». [لاحظ انه استعمل كلمة «الشعب» بصيغة المفرد. لا الجمع كما هو شائع]...

بە دوا ئەمەدا د. زەکەریا لەسەر نیازی مارکس لەو گوتەیەدا دەکاتەوە و زۆریش ژیرانە و زانایانە بەرەو بەدەستهێنانی قەناعەتی خوێنەر دەڕوات. هەروەها لە نێوان قساندا دەڵێ مرۆڤی ستەملێکراو هەقیەتی بەتەمای ژیانەوەییکی دنیای دوەم بێت کە تێدا بحەسێتەوە و دڵی خۆشی دابین بکات بەوەی کە ئەم جیهانە دەبێ دادێکی تێدا هەبێت هەرچەندە هاتنەدیشی بوەخرێت و بکەوێتە دوای مردن. بەڵام د. زەکەریا لەگەڵ هەموو زیرەکی و هوشیارییکی کە هەیەتی [ڕەنگە هەر لەبەر ئەو زیرەکی و هوشیارییەش بێت] خۆی لەوە بەدەنگ ناهێنێت کەوا دین هەر جێگەی ئومێد و ڕێز لێگرتنی هەژار و ستەملێکراو نییە چونکە دەوڵەمەند و دەسەڵاتداریش زوربەیان بڕوایان بە دین هەیە و گەلێکیشیان بە ڕاستی دیندارن و زۆر جارانیش خۆیان لە ستەم دەگێڕنەوە لەبەر تاکە هۆی ڕاگەیاندنی دین و ترسی ئازاری ڕۆژی قیامەت.

د. زەکەریا خۆی لە شتێکی یەکجار گرنگتریش دەدزێتەوە کەوا کەم و زۆر لەگەڵ گوتەی مارکسدا ڕێک ناکەوێت: بەشێکی زۆری گەلان لە کۆن و نوێدا دینپەرست بوون و چ باوەڕیشیان بە زیندووبوونەوە و قیامەت و بەهەشت و جەهەننەم نەبوە، تەنانەت دینی جوولەکە لە سەرەتای پەیدابوونی لە کاتی پێغەمبەر مووسادا باسی دواڕۆژی تێدا نەبوە پاشتر لە زەمانی دانیال ئیشارەت پەیدا بوە بۆ ژیانەوەی مردوان [بە نموونە بڕواتە گوتاری «أنبياء العهد القديم». لە نووسینی د.کامل سعفان - ژمارە 103- ساڵی دەیەم، گۆڤاری «الرسالة الاسلامية»، کە لەلایەن وەزارەتی ئەوقافەوە دەردەچێت]. عەرەبەکانی پێش پێغەمبەر (د. خ) و زەمانی ئەویش خواپەرست و حەجکردووش بوون بەڵام باوەڕیان بە

زیندووبوونەوە نەبوە تاکوو بە هۆی ئیسلامبوونیانەوە کەوتنەسەر دانهێنان بە قیامەت و بەهەشت و جەهەننەم.

خولاسە تەمای بەهەشت و ترسی جەهەننەم نە بە تەنها خوتخوتەی دڵی هەزارن بوە نە جێگای باوەڕی هەموو دینێک بوە. ئەگەر بگەڕێیتەوە بۆ سەردەمی کۆنی میسر دەبینی فیرعەونەکان پتر لە هەژاران و هەموو خەڵقی تر بە فکرەی ژیانەوەوە خەریک بوون و هەرەمی سەیروسەمەرەیان بۆ ئەو مەبەستە دروست کردوە... هەرچۆنێک بێ ئەم قسانەی لێرەدا کردمن هەرچەند بە نیسبەت بۆچوونەکەی مارکس زۆریش گرنگ بن، مەبەستی یەکەمی وتووێژەکەم نین. لە گوتارەکەدا لایەنێکی تری گوتار دوای ئەم پێشەکیانە دێتە سەر دەرخستنی ئەو هۆیانەی کە مارکسیان بەرەو دژایەتیی دین بردوە. لەوەدا هەوەڵ جار باسی مارکس و جوولەکایەتی دەکات کە چۆن لێی نارازی بوە و لە ئەنجامدا ئەویش وەک سپینۆزا لە جوولەکایەتی دەرچوە. لەم جێگایەدا بەدوا قسەکانی خۆیدا ئەمانە لە مارکسەوە بۆ ناو نووسینەکەی خۆی ڕادەگوێزێت کە لە زوێکەوە مارکس بەناوی «المسألة الیهودیة» وە نووسیبوونی:

«لو وجد تنظیم للمجتمع یلغي الشروط الضروریة للامساواة، وبالتالی یقضي علی امکانها لاصبحت الیهودیة مستحیلة، و عندئذ ینقشع الوعي الدیني الیهودي کما لو کان ضبابا کئیبا بدده هواء المجتمع المنعش».

سەرلەنوێ ئەمەی خوارەوەش لە «المسألة الیهودیة» وە وەردەگرێت:

«ان المال هو الاله الغیور لاسرائیل الذی لایمکن ان یوجد اله قبله. والحق ان المال لیحط من قدر کل الهة البشر...».

دوای ئەمە د. زەکەریا باسی تەجرەبەی مارکس لەگەڵ مەسیحییەتدا دەکات و چۆن کەنیشتە ببوە ناوچەی دەسەڵاتی نارەوا وماڵپەرستی و ستەم، خاوەن بیری ڕۆشنیش بەناچاری دوشمنایەتی دەکرد هەروەک کەنیشتەش دوشمنی هەموو زانین و بیرێکی ڕووناک بوە تاکوو دەڵێ:

«وعلى ذلك فان ماركس لم يكن الا واحدا فى سلسلة طويلة من المفكرين الذين افرزتهم الحضارة الغربية، والذين وجدوا الزاما عليهم ان يهاجموا الدين دفاعا عن حقوق الانسان».

لەم قسانەدا و پێش ئەوانەش خاوەن گوتار پێمان دەڵێت دژایەتیی ئەو ڕۆشنبیرانە لەگەڵ دین لەوەوە هاتوە کە تەجرەبەیان تەنها ڕووبەڕووی دینی ستەمکار و تەماعکار و جەهالەتدۆستی کردوون [دەبێ گوتارەکە بخوێنیتەوە] تاکوو دواتر دێتە سەر باسی دینی ئیسلام و پێدا هەڵدەڵێ و بەمە دەست بە قسەکانی لە بارەی ئیسلامەوە دەکات:

«يمكننا اذن ان نقول ان تجربة ماركس مع الدين كانت تجربة مع تراث ديني رجعي فى صميمه...»

تاکوو دەگاتە ئەمە:

«على ان هناک تجربة اخرى لم يكن من المكن ان يعرفها ماركس لانها تنتمي الى تراث حضاري لم يعرفه معرفة كافية فضلا عن ان معالمها لم تتحدد الا في عصر لاحق لذلک الذي عاش فيه ماركس. تلک هي تحربة الدين کقوة تحررية يستمد منها المجتمع طاقة روحية تعينه على التصدى لطغيان الاستعمار الاجنبي. وهذه التجربة لم تظهر ملامحها الا في بلاد العالم الثالث وفي النصف الثاني من القرن التاسع عشر وان كان تاثيرها لم يتضح بجلاء الا في القرن العشرين».

دوای گەلێک لێکۆڵینەوەی دیکە و لە کۆتایی گوتارەکەدا دەڵێ:

«... وان موقف ماركس من الدين كان مرتبطا بعصر معين وثقافة معينة، وان ماركس لو كان عايش تلک التجرية الشديدة التعقيد التي عاشتها مجتمعات العالم الثالث في عصرنا الحاضر لكان من الجائز ان يعدل احكامه البسيطة المباشرة بحيث يعمل حسابا للدور التحرري الذى قام به الدين في بعض هذه المجتمعات».

ئەم گوتارە لەلایەن بەرەی چەپی میسرەوە کرا بە قەڵخانێک بۆ بەرپەرچدانەوەی بەشێکی زۆری ئەو هێرشانەی بە ناوی ئایین دەبرێنە سەر مارکسایەتی Marxism، سەیریش لەوەدا بوو کەس نەهات ڕاگەیاندنە ڕاستەقینەکانی ئەم گوتارە لەبەر تیشکی مێژوو و زانست و مارکسایەتی خۆشیدا لێک بداتەوە بۆ ئەوەی بە چاکی بزاندرێ ئایا چەندی ڕاستی پێکاوە و چەندیش لە ڕاستی دوور کەوتۆتەوە. جگە لەمەش ئایا گوتەکان، بەتایبەتی ئەو چەند دێڕەی هەرە دوایی، لە واقیعدا لەسەر مارکسایەتی دەکەنەوە یاخود لەبەریەکی هەڵدەوەشێنن!

لە پێشەوە زۆر بە خێرایی ئەوەندە دەڵێم مەسیحایەتی لە سەرەتایی پەیدابوونیەوە تاکوو ماوەی چەرخێکیش بریتی بوو لە خۆ بەخت کردن و کوژران و خنکان و خورانی پێرەوەکان و پاوەندەکانی جایی ئەوەی خۆی ستەمکار بووبێت وەیا خزمەتی ستەمکاری کردبێت. مارکسیش ئەم ڕاستییەی زۆر چاک دەزانی. باشتر لە من و لە د. زەکەریاش. ئاگاداری مێژووی هەرە کۆنی جوولەکایەتیش بوو، هی سەردەمی مووسا، کە چ خزمایەتی لەگەڵ مێژووی دواتری ئەم ئایین و ڕەگەزە نییە. هەروەها قەناعەتم هەیە ماکس بێ ئاگا نەبوو لە ئیسلامەتی بە کۆن و نوێیەوە، تەنانەت زۆر نووسینی سەربە مارکسایەتی ئایینی ئیسلام و پێغەمبەری بە ئازادیخواز لە قەڵەم داوە، ئیتر نە مارکس و نە من و تۆش ئەوە ناسەلمێنین کە ئیسلامەتی هەر لەو کاتەوە کە «استعمار» بەرەنگاری عالەمی سێیەم بوە بۆتە ئازادیخواز، خۆ ئەوەی ڕاستی بێ لە هەموو مێژووی نوێی ئیسلامەتیدا پیاوی وەک «علی کوڕی ئەبوطالب» و «عومەری کوڕی عەبدولعەزیز» مرۆڤدۆست و دژەستەم و دێموکرات و دادپەروەر نە پەیدابووە نە ڕێی پەیدابوونیشی هەبوە. مارکس ئەم ڕاستییە ڕووتەی دەزانی، لەوەش بەولاوە لەلایەن بەگژدا چوونەوەی داگیرکەرەوە، تۆ بڵێی باس و خواستێکی شەڕی خاچپەرستەکان و سەلاحوددینی ئەیووبی نەبیستبێ؟ چەندین قارەمانی دیکەی وەک سەلاحوددینیش؟ من ئەمانە هەموو بەلاوە دەنێم و ئەو چەند دێڕەی هەرە دوایی گوتارەکە لە نوختەی پشتگیری کردن لە مارکسایەتییەوە هەڵدەسەنگێنم:

وا دەزانم مارکس خەیاڵی بۆ ئەوە نەچوە کەوا ڕۆژێک دێت دۆستەکانی هەر ئەوەندەیان پێ دەکرێ بۆ لەسەر کردنەوەی کە بڵێن ئەی مەردم لە مارکس مەگرن

وەها بنیاکانە لە ئایین دواوە چونکە کابرایێکی کەمزان بوو، ئاگاداری مێژووی کۆن و نوێ نەبوو، هەر هێندەی لە باری ئایینەوە دەزانی کە بەچاو دەیدیت... باوەڕ ناکەم هیچ ناحەزێکی مارکس بە چاوی کراوەوە تا ئەم رادەیە پایەی مارکس لە پلیکانەی زانایی و فەیلەسوفایەتی بهێنێتە خوارەوە، هەر نەبێ لەبەر حورمەتی خۆی نەکا لە نەزەر خەڵق بە مرۆڤێکی نیوەخوێندوو دەرچێت چونکە کەسی خوێندەوار نییە نەزانێ مارکس چەند شارەزای مێژووی بەرفرەوانی گەلان بوو بە هەموو لایەنەکانی ئابووری و کۆمەڵایەتی و ئایینی و زانستی و نازانم چییەوە.

ئەوەی من بۆی دەچم لە تەعلیلی هێندێک لەو گوتە و بیروباوەڕانەی مارکس کەوا لەگەڵ ڕاستە حیسابی زانیاری بێگوماندا ناڕوات شتێکە هیچ پێوەندی و خزمایەتی و نێزیکایەتی بە نەزانین و نەشارەزاییەوە نییە، باشتریش ئەوەیە بڵێم دوو شتە نەک شتێک، نەشم دیتوە تا ئێستا هیچ نووسینێک و قسەکەرێک باسیان بکات وەیا لە دیراسەی مارکس و مارکسایەتیدا حیسابێکیان بۆ بکات، من وا دەزانم مارکس لەبەر تیشکی دوو چرای زۆر گەش و بەتیندا نووسیوەتی: یەکەمیان ئەو ئامانجە سیاسییەی کە دەیەویست پرۆلیتاریای جیهانی لەسەر کۆ بکاتەوە، دوەمیان دانانی شوێن پەنجەی بیروباوەڕی خۆی لە هەموو ئەو باسە گرینگانەی کە شوێن پەنجەیێکی ئاشکرای لەمەوپێشی بەسەرەوە بوە، ڕێگەشم نییە لێرەدا، بە پێی پێویستی خۆ روون کردنەوە، بەدوا قسەکانی خۆم بکەوم. ئەوەندەی کە وەها یەکجار بەکورتی و خێرایی گوتیشم هەر بۆ ئەوە بوو لەلای خۆمەوە گومانی بێئاگایی و نەشارەزایی و نەزانی لەو بلیمەتە بێڕەزایە بتەکێنمەوە.

ئەگەر مارکس ئەو بێخەبەرە بووبایە کە لەسەر کردنەوەی د. زەکەریا بۆمانی باس دەکات چۆن دەیتوانی لەسەر زەقایی ماددەی پشت لە غەیب و ئایین و ڕووبەڕووی جیهانێکی زانست تێکەڕاو نوێڵێکی وەها گەورە لە بیروڕاکانی خۆی ساز بکات کە چینی هەژارانی پێ ڕاست بکاتەوە تا ئەو ڕادەیەی بەسەر دەوڵەمەند و دەسەڵاتدارانیاندا ڕاشکێنێت، بەر لە هەژارانیش هەموو رۆشنبیرانی جیهان بە خۆیەوە خەریک بکات ئیتر بە دۆستایەتی و شاگردایەتی بێت یا بە دوشمنایەتی. بەڕاستی لێرەدا مەودای قسە یەکجار بەرفرەوانە، هەمووشی بەگژ ڕایەکانی د. زەکەریادا دێتەوە. من هەر ئەوەندە دەخەمە سەر ئەوانەی تازە گوتمن کە بڵێم

ئەگەر مارکس تا ئەو ڕادەیەی د. زەکەریا دەڵێ پابەندی تەجرەبەی بەرتەسکی شەخسی خۆ بێت و چەشمەندازی بینین و فەلسەفەی هەر بابی دیمەنی بەرچاو پان و بەرین بێت. ئەوسا نەک هەر لە مەیدانی ئاییندا دووچاری چاوبەستەکێی بینینی شەخسی دەبوو بەڵکوو لە مەیدانە گرینگترەکانی ئابووری و ڕامیاریشدا هەمان چاوبەستەکێی لە خۆی دەکرد ئیتر دەبوو بڵێین ئەگەر مارکس پەنجا ساڵێک درەنگتر هاتبایە دنیا وازی لە بەشی هەرە زۆری شۆڕشگێڕایەتی خۆی دەهێنا چونکە ئەوسا تەجرەبەی لەگەڵ پرۆلیتاریایەکی زۆر جودا دەبوو لەوەی لە سەدەی نۆزدەهەمدا دیتی کە دەزانین لە پەنجا ساڵێکدا هەم چینی کرێکار ماوەیەکی درێژی لە وەدەستهێنانی مافە خوراوەکانی خۆی بڕی هەم باوەڕی گشتی تێکڕای کۆمەڵایەتی بەرانبەر مەفهوومی داد و ستەم و چاکە و خراپە لە هەموو مەیدانێکدا بەرەوپێشەوە گۆڕا. بەو پێیە دەبوو مارکس تیۆریی خەباتی چینایەتی وەها دەست لێ بدات و تەعدیلی تێدا بکات کە ببێتەوە بەرنامەیێکی «اصلاحی» و ئەو ئەزەلیەت و ئەبەدیەتی کە بۆ فەلسەفەکەی دیاریکراوە و پێڕەوەکانی ئێستا بۆی گەرمتر و بە هەڵپەترن لە سەد ساڵ پێش ئیمڕۆ، هەمووی بسڕابایەوە شتێکی تری لە جێگەدا پەیدا بووبایە زۆر جودا بێ لەوەی هەیە. هەرچەند من تاڕادەیێک بڕوا دەکەم کە تەجرەبەی شەخسی بە تێکڕایی لە پێکهێنانی باوەڕی بنجی و گشتی تەئسیری خۆی دەکات، بەڵام دوو تێبینیم لەوەدا هەیە بە نیسبەت مارکسەوە:

1. نەفسی مارکس لەوانەیە کە تەجرەبەی شەخسی سەر نەرم دەکەن بۆ پرۆگرامێک کە خۆیان حەزی لێ دەکەن [ڕێم نییە بەدوا ئیسپاتی قسەکەم بکەوم].
2. ئەگەر دەقی قسەکانی د. زەکەریا بسەلمێنین لەوەی تەعلیلی هەڵوەستی مارکسی لە ئاست ئاییندا پێ کرد، هەر ئەو ڕێگەیەمان لە پێشدا دەبێت کە هەمان پێوانە و کێشانە بۆ سەرلەبەری مارکسایەتی بەکار بهێنێت و سیفەتی «علیمانیة» لە فەلسەفەکە دارنین و پێی بڵێین ئەمە گروگاڵی بابایێکی ڕقهەڵستاوی کەمزانە.

لەگەڵ ئەمانەشدا دەبێ هەر دان بەوەدا بهێندرێ کە گوتارەکەی د. زەکەریا لە کات و جێگە و هەڵکەوتنی خۆیدا زۆر بە تەئسیر بوو چونکە بەرەی چەپ و بەرەی ڕاست بە ڕواڵەتی دۆستانەی گوتارەکە بۆ مارکسایەتی تێخیچان و هەر ئەوەندەیان لێ خوێندەوە کە بە پێی بۆچوون و شی کردنەوەی خاوەنەکەی تۆهمەی ناڕەوای لە مارکس و مارکسایەتی تەکاندوە و پاکانەیێکی دڵدەرەوەی لای مسڵمانەکان بۆ کردوە.

هەڵبەت ئەم تەرزە پەڕاندنەوە و پاکانەنەیە بە مەفهوومی «تاکتیک» تا بڵێی کارێکی سەرکەوتوە چونکە ئەوانەی لە کێشەی سیاسەتدا خەریکی زۆرانبازین پتر پەککەوتەی تاکتیکن، بیروباوەڕە فەلسەفیەکان نە هەموو ڕۆژێک لە شەڕەکەدا بە بیروباوەڕی دیکە دەگیرێت نە کەسیش ئامادەیە بیروباوەڕی خۆی بخاتە تاقی کردنەوە و ئەزموونەوە، خۆ ئەگەر هەموو ڕۆژێ دە عەیبیشی لێ بەدیار کەوێت بایی تۆسقاڵێک کار ناکات سەر پایە و حورمەت و پیرۆزیی باوەڕەکە لای پەیڕەوەکانی، بەپێچەوانە، ئەوەی من بیزانم پێڕەوە دڵگەرمەکانی باوەڕی سیاسی، بە تایبەتی مارکسایەتی، پتر پشتگیری لە لایەنە بێهێزەکان و مەیلەو سواوەکانی نەزەریەکە دەکەن پتریش هەڵمەت دەبەنە سەر لایەنە بەهێزەکان و ڕاست و دروستەکانی ئەو شتەی لەگەڵی بە شەڕ دێن. هەر لەم کولانەوە، بە چاوی خۆمان دیتمان لەو کاتانەی پێڕەوەکانی مارکس لە کوردستان دەسەڵاتێکیان گرتە دەست خەریکی ئابڕوو بردن و ڕیسوا کردنی ئەو کەسانە بوون کە لە مەیدانی نیشتیمانپەروەریدا ناو و ناوبانگێکیان هەبوو بە سەراحەتیش دەیانگوت ئێمە بۆیە وا دەکەین چونکە ئەمانە جێی باوەڕی خەڵقن عەیبی بەرچاویان تێدا نییە، خەتەری ئەوان لە دوشمنەکانی دیکە پترە کە هیچ هێزێکی کۆمەڵایەتی و سیاسییان بەدواوە نییە و عەیب و عاریشیان دیارە.

بەڵێ دەزانم سیاسەت مامڵەت لەگەڵ ئاپۆرەی خەڵقدا دەکات و زوربەی گەلیش بە نەخوێندوو و ڕۆشنبیریەوە ڕواڵەتپەرستە، بەڵام من کە هیچ جووتم لە زەویی سیاسەتدا نەگەڕێ بۆچی جڵەوی هۆشی خۆم بدەمە دەست مرۆڤی ڕواڵەتپەرستی نیاز لەخۆ گرتوو و لە پشت چاویلکەی ئەوەوە سەیری جیهان بکەم؟ بۆچی فێڵ لە خوێنەری کوردی لێ قەوماو بکەم بەوەدا کە پەردە درۆزنەکەی سەر ڕووی قسان

و بیرورایانی لێ بکەم بە حەقیقەتی ئەو شتەی لە ژێریدا شاردراوەتەوە؟ چاوبەستەکێی فێڵبازان، بگرە هەر لە شەعبەدەباز و جادوو تا دەگەتە شێخی درۆزن... تا دەگاتە پیاوی قسەلووس و خەڵق خەڵەتێن... تا دەگاتە مرۆڤی سیاسیی جەربەزە... تا دەگاتە خاوەن بیروباوەڕی فەلسەفی خلیسکێنەر هەمووی لەبەر ڕواڵەتپەرستی و سەراوبینی خەڵقەکە بە ئامانج دەگات. فێڵبازیش لە نێواندا نەبێ هەر دەبێ ئەوەندە ڕێزە لە هۆش و گۆش و مرۆڤایەتیمان بنێین، هەڵەی هەڵوەست و گوتە و بیروباوەڕ و فەلسەفان باس لێ بکەین و پێی ڕازی نەبین.

زانست هات و ڕازی نەبوو بە ڕواڵەتە شین و بەرین و بەرزەکەی «ئاسمان» و ئەنگوستی لە چاوی هەموو ڕواڵەتپەرستان نا بەوەدا کە بۆشایەتی و هیچایەتی و نەبوونایەتی ئاسمانی بەرچاوانی بە ئیسپات گەیاند و بە ناو ئەو هیچەشدا ڕۆیی بۆ ئەو ئەستێرانەی کە لە ڕواڵەتدا کەسیان پێ ناگات. جا من و تۆش بۆ دەبێ کۆمە بکەین لە دەرخستنی ناڕاستیی ئەو ڕایەی کە دەڵێ دین هەر دڵخۆشکەرەوەی هەژار بوە وەیا هەر بە ئومێدی بەهەشتێکی مەوهووم خوا پەرستراوە؟ ئەو کەسانەی کە ڕێزیشیان لەو ڕایە نادروستە ناوە بۆ دەبێ زەندەقیان بچێ لە باس کردنی نادروستییەکە؟ بۆچی خۆیان پێش من و تۆ ڕاستی مەسەلەکە نەخەنە ڕوو؟ د. زەکەریایێک ژیرانە و هۆشیارانە چاوبەستەکێیەکی فکریمان لێ دەکات و ئێمەش بە چاوی کراوەوە و بێ خواستنەوەی چاویلکەی ئەم و فەندەکە دەدۆزینەوە، بۆ دەبێ زراوڕژاو بین لە دەستیشان کردنی ڕاستیی کێشەکە؟ ئەوانەی کە سوودی بیروباوەڕیشیان لە بەسەرداتێپەڕینی چاوبەستەکێیەکەدا دەبینن بۆ نایەنە سەر باوەڕێک پەکی لەسەر چاوبەستەکێ و زیندەبەگۆڕ کردنی ڕاستی نەکەوتبێ؟ چەندە سەیرە لە چارێکی دوایی سەدەی بیستەمدا مرۆڤی خۆ بە عالم زانیوە و داواکاری داد و ڕاستی بە گوتنەوەی ڕاستیێکی بچووک قەڵس بێت و پارێزگاری ڕووپۆشی درۆزنی سەر ڕووی ڕاستی بکات! بەداخەوە ژیانی جیل لە دوا جیلی میللەتەکەمان بەسەر دەچێت و بەرەیێکی گەورە لە ڕۆشنبیرەکانمان هەر سوورن لەسەر ئەو باوەڕانەی بلۆفیان بۆ هەموو چاوێکی مەیلەو کزیش دەرکەوتوە، ئەوەی لە دڵدا ڕەخنە و توانجێکیشی لەو باوەڕە نادروستانە هەیە ناوێرێ ورتەی لە بەرەوە بێت،

ورتەش بکات جورئەتی ئەوەی نییە بە نووسین دوو دێڕان لەبارەی هەڵەبوونی ئەو باوەڕە نادروستانەوە بهاوێتە بەر ڕووناکایی.

صەد جاری دیکەش بە داخەوە دەڵێم ڕۆشنبیری سەربە لایەنی چەپی کورد پتر لە هی هەموو جیهان قولابی پەنجەکانی خۆی لە دروشم و دەقە نەزەرییەکانی بەر لە صەد ساڵ گیر کردوە وە چەمبۆڵەی لێ شل ناکاتەوە وەک بڵێی بەسەر سووری ماهی هەزاریی بە هەزارەوە▪ دەستی لە پنچکێک قەیم کردوە هەر لێی بترازێ هەپرون بە هەپرون دەبێ. ملکەچی و فەرمانبەرداری ڕۆشنبیری چەپی کورد بۆ دەقە بەرەوپاشبوەکانی کۆنینەی چەپ هەموو ئەو شەقڵە دەروێشانە و ترسنۆکانەی پێوەیە کە بە ناچاری و بە پێی بڕیاری سروشت لە سەرلەبەری ڕووپەڕەکانی ژیان و بوونی میللەتی بێدەسەڵاتی دواکەوتووی لاساییکەرەوەی هیچنەداری بێپشتیوانی پارچەکراوی وەک میللەتی کورد زەق زەق لە چاوان دەچەقێت.

کۆمیونیستی کورد شەرعییەتی بزووتنەوەی خۆی لەو دەقە کۆنانە وەردەگرێت کە ژمارەیەکی زۆر لە پارتییە کۆمیونیستیەکانی جیهان ئەوەندەیان لێ تێپەڕیون، ڕیسوا نەکردن و نەپووچانەوەی ئەو دەقانە بە بەڵگەی دواکەوتن و کۆنەپەرستی دادەنرێن. گومانت نەبێت لەوەدا کۆمیونیستی کورد کاتێک دەبیەت پارتی کۆمیونیستی فرەنسە وە یا ئیسپانیا بە گژ یەکێک لە بڕیارەکانی پارتی بۆلشەفیکی ڕووسیادا دێنەوە▪ هەموو دەماری لەشی کشت دەبێت و مووی سەری ڕاست ڕادەوەستێ و دنیای لێ وەتەنگ دێت. هەر دەڵێی کونتێبوونی ئەو زیندانە فکرییەی خۆی تێدا مەڵاس داوە ڕیسی مرۆڤایەتی و پرۆلیتاریا و پێشکەوتن و ئازادی دەکاتەوە خوری.

بێگومان تێکڕای کورد لە میللەتێکی تری دراوسێی خۆی پاشکەوتووترە، بەڵام دیسانەوە بێگومان کۆمیونیستێکی کورد لەچاو یەکێکی مللەتێکی تر یەکجار پاشکەوتووترە لە پاشکەوتوویی تاکێکی تری کورد. نەک هەر ئەوەندە بەڵکوو هەتا کۆمیونیستە کوردەکە پتر لە کۆمیونیستایەتی تێهەڵدەکشێت و پایەی لە نێوان بزووتنەوەی کۆمیونیستی جیهاندا بەرزتر دەبێت کەمتر دەوێرێ ناوی کورد بهێنێت و باشتر لەسەر میللەتێکی تر دەکاتەوە.

بێ ئەوەی ناو بهێنم دەڵێم بەرپرسێکی زێدە گەورەی بزووتنەوەی کۆمیونیست لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا کوردە و بارەها لێی بیستراوە کە کوردایەتیەکەی لێ بۆتە بار. خۆ ئەگەر واش نەڵێت و هیچ دەنگی لەبەرەوە دەر نەیەت ئەم ڕاستییەی هەر لێ بەدیار دەدات چونکە ڕۆژەک لە ڕۆژان لێی نەبیسترا لەسەر کورد بکاتەوە بەڵام میللەتی ڕەش و سپی و سوور و زەردی ڕووی زەمین نەماوە ئەم کۆمیونیستە کوردە شیوەنی بۆ نەکات و داوای مافەکانیان نەکات. ئەم خۆ بە موتەهەم زانینەی کۆمیونیستێکی کورد لە داواکردنی مافی نەتەوایەتیی کورد بە جۆرێکی سەربەخۆ، بەتەواوی لە کوردە قەومیەکەش دەردەکەوێتەوە بەوەدا کە ئەو پتر لە قەومیێکی عەرەب وەیا فارس وەیا تورک خۆی لە تۆهمەی شۆڤێنیەتی دەپارێزێ لە حاڵێکدا کوردی بێدەسەڵات ئەوەندە نەدار و کەمهێزە ناتوانێ بە درۆش شۆڤێنی بێت وەک کە بەرخ و کار هەرگیز ناتوانن هەرەشەی گۆشتخۆری و درندەیی بکەن.

سەیری پەژارەیی کورد لە چ پلەیێکی مرۆڤ تۆقێندایە، کە هەستی خۆ بەکەم گرتنی هەزاران ساڵەی ژێردەستی و نۆکەرایەتی وا لە «شۆڕشگێڕ!»ەکەی دەکات ترسی گلەمەندیی ئاغا کۆنەکانی و «هاوڕێ» تازەکانی سواری وەهم و خەیاڵی ببێت و بە تف لەخۆکردن و جنێو بە کورد و کوردستان دان تۆهمەی ڕەگەزپەرستی لە خۆی بتەکێنێت لە حاڵێکدا دەبوو، بەپێچەوانە. ئەو ئاغا کۆنانە عوزر بۆ کوردەکە بهێننەوە و حورمەتی «ڕەگەز» ی کورد بگرن، «هاوڕێ» تازەکانیش بەو لاواندنەوە و دڵڕاگرتنەی میللەتی ئیمرۆکەی کورد نەختێک لە ڕەشایی مەغدووریەتی کورد بە درێژایی ئەزەل بسڕنەوە.

هەموو ئەو خۆشکاندنەوانەی لە ڕاپەڕینەکەی 1948 ـەوە تاکو دوای شۆڕشی 1958 و ساڵانی دوای 11ی ئەیلوولی 1961 و هەتا ئێستاکەش کە بەرەی چەپی کورد لەسەر حیسابی ئابڕووی قەومایەتیی میللەتی کورد کردوەتی و دەیکات ڕاستەوخۆ لە هەستە پەستەکەی ژێر دەستی و نۆکەری و بێمافی و بێکیانی و بێسامانی و دەربەدەری پارچەکراوی و دەردە کوشندەکانی تری کوردەوە دەپەڕنەوە بۆ سەر زار و قەڵەمی بەشی زۆری «ڕۆشنبیر!» ی چەپ بەو جۆرە کە لە بەرەی چەپی هیچ میللەتێکی تردا شەبەنگیشی نییە. ڕۆشنبیری بەرەی چەپی ئەو میللەتانەی کە مەسەلەی «کوردایەتی» تێیاندا بوە بە کێشە بە دەگمەنێکی یەکجار

کەم نەبێ هەر دانیش بە مافی نەتەوایەتیی کورددا ناهێنن و جایی ئەوەی عوزری ستەمی لیرە پێشەوەی کە لە کوردیان کردوە بکەن بە دڵخۆشکەرەوەی کورد با بە درۆش بێ!! ئێمە دەبێ دەمەبەشکە بمانگرێ کە ببینین «تودە»ی ئێران دان بە بوونی کورددا دەهێنن، دان پێداهێنانێک کە ڕەنگە داگیرکەری ئیستعمار لە کوردی چاو نەبووبێ چونکە هیچی تێنەچوە و پێوەی ماندوو نەبوە و چ فەرقی نەبوە لەگەڵ دان پێداهێنان بە مافی تورک و فارس و نازانم کێ.

ئا لێرەشدا سەرلەنوێ بەرەی چەپ پەستی و بێدەسەڵاتیی میللەتی کوردی لێ دیار دەدات بەوەدا کە ئەگەر ئیستیعمار مافی میللەتێکی غەیری کوردی سەلماند چەپرۆیەکەی کورد دەڵێ خەباتی گەلان ئیستیعماری ناچار کرد مافەکە بسەلمێنێت بەڵام ئەگەر ئیستیعمار بە ڕاست یا بە درۆ باسێکی مافی کوردی کرد خێرابەخێرا بەرەی چەپی کورد بە دەمیدا دێتەوە و خراپی لێ دەدەنەوە هەر دەڵێی کورد سنووری حەیا و ئەدەب دەبەزێنێ ئەگەر وەک میللەتێکی تر باسی کرا. بگەڕێوە بۆ مێژووی 30 ساڵەی ڕابردوو دەبینی ئەم شکاندنەوەی ڕەگەزی کورد لەلایەن بەرەی چەپی کوردەوە دیمەنێکی هەمیشەیی و بە بەرینایی کوردستانە.

لە نامیلکە زۆر تاوانبارەکەی «کورد ئوممەت نییە» تا نەشیدی «ئێمە گورگین نەتەوەی گورگین»... تا «مەعاریفی قلیاسان»... تا هەڵکەندنەوەی قەبری عەلی کوردی... تا «بڵێ کوردم هەتا سەرت ببڕم»... تا دەگاتە شکاندنەوەی شێخ لەتیفی شێخ مەحمود لەکاتی سەردانی وەفدێکی عیراق لە «خرۆشچیف» لەلایەن شووعیێکی کوردەوە لەوەدا کە شێخ لەتیف باسی میللەتی کوردی هێنابوە ناو قسانەوە... تا دەگاتە خوشامەدی کردن لە فڕۆکەی مێگی ڕووسی لەلایەن «چەپی» یەکانەوە کە دەهات لە سەردەمی عەبدولکەریم قاسمدا بۆمباردمانی کوردستانی دەکرد... تا بەرهەڵستی کردنی بێوچانی کۆمیونیستەکانی کورد لە پێکهێنانی دامەزراوە دیمۆکراتە کوردستانیەکان هەر لە سەرەتای بەرپابوونی شۆڕشی چواردەی تەمووزەوە... تا چەندین تێکهەڵقژانی چەپەکان لەگەڵ ئەوانەی بە خۆیان دەگوت قەومی لەسەر داوا کردنی مافەکانی سەربە قەومایەتی کورد...

ئەمانە و هەرچی وەک ئەمان هەیە لە هەڵوەستی «چەپ» ی کورد لە ناوەوە و دەرەوەی عیراق هەمووی زادەی دایک و باوکێکی ئیعتیبارین:

1- خۆ بەکەم زانین لە ئاکامی تێشکانی چەندین هەزار ساڵەی میللەتی کورد.

2- خۆ دانەپاڵ بزووتنەوەیێک کە یەکەم هۆی شانازی لە کوردایەتیدا نابینێت بەڵکوو لە «اممیة» دا دەبینێت. با ئەو بزووتنەوەیەش هەر ببڕای ببڕای دانی بە کوردیەتیدا نەهێنابێت.

بەڕاستی دەشێ ئەم دان پێدانەهێنانەش هۆیەکی بنجی بێت لە کزبوونەوەی هەستی شانازی کردن بە نەژادی کورد لای کۆمیونیستی کورد، بەوەدا کە ئەو لە پێشەوە خۆی بە «اممیة»ـەوە لکاند و کردی بە کێشانە و پێوانەی چاکە و خراپەی شتان، «امّمیة»یش مەرحەبای لە کوردایەتی نەکرد یەکسەر کوردایەتیەکە لە بەرچاوی کۆمیونیستەکە دەپووچێتەوە و لە سەبەبە هەرە گەورەکەی شانازی پێوەکردن بەتاڵ دەبێ. هەر ئەم ڕاستییەیە وا دەکات کۆمیونیستی کورد شانازی بە بزووتنەوەی پرۆلیتاریای هەموو جیهانی دەرەوەی کوردستان بکات وەک ئەوەی کە بەرهەمی بزووتنەوەکە ڕاستەوخۆ برژێتە عەنباری ماڵی خۆی، وەیا باوک و برای خۆی ڕابەری بزووتنەوەکە بن.

تاریکترین ڕووپەڕەی ئەم هەستە پەستەی «کورد بەکەم زانین» ی مێژووکرد کە بەم دواییە لە بەرەی چەپی کوردی بەدیار دابێت ئەوە بوو کە لە ژمارە 42 ی تشرینی دوەمی ساڵی 1976 ی گۆڤاری «ڕۆژی کوردستان» لە ژێر عینوانی «سەرکۆتەڵەکەی ماوە پێمانی بهارن» بەناوی «دنیادیدە»وە بڵاو کرایەوە. کەم وەها ڕێک دەکەوێت دەست و قەڵەمی مرۆڤ تا ئەو ڕادەیە بە ئازادیی و بە ورشەی لە خۆبایییبوونەوە ئابرووی خەڵق بتکێنێت.

بابایێکی وەک من هەرچەند لە گۆشەی لاتەریکیی خۆمەوە تێکەڵ بە چەندوچۆنی سیاسەتی ناوەوە و دەرەوەش نەبم ئەوەندەم پەیوەندیی بە دنیاوە هەر دەمێنێت کە فەرقی دەمی تیغ لەگەڵ نەرمایی چەپکە گوڵ بکەم. وا بزانم هیچ کوردێکی خاوەن دڵ و دەروونیش نییە وەک من هەستی ئەو دەمەتیغەی نەکردبێت: دەک ماڵی بێدەسەلاتی و ئیفلاسی مەعنەوی برمێت چ گاڵتەیێک بە کەرامەتی مرۆڤ دەکەن.

تۆ سەیری، لە نێوان چەند هەزار ملیۆن ئادەمیزادی دوور و نیزیک و بێتەرەف و دوشمندا هەر نووسەری کورد ڕێ بەخۆی بدات چەنگاڵ لە شرە سەرپۆشی سەر

حەیا و شەرم و ڕووەتی بەشێکی میللەتەکەی خۆی، ئەو بەشە چی دەبێ بابێ، گیر بکات و زڕاوزڕ دای بدرێت. تاکە یەک نووسەری عەرەبی عیراق شتێکی وەها بێحورمەتی لەو قوتابیانە نەگرت، نەخێر هەر هیچی بێحورمەتی پێ نەگوتن.

نەک هەر ئەوەندە و بەس؛ ئەوەی خەڵق دەیبینێتەوە ■ لە ڕەفتاری حکومەتی عیراق بەرانبەر قوتابی کورد شتێکی زۆر جودایە لە بێحورمەتی بەوەدا کە هەمیشە خەریکە بیانگێڕێتەوە بۆ خاک و مەفتەنی خۆیان. خاوەنی ئەو نووسینە بێحورمەتە زۆر چاک دەزانێت قوتابیی کورد وەک پوورەهەنگی هەنگوین لێ گیراو کە هەنگەکانی پەرت و بڵاو و بێدەرەتان بێرە و بەوێدا پەلەفرە دەکەن، ئەوانیش لەسەر شێواویەکی بێسەروبندا پەلەکوتکەی خۆگرتنەوەیانە، خۆشیان پێ ناگیرێتەوە... با من قسەی خۆم ڕابگرم تاکوو بەشێکی دەقی ئەو گوتارە لێرەدا تۆمار بکەم، ئەو بەشەی قسە هەرە نازدارەکانی تێدایە.

گوتارەکە نەختێک بە زۆرزانی قسەی پەندامێزی تێکەڵ بە زەهرە کوشندەکەی کردوە بۆ ئەوەی، کوردی گوتەنی، لە ڕوو دانەمێنێت بەڵام چ عوزران دروست ناکات و هەر دەمێنێتەوە وەک نموونەی شەرمهێنەوە ■ و بەخۆدا شکێنەوەی مرۆڤی خاوەن دڵ و دەروون. فەرموو بخوێنەوە:

*«... ئێمە داخ بۆ ئەم جۆرە مرۆڤانە ناخۆین، چونکە ئامادەن شوێنی هەموو «عیو»یکی دوژمن بکەون بەڵام داخی ئەو لاوە خوێندەوارانە دەخۆین کە لە بەینی بەرلینی ڕۆژاوا و فرانکفۆرتدا سەریان لێ شێواوە... دەترسێین وەکوو سەگەکەی بەینی «تەپەلو» و «لەیلان»یان لێ بێت. لەم قسەیەدا هیچ نیازی ڕووشکێنی کەس نین. بەڵام لە کوردەواریدا گەلێ قسەی نەستەقی وا هەن کە هەر یەکە سەد عەقڵی لێ وەردەگرین:*

*تەپەلو و لەیلان دوو دێن نزیکی شاری کەرکووک. سەگێک دەبێت بۆ دەنگی دەهۆڵ و زۆرنا زۆر گوێی سووک دەبێت، دەزانێت دەهۆڵ و زورنا مانای شایییە، شاییش خواردەمەنی چەوری تێدایە. لە هەر یەکە لەم دێیانە، دەنگی دەهۆڵ دەبیسێت خۆی بۆ بەر ئەدات...*

*دوو چاوەشی قۆشمە و بلیمەت هەر یەکە لە ماڵێکی ئەم دوو دنیە خۆیان دەشارنەوە، کە سەگەکە لە تەپەلو دەبێت چاوەشی لەیلان زرمە لە دەهۆڵ هەڵئەستێنێت سەگەکە وا دەزانێت شایی لە لەیلانە و تاو ئەدات بۆ ئەوێ، کە ئەگاتە لەیلان ئەم بێ دەنگ دەبێت و چاوەشی تەپەلو لە دەهۆڵ ئەدات، سەگەکە بە تاو دەگەڕێتەوە بۆ تەپەلو. سەگەکە ئەوەندە دەبەن و دەهێنن دەیپڕوکێنن...»*

ئەم قسە بێحورمەتانە کەوا هیچ دوودڵی و زمانگرتن و لێ کەم کردنەوەی تێدا ڕەچاو نەکراوە تا ئەو ڕادەیەی دەتوانم بڵێم بە دڵخۆشی و هەستی حەسانەوەشەوە دەربڕاون لەلایەن چ دوشمنێکەوە لە کورد نەگیراون، تەنانەت دەسەڵاتدارەکانی بەرلین و فرانکفۆرتیش شتی وەها سووکیان بەو قوتابیە کوردانە نەگوتوە کە سەر بەو وڵاتەن بەلای خاوەنی گوتارەکەوە بە هەشتی سەر زەمینە. بێگومان چ کوردێکیش بە دڵیدا نایەت ئەو تەرزە سووکایەتییە بداتە پاڵ قوتابیی میللەتێکی دیکە، خۆ خاوەن گوتار لەبەر پاکانەی خۆی لە توهمەی ڕەگەزپەرستی هەر نزیکی شتی وەها «بڤە» نابێتەوە.

ئێمە کە هەر خەریک ببین گوێ بگرینە دەهۆڵی تەپەلو و لەیلان با ئەوەندەش بە بیری خاوەن گوتار و سەرپەرشتیکەرانی «ڕۆژی کوردستان» بهێنمەوە کە نوقسانیەکی زۆر گەورە لەو وێنە ناحەزەدا هەیە: کە قوتابیی کوردی ئەورووپا بوون بە سەگی نێوان تەپەلو و لەیلان بۆچی ئەوەش نەگوترێ کە وا لە وڵاتە سۆشیالیستەکانیش دەهۆڵ و زورنایەک لە کۆنەوە بۆ قوتابیی کورد دەگوترێ، بەو پێیە ئەوەی بۆ کوردەکە نراوەتەوە شتێکە وەک «سێ ڕسکانە» لێشم بسەلمێنن کە دەڵێم «لەم قسەیەدا هیچ بە نیازی ڕووشکێنی کەس نیم».

وا دەزانم قوتابیەکانمان بدرێنە دەست دوشمنەکانیان دوو قازانجی مناسب دەستگیر دەبێت: یەکەمیان ئەوەیە قوتابیەکان بە دەست دوشمنەوە پتر دەحەسێنەوە لەوەی دەست و زمانی مرۆڤی وەک خاوەن گوتارەکە پێیان دەکات. دوەمیان ئەوەیە هەر نەبێ کەفوکوڵی دڵە ڕق هەڵگرتوەکەی کوردێک دژی ئەو لێقەوماوانە بۆ بەرچاوی

دۆست و دوشمن سەر ناکات، بایی بادانەوەی سبە رۆژیش مەیدانی سیاسەتگۆڕی بۆ خاوەن گوتار بەهەموارتری و بێ کۆسپتر دەمێنێتەوە■ وەک دەشزانین زۆر جاران مەیدان گۆڕیمان لێ دیتوە تەنانەت بەشێک لەوانەی. ناوناوە، پەنای بردوونەتە بەرێ لەو ناپاکانە بوون شوێن هەموو «عیو» یێک دەکەون. لەعنەتیان لێ بێت.

خوێنەر دەبینێ، هەڵسووڕ و داسووڕمان بە دەوری «فکر» دوە چەند بە ئاسانی رووبەڕووی هەڵوەست و ڕووداو و واقیعمان دەکات. هەر دەڵێی بزووتنەوەی نوقتەیە خەت دروست دەکات و خەتەکەش وێنەی ئالقە و سێسوچ و چوارگوشە و شکڵەکانی تری ئەندازە■ دەکێشێت و بە دوا ئەویشدا «بارست» پەیدا دەکات. ئەوەی ڕاستیش بێ موناقەشەی فکر کە هەر لە جغزی فکری ڕووتدا بمێنێتەوە■ سوودێکی چەندانی نابێت: ئێمە دەبێ فکر بە ناو هەڵکەوت و ڕووداو و هەڵوەستدا بگێڕین بۆ ئەوەی یەکتر یەکالا بکەنەوە■ ئیتر یا فکرەکە ڕاست دەردەچێت و چەوتیی شتە مادديیەکان دەردەخات. یا بە پێچەوانەوە■ شتە ماددییە ڕەق و زەقەکان پووچەڵیی فکرەکە بە ئیسپات دەگەیەنن، دیاریشە مەبەست لە «چەوتی»ی شتی ماددی نەبوونی شتەکە نییە چونکە شتی چەوت وجوودی هەیە بەڵام دەشێ بگوترێ دروست نییە، ڕاستگۆ نییە. بەرژەوەندی تێدا نییە، مرۆڤانە نییە، لەگەڵ زوربەی گەلدا نییە، پاک نییە... هتاد. هەرچی «فکر»ەکەیە لەوانەیە سەرەڕای ئەو هەموو عەیبانەی لە ماددەدا هەبوو عەیبێکی تری زێدە گەورەشی تێدا بێ ئەویش دەرنەچوونی ڕاگەیاندنەکان و بەڵێنەکان و ئومێدەکانیەتی.

فکر کە بنگەکان و پێشەکییەکانی مەوهوم وەیا درۆزن بوون دەبێتەوە برای نامەوجوود... بەهەمەحاڵ دابڕینی فکر لە واقیع کەڵک لە فکرەکە دەبڕێ و وای لێ دەکات بچێتە ڕیزی دامە و شەترەنج کە زانین و نەزانینی لە سنووری خۆیدا دەمێنێتەوە■ و هیچ شتان بە ئیسپات ناگەیەنێت و هیچ تاریکییان ڕوون ناکاتەوە و هیچ درۆیان لە کەس سپی ناکاتەوە... هەر هیچ ناکات. بێگومان ئەم نیازەی ئەزموونی واقیع و هەبوونی ماددییە وام لێ دەکات بە دوا ساغ کردنەوەی ئاکامەکانی ئەو بۆچوونەی بەیەکدی گرتنی دیوانی نالی و حاجی بکەوم تا بزانین

ئایا ڕاستە لە معادلەی «سروشت + مرۆڤ» دا مرۆڤ لایەنە کارتێکراوەکەیە و سروشتیش کاریگەرە؟ ئایا دەوروبەر و مادده ئاغایە مرۆڤەکەش نۆکەر؟

دەزانم هەندێ ئەدیب کە حەز لە «تحلیلی ماددی» دەکەن لەوانەن پەسندی ئەو بەیەکدی گرتنەی دیوانی نالی و حاجی قادرە بکەن بەو جۆرەی کە کردم، چونکە لە ڕواڵەتدا بەیەکدی گرتنەکە ئەوە دەسەپێنێ کە «مادده» زاڵە بەسەر «فکر»دا، ئەدی ئەوە نییە تێکەڵبوونێکی سەرەتای عومر لەگەڵ گژوگیادا شاعیرێکی وەک «نالی» کرد بە پسپۆڕی نەبات؟ مانەوەی حاجی لە نێوان عەشرەت و کۆچەر و بەهارەهەواردا کردی بە ساحیر لە کێشانی وێنە ئەو ژیانە؟ لە زاهیردا ئەمانە بەڵگەی تازەن دەچنە ڕیزی زنجیرەی هەزار ئاڵقەی بەڵگەکانی دیکە «نظري و تجريبي»یەوە کە بەڵگەخانەی فەلسەفەی ماددی دەوڵەمەند کردوە.

خوێنەر ئەگەر زیهنی خۆی لە قسەکانم نەخلیسکێنێ دەزانێ من نامەوێ مادده ڕووت بکەمەوە لەو بایەخەی کە هەیەتی و لەو دەورەی لە عەمەلیەتی بوون و ژیان و گۆڕاندا دەیبینێت. ئەوەی من مەبەستمە بەیەکدی گرتنی دەوری مرۆڤە لەگەڵ دەوری مادده لەو عەمەلیاتەدا بۆ ئەوەی چەندوچۆنی هەردووکیان لە قاڵبی ڕاستەقینەی خۆیدا دابنێین. دەمەوێ بزانین لە تەفاعولی مرۆڤ لەگەڵ سروشت کە بنەمای هەموو ژیان و بەرەوپێشچوونێکە ئایا کاریگەری یەکەم مرۆڤەکەیە یا ماددەکە؟ ئایا مرۆڤ کە دێت و دەچێت و ڕاو دەکات و دەچێنێت و نەوت دەردەهێنێت و فڕۆکە بەرەو بڵندایی دەبات و بۆ بنی دەریا قووڵ دەبێتەوە و فابریقان دادەنێت و هەنگوین لە هەنگ دەستێنێت و هێزی ئاو و با و کارەبا و ئاتۆم بەکار دەهێنێت و مرۆڤی دیکە دەکوژێت و دەیگرێت و دەیفرۆشێت (و دەشی لاوێنێتەوە) و ملیۆنەها شتی چاک و خراپ و نە چاک و نە خراپ دەکات خۆی کارتێکەر و ئیرادەتمەندە یاخود بووکەشووشەیەکی کۆککراوە بەدەست ئەو شتانە و ئەوان کارتێکەر و کاریگەرن، مرۆڤیش کارتێکراو و بێ ئیرادە؟

ئێمە ئەگەر لەو پرسیارەدا مەسەلەکە بە لای مرۆڤدا بشکێنینەوە زەرەر لە کەس و لە چ لایەنێک نادەین چونکە «مادده» - بە هەموو جۆرەکانیەوە - هیچ داخوازییێک و مافێکی کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی نییە بە کز کردنەوەی دەوری لەم جیهانەدا ئەو مافانەی کەم ببنەوە، بەڵام کە هاتین و لە بایەخی ڕاستەقینەی دەوری

مرۆڤمان کەم کردەوە بە خۆی و هەموو داخوازیەکان و مافەکان و ئارەزووەکانیەوە دادەشکێت و لەکیسی دەچێت و لێی کەم دەبێتەوە چونکە لە کاتی دیار کردنی پشکی مرۆڤ لەو خێر و خۆشیەی کە کۆمەڵایەتی پێکی دەهێنێت. ئەو لایەنە دەسەڵاتدارەی کە دابەش کردنەکەی بەدەستەوەیە بایی کۆبوونەوەی دەوری مرۆڤ لە عەمەلیەتی بەرهەمهێنان و بەرەوپێشچووندا لە پشکەکەی دادەلەنگێنێت و بۆ ئەو مەبەستانەی خۆی حەزیان لێ دەکات گلیان دەداتەوە. لەگەڵ ئەم فێڵە ماددییەدا ڕێی ڕازینەبوونیش لە مرۆڤەکە دەبڕێتەوە کە ئەمەیش هەر جۆرێکە لە داڵەنگاندنی پایەی مرۆڤ لە مەیدانی ئازادیی بیروباوەڕدا.

لەبەر ئەمە و لەبەر گەلێ هۆی تر کە هەموو ڕاستەوخۆ لە چاوەدێری کردنی سوودی مرۆڤەوە هەڵدەستنەوە دەبێ ئاگادار بین هەرگیز کێشانە و پێوانەمان بەرەو مادده و پشت لە مرۆڤ نەبێت. لە سەردەمەکانی کۆندا بە ڕاشکاوی ماددەی مردوو لە شێوەی بوتدا لەلایەن مرۆڤەوە دەپەرسترا، با ئێمە شتێکی وەها نەکەین لە ڕێی فەلسەفەوە سەرلەنوێ مرۆڤ بکەینەوە بە بوتپەرستێکی مۆدیلی سەدەی بیستەم...

لە زەمینەی بەیەکدی گرتنی دەوری مرۆڤ و مادده لەسەر ئەم ئەرزەدا، تا ئەوەندەی بگوترێ مرۆڤ، یاخود فکر، ناتوانێ لە بۆشاییدا هیچ بەرهەمێکی هەبێت، نە ماددی نە عەقلی، چ جۆرە بەرهەڵستێکم بەدڵدا نایەت. دەشتوانم لەو گوتەیە زیاد کەم و بڵێیم بێ مادده هۆش و مرۆڤیش هیچیان پەیدا نابن تاکوو باس لە بەرهەم و دەوریان بکەین، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا دەبێ بزانین کە گوتەی وەها بەدیهی هەموو فەلسەفەکان لەسەری ڕێک کەوتوون، هەندێ خەیاڵبازی ئایدیالیست نەبێ کە بەرەو ئەودیوی مادده بۆ «مطلق - ڕەها» تێهەڵدەکشن و جیهانێکی وەهمی لە «وێنەی زیهنی» دروست دەکەن و بە دەوری ئەو وێنەیەدا دەمەتەقەی مەنیتیقی نەزەری هەڵدەستێنن و چەکبەردەی ئەو دونیا مەوهوومە بۆ ناو جیهانی خۆمان دەهێننەوە.

لەو تەرزە ئایدیالیستە نەبێ زووربەی خاوەن فکران هەر لە ماددیەتی مولحیدەوە تا دەگاتە جەرگەی ئایین دەڵێن تا «زانراو» نەبێ «زانین» نابێ. مەلاکانی ئیسلام بەر لە هەزار ساڵ زیاتر گوتویانە «حقایق الاشیاء ثابتة والعلم بها متحقق». تەنها جوداوازیەک هەبێ لە نێوان ئایینپەرست و مرۆڤی مولحید لەم مەیدانەدا ئەوەیە کە

پیاوە ئایینییەکان باوەڕیان بەوە هەیە کە ئەگەر خوا بیەوێ دەتوانێ هەرچی زانستی جیهان هەیە، هی لێرە بەپێشەوە و هی لێرە بەدواوە کە وا جارێ پەیداش نەبوە، بخاتە مێشکی نەخوێندەوارێکەوە. ئەم قسەشیان شتێکی چاوەڕوانکراو▪ لە باوەڕهێنان بە خوا چونکە کە خوا هەبێ دەبێ هەموو شتێک بزانێ با جارێ شتەکەش پەیدا نەبووبێ لەو ڕووەوە کە پێویستە زانینی خوا نوقسانی تێدا نەبێت دەنا بەشی خوایەتی ناکات. چەند سەیرە خوا عیلمی دواڕۆژی نەبێت ئیتر ئەوەیش وەکوو من و تۆ لەنکاو بەسەر شتاندا بکەوێت.

پیاوی ماددی تارادەیێک عیلمی پێشەکی لە داهێنەر (مخترع) دەسەلمێنێ و دان بەوەدا دەهێنێ کە دەبێ داهێنەر پتر لە خەڵکی تر بزانێ فڵانە مەکینە و فیسارە دیاردە چ دەکەن و چییان بەسەر دێت، دیارە کە هات و باوەڕی بە خوا پەیدا کرد دەبێ بایی دەسەڵاتە بێسنوورەکەی خوا عیلمی بێسنوریشی لێ بسەلمێنێ.

من لەم قسەیەمدا مەبەستم نییە لە جیاتی پیاوی ئایینی بەڵگەی هۆشەکی (عقلی) بۆ عیلمی خوا پەیدا بکەم. داواش لە مولحید ناکەم ئیمان بە بوونی خوا بهێنێت کە دەزانم نە زاناکانی ئایین پەکیان لەسەر بەڵگەهێنانەوەی من کەوتوە نە مولحیدیش ئەوەندە خۆشجڵەو▪ بە دوو قسەی وەها بەپەلە قەناعەتی خۆی بگۆڕێت. مەبەستی من ئەوەیە بڵێم، لە دەرەوەی جغزی خوایەتیدا، پیاوی ئایینیش هێندە ماددییەتەی لایە کە بڵێ بێ «معلوم» چاوەڕوان ناکرێ «علم» هەبێت.

لە ئاست ئەم بەدیهیەدا تێبینیەکم هەیە نابێ چاوی لێ بپۆشم: دەزانم گوتەی «بێ بوونی «زانراو» مومکین نییە «زانین» هەبێ» ئەلف بێتکەی قسەی مەنتیقییە و هێندە سادە و سافیلکە و تەنکە کەسی پێ سوودمەند نابێت. لێرەش بەدواو▪ دەبینی من لە بەیەکدی گرتنی دەوری هۆش لەگەڵ ماددە لایەنی هەبوونی ماددە و پەک کەوتنی هۆش لەسەر ئەو هەبوونەم لە حیسابان سڕیوەتەوە و هەرگیز لێکدانەوەکەم لەسەر ئەوە هەڵ ناستێنم بڵێم ئەگەر ماددە نەبا هۆش نەدەبوو یاخود نەیدەتوانی بیر لە هیچ شتێک بکاتەوە چونکە هۆشیش هەیە و ماددەش هەیە و لەو هەبوونەدا پێکەڵپێکن... بەڵێ ئەمە شتێکی زۆر ڕوونە و نابێ لە موعادەلاندا «هەبوون» بکرێ بە دیاری بۆ لایەنێک و لەوی تر بسێندرێتەوە. بەڵام ئەوەی سەرنجم ڕادەکێشێت لەو نرخاندنەی کە بەعادەت بیری ماددی لە ڕووداوی

مێژوویی بەکاری دەهێنێت شتێکە وەک ئەو بەدیهیەی «ئەگەر نەبوویا...» یەیە کە تازە پووچاندمانەوە: زۆر جاران مێژوونووسی (بە اصطلاح ماددی) دەوری تاک لە ڕووداوی مێژوویی دەپووچێنێتەوە بەوەدا کە دەڵێ ئەگەر گەل نەبا تاکەکە هیچی پێ نەدەکرا هەرگیزیش خۆی لەوە ناگایەنێ ئایا گەلە بەستەزمانە زۆرلێکراوەکە چ دەسەڵات و ئیرادەییێکی هەبوو لەو ڕووداوەدا؟ ئایا بە خواهشتی خۆی دەبوو بە عەسکەر و تاوی دەدایە بێتاوانان و لە شەڕدا دەیکوشتن وەیا بە زەبری قەمچیی مزە و هەستە و پیتاکی لە بێدەسەڵاتان دەستاند بۆ زۆردارەکەی کە سەربازیی بۆ دەکرد؟ ئەم تێبینییە زۆر جاران یەخەمان دەگرێتەوە، با جارێ بچینەوە سەر ڕچەی لێکدانەوەکەمان، لە بەیەکدی گرتنی دەوری هۆش و سروشت...

بە خەیاڵ یەکێک لە تاریکستانی ئەودیوی کاکێشان خەڵق بکە، هەڵبەت ناتوانێ شیعر هەڵبەستێ و گۆرانی بڵێ و بیر لە تەڵاق کەوتن بکاتەوە، بەڵام حیکایەتی پێوەندی هۆش بە ماددەوە و زاڵیەتی یەکێکیان بەسەر ئەوی دیکەدا بەو دوو سێ ڕستەیە تەواو نابێ و ڕاستی مەسەلەکە لەوەندەدا دەرناکەوێ. هەروەک لە بەتاڵاییدا هۆش [واتە مرۆڤ] کار ناکات، بەبێ هۆشیش هەرچی سروست هەیە بە ئەزەل و ئەبەدیەوە و دەستوورات و هێزە نهێنیەکانیەوە ناتوانن یەک خاڵ بنووسن... یەک وشە بڵێن... یەک هەڵپەرکێ ڕێک بخەن. هەموو ئەو شتانەی پەکیان لەسەر هۆش کەوتوە و بێ بوونی ئەو پەیدا نابن سروشت لە هەموویاندا بێدەسەڵاتە نەک هەر بەو مانەیەی کە نەتوانێ بیانکات، بگرە لە شێوەی «هێزەکی، وجوود بالقوە، Potential»[1] یشدا وێنەی مەوهوومی ئەو شتانە لە سروشت پەیدا نابێ.

---

[1]- زاراوەی «بوونی هێزەکی - وجود بالقوة - Potential» بە کورتی ئەوە دەگەیەنێ کە شتێک وەیا ڕووداوێک وەیا وێنە ▪ هەڵکەوتێک ئیحتیمالی پەیدابوونیان هەیە بەڵام جارێ کات ▪ باری دەرکەوتنیان نەهاتوە وەک ئەوەی قابیلیەتی «ئاخاوتن» بە شێوەی «هێزەکی» لە منداڵدا هەیە بەڵام دەبێ بگاتە تەمەنی توانینی قسەکردن ئەوسا لێی بەدیار دەدات ▪ بوونەکەی دەبێتە «بوونی کردەکی - وجود بالفعل».

من کە دەڵێم «ئەو شتانەی پەیدابوونیان بە هۆش بەستراوەتەوە بەر لە پەیدابوونی هۆش بوونی هێزەکیشیان نییە»، مەبەستم ئەوەیە کەوا ئەو «ماددە»یەی فەیلەسووفە ماددییەکان بۆ ئێمەیان باس کردوە لە خۆوە ناتوانێ لە پێشەوە مشووری ئەو بوونە هێزەکییە بخوات چونکە ئیرادە و ئیدراکی نییە نە هەست بە خۆی بکات و نە «خەریک» بێت بەو شتانەوە. هەروەهاش خاسیەتی وەک زیندوەتی و ئیرادە و هۆش کە بوونی هێزێکییان لە ماددەدا نەبوو، مومکین نییە لە هەناوی ماددەی مردوودا وردە وردە بە تێپەڕینی کات بڕسکێن چونکە لە نوختەنەزەری «نەبوون»ـەوە دەقیقەی ئێستاکە و دوای ئەو و دواتر و هەتا کۆتایی میلۆنەها دەقیقە هەموویانە وەک یەکترن هیچ تاکێکیان ناتوانن شتێک پەیدا بکەن کە ئەوی بەر لە خۆی پێی پەیدا نەکرابوو دەنا دەبێ بڵێین هێزێکی سیحری و غەیبی لەو تاکەیاندا هەبوو کە ئەمە دژی هەموو بیرکردنەوەیێکی ماددییە.

ئەو فەیلەسووفانەی دەڵێن ماددە لە فڵانە پلەدا و لە فڵانە باردا قابیلیەتی «ژیان»ی لێ پەیدا دەبێ سیفەتێکی نامەوجوود بۆ ماددەکە لە غەیبەوە دەخوازنەوە [ئەمەش جەرگەی میتافیزیکایەتییە] کەچی پێشینیەکانی نەزەریەی ماددی موتلەق چ جێگەی پەیدابوونی سیفەتی غەیری کیمیایی و فیزیایی و سروشتی کە هەموویان خاوەن «بوونی کردەکی- وجود بالفعل»ن تێیاندا نابێتەوە چاوەنۆڕیش نابێ ئەو فەیلەسووفە دەنگ دلێرانە هێندە بەناچاری هەنگاوی وەها میتافیزیکی بەرین و کوڵدەرانە بهاوێژن. هەر دەڵێی لە کاری خۆیان بە تالووکەن و دەیانەوێ خێرا خۆیان و نەزەرەکەشیان لە دوودڵی و نەسەلماندن ڕزگار بکەن. فەیلەسووفی ماددی کە نەسەلمێنێ «خوا» ئەو بوونە هێزەکیەی لە ماددەدا خەلق کردوە دەبێ بسەلمێنێ کە ئەو ماددەی تا ئێستا قسەی لێ کراوە هەر بە جارێ لێی هەڵناسێ بەرەبەرە خاسیەتێک لە هەناوی خۆیدا بڕسکێنێ کە پێشتر وجوودی نەبوە...

تەعلیلی بەدیار کەوتنی خاسیەتی غەیری سروشتی و کیمیایی و فیزیایی وەک زیندوەتی و هۆش و ئیرادە لە ماددەی مردوودا دەبێ لە یەکێک لەو سێ ڕێگایەوە بچێتە زیهنی ڕووناکەوە:

- یا دەبێ بگوترێ «خوا» ماددە و خاسیەتەکانی دروست کردوە.
- یاخود لە ماددەدا قابیلیەتی پەیدا کردنی هۆش و ژیان و ئیرادە هەیە کە ئەوسا ماددەکە خۆی جێگەی خوا دەگرێتەوە.
- یاخود ماددە لە زیمنی «مادییەت»ی خۆیدا قابیلیەتی وەهای هەیە کە تا ئێستا فەلسەفەی ماددی و زانست لەبەر غەلەبە کردنی ماددییەتی ئالیی و مردوو بەسەر قەناعەتیاندا بۆی

بێ مرۆڤ، ئەوەی چالاکیی «طبیعی» ماددەی مردوو و زیندووی ڕوەک و ئاژەڵ هەیە. لە سروشتدا پەیدا دەبێ: گیا دەڕوێت، بوومەلەرزە جیهان دەهەژێنێت، باران دەبارێت، شێر مامز ڕاو دەکات، مانگ و ڕۆژ دەگیرێن، ساڵ تێوەردەسووڕێتەوە... بەڵام کە مرۆڤ نەبێ هەرچی دەریا و کێوە بەرزەکان و بیابانەکان و فرتەنەکان و ڕۆژ و مانگ و ئەستێرەکان هەیە ناتوانێ یەک تەقەڵ لە پینەی پێڵاوێک بدات... پێڵاو نابێ تاکوو پینە بکرێ... پینە نابێ تەقەڵی لێ بدرێ... فکری تەقەڵێش لە فەرهەنگی سروشتدا وجوودی نابێ.

لەم ڕووبەڕووبوونەی ماددە و هۆش، لەبەر تیشکی بوونی لایەکیان و نەبوونی ئەوی دیکەدا دیتمان هەر یەکەیان لە مەیدانی خۆیدا «فەرمانڕەوا»یە. بەڵام دەبێ ئەوە بزانین کەوا پەک کەوتنی هۆش لە سەر هەبوونی «ماددە» بە خواهشتی ماددەکە نییە: ماددە ئاگای لە هۆش و لە خۆیشی نییە تا بیەوێ پەکی بخات. هەر لە بنەڕەتدا چ خواهشتی نییە، ماددە بێئیرادە و بێئاگایە ئەگەر هێزێکی خاوەن ئیرادەی دەرەوە ماددە بەگژ مرۆڤ وەیا غەیری مرۆڤیدا نەهێنێ لە خۆوە بە پێی ئارەزۆ و خواهشت ورتەی لەبەرەوە نایێ بە ڕەزامەندی و بە پێناخۆشبوون... بە هێشتن و بە نەهێشتن... بە کردن و بە ڕێگە لێ برینەوە. ئەوەی بە پێی دەستووورە ئەزەلیەکانی ماددە ڕوو دەدەن لە خۆوە بێ تەدبیر و بێ خوازی ماددە ڕوو دەدەن. کە هۆی ڕوودانیشیان پەیدا بوو دەبێ هەر ڕوو بدەن، بەڵام مرۆڤ لەتەک سروشتدا و لەتەک ئەوەی بۆ خۆشی دەیکات وەها ناچار و بێدەسەڵات نییە: مرۆڤ دەتوانێ بکات دەشتوانێ نەکات.

هۆشی مرۆڤ بەرهەمێکی میکانیکی و ماددی ڕووت نییە وەک سەعاتی کۆککراو بە شێوەیێکی ئالی مرۆڤەکە بخولێنێتەوە و بیوەستێنێت... ئاگر هەر گەرمە...

---

نەچوون وەیا نەیان سەلماندوە، کە ئەمەش قبوڵ کرا هەموو بینین و بۆچوون و بنەمای فکری و تصوراتی ماددی دەبێ لە نوێوە هەڵنرێتەوە چونکە کاریگەرێکی نوێ دێتە ناو حیسابی لێکدانەوەی «ماددی»یەوە کە هیچ حیسابی بۆ نەکراوە.

تا ئەوەندەی زانست و لێکدانەوە واقیعیان ڕوون کردۆتەوە لەم سێ ڕێگەیە بەولاوە نایەتە بەرچاو.

ڕووناکایی لە چرکەیێکدا سێ سەد هەزار کیلۆمەتر ماوە دەبڕێت... کێشی زەوی شەش هێندەی هی مانگە... دوو زەڕڕە هایدرۆجین و یەک زەڕڕە ئۆکسجین ئاو پێک دەهێنن... ئاسن لە خەڵووز قورسترە... ساڵ 365 ڕوژ و چەند سەعاتێکە... تیشک لە حەوت ڕەنگ پێک هاتوە... هەرچی لە سروشتدا هەیە بە پێی دەستووری قەرارادە کار دەکات و کە مەرجەکانیان هاتە جێ بە پێی بڕیاری دەستوورەکانیان دەکەونە گەڕ.

مرۆڤ ئەو چشتە «مفروغ منه» وە نییە. مرۆڤ لەوانەیە برسی بێت و خواردنی خۆشیشی لە لا هەبێت و نەشی خوات: ڕەنگە بەڕۆژوو بێت، یاخود زگی بیەشێت، یاخود لێی یاساغ کرابێت، یاخود بۆ فرۆشتنی دانابێت، چاوەڕێی مێوان بێت، یاخود بیەوێ هەڵی بگرێت... یاخود... یاخود تا دەیان یاخودی دیکە. برسیش بوو ئەگەر خواردنیشی نەبێ هەوڵ دەدا پەیدای بکات، وەیا دروستی بکات. ڕەنگە بگوترێ ئاژەڵیش لە برسییەتیدا خەریکی پەیداکردنی خواردن دەبێت. قسەکەش ڕاستە چونکە زیندوەتی و هەستی برسییەتی پاڵی پێوە دەنێن بەرەو هەوڵی خواردن کردن بەڵام نە لێی بەڕۆژوو دەبێت و نە دروستی دەکات و نە دەیفرۆشێت و نە بە دیار هاتنی مێوەیەوە لێی کنارگیر دەبێت. ئاژەڵیش تارادەیێکی زۆر «مفروغ منه» وە بەڵام نەک هێندەی ماددەی مردوو.

گەلێک جاران لە نووسینی نووسەری ماددی، کە بە پێی لێکدانەوە «ئاوێنەیی»یەکەی خۆی مرۆڤیش بە بەرهەمێکی عادەتی دادەنێت، دەوری لە موعادەلە بەرفرەوانەکاندا هێندەی دەوری ماددە بە ئاسایی و ناچاری و ئالی حیساب دەکرێت. لە نووسینی بەرەیێکی زاناکانی سایکولۆجی بزووتنەوە و خواهشت و ویستن و نەویستنی مرۆڤ وەها بە «ردالفعل»ی هاندەران داندراوە فەرقێکی ناکات لەگەڵ بەگەڕهاتن و ڕۆیشتن و وەستانی عەرەبانە... ئەو زانایانە چ مەبەستیشیان نییە مافی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتیی مرۆڤ کەم بکەنەوە بەڵام لە گۆشەنیگای ئیلحادەکەیانەوە حەز دەکەن خاسیەتەکانی مرۆڤ ببەنەوە ڕێزی خاسیەتی ماددەی ڕەق و تەق تاکوو کەلەبەرێک نەدەن بە حیکمەت و ئیرادەیێکی غەیبی کە مرۆڤی خستبێتە بەر دەستوور و یاسای تایبەتییەوە: دەیانەوێ تارمایی «خوا» سایە نەخاتە سەر هیچ شتێک...

با بگەڕینەوە بۆ باسەکەی خۆمان و نەختێکی دیکەش لە نزیکترەوە مرۆڤ و سروشت بە یەکدی بگرین لە ڕووی ئەو دەورەی لە «ڕووداو»دا دەیبینین.

ئەگەر ئەو کابرایەی کە بەخەیاڵ لەو دیو کاکێشان خەلقمان کرد بتوانێ زرە فکرێک بە دڵی خۆیدا بهێنێت وەیا گروگاڵێکی منداڵانە بکات، سروشت بێ مرۆڤ ئەوەندەشی پێ ناکرێ، بەولای بزووتن وەیا وەستانە ئالییەکەی کە زادەی دەستووره نەگۆڕاوەکانیەتی هەرچی چالاکییەکی سەربە فکر و دوان و جوانکاری و خاسیەتەکانی دیکەی مرۆڤ هەیە، میکرۆسکۆپییش بێ، لە دەسەڵاتیدا نییە.

نالی کە لە سروشتەوە وێنەی گوڵ و گیا و درەخت بۆ ناوە هەڵبەستی خۆی دەهێنێت ▪ ئیزنی لە سروشت نەخواستبۆوە بۆ ئەم کارە، سروشتیش چ ئاگاییێکی لە هیچ سەروبەرێکی خۆی و چالاکیەکەی نالی نەبوو تاکوو بێین بەشێکی کەم یاخود زۆری وێنەکانی ناو ئەو هەڵبەستانە بۆ ئەو حیسابە بکەین.

گوڵ و گیا لەو دەمەدا کە مەڕوماڵات و کەر و ئێستر دەیخۆن چەند بێدەسەڵاتە، کە نالی دەیانخاتە شیعری خۆیەوە وەیا وێنەگر لەوحەیان لێ دروست دەکات وەیا پووشفرۆش، دەیاندرویتەوە ئەوساش هەر هەمان بێدەسەڵات و بێچارەیە. ئا لێرەشدا یەک تێبینی گرنگ هەیە پشتگوێ ناخرێ، تێبینییەکەش ئەمەیە:

بیرکەرەوەی ماددی لە هەڵسەنگاندن و نرخاندنی دەوری ئەو کاریگەرانەی ڕووداو پێک دەهێنن بە خەیاڵیاندا نایەت لە عەمەلیەتی خواردنەکەدا دەوری کەر و ئێستر بە دەوری گیا و گوڵ بگرن، چ مانیعێکیشیان نییە کەر و ئێسترەکە بە کاریگەر حیساب بکرێن چونکە دیارە ئەوان گیاکە دەکەن بە خۆراک و پێی تێر دەبن گیاکەش تێدەچێت، بەڵام کە مرۆڤ لە جێگەی کەر و ئێستردا بوو بە تەرەفێکی موعادەلەکە ئەوسا هەموو گومان و شوبهە و خوتخوتەی زانا ماددییەکە بەخەبەر دێت دژی کاریگەربوونی مرۆڤەکە و بێتەرەفی و بێبایەخی گیاکە. مرۆڤ لە ئاست گیاکەدا شاعیر بێ وەیا پووشفرۆش بێ وەیا وێنەگر بێ وردە حیسابێک لەگەڵیدا دەست پێدەکا کە هەرگیز لەگەڵ کەر و ئێسترەکەدا نەکرابوو. ناشکرێ.

لەوانەیە بگوترێ ئەی شاعیر تۆ کەی دەتوانی شیعرەکەت بە وێنەی گوڵ و گیا برازێنیتەوە ئەگەر چاوت پێیان نەکەوتبا، هەروەهاش تۆ ئەی وێنەگر... کابرای

پووشفرۆش تۆش ئەگەر گیا نەبا لەوانە بوویت لە برسان بمریت، جگە لەو لایەنەی لە برسان مردنیش، بزانە گیادروون چۆن ناچاری کردی داسوولکە و گوریس و کەر پەیدا کەیت... بزانە چەند ملکەچیت بۆ یاسای گیادروون... کەچی دەشێ لە ئاست کەر و ئێستردا دەم و دوویەکی دیکەی هەبێت و بڵێت، سروشت کەر و ئێستری بەسەر گیادا زاڵ کردوە بەوەدا کە دەیخۆن و پێشێلی دەکەن و لەسەری پاڵ دەکەون هیچ دەسەڵاتێکی سەرپێچی و ڕازینەبوونی نییە. بەڕاستی مرۆڤ ناڕاحەتە بەدەست دۆستەکانیەوە!!

بەلای باوەڕی منەوە سروشت لە عەمەلیەتی گۆڕان و بەرەوپێشچوون و ژیان و چالاکی مرۆڤدا دەورێکی بێتەرەفانەی هەیە، بەو مانایە کە لە بوونی خۆی بەولاوە شتێکی تر [وەک پێوەماندووبوون، خواهشت، ویستن، نەویستن، ئیرادە] تێکەڵ بەو عەمەلیەتە یەکجار ئاڵۆزکاوە ناکات، بوونەکەشی لەدەست خۆیدا نییە، «امر واقع»ێکە بێ ئاگا، بێ ئیرادەیە. ئەو گیایەی زەهراوییە و خۆرەرەکەی دەکوژێت لەگەڵ ئەو میوە و گۆشت و دەغڵودانەی هۆی ژیانی کامەرانن هەموویان یەکسانن لە رووی بوون و نەبوونی دەوری «ایجابی» یەوە چونکە تێکڕایان دەوری بێتەرەفانەیان هەیە بە تەواوی وەک ئەو بەردەی کە لە تۆقەڵەی سەری چیا لە ژێر پێی مرۆڤ تەلەزگە دەبەستێت و مرۆڤەکەی پێ هەڵدەدێرێت و دەمرێت وەیا ئەو تەختەدارەی کە لە گێژەنی ئاودا مرۆڤی پێ لە خنکان ڕزگار دەبێت: بەردە تەلەزگەبەستوەکە و دارە ڕزگارکەرەکە هەردوویان لە تای تەرازووی عەمەلیەتی ژیان و مردن و ڕزگاربوون و تێوەگلاندا بێتەرەفن، نە ئەویان مردنی مرۆڤی مەبەست بوو نە ئەمیشیان ویستی ڕزگاری بکا. ئەو هێزە کێشەرەی کە قورسایی لە سەرەوە بۆ خوارەوە ڕادەکێشێت و بوو بە هۆی مردنی کابرای تەلەزگەبەستووی سەری شاخ ئەویش وەک قابیلیەتی سەراوبوونی دار لە خۆوە وەها بوو بێ ئیرادە و بێ مەبەست.

لێرەدا شتێکی بچووک بە بیری خوێنەردا دەهێنم: گۆڕان دوو جۆرە یەکێکیان گۆڕانی بایۆلۆجی کە هەموو گیانلەبەرێک، بە ڕوەک و حەیوانەوە، دەگرێتەوە و مرۆڤیش تێیدا بەشدارە. ئەم گۆڕانە دەشێ پێی بڵێین ماددیی سروشتی چونکە گۆڕانێکی ئالیی ناچاریی هەمیشەیی و پێی داخوازی ئەو دەستوورە ماددییانە ڕوو

دەدات کە لە ئەزەلەوە بێخواهشت و بێپلان کاریان کردوە[2] و کاریش دەکەن. گۆڕانەکەی دیکە گۆڕانی کۆمەڵایەتی سەربە مرۆڤە کە ئەویان لە هەموو ڕوێکەوە لەوی دیکەیان جودایە چونکە عامیلێکی نوێی بێ سابیقەی لەگەڵدایە ئەویش خاسیەتەکانی مرۆڤە کە لە پێش هەموویاندا «هۆش» دێت. گۆڕانی بایۆلۆجی بەرهەمی پەیدابوونی «گیان - زیندوەتی» بوو کە وا بەر لە پەیدابوونی هەموو جیهانی بێسەروبن و بێ سەرەتا و کوتایی یەک پارچە سەرانسەر مردووی بێ گۆڕانی «کیفی- چۆنی» و هەمووی تاکە یەک مەیدانی دەستووورە گشتیەکانی فیزیا و کیمیا و کارەبا و زەڕڕە و ڕووناکایی و... هتاد بوو، کە لە هیچیاندا خواهیشت و جووڵەی ئیرادی و ویستن و نەویستن و ئاگا لەخۆبوون و... مردن و زاوزێ نەبوو، تەنانەت یەک گرام ماددەی زیندەڵ (عضوي) جارێ لە هەناوی سروشتدا نەڕسکابوو... گۆڕانی ئەم گیانلەبەرانە کە پێی دەڵێین «بایۆلۆجی» تا بڵێی تەنبەڵ و درێژخایێنە.

کە مرۆڤ پەیدا بوو سەرلەنوێ عاملێکی نوێی گۆڕان و کار تێکردن هاتە کایەوە کە ئەویش نەک هەر لە بەرانبەر سروشت، بەڵکوو لە بەرانبەر ڕوەک و جانەوەریشدا، بە هەموو خاسیەتەکانیەوە کە شەقڵی تایبەتی ئەون سەرانسەر نوێ و بێ پێشینە بوو. هێزی هۆش و لێکدانەوە و بەبیرهاتنەوە و بەیەکدی گرتن و... هەست و پێزانینی ئەوتۆیی بوو بە سەرەتای جۆرە گۆڕانێک کە نە لە کۆندا هەبوو نە لە ئیمکاندا بوو هەبێ. مرۆڤ لە لایێکەوە هاوبەشی سروشتە لەوەدا کە لەشی بریتییە لە ماددە، لە لایێکی دیکەوە هاوبەشی گیانلەبەرانە لەوەدا کە لەشی بریتییە لە ماددەی زیندەڵ. دیارە گیانلەبەریش وەک مرۆڤ هاوبەشی خاسیەتە سروشتییەکانە چونکە ئەویش هەر ماددەیە. لەوە بەولاوە مرۆڤ هیچ هاوبەشێکی لەو جیهانەدا نییە، نە سروشت و نە گیانلەبەر، چونکە هەروەک هێزی زیندەوەتی هەموو زیندوویێکی لە سروشت جودا کردەوە هەروەهاش هێزی هۆش و لکەکانی تری کە تێکڕایان خاسیەتەکانی مرۆڤایەتی پێک دەهێنن مرۆڤی لە هەموو جیهان دابڕی و

---

[2]- لێرەدا قسەکە لە گۆشەنیگای ماددییەوە باسی ئەو گۆڕانە دەکات، نامەوێ لە گۆشەی لاهوتەوە موناقەشەی مەسەلەکە بکەم.

خستیە سەر ڕاڕەوێک کە بەر لە پەیدابوونی مرۆڤ نەدەشیا پەیدا ببێ. زیندوەتی گۆڕانی بایۆلۆجی داهێنا، ئەم جارەیان هۆشداری گۆڕانی کۆمەڵایەتی داهێنا.

ئەم سێ دیادەیەی:

1. سروشت
2. گیانلەبەر
3. هۆشلەبەر

هەرچەند لەگەڵ یەکتردا تێکەڵ و هاوڕێی «هەبوون»-ن، سێ جیهانی لە یەکتر جودا پێک دەهێنن کە هەر یەکەیان بە پێی خاسیەتی تایبەتی خۆی بەتەواوی لەوانی دیکە دەترازێ. خوێنەر نابێ سەیری بەم قسەیەم بێ بەتایبەتی ئەو خوێنەرەی بڕوای بە «تناقض» هەیە چونکە هەروەک ئاو و ئاگر کە دژی یەکترن و بەیەکەوەش هەن بێ ئەوەی کەس سەیری بەم کۆبوونەوەیەی لەیەک نەکردوو بێتەوە، هەروەهاش ناشێ سەیرمان بێتەوە لەوەی کە سێ جیهانی یەکجار لەیەکتر جودا بەیەکەوە و لە تەک یەکتردا پەیدان، بێ ئەوەی لە هەموو خاسیەتەکانی یەکتر بەشدار بن.

من لە خوێندنەوەمدا سەرنج لە بیرکەرەوەی ماددی سەربە چینایەتی دەگرم و دەبینم زۆر بە عەنتیکەیی خولیای جوداوازیی «چین» وای لێ دەکات ئەو بایەخەی کە بە جودایی نێوان کرێکار و پارەداری دەدات هەرگیز بە جودایی نێوان دەوری «سروشت» و دەوری «مرۆڤ» لە گۆڕانی کۆمەڵایەتی نادات. بایەخ نەدانەکە لە سەرجوملەی بۆچوونەکان و شی کردنەوە ماددییەکانیەوە بەدی دەکرێت نەک لەوەی بە سەراحەتی پاتەوپات مرۆڤ و سروشت وەک یەک حیساب بکات. لەلایەن زێدە بایەخدان بە جوداوازیی چینایەتییەوە ئەوەندە بەسە کە لە هەندێک وڵاتی سۆشیالیستیدا کوڕی کۆنە دەوڵەمەند و کۆنە پیاوماقوڵەکان وەک کوڕی کرێکارێک مافی خوێندنی زانکۆی پێ نادرێ هەرچەند لە ئەزموونێدا پلەی بەرچاویشی وەرگرتبێ. لێرەدا ئەم جودایی کردنە پتر لە ڕەجعیەت ڕۆچوە لەوەی بابایێکی سپی خۆی لە ڕەشێک هەڵاوێرێ چونکە هەر نەبێ جوداخوازی ڕەنگ لەگەڵ هەموو دزێوییێکی کە هەیەتی شتێکی بایۆلۆجییە و بە میرات وەردەگیرێ و

کاری سروشتە لە حاڵێکدا «پارەداری» خاسیەتێک نییە وەک خوێن و پێست بە جۆرێکی ئالی لە باوک و دایکەوە بۆ وەچەکانیان سەرەژێر بێتەوە و ماکی خیانەتی ئەوان بۆ ئەمان بەدیاری بهێنێت.

هەر لەم بابەتەی بایەخ نەدان بە خاسیەتە هەرە زل و جوداکەرەوەکەی مرۆڤ لە جانەوەران کە هۆش و زانینە ئەوەیە کە مانگانەی کرێکارێکی عادەتی مەیلەو نەخوێندوو هێندەی هی دکتۆرێکە، بگرە زیاتریشە. بەڕاستی ئەم تەرزە جوداوازییە فەرقێکی نییە لەوەی پێی دەڵێن جوداوازیی ڕەگەز بەڵکوو لەویش خراپترە چونکە مومکینە کۆمەڵێک هەمووی یەک ڕەگەز بێت کە لەو حاڵەتەدا جوداوازیی ڕەگەز بەتەواوی بزر دەبێت. بەڵام لە هەمان کۆمەڵدا جوداوازیی «چین» کارە ناڕەواکەی خۆی دەکات چونکە دیارە لەو کۆمەڵەدا کۆنە دەوڵەمەند و دکتۆر و ئەندازیار و کرێکار هەر دەبن کە فەرق و جوداوازییان لە نێواندا بکرێ. هەڵبەت من لێرەدا دژی یارمەتیدانی کرێکار نیم کە دەبێ حیسابی نەخوێندووی لەگەڵدا نەکرێت و هەموو مافێکی مرۆڤایەتی بۆ جێبەجێ بکرێت و حورمەتی بوون و ژین و بیروڕا و خواهشتی بگیرێت. بەڵام نابێ موجامەلە کردن لەگەڵ کرێکار بە زەرەری دکتۆر و ئەندازیار تەواو بێت وەیا لە تۆڵەی ساڵانی فیزونازی دکتۆر و ئەندازیاری سەد ساڵ پێش ئیمرۆ ئەمانەی سەردەمی ئێستاکە مافی خۆیان پێ نەدرێت.

تێ ناگەم بۆچی هەمان دەستوور بەسەر ئەو کەسەدا جاری ناکرێت کە خۆی بۆتە جێگری کۆنە فەرمانڕەوا و قەیسەرەکان و پاشاکان و تۆڵەی زوڵم و زۆری ئەوانی لێ بسەندرێتەوە!

لە نموونەی خۆ دەرهاویشتنی فەرمانڕەوا لەو بڕیارەی بەسەر غەیری خۆیدا دەسەپێنێت شتێکی کۆتایی ساڵانی چلەکانم بیر دەکەوێتەوە کە ستالین لە شێوەی «أمر اداری» فەتوایێکی دەرچواند بەسەر زیرەکی و زەکای مرۆڤدا و بڕیاریدا پلەی زیرەکیی تاکان لە بنەڕەتدا وەک یەکە بەڵام جوداوازیی چین و پەروەردە بوو لێکیان دوو دەخاتەوە. لەم فەتوا سافیلکەیەدا - کە چ پێوەندی بە ڕاستی و بە بەرژەوەندی مرۆڤیشەوە نییە - هەر ئەوەم مەبەستە کە ئەگەر خاوەنی فەتواکە بڕوای پێی هەبووبا دەبوو خێرابەخێرا واز لەو ڕابەرایەتیە زێدە زەحمەتە بهێنێ کە بە ئەستۆی خۆیەوە گرتبوو چونکە لە سەرەتای ژیانی خۆیدا بە هەژاری

ڕابیواردبوو و بۆی ڕێک نەکەوتبوو لە ڕێی پەروەردەبوونی تایبەتیەوە، بە پێی قسەکەی خۆی، زیرەکیەکەی بەرەوپێش بچێت ئیتر بۆ دەبێ یەکێکی خواپێداو و دڵسۆز نەدۆزیتەوە و دەسەڵاتی ڕابەرایەتی و بەڕێوەبەراتیەکەی خۆی پێ نەدات؟

بێگومان هەموو ئەو کەسانەی کە قسەی وەها دوور لە واقیع دەکەن هەرگیز بەتەما نین قسەکان بەسەر خۆیاندا بهێنن، بە پێچەوانە، بە نیازی ڕام کردن و کەوی کردنی غەیری خۆیان سێبەری گومان کردن لە قابیلیەتی مرۆڤ بەسەر خاوەن قابیلیەتاندا دەهێنن.

بەهەمەحاڵ، مرۆڤ هەرچی دەبێ با ببێ، ئەگەر غەدری لێ نەکرێ لەلایەن دەسەڵاتدارەکانەوە▪ پێویستە هەموو مافی مرۆڤایەتی پێ بدرێ هەر لە خواردن و خواردنەوەوە تا دەگاتە ئەوەی بەو «فەیلەسووف» ە دەسەڵاتدارانە بڵێ ڕام لێتان نییە، فەرموون لەماڵەکەی خۆتان دانیشن، سەیریش لەوەدایە کە دەبینی ئەو ڕۆشنبیرانەی خۆیان بە مرۆڤدۆست و شۆڕشگێڕ دادەنێن هەمیشە دەبنە کوتەکی دەستی ئەو فەیلەسووفە زۆردارانەی ئارەزۆی خۆیان بەسەر گەلدا دەسەپێنن.

دەسەڵاتدارێکی وەک ستالین هیچی نەهێشتەوە نەیکا دژی ئارەزۆی فەلاحی ڕووس لە مەسەلەی «دابەش کردنی زەوی و کێڵگەی هەرەوەزی» و ئەو سیاسەتانەی بەسەر زەویدا دەهێندرا، لەوەشدا ڕەفتارێکی هێندە دڕندانە لەگەڵ فەلاحاندا کرا بە وەهم و وڕێنەی شۆڕشی ئوکتوبەری1917 دا نەدەهات کە چی ڕۆشنبیری چەپی کوردی ئەم ڕۆژگارە بەڕاشکاوی خۆی دەداتە پاڵ ئەو دڕندەییە بێڕەحمە و بێئینسافە و ملیۆنەها فەلاح بە تاوانبار دادەنێت نەکا «سەرۆکی کەهەنووتی فەلسەفە» عەیبێکی بەسەردا بێت: بەڕاستی گەلدۆستی و پرۆلیتاریاپەرستی هەر وەها دەبێ!

موناقشە بە دەوری «فکر و مادده» و چۆنیەتی وەرگێرانی بیروباوەڕ لەو پرسیارەدا بۆ هەڵوەستی واقیعی گەلێک مەیدانمان پێ دەکوتێتەوە چونکە دیارە مرۆڤ لە ئاکامی تەتبیقی بیروباوەڕی خاوەن فەلسەفاندا خۆی لە حاڵەتە جۆرجۆرەکانی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیریدا دەبینێتەوە▪ کە لێیان ڕازییە یاخود نارازییە لەبەر ئەمە بەناچاری دەبێ هەر ساتە بابدەینەوە سەر ئەو

حاڵەتە ماددییانەی کە بیروڕای پیاوی وەک ستالین لە فەلسەفەوە دەیانکات بە یاسا و دەستووری گوزەران و خوێندن و هونەر... بگرە پەرستنیش. بیروڕای ئەو خاوەن فەلسەفانە نرخی وەها زل لە مرۆڤ وەردەگرن بەرانبەر بەو نانەی کە گۆیا بۆی پەیدا دەکەن، سەد جاران مافی ئەوە بە هەموو کەسێک دەدات هەر نەبێ من بە قسە و لێکدانەوە هەڵیان سەنگێنێت. خۆ بە نیسبەت ئەو خەڵقەی کە یاساکانی بیروڕای خاوەن دەسەڵاتەکانیان بەسەردا دەبڕدرێت، ئیتر یا تێریان دەکات یا نایانکات، هەزاران جاریش هەقی ڕازیبوون و ڕازینەبوونیان هەیە تەنانەت ئەو هەقە نابێ لە زوربەی میللەت بستێندرێتەوە با هەمووشیان بەو یاسانە تێر و تەسەل بووبن چونکە ناشێ یەکێک یا کۆمەڵێک خۆیان لە میللەت بکەن بە «دایانی منداڵ» و بە زۆر شیریان دەرخوارد بدەن.

ئەمە لەلایەنی هەقی زوربەی میللەتەوە، بەڵام لایەنی دەسەڵاتدارە خاوەن فەلسەفەکە واز لە چەرخ و بازاڕی خۆی ناهێنێت ئەگەر هەموو ڕۆژەکیش بە هەزاران خەڵق لە برسان بکوژێت، وەهاش لەسەر هەڵوەستی خۆی بەردەوام دەبێت و بە چاکی دەزانێت میللەتەکە تاوانبار دەکات لە نەهاتنە دی خێر و خۆشی بیروباوەڕە ڕووناکەکانی! سەدان قەڵەمی بڕندەی بەکرێگیراویش [وەیا تۆقاندراوە] لە قاڵبی دۆستایەتیی گەلدا دەبنەوە بە هاوبەشی جەلادەکە.

ئا لەم تەرزە هەڵکەوتەدا خاوەن فەلسەفەی ماددی کە لە هەوەڵەوە وا دادەبڕێت گۆیا زەرفی ماددی یەکەم بایەخدارە لە هەڵنانی باری کۆمەڵایەتی و یاساکانی و بیروباوەڕەکانی، هەر بە جارێ لە فەلسەکەی خۆی بەرەودوا دەبێتەوە چونکە بیروڕاکەی خۆی، چەوت بێت و ڕاست بێت، دەکاتە ئەو زەویەی کە سەرلەبەری کۆمەڵایەتیی بەسەرەوە هەڵدەندرێت. ئەگەر نەڵێم دەچێندرێت. لەمەشدا نابێ چ بایەخێک بەوە بدەین کە گۆیا بیروڕاکە و فەلسەفەکە لە بنەڕەتدا لە واقیع هەڵێنجراوە یا هەڵەش بێ، چونکە هەڵەبوونی بیروڕاکە جارێکی دیکەش پووچاندنەوەی واقیعەکە لە نەزەر خاوەن بیروڕاکە دەردەخات لەو ڕووەوە کە ئەو وێنە نادروستەکەی ئاوێنەی مێشکی خۆی داناوە بە جێگر و نوێنەری واقیعی ڕەق و زەق، گوێش ناداتە دەرچوون و دەرنەچوونی ئەو بەڵێنانەی کە پێشبینی و گەشبینی بیروڕاکەی بەتەمایان بوو.

مرۆڤ ئەگەر لەگەڵ خۆی ڕاستگۆ و سەریح بێت لەسەریەتی، بێ ئەوی لە پێشەوە بڕیاری قەراردادەی لە خۆی کردبێتە ئایین، هەر شتە نرخی خۆی پێ بدات و ئەو دەورەی کە لە گۆڕان و بەرەوەپێش چووندا هەیەتی بۆی تێبخوێنێتەوە، هەڵبەت لەمەشدا دەبێ تەجرەبە ڕابەر بێت چونکە هەر تەجرەبە لە دەستی دێت ڕاستی و هەڵەیی بیروڕا و فکر و فەلسەفە و پرژۆان ساغ بکاتەوە. ناوناوەیێک نەبێ کە هەندێ بنگەی فکری سەرەتایی و بەدیهی لە پێشەوە و بەر لە تەجرەبە دەشێ بڕیاریان لێوە وەبگیرێت.

لێرەدا مەبەس لە «تەجرەبە» واتای دەقاودەقی وشەکە نییە چونکە پێویست نییە هەموو جاران سەرلەنوێ شتی تەجرەبەکراو تەجرەبە بکرێتەوە، لەوەش بەولاوە هەڵێنجانی بیروڕاش لە واقیعی ڕاست و دروست هەر دەچێتەوە ڕیزی تەجرەبە و نرخی ئەوی پێ دەدرێت. خۆ ئەگەر وەها نەکەین و هەمیشە چاوەنۆڕی تەجرەبە بین دەبێ هەموو موناقەشەیێک ڕاگرین و هیچ لێکدانەوەیێکی هۆشەکی «عەقلی» نەکەین. ئێمە کە واقیع بکەینە ڕابەر بۆ دەرخستنی دەوری مرۆڤ و دەوری غەیری مرۆڤ، بەمردوو و زیندوویەوە، لە ڕووداو و گۆڕان و بەرەوەپێش چوونی کۆمەڵایەتیدا. بە نیازی دەستنیشان کردنی عامیلی کاریگەر و لایەنی کارتێکراو، نموونەی زۆر سادە و ئاشکرا و بێگومانمان هەیە، لەوانەی ئەگەر ڕاستی مەسەلەکەی تێدا نەگوترێ و دەوری هەر لایەنە بەخۆی نەدرێتەوە گاڵتە بە لێکدانەوەمان دەکات و شەرمیشمان لە خۆمان دەهێنێتەوە. لێرەدا دەگەڕێمەوە بۆ لای نالی و هەڵبەستەکانی و لەوێوە بۆ نموونەکان دێمەوە:

ئێمە ئەگەر بڵێین نالی لە خواستنەوەی دیمەنی گوڵ و گیا و دەشتودەر بۆ ناو هەڵبەستەکانی ئەسیری سروشت و کارتێکراوی بوو، دەبێ بڵێین قەسابیش ئەسیری ئەو مەڕە و ئەو گامێشەیە کە بە نیازی سوودی خۆی و گوزەران کردن سەریان دەبڕێت. نالی ئەسیری گیا و گوڵە قەسابیش ئەسیری بزن و مەڕە ڕاوکەریش ئەسیری پێستی ئەو ڕێوەیەیە کە بە تەڵە دەیگرێ... با هەروا بەدوا قسان بکەوین و بڵێین خاوەن زەویش ئەسیری ئەو فەلاحەیە کە دەڵێین دیلی زەویەکەیە، فەلاحیش ئەسیری گاجووتەکە و گەنم و جۆیەکە و کێڵگەکەیە... دەوڵەتە ئیمپێریالیستەکانیش ئەسیری میللەتە داگیرکراوەکانیانن... جەلادیش

ئەسیری ئەو مەحکومانەیە کە هەڵیان دەواسێت چونکە لەوەوە مانگانە وەردەگرێت...

دەتوانین بەم جۆرە هەرچی جیهان هەیە سەروژێری بکەین و ڕاگەیاندنەکانی هەڵگێڕینەوە، وەک کە بڵێین ئەو تیپانەی یاری دەدۆڕێنن دەبێ پاداشەکەیان بدرێتێ چونکە ئەگەر ئەوان نەبەزیبان لایەنەکەی تر ڕێی نەدەبوو سەرکەوێت، لەشکری شکاویش هەقی پێدا هەڵگوتنی دەبێت چونکە بە هۆی شکانی ئەوەوە لەشکرەکەی دیکە شەڕی بردەوە... هەرچی نموونە هەیە، لەوانی دوو لایەنی کاریگەر و کارتێکراویان تێدا بێت، سەرلەبەریان لە تەرازووی خستنەپێشی دەوری ماددەدا بەم جۆرە سەرەوبن دەبن.

دەزانین و دەڵێین و دەشسەلمێنین، دەبێ ماددە هەبێ تاکوو مرۆڤ بتوانێ کاری تێبکات، بەڵام بەوەدا شتێکمان نەگوتوە فلسێک بهێنێت وەیا تیشکێکی هەبێ تاریکایی ڕووناک بکاتەوە چونکە، وەک گوتمان، دەبێ هەموو لێکدانەوەیێکمان لەو مەیدانەی بە یەکدی گرتنی دەوری مرۆڤ و سروشتدا لەسەر بناخەی «هەبوون» ی کاریگەرەکانەوە هەڵبستێت. بەو پێیە دەبێ بڵێین سروشتیش هەیە و مرۆڤیش هەیە و لەو هەبوونەدا پێکەڵێنکن، هەر بۆیەشە دەتوانین هەبوونەکە لە حیسابی هەموان دەربهاوێژین و هیچیشیان حیسابیان دانەلەنگێ. ئێمە دەبێ سەیری دەوری چالاکیی مرۆڤ و چالاکیی سروشت بکەین لەو شتانەی کە لە جیهانی مرۆڤدا ڕوو دەدەن. بە نموونە، خانوو دروست کردن بهاوێینە بەر لێکدانەوەمانەوە و زەینی خۆمان بدەینە ئەو چالاکییەی لە دروست کردنەکەدا دەدیترێت تا بزانین کاریگەری بۆ چ لایەنێک دەگەڕێتەوە: ئایا مرۆڤ خانوو دروست دەکات یاخود بە هۆی گەچ و بەرد و قوڕ و خشت و سیمەنت و شێلمان و دار و گەرا خانوەکە دروست دەبێ؟ بەڕاستی خۆ نەزان کردنە ئەگەر نەڵێین مرۆڤ دروستکەرەکەیە چونکە نەک هەر دروستکەرە بەڵکوو شارەزا و وەستایشە، بۆ مەبەستێکیش دروستی دەکات. ئەو مەبەستەش لەوانەیە یەک لە هەزار مەبەستان بێت وەک: تێدا ژیان، قۆنتەرات تەواو کردن، بەکرێدان، تێدا خوێندن، عیبادەت تێدا کردن... هتاد. ئەوانەی پێوەی خەریکیشن هەر یەکەیان بە ئامانجێکی خۆیەوە خەریک بێت وەک عەمەلەیی،

وەستایی، ئەندازیاری، خاوەن ماڵی، خاوەنایەتیی قۆنتەرات، چاودێری کردن، پاسەوانی، گوێزانەوەی شتومەک، نەجاری، سوخرە و بێگار... هتاد.

نموونەی خانوو دروست کردن نوێنەری هەموو ئەو بەرهەمانەیە کە مرۆڤ تێدا بەشدارە، لە مرۆڤیش بەولاوە هەرچی بەکار دێت لە پێکهێنانی ئەو بەرهەمانە تاکێکی هەست بە خۆی و بە دەوری خۆی ناکات و هیچ خواهشتێکی نییە لە بوون و نەبوونی بەرهەمەکەدا، تەنها جوداوازیەک هەبێ لە نێوان ماددەی مردوو و ماددەی زیندوودا کە مرۆڤ بۆ ئارەزوەکانی خۆی بەکاریان دەهێنێت هەر ئەوەیە کە وا گیانلەبەر لێی دەوەشێتەوە لە ترسی ڕۆحی خۆی هەڵبێت وەیا جووتە بهاوێژێت وەیا گاز بگرێت واش دەبێ بە تەمای ئالیک و خواردن وەیا لەبەر ترس وەیا لەبەر وەفاداری [سەگ!] مل بنێتە چالاکی بۆ مرۆڤ و ئۆگری بێت. ماددەی مردووش تێیاندا هەیە بە زەحمەت چنگ کەوێت وەیا دەردەست بکرێت وەیا سوودی لێ وەربگیرێت بەڵام هیچ تاکێکی هەڵوەستی «ایجابی» نییە: نە دەیەوێت و نە نایەوێت و بە ئیرادەی خۆشی لاتەریک دەوەستێت. بگرە لە خەستەخانەو کە نیوەمردووی تێدا دەژێتەوە تا ئەو پەتەی کە مرۆڤی پێ دەخنکێنن، هەروەها لەو گیایەوە کە هەندێ نەخۆشی پێ چاک دەبێتەوە تا ئەو زەهرەی کە مرۆڤ دەکوژێت هیچیان نە دەسەڵاتێکی خۆی هەیە و نە مەبەستێکی هەیە.

لەم لێکدانەوەیەدا، کە وا تا بڵێی سەرەتایی و سەراوێشە، دەبێ لەوەی پێی دەڵێن دەوروبەری ماددی حیساب بۆ شتێکی گرنگ بکرێت: بەشێکی زۆری دەوروبەری ماددی دەسکردی مرۆڤەکە خۆیەتی وەک دامەزراوە سیاسییەکان و زانستییەکان و... هتاد، وەک ئایین و نەریتی کۆمەڵایەتی... وەک هەموو خانوو و کارگە و ڕێگەوبان و بەرهەمە پیشەسازیەکان و کانەکان و کشتوکێڵ و مەڕوماڵ [کە بەخێو دەکرێن و دەبن بە ماڵی مرۆڤ] و... هەرچی سامانی مێژوویی نەتەوایەتی هەیە.

حیسابی ئەم تەرزە دەوروبەرە ماددییە لەگەڵ دەوروبەری سروشتی کاڵ و خام زۆر جودایە لە ڕووی دیاری کردنی دەوری مرۆڤ و دەوری ماددە لە گۆڕانی کۆمەڵایەتیدا چونکە ئەمانەی دەستکردی مرۆڤن، ئەگەر بەدیش بن، لە دەستەتەرازووی مرۆڤدا دادەندرێن. بەرهەڵستی کردنی یاسایێکی بەد لە بەرەوپێشچوونی مرۆڤ هەرگیز وەک زەحمەتی وەدەستهێنانی نەوتی بن بەحران

نییە کە ئەویش بە پێی وەزەحمەت پەخستنی کاری مرۆڤ جۆرێک بەرهەڵستی پێک دەهێنێت... شەهیدبوونی ئاشتیخوازێک بە دەستی زۆردارێک وەک ئەوە نییە کە بروسکە بیکوژێت وەیا تاوێرێک پانی بکاتەوە. دەوروبەری دەسکردی مرۆڤ، بە هەردوو جۆری ماددی [وەک خانوو، فابریقە، ڕەز، پۆشاک، خۆراک...] و مەعنەوییەوە [وەک ئایین، سیاسەت، نەریت، درۆ و ڕاستی...] شتی بێتەرەف نین و هەموویان بە مەبەستی تایبەتییەوە پەیدا بوون ئیتر مەبەستەکە چاک بێت یا بەد. زۆریش لەوان هەر لە بنەڕەتدا بە نیازی «شەڕ پێ فرۆشتن» وەیا «لەسەرخۆ کردنەوە» و خۆ پاراستن پەیدا کراون، واش دەبێ لە دوای پەیدابوون و بەیەکتر کەوتنەوەیاندا دەبنە هۆی شەڕ و هەرا. بەنموونە:

1- خانوو، پۆشاک، خۆراک، کێڵان، چاندن... هەموویان بۆ پاراستنی ژیانن.

2- چەک، لەشکر، وەرزشی سپایی، هاندانی سیاسی و ئایینی، پرۆپاگاندە... لەوانن بۆ خۆ پاراستن بن لەوانیشن بۆ شەڕ پێفرۆشتن بن.

3- ئەو ناکۆکیانەی لەسەر جودایی باوەڕ هەڵدەستن بەزۆری لە دوای بەیەک کەوتنەوە و بەیەک گەییشتنی باوەڕەکان پەیدا دەبن نەک لە سەرەتاوە هەموو باوەڕێک بە نیازی شەڕ فرۆشتن بە باوەڕێکی دیکە دەبرێتە مێشکانەوە: ئیسلامەتی لە داهێنانی قوربانی و مەبەستی ئەو نەبوو دوای چەندین ساڵ مسڵمان و هیندۆسەکان لەسەری بەشەڕ بێن...

حیسابی ئەم دەوروبەرەی کە دەسکردی مرۆڤە لێکۆڵینەوەی سەربەخۆی دەوێت، لەوەشدا دەوری لایەنە چاکەکان و لایەنە بەدەکانی دەوروبەرەکەیە بە جۆرێکی ناوکۆیی بەیەکدی دەگیرێن نەک تێکەڵ بە دەوروبەری سروشتی دەکرێت، من کە بێم لە دەوری «نەوت» بکۆڵمەوە لە پێشەوە نەوتەکە بە ماددەیێکی مردوو دانێم کە لە خۆوە هیچ ناکات و چ نیازێکی نییە و هەرچی سەر بەویشە وەک باشی و خراپی نەوعەکەی و نزیکی و دووریی هەڵێنجانی و لەباری و نالەباری و شوێنی لێ

دەرهاتنی ئەویش هەر دەگەڕێتەوە بۆ حیسابی ماددەی مردوو (سروشت) کە هەمووی «امر واقع»ە. لەوە بەولاوە دەورە سەربەخۆیەکەی مرۆڤ دەست پێدەکات ئەویش بە هەموو لایەنە چاک و خراپەکەیەوە بگرە لە تەکنیکەوە تا دەگاتە هەرەوەز و هاریکاری و پەیمانە نەوتاویەکان و تەقەلای سەرمایەداران و خۆ بەدەستەوە نەدانی خاوەنە دڵسۆزەکانی نەوت و هەزاران لایەنی دیکەی ئاشکرا و بزری کێشەی نەوت... من لێرەدا ڕێگەم نییە لەم گۆشە فکرییە تایبەتیەی نرخاندنی دەوری مرۆڤ و سروشتەوە بادەمەوە سەر وردەکاریی شی کردنەوەی لایەنی چاک و خراپ و بەهێز و بێهێزی ئەو دەوروبەرەی کە دەسکردی مرۆڤە و بریتییە لە هەموو مێژوو و کۆمەڵایەتیی مرۆڤ، لەوێشدا چۆنیەتیی هۆنینەوەی شیرازەی کۆمەڵایەتی و بەرەوپێشچوون و بەرەودوا هاتنەوەی مێژوو و دەوری ڕاستەقینەی دیاردە «تناقض» بە چاک و خراپیەوە و بزربوونی «تناقض» لەو حاڵەتانەی هاریکارییان تێدایە و... هتاد بە پێی بۆچوونی خۆم بە درێژی باس بکەم.

من لێرەدا ئەوەندە ڕێیەشم نییە کە مێژوو بە چاوی مێژوو ناساکان و بە چاوی فەیلەسووفەکان و بە چاوی مارکس سەیر بکەم و دەمەتەقە لەسەر بیروڕاکانیان هەڵستێنم. من بەحاڵ دەتوانم لە کولانەی بەراورد کردنی حەقیقەتی دەوری مرۆڤ و سروشتەوە تیشکێکی بیروڕای خۆم بهاوێژم بۆ ئەو ناتەواوییە فکرییەی کە دەوری فاعیلیەت و خالقیەت لە مرۆڤ دەدزێتەوە بۆ دەوروبەر کەچی بەشی هەرە زۆری دەوروبەرە کاریگەرەکە دەسکردی مرۆڤەکە خۆیەتی.

بە زۆری، ئەگەر نەڵێم هەمیشە کات، ئەوانەی لە ڕێی شی کردنەوەی ماددی تەقلیدییەوە مێژوو و کۆمەڵاتی و ڕووداوەکانی دەدەنەوە بە عامیلی دەوروبەر و زەرفی ماددی و لەوەشدا «مرۆڤ» دەکەنەوە بە داشی دامە، زۆر بە عەنتیکەیی زەرفە «مرۆڤکرد» ەکەش هەر دەخەنەوە سەر ئەو لایەنەی کە لە لێکدانەوەکانی ئەواندا بە شتی دەرەوەی و جوودی مرۆڤ حیساب دەکرێت، واتە بۆ کاریگەریی مرۆڤەکەی حیساب ناکەن هەرچەند لەوەوە هەڵقوڵیوە. بە نموونە لەوانەیە لە لێکدانەوەی تەقلیدی بخوێنیتەوە «...قوتابخانە زۆر بوون، دەرگەی بازرگانی لەگەڵ وڵاتە پێشکەوتوەکاندا کرایەوە سەرپشت، دەنگوباسی ئازایخوازی و زانست و بزووتنەوە کۆمەڵایەتیەکان بڵاو بۆوە، ڕۆژنامە و گۆڤار و کتێب و - بە تێکرایی -

چاپەمەنی کەوتە کوچە و بازاڕ، هۆی هاتوچۆ و ڕاگوێستن جیهانی بەیەکەوە بەستەوە... ئا لەم زەرفەدا فلانە فەندی، وەک بەرهەمێکی سەردەمی خۆی، کەوتە سەر خوولیای داوا کردنی مافە کۆمەلایەتیەکان...» ئەم تەرزە لێکدانەوەیە فاعیلیەتی «فلانە فەندی» تێدەبات، لەوەندەش ڕاناوەستێ کە بایەخەکەی لێ دەستێنێتەوە بۆ لایەنێکی دیکە چونکە لێکدانەوەکە حیسابێک بۆ ئەو ڕاستییەش ناکات کە هەرچی ئەو عامیلانەی ناو زەرفە تازەکە هەیە هەموویان دەسکردی مرۆڤن و لە مەریخەوە بەسەر زەویدا نەباریون.

بەڵێ ڕەنگە منیش لە نووسیندا شێوازێکی وەها بەکار بهێنم بۆ مەبەستی کورت کردنەوەی قسان، چونکە لەوانەیە زەحمەت بێ هەموو جارێک و لە هەموو حاڵێکدا لایەنی زەرفی مرۆڤکرد هەلاوێرم لە زەرفی سروشتی، بەلام من ڕاستییەکەم هەر لە بیرە و و زەینم تەلەزگە ناکات بۆ ئالۆزبلۆزی لێکدانەوەی نارەوا. جا ئەگەر بێت و نووسەران و خاوەن بیروڕایان بە جۆرێکی گشتی لە سەرەتاوە خۆیان باوەڕ بکەن و خەڵقیش ڕابێنن بەوەی تاکە عامیلی ئیجابی لە گۆڕانی کۆمەلایەتی و لە مێژوودا مرۆڤە ئەوسا پێی ناوێ هەموو جارێک ڕاستییەکە دووبارە بکەینەوە لە نووسین و گوتندا، وەک کە دەڵێین ڕۆژ هەلات و ئەستێرە ئاوا بوو پێویست نابینین هەموو جارێ بڵێین «بە هۆی سووڕانەوەی زەوی بە دەوری خۆیدا» چونکە ئەو ڕاستییەمان لێ بۆتە بەدیهییە و لە زیمندا حیساب کراوە.

خاوەنی ئەو بیرکردنەوەیەی کە حەز دەکا بۆ پتەوکردنی بنگەی فەلسەفەی ماددی لە بایەخی دەوری سەربەخۆی زێدە گرنگی مرۆڤ کەم بکاتەوە نەکا لایەنی زاتی بەسەر ماددەدا زاڵ بێت، زۆر بە عەنتیکەیی خۆی لەباری پێچەوانەدا دەبینێتەوە، واتە زاتی خۆی دەبێتە یاسا و دەستوور تا ئەوەی هەموو دروستکراوێکی ماددی لەسەر وەهم و خەیەڵەکانی ئەو زاتە هەڵدەندرێت. کابرای خاوەن فکری ماددی دوای ئەوەی، بە پێی باوەڕی خۆی، دەگات بە دۆزینەوەی یاسا ماددییە عیلمییەکانی کۆمەلایەتی، دەست دەکا بە پرۆژەدانان بۆ بەڕێوەبردنی کۆمەڵ، سەرلەبەری پرۆژەکانیش لە بیروباوەڕی خۆی هەڵدێنجێت وەک دەشزانین نە لە کەس دەسەلمێنێ هەڵەی بۆ ڕاست بکاتەوە نە گوێش دەداتە ئەو تەجرەبانەی کە هەڵەی پرۆژەکانی دەردەخەن، سەیریش لەوەدایە میللەتی ئەو تەرزە جێگایەش کە

گۆیا پێرەویی فەلسەفەیێکی ماددی دەکەن پتر لە میللەتی جێگەی دیکە ملکەچن بۆ ئەو بیروڕا و پرۆژە نادروستانەی کە لە «زات»ی سەرۆکەکەیان هەڵدەقوڵێ، بە کوردی پتر بەردەست و ڕامکراوی «زات» ن لەوەی هی «مادده» بن چونکە هیچ ماددەیێک و بەرژەوەندیێک خۆی لە نێوان ئەو میللەتەدا نادۆزێتەوە ئەگەر «زات» ی سەرۆکەکەیان نەیسەلماندبێت. بەڵام ئەم حیکایەتە لەوەندەدا بە کۆتایی ناگات.

نووسەران و خاوەن فەلسەفان کە دێن باسی فکری زاتی و فکری «موضوعی» دەکەن ڕاستییێکی یەکجار گەورە و بنجی لەو باسەدا هەڵدەبوێرن، ڕاستییەکەش لەو شتە یەکجار بەرچاوانەیە کە وا لەبەر زێدە ئاشکراییان نیگا بۆ خۆیان ڕاناکێشن:

جودا کردنەوەی شێوازی بیر کردنەوە و بیروڕا بۆ زاتی و مەوزووعی لە ئەنجامی دواییندا بێبایەخ و بێنرخ دەردەچێت، چونکە کابرای مەوزووعی دوای تەجرەبە ناچارە هەر دەبێ باوەڕ بەو بیروڕایە بکات کە لە زات و مێشک و دەروونیدا خۆی بەڕاست دەنوێنێت لەوانەیشە ئەو بیروڕایە فری بەسەر ڕاستییەوە نەبێت. تەرجرەبە و ئاکامەکانی ڕاستەوخۆ نابنە بیروباوەڕ لە مێشکی ئەو کەسەی پێیانەوە خەریکە. دەشێ مرۆڤی خاوەن تەجرەبەی جۆراجۆر بڕوا بە هەڵەترین تەجرەبە بکات، هەروەک مومکینە لێکدانەوەی کابرای «زاتی» لەگەڵ ئاکامی ڕاستترین تەجرەبەدا ڕێک بکەوێت. بەڵێ دەزانم ئەو کەسەی ڕێبازی مەوزووعی دەگرێتە بەر پتر بەلای زانستدا دەڕوات، بەڵام هیچ مەرج نییە لەو ڕێبازەدا هەموو جاران نیشان بپێکێت کەچی ئەو هەموو جاران باوەڕ بە ڕاستی و دروستیی قەناعەتەکەی خۆی دەکات. پێی ناوی من بڵێم لە خۆوە دیارە ئەو کەسە مەوزووعییەی بەهەڵەدا چوە، بیروڕایەکەی نابێ مەوزووعی بێت هەرچەندە لەسەر تەجرەبەش هەڵچەقیبێت: ئا لێرەدا زۆر ئاشکرایە کە شێوازە مەوزووعییەکە فکرێکی زاتی بەدەستەوە دا فکرەکەش هەڵەیە. کابرا مەوزووعییەکەی کە نیشانیش دەپێکێت هەر لە ڕێی زاتەوە بڕوا بە ڕاستیی مەوزووعەکە دەکات، لەوانەیە یەکێکی تری مەوزووعی وەک خۆی بڕوای جودا بێت لە هەمان پرسیاردا.

مومکین نییە مرۆڤ لە هیچ حاڵێکدا لە قەپێلکی زاتییەت دەرچێت: ئەگەر دەتەوێ فکری مەوزووعیی دوور لە زات ببینیت سەیری تەختە و ڕەمزەکانی هۆشی ئەلیکترۆنی بکە چونکە ئەو زاتێکی نییە تێکەڵ بەبابەت بێت، کە زانیاری ڕاستیشی

پێ بدرێت ئەنجامی هەرە ڕاست بەدەستەوە دەدات و بە دەگمەنێکی وەک نەبووش نەبێ هەڵە ناکات. هەموو میقیاسێکی دیکەی ماددیش وەک هۆشی ئەلیکترۆنی هەر یەکە لە مەیدانی خۆیدا مەوزووعیی تەواوە. ئەگەر لە دروست کردنیاندا هەڵە نەکرابێت ئاکامی ڕاست بەدەستەوە دەدەن وەک، تەرزمەتر، بارۆمەتر، سیسمۆگراف، ڕادار... هتاد.

مرۆڤ لە هەموو حاڵوباراندا بە ناچاری مەخلوقێکی زاتییە، هەر ئەو خەسڵەتەیش کە زادەی هۆشیەتی یەکجار جودای دەکاتەوە لە گیانلەبەری دیکە چونکە لەواندا غەریزە هەیە دەیانگێرێت ناوناوەییک نەبێ هەندێ جانەوەر لە سنوورێکی تەسکدا هەڵوەستی زاتی دەبێت وەک ئەو وەفایە زێدە بەرچاوی سەگ کە لەوە دەچێت بۆ سوودی خۆی بێت. سەگیش تا سەگ فەرق دەکات. واش دەبێ جانەوەرێک ڕق لە غەیری هەڵدەگرێت و خەریکی تۆڵە سەندنەوە دەبێت، بەڵام ئەمانە سەرەڕای کەمبوونیان و ئەنجامێکی دیکە پەیدا ناکەن سەربە هیچ شتێک بگەیەنێتەوە وەیا گۆڕانێک لە حاڵوباری جانەوەرەکە پەیدا بکات... [باسی ئەو جانەوەرانە زۆری بەبەرەوەیە تا ئەوەی هەندێ لە زاناکان باس لە سایکۆلۆجیی جانەوەران دەکەن، بەڵام لێرەدا کارمان بەوانەوە نییە].

مرۆڤ لە ڕۆژی لەدایکبوونییەوە بوونەوەرێکی زاتییە. پێبەپێی تەمەنی جۆری خەریکبوونی دەگۆڕێت. لە هەر تەمەنێکدا بێت بە بابەتێکەوە خەریک دەبێت کە لەو تەمەنەدا جێی بایەخ پێدانی هەست و هۆشیەتی. نەک هەر ئەمە: گەلان بە پێی پلەی شارستانەتییان خەریکی گوزەران و ڕابواردن و خۆشی و ناخۆشی دەبن. مەوزووعاتی جیهان لە ئەزەلەوە هەر ئەوانەن کە هەن بەڵام مامڵەتی مرۆڤ لەگەڵیاندا بە پێی بەرەژوورچوونی زاتی دەگۆڕێت و پێش دەکەوێت.

هەرچی بابەت و ماددە و مەوزووعی جیهان هەیە ناتوانن مرۆڤ ببزێون ئەگەر تێیان نەگات، کە تێشیان گەییشت بە پیریانەوە ناچێت ئەگەر بڕوا بە سوودیان نەکات، بڕواش بە سوودیان بکات خەریکی دەردەست کردنیان نابێت ئەگەر توانای نەبێت وەیا لێی نەگەڕێت وەیا عەقیدە ڕێی پێ نەدات خولاسە هەتا بەداو خورد کردنەوەی چالاکیی مرۆڤ بکەوێت بۆت ڕوونتر دەبێتەوە کە وا مرۆڤ چەند زاتییە و چۆن مەوزووعیەتەکەشی هەر بە بۆتەی زاتەکەیدا تێدەپەڕێت ئنجا دەبێتە هاندەر.

دەبێ لێرەدا ئەوە لەبیر نەکەین کە زاتی مرۆڤ هەموو دەم ئازاد نییە لەوەی دەیکات و نایکات. لە گەلێک باردا ئازادیی ئیرادە تێدەچێت وەک کە هەڕەشە لێکردن بەکار بهێندرێت وەیا بە پارە دڵ و دەروون بکڕدرێت وەیا بە فەندی جادووگەرانە دڵ و دەروونەکە خەفە بکرێت. لەو تەرزە حاڵەتەدا زاتییەتی مرۆڤ زۆر کز دەبێتەوە بەڵام هەر دەمێنێ و هەر خۆی بڕیار دەدا سەر بۆ هەڕەشە دانەوێنێت وەیا بە پارە خۆی بفرۆشێت، مرۆڤی واش هەیە لەو حاڵانەدا زاڵ دەبێ بەسەر ترسی هەڕەشەدا و دەشکوژرێ بەڵام واز لە باوەڕی ناهێنێت. دیارە ئەو تەرزە مرۆڤە باوەڕی خۆی بە هەموو دنیا ناگۆڕێتەوە، تەنانەت کە نادروستیی باوەڕی خۆشی دۆزیەوە شەرم دەیگرێ وازی لێ بهێنێت. لەم حاڵەتەدا زات دەگاتە ئەوپەڕی زاڵبوون بەسەر بابەتدا. ئەوەی بە چاوی خۆشمان دەبینین شتێکە دژی چاوەڕوان کردنمان چونکە بە زۆر ئەوانەی بە خۆیان دەڵێن مەوزووعی و خاوەن بیروڕای ماددی پتر لە خەلقی دیکە پێ دادەگرن لەسەر ئەو بیروڕایانەی ڕۆژگار بە درۆیان دەخاتەوە.

لە نێوان خاوەن بیروباوەڕە ماددییەکاندا دوو سەرۆکی زێدە گەورە ئەم لایەنەی لەخۆ ڕازیبوون و باوەڕ بەخۆ هێنایان لەڕادەبەدەرە. هەر لە ڕێی ئەم خەسڵەتەشەوە بوون بە دوو ڕابەری هەرە گەورەی فکری ماتیریالیست چونکە قسەکانیان زەڕڕەیێک گومان لەخۆ کردن و ڕێدان بە ئیحتیمالی دوەمیان تێدا نییە. ئەوی دەڵێن لە شێوەی قەتعی وەها پتەو و بێ کەلەبەر جلوە دەبەستێ هەرچی باوەڕێکی دیکە هەیە لەتەک ئەودا بە کێش و تەرازووی ئەو پووچەڵە و درۆزن و وڕێنە و ئەفسانە دەردەچێت.

یەکەمی ئەو دوو ڕابەرە مارکسە و ئەوی دیکەیان لینینە. مارکس وێڕای ئەو هەموو زانیارە بێپایانەی لە مێشکی خۆیدا کۆی کردبۆوە، ماددەیێکی لە نووسینەکانیدا بەکار دەهێنا کە زاتەکەی خۆی بوو، ئەو زاتەی حەزی دەکرد بە گژ هەموو جیهانی دەرەوەی قەناعەتی خۆیدا بچێت و شەڕی پێ بفرۆشێت. برنارد شۆ لە وەسفی مارکسدا دەڵێ «یەکەم مرۆڤە بەسەر بەرزاییەوە ڕاوەستا و بێ ترس سەیری جیهانی کرد» بەڵام من یەک تەعدیلم هەیە لەم قسەیەدا ئەویش لێ زیاد کردنی دوو وشەیە: «... بەسەر بەرزایی نەفسی خۆیەوە» مەبەستیشم لە بەرزایی،

باوەڕ بەخۆ کردن و گیانی تەحەددی و هەڵمەت بردنە سەر باوەڕی غەیر و ئەو تەرزە خاسیەتانەیە، دەنا گەلێک کەسی دیکە هەیە لەسەر سەکۆیێکی زانستی بەرینتر و بەرزتریش لە سەکۆی مارکس، ڕاوەستاوە و پتر ڕاستییەکانی جیهانی زانیوە بەڵام لە زاتیدا ڕابەرایەتی و ئیمان بەخۆ هێنان و گیانی تەحەددی و هەڵمەت بردن نەبوە خەڵقیش بەدوا بریقەی زات و بریقەی قسان و بریقەی بەڵێنیان دەکەون نەک بەدوا بریقەی ڕاستی و دروستی کە زۆر جاران لە هەموو شتێک ناحەزتر دەبێت.

مارکس دەگەڕێ بەدوا باوەڕی پتەوی بە بنگە و بنج و بناوان و هەڵی دەتەکێنێ و یەکێکی خۆی لە جێگەدا دادەنێ هەرچەندە لەوەشدا «هەڵە»ی لە جێگەی «ڕاست» دانابێت. نموونەیێکی زێدە بچووک و زێدە بەرچاوی ئەم شەڕ بە دنیا فرۆشتنە هێرشە مەشوورەکەیەتی بۆ سەر یاسا یاسا ئابوورییە بەدیهیەکەی «عرض وطلب» کە هێندەی گەرمای هاوین و سەرمای زستان ئاشکرایە کەچی مارکس هات و یاساییکی وەها «زاتي» خستە جێگەی ئەو «موضوعي» یەوە بەوەدا کە نرخی شتانی گێڕایەوە بۆ ئەو ئیشەی لێی خەرج کراوە کە ئەگەر باوەڕی پێ بکەین دەبێ کیلۆی دونبەلان بە ئانەیێک بێت... ئەو گڵەی لە کاتی دۆزینەوەی ئەڵماسدا هەڵی دەکەنین دەبێ ئەوەیش بە نرخی ئەڵماسەکە بێت... چونکە دونبەلانەکە خۆڕسکە و مەسرەفی گوێزانەوەی پتر تێنەچوە، خۆڵەکەش بە قەدەر ئەڵماسەکە ماندووبوونی ویستوە.

لێرەدا هەر تەئویلێک بهێندرێتەوە بۆ بەدرۆخستنەوەی «عرض وطلب» و بەڕاست گێڕانی بۆچوونەکەی مارکس لەوە تێپەڕ ناکات کەوا ڕەنگە تەئویلێکی ژیرانە بێ و بایی کوشتنی کرمی گومانی ناو دڵان بکات [ڕەنگە نەشکات] خۆ ئەگەر زاتە لەخۆڕازییەکەی مارکس لێی گەڕابایە چ زەرەرێک لە مارکسایەتی و بیری ماددیش نەدەکەوت، ئەوسا قوتابیەکانی مارکسیش هەموویان دەبوونە محامی دەستوورەکەی «عرض وطلب» دەشیان کرد بە بەڵگەی عیلمیبوونی ماددییەتی مارکس.

لینین چونکە لە بارێکی پتر سەربە چالاکی و جموجووڵی شۆڕشگێڕانە بوە لەو بارەی مارکس تێدا ژیا، لایەنی زاتیەتی لێ دیارترە. لینین لە هەموو نووسینەکانیدا

یەک خەتی ڕاست و بێ خوارەکە و پێچەکەی بڕوابەخۆ کردن و غەیرڕیسوا کردنە، لەوەشدا ڕستەی وەها «زاتی» بەکار دەهێنێت دەبێ چەند جاران لێی ورد بیتەوە ئنجا یا تێی دەگەیت یا ناگەیت. بەڕاستی لینین هەموو ناحەزە فکرییەکانی خۆی بەلاوە لە ژێرووی پلەی جانەوەراندان. لەوەشدا یەک زەڕڕە زمان گرتن و وشەبەپاشدان و لێگرتنەوە بەکار نایەنێت هەر دەڵێی باسی قاپ و قاچاخ و بەڕە و سەرماوەر دەکات. لێرەدا نموونەیێکی مەیلەو واتا ئاشکرا لە نووسینەکانی دەهێنمەوە بۆ ئەوەی بزاندرێ بە چ چاوێکی سووک سەیری ئەوانە دەکات کە بە غەیانی پرولیتاریایان دادەنێت. لە لاپەرە 115 ی کتێبی [لینین: «*عن الامبریالیة والامبریالیین*» - دار التقدم، موسکو-1971] ئەم جەهەننەمە دەخوێنینەوە:

ولکن جمیع هؤلاء الکاوتسکیین، وهیلفردینغ والاوکیین، ومارتوف وشرکاه، هم، فی الواقع، متفائلون... من الانتهازیة. وکل المسألة هنا.

ان البرولیتاریا هي نتاج من الرأسمالیة، الرأسمالیة العالمیة، لا الاوروبیة وحسب، ولا الامبریالیة وحسب. ویقینا ان «البرولیتاریا» «ستکون» واحدة علی النطاق العالمي، بعد خمسین سنة او قبل خمسین سنة - تلک نقطة تفصیلیة في هذا النطاق - وبها ستنتصر الاشتراکیة- الدیمقراطیة الثوریة «بصورة لامرد لها» ولکن، لیس المقصود ذلک ایها السادة الکاوتسکیون، انما القصود انکم الان في البلدان الامبریالیة الاوروبیة، تزحفون علی بطونکم امام الانتهازیین الذین هم غرباء عن البرولیتاریا بوصفها طبقة، والذین هم خدم البرجوازیة وعملاؤها، وناقلو نفوذها وتأثیرها. واذا لم تتحرر الحرکة العاملة منهم، ظلت حرکة عاملة برجوازیة. إن دعایتکم «للوحدة» مع الانتهازیین، مع لیغن ودافید، مع بلیخانوف او تشخنکیلی، وبوتریسوف، وغیرهم واضرابهم، انما تعني، موضوعیا، الدفاع عن استعباد البرجوازیة الامبریالیة للعمال بوساطة خیر عملائها في صفوف الحرکة العاملة. إن انتصار الاشتراکیة الدیمقراطیة الثوریة علی النطاق العالمي أمر محتم إطلاقا، ولکنه سیجري وسیجري، یقوم وسیقوم ضدکم فقط. وسیکون انتصارا علیکم».

ئه وشانەی لەسەرەوە بە خەتی ڕەش نووسراون لە نووسینەکەی لینیندا خەتیان لە ژێر کێشراوە، نووسینەکەش هی ساڵی 1916 یە.

بەشێکی ئەم توندوتیژییە پێداویستی مەوزووعە، بەشێکیشی هی زاتە خورت و سەرکەشەکەی لینینە. هەرچی نووسینێکیشی من دیتبێتم لەو جۆرەیە. تێکەڵبوونی زاتەکە لەگەڵ مەوزووعەکە چاک بێت یا خراپ بێت لێرەدا لێی نادوێم، ئەوەی مەبەستمە تەنها ڕوون کردنەوەی لایەنی زۆر بەرچاوی «زاتی»بوونی بیروڕای ئەوانەیە لە بەرەی ماتیریالیستن. نەختێک وردبیتەوە دەبینی مرۆڤی وەک لینین کە هەڵوەستی «ئەوپەڕ»ی لە کۆمەڵایەتیدا هەیە وا بەڕاشکاوی دەوێری ئەو هەموو خەڵقە لەو هەموو هەڵوەستانەدا [لە سەرلەبەری کتێبەکە و گەلێکی دیکەی وەک ئەو] لە هەموو ڕوێکەوە ڕیسوا بکات.

سەیری چۆن لە کۆتایی قسەکانیدا هەر دەڵێی لە ئامانجی بنجیی شۆڕشی پرۆلیتاریا، کە بەزاندنی ئیمپێریالیزمە، دوور دەکەوێتەوە و دەلکێ بە بەزاندنی ئەو کەسانەی شۆڕشگێڕی سۆشیالیستی تەواو نین [سیجري وسيجري، يقوم وسيقوم ضدكم فقط- ئەم «فقط»ە هەرچی هێزی ئیمپیریالیزم و بۆرجوازیەتی هەیە لە حیسابانیان دەردەهاوێژێت. زاتییەت لەمە پتر مومکین نییە].

بەلای منەوە، وا دەزانم بە لای واقیعیشەوە، هێزی هەرە گەورەی مارکسایەتی و لینینایەتی لە زاتەکەی خۆیان و لەلایەتی ڕوحانیەتی فەلسەفەکەیانەوە پەیدایە نەک لەوەی پێی دەڵێن لایەنی ماددییەت و زانستایەتی، هەر ئەمەش بوو وای کرد بەدەنگ هاتنی پارتە کۆمیۆنیستەکانی دەرەوەی دەسەڵاتی سۆڤیەت دەیان ساڵ لە کاتی خۆی دوا بکەوێت. هەر ئەمەیشە وا دەکات تازەپێڕەوی کۆمیونیزم لە جێگەیێکی وەک کوردستانی عیراقدا پتر لە سۆفیی گەرمەتەریق جەزبەگرتوو دەبێت بۆ ئەو فەلسەفەیەی کە جاریێ هەر تێی ناگات چ دەڵێ. گومانم نییە لەوەدا کە کۆمیونیستێکی ئەوتۆیی ئەم قسانە دەخوێنێتەوە هەمان حاڵەتی خۆ ون کردنی دووچار دەبێ کە لە کاتی جنێودان بە شێخی تەریقەت دووچاری مریدەکەی دەبێ، کەچی ئەوەی گوتوومە شتێک نییە هیچ کەسێکی مەوزووعی زویر بکات چونکە سەدیێکی ئەوەم نەگوتوە کە کۆمیونیست لەسەری زمانیەوە بە هەموو دنیای دەڵێ.

ئەوانەی کە لە ماددییەتی تەقلیدی زۆر تێهەڵناکشێن، بە عادەت، گەلێک مەوزووعی ترن لەو ماددییە تەقلیدییانەی کە بە غەیری بیروڕای خۆیان هیچ نرخێک و بایەخێک نادەن، بگرە ئەگەر لە ناچارییەوە نەبێ هەموو بیروباوەڕێکی ناکۆمیونیست بە پووچەڵ و پاشکەوتوو و چەوسێنەرەوە دادەنێت، لە سەرەتای فەلسەفەکەشیانەوە گوتراوە و نووسراوە هەموو بیروڕا و بزووتنەوەیێکی غەیری مارکسی پێبەپێ دەبێ لەناو بچێ، ئەمەش بە فەرمانی مێژوو دادەنێن. نامەوزووعییەتی ئەم باوەڕە لەوەوە دێت کە نە خۆی ئەو چاکە و ئەو ڕاستەیە ئیدیعای دەکات نە غەیری خۆشی هەموویان ئەو بەدە و ئەو هەڵەیەن کە لێی کردوون بە تەمغەی حەتمیەت. مەوزووعیەتی باوەڕی دیکە کە زۆر تێهەڵناکشێت لە ماددییەت ئەویش لەوەوە دێت هەموو چاکە و ڕاستی دنیای بە بەر خۆی هەڵنەبڕیوە، بەدی و هەڵەشی نەکردوە بە شەقڵ و دروشمی غەیری خۆی، لەبەر ئەمە دەرگەی مەوزووعیەت لە باوەڕە ماددییەکە داخراوە ناتوانێ مەودا بدات بە تەعدیل و ڕاست کردنەوەیەکی کە تەجرەبە دەیکات بە پێویست چونکە خۆی ناچار کردوە بە بەردەوامبوون لەسەر قەناعەتەکانی با هەموو ڕۆژەکیش دەیان هەڵەی لێ ئاشکرا بێت.

لایەنەکەی دیکە بەم جۆرە تەسکپێوەییە خۆی بە تاکە ئیحتیمالی «ڕاست و چاک» نەبەستۆتەوە، لە مەیدانێکی بەرفرەوانەوە سەیری جیهان دەکات و ئیحتیمالی هەڵەبوونی خۆی و ڕاستبوونی غەیری خۆی لە حیساباندا دەهێڵێتەوە. هەر بۆیەشە فکرەی ماددی لە سێبەری دەسەڵاتی غەیری خۆیدا دەتوانێ گەشە بکات و بشگات بە حوکم، ئەگەر باوەڕەکانی دیکەش وەک ئەو هەموو جیهانی غەیری خۆی بە غەیان دانابا نەیدەهێشت ماددییەتەکە هەناسە هەڵێنێت وەک کە ماددییەتەکە لە یەکەم ڕۆژی گەیشتنی بە دەسەڵات هەموو باوەڕێکی غەیری خۆی تەفروتونا و تاوانبار دەکات. کە دەڵێن «حەتمیەتی سەرکەوتنی فکرەی ماددی» لەم ڕاستییەوە هێز وەردەگرێت نەک لەبەر ئەوەی فکرە ماددییەکە بەچکە شەرعییە نازدارەکەی بەرەوپێشچوونی کۆمەڵایەتییە.

لەو وڵاتانەی بەرەی کۆمیونیست تێدا دەسەڵات وەردەگرن هەرگیز پاراستنی خۆیان تەسلیم بە «بڕیاری مێژوو و حەتمیەتی چارەسەر کردنی سۆشیالیست» ناکەن، بە پێچەوانە وەها خۆیان پڕچەک دەکەن و حیزبایەتی دەسەپێنن و غەیری خۆیان

کەنەفت دەکەن هەر دەڵێی بڕیاری مێژوو دژی خۆیان دەرچوە. لێرەشدا ئەو بەهانەیەی کە کۆمیونیستەکان دەیهێننەوە بۆ سەرکوت کردنی غەیری خۆیان بەوەدا کە گۆیا ئەمە تاکتیکە بۆ خۆ پاراستن دژی دوشمنەکانیان. ئەم بەهانەیە ج بایەخێکی نییە چونکە کەس ڕێی لێ نەگرتوون بۆ خۆ پاراستن دژی بێگانە لەشکر و ئاتۆم و گوللەبەند و تیغبەندیش پێکەوە بنێن، ئەوەی جێی گلەییە سەرکوت کردن و دەمکوت کردنی میللەتەکەی خۆیانە کە سەد ساڵیش لە گەیشتنیان بە دەسەڵات هەر نایەڵن ورتەی لەبەرەوە بێت.

ئەگەر ڕاستە گۆڕانی حەتمیی مێژوویی، جیهان بەرەو کۆمیونیزم دەبات با ئەوانیش وەک دەوڵەتێکی کەمدەسەڵاتی وەک دانمارک و سویسرە نەختێک ڕێگە بەو حەتمییەتە بدەن لە خۆوە و بێ بگرە ببەستە باڵ بەسەر میللەتدا بهێنێت. هەڵبەت دەزانم ڕێبازی مرۆڤ بەرەو کەم کردنەوە وەیا نەهێشتنی جودایی ڕێکاری ژیانی تاک و چین دەڕوات، هەرچەند ئەمەش ئەگەر بە ڕێگەی ئاساییدا بەرەو تەتبیق بڕوا ڕەنگە زۆر بخایێنێ، ئەمە دەزانم و باوەڕم هەیە بێ ئەمە گوزەران مومکین نابێ بەڵام نە مەرجە پێک هاتنی یەکسانی و دادی کۆمەڵایەتی لە ڕێی دیکتاتۆریەتیی پرۆلیتاریاوە بێت [کە هەرگیز پرۆلیتاریاش لە وڵاتی کۆمیونیست لە ڕەعیە بەولاوە نەبوە] نە ڕاستیشە گۆیا هەموو بیروڕایێکی باسی داد و یەکسانی دەکات ئەگەر مارکسی نەبێ درۆ و دەلەسە و خیانەتە.

چی کۆمیونیستەکان بە میرات لە نەزەریەی مارکسی لینینیان پێ گەیشتوە لە زاتی ئەو دوو شۆڕشگێڕەوە زەنەی کردوە پتر لەوەی ڕاستەوخۆ بە جۆگەلەی حەتمییەتی مێژوودا لە ڕێی مێشکی ئەو دوو کەسەوە بۆیان بووبێت بە مەشخەڵ. بێگومان ئەو بیروڕایانەی کە مارکس و ئەنگلز وا ڕادەنوێنن زادەی ڕووداو و کۆمەڵایەتی و ئابووری و مێژوون، تێکەڵ بە زاتی ئەوان بوون و بەشێکی زۆری باوەڕی شەخسی ئەوانیان لەگەڵ خۆیاندا کرد بە ناوەڕۆکی نەزەرییە.

کە دەڵێن ئەگەر مارکس نەبا یەکێکی دیکە نەزەریەکەی دادەڕشت. لەم گوتەیەدا ڕاستییەکی بەقەدەر ئاسمان ئاشکرا و بەرین دەشارنەوە: بەڵێ خەڵقی دیکە دەبوو، هەشبوو، ماددییەتی مێژوویی و دەوری پرۆلیتاریا... و هتاد بکات بە نەزەرییە بەڵام لەوانە بوو پێوەندی نەبێت بەو مارکسایەتیەی دەیناسین و دەیزانین چونکە

جوداوازیی نێوان فەلسەفان زۆر بە ئاسانی و بە لێک ترازانێکی کەم پەیدا دەبێت و ئاکامی یەکجار گەورەش دادەهێنێت، بە نموونە ئەگەر ئەو کەسەی لە جێگەی مارکس دەبوو بە داهێنەری ماددییەتی جەدەلی تەنها فەقەرەی دیکتاتۆریەتیی پرۆلیتاریای لە نەزەریەکە کەم کردبایەوە، وەک بەو دواییە پارتی شیووعیی فەرەنسەیی کردی، سەرلەبەری بزووتنەوەی شیووعی دەگۆڕا، لەوانە بوو ئەوسا پلیخانۆف جێی لینینی گرتباوە، ستالین پەیدا نەبێ. بەرەی یەکگرتووی شیووعی و سۆشیالیستان جیهانیتر و پتەوتر و هەمیشەییتر بوویایە، نازی نەگاتە حوکم [بە یەکگرتنی کۆمیونیستەکان و سۆشیالیستەکانی ئەڵمانیا].... دەیان پاشەکشەی نەزەریەش کەوا، لەبەر چەپرەویەکی تێیدایە. بەناچاری بە مل دەوڵەتە کۆمیونستەکاندا دێت بێلزوم بایە [هەرچەند بە زمان و بە نووسین دان بەو پاشەکشانەدا ناهێنن. بەڵام لە چاوی نووستوش دەچەقن...].

بێگومان هەموو ناواقیعیەتێکی کە لە نەزەریەی کۆمیونیزمدا هەیە کاری ئەو زاتانەیە کە دانهێناوە و پشت لە ماددییەت و مەوزووعییەتیشە کە گۆیا ناوەڕۆکی نەزەریەکەیە. لە تەجرەبەی رۆژانەماندا دیتوومانە، لەو کاتەدا کە بەرێکی غەیری کۆمیونیست هەڵوەستێکی خۆبەختکەرانە و دڵسۆزانە و ڕاست و دروستیان هەبوە، لەپڕ هێرشیان براوەتە سەرێ لەلایەن بەرەی کۆمیونیستەوە بەدەست و بە زمان و بە قەڵەم و بە دروشم، زۆر جارانیش هێرشی کۆمیونیستەکان دەنگدلێرتر و پاتەوپاتتر و بریندارکەتر بوە لە هی ئەو حکومەتە ڕەجعییەی کە هەڵوەستەکە دژی بوە. لەو تەرزە حاڵەتەدا کە لایەتی خاوەن هەڵوەستەکە چ تاوانێکی نەبووبێت، یا دەبێ بڵێین لایەنە کۆمیونیستەکە لەبەر بەدی و هەڵەیی خۆی هێرش دەبات، یا دەبێ بڵێین لە تێوەرامانێکی زاتیی دوو لە مەوزووعیەتەوە گومانی بەد لە غەیری خۆی دەکات چونکە ئەگەر وا نەڵێین ئەوسا لە باشترین ئیحتمالدا دەبێ نەخۆشی نەفسی ئەو کارە نارەوایەی پێ بکات. بۆیەش ئەمە باشترین ئیحتیماله چونکە کە هۆی هێرشەکە بەدی و هەڵەیی بیروباوەڕ نەبوو. تێوەرامانی زاتی نەبوو، نەخۆشی نەفسی نەبوو دەمێنێتەوە تەنها هۆی جێبەجێ کردنی فەرمانی بێگانە. ئەو کەسە و ئەو لایەنەی بە خۆڕایی هێرشی دەبرێتە سەر باشترین بەڵگەیە بۆ سەلماندنی مەوزووعینەبوونی لایەنی هێرشبەر، کە مەوزووعیەتیش لە نێواندا هەڵستا هەر

دەمێنێتەوە هۆی زاتی ڕاڤەی ئەو هێرشە بکات چونکە ئەوەی ڕاستی بێ، نەخۆشی نەفسی و فەرمانبەرداری بێگانەش هەر دەگەڕێتەوە بۆ هەڵوەستی زاتی بەڵام لە حاڵەتی بێگانەنەوازیدا هەڵوەستە زاتییەکە بە چاوی کراوەوەیە نەک وەک نەخۆشی نەفسی کە نەخۆشەکە هەستە بە خۆی ناکات.

ڕەنگە بگوترێ لەو حاڵەتانەدا کە بیرکردنەوەی دەروون و هەڵکەوتی دەرەوەی وجوودی مرۆڤ یەکسان بوون ڕێگە نامێنێ بۆ تێخوێندنەوەی دەوری سەربەخۆی زات، بەڵام ئەم لێکدانەوەیە تۆزاڵی سەرەوەی ڕاستی و واقیعی ئەنگاوتوە چونکە ئەوەی مرۆڤەکە دەبزوێنی بڕیاری زاتەکەیەتی، لەگەڵ واقیع یەکسان بێ یا یەکسان نەبێ. من کە تینوو بووم و لە دوورەوە بریقەیێکم دیت و بە ئاوی تێگەیشتیم، بۆ ئەو بریقەیە دەچم بە پێی بڕیاری زاتی خۆم و بە نیازی ئاو خواردنەوە، لەوە بەو لاوە دەشێ بریقەکە هی ئاو بێت و دەشێ هی شتێکی دیکە بێت وەک شووشە و ئاسنجاو. پاسەوان کە لە شەوی تاریکدا تارمایی دیت، تفەنگی پێوە دەنێ ئیتر لەوانەیە تارماییەکە هی دز بێت لەوانەشە هی باباییکی بێ خەتا بێت وەیا هی برادەرێکی خۆی بێت وەیا هی ئاژەڵ بێت وەیا ڕەشکەوپێشکەی چاو بێت.

هەڵبەت بەڕادەی نزیکبوونەوەی بڕیاری زات لە پێداویستی واقیع بڕیارەکە «مەوزووعیتر» دەبێت بەڵام هەرگیز خوازی زاتەکە ناپووچێتەوە بەوەدا کە لەگەڵ واقیع گونجاوە چونکە هەمیشە بڕیارەکە لە زاتەوە دەردەچێت نەک لە واقیعی دەرەوەی زات. زۆر جاران دەگوترێ بەرژەوەندی ماددی خەڵک دێنێت و دەبات ئەم گوتەیەش وەک بەڵگەنەویست حیساب دەکرێت بەڵام فێڵێکی گەورەی تێدایە بێ ئەوە کەس مەبەستی بێت لەو گوتەیەدا فێڵ بکات. بۆ ئەوەی گوتەکە ڕاست بێت و فێڵی تێدا نەمێنێت دەبێ بڵێین مرۆڤ بەرژەوەند لە چدا ببینێت ئەو دەکات ئیتر ڕەنگە بەرژەوەندەکە ماددی بێت یا مەعنەوی بێت [حەج، نوێژ، پیتاکدان، خۆبەخت کردن...] وەیا بەرژەوەندێکی مەوهووم و دۆزن بێت، تەنانەت لەوانەیە مرۆڤ شتێک بە بەرژەوەند بزانێت و بیکات کەچی گەورەترین هەڵەی کوشندەی هەموو ژیانی بێت. واش دەبێ مرۆڤەکە دەزانێ لە ڕووی سوودی ماددییەوە فڵانە شت یەکجار خراپە کەچی بە پاڵەپەستۆی هەستێکی دیکە گوێ ناداتە سوود و زیان و چەندوچۆنی ئەو شتە و بێ دوودڵی، بە شانازییەوە دەیکات.

ئەم حاڵەتانە و هەزاران و ملیۆنان حاڵەتی دیکەی وەک ئەوان لەبەر چاومانن و هەمووشیان هەر ئەو دەسەلمێنن کە ڕەفتاری مرۆڤ وەک هۆشی ئەلیکترۆنی و تەرمۆتر نییە بە شێوەیێکی ئالی فەرمانی سروشت و دەوروبەر جێبەجێ بکات، وەک گیانلەبەری دیکەش نییە بە پێی حوکمی غەریزەی سادە بجمێت و بجووڵێت: لە مرۆڤدا «زات» هەیە وێنە و شەبەنگ و واتا و نرخ و سوود و زیانی جیهانی دەرەوەی خۆی پێدا تێدەپەڕێت و بە جۆرێک لە جۆران هەڵدەسەنگێندرێت و بڕیاری بۆ دەردەچێت، هەر کاتێکیش ئەو زاتەت لە مرۆڤدا کوشت وەیا بێدەسەڵاتت کرد وەیا فێڵت لێ کرد مرۆڤایەتیەکەی دادەلەنگێت تا ئەو ڕادەیەی کە یەکێک بە خەوی مغناتیسی دەخەوێندرێت جڵەوی زاتەکەی دەکەوێتە دەست یەکێکی تر و ئیرادەی نامێنێت. شێت مافە ئازادەکانی مرۆڤایەتیی نابێت چونکە زاتی هۆشداری نییە لە کاریان بهێنێت. منداڵ هەموو ئەو مافانەی کە بەندن بە «زاتی تەواو»ەوە لێی دەگیرێتەوە تا دەگاتە پلەی مرۆڤایەتی تەواو.

هەموو فێڵبازەکانی جیهان ■ لە مەیدانی سیاسەت بێ چ لە ئاین چ لە ئابووری چ لە هەر شتێکی دیکە بێ لە ڕێی پەکخستن و کول کردنی زاتی ئەو خەڵقەی فێڵیان لێ دەکەن دەگەن بە ئامانجیان ئیتر لەوەدا جۆرەها هۆی پەکخستن و کول کردنی زات بەکار دێت هەر لە چاوبەستەکێ و بەڵێنی درۆزنەوە تاکوو دەگاتە حەبس کردن و کوشتن و تۆقاندن، کە زاتەکەشی پەکی کەوت و نەیتوانی وەیا لە بیری چۆوە ڕازی نەبێت و دەست بکاتەوە، سامانەکەی و خێر و خۆشیەکەی دەبێتە هی ئەو کەسە وەیا ئەو لایەنەی سواری زاتەکەی بوە.

تۆ سەیری شێخی تەریقەتی ساختەچی بکە چۆن دڵ و دەروونی دەروێشەکەی خۆی داگیر دەکات، لەوەش بەولاوە چۆن دەروێشەکە گڕ دەخوا لە وڵات تا لوقمەیێک پەیدا دەکات و دەیخاتە زاری شێخەکەیەوە. لە سیاسەتیشدا دیتومە و تۆش دیتوتە گەنجی تازەپێگەیشتووی بێتەجرەبە وەک دەروێشی شێخەکە گیانبازی بۆ سەرۆکی خۆی کردوە تا سنووری خۆ بە قوربان کردن. بەهەمەحاڵ هێندەی بەدیهیە ئاشکرایە، تۆ کە دڵ و مێشکی یەکێکت بۆ خۆت دزیەوە هەموو شتێکی دەبێ بە هی تۆ. بۆ ئەوەی ئاگاشمان لە هەموو سەروبەرێکی ئەم لێکدانەوەیە بێت پێویستە ئەو بزانین کە بە هۆی خەریکبوونی جەردەی فکر و فێڵباز و باخەڵبڕ بە

بەرژەوەندی مادديیەوە مامڵەتەکە و فێڵ لێکردنەکە لایەنی زاتی نادۆڕێنێت، بە پێچەوانە لێی زیاد دەکات چونکە کابرای فێڵلێکراو ماددە دەدۆڕێنێت. دیارە لە ڕێی کوێر کردنی زاتیشیەتی ماڵ دۆڕاندنەکەی لێ خۆش دێت.

لێرەدا وا بەچاک دەزانم قسەیێکی پێشووتری خۆم بهێنمە ناو ئەم لێکدانەوانە بە نیازی پتر ڕوون کردنەوەی بابەت و، تاڕادەیێکیش، پتر ڕوون کردنەوەی قسەکە خۆی.

لە لاپەڕە 32ی بەرگی سێیەمی کتێبی «*حاجی قادری کۆیی*» لە ئاست موناقەشەی هەندێ بیروباوەڕی تەسکپێوی ماددی ئەمەی خوارەوە دەخوێنێتەوە:

*«تێکڕای ئەو بیروباوەڕانەی وا دەزانن شی کردنەوەی مێژوو بە شێوازی ماددی بریتییە لە دۆزینەوەی پێوەندی ماددی ڕەق و زەق و بە وەزن و سەنگ خۆ دەدزنەوە لە واقیعێکی کۆمەڵایەتی گەلێک گەورەتر و بەرینتر و قووڵتر و ئاڵۆزکاوتر و بەگیروگرفتتر لەو واقیعە سادەیەی کە بە موعادەلەی ڕیازی و پێوانەی بەرژەوەندی بازاڕی و ڕاستە حیسابی کڕین و فرۆشتن و سوود و زیانی مامڵەتی ڕۆژانە شی دەکرێتەوە: هەروەک مرۆڤ بریتی نییە لە شێست کیلۆ ئاو و دە کیلۆ خوێ و چەند کیلۆیەک ئاسن و خەڵووز و گەچ کە نرخی هەموویان لە دوو دینار تێپەڕ ناکات هەروەها کۆمەڵایەتیش بریتی نییە لە چەند دەستوورێکی سادەی بێ قووڵایی و لەسەر زەقایی ماددە هەڵچەقیو.*

*مرۆڤ و کۆمەڵایەتی بە هۆی ئەو تایبەتیە یەکجار بێمانەندانەی کە لە هەموو جیهانیان جوداواز دەکاتەوە بە سروشت و گیانلەبەریەوە، لە شێوەیێکی زۆر ئاڵۆزکاو و سەیر و گرنیاویدا، پتر لە دەروونی خۆیاندا ڕووچوون نەک لە ماددە. تەجرەبەی ڕۆژانەی دەیان و سەدان و هەزاران ساڵە ئیسپاتی ئەوە دەکات مرۆڤ و کۆمەڵایەتی ڕەگی پێوەندییان بە وجوودەوە لە تۆژاڵی سەرەوەی ماددەوە ڕۆ دەچێت بەرەو ناخی ناوەڕۆکی خۆیدا؛ هەروەک گیا لە زەوی و ئاو و هەوا و تیشکی ڕۆژەوە ماددەی مردوو وەردەگرێت و دەیکات بە ماددەی زیندوو (عضوي) هەروەهاش مرۆڤ لە دەوروبەری ماددی و*

*بەرژەوەندی گوزەران و هۆیەکانی مانەوەی نەوع و دیاردەکانی سروشت و هەزاران ماکی بزوێنەری چەرخ و مەنگەنەی ژیان و بوون بەسەربردنەوە کەرستەیێکی خامی سەرەتایی دەداتە بەر مێزە زگماکەکانی بێئەژماری هەست و زانین و هۆش و سۆز و بەزەیی و ڕقبوونەوە و بە خۆدا شکانەوە و ترس و ئازایی و نەزانین و بەسەهوو چوون و بیری چەوت و ئێشان و بێهێزی و خۆشی و نەخۆشی و جینس و تەماع و حەپەسان و چەند هەزاران خاسیەتی تری ئاشکرا و بزری مرۆڤایەتییەوە، لەوەوە کیانێکی ماددی - مەعنەوی - عەقلی- عاتیفی- مەنتیقی- غەیبی - تەمەعکارانە - خۆبەختکەرانەی ڕەنگاوڕەنگ و هەزار ئاواز و دە دەرگە و دەربوونەی لێ دروست دەکات کە هەر یەکێک لەو باریکە ڕێگایانەی لێی دەبێتەوە و تێی دەکەنەوە جیلاوجیلی زانا و پسپۆڕ و پشکنەر و لێکۆڵەرەوە خەریک دەکات و بەشەڕیان دێنێت و لێکتریان نێزیک دەکاتەوە و دووریان دەخاتەوە و پێلیان دێنێتەوە تاکوو لە ئاکامی ئەو شەڕ و ئاشتبوونەوەیەیاندا لەسەر شتێکیان هەڵدەوەستێنێت کە لەوانەیە بەتەواوی پێچەوانەی ڕاستی بێت و لەوانەیشە جەرگەی حەقیقەتی گرتبێتەوە».*

ئەم لێکدانەوەی ناو کتێبەکەی *«حاجی قادری کۆیی»*، وەک ئێرەکانە، مرۆڤ لە جێگەی ڕاستینەی خۆیدا دادەنێت و دەیداتەوە بە هەموو ئەو کاریگەرانەی کە لە زاتی خۆیدا زگماکە و ئەوانەی لە سروشتدا دەبنەوە بە هاندەری زاتەکە وەیا لە ئاکامی پەیدابوونی کۆمەڵایەتی بە هەموو لایەنە ماددی و مەعنەوییە چاکەکان و بەدەکانیەوە بۆتە کاریگەر و هاندەر و پەکخەر. ئەگەر کوردەغیرەتی و کورتبینی و تەعەسوب لێمان بگەڕێ زۆر چاک دەزانین تاکە هۆی بەرژەوەند و تەماع و ماددە ناتوانێ تێمان بگەیەنێ بۆچی جوداوازیی زمان خەڵقی شارێک بەتەواوی دەکاتە دووکەرتی سەرلەبەر بێ ئەوەی دەوڵەمەندایەتی و هەژاری بتوانێ لەوەدا دەوری هەبێ؟ بۆ چی دوو برای داک و بابی یەکیان دەبێتە چەپرۆ ئەوی دیکەشیان دەچێتە خەندەقی بەرانبەر، خۆ هەتا بمانەوێ نموونەی یەکسانی و هاوچوونی دەوروبەر بێنینەوە لە برایانمان چاکتر چنگ ناکەوێ؟ بۆ چی زۆر لە بەچکە ئاغاکانی دزەیی،

**دوای شەڕی دوەم، بوون بە شیووعی و هۆیەکی بەرچاوی بزووتنەوە فەلاحیەکەی دزییاتی ساڵی 1953 لەوانەوە دەرکەوت؟**

فەلاحی دزەیی لە کاتی تەسویەی زەوی کە هێشتان ڕابەری سیاسی بەرەی چەپیان تێدا پەیدا نەبووبوو لە خۆیانەوە مڵکایەتی زەویەکانیان بۆ ئاغاکان ئیسپات کرد و نەمبیستوە کەسیان لەسەر زەوی هەرای نابێتەوە، مەگەر کێشەی عادەتی کەوا لە نێوان فەلاح و فەلاحیش پەیدا دەبێ بێ ئەوەی بێنی چینایەتی لێ بێت؟ بۆچی فەلاحی مسڵمان کچی خۆی نادات بە فەلاحی گاور؟ بۆچی پیاوێکی عادەتی لاهۆر، کابول... دڵیان نایەت بایی دوو دینار لە پێناو بەرژەوەندی گشتی ماندوو بێ کەچی بە کوێرەوەری چەند سەد دینارێک پەیدا دەکەن و دەچن بۆ حەج؟ زۆر جاران لە ئاست ئەم پرسیارەدا گوێت لێ دەبێ دەڵێن کابرای حەجکردوو دوای گەڕانەوە بە هۆی کەشیدەی سەریەوە باشتر دەتوانێ لە مامڵەتدا فێڵ لە خەڵق بکات، واش تێدەگەن ئەم وەرامە فزەی لایەنی ئایینی بڕی و ماددییەتەکەی بە ئیسپات گەیاند!!

ئەم خەیاڵە نەک هەر بەتاڵە، بەرەواژیشە، چونکە ئەگەر بشسەلمێنین هەموو جاران حاجی بە نیازی فێڵ لە خەڵق کردن دەچێتە حەج - کە ئەمە هیچ پێوەندی بە ڕاستییەوە نییە - بەوەدا هەر هەڵوەستی مام حاجیمان ڕوون کردەوە؛ ئەو خەڵقەی کە بە کەشیدەکە هەڵدەخەڵەتین، بۆ کام تەماعی ماددی لە حاجی دەسەلمێنن فێڵیان لێ بکات؟

بەڕاستی حورمەتی حەجەکە بەلای خەلقەوە لەوەدا پتر دەردەکەوێ کە حاجی بۆ دەستبڕین حەج بکەن چونکە هەڵبەت ئەو نیازەی دەستبڕین، کە هەبێ، دەنگ و باسێکی دەگاتەوە لای خەڵق، ئیتر کە لەگەڵ ئەوەشدا گوێ نەدەنە فێڵبازیەکەی و هەر مامڵەتی لەگەڵدا بکەن دیارە حورمەتی کەعبە گەلێک لەوە پترە کە من و تۆ بە خەیاڵماندا دێت، وەک ئەوەی کوڕێک کچێکی خۆش بوێت بشزانی بۆسەی لێ داندراوەتەوە هەر بۆ ژوانی بچێت دیارە خۆشویستنەکە عادەتی نییە. ئەو حاجیە درۆزنەی کە بۆ قۆڵبڕین دەچێتە حەج دیارە دەزانی کەعبە و حەجەروڵئەسوەد بەلای مسڵمانانەوە بەحورمەتن و ڕێز لەو پەڕۆیەی تۆقەڵەی سەری حاجییان دەنێن کە نیشانەی بەدەوردا گەڕانی کەعبە و ماچ کردنی بەردە ڕەشەکەیە. حورمەتەکەش هی غەیبە نەک هی دنیا دەنا دەبوو فێڵبازێکی کورد بچێ سەردانی قەندیل و دەشتی

دزیبان بکات، کە ئەویان هاوینەهەوارێکی بەهەشت ئاسایە ئەمیشیان ئەنباری گەنمە زێڕینەی وڵاتی کوردانە، ئیتر بگەڕێتەوە بۆ دێیەکە و شارەکەی خۆی و بە خەڵق بڵێ ئاوەرن دەستم ماچ بکەن و لێم گەڕێن قوڵتان ببڕم چونکە حەجی وڵاتە پیرۆزەکەتانم کردوە!! فروفێڵی حەجکردوان پتر ئیسپاتی بەرزیی پلەی حەج لە دڵاندا دەکات نەک بە پێچەوانە. خۆ ئەگەر فێڵبازیی بە ناوی ئایینەوە بکەینە بەڵگەی کەمبایەخیی ئایینەکە کەواتە دەبێ فێڵبازی بە ناوی سۆشیالیزم و کۆمیونیزمەوەش بکەینە بەڵگەی پووچەڵییان، چونکە دەزانین زۆر کەس بۆ مەرامی کاری خۆی ڕەنگی ئەو بیروباوەڕانە لە خۆی هەڵدەسوێت و پێی دەوڵەمەند دەبێ!!

بیستوومە لە وتووێژدا گوتراوە، لە ساڵی گرانیدا قورئانیان بە نان دەدا، بە مەشدا وا ڕادەنوانرا کە حورمەتی نان لە قورئان پتر بێت. هەڵبەت دەزانم نان و هەموو هۆیەکی ژیان و گوزەران بەحورمەتە، بەڵام مەسەلەی فرۆشتنی قورئان بۆ پەیدا کردنی نان لە ساڵی گرانیدا نرخە مەعنەویە یەکجار زلەکەی قورئان نیشان دەدات چونکە لەو تەرزە قات و قرییەدا هەر زێڕ و ملک و شتی ئەوتۆیی نانی پێ دەهات، ئەگەر ئەولادت فرۆشتبا کەس نانێکی پێ نەدەدا، کەواتە ئەگەر ڕاست بێ قورئان نانی هێناوە دیارە گەلێک بەولای زێڕ و ملک و نانەوە بەحورمەت بوە لای ئەو کەسەی کڕیویەتی چونکە قورئان نە دەخورێ و نە لەبەر دەکرێ و نە دەزێ و نە فلسێک دەخاتە گیرفانانەوە و نە هیچ جۆرە سوودێکی ماددی لێ پەیدا دەبێ.

ئەو کەسەی کە قورئانی لە ساڵی گرانیدا خستە تای تەرازووی نانەوە بۆچی ئەو هەڵسەنگاندنە لە ساڵی هەرزانیدا ناکات تا بزانێ یەک قورئان نانان دەهێنێت. لە ساڵی گرانی پشیلەیێک خانوویێک و دوو ئافرەتی جوانی دەهێنا.

من مەبەستم نییە لێرەدا داوا لە خوێنەر بکەم مسلمان بێت و ڕۆژی جزمێکی قورئان بخوێنێتەوە، تەنها مەبەستێکم هەبێ ئەوەیە کە لایەنی «زاتیبوون»ی مرۆڤ بهێنمە بەر چاوانەوە و مێشکی خوێنەر بۆ ئەو ڕێبازە فکرییانە ببەم کە بەلای خۆمەوە باشتر لە قسە عادەتیەکانی نێو ڕۆژنامە و گوتاری دڵگەرمانە ڕاستی دەوری مرۆڤ لەم ژیانەدا دیار دەخەن ئیتر دەورەکە چاک بێ یا بەد. من دەمەوێ بڵێم مرۆڤ حوکمڕانی کۆمەڵایەتییە و تاکە عامیلی کاریگەری ئیجابییە هەتا لەو

حاڵەتەشدا کە دەسەڵاتی بەسەر شتاندا ڕاناشکێت، حوکمڕانییەکەشی لەو خەسڵەتانە و تایبەتیانەوە دێت کە هەر لە مرۆڤدا هەیە.

ڕەنگە بگوترێ ئەو میسالانەی لەو لاپەڕەی دواییدا هێنامنەوە میسالی کەمبایەخ و مەیدانکورتن کە بە هەر لایێکدا بکەوێت سوودی زۆر پێ ناگەیەنێت و زەرەری گەورەش لە لایەنەکەی دیکە نادات: حەج و قورئان و حەرامبوونی ژنی مسڵمان لە گاوران و دەوری بەچکە ئاغای دزەیی لە بزووتنەوەی فەلاحان و ئەو تەرزە شتانە کەنگێ دەچێتە پلەی بایەخی ئەو بزوێنەرە ماددییانەی کە دەوڵەتان دەورووژێنن و شەڕان هەڵدەگیرسێنن و پاپۆڕان بە دەریایاندا دەگێڕن و پسپۆڕان بۆ بنی دەریا و زەقایی قوتبەکان دەنێرن و پەیمانان بنیات دەنێن و هەڵیان دەوەشێننەوە و خۆبەختکەران بە بۆمباوە دەنێرن بۆ دەستبەسەردا گرتنی تەیاران لە تاقی ئاسمان و... و... و هەزاران و ملیۆنان شتی وەها بە مرۆڤ دەکەن کە هەموو مێژوو و ئێستاکەی پڕ کردۆتەوە و دوارۆژیش بە خۆیەوە خەریک دەکات: نەزەرەیەی ماددی لەبەر ڕۆشنایی ڕووداو و بەرژەوەندی گەورەی ئابووری و سیاسی... و هتاددا مرۆڤی کردۆتە کارتێکراو کە دەبینین بە داخوازی ئەو کاریگەرە زلانە مرۆڤ بە خۆی و کۆمەڵایەتی و دەوڵەتەکانیەوە دەجمێ و دەرەقسێ و کڕنووش دەبات.

ئەم قسەیە لە ڕواڵەتدا پاڵپشتییەکی باشی زاڵبوونی ماددە بەسەر مرۆڤدا دەکات، بە ئاسانیش قەناعەتی زوربەی خەڵق دەهێنێت و مەسەلەکەیان بە سەرکەوتنی ماددە بۆ ساغ دەکاتەوە چونکە وەک گوتوومە، خەڵقی دیکەش گوتوویانە، کەمتاکورتێکی خاوەن بیری ورد نەبێ کەس تاقەتی ئەوەی نییە پەردەی ڕواڵەت هەڵبداتەوە تا بزانێ لەو دیو پەردەکەدا چی هەیە! بەڕاستی فەلاکەتی زۆر گەورەی مرۆڤ ئەوەیە کە وا لە زۆر حاڵەندا بەرژەوەندەکەی لەوەدایە واقیع وەک هەیە وای وەربگرێت کەچی لە ڕێی «زات»ەکەیەوە «تصور»ی واقیعەکە دەکات و لێی بەسەهوو دەچێت. ئالێرەدا خەڵق بە ڕواڵەتی قسەکە هەڵدەفریوێن، بەڵام ئەگەر «موضوعی» بان دەهاتن ڕاستی شتانیان دەکرد بە بنکەی بڕیار و قەناعەت نەک ڕووکەشی شتان.

جارێ لە پێشەوە ئەوە بڵێم، من بەر لە چەند لاپەڕەیێک (بگەڕێوە بۆ لاپەڕە 77)[3] بیروڕایەکی بنجیم دەربڕی بەوەدا کە گوتم:

*«مرۆڤ بەرژەوەند لە چدا ببینێت ئەوە دەکات ئیتر ڕەنگە بەرژەوەندکە ماددی بێت یا مەعنەوی بێت وەیا بەرژەوەندێکی مەوهووم و درۆزن بێت، تەنانەت لەوانەیە مرۆڤ شتێک بە بەرژەوەند بزانێت و بیکات کەچی گەورەترین هەڵەی کوشندەی هەموو ژیانی بێت...».*

بەمەدا ئاشکرایە من نەمگوتوە مادده نابێتە هاندەر، هەڵبەت ناشبێ وەها بڵێم چونکە کە بەلامەوە زاتی مرۆڤ بڕیاری چاکە و خراپە و سوود و زیانی شتان بدات دیارە دەبێ یەکەم شتێکی ببێتە بنگەی ئەو بڕیارە و زەرفی تەفاعولی زاتەکە جیهانی ماددی بێت نەک وڕێنە و وەهم و خەیاڵ تەنانەت وڕێنە و وەهم و خەیاڵەکەش هەر لە ئاکامی گەییشتنی زاتەکە بە مادده پەیدا بوە.

من ئەگەر جیهان حیساب بکەم بە تەختەدامە و مرۆڤیش بە دامەچی دابنێم، بەوەدا سەلماندوومە کە بە بێ تەختەکە و بەردەکان یاری دامە ناکرێ: ئەوەی من زیاد لە بیریارە ماددییەکان دەیڵێم ئەوەیە کە تەختەدامە لە خۆوە و بە دڵخوازی خۆی مرۆڤ ناچار ناکات بە یاری کردن، لەو تەشبیهەشدا [تەشبیهـ کردنی جیهان بە تەختەی دامە] ئاگادارم کە مرۆڤ جیهانی دروست نەکردوە وەک کە تەختەدامەی دروست کردوە. هاندەری برسییەتی و جینس و تەماع و دەسەڵات و خۆپاراستن و لەزەت وەرگرتن... و چەندەها هاندەری دیکەش گەلێک پتر لە مەراقی دامە کردن مرۆڤ دەبزێون. زۆر جارانیش، لەبەر هۆی تایبەتی، لە بۆیان وەها ئارەزوومەند و موحتاج دەبێت هەر دەڵێی جڵەوی ئیختیاری لە دەستان دەرچوە. بەڵام چ زەرەرێک لەو تەشبیهەدا لە مادده و جیهان و دەوروبەر و هیچ شتێکی دەرەوەی وجوودی مرۆڤ ناکەوێت چونکە من نامەوێ لەوەدا بایەخی مادده کەم بکەمەوە و تەشبیهـ کردنەکەی لەسەر حیساب بکەم بە دالەنگانی پایەی، تەنها مەبەستم هەر ئەوەیە کە بڵێم لە هەموو حاڵاندا ئاکتۆری شانۆی کۆمەڵایەتی هەر مرۆڤە، جیهان و تەختەدامە، نەوت و پێستەڕیوی، تیشکی رۆژ و ئەسفەنجی دەریا... - هتاد سەرلەبەریان

---

[3]- دەکاتەوە لاپەڕە 67ی ئەم چاپە. سایتی مامۆستا.

دەوری کاتێکراو دەبینن، مەگەر ئەوەیان بۆ بە کاریگەری حیساب بکەین کە زاتەکەی مرۆڤ بۆیان دەبزوێت، ئەمەش هەرگیز نابێتە کاریگەری.

ئەمە لەلایەن تێخوێندنەوەی ماددە لە بیروباوەڕەکەی مندا. لەلایەن کەمبایەخیی ئەو میسالانەش کە مەبەستم پێ روون کردبوونەوە لەتەک میسالە زلەکاندا، بەرپەرچدانەوە هێندە زۆرە لێی بەکۆتایی ناگەین ئەگەر قسەی لێ کورت نەکەینەوە:

لێرە بە پێشەوە، میللەتان بە تێکڕایی چ پشکێک و ڕەزالەسەربوونێک و ناڕەزاییەکیان نەبوە لەو کارەساتە گەورانەی کە دەوڵەتەکانی خەریک دەکرد. بەشی هەرە زۆری خەڵق تەنها توانیوەتی خەریکی ئەو شتە بچووکانە بێت کە لە میسالەکاندا دیتمان. هەزاران خەریکبوونی بچووکی وەک تەڵاق هەڵبەستنەوە و خزم ئاشت کردنەوە و لە یەکتر زویربوون و گوێ گرتنە پەندی مزگەوت و خانەقا و ساغ کردنەوەی دەستنوێژ لەیەکدیشکانی کوڕ و کچێک بۆ بە یەکتر شیان و نەشیانیان و گێرانەوەی چەندوچۆنی شایی و تازیان و وردە ڕابواردنی شەوانەی کارەمستێنە بەدیار ئومێدی شەوچەرەی باسووغ و بادام و حیکایەتی فلان هات و فستان هەڵات و هەزاران ڕووداوی خوێڕیلەی ئەوتۆیی [زۆر بە داخەوە] ناوەڕۆکە یەکجار گرنگەکەی ژیانی بەشی هەرە زۆری میللەتانی پڕ دەکردەوە.

ئەو ڕووداوە گرنگانەی مێژوو خەریکیانە و نەزەرییەکان بەبەر خۆیانیان هەڵدەبڕن لەوە پتر ماڵی میللەتان نەبوە کە وەک داستانی ئەرسەلاننامە و ئەمیر هەمزە بۆیان دەخوێندرایەوە، میللەتانیش چ تەماییکیان بەو کارە گرنگانە نەبوە و بە ماڵی خۆشیانیان نەزانیوە ئەگەر من و تۆ ئەمڕۆ لە ڕێی فەندوفێڵی چاوبەستەکێی فکری و فەلسەفیەوە بۆ نیازی سیاسیی ئەمڕۆکەمان لە قەبەڵیان نەکەین. تاکەکانی میللەتان لەو ڕۆژگارە تێپەڕیوانەدا ئەو دەمەیان خۆشی دەبوو کە نوێنەرەکانی دەسەڵاتی دەوڵەتی و دنیایی نەبینن و لە گەزەندەیان دوور بن چ جایی شریکی چاکە و خراپەیان بن.

تا ئێستاش ترسی پیاوی میریی خاوەن دەسەڵاتی دنیایی لە ناخی دڵی ئەوانەی پێیان دەڵێن «میللەت» ڕەگ داکوتاو و تێڕاگەڕاوە. من لە نووسینی دیکەمدا گوتومە میللەتی هەژار چ لزومی بەوە نییە ڕووداوەکانی مێژووی پێ بدرێتەوە بەو هەموو

ناشیرنی و نامەردییانەی کە لەو ڕووداوانەدا هەیە: هەر تاکێکی میللەت ئەوەندە کردەوەی بەد و ناپەسەند لە ژیانییدا هەبو؛ کە پێویست نەهێڵێ بەوەی لێی زیاد بکرێ بە هۆی بەشدار کردنی لەو ڕووداوە دڕندە و دزێوانەی کە ئەو هیچ دەستێکی تێییاندا نەبوە. وەیا هەر نەبێ بە خواهشتی ئەو ڕوویان نەداوە. گۆیا دەبێ باغەوانێکی هەژار و بەستەزمانی کووفەیی چ شەرەفێک زیاد بکات بەوەدا کە بکرێتە شریکی کارەساتە چڵکن و گڵاوەکانی ئەو قەسرانەی دەستڕۆییشتوەکانی سەردەمی عەباسی ئارەزوە ناڕەواکانی خۆیانیان تێدا دادەمرکاندەوە؟ تۆ بڵێی دانیشتوانی شاری ڕۆمای سەردەمی نێرۆن چ شانازییەک پەیدا دەکەن ئەگەر بگوترێ «نیرۆن» بە قسەی ئەوان و بۆ کەیفی ئەوان خانوەکانی سووتاندن؟ یا ئەگەر بگوترێ دژی خواهشتی وان ڕۆما سووتێندرا کام پێچکەی ڕەوڕەوەی مێژووی گەلان پەنچەر دەبێ؟ پەنجەر دەبێ نابێ «ملی وەقوتەوە» دەسا ڕۆماییەکان نە ئاگاداری سووتاندنەکە بوون و نە حەزیشیان لێ بوو نە بوو نە هیچ دەسەڵاتێکیشیان هەبوو لە ڕوودان و ڕوونەدانی کارەساتەکە.

با میسالێکت بۆ بهێنمەوە لە بێدەسەڵاتیی میللەتان لەو ڕۆژگارەدا کە ئیتر پێویست نەهێڵێ نموونە لە مێژووی کۆن بخوازینەوە: ساڵی 1967 یەکسەر دوای تێشکانەکەی پێنجی حزێران مانگانەی مەئمووران لێی داشکا تاکوو مانگێکیان سەیری قایمەی مانگانەی خۆمم کرد دیتم نەوەد دینادی لێ داشکابوو بە ناوی «نەکسە» و فەلەستین و نازانم چی. گوتم ئای براگەل کە وەتەنیم و ئاگام لە خۆم نییە!!

میللەتان، دوای بەسەرچوونی ژیانە دیمۆکراتەکەی شارەکانی یۆنان - تارادەیێکیش هی ڕۆما - دەستیان لە ڕووداوی گەورەدا نەبوە تا دەورووبەری شۆڕشی فرەنسە، ئەوساش وەک دەزانین و دەخوێنینەوەنە نە هەموو میللەتان گەیشتنە پلەی هاوبەشبوون لە ڕووداوی گەورەدا نە ئەوەی هاوبەشیش دەبوو بە پێی دڵخوازی خۆی دەیتوانی ڕووداوان لێ بخورێت... تا ئێستاکەش گەلێک میللەت هەر بە قەدەر میللەتانی سەردەمی سۆمەر و ئاکاد خاوەنی دەسەڵاتی خۆیەتی.

لەگەڵ ئەمەشدا بەشداربوونی میللەت لە ڕووداوان و خەریکبوونی خاوەن دەسەڵاتان بە کاری گەورەوە یەک زەڕڕە یارمەتی «ماددە» نادات بۆ ئەوەی بێتە

ئاغای «مرۆڤ» چونکە مرۆڤەکە خەریکە نەک ماددەکە، زوربەی میللەت بڕیار نادات یەک دوو مرۆڤ بڕیار دەدات ئەوانیش هەر مرۆڤن. لەمەش بترازێ بەشداربوونەکە و خەریکبوونەکە وەک هەڵکشانی جیوەی تەرمۆمەتر نەبوە کە بەناچاری و حەتمی و بە یەک جۆر [کە هەرگیز ناگۆڕێت] بە پێی زیادبوونی گەرمایی سەردەکەوێت، مرۆڤ، میللەت بێت و دەوڵەت بێت، بە شێوەی ئالی ڕوەو تەماع و حەز و شەهوەت ناڕوات، ترسەکەشی وەک هی بەرخ و چوێلەکە ئالی و سادە نییە: مرۆڤ لە حاڵەتی ترس و تەما و پەرستن و کفر کردن و خۆبەخت کردن و خەڵق بە قوربانی خۆ کردن و هەموو حاڵەتێککدا زاتێکی هەیە لەگەڵ ئەو هاندەرانەدا مامڵەت دەکات، ئیتر یا بە سەرکەوتوویی یا بە هەڵاتوویی لە مامڵەتەکە دەبێتەوە، تەنانەت کە زاتەکەی لە ئاست دەوروبەری مرۆڤکرد وەیا سروشکردیشدا پەکی دەکەوێت و پێیان ناوێرێت هەر خۆی کاریگەرە ئیجابییەکەیە بەڵام لە حاڵەتی هەڵاتوییدا. تۆ کە نەتتوانی تایە گەنمێکی 200 کیلۆیی هەڵگریت نەبوویت بە کارتێکراوی گەنمەکە ئەویش نەبوو بە کاریگەر، تۆ هەر زیندوویت و خاوەن ئیرادەیت ئەویش هەر مردوە و هەر بێئیرادەیە و پێت هەڵبگیرێت و پێت هەڵنەگیرێت.

ئەوەی کە گوتم لەبارەی خەریکبوونی زوربەی تاکانی میللەت بە شتی کەمبایەخ و سەراوی و بەرتەسک و کەمبڕشت ڕاستییەکە بەدرێژایی هەبوونی مرۆڤ بەرچاو بوە، هەر ئەو شتە کەمبایەخانەیش تاموشامێکی خستۆتە ژیانە تاڵ و تاریکەکەی بێدەسەڵاتانەوە، هەروەهاش لە خۆشی خواپێداوانی زیاد کردوە چونکە دیارە لەزەتی خۆشگوزەرانی لە ڕەشبەڵەک و یاری کەوشەک و گێڕانەوەی سەرگورشتەکانی مەلا نەسرەددین و ڕاوەبەراز و سەیرانی بەهاران و شتی ئەوتۆییدا هەیە نەک لە شتە گرنگ و تاڵ و تفت و نەفەسبڕ و بەئەرکەکاندا. تەنانەت مەبەست لە سەرکەوتن لە شتی گرنگدا ئەوەیە دواتر لەزەت لە شتە وردیلە خۆشەکان وەرگریت.

دەبینی دەوڵەمەندێک پارەیێکی زۆر بە وڵاغی جوان وەیا جاریەی جوان وەیا مافووری جوان وەیا هەر شتێکی دیکەی جوان دەدات خۆ جوانی مرۆڤیش تێر ناکات لە گەرما و سەرماشی دوور ناخاتەوە... بایەخی ئەو شتە بچووکانەی

مرۆڤیان بەخۆیانەوە خەریک کردوە بەوەدا داناشکێت کە شتێکی دیکە هەیە پێی دەڵێن گوزەران و نان پەیدا کردن هەرچەند بێ گوزەران ژیانیش مومکین نابێت.

من لێرەدا کە باسی گوزەران دەکەم لەتەک ئەو شتانەی گوزەرانیان پێوە بەند نییە جۆرێک بەراورد کردن و بەیەکدی گرتن لە نێوان دوو شتان هەڵدەستێنم کە هەردوویان پێکهێنەری ئارەزۆی مرۆڤن. لەبەر ئەمە هەر لایەکیان لە رووی نرخ و بایەخەوە بەسەر لایەکەی دیکەدا زاڵ بوو لە خاسیەتی کاریگەربوونی دەوری مرۆڤ داناشکێنێت، لەم بەراوردکردنەشدا چ مەبەستێکم نییە تای تەرازووی لایەکیان لە تای لەیەکەی دیکە قورستر بێ چونکە لە هەموو حاڵدا زەرەر بە هیچ شتێک ناگات. هەرچەند ئەو کەسانەی کە وا وادەزانن مێژوو بریتییە لە هەرای خەڵق بە دەوری «فائض القیمة»ەوە هەموو ریسیان لێ دەبێتەوە خوری ئەگەر بایی فلسێک لە نرخی عامیلی گوزەران داشکا، لەوەشدا لەسەر هەق نین چونکە لێکدانەوە و لێکۆڵینەوە و ئەزموون بە چ ئاکامێکمان بگەیەنێت ئەویان ڕاستی مەسەلەکەیە. ئیتر بۆ دەبێ پووچانەوە وەیا کەمبوونەوەی دەوری یەکێک لەو عامیلانەی وا دەزاندرا یەکەم کاریگەرە من و تۆ و یەکێکی دیکە دڵ شکستە بکات.

من ئەمە دەڵێم لە حاڵێکدا بۆ خۆشم لەو باوەڕەدام [هەر دەبێ وایشبم] کە خەریکبوونی مرۆڤ بە گوزەرانەوە بەشی زۆری ژیانی مرۆڤ بۆ خۆی دادەبڕێت و لە هەموو شتان پتر گیرۆدە و پابەندی دەکات و بێرە و بەوێیدا دەگێڕێت. ئەم ڕاستییەش هێندەی پێویستبوونی ئاو و هەوا بۆ زیندووبوون ئاشکرا و بەڵگەنەویستە بەشێکی زۆری نووسین و هونەری نوێش هەر بە دەوری گرنگیی گوزەران و نان پەیداکردندا دەخولێتەوە و لێشی زیاد دەکات، ڕەنگە بۆشی قەرز بکات.

ئەم گرنگییەی دەوری گوزەران لە ژیانی مرۆڤدا دیاردەیێکی تایبەتی لە کۆمەڵایەتی بەرفرەواندا پێک هێناوە تا ئێستا نەهاتە بەر چاوم هیچ یەکێک لەوانەی بە ئابووری و ڕامیاری و مێژووەوە خەریکن پەنجەیێکی بۆ درێژی بکات، جا ئەگەر نووسینێک هەبێت من نەمدیتبێ قسەکەم لەگەڵ ئەوە نییە.

گوزەران کە ئامانجی یەکەمی جموجۆڵی مرۆڤە، بە نیسبەت زۆرینەی چینەکانی میللەتەوە کاریکی سەخت و بەئەرکە و تا بڵێی دوورە لە خۆشی و نەرمی و شلکی و تەڕایەتییەوە. هیچ لە ڕاستی دوور ناکەومەوە کە بڵێم کەسبی ڕەنجبەری وەک دروێنە و خەرمان کوتان و کێشەی کا و دان، مێردەزمە و کامووسی پاڵەیە، دەماری پیاوەتی و ئادەمیایەتی تێدا دەکوژێت. ئەوانەی لە نزیکەوە ئاگاداری ئەم ژیانەن دەزانن سەپان و تێڵەگەکێش و جووتیار، بە تایبەتی سەپان، لە چ عەزابێکی دڕندە و کوشندەدان.

بەڕاستی ئەگەر ناچاریی نەبێت، کە دەزانین لەوانەیە ناچاری خۆکوژیش بە مرۆڤ بکات، فەلاح نایەتە ڕیزی ژیانی ئادەمییەوە بەر لەوەی لە گاسن و لە داس ڕزگار بێت. هەر ئەم سەختییە و نەفەس بڕییەیە ناهێڵێ یەک بەستە و یەک گۆرانی هەبێ لە سەرلەبەری کشتوکاڵدا، تەنها ئەوەندە هەیە لە سەرەتای دروێنەی کۆتایی بەهار، کە جارێ هەوا فێنکە و دەغڵەکە شلکە و سەپانیش گژرەوشار نەدراوە یەک دوو ڕۆژان گوێت لێ دەبێ کوڕی بەتاقەت و لەخۆ ڕازی چەند بەندێکی کورتی دروێنە دەڵێ «هەر دروونە دروونە درروونە، دەسکی داسێم بە ڕوونە...» لەوە بەولاوە، کافر بەحاڵی سەپان و فەلاحی خۆمان و وەک هی خۆمان بێ! لە کۆتایی هەموو ڕۆژێکی سەپانیدا دەبێ گیانێکی نوێ بەبەر پاڵە بێتەوە دەنا گیانەکەی ڕۆژی پێشووی بایی ڕوح کێشانی ڕۆژێکی دیکەی ناکات.

من هیچ سەیرم لەوەدا نابێتەوە کە فەلاحی رووسی لە دەوری ستالین، کاتێک ویسترا زەوی لێ بسەندرێتەوە ئاگر بەر بوە عومری و شێتانە و هارانە وەرگەڕا ئاژەڵەکانی و کوشتنی هەر بۆ ئەوەی نەکەونە دەست ئەو حکومەتەی زەویی لێ دەسەنێتەوە و بە فەلاحیشی دەهێڵێتەوە. سەیری ئەم دوو هەڵوەستە بکە بە دیار یەک بەرژەوەندەوە، هەردوویان هەڵوەستی زاتی مرۆڤن، هەرچی هی ستالینە شێوە ناز کردن و کوڕێنییەکە لەسەر تەختی نەرم و نۆڵەوە بەسەر واقیعێکدا کە دەبێ ڕام و کەوی و خەساو و بێدەسەڵات بێ لە ئاست ئەو کوڕێنییەدا. هەڵوەستی فەلاحیش دەست گیر کردنە لە زەوی و ئاژەڵێک کە خوێنی خۆی و باپیرانی بوون بە مزەیان، زوربەی شیوعییەکانیش بێ ئەوەی ورتە لە دڵیانەوە بێت چەپڵەڕێزانیان دەکرد بۆ کوڕێنییەکە، فەلاحی خوێن بەفیڕۆچووشیان دە جاران تاوانبار دەکرد.

هەر لەم ساڵانەدا ئەم مەسەلەیەم لەگەڵ شیووعییکی مەیلەو واقیعیش باس کرد، دەردەکەوت تا ئێستاش لایەنگیریی سیاسەتەکەی ستالین دەکات: دەیگوت فەلاحەکە نەزان بوو سوودی خۆی لێ بزر بووبوو... دەک لەو فکرە ڕوونە مرۆڤانەیە! تۆ وەرە لە شۆڕشێکدا کە دەڵێ بۆ حەسانەوەی فەلاح بەرپا بووم، بە شەق و دەر کردن و کوشتن یاسایەک بەسەر ئەو فەلاحەدا بسەپێنە کە حەزی لێ ناکات، دواتریش مەعلووم بوو کە یاسایەکی زۆر بە زەرەرە و تاکوو ئێستاش کشتوکاڵی سۆڤیەت لێی هەڵنەستاوەتەوە. ئنجا دوای چل ساڵ لە کارەساتەکە و دوای تاوانبار کردنی ستالینیش هەر پێ داگریت لەسەر ڕاستبوونی ئەو هەڵەیە و پیاوخراپبوونی ئەو ستەملێکراوە!! پێی ناوێ من بڵێم، لە خۆوە دیارە ئەم تەرزە هەڵوەستە پێوەندی بەهیچ کوێرە ڕێگایەکی مەزوعیەتیشەوە نییە، هەڵوەستێکی «زاتی» ڕێ لێ شێواوە کە بە هەموو حیسابان هەر بە زەرەری مرۆڤ تەواو دەبێت.

هەرچی بابەتی فۆلکۆریی هەیە خۆ لەو کەسب و کارانە ناگەیەنێت کە مرۆڤ نیوەمردوو دەکەن. بگرە لە بەند و باڵۆرە تا دەگاتە حیکایەت و لاوک و بەستە و هەڵپەڕکێ هەموویان خەریکی چشتی وەهان بە گوێ لێگرتن و تێدا هەڵسووڕانیان حەسانەوەیەک بە مرۆڤ بگات. عەمەلەیی و فەلاحی لە ئارەقەڕشتن بەولاوەیان تێدا نییە بۆیەیە کەلەپۆری گورانی و بەستەیان دەوڵەمەند نەکردوە چونکە دیارە کەسانێکی دەیانەوێ لە ڕێی گۆی گرتن وەیا تێدا بەشداربوونەوە خۆیان بخافڵێنن زۆر بە ئاسایی یەخەگیری بابەتی وەها دەبن کە وا بەبەریانەوە هەبێ ئەرک و ژانی ژیان لە بیران ببەنەوە. هەموو ئەو حیکایەتانەی بەدەوری قارەمانەتی کوڕە هەژاراندا دەخولێتەوە لە کۆتاییدا دەیانگەیەنێ بەو ژیانە ئاسوودەیە و دەوڵەمەندەی کە لە هەژاریدا دەست ناکەوێ.

تۆ سەیری کەسبی شوان چونکە ئاسانتر و ئازادترە لە هی عەمەلە و فەلاح هەر لە پێشەوە بلوێری خستۆتە دەست شوانەکە بۆ خۆی لەو دەشتودەرە بەربەرەڵڵایەدا تەڕدەماغیەکی پێ پەیدا دەکات. ئینجا مەڕەکانیش پتر پێ ئۆگر و فەرمانبەرداری خۆی دەکات، تۆ لەوە گەڕێ کە ئەوەندەی حەزیش بکا لە شیرەکەیان دەخواتەوە - سەپان و فەلاحی وەها هەیە ساڵی یەک قوم شیر ناخواتەوە. شوان بە خۆی و بلوێرەکەیەوە لە زۆر بابەتی فۆلکۆریدا دەشبێ بە پاڵەوانی سەر شانۆ... مرۆڤ

بەدەست خۆی نییە دەیەوێ بحەسێتەوە، حەسانەوەشی لە پاڵەیی و عەمەلەییدا نەبوە تاکوو لە سەرگوزەشت و گۆرانیدا پێیاندا هەڵبڵێت. گوزەران کردن چونکە کارێکی زەحمەتە و هی پێ رابواردن نییە، لەو بەشە فۆلکلۆرەدا ناوی دێت کە ئەویش بە نیازی حەسانەوە و گەپ و خۆشوەقتی دانەنداراوە: گوزەران لە پەندی پێشینیان ناوی هەیە کە دەزانین «پەند» لە کۆمەڵایەتی زوربەی میللەتدا جێگەی «فەلسەفە» دەگرێتەوە، فەلسەفەش مەبەستی بزەهێنانە سەرلێوان نییە بەڵکوو، بە زۆری، رووبەڕووبوونی لایەنە سەختەکانی ژیانە.

بەرچاوترین دیاردەیێکی کۆمەڵایەتی لەوانەی سەردەکێشنەوە بۆ لایەنی گوزەران، ئەو ئاهەنگە زلەی قوربانی دانە بە «نیل»ی میسر کە ئێستا ناوی «وفاء النیل»ی بەسەردا براوە. ئەم داب و نەریتە تا داهاتنی ئیسلام و زاڵبوونی لە میسر هەر بەردەوام بوو. بێگومان بە بووک بردنی کچێکی جوان و تازە و ڕازایەوە بۆ نیل و هەڵدانی ئەو کچە بۆ نێوان باوەشی شەپۆلە خنکێنەرەکانی بە ناوی پاداش لە بری زیادبوونی ئاوەکەی بۆ بەرهەمهێنانی دەغڵ و شینایی و مێوە بایەخدانێکی زۆر گەورەیە بە گوزەران کە بە زاهیر دیاردەکە دەگێڕێتەوە بۆ «موضوعیة» نەک «ذاتیة» بەڵام لە دوو نوختە نەزەری زۆر بنجییەوە لایەنی مەوزووعیەتەکە لەم کارەساتەدا دەبێتەوە بە خزمەتکاری زاتیەت.

نوختەی یەکەم ئەوەیە ئاهەنگەکە و قوربانی دانەکە و دەستی پاڕانەوە پان کردنەوەکە و فرمێسک و هەنیسک و بزەکە هەموویان بۆ ڕەزامەندی «غیب»ـە کە بە پێی لێکدانەوەی ماددی و مەزووعی ڕواڵەتێکی زیدە بەرزی پابەندبوونی زاتە بە هێزی نادیارەوە. لە ڕووی دەلالەتی قووڵی ڕەفتارەوە فەرقێک نییە لە نێوان «وفاء النیل» و دروست کردنی هەڕەمەکان بۆ پاراستنی لەش بە نیازی ژیانەوەی دوای مەرگ.

نوختەی دوەم ئەوەیە کە ئەم قوربانی دانە هەر بۆ تەئمینی گوزەران باو نەبوە بەڵکوو لە زۆر جێگەدا کاتێک پاشایان مردبایە نەک هەر یەک ژن بگرە هەرچی ئەو کەسانەی لە نێزیکەوە تێکەڵ بە ژیانی پاشاکە بوون هەموویان لەگەڵ ئەودا زیندەبەچاڵ دەکران.

زۆر جاران نووسەری ماددی کە دووچاری دیاردەی بە زاهیر ناماددی لە کۆمەڵایەتیدا دەبێت بە سووک و ئاسانی خۆی و نەزەریەکەی لەو ناڕاحەتیە ڕەها دەکات بەودا کە دەڵێ، ئەم دیاردەیەش لە شی کردنەوەی نیهائیدا سەربە ماددییەتەوە دەنێت کۆڵێکیش کەیفی بە خۆی و قسەکەی دێت و خەڵقەکی زۆریش لێی ڕازی دەبێت و «سەدەق»ی بۆ دەکێشن. بەڕاستی ئەم تەرزە خۆ دەرباز کردنە جگە لەوەی کە هیچ پێوەندی بە مەوزوعیەت و عیلمانیەتەوە نییە لەوە زیاتر کە وشەسازیەکی ڕووت و قووتە. لە دوو نوختەی زۆر بنجییەوە خەتاباریشە:

یەکەم: لەوەدا کە بە چاوبەستەکێ لە بیرت دەباتەوە کە ئەوەی بایەخی هەیە لە دیار کردنی چاکە و خراپە و مەوزووعیەت و نامەوزووعیەتی شتان باری ئێستاکەیانە نەک هی بابەلباپیران. من کە تینوو بم لە بەستێکی ڕەق و تەقدا چ دادم دەدات بگوترێ ئەم بەستەش وەختی خۆی ڕووبار بوو وشک بوە. فڵانەکەس پێرار ملیۆنێر بوو دواتر ئیفلاسی کرد: ئایا خاوەن چاوبەستەکێکە ئامادەیە پارەی بە قەرز بداتێ لەبەر ڕۆشنایی سامانەکەی پێراری؟ بەڕاست خۆ مردووی قەبرستانانیش زووتر زیندوو بوون! ئەم تەرزە خۆپەڕاندنەوە لەوە دەچێت کابرایەک گرەوی دامەی کردبێ و خەریک بێ بدۆڕێنێ ئیتر بە دزیەوە بەردەدامە خوراوەکانی خۆی بخاتەوە سەر تەختە.

براله خۆ ئێمە کەسمان قۆنتەراتمان نەگرتوە فڵانە جۆرە لێکدانەوە و شی کردنەوە ڕاست دەرچێت، کە بووشین بە قۆنتەراتچی فەلسەفان نرخی چی بە خۆمان و بەو فەلسەفانەوە دەمێنێت؟ چ گومان نییە لەوەدا کە ئەگەر لێکدانەوەی فەلسەفی لە مەیدانی کۆمەڵایەتیدا وازی لە واقیع هێنا بۆ ئەو سەرچاوە دوورانەی کە واقیعەکەیان لێ هەڵقولیوە ئیتر لەوەڕا چارەسەری گیروگرفتان بکات، بەڵایەکی وەها گەورە بەسەر کۆمەڵدا دەهێنێت هیچ دوشمنێکی نەیتوانیوە بەسەری بهێنێت، مەسەلەکەش هێندە ئاشکرایە پێویست نییە پتری بەدوا بکەوم.

دوەم: لەوەدا کە ئەم گەڕانەوەیە بۆ بنیچەی شتان هەر لەو حاڵەتانەدا دەکرێ لە سوودی بیروباوەڕی ماددی تێدایە و شەڕەدندووکێی موناقەشان بەرەو زاڵبوونی فکری ماددییەوە دەبات. لە هەر حاڵوبارێکدا بردنەوەی «شت» بۆ سەر «بنج»ی خۆی مەبەستی لێکدانەوەی ماددی جێبەجێ نەکات ئەو بەلایدا ناچێت لە کەسیش

ناسەلمێنێ بەلایدا بچی. بە نموونە دەڵێم بایی ئەوەی کاردروستایی خۆی پەکی لەسەر یەکچوونی مرۆڤ دەکەوێت دەڵێ میللەتان بران، بایی ئەوەی کار و بازاڕەکەی لە هێمناییدا ڕادوەستێ قبوڵی نییە خەڵقی دەربوونەی شارێک برای یەکدی بن هەرچەندە هیچ هۆیەکی ڕاست و دروستی دوشمنایەتیش لە بەیندا نەبێ. چەند سەیرە ئێمە هەمومان برای هەموو دنیا بین بەڵام نەشێ نە ئێمە و نە هیچ میللەتێکی دیکەش لە نێوان خۆیاندا برا بن. بۆ ئەوەی بەقاڵێک و عەمەلەیەکی ڕەواندوز شەڕی جوداوازیی چینایەتی بکەن. ئەوەندە هۆیە بەسە کە عەمەلەیەکی ئەڵمانیا و سەرمایەدارەکەی لە یەکدی جودا بن.

تازە ڕاپەڕینەکەی 1948 - وثبة - تەقی بۆوە، کۆیێ وەک هەموو شوێنانی دیکە وڵات بە گەورە و گچکەیەوە سەر لە سبەینە کەوتە نماییشت... ویسترا گەڕانێکی جەماهیری لە کووچە و جادان بکرێ بۆ دەرخستنی پشتگیری کردن لە جەماهیری بەغدا، لە هەرچەند هەنگاوێکدا شۆڕشگێڕێکی چەپ فرتکی دەبەست بۆ سەر بەرزایی دیوارێک وەیا سەر پشتی ئۆتۆمۆبیلێک و دەکەوتە هاندانی خەڵقەکە بۆ پتر شۆڕشگێڕایەتی... تا نزیک نیوەڕۆ خەڵقەکە بێزار بوو، قسەکەرێک تکای لە جەماهیر کرد کە بڵاوەی لێ بکات... لەم کاتەدا یەکێکی زۆر خوێنگەرم پێشی بە عالەم گرت و گوتی دەچنەوە ماڵە کاولەکانتان؟ خۆ ئەگەر کەر گیای دەست کەوێ بیخوا ئێوە گیاشتان نییە؟ چۆن دەچنەوە بێ خوێنڕشتن؟ ئەم شۆڕشگێڕە، زۆر بە داخەوە، نموونەی هاوتاکانی خۆیەتی لە جێگەی پێشکەوتووشدا. بەلای ئەوەوە چ فەرق نییە لە نێوان کۆنتێکی فرەنسەی سەردەمی شۆڕشی 1789 کە بە قەمچی ئاگری لە پشتی فەلاح هەڵدەستاند لەگەڵ ئەو بازرگانە کۆیییەی کە مانگانەی دەدا بە بزووتنەوەی نیشتیمانی و کوڕ و خزم و کەسیشی بەدڵ لە بزووتنەوەکەدا بوون. لە حاڵەتی بازرگانەکەی کۆیێ، ئەو لێکدانەوەیە نەدەکرا بڵێ ئەویش بەدەست داگیرکەر و حوکمی زۆردارانەوە وەک عەمەلە و فەلاحەکە ستەمدیدەیە بەپێچەوانە هەر ئەو لایەنانەی لەسەر حیساب دەکرا کە لە هەژارێکی جودا دەکاتەوە.

من ئەم نموونەیە لە دەوروبەری خۆمان دەهێنمەوە بۆ ئەوەی بە هۆی شارەزایی خۆمان لە نموونەکە و وەکوویەکبوون و لەیەکچوونی بازرگان و عەمەلەیێکی کورد لەلایەن مەغدوریەت بەدەست دەسەڵاتی ناڕەواوە باشتر بۆمان ڕوون بێتەوە. چۆن

بیری ماددی لە دەمی پێویستدا لایەنی جوداوازیی نێوان شتان پێش دەخات و ئەو مەبدەئی «شی کردنەوە نیهائی» لە بیر خۆی دەباتەوە. خۆ ئەگەر ئەمەم مەبەست نەبێ دەتوانم هەر بەو لێکدانەوەی «شی کردنەوەی نیهائی» و گوتەی «لە بنج و بناواندا» کام شت بە پێی سیاسەتی فکری ماددی لە یەکدی دوورن وەک یەکدییان حیساب بکەم و بڵێم عەمەلە و سەرمایەدار نەک لە شی کردنەوەدا بەڵکوو لە یەکەم نیگاوە دیارە هەردووکیان مرۆڤن. داگیرکراویش هەروەها. لەوەش بەولاوە بڕۆم بڵێم مرۆڤ و مەشکەی دۆ هەردوویان هەر ماددەن... لە شی کردنەوەی نیهائیدا پەلکە شووتی و کەشتیی ئاسمانی وەک یەک هەردوویان ماددەن.

دەبینیت نموونەکان بەلای گەپ و نوکتەدا دەچنەوە بەڵام لە ڕاستیدا ئەگەر موجامەلە لە بەیندا نەبێ بێبایەخ کردنی گێڕانەوەی دیاردەی «ناماددی» بۆ بنیچەی «ماددی» بە نیازی پتەو کردنی بیرکردنەوەی سەربە ماددییەت کە وا هەر لە خەیاڵ و فکردا پێی پتەو دەبێ نەک لە واقیعدا. ئەوەی لێ دەوەشێتەوە کە ماددییەتەکە کز بکەیتەوە بە هۆی بەراورد کردنی نموونەی ماددی لەگەڵ نموونەی دیکەی ماددیدا کەوا یەکسەر ماددەن و هیچیش لە یەکتر ناچن و بە هیچ مەزهەبیش ناشێ بگوترێ چونکە ماددین دەبێ وەک یەک بن: کە گوتم پێستەڕێوی و فڕۆک هەردوویان بە هۆی ماددەبوونیانەوە هاوتای یەکترن لە زەمینەی گۆڕانی ئابووری و کۆمەڵایەتیدا، خێرا بە خێرا بیرکەرەوەی ماددی لێم بەدەنگ دێت و قسەکەم بە هەزار و یەک بەڵگە ڕەت دەکاتەوە، ئەوسا منیش خێرا بە خێرا پێی دەڵێمەوە «پێغەمبەرایەتی» و «نانەوایی» ش هەرگیزاو هەرگیز قیاسیان لە یەکدی ناکرێت نە لە لایەن سەرچاوەی پەیدابوونیانەوە و نە لە لایەن ئەو دەورەی لە کۆمەڵایەتیشدا دەیبینن... چەند سەیرە «ماددییەت» لە ڕێی هێنانەوە نموونەی ماددی و بەیەکدی گرتنیانەوە کز بێتەوە، لێشتەوە دیارە کزبوونەوەکەی لەوەوە دێت کە تایبەتی و خاسیەتی شتان پشتگوێ بخرێت و تەنها لایەنی «ماددیبوونیان» وەیا «لە بنجدا ماددیبوونیان» لە تەرازووی هەڵسەنگاندنی فکریدا سەنگی پێ بدرێت.

ئەم فێڵە ئاشکرایەی بیر کردنەوەی ماددی دەیکات ڕاستەوخۆ لەلایەنی «زاتی» خاوەنی نەزەریەکەوە هەڵداستێ نەک لە «مەوزووعیەت»ی نەزەریەکە خۆیەوە

چونكە بیركردنەوەی ماددی، كە لێرەدا مەبەستە، هەر فكری ڕووت بەڵكوو پتر سیاسەتە لەوەی فكر بێت، وەک دەشزانین هیچ چالاكیەكی فكری نییە هێندەی سیاسەت «زاتی» بێت. تۆ كەمێک لە مەسەلەكە ورد ببەوە، دەبینیت داهێنەری فەلسەفەی (بەدوا ئەویشدا هەموو پێڕەوەكانی) بە نیازی بەهێز كردنی سیاسەتی ناو فەلسەفەكە بنەما و بنچی فكری سەربە ماددییەتی بۆ هەڵناوە تاكوو بۆی بلوێ لە ڕێی بەستنەوەی فەلسەفەكە و فكرەكە بە ماددەوە داوای حەتمیبوونی ئەو ئەنجامانە بكات كە لە فەلسەفەكەیان هەڵدێنجێت چونكە كە فەلسەفەكە زادەی ماددە بوو بە ناچاری و بە شێوەیێكی حەتمی دەبێ ڕاستبوون و دروستبوونی بسەلمێندری لەو ڕووەوە كە ماددە جێگەی نەسەلماندن و بڕوا پێ نەكردن نییە.

كام بیروباوەڕی سست و كزە بێنە لە ماددەی گرێ بدە دەرحاڵ بەڕاست وەردەگیرێ چونكە ماددە گەورەترین و بێ شوبهەترینی ڕاستیەكانی ئەم جیهانەیە، هێندە هەیە گرێدانەكە زەكا و پێتۆڵی و زۆرزانی پێ دەوێت، لەوە بەولاوە هەروەک كە گوتت ئۆكسیجینم لە ئاو دەرهێناوە چار نامێنێ دەبێ بڕوا بە هەبوونی ئۆكسیجنەكە بكرێ چونكە ئاوەكە ماددەی بەرهەست و بێ فێڵە هەروەهاش كە گوتت فەلسەفەكەم لە ماددە هەڵێنجاوە یەكەندەردوو باوەڕ پێكردنی دەبێتە شتێكی ناچاری، خۆ كە ناویشت نا «اشتراكي علمي» ئیتر كێ دەوێرێ بڵێ لەل!

لایەنی سیاسەتی دایەلیكتیک زەكایەكی گەورەی دیكەشی بەكار هێناوە لە هەڵنانی یەكێک لە بنەما ئابووریە مەشوورەكانی، كە ئەویش هەر جۆرێكە لە تێهەڵكێشانی بەرگێكی مەوزووعیەت بەبەر قەڵافەتێكی یەكجار گەورە و كەڵەگەتی زاتییەت: گوتەیێكی زۆر پەرەسەندوو و سەلمێنراوی ئابووریی ماركسی لە شێوەی بەڵگەنەویستدا دەڵێ كە هێزی بەرهەمهێنان گۆڕا بە دوا ئەودا «پێوەندی» یەكانی بەرهەمهێنان لە نێوان خەڵقدا دەگۆڕێت و... ئیتر واقیعی سەرلەبەری كۆمەڵ دەگۆڕێت.

بەلای باوەڕی منەوە ئەم موعادەلەیە یەكێكە لەو تەڵە فكرییە گەورە و مەحكەم و بە دزڵابانەی وەک جانەوەری هەشت پێ Octopus لە مێشكی مرۆڤ دەئاڵێت و فرزەی دەبڕێت. پێشی دەسەلمێنێت كە هێزی بەرهەمهێنان باوک و دایكی كۆمەڵایەتییە بە داب و دەستوور و نەریت و یاسا و بیر و شەرەف و

ناموسیشیەوە. کەم وا دەبێ تاکە «گوتە - مقولة» هێندە بە ناڕەوایی و بێئنسافانە و دژی مرۆڤ و فکری ڕۆشن دنیای لێ مارە بکرێت. لەم گوتەیەدا پایەی هۆی بەرهەمهێنان لە ژیانی ماددی و مەعنەوەیی مرۆڤدا گەلێک بەرزتر بۆتەوە لە پایەی بوت لە نێوان بوتپەرستاندا چونکە بوتپەرست لە کولانەی مەعنەوییاتی سەربە غەیبەو▪ عەبدایەتیی خۆی بۆ بوتەکە جێبەجێ دەکات. لایەنەکانی دیکەی ژیانی کەمتر بەندە بە دەستووراتی بوتپەرستییەوە، بەڵام ئەم گوتەیەی دەوری «هۆی بەرهەمهێنان» لە ژیانی کۆمەڵایەتی بەرفرەواندا دەبێتە هەورێکی ئێقلیمگیر بەسەر هەرچی جیهانی مرۆڤدا هەیە دەکێشێت. پتریش خەتەری لەوەدایە کە دەبێتە ئایینی بەرەی ڕۆشنبیران ئەوانیش خۆیان دەبن بە ڕابەر و مامۆستای ماددی و مەعنەویی گەل.

زۆر ئاشکرایە ئەم هەموو پێشکەش و شاباشە گەورەیەی هەڵدەدرێتە بەر پێڵاوی هۆی بەرهەمهێنان، بە نیازی دانانی تاجی پێشەوایی و یەکەمینایەتی و گەورایەتییە لەسەر کەللە بەهەوا ئاخناوەکەی عامیلی ئابووری لە گۆڕانی کۆمەڵایەتیدا، مرۆڤی زەلیل و بێچارەش با بۆ خۆی لە پلەی سێیەم و چوارەمی کاریگەریدا [کە دەکاتەوە ناکاریگەری] مێشەکزە لە لووتی خۆی دەر بکات.

ئەم گوتەیە لە ڕووی زاتیبوون و مەوزووعیبوونەوە، نەک هەر بۆ مەبەستێکی قەرارداده و نیهائی و بێ لێ زیاد و کەم کردن هەڵنراوە کە دەیکاتە بەچکە زاتییەکی زۆر بەناز پەروەردەکراو، بگرە بەولای زاتییەو▪ میتافیزیکیشە چونکە گۆڕانی هۆی بەرهەمهێنان لە غەیبەو▪ دەهێنێت و خۆی ماندوو ناکات بە دۆزینەوەی ئەو ماکانەی هۆیەکە دەگۆڕن. گوتەی وەها تەماویی سەربە غەیب گەییشتوو کە ناتوانێ تەفسیری خۆی بەدەستەو▪ بدات هەر ئەوەندە دەتوانێ غەیری خۆی تەفسیر بکات کە وەک خۆی بیکات بە «امر واقع»یکی بێ تەفسیر.

لەلای خۆتەوە لەوە بفکر▪ کە بگوترێ «کە بەهار هات گوڵ دەپشکوێ و دنیا گەرم دادێت...» بێ ئەوەی گوتەکە بەهار بگێڕێتەوە بۆ نزیکبوونەوەی ڕۆژ و ڕەوانەوەی سەرمای زستان، لەم حاڵەتەدا قسەکە دەبێتە باسی هێزی ون و میتافیزیک چونکە بەبێ هۆی کاریگەر بەهار دانایەت... بەهار لە خۆوە نایەت، کە ڕۆژیش هۆی هاتن نەبووبێ دیارە دەبێ لەو بەینەدا نهێنییەکە کاری خۆی کردبێت. هەروەهاش گۆڕانی

هۆی بەرهەمهێنان، کە نەزانین سەبەبی گۆڕانەکەی چییە دیارە بەدیار میتافیزیکەوە دەبێ بحەپەسێین. کابرایەکی هۆشکول[4] دەیگوت مانگ بەسوودترە لە ڕۆژ چونکە مانگ شەوی تاریک ڕووناک دەکات، هەرچی ڕۆژە بەسەر ڕووناکیدا هەڵدێت... هۆی بەرهەمهێنانیش لە مرۆڤ کاریگەرترە چونکە کە هۆیەکە گۆڕا دەوروبەر و یاسا و کۆمەڵایەتی و بیروباوەڕ و هەموو شتێکی دیکەی مرۆڤیش دەگۆڕێ، هەروەک ڕۆژیش بەسەر ڕووناکاییدا هەڵهات مرۆڤیش لە بەرەکەتی گۆڕانی هۆی بەرهەمهێنانەوە دێتە سەر حازری.

نووسەرانی ئەم ڕۆژە، لەوانەی بە پەرۆشەوەن دانەبڕێن لە کاروانی مارکسایەتی، پێیانەوە دیارە خەریکی دۆزینەوی دیاردە و ڕووداو و گوتە و کردەوەی ئەوتۆن، لە کۆن و نوێدا، بشێ بکرێنە بەڵگەی ڕاستبوونی ئەم دەورە یەکجار گرنگەی هۆی بەرهەمهێنان، ئیتر لەگەڵ خۆیاندا ئیقناع کاری و تەفرەدان و چاوبەستەکێ دەکەن بۆ ئەوەی ئەوانیش بتوانن مێژووی میللەتی خۆیان بدەنەوە بەو عیفریتە سحیربازە هەشتپێیە هەروەک نووسەرانی سەربە فکرەی چینایەتی لە ئەورووپا دین و پەیدابوونی «مسیح» دەدەنەوە بەو هۆیانەی سەربە ئابووری.

ئەرکی قورس لەوەدایە کە بێیت و هەزاران شتی لەیەکتر نەچووی ڕۆژگارێک بیەیتەوە بۆ تاکە سەرچاوەیێک کە بە زاهیر دەبوو شتی وەک یەک و لەیەک نزیک بەرهەم بهێنێت. هەڵبەت ئەم تەرزە هەوڵدانە داوا دەکات ڕاستەوخۆ و بەر لە هەموو شتێک مرۆڤ و دەورەکەی و زاتەکەی و قەناعەتەکەی و حەزەکەی و قابیلیەتە زگماکە خالقەکانی بێتەرەف و لاتەریک بکەیت تاکوو جەنابی گاسن و کرمی ئاوریشم و تۆڕی ماسی گرتن و داس و منشار و چەکوچ و ئاشی ئاو و دارخورما و گیا و هێلکە لەکلەک... بتوانن بێ تەدەخولی عامیلی مرۆڤ ژێربێژی ئەرەستۆ و فەلەکی بەتلەیمووس و شەڕەکانی هانیبال و دۆزینەوەی «جذر تربیعی» لە بابلی چوار هەزار ساڵ پێش ئێمڕۆ و خیلافی نێوان باوەڕی غەزالی و ئیبنو ڕوشد و بەیەکەوە هاتنی مولحیدەکان و ئیماندارەکانی سەردەمی عەباسی [چونکە زۆر بەرچاوە بۆیە ئەویان ناو دەهێنم] و جودایی مەزهەبی حەنەفی و

---

[4]- هۆشکول: متخلف عقلیا- Retarded.

شافیعی لە دەستنوێژشکان و تەڵاق کەوتن و... دیموکراسیی کۆنە یۆنان و دڕندەیی حوکمی زوربەی وڵاتانی دیکە و حەرامبوونی گۆشت کەروێشک لای هەندێک و حەڵاڵبوونی لای هەندێکی دیکە و... پەیدابوونی هەزار و یەک زمان و دەهەزار عادەت و صەد هەزار عەشیرەت... و میلۆنەها شتی دیکەی کۆمەڵایەتی بدەیتەوە بە گۆڕانی هێزی بەرهەمهێنان. هەر بۆ ئەوەی خالقیەتی مرۆڤ بەشدار نەبێ لە شی کردنەوەی ماددی، کە دێیت باسی گۆڕانی گاسن بکەیت بۆ تراکتۆر لێت مەنعە دەوری زاناکان و پسپۆڕەکان و تەکنیک زانەکان و ئەندازیارەکان و هەموو ئەو کەسانەی بە لایەنی تیجاریی مامڵەتی تراکتۆرەوە خەریکن بنبوو و پێشێل و خەفە بکەیت، ناشبێ بپرسیت ئایا. ئەو گاسنەی کە بەدوا گارەشەوەیە و جووتیار لەکاری دەهێنێت بۆچی هەر لە لای جووتیارەکە و سەپانەکە و فەلاحەکە و گارەشەکەوە تێهەڵنەکشی بەرەو گۆڕان تا دەگاتە «تراکتۆرایەتی» لەو وڵاتانەش تێهەڵنەکشی کە تا ئێستاش گاسن و گارەش بەر دەدەنە گیانی زەوی ڕوسم و کەڵەکاوی و چیمجاڕ و قاقڕ و زەنەکاوی و شۆرەکات!

ئەگەر ڕێمان هەبێ کەر و ئێستر بخوازینەوە بە نموونەی «هێزی بەرهەمهێنان»ی گوێزانەوە، زۆر بە تەوازوع و سەرکزییەوە پرسێکی کەرەوارانە و شەوکوێرانە و نەخوێندوانە دەکەین لەوەدا بۆچی ئێسترسوار و کەرسوار، وەیا ئەوانەی حەز لە سواری دەکەن و هەر خەونی پێوە دەبینن، کەر و ئێسترەکانیان نەگۆڕان بە عەرەبانە و گەرۆک و ڕێی ئاسن و فرۆک. بگرە پایسکلیش؟ ئێوە دەفەرموون «کە هێزی بەرهەمهێنان گۆڕا...» ئیتر کام جندۆکە و مێردەزمە و شەیتان لێ ناگەڕێن لە قرناقە و عفەک و شارەبان ئەم گۆڕانە چاوەڕوانکراوە «حتمی»یەی کەر و ئێستر بۆ عەرەبانە بێتە دی؟ ڕەنگە لەوەرامدا پێمان بڵێن باری ئابووری و ئاڵوویر و ڕامیاری و ڕۆشنبیری لەو شوێنانەدا بەرەوپێش نەچوون بایی ئەوە بکات هێزی گوێزانەوەیان تێدا بگۆڕێت. جا ئەگەر ئەمە وەرام بێت چ کارمان بە کێشەی «گۆڕانی هێزی بەرهەمهێن» نامێنێ چونکە کە ئەو هەموو بارانە گۆڕان شاڵڵا کەر و ئێستر هەرگیز نەدەگۆڕان...

ئەمە دەڵێم دەشزانم ئەگەر هەموو شتێک گۆڕا دەبێ کەر و ئێستریش بگۆڕێت هەر نەبێ بەوەدا کە بخرێتە پێش عەرەبانە، ڕێگەوبانیش خۆش بکرێن بە پێی داخوازی

سوورانەوەی ڕەورەوەی عەرەبانە، لەم حاڵەتەشدا چ دەورێکی نەزەریەی «هۆی بەرهەمهێنان» لە بەیندا نامێنێت چونکە ئەوسا نەزەریەیێکی دیکە دێتە کایەوە دەڵێ عەمەلیەتی گۆڕان لە شێوەی «نما» کردندا ڕوودەدات نەک لە ڕێی گۆڕانی هۆی بەرهەمهێنان و «تناقض»ەوە، دیارە «نما»ش هەرچی لە کۆمەڵدا هەیە دەیگرێتەوە بەو پێیە ئەگەر هۆی بەرهەمهێنانیش «بە تێکڕایی» نەگۆڕێ، بەرەوپێشچوون و گۆڕانی کۆمەڵایەتی هەر دەبێ.

بەلای منەوە ڕاستی و ناڕاستیی تیۆریی نما کردن چۆن دەبێ با ببێت [وەک بزانم زۆریشی ڕاستی تێدایە] ئەوەی مرۆڤ دەجووڵێنێ هۆیەکی یەکجار گەورەتر و بەرفرەوانتر و بنجیتر و کاریگەرترە لە «تناقض» و لە هۆی بەرهەمهێنان و ئەو تەرزە لێکدانەوانەی بە دەوری ئەو تەرزە «محور»-انەدا دەخولێنەوە. بزوێنەری مرۆڤ و کۆمەڵ «پەلەی ژیان»ە بە ڕابەرایەتی هێزی لێکدانەوە و هۆش ئیتر ئەو هێزە زۆر بێ یا کەم، توانای تێگەییشتنی تەواوی شتانی هەبێ یا نەبێ. وەک دەشبینیت «پەلەی ژیان» هەم «تناقض» یش دەگرێتەوە هەر هاریکاری و برایەتی و دۆستایەتیش.

ڕابەرایەتیی هۆشیش لەوانەیە بەرەو ئامانجی ڕاست لێ خوڕێت لەوانەیشە هەڵەی کوشندە بە مرۆڤ و بە گەلیش بکات، هەروەهاش بەبەریەوە هەیە لە ڕێی کەوتنە بەر حوکمی دوو هاندانی جودا وەیا دوو مامۆستای جودا دوو برای داکوبابی یەکێکیان ببێتە ئیماندار ئەوی دیکەشیان کفران بکات، هەروەک دەشێ دوو ڕێبازی سیاسی لە یەکتر جودا بگرنە بەر. خۆ ئەگەر بڵێیت مومکینە بەرژەوەندی موشتەرەک کۆیان بکاتەوە وەیا دژایەتی بەرژەوەندی بە شەڕیان بهێنێت دەڵێم ڕاست دەکەیت و قسەکەشت ئیسپاتی دەوری «پەلەی ژیان» و «هۆش و لێکدانەوە» دەکات پتر لەوەی بە ڕاشکاوی دەوری «تناقض» بە ئیسپات بگەیەنێت وەیا بە هیچ جۆرێک تەئسیری «هۆی بەرهەمهێنان» ی تێدا بدیترێت.

کە ئەمە دەڵێم میسالی بە هێزم بەدەستەوەیە: ئەگەر بەشەڕهاتنی دوو برا لەسەر تەماع لایەنی «تناقض» بسەلمێنێ خۆ لە هەمان کاتدا «پەلەی ژیان»یش دەسەلمێنێ، بەڵام کە دوو برا وەیا دوو برادەر وەیا دوو بەری میللەتێک بەسەهوو دەچن و دژی بەرژەوەندی هەردوو لا ناکۆکی دەنێنەوە «تناقض» و «هۆی

بەرهەمهێنان» لە هیچ ڕوویێکەوە و بە هیچ شێوەیەک تەفسیری ئەو ناکۆکییە نابەجێیە ناکەن: لەم حاڵەتەدا دیارە «هۆش و لێکدانەوە»ی بەرەواژ کاری خۆی کردوە کە هەڵوێستێکی «زاتی» ڕووتی پڕ لە هەڵەی پێک هێناوە و پەکی لایەنی «موضوعیة»ی خستوە. لەمەشدا فەرق نییە لە نێوان بەسەهوو چوون و بەسەهوو بردن چونکە هەردوو حاڵەت دەگەڕێتەوە بۆ «زات» بێگومان ئەگەر دوو هۆشی ئەلەکترۆنی لە جێگەی ئەو دوو لایەنە بەسەهوو چوە وەیا بەسەهوو براوەدا بوونایە ئیمکان نەدەبوو فەتوای ناکۆکی بدەن چونکە هۆشی ئەلەکترۆنی «زات»ی نییە بەسەهوو بچێت. ئەگەر مەعلووماتی هەڵەشی تێنەهاوێن بە فەند و فێڵی پیاوخەڵەتێن بەسەهوو نابردرێت.

دەمەوێ پرسیارێکی دیکەی سافیلکە بکەم و بڵێم ئایا گۆڕانی بەرەوپێشی فکری نووسەر و هونەرکار و فەیلەسووف بەستراوەتەوە بە گۆڕانی قەڵەمی پێنووسین و فرچە و ڕەنگ و تەوش و بەردی هەیکەلتراشی و کاغەز و مەرەکەبەوە؟ یاخود پێشکەوتنەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کارگەی کەرستەکان دروست دەکەن؟ یاخود بۆ گۆڕانی ئەو کارگانەی دروستیان ناکەن؟ خۆ دەبێ سەرەژوور چوونی فکری نووسەر و هونەرکار و شاعیر و زانا بکرێ بە بەندە و بەچکەی یەکێک یا دوان یا پتر لە هۆیەکانی بەرهەمهێنان، ئیتر ئایا بە باسکەکانی کام «هەشتپێ - اخطبوط»ی هۆی بەرهەمهێنان ئەو فکر و هۆشە شریتپێچ بکەین؟ تەمغەی نۆکەرایەتیی کام یەکێک لە سەرچاوەکانی ئیلهامی هۆی بەرهەمهێنانیان لێ بدەین؟ ئاخۆ دەست بە دارعەسای کام تەریقەتی هۆی بەرهەمهێنانەوە بگرین بۆ وەرامدانەوەی ئەو پرسیارەی کە دەڵێ بۆچی فەلاحی مسڵمان بە نیازی فرە کردنی بەرهەم بێ وەیا بۆ کەیفی پیاوانەی خۆی دوو سێ ژنان دەهێنێت کەچی فەلاحە دیانەکەی دراوسێی خۆی بە یەک ژن دابین دەبێت. ڕێشی نییە دوو ژن و سێ ژنان مارە بکات؟

کام داخوازی و پێداویستی هۆی بەرهەمهێنان وا دەکا لە یەک جێگەدا دوو سێ یاسای لەیەکتر جودا بۆ تاکە یەک جۆری بەرهەم پەیدا ببێت؟ بۆچی زانایەکی لاوەکی خەڕەکی خەڕەکڕێس بگەیەنێتە پلەی کارگەی چنین خەڕەک ڕێسەکەش هەر لە پلەی دوو هەزار ساڵ پێش ئیمڕۆ جینگڵ بخوات؟ بەڕاست کام هۆی بەرهەمهێنان لە حیجازی بەر لە هەزار و سێ سەد ساڵ گۆڕا و قورئانی پەیدا کرد و لە ماوەی

سێیەکی صەدەییکدا تاج و تەختی دوو دەوڵەتی هەرەگەورەی ئەو سەردەمەی تێک دا و عەرەبی بێ ماڵوحاڵ و بێسەواد و بێدەوڵەت و بێژیاری کردە فەرمانڕەوای بەشێکی زۆری جیهانی پێشکەوتووی هەزار و سێ صەد ساڵ پێش ئیمڕۆ؟

تۆ بڵێ کە لافاوی مسڵمانی ڕەشوڕووت ڕووی لەو وڵاتە کرد بۆچی هۆی بەرهەمهێنانیان تێدا بەدەنگ نەهات؟ ئایا شافیعی وەیا ئەبوحەنیفە لە هۆیەکانی بەرهەمهێنانی سەردەمی پێغەمبەرەوە بیروباوەڕەکانی خۆی هەڵدێنجا یاخود هی ڕۆژگاری ئەمەویەکان یاخود هی ڕۆژانی ژیانی خۆی؟

تێ ناگەم، کە دەرزی درووومانی دەست گۆرا بە مەکینەی Singer بۆچی پێوەندی نێوان ئەوانەی لەگەڵ درووومان خەریکن، جلدروو بێ یاخود جل دروستکردوو، هیچ گۆڕانێکی بەسەردا نەهات؟ ئۆتۆمۆبیل پەیدا بوو کەچی سۆفیەتی لە ساڵانی 1920-1940 پتر پەرەی سەند لەو سەردەمەی کە سۆفی بە پێیان یا بە سواری سەفەری دەکرد؟

خوێنەر لە شێوازی ئەم پرسیارانە سەیری نەیەتەوە کە دەبینێ بە لچکولێو و بەتەوسەوە خۆیان ئاڕاستەی هۆیەکانی بەرهەمهێنان دەکەن چونکە ئەو لچولێوەی ئەم گوتەیە لە هۆش و گۆشی مرۆڤی با دەدات و ئەو گاڵتەیەی بە هەست و زانینمانی دەکات گەلێک پتر لەوەی نووسیم و داوای تۆڵە لێ ستاندنەوە دەکات. تۆ سەیری کە دەڵێ «کە هۆی بەرهەمهێنان گۆرا... کۆمەڵایەتی دەگۆڕێ» چەند بە ڕەهایی و بێباکانە مرۆڤ دەکاتە عەبدی ئەو پێمەڕەیەی کە لە بن پێڵاوەکانیدا دەڕزێتەوە و خێرا یەکێکی دیکە لە جێگەی ئەو دەکرێ بە پێنج درهەمان، داس و گاسن و چەکوچ و تەڵە و تۆڕ... کە سەرەتاییترین کەرستەی گوزەرانن دەبێ جێگەی ئەو خوایە بگرنەوە کە ئایینەکان دەیانگوت هۆشی بە مرۆڤ داوە و ڕێی چاکە و خراپەی بۆ ڕوون کردۆتەوە! گۆیا من و تۆ و باب و باپیرانمان کە لە زمانی سۆمەرەوە بە گاسن و گارەش نانیان پەیدا کردوە، بیروباوەڕ و هۆش و ئایین و پێوانەی شەرەف و نامووس و مەردی و نامەردی و هەموو بوونی مەعنەویمان لەو گاسن و گارەشەوە بەسەردا باریوە! داسوولکە فێری ڕاستگۆیی وەیا درۆزنیمان دەکات! دەسا لەوەتەی مرۆڤ هەیە هەرگیز حورمەتی گاسن و داسوولکە و پێمەڕە و مسار و چەکوچی بەقەدەر حورمەتی پێڵاوەکەی لا نەبوە،

هەرچی هۆش و زانین و خەسلەتی چاکە و ڕێز لەخۆنانیش هەیە لە دژی ئەوان و لە ڕەغمی ئەوانی پەیدا کردوە. ئەو ژیانی ناگزوور و کولەمەرگی مرۆڤ بە هۆی ئەو ئامێرە خوێڕیانەوە بەسەری بردوە وەهای لێ کردوون بە دوژمن هەر دەستی ڕۆییشتبێ وازی لێ هێناون، تا ئێستاش فەلاحی قوڕبەسەر هەر ئاوی ڕوون شک ببات ناچێتە ژێر ئەرکە پشت شکێنەکەی داس و گاسن.

هەڵبەت دەزانم، تۆش دەزانیت، مرۆڤ کە ناچار بوو لەگەڵ بەندیخانەش دێتە ڕەدایێ، هەر بەو پێیەش سەپان ناچارە داسەکەی بسوێت و پەڕۆوپاڵ بخاتە ناو قەیناغەکانی پەنجەکانیەوە و- ئەگەر هەیبێ- لە ترسی مار و دڕک و قەسەڵ گۆرەوی چۆکان لەپێ بکات و کوندەڵانێکیش لە پەرێزێ بۆ مەشکۆڵەی دۆ - ئەویش ئەگەر دۆی هەبێ- و جەوەندەی ئاو قوت بکاتەوە هەموو ڕۆژێکیش سەد جاران لەعنەت لە داسەکە و قەیناغەکە و قەسەڵەکە دەکات هەر ڕێشی بوو هەڵدێت بۆ ژیانی شارستان. ئەم مامڵەتەی کە بەرژەوەند بە مرۆڤی دەکات لەگەڵ دەوروبەردا، بەڵگەی عەبدایەتی مرۆڤەکە نییە بە پێچەوانە هی ژیری و زانین و هەست کردنیەتی چونکە ئەگەر مرۆڤ ئەو زانایە و هەستیارە نەبا یا لەپلەی ئاژەڵیدا دەمایەوە یا وەک هەزاران گیانلەبەری دیکە ئەویش ئاسەواری دەبڕایەوە، سەیری چەند بە ئاسانی دەتوانین خۆمان لە چاوبەستەکێکی ڕواڵەتی دیاردان ڕزگار بکەین: ئا لێرەدا لە جیاتی ئەوەی عەبدایەتیی مرۆڤ بۆ دەوروبەر بە ئیسپات بگەیەنین هاتین ژیری و کابان پوختی و دەوڵەتپارێزیی سەپانەکەمان بەدی کرد لەو کاردروستاییەی کە بۆ حەسانەوەی خۆی کردی، هەر ئەمەش ڕاستی مەسەلەکەیە. بێگومان ئەگەر هەمان حاڵەتی پیتۆڵی و زیرەکی لە حەیوانێک بەدیاری دابایە کەس لێی نەدەکردە بەڵگەی عەبدایەتی بۆ حوکمی دەوروبەر، بە پێچەوانە، دەگوترا ئای لەم زیرەکییە و مشوورخواردنە عەجایبە های!!

سەرنجی خۆت بدە بۆچوونی ئەوانی لە بیرکردنەوەدا بەلای بایەخدان بە ماددەدا دەچنەوە، چەند بێ وچان و هەتا بۆیان بکرێ دەوری سەربەخۆی مرۆڤ لە گۆڕان و چەندوچۆنی ڕووداوی کۆمەڵایەتی دادەلەنگێنن: چونکە کاریگەری و دەوری سەربەخۆ پتر و ڕوونتر لە کردەوەی تاکدا بایەخدار خۆی دەنوێنێ دێن خەریک دەبن و دەوری تاک دەپووچێننەوە و هونەرەکەی دەدەنەوە بە گەل [ئەم مەسەلەیە

له لاپەرە 11-12 ی بەرگی سێیەمی کتێبی *«حاجی قادری کۆیی»* نەختێک ڕوون کراوەتەوە] لەوەشدا ئاشکرایە مەبەس دەوڵەمەندتر کردنی گەل نییە چونکە بێچارە بە قسە دەوڵەمەند نابێ. ئاگاشی لەوە نییە نووسەر هەن لەسەر کاغەز پشکی گەل لە کاری بایەخداردا پتر بەپێز دەنوێنن. مەبەس ئەوەیە «تاک» هەستی شانازی بەخۆ کردنی دابشکێت... دوای ئەمەی تاک ڕووتایەوە و گەلیش پۆشتە نەبوو ئەمجار دێت سەرلەبەر گەلیش بێ تەئسیر دەکەن لە ئاست «هۆی بەرهەمهێنان» بەوەدا کە پاتەوپات و بێتەئویل و عوزرهێنانەوە گۆڕان و بەرەوپێشچوون دەبەنەوە بۆ گۆڕانی هۆیەکانی بەرهەمهێنان، دەقی نەزەرەیەکەش وەها ئەو هۆیانە بەسەربەخۆیی باس دەکات هەر دەڵێی لە مەریخەوە بۆ سەر زەوی دابەزیون.

زۆر جاران لەگەڵ خۆمدا دەڵێمەوە قەیدی چی دەکرد ئەگەر گوترابایە مرۆڤ لە هەوڵی گوزەران و بەرەوپێشچوون و حەسانەوەیدا کەرستەی بەرهەمهێنان و دروست کردن و لەسەرخۆ کردنەوە و هەڵمەت بردنی بەرەو لەبارتری و چاکترییەوە دەگۆڕێت. هەرجارەش بە پێی داخوازی پەیدابوونی کەرستەی چاکتر، یاسای ئاڵوگۆڕ و مامڵەت لەگەڵدا کردن و سوود لێ وەرگرتن و هەموو پێوەندییەکی کە بەوانەوە بەستراوەتەوە دەگۆڕێت، ئیتر لەو ناوەشدا گەلێک وردە حیسابی سوودی بەرتەسکی شەخسی و بەرهەڵستی کردنی ئەم لایەنە و ئەو لایەنە و تووڕەبوونی عەمر و زەید و خۆشامەدی لێکردنی فلان و فیسار هەزاران هەڵوەست و گوتە و کردەی لەیەکتر نەچووی سوودمەند و زەرەرمەندان بەخەبەر دێت و کاری خۆی بە چاکە و بە خراپە دەکات.

ئێستەش دەڵێم بۆ دەبێ نەزەریە هەبێ حەز بەوە بکات ڕیشی مرۆڤ لە دەست گارەش و داسوولکەدا بێت! کەی ڕەوایە خەیاڵ بۆ ئەوە بڕوات کە ئەگەر عەبدایەتیی مرۆڤ بۆ هۆی بەرهەمهێنان بەئیسپات بگات کامرانی و بەختەوەریەکەی مسۆگەر دەبێت! ئەگەر مەبەست ئەوەیە لەڕێی بێبایەخ کردنی دەوری مرۆڤی هۆشیار و هەستیار و زانا و پسپۆڕ دەوری هۆی بەرهەمهێنان بەرز بکرێتەوە لەوێشدا هۆیە هەر سەرەتاییەکە کە چەکوچ و داسە بکرێ بە سەرامەدی هەموو کەرەستەیێکی بەرهەمهێنان هەر بۆ ئەوەی کرێکار و فەلاح کە چەکوچ و داس بە دەستەوە دەگرن بکرێن بە ڕابەری پێشکەوتن و خاوەنی کۆمەڵایەتی.

ئەگەر ئەمە مەبەستە خۆ دەتوانین بێ ئەو هەموو فاکوفیکە و چاوبەستەکنیە لە پێشەوە بڵێین کرێکار و فەلاح کە ئەرکی زۆر قورسیان بەسەر شانەوەیە دەبێ چاوەدێری بەرژەوەندیان بەزیادەوە بکرێت و بحەسێندرێتەوە و... تاد. چونکە ئەم قسە و بیروڕایانە کە هەرگیز لە عەمەلە و فەلاحەوە دانەکەوتوە بەڵکوو بیرکەرەوە و فەیلەسووف و ڕابەرانی سیاسەت لە چینەکانی سەرووی فەلاح و عەمەلەوە کردوویانە بە پرۆگرام وەیا ئایین، مومکین بوو جۆرێکی دیکەش گوترابان و دەقەکانیان پتر بەرەو ڕاستی چووبان و هەمیسان هەموو ئەو ئامانجەی کە ئێستا بەبەر چاوی بیر کردنەوەی ماددییەوە گیراوە ئەوساش بە بەرچاوی دەقەکانی دیکەوە گیرابا: هەرگیز بزووتنەوەی شۆڕشگێڕانەی پرۆلیتاریایی نەبەستراوەتەوە بەو باوەڕی کە دەڵێ هۆی بەرهەمهێنان و گۆڕانی. بنەمای بیروباوەڕی کۆمەڵایەتییە. ئەوەی ڕاستی بێ پەرۆشی من لەم قسانەی دواییمدا بۆ لایەنی ئاکارەکی (اخلاقی) نەزەریە و بیروباوەڕان دەگەڕێتەوە کە دەبینم لە ڕادەبەدەر مرۆڤ بۆ هۆی بەرهەمهێنان دەشکێننەوە، ئەگەرنا لە نوختەی نەزەریبوون و مەوزووعیبوونیانەوە زاتی خاوەن نەزەریەکە خۆی سەرپشک بوە لە داڕشتنیان. ئیتر خوام دەکرد لەو داڕشتنەدا هەرچی ڕاستی و بەرژەوەند هەیە پێشێل کرابێت وەیا بەرژەوەندی لایەنێکی بەرتەسک ڕەچاو کرابێت وەیا هەر مەبەستێکی دیکەی چاک و بەد هەیە تێی ئاخنرابێت، لە هەموو حاڵاندا لایەنی «زاتی» لە چاوان دەچەقێ: دەوری «زات» بەوە کەم نابێتەوە سوود و بەرژەوەند لە نەزەریەدا مەبەست بێت، بەوەش زیاد ناکات بە دوشمنایەتیی غەیر نەزەریە دروست بووبێت، بەڵام لەو حاڵانەدا کە بە ئاشکرایی ڕاستی بنبوو دەکرێت ڕێم هەیە بڵێم لەگەڵ ڕاستیدا ئاکاریش خنکێنراوە چونکە کارەکە سەربە «درۆزنایەتیی بێباک» دەگەیەنێت. ئەدی وەها نییە؟

ڕەنگە هەندێ کەس بە سافیلکەیی بڵێین ئەو نەزەریەی کە مەوزووعیەتی تێدا نەبێت لێی ناوەشێتەوە سەرکەتوو وەیا بەردەوام بێت لەبەر ئەمە پشتگوێخستنی واقیع و مەوزووع و ڕاستی بایەخ نادات بە لایەنی زاتیبوونی نەزەرەیەکە، بەڵام وەک بۆ چاوی حەقیقەتبین دەردەکەوێ بەردەوامبوون و نەبوونی پرۆژە و پرۆگرام و بیروڕا و نەزەریان کاتێک پەکی لەسەر ڕاستی و واقیعیەت و مەوزووعیەت و

بەرژەوەند و ئاکار... دەکەوێ کە بەبێ تەدەخولی «دەسەڵات» تاقی بکرێنەوە و ئەنجامەکانیان بەرەهایی و دوور لە چاوسوور کردنەوە هەڵسەنگێندرێن ئیتر بە پێی چاکە و خراپەیان بەردەوام وەیا کەمدەوام بن. کەچی وەک دەزانین بەزۆری پرۆژەی پووچەڵ لە دوو رێگەوە دەشێ پتر لە پرۆژەی دروست بەردەوام و رێز لێگیراویش بێت:

یەکەمیان رێگەی هێز و هەڕەشە بەکارهێنان، دوەمیشیان کوێر کردنی زات و نەفسی گەل تا ئەو رادەیەی فەرق بە چاکە و خراپەی پرۆژان نەکات. لەوە گەڕێ کەوا لە گەلێک حاڵوباردا گەل بۆخۆی لە پلەیێکی هێندە بەرەژێری دواکەوتندایە بە پرۆژەی چاک هەر رازی نابێ و رەنگە بەدەستی خۆی بەردی بناخەی ئەو پرۆژانەی مایەی خێر و خۆشین دەر بهێنێت. من لە لای خۆمەوە تارادەیێک رازی و ناچارم بە چاوپۆشی کردن لەو جۆرە پەک کەوتنەی «زات» کە بە هۆی ترساندن وەیا گێل کردن وەیا تێنەگەیشتن کاری رووخێنەر دەکات. بەڵام جۆرێکی دیکەی «زاتکوێر»ی یەکجار بریندارکەر هەیە لە تەحەمولدا نییە، ئەویش زاتکوێریی ئەو «رۆشنبیران»ەیە وا لەگەڵ داوا کردنی «علمانیة» و «موضوعیة» هێندە لە زاتییەتی گومڕادا رۆ دەچن قبوڵ ناکات هیچ کەسێکیش بە زاتی ئازاد و چاوی کرایەوە و مێشکی روونەوە دوو قسەی راست و دروست بکات و دوو هەڵان بەدەرخات و رەخنە لە دوو کاری نارەوا بگرێت. ئەو «رۆشنبیر»ی وەها زاتکوێر، پتر لە مرۆڤی سادەی نەخوێندووی سۆفییمەشرەب و دەروێشتەبیات دەبن بە مێردەزمەی ئازادیخنکێن، چالاکتریش هەرا دەنێنەوە دژی بیری رۆشنی بەرەوپێش، خێراتریش گونبەدی شەخسییەتیان بە رەهایی و ئازادیی فکر دەتەپێ و سوودی ماددیشیان دادەلەنگێ لەو رووەوە کە شۆرەتی ناویان و هۆی شۆرەتی ناویان و هۆی گوزەرانیشیان لە بەگژدا جوونەوەیان دژی بیروباوەڕی نەترساو و فێڵ لێ نەکراو هەڵدەقوڵێت. بەڵام دەبێ ئەوەندە بڵێم تێکەڵبوونی بەرژەوەند و هۆی گوزەران لەو بەگژدا چوونەدا مەسەلەکە بۆ «عاملی ماددی» ساغ ناکاتەوە چونکە بەر لەوەی گوزەران و بەرژەوەندیش کەوتبێتە ناو حیسابی لەسەر کردنەوە و بەگژداچوونەوە، کابرای «رۆشنبیر»ی زاتکوێر وەها یەخەگیری زاتی بینەر دەبێت هەر دەڵێی پاسەوانی پەرستگایە و لەگەڵ بێئیمانان دەجەنگێت.

ئەم تەرزە دیمەنە لە کوردستانی خۆمان بەدرێژایی پتر لە سی ساڵێک ڕابردوودا بەرچاو بوە بە تایبەتی لە کاتی هەڵپەوکڵپەی ساڵانی «وثبة» و 1959 کە مەیدانی شەڕ بە خەلق فرۆشتن بۆ ئەو «ڕۆشنبیر»ە زاتکوێرانە نەک هەر بەتەواوی کرابۆوە بەڵکوو مەیدانەکە بەڕووی زاتساغاندا وەها تەنرابوو لە بەندیخانە نەفەسبرتری لێ بەسەر هاتبوو. جا ئەگەر دەسەڵاتی ئەم زاتکوێرانە یەکجارەکی بووبایە فەرمانڕەوا، پرۆژە و تەجرەبە و تاقی کردنەوە و ئەزموونی قوربەسەر کەی دەیتوانی لە حاڵەتی ڕاست دەرنەچوونیاندا دەلالەتیان لێ وەربگرێت.

من لەو ساڵانەدا بە تایبەتی لە ساڵی 1959 «ڕابەر» ی وەهام دیتوە بووبوە فەرمانڕەوای ناوچەیێکی دوو هێندەی قەزای کۆیێ، هەموو پاشخانی سەقافەتەکەی سەکندایەتیی زێدە پاشکەوتوو و بێحورمەت بوو، ئەوپەڕی تێهەڵکشینیشی لە خوێندەواریدا ئەو بوو بۆی ڕێک نەکەوتبوو فێری ئیمزا بێت... هەزار ڕەحمەت لەگۆڕی بێت، بەڕاستی ڕابەر بوو...!

هەرچەند یەکجار بە پەرۆشم بۆ تێکرای ئەو ڕۆشنبیرانەی «زات» بە قوربانی «ماددە» دەکەن واش دەزانن کارەکەیان بە سوودی مرۆڤ تەواو دەبێت کە مرۆڤ خۆی «زات»ی ڕووتە، پەرۆشم بۆ بەرەی «هونەرکار»ان پتر کارم تێدەکات چونکە هونەرکار پتر لە تاقمی تێکڕای ڕۆشنبیری دیکە قەرزداری زاتی خۆیەتی لەو ڕووەوە کە بەرهەمەکەی دە هێندەی نووسین و قسەکردن زادەی هەناو و تەرجەمەی دڵ و دەروون و کەفوکوڵی بورکانی نەفسیەتی.

بێنە تابلۆی وێنەکێشێک بگرە بە پارچە نووسینی نووسەرێک، کە هەردوویان بە یەک بابەتەوە خەریک بووبن، دەبینیت دەلالەتی نووسینەکە صەد جاران یەکسەرتر و ڕوونتر و ئاشکراتر و «بابەتی» ترە لە دەلالەتی تابلۆکە. بە نموونە دەڵێم، کە دەخوێنیتەوە «زوڵم بەدە» هێندەی نووسەری عیبارەتەکە لە مەبەست و بابەتی قسەکە دەگەیت، بەڵام هەمان واتا لە تابلۆی وێنەکێشدا [هەر لە وێنەکێشی مەیلەو نەقاش تا دەگاتە سوریالیست] لەوانەیە بە جۆرێک تەعبیری لێ درابێتەوە کە هەر وتوویژی تایبەتی زاتی وێنەکێشەکە بێت و تەعبیرەکەش هەمووی دەسکرد و زادەی زاتەکە بێت کە بە دەگمەن نەبێ لە دڵ و دەروون و زاتی یەکێکی دیکەدا نە بڕسکێت و نە مەفهوومیش بێت. پێی ناوێ من بڵێم لە خۆوە دیارە، ئەو هەموو

ڕێبازە جودایەی کە بوونەتە قوتابخانەی جۆراجۆری وێنەکێشی، لە هەر ڕێبازەشدا بە ژمارەی کەسانی وێنەکێش شوێنپێ و ڕێچکۆڵەی تایبەتی و سەربەخۆ دێنە بەر هەست و چاو تا ئەو ڕادەیەی کە ئەگەر یەکێک لە خاوەن ئەو شوێنپێ و ڕێچکۆڵانە شوێنی یەکێکی دیکەی هەڵگرتبۆوە لە ناو شۆرەتی هونەرکاریی دەردەهاوێژرێت و بایەخی پێ نادرێت.

ئەمانە بەڵگەی زاتیبوونی وێنەکێشە چونکە دیارە بابەتی تاک تاکی هونەرکاری هەر یەکێک لەو ڕێبازانە هاوتا و هاوواتا و هاومەبەستی بابەتی کۆمەڵەی هاوڕێکانی خۆیەتی لە هەمان ڕێبازدا بەڵام زاتەکەی هاوکێش و هاوشەقڵ و هاوپێوی زاتەکانیان نییە، واتە ئەو خۆی نوسخەی دوەمی هاوڕێکانی نییە هەرچەند بابەتەکە و «التزام»ـەکەش بێ فەرق بێت لەگەڵ هی ئەواندا. لێرەدا هونەرکار جارێکیان شەقامەڕێی فکر و باوەڕی خۆی جودا کردەوە لەوانەی هاوباوەڕی نین، جارێکی دیکەش لە ناو شەقامەڕێکەدا ڕیچکۆڵەیێکی سەربەخۆی خۆی هەڵگرتەوە کە ئەگەر هەڵی نەگرێتەوە پێی ناڵێین وێنەکێشی هونەرمەند[5].

لە وێنەکێشی زاتیتر کاری مۆسیقایە، چونکە هەر نەبێ «وێنە» دیمەنی شتانت دێنێتە بەرچاو بە شێوەیێک کە ناسینەوەی ئەسڵەکەی لە دەسەڵاتی بینەردا بێت هەرچەند ڕاگەیاندنی تێکڕای تابلۆکە بەولای دەسەڵاتی بینەری عادەتییەوە بێت، بە نموونە کە تابلۆیەک چاوی پشیلە و تایەی گەڕۆک و دەسکەپیاز و شەکسپیر و ئەنگوستیلەی درووومانی لەتەک یەکتردا دانان مومکینە هەموومان تاک تاکی ئەو پێکهێنەرانە بناسینەوە هەرچەند نەشزانین تێکڕایان چ مەبەستێک بەدەستەوە دەدەن چونکە لەوانەیە وێنەکێشەکە مەبەستی لە کۆ کردنەوەیان «ڕاوەماسی» وەیا «شەڕ و ئاشتی» وەیا «دۆستەکەی خۆم» وەیا «یاریی سێباز» بێت، کەچی پارچەیێکی موسیقا نە واتای تێکڕای و نە هی لەڕەی هیچ تاکێک لەو ئامرازانەی تێیدا بەشدار بوون ئاشکرایە بۆ بەر گوێی بیسەر، تەنانەت پسپۆڕیش لە پەراوێزی بۆچوونێکی

---

[5]- من بۆ «فنان» وشەی «هونەرکار» پەسەند دەکەم، هەرچی وشەی «هونەرمەند»یشە بۆ واتای بەرفرەوانی چەسپاوی لە هەر کارێکدا، وەک بڵێی «ئەم نووسەرە هونەرمەندە» نابێ بڵێی نووسەر هونەرکارە.

فرەواندا دەتوانێ بەرەو خورپەی هەناوی موسیقاساز بڕوات، چونکە ئەویش ناتوانێ واتای هەموو لەرە و لەرزە و ترینگە و خرینگەیێک تێبگات وەک کە بینەر دەتوانێ چاوی پشیلە و دەسکەپیاز و ئەنگوستیلە بناسیتەوە با پسپۆڕیش نەبێت.

خولاسە هونەرکار لە هەموو رۆشنبیرێک زاتیترە، هەرچەند لە نێوان ئەو بەرەیەشدا خوار و ژوور و سەخت و ئاسان هەیە، هەر ئەو زێدە «زاتیبوون»ەشە وا دەکات بەرەی رۆشنبیران یەکجار تەنگەتاو بن بە دەست ئەو هەلومەرج و بەند و بەرهەڵستانەی کە ژیانی تاک و کۆمەڵ رێک دەخەن و یاسا و پێڕەو بەدوا خۆیاندا دەهێنن وەک ئەوەی کە دەبێ هەموو رۆژێ لە فلانە سەعات عەمەلە و مەئموور لە کاردا بن وەیا فەلاح ناچارە لەگەڵ شەبەقی بەیان گاجووتەکانی بۆ جووت کردن لێخوڕێت، هەروەهاش بەقاڵ و حەماڵ و لێخوڕ و کاروانچی و باخەوان. جا کە تۆ هاتیت و رۆشنبیر و هونەرکارت بەند کرد بە وەخت و سەعات کەڵکی لێ دەبڕێت و نەزۆک دەبێت، هەروەهاش نەزۆکی دەکەیت کە ڕێی ئازادیی لێکدانەوە و تەعبیرت لێبڕیەوە چونکە بابەتەکەی ئەو گاسن و هەنجیر و داسولکە و چەکوچ و ئێستر و تۆڕ... نییە کە بە درێژایی مێژوو بەدەست عەبد و حەپسانیشەوە هەر بەرهەمهێن بوون.

سەرمایەی ئەدیب و هونەرکار مێشک و دەروونەکەیەتی، باشتریش ئەوەیە بڵێم لە بەرهەمی زیهنیدا بەرهەمەکە و هۆیەکەی پێکهێنانی یەک شتە چونکە هۆش و دەروونی هونەرکار لە بەرهەمەکانیاندا خۆیان دەزێنەوە ئیتر یا لە شێوەی پەخشان و هەڵبەست یا پەیکەر و وێنە یا مۆسیقا... دا جلوە دەبەستن. تەنانەت دەتوانین بڵێین شەبەنگی ئەم بەرهەمانە - چ شیعر و پەخشان بێت و چ هونەری جوان بێت - لە مێشک و دەروونی نووسەر و بویژ و هونەرکاردا بەرلەوەی بشبن بە پارچەی هەڵبەست وەیا وێنە وەیا پەیکەر...

ئا ئەو شەبەنگە مەلۆتکەی ژان و ژواری زاتەکانە، جا ئەگەر هێزی «ونبینی»ی لە مرۆڤدا هەبێت دەتوانی بیانبینێت با نەشبووبنە تابلۆ و پەیکەر. بە نموونە دەڵێم، تۆ کە هاتیت چەند بەیتێکت لە دڵ و دەروونی خۆتدا رێک خست و بۆت رێک نەکەوت بیاننووسیتەوە و لێت گوم بوون وەیا هەر بەجارێ لە بیرت چوونەوە دیسانەوە تۆ دەروونەکەت خۆی زاوەتەوە هەرچەند مەلۆتکەش لە نێواندا نەبێت، هەروەهاش کە

ئەو خەیاڵە شاعیرییە لە دەروونی پەیکەرتراشدا ڕسکا و جلوەی بەست و خۆی هەڵکەند ئەگەر نەشبێ بە پەیکەر زانی دەروونەکە ناپووچێتەوە: دەروونەکە ئاوس بوە و زاویشە بەڵام بۆی ڕێک نەکەوت لە بەردێک چەسپ بێت وەک ئەوەی کە تۆ وێنەی خۆت بە کامێرا دەگریت تیشکەکان و سێبەرەکانی لە لەشتەوە هەڵدەبەزنەوە چ فەرقێک ناکەن بەوەی کە کامێراکە سەقەت بێ وەیا جامەکەی بسووتێ لەگەڵ ئەوەی وێنەکەت بە ڕێکوپێکی دەرچێت.

بەڵێ بێگومان هونەرکار لە ڕۆشنبیری دیکە پتر لە زاتی خۆیدا ڕۆچوە، تێکڕای ڕۆشنبیرانیش زاتیترن لە غەیری خۆیان، کە ئەمەش وەها بێ سەیری هەرە سەیر لەوەدایە کە دەبینم هونەرکار دەیەوێ وا ڕابنوێنێت ئەویش وەک خەڵقی دیکە بابایێکی مەوزووعییە، لەوەشدا «زاتییەت» تێکەڵ بە «ئیلتزام» دەکات. من ڕەوا نابینم چی دیکە موناقەشەی «زاتیبوون»ی هونەرکار بکەم چونکە دەبێتە کوتانەوەی بەدیهیە، تەنها ئەوەندە دەڵێم لە گۆشەی نەزەری ئیلتزمی هونەرکارەکەوە دەبێ هونەرکار یەکجار بەدرەنگەوە بێتە سەر لەدەستدانی خۆی و پڕکردنەوەی دەروونی بە بابەتی خوازراوەوە و بەدیاری وەرگیراو چونکە لەوەدا ئەو بەر لە هەموو کەسێک و پتر لە هەموو کەسێک نابووت دەبێت. تا ئەوەندەی هونەرکار لە باوەڕی بێخەوشەوە هونەرەکەی خۆی بکاتە خزمەتکاری ئیلتیزامەکەی ئیعتیرازێکم نییە، لەوە بەولاوە دوو ڕەخنەی یەکجار گەورە یەخەگیری هونەرکاری مولتەزیم دەبێت:

ڕەخنەی یەکەم لەوەدایە کە گومان لە دڵیدا پەیدا بێت و بە زۆرەملێی ترسنۆکانە گومانەکە بە باوەڕی ساختە کپ بکات.

ڕەخنەی دوەم ئەوەیە کە ڕێ بدات بە دەسەڵاتی لە خۆی گەورەتر خۆهەڵقورتێنێ لە کارە هونەراوییەکەی، ئیتر بە خاترانە سەوز بە قاوەیی بگۆڕێت و لە درێژی و کورتی ئەندامی پەیکەرکانی زیاد و کەم بکاتەوە و پلەی هەڵپە و دڵگەرمیی مۆسیقاکەی بە پێی ئارەزۆی لەخۆ گەورەتران خوار و ژوور ببات...

هەڵبەت لێرەشدا نامەوێ داوای قارەمانەتی لێ بکەم و بڵێم دەبێ مل بداتە یاخیگەریی بێجێ و بێباکانە: من ئەوەندە دەڵێم دەبێت حورمەتی هونەرەکە و

بیروڕاکەی خۆی بەوەدا بگرێ کە لە خۆوە بەرەوپیری توانەوەی ئیرادە و سوانەوەی زاتیەوە نەچێت و خۆشامەدی لە «بەردەستایەتی» خۆی و «دەسەڵاتداریەتی»ی چاوسوورکەرەوە نەکات، بە خۆڕاییش نەبێتە کوتەکی دەستان دژی هونەرکاری ئازاد و خاوەن زاتی بە هێز و پێز. لەمەشدا شتێکی ئەوتۆم داوا نەکردوە لە نرخی «هونەر» بەزیاد بگیرێت.

دەمێنێتەوە هونەرکار پێم بڵێ، کە ئەو بە خۆی و هونەریەوە خەریکی تەعبیردانەوە لە مەوزووع بێت چۆن لایەنی مەوزووعیەتی ژێر لایەنی زاتەکەی دەکەوێ بە جۆرێک پێی بڵێین «مرۆڤی زاتی» کە وا بەزاهیر زۆر لە مەوزووعیەت دووری دەخاتەوە؟ ئەوەی ڕاستی بێ ئەم پرسیارە لێرە بە پێشەوە وەرامی دراوەتەوە بەوەدا کە گوتوومە مرۆڤ لە حاڵی خەریکبوونی بە بابەتەوەش هەر خەلقەندەیێکی زاتییە چونکە مامڵەتی ئەو لەگەڵ مەوزووعدا وەک هی هۆشی ئەلیکترونی و تەرمۆمەتر نییە کە بە پێی یاساکانی سروشت و لە شێوەی ناچاریدا بێتە دی، تەنانەت وەک هی گیانلەبەرەکانی دیکەش نییە کە لە ڕێی غەریزەی نەگۆڕاو و یەکشکڵەوە تێکەڵ بە بابەت دەبن و هەتاهەتایی خۆیان دووبارە دەکەنەوە.

لەمەش بترازێین و چاو ببرینە بابەتەکەی پێوە خەریکبوونیەوە هەمیسان هەر دەگەینەوە بەو ئاکامەی کە هەمیشە پێی دەگەین ئەویش سەرپشکبوونی زاتەکەیەتی لە هەڵبژاردنی ئەو بابەتەی پێوەی خەریک دەبێت، فەرقێکیش لەوەدا نییە ئایا هەڵبژاردنەکە بە ئیرادە و خواهشتی ئازادەوە بوە یاخود بە هۆی بێدەسەڵات کردن و بەسەردا برینەوە بوە یاخود لە ڕێی گێل کردن و چاوبەستەکێوە، چونکە لە هەموو حاڵاندا بابەت ناتوانێ بچێتە نەفس و هۆشی مرۆڤەوە ئەگەر گونجاندنێکی لەگەڵدا نەبێت کەچی گەرمایی هەمیشە تەرمۆتر دەجمێنێت و ـ گونجاندن و پێ سەلماندن و فێڵ کردن و ئیقناع کردنیشی ناوێت. وەک لە پێشەوەش گوتم لە گەلێک حاڵوباردا نەفس و زاتی وەها هەیە بە هیچ جۆرە ئیقناع کردنێک واز لە باوەڕەکەی خۆی ناهێنێت.

ڕەنگە ئەوانەی حەز دەکەن جغز بە دەورەی ئیرادەی مرۆڤەوە بکێشرێت ڕەخنە لەو ئازادییە بەرفرەوانەی ڕۆشنبیر بگرن و بڵێن کە هات و ڕێگەی بەربەرەڵڵا خرایە پێش زاتی ئەو ڕۆشنبیرانەوە لەوانەیە هەریەکیان ڕێبازی وەها کێوی بگرێتە بەر کە

پێوەندی بە گیانی هاریکاری و خزمەتی کۆمەڵایەتی و ئامانجە بنچینەکانی گەلەوە نەمێنێت ئەوساش هەم لێیان خەسارەتمەند دەبین هەم زەرەریشیان لە دەست دەکێشین. لە ئاست رەخنەی وەهادا هەزار و یەک بەرپەرچدانەوە هەیە، من تەنها دوانیان بە عەرزەی خوێنەر و رەخنەگران دەگەیەنم:

1. ئەوانەی دەیانەوێ جغزەکە بە دەوری رۆشنبیراندا بکێشن، ئەگەر دڵسۆزیش بن، تەدەخول لە ئازادیی غەیری خۆیاندا دەکەن بەوەشدا مەیدانێکی بەرفرەوانتریان بە خۆیان داوە لەوەی رۆشنبیر لە بەکارهێنانی باوەڕی خۆیدا بەبەر خۆی هەڵبڕیوە چونکە رەخنەگرەکە سەرەرای رێگەبەخۆدان رێگەش لە خەڵق دەبڕێتەوە. ئنجا ناشسەلمێنێ کەس رەخنەی لێ بگرێت.
2. ئەو رەخنەگرانە وەها رادەنوێنن کە رۆشنبیری ئازاد و دەورە لێنەدراو بەرەو کاری بەد و رووخێنەر و ناجایەز دەڕۆن، خۆ ئەگەر ئەمە راستیش بێ [کە فری بەسەر راستییەوە نییە] یاسا و پێڕەو و بەندیخانە هەیە سزای رۆشنبیری رووخێنەر بداتەوە، کەچی رەخنەگرەکان لە کەس ناسەلمێنن سنوور بەدەوری ئیرادەی ئەوانەوە بکێشێت وەیا گومانی کاری بەد و رووخێنەریان لێ بکات هەرچەند لە ناوجەرگەی ئازادیی غەیری خۆشیاندا پێکۆڵ دەکەن، رەنگە زۆریش بەدرەفتار بن.

ئەمانەش بەلاوە بنێن، رۆشنبیر لە پەنجەکانی خۆی بەولاوە چ چەکێکی پێ نییە خەڵق بترسێنێت وەیا شتان برووخێنێت. بزوێنەری پەنجەکانیشی ئارەزۆی شەڕ و هەرا و زۆرانبازی و پەنجەرە شکاندن و درەخت هەڵکەندن و گیسک دزین نییە: بزوێنەری پەنجەی رۆشنبیر بریسکەی مێشک و تاوی دەروونیەتی. دیارە ئەو رەخنەگرانە لەو تریسکە و تین و تاوە دەترسێن نەکا لە مێشک و دڵ و دەروونی گەل رەنگ و دەنگ بدەنەوە.

بەلای باوەڕی منەوە، بەلای واقیعیشەوە. هەڵوەستی بیرکەرەوەی ماددی لە زاڵ کردنی تەئسیری ماددە بەسەر خواهیشت و قابیلیەت و توانا و کاریگەرایەتیی

مرۆڤدا پتر پەکخەری دەوری پێشرۆی مرۆڤن لەو لاهوتیانەی کە هەموو کردەوەیەکی مرۆڤ یەکسەر دەگێڕنەوە بۆ قەزا و قەدەر و هیچ توانایەکی کاریگەرایەتی بۆ مرۆڤ دیاری ناکەن. باوکم لە ئاست ئەوان لاهوتیانەدا دەڵێ:

چونکی سەلبی تەئسیریان لە قودرەتی عەبدی کرد
میللەتی وا بە قودرەت پاکی بەزیندوویی مرد

بەڕاست، ئەو کەسەی کە دەڵێ ئیرادەی کردگار لە غەیبەوە بڕیاری بەرەوپێشچوون و بەرەودوابوونەوەی ئادەمیزاد [تاک یا بە کۆمەڵ] دەدات چی خراپتری گوتوە لەو کەسەی کە بە زاری فەلسەفەوە دەڵی نەوت و پێستەرێوی و چەڵتووک و خەڵووز و شێلم و دەرزی و کەتیرە و گاسن و داسوولکە... پاڵ بە هەنگاوەکانی مرۆڤەوە دەنێن چونکە ئەگەر عەیبی قەزا و قەدەر لە نەزەر فەیلەسووفی ماددی ئەوە بێ کە ئیرادەی مرۆڤ دەکوژێت، شرەبابەتەکانی ئەویش بە پێی لێکدانەوەی ناو فەلسەفەکەی هێندەی قەزا و قەدەر سواری ئیرادەی مرۆڤ دەبن. خۆ ئەگەر پێم بڵێ هۆیە ماددییەکان بە پێی دەستووراتی وەها و واها تەئسیر دەکەن لاهوتی ئەوتۆش هەیە بتوانێ لە پەنا قەزاوقەدەردا گەلێک کەلێنی گەورە بە رووودا بکاتەوە بۆ تێخوێندنەوەی ئیرادەی مرۆڤ وەک «لیس للانسان الا ماسعی- وقل اعملوا فسيرى الله عملكم - وهديناه النجدين - وإذا الموؤدة سئلت بأى ذنب قتلت - فمن شاء فليؤمن ومن شاء فليكفر...». هەروەهاش، ئەو بێتەئسیریەی دەسەڵاتی مرۆڤ کە بەیتەکەی باوکم کردییە گلەیی و ڕەخنە لەو لاهوتیانەی ئیرادە بە مرۆڤ ناهێڵن بە شێوەیێکی ئاشکراتر لەو فکر و فەلسەفانەدا دەردەکەوێتەوە کە لە شی کردنەوەیاندا مرۆڤ دەکەنە پابەندی دەوروبەر و [بەتایبەتی] هۆی بەرهەمهێنان. بەڵام فەرقێکی بەرچاویش دەمێنێتەوە لە نێوان هەردوو حاڵەتدا، فەرقەکەش ئەوەیە بابای لاهوتی ڕێگەی لە لاهوتێکی دیکە نەبڕیوەتەوە کە باوەڕ بە هەبوونی ئیرادەی سەربەخۆ و ئازادی مرۆڤ بکات و قەزا و قەدەر بخاتە پلە دووەمی کاریگەرییەوە. خۆ ئەگەر ویستیشی ڕێگەی لێ ببڕێتەوە هەر پێی ناکرێ چونکە نە دەسەڵاتی ڕێگەبڕینەوەی هەیە و نە لە بەرنامەشیدا هەیە دەسەڵات بگرێتە دەست. بە زۆریش ئەو جۆرە لاهوتییانە گۆشەگیری دەکەن و کەمتر تێکەڵ بە کاری دنیایی دەبن بۆیەیە تەئسیری ئەوان لە تاکە ڕێگەی نووسین و گوتندایە،

بە پێچەوانە بیرکەرەوەی ماددی کە مرۆڤ دەخاتە بەر تەئسیری پێستەڕێوی و داسوولکە و هەموو هەوڵدانی ژیانی بۆ دەسەڵات پەیدا کردن و گەییشتن بە حوکمە، هەر کە دەستی تەقەڵاشی گەیشتە دەسەڵات تاکە ڕێگەی خۆی دەکاتە شەقامەڕێی هەموو گەل بە خوێندوو و نەخوێندوویەوە مەگەر بەرەیێکی لە خۆی بەهێزتر بێت و جێی پێ لەق بکات.

سەیری هەرە سەیریش لەوەدایە کە دەبینین لاهوتیەکە و فەیلەسووفە ماددییەکە، هەر یەکەیان لە ڕێبازی بۆچوون و باوەڕی خۆیەوە، حەج بە میللەت دەکات: لاهوتیەکە داوات لێ دەکات حەجی کەعبە وەیا قودس بکەیت، ماددییەکەش بەرەو زیارەتی ئەو گۆڕە پڕ شکۆیەتەوە دەبات کە وا تەرمی پێشەواینکی ماددییەتی تێدایە، لێرەشدا جارێکی دیکەش کابرای لاهوتی لە چەند سەرێکەوە کەم تەکلیفترە لە بابای ماددی چونکە زیارەتی قەبری پێغەمبەری لێ نەکردووی بە پێداویستێکی ناچاری کە بە پێی قیاس و بەیەکدی گرتن ئەمیان دەوەستێتە بەرانبەر تەرمخانەی پێشەواکەی ماددی، هەرچی «ماڵی خوا»یە کە حەج دەکرێت ژووررووی گۆڕستان و تەرمخانانە و لە نەزەریەدا کەس بە خۆ تێهەڵسوون و بەدەورەدا گەڕانی کەم نابێتەوە هەروەک کە لە نوێژیشدا سوجدەی بۆ دەبات کەم نابێتەوە، ئنجا حەجەکە هەلومەرجی زەحمەتی هەیە کە ئەگەر هەموویان بەیەکەوە لە تاکدا کۆنەبنەوە نابێتە «فرض» بەسەریەوە، کە کۆش بوونەوە کەس ناتوانێ داوای حەج لەو کابرایە بکات کە مەرجەکانی حەجی تێدا کۆبۆتەوە، لە ساڵیشدا کۆێکی دیاریکراو هەیە تێدا دەکرێت کەچی بیستوومە تەرمخانەی پێشەوا زلەکانی ماددییەت بەدرێژایی ساڵ حەج دەکرێت، دەشڵێن «تاکپەرستی» لە فەلسەفەی ماددیدا نییە.

ئەم دیاردەیەی سەردانی گۆڕستانی پێشەوای ماددییەت لەلایەن پەیڕەویکەرەکانی ماددییەتەوە بەو شێوەیەی کە دەبێتە جۆرە پەرستنێک و پێچەوانەی هەموو نەسەلماندنێکی تاکپەرستیشە، یەکێکە لە دیمەنە هەرە ئاشکراکانی هەڵوەستی زاتی کە چ پێوەندی بە مەوزووعیەتەوە نییە و تاکپەرستنێکی بێتەئویلیشە. واشدەزانم بەشێکی بەردەوامبوونی تاکپەرستییەکە دەگەڕێتەوە بۆ سوودی شەخسی ئەو دەسەڵاتدارە ماددییەی کە لە پەنا حورمەت گرتنی بێئەندازەی گۆڕی مردووەوە حورمەتی خۆی بەسەر خەڵقدا دەسەپێنێ چونکە خۆی جێنشینی مردووەکەیە و

میراتگری کەلەپووریەتی، لەو باوەڕەشدام ئەگەر پێشەواییکی یەکجار لەخۆڕازی بوو بە میراتگر و جێگر و جێنشین، هەر لەبەر خاتری حورمەتی خۆی، دەکەوێتە سەر باری کەم کردنەوەی حورمەتی مردوەکە چونکە ئەوسا وا دەزانێ بەشێکی حورمەتی خۆی بۆ مردوەکە دەڕوات ئیتر بانگەوازی ڕیسوا کردنی تاکپەرستی بەرزتر و گەرمتر دەبێت بایی ئەوەی کە دالەنگاندنی حورمەتی مردوەکە پەکی لەسەری کەوتوە، دیارە کابرای زیندوو بەر ئەو بانگەوازە ناکەوێت و پایەی دانالەنگێت، بە پێچەوانە بەرزتر دەبێتەوە.

خوێنەر حەقیەتی بپرسێت و بڵێت کە مەبەستی کابرای زیندوو لە هەموو حاڵاندا پاراستن و زیادکردنی حورمەتی خۆی بێت بۆچی پێی بڵێین «زاتی» لە حاڵێکدا ئەو خەریکی «سوود» بوە سوودیش ماددەیە نەک زات. لە ئاست پرسیاری وەهادا وەرامی دەستهەڵێنج و زۆریش هەیە: جارێ لە پێشەوە با ئەوە بڵێم، کابرای زیندوو ئەگەر زاتەکەی برسیی ناو و شۆرەت نەبێ چ پەکێکی ماددی لەسەر ئەو فاکوفیکە نەکەوتوە: پێداویستی ماددی بەزیادەو■ لەبەر دەست و ئیرادەی زیندوەکەدا کەڵەکەی کردوە بە جۆرێک صەد جاریش لە توانای بەکارهێنانی بەولاوەیە، ئەگەر زاتەکەی داخوازیی شتی دیکە نەکات دەفری لەش و ئارەزوە ماددییەکانی ئەو لەشە جێگەی ئەو شتە ماددییانەی تێدا نابێتەوە: وەک کە کاسە پڕ بوو چی دیکە لە ناو خۆیدا ناگرێت، وەیا شێر و پڵنگ کە تێر بوون ڕاوی نێچیری تازە ناکەن[6]، ئەگەر ئەو کابرایەش بەو پێودانە ماددییە مەوزووعیە خواهیشتە ماددییەکانی دابین بکات و گوێ نەداتە ئارەزوە نارەواکانی زاتە نەوسنەکەی، گەلێک زووتر و ئاسانتر دەحەسایەوە و خەڵقی دیکەشی دەحەساندەوە. لەمەش بەولاوە، هەموو بڕیارەکانی ئەو کابرایە چ بەردەوام کردن و ■ ڕیسواکردنی تاکپەرستی بێت لە زاتی مرۆڤەوە

---

[6]- درندە هەیە، وەک گورگ، بێ حیساب نێچیران دەکوژێت، لەو حاڵەتەدا سروشتی دڕی جانەوەرەکە کاریگەرە نەک پێویست ■ بەرژەوەند. شاعیری فارس دەڵێ:

نیش عقرب نه از پی کینست
مقضای طبیعتش اینست

دەردەچن، ئەگەر لە جێگەی ئەودا ئالەت بڕیاری دابایە نەدەشیا خۆی تێدا بخوێنێتەوە چونکە «زات»ی نییە داوای دابینبوون بکات.

ئەمە لایەنی زاتیبوونی هەڵوەستی ئەو تاکەی کە جارێکیان لە بەردەوام کردن و پێداهەڵگوتنی پایەی مردوان و جارێکی دیکەش لە دالەنگاندنی ئەو پایەیە دەحەسێتەوە، لەلایەن هەڵوەستی زوربەی زۆرینەی ئەو خەڵقەش کە بە سازی ئەو تاکە هەڵدەپەڕن زاتییەت و نامەوزووعیەتیان لە هەموو حاڵاندا وەک ڕۆژی نیوەڕۆ ئاشکرایە چونکە چ لە ترسان بێت و چ لە بڕواوە بێت و چ لە هەڵخەڵەتانەوە بێت هەڵپەڕینەکەیان هی زاتە نەک هی بەرژەوەندی ڕاستەقینە، تەنانەت ئەگەر لە برسانیش بێت کە لەوێدا بەرژەوەندی ئومێدی تێربوون دێتە ناو حیسابانەوە دەوری زاتەکە هەر بەرچاوە چونکە بڕیاردانی «هەڵپەڕین بە پارە» لە زاتەوە سەر وەدەر دەنێت نەک لە خودی پارەکەوە. «هەڵپەڕین بە پارە»ی مرۆڤ وەک هەستانەوە و دالەنگانی دەستەی تەرازوو ئالی و ناچاری و حەتمی نییە لەو ڕووەو- مرۆڤەکە بە پێی بڕیارێک هەڵپەڕین بە پارە دەفرۆشێت واش دەبێ هەرچی پارەی دنیا هەیە نایخاتە سەر باری هەڵپەڕین.

گەورەترین نموونەی چەرخی بیستەم بۆ نامەوزووعییەتی هەڵوەستی مرۆڤی سەربە باوەڕی ماددی مەسەلەی «ستالین» بوو کە دیتمان بۆ ماوەی سی ساڵێک پەرسترا، دوایی لە ماوەی دوو سەعاتێکدا لە سەری منارەوە سەرەژێر کرا بۆ بیر: کوڕم دەوێ گاڵتە بە عەقڵی خۆی نەکات و بڵێ هەردوو هەڵوەستی پەرستن و خستنە بیرەوە مەوزووعی و عیلمانی و عەقلانی بوون. هەڵبەت تۆش وەک من و لە منیش باشتر دەزانیت، هەردوو هەڵوەست بڵقی دڵ و دەروونان بوون و هیچ خزمایەتیەکیان لەگەڵ مەوزووعیەت نەبوو چونکە ناچێتە عەقڵی شێتیشەوە یەک شت ڕەشیش بێت و سپیش بێت. دیارە ئەو میلۆنانەی لە هەردوو باردا هەڵدەپەڕین لە ڕێی زاتی سواوەوە ئەم تەقلەبازییەیان لێ خۆش هات. هەر لەبیرمە، دوای ڕووداوەکە باوەڕپێکراوێکی هەرە گەورەی ئومەمییەت لە وڵاتی عەرەبدا، کە خۆی کوردیشە لە تەبریری ڕووداوەکە، چ شەرم دای نەگرت و گوتی ئەمە دەوڵەمەند کردنی مارکسیزمە. منیش کە لە ڕادیۆ قسەکەیم بیست بە دەست خۆم نەبوو گوتم ئەگەر ئەمە دەوڵەمەند کردنە ئەدی ئیفلاس پێکردن چۆن دەبێ! جا ئێستا دەڵێم

ئەگەر ماركسیزمیش بە ڕووداوی وەها ئیفلاس نەكات دەبێ میللەتەكە ئیفلاس بكات. ئەگەر بە ئیفلاسی میللەتیش نارازی و دڵشكستە ببین هەر نەبێ باسی دەوڵەمەندبوون لەو ڕووتانەوەیەدا نەكەین چونكە لەو تەرزە قسە بەرەواژەدا سەرلەنوێ خەڵقەكە ئیفلاس دەكاتەوە.

من لەگەڵ خۆمدا زۆر لێكدانەوەم كردوە بۆ دۆزینەوەی سەبەبێك ئەوەندە گرنگ و بایەخدار بێت وەها لە بیركردنەوەی ماددی بكات كە كز كردنەوە دەوری مرۆڤی لەتەک دەوری ماددە لێ خۆش بهێنێت. بەڵێ بێگومان، دەزانم هەڵنانی فەلسەفە لەسەر بنیچەی ماددی كە لە بنەڕەتەوە هیچ شتێكی نامادی تێكەڵ نەبووبێت بۆ تەفسیری پەیدابوونی ژیان و بەدوا ئەودا ئیرادە و بەدوا ئەویشدا هۆش و خاسیەتەكانی مرۆڤایەتی، بیركەرەوە بە ماددەدۆستی ڕادەهێنێت و ڕێش لەبەر قەناعەتی خۆش دەكات كە هەرچی لە جیهانی بێسەروبنی ماددیدا ڕوو بدات و دەربكەوێت و ون بێت هەمووی هەر دیاردەی ماددیی ڕووتە و پێویستی بە تێكەڵ كردنی هێزێكی نامادی نییە بۆ تێگەییشتن و پێڕازیبوونی.

ئەم تەرزە لێكدانەوەیەش كە سەرەتایێكی ناچارییە بۆ ئیمانهێنان بە ماددە، وردە وردە دزە بە خەیاڵ و فكر دەكات بۆ ئەوەی كە حاكمایەتی و كاریگەرایەتیی ماددە، هەروەک بەسەر هێزی غەیبدا زاڵ كرا، بەسەر هەموو شتێكی جیهاندا زاڵ بێت. من لە بەرەی بیركردنەوەی ماددی كە چ پێوەندیشی بە ماركسیزم و ماتیریالیزم و سیاسەتیشەوە نەبوە زانای وەهام دیتوە لە مەیدانی دیفاع كردن لە ماددە و ئیمانهێنان بە ماددە گوتوەتی پەیدابوونی ژیان و ئیرادە و مرۆڤ و گیانلەبەری دیكە هیچ شتێک لە بایەخی ماددە كەم ناكاتەوە و یەک تۆسقاڵیش لە سەنگی بیروباوەڕی نامادی وەیا سەربە غەیب زیاد ناكات چونكە هەموو عومری ئادەمیزادیەتی چەند سەد هەزار ساڵێكە، هەموو عومری «گیانلەبەرایەتی»ش چەند هەزار ملیۆن ساڵێكە. مرۆڤ و گیانلەبەریش تەنها لەم سەرزەوییە وەیا چەند جێگەیێكی كەمی بەرتەسكی مەحدوودی ئەم جیهانە بێسەروبنەدا پەیدا بوە. خۆ ئەگەر بێین ئەو چەند هەزار ساڵەی ئادەمیزاد و چەند هەزار ملیۆن ساڵی گیانلەبەران بە ئەزەل و ئەبەد بگرین و ئەو ئەرزە و چەند جێگەیێكی دیكەی وەک ئەویش(كە هەبێ) بەو جیهانە بێكۆتاییە بگرین قەترە بە دەریاش دەرناچن. جا ئەگەر حیسابی ئەو كاتە

کورتە و ئەو جێگە بەرتەسکانە کە ژیان و هۆش و ئیرادەیان تێدا پەیدا بوە لە دەفتەری لێکدانەوەمان بسڕینەوە کەمایەتییەک ناپەڕێتەوە بۆ ناو لێکدانەوەکەمان چونکە یەک قەترەمان لە دەریا کەم کردۆتەوە. خۆ ئەگەر لێکدانەوەکەمان بخەینە پێش پەیدابوونی ژیان و هۆش و ئیرادە وەیا بیخەینە دوای برانەوەیان بە هۆی تەقینەوەی بۆمبایەکی هایدرۆجینی زێدە بەهێز، کە ئەمەش «تصور»ێکی ڕەوایە لە مەیدانی موجادەلەدا، ئەوسا لە هەردوو حاڵەتدا هەر دەمێنێتەوە ماددەی بێگیان و بێهۆش بە خۆی و دەستوور و هێز و خاسیەتە ئەزەلی و ئەبەدییەکانییەوە و ئەم قڕەقڕەی موجادەلە کردن بە دەوری نهێنی چۆنەتیی پەیدابوونی ژیان و سروشتی هۆش و ئیرادە و ماددیبوون و ناماددیبوونیان دەبێتە وەهم و وڕێنە ئیتر خۆ تەفرەدان بە تۆژینەوە لە هەبوونی کردگار و هێزی ون و غەیبی جێگەی لە دەفری لێکدانەوەدا نامێنێ و لە خۆوە دەچێتەوە و دەپووتێتەوە.

خولاسە ئەو تەرزە بیر کردنەوە ماددییە کە زۆریش دوورە لە مارکسیزم، تارادەی فێڵ لەخۆ کردن و خۆ بەسەهوو بردنیش کەسەرداره دژی ئەو دیاردانەی شەبەنگی «ناماددییەت» بە بیری مرۆڤدا دەهێنن، هەر دەڵێی بیتاقەی یانسیبی بڕیوە لەسەر نەبوونی «خالق» و بێبایەخبوونی دیاردەی هۆش و ئیرادە و زیندوەتی. من لێرەدا ناچمە سەر بەگژداچوونەوەی ئەو جۆری بیرکردنەوەیە لەبەر زۆر هۆی ئەوتۆ کە ناتوانم بشیان ژمێرم چ جایی بە بەریانەوە بنیشم، مەبەستیشم لەم ئیشارە بۆ کردنە ئەوە بوو کە بە خوێنەری ڕابگەیەنم گەلێک ڕێبازی بیری ماددی خەریکی پووچاندنەوەی زات و نەفس و هۆشە، تەنانەت هی وەهایان تێدایە هێندە ئیمان بە ئالییەتی جیهان دەهێنێت کە مارکسیزمیش بە فەلسەفەیێکی میتافیزیکی دادەنێت. لەمەوە پتر بۆت ڕوون دەبێتەوە چۆن فرچک گرتنی بیروباوەڕی مرۆڤ بە بنجیبوون و کاریگەربوون و «هەموو شتبوون» ی ماددە لە خۆوە سەر دەکێشێتەوە سەر بایەخ نەدان بەو دیاردانە و هێزانەی کە وا ماددەی ڕووت نین و چۆن دەیانکاتەوە بە سێبەری ماددە.

ئەم خلیسکانە عەفەوییەی بیروباوەڕی ماددی، بە تێکڕایی، بەرەو هێنانە خواری پایەی مرۆڤایەتی بۆ بەر پایەی ماددەی مردوو. بە هەوڵ و تەقەلایەکی ئیرادی و دڵخواز دەگوڕێت کاتێک کە فەیلەسووفی ماددی دەکەوێتە سەر بای

چەنگەوبازبوون لەگەڵ فەلسەفەی ئەوتۆ کە دەیەوێ هێزی زیندوەتی و هۆش و ئیرادە ببایەوە بۆ سەرچاوەی غەیب. وا دەزانم مەترسی کردن لە فەلسەفەی دوانەتی [الثنائية-Dualism] و ئەو ئەنجامە رامیارییە و ئابوورییە و کۆمەڵایەتییەی کە دەشێ لێیەوە هەڵستێتەوە هانی فەیلەسووفی ماددیی سەربە سیاسەتەوە دەدات کە دوانەتییەکە بپووچێنێتەوە لە ڕێی هێنانە خواری مرۆڤ و قابلیەتە [بەزاهیر نامادییەکانی] بۆ ژێر حوکمی ماددە و یاساکانی چونکە دیارە فەلسەفەی «دوانەتی» لە خاسیەتەکانی زیندوەتی و هۆش و ئیرادە هێزی زۆر وەردەگرێت، جا ئەگەر ئەو بنەما بەهێزانەی زیندوەتی و هۆش و ئیرادەوە کرانەوە بە سێبەری ماددە، غەیب و میتافیزیک چەکی هەرە گەورەی شەڕ کردنیان کول دەبێ بەڵام لە هەمان کاتدا مرۆڤیش بە ناچاری دەبێ بکرێتەوە بە خزمەتکارێکی دەستەونەزەری ماددە چونکە کە مرۆڤ زیندوەتی و هۆش و ئیرادەی بوون بە سێبەری ماددە هەر دەمێنێتەوە لەشەکەی کە بریتییە لە ماددەی ڕووت، دەشزانین چەند دزێو و ناحەز دەبێ کاتێک مرۆڤ دەمرێت. واشدازانم فەلسەفەی ماددی، بەلای خۆیەوە، زۆری بۆ مرۆڤ تێدا هێشتوەتەوە چونکە کە ئەو هات ماددەی کرد بە جێگری «خوا» و هەرچی موعجیزەی سەرسووڕێنی ئەم جیهانە هەیە دایەوە بە ماددە و هێزە فیزیکیەکانی وەک کارەبا، ڕاکێشان، گەرمی، ئاتۆم... دیارە مرۆڤیشی کردوە بە «پێغەمبەر» کە هێناوەتی یەکسەر لەبەر دەستی ماددەی داناوە...

پابەندبوونی مرۆڤ و گیرخواردنی بەدەست ئەو بابەتەی پێوەیە خەریکە شتێکی یەکجار بەرچاوە بەدرێژایی و پانایی کات و جێگا[7] دواتریش لەم نووسینەدا ڕووبەڕووی نموونەی دیکە دەبین لەوانەی تێمان دەگەیەنن چۆن مرۆڤی زۆر زانا و زیرەک بە پێی هەڵکەوتێک کە خۆی تێدا دەبینێتەوە بڕیاری بەسەر شتی لەیەکتر

[7]- ئەم پابەندبوون و گیرخواردنە بەدەست بابەتی پێوەخەریکبوونەوە دیاردەیێکی ژیانی ڕۆژانەمانە وەک ئەوەی کە زۆر لە نوێژەکەری ئیمان دروست خوتخوتە و وەسوەسە وایان لێ دەکات بە زەحمەت دەسنوێژ بشۆن وەیا نیەتی نوێژ بهێنن. لە نێوان زاناکانیشدا دەبینی هەر یەکەیان دەوری گرنگ بەو ماددەیە دەدات کە کەسب و کاری ژیانی خۆی پێوەی بەندە. گوێ بگرە زانای سایکۆلۆجی و ئابووری و ئایین چ دەڵێن لە بابەت چەندوچۆنی ئەم جیهانە و قسەکانیان بەیەکدی بگرە و بزانە چەند لەیەکدی دوورن، بەڵکوو پێچەوانەشن...

چوون جودا دەبێت. ئەم ڕاستییەش بەزاهیر تەئسیری دەوروبەر بە ئیسپات دەگەیەنێ بەڵام لە واقیعدا دەوری «زات» ئاشکراتر دەکات چونکە ئەگەر لە جێگەی ئەو زاتەدا هۆشێکی ئەلیکترۆنی بڕیاری دابا یەک بڕیاری بۆ شتە لەیەکتر چوەکان دەردەکرد و «هەڵکەوت» نەیدەتوانی جودایی بخاتە نێوان بڕیارەکانیەوە لەو ڕووەوە کە هۆشی ئەلیکترۆنی زاتی نییە گوێ بداتە هەڵکەوت. بە نموونەی پتر ڕوون کردنەوە دەڵێم ئەگەر هۆشی ئەلیکترۆنی حاکم بێت لە دادگادا فەرقی دارا و عەلی ناکات، بەڵام عەلی و دارا لەوانەن لایەنگیریی دۆست و خزمی خۆیان بکەن لە ئاست بێگانەدا، بێگانەش هەڵاوێرن لە دوشمنەکانیان.

وەک گوتم، بەلای باوەڕی منەوەی ترسی دوانەتی Dualism پاڵ بە فەیلەسووفە ماددییەکانەوە دەنێت بەرەو پتر ڕۆچوون لە ماددییەت تا ئەو قووڵاییەی کە لەوێدا هێزی زیندوەتی و هۆش و ئیرادەش هەر بە قەدەر کێشی موقناتیس و تیشکی ڕۆژ نامادییەتی لێ دەسەلمێندرێ.

من لە گۆشەی تێفکرینی خۆمدا چ هەقێکم نییە بەسەر ئەو هاندەرانەی ترس و تەما تێکەڵ بە لێکدانەوەی فەیلەسووف و بیرکەرەوەی ماددی دەکەن و ئامانجی سیاسی و ئابوورییان لێ دەگۆڕن بە بورهانی فیکری. من بەتەما نیم ترسی فەیلەسووفی ماددی لە دوانەتی Dualism ی مەلای ئیسلام و قەشەی دیان و فەیلەسووفی ئایدیالیست نیگام لێڵ بکات و ڕای ناچایەزم پێ بسەلمێنێ، چونکە بڕیارم داوە ئەگەر تەفسیری جیهان و ڕووداوەکان و دیاردەکانی پێویستی بە دە هێز و بیست ماکیش هەبێت نەک یەک و دوو، بێ دوودڵی کردن دان بە هەموویاندا بهێنم، خۆ ئەگەر بە لێکدانەوەی نەترساو و بە داکوباب زانرا کە جیهانە هەرچی تێیدا هەیە لە خۆوە و بێ تەدبیر و بە شێوەی ڕێکەوتی کوێرانە پەیدا بوون و بەردەوامن، وەیا بەردەوام نابن، ئەوساش دڵ و مێشکی ئەوتۆم هەیە ئەو ڕاستییە، ئەگەر ڕاست بێ، بخەمەوە سەر ڕاستییەکانی دیکەی لێیان دڵنیاین.

لەگەڵ ئەمەشدا دەتوانم بڵێم. بیرکەرەوەی ماددی، لە هەر بەرەیێک و قوتابخانەیێک دەبێ بابێ، هیچ هەقێکی بەدەستەوە نییە لەوەدا کە ترسی «دوانەتی» پایەی مرۆڤی پێ دالەنگێنێت بۆ ژێر پایەی ماددەی مردوو وەیا ئینکاری دەوری هەرە گرنگ و سەربەخۆی هێزی زیندوەتی ئیرادە و هۆش لە ڕووداوی بایۆلۆجی و

کۆمەڵایەتی و مێژوودا بکات چونکە ئەو لە سەرەتای هەڵنانی فەلسەفەکەیەوە هەموو هێز فیزیکی و غەیری فیزیکی لەگەڵ هەموو ڕوودان و گۆڕان و نەگۆڕان و بوون و بەسەرچوون بداتەوە بە تاکە ماک و سەرچاوەی ماددە بێ ئەوەی دان بە هیچ سەرچاوەییکی دیکەدا بهێنێت و کەلێن بۆ بوونی خوا و هێزی غەیبی میتافیزیکی لە فەلسەفەکەیدا بهێڵێتەوە یەک زەڕڕە زیان لە «وحدانية»ی ماددە ناکەوێت نەزەریەکەشی کونی تێ نابێت ئەگەر سەرلەبەری گۆڕانی کۆمەڵایەتی بە تاکە کاریگەریی «هۆش» ببەخشێت و بایی فلسێک بایەخ بە نەوت و پێستەڕێوی و ئاسن و بنێشت... نەدات.

تۆ جارێ بۆ یەک دوو دەقیقە واز لە بیرکەرەوەی ماددی بهێنە: ڕەنگە سەیر لەوەدا بێ کەوا من هێندە بە دڵگەرمییەوە لەسەر دەور و کاریگەرایەتیی مرۆڤ دەکەمەوە، لە پلەی یەکەمدا مەبەستم ئەوەیە لە پەنا دەربڕینی ڕاستیدا مافەکانی جۆراوجۆری مرۆڤ بپارێزرێت چونکە وا دەزانم ئەو لایەنە فەلسەفییەی کە مرۆڤ مەحکووم دەکا بە ماددە و دەوروبەر تا ئەو ڕادەیەی دەیخاتە پلەی دووەمی کاریگەراتییەوە خۆی لە خەڵق دەکات بە فەرماندەی دابەش کردنی خێر و خۆشی و سەلماندن و نەسەلماندنی مافە بنچییەکانی مرۆڤ و ڕێدان و ڕێ نەدان بە ڕەخنە گرتن و ڕازینەبوون لە بڕیار و کردارەکانی ئەو، ئەمەش ئەنجامێکە دەیان ساڵە بە چاوی خۆمان دەیبینین و تێی دەگەین.

فەیلەسووفی ماددی دێت لە ڕێی هەڵنانی هۆیەکان و کاریگەرەکانی ماددی بە دەوری ئیرادەمەوە دەمکات بە تەلێکی هاوئاهەنگ لەگەڵ سیمفۆنی دەوروبەر و ئنجا دەشمکاتەوە بە دڵۆپێک لە دەریای کۆمەڵ و لەوەم دەردەهاوێژێت کە تاکێکی خاوەن ئیرادە بم لە نێوان ئاپۆرەی خاوەن ئیراداندا. دەنا ئەگەر کێشە فکرییەکە هەر لە چارچێوەی فکری ڕووتدا جێنگڵی خواردبایە و نەیکێشابایەوە سەر کەمبوونەوەی مرۆڤایەتیی هەموو تاکێکی کۆمەڵ، هەر بایی کێشەی گەورەتربوونی «موشتەری» لە «زوحەل» ئاکامی کۆمەڵایەتی لێ کەوتبایەوە، منیش هەر بایی گرنگیی ڕاستییەکی ڕووتی بێئەنجام بۆی بە پەرۆش دەبووم و ترسی کوژانەوەی زاتم و پووچانەوەی مافەکانم شەڕی بەردەوام و بە هەڵپەی پێ نەدەنامەوە.

تۆ ئەگەر ناوت عەزیز بێت و لە کاتی بەڕێ کەوتن لە هەڵەبجەوە بەرەو عەبابەیلێ سەهوو لە ناوت بکرێ و بڵێن فەرموو کاک قادر ترمبێل سازە، نەختێک ناڕاحەت دەبیت و لەوانەیت سەهوەکەش ڕاست نەکەیتەوە، بەڵام کە سەهوەکە لە شێوەی ڕەسمیدا بوو ئەوسا ئەگەر ڕاستی نەکەیتەوە میراتی باوکت پێ نادەن، مانگانەکەت گل دەدەنەوە، پەساپۆرتت نادەنێ کوڕەکەت لە قوتابخانە وەرناگرن...

پەرۆش بۆ «ڕاستی» کە هەستێکی پر شەرافەتە لە مرۆڤدا دەبێتە پەرۆش بۆ عەینی شەرافەتەکە لەو حاڵەتانەدا کە ڕاستی و شەرافەت بەیەکەوە دەبەسترێنەوە. تۆ سەیری، لە جێگایانەدا کە فەلسەفە ماددییەکەی پایەی هۆش و ئیرادە دادەلەنگێنێت خۆی دەبێتە یاسا و ئایین. هەموو ئەو حەبسبوون و خۆبەخت کردنە سیاسییانەی کە لە شوێنێکی دیکەدا دەبێتە هۆی شانازی کردن و ناو و شۆرەتی پیاوەتی و شۆڕسواری، هەموویان لەبەر سێبەری ئەو فەلسەفەیەدا دەبنەوە بە تاوان و ڕیسوابوون... و لەناوچوونیش. لە هەردوو حاڵەتیشدا یەک نیازی پاک و پیرۆزی ڕێزلەخۆنان و ماف وەدەستهێنان و خزمەتی کۆمەڵ لەلایەن خۆبەختکەرانەوە هاندەربوە.

هەر لەو ڕوانگەی ڕێزنان لە مرۆڤایەتی و ئیرادە و بیروباوەڕ و مافە ڕەواکانیەوە ڕەخنەی یەکجار نارەزامەندانەم هەیە لەو گوتە کۆنە پەرەسەندوە پێدا هەڵگوتراوەی کە دەڵێ «مرۆڤ نرخدارترین سەرمایەیە». دەزانم لە سەرەتاوە ئەم گوتەیە بە نیازی بزاوتنی دەماری هەست بەخۆ کردنی ئاپۆرەی هەژار و قەلەندەران دەربڕاوە لەو کاتانەدا کە وا جارێ ئەوەی پێی دەڵێن «لایەنی کەم - الحد الادنی» ی مافی کۆمەڵایەتیی تاک و کۆمەڵ خۆی نەکردبوە پاڵەپەستۆ بەسەر هەست و هۆشی بیرکەرەوانەوە، بەڵام ئەو سەردەمانە لە هەموو ئاسۆیەکانی بیروباوەڕ و خەبات و بەرەپێشچوون و گۆڕانی کۆمەڵایەتی ئاوابوون و چوونە ڕیزی یادگار و ئاستەوار و شتی کۆنینە. خۆ بە نیسبەت وڵاتە سۆشیالیست و کۆمیونیستەکانی، کە گوتەی وەهایان تێدا باوە، بە حیساب، حکومەت و دەسەڵات هی ئەو چینانەیە کە وا بەر لە سەد ساڵ گوتەکە بۆ خاتری ئەوان و بۆ دڵدانەوە و هاندانی ئەوان دەربڕابوو، واتە مرۆڤەکە خۆی خاوەنی واقیعەکەیە، هەر بە جارێ دەوری بەسەر چوە، چونکە پرسیارێک هەڵدەستێت دەڵێت: چۆن دەشێ مرۆڤ بە خۆی بڵێ من سەرمایەم؟

گریمان سەلماندمان لە شوێنێکی وەک فرانسە وەیا ئەڵمانیادا جارێ بەرەی پرۆلیتاریا نەگەیشتوە بە مافەکانی خۆی و تا ئێستاش دەتوانین بە بۆرەتەئویلان رێ بە خۆمان بدەین بڵێین زوربەی گەل پێویستی بەو جۆرە دڵدانەوەیە هەر ماوە، خۆ لە پۆلۆنیا و بولغاریادا پرۆلیتاریا حوکمڕانە ئیتر چۆن ڕەوا دەدیترێ حوکمڕان گاڵتە بە خۆی بکات و بڵێت خۆم لە هەموو سەرمایەکانی وڵاتی خۆم نرخداترم. بە نموونە دەڵێم، چەند سەیرە بابایەک لە ماڵی خۆی چاو بە کەلوپەلەکانی ناو ماڵدا بگێڕێت و، دوای لێکدانەوە، لەگەڵ خۆیدا بڵێ نێوان بۆفێ و مافوور و قاپ و قاچاغەکان... دا خۆم لە هەموان پتر پارە دەکەم. وەیا فەلاحێک بێت و نرخی خۆی بە گاجووت و بزن و مەڕ و ئەرزەکەی بگرێت و بڵێ ئافەرین لە خۆم چەند بەنرخترم لەوان!

کاتێک مرۆڤ بەڕاستی «سەرمایە» بێت، وەک کە لە کۆندا عەبد دەکڕان و دەفرۆشران، ئەم گوتەیە تابڵێی بەنرخ و مرۆڤدۆستە بەڵام لەم سەردەمەدا ئەویش وەک هەزارانی شتە کۆنینە چاکەکان کە دەوریان بەسەرچوە بۆتەوە بە دوشمنی مرۆڤ چونکە لە جیاتی ئەوەی بە خاوەنایەتی و ئاغایەتیی مرۆڤدا هەڵ بڵێی دەیهێنێتە ریزی «سەرمایە» و نەختێک، بەدرۆ، لەوی بەرزتر دەکاتەوە. درۆیەکەش زۆر ئاشکرایە چونکە بێگومان ئەو کەسە و ئەو کۆمەڵەی گوتەی وەها دەڵێنەوە هەرگیز لە تەتبیقدا مرۆڤ ژووروی ئالەت ناخەنەوە لەو ڕووەوە کە هات و هەڵەیێکی کرد وەیا ئامێرێکی شکاند گورج یەخەگیری دەبن و خێرا بە خێرا بە نیازی تۆڵە لێ سەندنەوەی دان بە هۆش و گۆش و ئیرادەیدا دەهێنن و پێی دەڵێن خۆ تۆ گاجووت و کۆکا و مافوور و پەنیر نیت بتبەخشین. هەزار جارانیش بڵێ کوڕینە من نرخدارترین سەرمایەم لێی ناسەلمێن.

هەڵبەت من لەم میسالەدا مەبەستم ئەوە نییە چاوپۆشیی خۆڕایی بکرێ لە مرۆڤی خەتاکردوو و تەنبەڵ و تەوەزەل چونکە دیارە ئەو تەرزە مرۆڤانە هەر بەجارێ کەڵکیان لێ دەبڕێ کە دیتیان خەتایان لێ بەسەر ناگیرێتەوە، مەبەستم ئەوەیە بڵێم ئەم گوتەیە لە هەموو ڕوویێکەوە پەک کەوتە و بێبایەخ و بێ ناوک و ناوەڕۆک بوە بە تایبەتی لەلایەن ئەوانەی لە ئاخاوتندا بەکاری دەهێنن، ئەگەر پەکیشی نەکەوتبێ هەر لەوەدا پەکی نەکەوتوە کە مرۆڤەکە تێیدا خەسارەتمەند دەبێ چونکە دیارە کە

خرایە ڕیزی سەرمایەوە دەبێتە بابەتی بازاڕ و کڕین و فرۆشتن، وەک دیتیشمان بابی تاوانباربوون لە کاتی هەڵەکردندا دەبێتەوە بە مرۆڤ و لە «سەرمایە» دەشۆرێت.

وابزانم تۆش لەگەڵ مندا باوەڕ بەمە دەهێنت کە مرۆڤ ناوی سەرمایەی لێ نرا خاوەنی لێ پەیدا دەبێت و دەستی بەسەردا دەگرێت ئەوساش خاوەنەکەی چۆنی بەلاوە بەرژەوەند بێت وەهای لێ دەخورێت و ڕەفتاری لەگەڵدا دەکات. ئیتر دەشێ وەک دیل بیخاتە قەفەسەوە و وەک دابەستەش خواردەمەنی تێروپڕی بداتێ، ڕەنگە بە پێچەوانەش برسی بکات یا هەرچۆنێک خۆی بیەوێت وەها لەم بەنرخترین سەرمایەیە بکات. لە هەموو بارێکیشدا سەرمایە مافی ڕازینەبوون و ڕەخنەگرتن و داواکردن و خواهشت دەربڕینی نییە. هەر ئەمەیشە بەو مرۆڤە ڕەوا دەدیترێ کە پێی دەڵێن بەنرخترین سەرمایە. ئنجا هەروەک بیرکەرەوە ماددییە سیاسییەکانی بەرەی شۆڕشگێڕ بە خەڵق ڕادەگەیەنن کە ڕازیبوون بە لیبەڕالیەتی بەردەوامبوونە لە کۆتی بۆرجوازیەتی، هەرچەند لە سەردەمێکدا لیبەرالیەتی پێشکەوتووترین ڕێژێمی سیاسی بوە، منیش بە مرۆڤی ئەم سەردەمە دەڵێم ڕازیبوونت بە گوتەی «مرۆڤ بەنرخترین سەرمایەیە» تەڵەیێکی ئەبەدیت لێ دەنێتەوە چونکە لەمەیاندا پلە و قۆناغ و سەردەم پەیدا نییە وەک لە لیبەڕالیەتیدا هەبوو، لەبەر ئەمە ئەگەر خۆتی لێ ڕزگار نەکەیت هەتا هەتایێ بێنرخترین [دیسان دەڵێمەوە بێنرخترین] سەرمایە تۆ دەبیت.

بەڕاستی گوتەکە بە نیسبەت تێکڕایی ئادەمیزادەوە ئیفلاسی کردوە بەڵام بێگومان بەلای ئەو کەسەی بەسەر خەڵقی دیکەیدا دادەبڕێت، هەتا ئەو ڕۆژەی تەڵەیێکی باشتر دەدۆزێتەوە، گوتەیێکی زۆر بە پیت و بەرەکەت و بڕشتە. لەلایەن مەوزووعیبوون و زاتیبوونی گوتەکەیشەوە لە ئاشکرا ئاشکراترە کە وا زووربەی مرۆڤ تەڵەی وەها پەسەند ناکات ئەگەر زاتەکەی کوێر نەکرێت چونکە دیارە عەبدیش لە ناچارییەوە نەبێت حەز بە عەبدایەتی ناکات. بەڵام ئەو دەسەڵاتەی کە گوتەکە بەسەر غەیری خۆیدا دەسەپێنێت حیسابی زاتیەتی و مەوزووعیەتی لەگەڵدا ناکرێت چونکە ئەو لەم هەڵوەستەدا هەلپەرست و سەرشێوێن و عەوام خەڵەتێنە، ڕەنگە جەلادیش بێت. بابگەڕێمەوە بۆ حیکایەتی «دوانەتی» و مەترسییەکانی.

دیتت لە قسەکانمدا بەلای ئەوەوە چووم کە لە سەرەتای بیرکردنەوە و لێکدانەوەدا فەیلەسووفە ماددییەکان هەم لەبەر غەرقبوون لە کەلکەلەی حەپەسان بەرانبەر شکۆی ماددە و هەم لەبەر ترسی دزەی بیری «دوانەتی» بۆ ناو لێکدانەوەی ماددی، بەناچاری، بەرەو داڵەنگاندنی پایەی هۆش و ئیرادە چوون. دواتریش کە بەرەی ئەو فەلسەفەیە گەیشتە حوکم و دەسەڵاتی بەدەستەوە گرت سوودی خۆی لەوەدا دۆزیەوە کە مرۆڤ هەر لەو پلەیەدا بمێنێتەوە نەوەک لەسەر سەکۆی زێدە بڵندی «یەکەمایەتی و کاریگەرایەتی و خاوەنایەتی و ڕابەرایەتی»دا تەمای مافی ڕەخنەگرتن و ڕازینەبوون و بەدرۆخستنەوە و قەناعەتگۆڕی و ئەو تەرزە یاخیگەرییانە بچێتە دڵییەوە چونکە بێگومان مرۆڤی ئیرادەئازاد یەکجار زەحمەتتر و درەنگتر دابین دەبێ لە مرۆڤی گیرخواردوو بەدەست قودسییەتی نەزەرییانەوە.

مرۆڤی ڕەها لەوانەیە لە خۆشیدا خنکابێت و داوای پتر بکات. بە پترەکەش ڕازی نەبێت ئیتر بابداتەوە سەر بێباکی و ڕیشبەردانەوە و جلشڕی و قوتەیی و گاڵتە بەدنیا کردن، بەڵام کە وەک سۆفی، ترسی بەزاندنی سنووری قودسییەتی نەزەریە و بیروباوەڕ مچوڕکی بە لەشیدا هێنا، زۆر بە ئاسانی، دوو قسەی میکرۆفۆن و دوو دێڕی نووسینی سەر دیوار بە ئیمزای سەرۆکەکەیەوە هێندەی عەسکەری ئیجباری فەرمانبەرداری دەکا بۆ بەر حوکمی لەخۆ گەورەتران. کە برسی و ڕووت بوو دەسەلمێنێ بۆ سوودی گشتی جانفیدایی کردوە، کە تێر و پۆشتەش بوو شانازی دەکا کە هیچ پێڕەو و یاسا و نیزامێک نییە هێندەی ئەو یاسایەی خۆی تەقدیسی دەکات مرۆڤنەواز بێت.

من لەو باوەڕەدام ترسی ڕازینەبوون و یاخیگەریی جیلی دوای نیوەی سەدەی بیستەم وا لە سەرۆکەکانی وڵاتە کۆنە شۆڕشگێڕەکان دەکات پتر بەرەو سیاسەتی «بەیەکەوە هەڵکردن» بڕۆن چونکە خەڵقەکە لەو وڵاتانەدا دەمێکە داوای چاوپۆشی و لێبووردن و لەخۆبووردن و جانفیدایی و ڕازیبوونیان لێ دەکرێ تاکوو وایان لێهات بەرەو نارەزایی و نەسەلماندن ببنەوە چونکە هەموو تەحەمولێک سنوورێکی هەیە. مرۆڤیش هەرچەند ڕام و کەوی و دەستەمۆ بکرێت هەر مرۆڤە و نابێتە جانەوەر. لەبەر ئەمە بەبەریەوە هەیە ڕۆژەک لە ڕۆژان دەروونە تەنگەتاوکراوەکەی بتەقێتەوە. ئنجا ئەگەر ئەو سەرۆکانە بزانن سیاسەتی کرانەوە و بەیەکەوە هەڵکردن

خێراتر خەڵقەکە بەدەنگ دەهێنێت لەوەی دیوار بە دەوریەوە هەڵبنرێت با دەدەنەوە سەر ئەمەیان چونکە لە هەموو حاڵاندا سەرۆکەکان حیسابی بەردەوامبوونی دەسەڵاتی خۆیان بەر لە هەموو شتێک دەکەن، لەوەشدا فەرق نییە ئایا بینبڕکێی نێوان خۆیان بۆ سەرۆکایەتی بەگژ یەکتریاندا بهێنێت وەیا ترسی بەدەنگ هاتنی زوربەی میللەت حەولی تەبریر و چاوبەستەکێ و «زات کول کردن و بەهەڵەبردنی خەڵق» و فەلسەفەگۆڕی و کاری ئەوتۆیان پێ بکات چونکە لە هەموو حاڵاندا پێوەندییان بە مەرزووعیەتەوە نییە. بگرە لە زاتییەتیشدا، وەک پێشتر گوتم، بەلای هەلپەرستیدا دەچنەوە.

لەبەر تیشکی ئەو دێرانەی لەو یەک دوو لاپەڕەیەی دواییدا خوێندتەوە، من کە دێم حیساب بۆ ترسی دوانەتی لە لێکدانەوەی فەیلەسووفە ماددییەکان دەکەم، هەڵوەستی سەرۆکە سیاسییەکان کە دەچێتەوە بۆ «هەلپەرستی» نەک بۆ شتێکی تر بەر ئەم حیسابەی من ناکەوێت چونکە هاندەری هەلپەرستی پەکی لەسەر حەقیقەت و ڕاستی و درۆیی شتان نەخستوە تەنانەت ئەگەر بزانێ بە پەرەسەندنی فکرەی دوانەتی ئاشەکەی خۆی خێراتر دەگەڕێ دەرلەحزە دەیکا بە باوەڕ و بە ئایینیش. حیسابی من لەگەڵ داهێنەران و بێ مەبەستەکانی ئەو لێکدانەوە ماددییەیە کە هێزی نەزەریەکەیان لە پێشخستنی دەور و کاریگەرایەتی ماددەدا دیتوە ئەوساش هاندەری سوودی شەخسی و پاراستنی دەسەڵات لە کاسەی ئەواندا نەبوە تاکوو بڵێین مەبەستی سوود و ناو شۆرەت پایەی مرۆڤی بەوان داڵەنگاندوە چونکە کاتێک فەلسەفەکە هەڵدەندرا، وەک گیانی کوردایەتی ئەم سەردەمە، هەر ناڕاحەتی بەدوا خۆیدا دەهێنا بۆ ئەوانەی پێیەوە خەریک دەبوون.

جا ئەگەر خوێنەرێکی ئەم ڕۆژگارە بیەوێت لە سەرنجدانی ئەم نووسینە سوودێکی فکری وەربگرێت دەبێ دوو جورئەتی زۆر گەورە بداتە بەر خۆی: یەکێکیان لەوەدا کە ترسی «دوانەتی» لە شێوە بیرکردنەوە و بۆچوونەکانی فەیلەسووفە کۆنەکانی ماددیەت دەدۆزێتەوە و دەبینێت ئەو ترسە بەزیادەوە نرخ و سەنگی ماددەی مردووی بە قاچاغ هێناوەتە ناو نەزەریەکەوە، یەکێکیشیان لەوەدا کە بۆی ڕوون دەبێتەوە چۆن ڕابەرە سیاسییەکان و خاوەن دەسەڵاتەکانی بەرەی فەلسەفەی ماددی بە نیازی پاراستنی دەسەڵاتی خۆیان و کەم کردنەوەی مافی ناڕەزابوونی

زوربەی میللەت بەردەوام دەبن لەسەر پێداهەڵگوتنی دەوری مادده، بگرە بە پێی زۆربوونی ژمارەی ڕۆشنبیران پتریش لە جاران نووسینی ماددەدۆست بڵاو دەکەنەوە.

دوای ئەم دوو جورئەتە زلە تێبینییەکی دیکە دێتە پێش پتر لە زەحمەتی چاوپێداگێڕانەوەی فەلسەفەی زیاد دەکات ئەویش بیکەسی و بێپشتیوانیی ئەم تەرزە نووسینەی بابایێکی وەک منە کە ئەگەر ڕاستیشی پێکابێت و هیچ هەڵەشی تێدا نەبێت تاکە یەک نان پەیدا ناکات، بە پێچەوانەی خۆدانەپاڵ لایەنەکەی تر وەک بە چاوی خۆمان لە سەرانسەری جیهاندا دەبینین. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا کەس بە خوێندنەوەی نووسینی بێپشتیوان زەرەرمەند نابێت، خۆ ئەگەر چ سوودیشی هەبێت خاوەنی نووسینەکەی تێدا بەشدار نابێت، بۆیەیە بێ زمان گرتن و کۆمە کردن ئەم وتووێژە لەگەڵ خوێنەری کوردا دەکەم.

ئەوەش دەڵێم و دەخەمە سەر قسەکانمەوە: خوێنەر هەر جۆرە لێکدانەوەیەکی سوود و زەرەری چاو پێدا گێڕانەوەی بیروباوەڕ دەکات با بکات و هەر بڕیارێکیش لەوەدا دەدات با بدات بەڵام با ئەوە بزانێت کە ئەو، پاش دۆڕاندنی ئیرادە و ئازادیی باوەڕەکەی، لە نەزەر سەرپەرشتیکەرانی فەلسەفەکەدا دەبێتە «شت» و مامڵەتی شتی لەگەڵدا دەکرێت چونکە مرۆڤ کە لە بنەڕەتدا مەخلووقێکی خاوەن هۆش و ئیرادەیە بۆ خواهشتی خاوەن مەبەستی شەخسی ڕام نابێت تا هۆشەکەی کول دەبێت و ئیرادەکەی دەسوێت. دوای کولبوون و سوان بەتەواوی لە پلەی مرۆڤایەتی دادەبەزێت. کابرای خاوەن مەبەستی شەخیس لەو مامڵەتەدا پەندەکەی «بەپێیان بگرن بێپێ هی خۆنە»ی بەکار هێناوە چونکە کە ئەو هۆش و ئیرادەی لە مرۆڤ وەرگرت ماڵەکەی و هەموو قابیلیەتەکەشی هی خۆیەتی، نەک ماڵ و قابیلیەت گیانەکەشی. ئنجا ئەو گەنجە ڕۆشنبیرەی لەوەدا دەحەسێتەوە کە فەرمانبەری بێڕەخنە و بێگرفتی لە خۆ گەورەتران بێت هەر ئەوەندە مەودای تۆڵەسەندنەوەی بۆ دەمێنێتەوە کە خۆی گەیشتە پایەی ڕابەرایەتی و دەسەڵات، گەنجی ئەوسا لە خشتە ببات و زەلیلی فکریان بکات و سواری زاتیان بێت.

هەرای نێوان «مرۆڤ» و «دەوروبەر» وەک دەبینێت زۆری بەبەرەوەیە. بەهەمەحاڵ قسەی من ئێستاکە لەگەڵ نەزەریەکە خۆیەتی، چونکە خاوەنە

مردوەکانی لەم ڕۆژگارەدا نایەن لەسەر بەرزایی حوکم و دەسەڵاتەوە شۆڕ ببنەوە بۆ بیستنی قسەی ئەوتۆ کە ئەگەر گوێگری هەبێت. هاوبەشیان لەو دەسەڵاتەدا زۆر دەکات و زوربەی فەرمانبەرکانیشیان لێ بەدەنگ دەهێنێت. جا کە حاڵ وەها بێت ڕێم هەیە بڵێم ناشێ ترسی «دوانەتی» وەها لە نەزەرەیەی ماتیریالیزم بکات کە لە دانهێنان بە دەوری پێشڕۆ و بێهاوتای مرۆڤ لە گۆڕانی کۆمەڵایەتی و مێژوویی و ڕووداواندا سڵ بکاتەوە. فەلسەفەی ماددی (ماتیریالیست) لەگەڵ فەلسەفەی وەک خۆیدا باوەڕ بەوە دەکات کە وا ماددەی مردوو لە کۆتایی کار کردن و کارتێکرانی ملیارەها ملیارەها ساڵدا بە پێی داخوازی ئەو خاسیەتانە و ئەو هێزە سروشتییانەی تێیدان گەییشت بە چۆنیەتییەک کە شیا هێزی ژیان «زیندوەتی»ی تێبگەڕێت و ببێت بە ماددەی زیندەڵ. ئینجا بۆ ماوەی هەزاران ملیۆن ساڵ ئەو ماددەی «گیان تێداگەڕاوە» بە پلەی گۆڕانی بایۆلۆجیدا سەرەژوور هات تاکوو گەییشت بە پایەی مرۆڤایەتی و هەرواش لە گۆڕانی بەرەوپێشدایە: ئاخۆ لەم گۆڕان و بەرەژوور و بەرەوپێشچوونەدا، کە هیچ هێزێکی نامادی تێکەڵ نەبووبێت کوا جێگە و ڕێگەی «دوانەتی»؟

دەمێنێتەوە چاری ئەو جوداوازییە یەکجار سەیر و سەرسووڕێنەری نێوان ماددەی مردوو و زیندوو و نێوان ماددەی زیندووی بێهۆش و بەهۆش بکرێ! چارەسەرکردنی ئەم جوداوازییە لە جغزی شی کردنەوەی ماددیدا بەوە ناکرێت پشت گوێ بخرێت وەیا لێی کەم بکرێتەوە وەیا بە «امر واقیع» وەربگیرێت وەیا لە سەری زمانەوە بکرێت بە سێبەری ماددە.

فکری ماددی بیەوێت و نەیەوێت زیندوەتی و هۆش و ئیرادە [من قسە کورت دەکەمەوە کە ئەم سێ وشەیە بەکار دەهێنم «زیندوەتی - هۆش - ئیرادە» ئەگەرنا گیانلەبەر و هۆشلەبەر موعجیزەی بێئەژماریان تێدایە] لە هەموو لێکدانەوەیێکدا هەر موعجیزە دەردەچن هەرگیزیش لە موعجیزە ناشۆرێن بەوەدا لە ڕێی فەندی ژیربێژانە و زیرەکانەوە بە بەرهەمێکی ماددی عادەتی وەک هێزی کارەبا و تیشکی جیهانی و دیاردەکانی کیمیایی و فیزیایی لەقەڵەم بدرێن وەیا بایەخی هۆشی مرۆڤ کەم بکرێتەوە. ئەو خاسیەتانەی لە ماددەی گیانلەبەر و هۆشلەبەردا هەن چ بدرێتەوە بە هێزی غەیبی و چ بدرێنەوە بە تێکەڵبوون و تێکرژانی ماددە و

هێزەکانی هەر دەمێننەوە وەک دیاردەی هەرە سەیر و نامەفهوومی ئەم جیهانە، هێندە هەیە ئەوانەی کە وا لەبەر کورتهێنانی تەفسیری ماددی دیاردەکە دەدەنە پاڵ دەسەڵات و زانینی بێسنوور و بێکۆتایی پەروەردگار هانا دەبەنە بەر هێزێک کە لە ئاست هیچ شتێک کورت ناهێنێت هەرچەند لەمەشدا بەلای بیر کردنەوەی ماددییەوە بە شێوەیەکی کۆڵدەرانە لە مەیدانێکی حەقیقی بۆ مەیدانێکی وەهمی هەڵاتوون[8].

خولاسەی قسان؛ فەیلەسووفی ماددی هەرچەند لە پایەی ماددە بەرز بکاتەوە و لە بایەخی زیاد بکات، رووبەڕووبوونی موعجیزەی گیانلەبەر و هۆشلەبەری بەملەوە دەبێت و خۆ لێ دزینەوەی مومکین نییە. شتێکی کە یەکجار لە ناڕاحەتی هەڵوەستی فەیلەسووفی ماددی زیاد دەکات ئەوەی کە لەم رۆژگارانەی زاناکان چاوەدێریی بوونەوەر دەکەن بەو ئامێرە وردبینانەی سەرەتاتکە لە مێکرۆب و لە زەڕڕەش دەکەن ببڕای ببڕای نەدیترا یەک زەڕڕەی مردوو گیانی بەبەرابێت و ببێتە زیندەڵ. ئەمەش ڕاستییکە لاهوتییەکان پێی دەنگدلێرتر دەبن چونکە دەڵێن ئەگەر ڕاستە ماددە لە خۆوە بوو بە زیندوو دەبوو لەم ڕۆژگارەشدا ئەم گیانتێکەرانە ڕوو بدات بە تایبەتی کە دەزانین زانستی ئەم سەردەمە چەند دەسەڵاتدارە لە پێکهێنانی هەر هەلومەرجێکی پێویست بێ بۆ گیان بەبەرهێنانی ماددە.

---

[8]- خواپەرستەکانیش توهمەی کۆڵدان و ترسان و هەڵاتن دەدەنە پاڵ فەیلەسووفە ماددییەکان لەوەدا کە زۆر خێرا و بێ ئەوەی بتوانن تەفسیری گەلێک دیاردە لە ڕێی ماددەوە بکەن چاوی خۆیان لە ڕاستییان دەنووسێنن و لەبەر سێبەری زۆر خەست و تیری تەفسیری ماددی بێ ئەرک سەرپۆشێکی درۆزنی حەسانەوەی فکری بە خۆیاندا دەدەن و پشت لە خوا لێی دەنوون. فەیلەسووفە ماددییەکان لە شی کردنەوەی هەموو شتان، بە تایبەتی ئەو شتانەی سەربە ئادەمیزادن، ڕازی نابن هیچ ڕوودانێک و گۆڕانێک بێ هۆی ئاشکرا بسەلمێنن بەڵام ڕازین بەوەی مرۆڤەکە کە سەرچاوەی کۆمەڵایەتییە و میلۆنەها لایەنی سەرسووڕێنی تێدایە کە هەر یەکەیان هەزاران جار لە ڕوودانی شۆڕشی فرەنسە پتر پێویستی بە هۆ و هاندەر و تەدبیر و زیرەکی هەیە، ڕازین مرۆڤەکە لە ئاکامی بێ تەدبیرییەوە پەیدا بووبێت. ئەو فەیلەسووفانە بەر لەوەی بگەنە دۆزینەوەی هۆی ئەوتۆ لە خوامان بێ نیاز بکات واز لە خوا دەهێنن، کە ئەمەش هەڵاتنێکی زۆر ترسنۆکانەیە بەلای خواپەرستانەوە.

زانست «عنصر» ی وەهای دروست کرد کە لە سروشتدا پەیدا نەبووبوو ئیتر بۆچی زانست و سروشت بەیەکەوە نەتوانن تاکە یەک زەڕڕەی بێگیان بکەن بە گیاندار؟ کە ئەم گیانبەبەرهێنانە بە یاریدەی زانستی نوێش مومکین نەبێت چۆن دەچێتە عەقڵەوە بە ڕێکەوتی کوێرانە لەخۆوە ماددەی کەڕولاڵ و ساردوسڕ لە هێکرا ڕوحی بەبەر هاتبێت؟ هەڵبەت لێرەدا من مەبەستم ئەوە نییە مولحیدان بکەمە ئیماندار چونکە نە من پەکم لەسەر لایەن کەوتوە و نە مولحیدیش بە قسەی من بادەداتەوە سەرئیمان، جیهانیش هیچ بارێکی ناگۆڕێ ئەگەر کاک باپیر وەیا مام ئۆمەر خوای پەرست یاخود شتێکی دیکەی کرد. من لێرەدا لەگەڵ «خیام» دەڵێمەوە:

ان کس که جهان ساخت فراغت دارد
از سبلت چون توی و ریش چو منی

من تەنها ئەوەم مەبەستە، لە خوێنەری کوردی ڕوون بکەمەوە، بە پێی بۆچوونی خۆم، کە ئەم موعجیزەیەی زیندوەتی و لکەکانی بە هەڵاتن لە ترسی «دوانەتی» ناپووچێتەوە و ناڕەوێتەوە، فەیلەسووفی ماددیش کە هات و لە پێشەوە، بە خەیاڵی خۆی، لە ڕێی ئینکار کردنی هەبوونی کردگار و هێزی غەیبی و ناماددییەوە هەموو بوونەوەری گێڕایەوە بۆ تاکە ماکی «مادده» پێی ناوێ لە نوێوە ترسێکی ئەبەدی «دوانەتی» بەدوا خۆی و نەزەرەیەکەیدا بگێڕێت و هەمیشە خەریکی شەڕکردن بێت دژی شەبەنگی ئەو مێردەزمەیە.

مرۆڤی ماددی کە هێندە خۆی ئازا کرد بتوانێ بێ تێخوێندنەوەی هیچ فکرەیێکی بوونی «خوا» دڵی خۆی تەسکین بکات بە توانا و لێهاتوویی ماددەی ڕووت و مردوو بۆ گێڕانی کار و بازاڕی ئەم جیهانە بەو هەموو دیاردە بێئەژمارە سەرسووڕێنە پڕ حەپەسانەوە با ئەوەندەش ئازا بێ کە جارێکی دیکە خەیاڵ لە پەیدابوونی «دوانەتی» نەکاتەوە: فەیلەسووفی ماددی لە خەیاڵی خۆیدا «خوا»ی کوشتوە و لە حیسابانی دەرهاویشتوە، ئیتر چ پێویست هەیە ترسی زاڵبوونی «فکر» بەسەر ماددەدا لە نوێوە «فەرخەخوا»یێکی بۆ قوت بکاتەوە، ئنجا

خوتخوتەی «دوانەتی» و شەبەنگی «غەیب» گێژی بکات و بە گژ ڕابەرایەتی و کاریگەرایەتی و پێشەوایەتی و یەکەمینایەتی و ئاغایەتی و مرۆڤی خاوەن «فکر»یدا بهێنێت! لەم هەرایەشدا ئەوەی تێدەچێت مافی مرۆڤەکەیە نەک شەبەنگ و مێردەزمەی غەیب چونکە لێکدانەوەی ئەو غەیبناسە کە لە سەرەتاوە ڕازی نەبوو بە تێبردنی دەوری هێزی «غەیب» هەر ڕازی نابێ بە پووچاندنەوەی دەوری خالقیەتی «هۆش» و «زیندوەتی» لەتەک ماددەدا، بەڵکوو لەم هەوڵە بێلزومەدا بابای «غەیبناس» بەڵگەیێکی تازەی بەدەست دەکەوێ بۆ نائەمینی کابرای ماددی لە لێکدانەوەکانیدا، چونکە زیندوەتی و هۆش شتی بەرچاون و لە خانەی گومان لێکردنی «غەیب» نین، کەواتە جێی خۆیەتی خەریکبوونی فەیلەسووفی ماددی بە دالەنگاندنی پایەی ئەو هێزە بەرچاوە و یەکجار سەرسووڕێنە ببێتە هۆی گومان کردن لە نیاز و مەبەستی فەیلەسووفەکە نەک هەر بەرابنەر هێزی زیندوەتی [و لکەکانی] بەڵکوو بەرانبەر سەرانسەری «غەیب» چونکە دیارە یەخەگرتنی شتی بەرچاو بێگومان یەکسەر گومان پەیدا دەکات لە یەخەگرتنی ئەو شتانەی بەرچاو و بەرهەستیش نین وەک ئەوەی کە یەکێک بیەوێ لە حیسابی پارەی نەقد چاوبەستەکێ بکات دیارە چاوەنوڕی فێڵی گەورەتری لێ دەکرێ لەو قەرزانەی کە دەفتەریشیان بۆ نەگیراوە.

هەر لەم بابەتەی پتر سووربوون لەسەر یەخەگرتنی ناحەزانە و نەسەلمێنانەی شتی نابەرچاو ئەوە بوو کە بەر لە 40-50 ساڵ ئەوانەی گومانیان دەخستە ڕاستی و دروستی و ڕەوایی داهێنراوی وەک فۆتۆگراف و گەڕۆک و فۆنۆگراف کە هەموویان بەقەدەر بەرد و دار ڕەق و زەق و بەپێز بوون، زۆر بە ئاسانی و بە بێزوقێزەوە ئینکاری خرایەتی زەوی و سووڕانەوە بە دەوری ڕۆژدا و هێزی کێشەریان دەکرد چونکە ئەمانە لە ڕێی لێکدانەوە و زانست و تاقی کردنەوەوە بە ئیسپات دەگەن. ئیسپاتەکەش وەک ترێ و هەنجیر بەرهەست و بەردەست نییە نەسەلماندن هەڵنەگرێ خۆ مەعلوومیشە ئینکار کردنەکە زەرەری لە مام نەسەلمێنەکە نەدەدا بەڵکوو لەوانە بوو کوڕێنیشی پێوە بکات بەنامەی ئەوەوە کە گۆیا دژی کافران لەسەر توانای خوا دەکاتەوە.

بەڕاستی کە بە وردی لە مەسەلەکە ورد بیتەوە دەبینیت ئەو فەیلەسووفەی خەریکە لە بایەخ وەیا لە خاسیەتە سەرسووڕێنەکانی زیندوەتی و هۆش دادەلەنگێنێت، بە هەموو هێز و توانای لەسەر ماددە دەکاتەوە هەر دەڵێی بەقەدەر پەرۆشی غەیبپەرست بۆ وەحدانەتی خوا، ئەویش بۆ بوتی خۆی بەپەرۆشە. ئا لێرەشدا دیمەنێکی زۆر سەیر و نابەجێش دێتە بەر نیگای سەرنجدەرەوە: فەیلەسووفی ماددی لێ دەوەستێتەوە تا زانای فیزیا و کیمیا و نەفس و ئاسمان و... هتاد ڕاستییان دەدۆزنەوە ئیتر دەستیان بەسەردا دەگرێت و دەیانکات بە خزمەتکاری فەلسەفەکەی، هەر ڕێش نادات بە زاناکە خۆی بیروڕای فەلسەفی لەو زانستانە و دۆزراوانە هەڵێنجێت، خۆ ئەگەر بۆچوونێکی دژی بۆچوونەکانی فەیلەسووفە ماددییەکەی دەربڕی بەجارێک لە پلەی فەلسەفە و زانست دەهێنرێتە خوارەوە و دەکرێتە خزمەتکاری بیری بۆرجوازیەتی[9] و غەیب و ئەفسانە، لەمەشدا هیچ کەلێن و دەرفەت ناهێڵێتەوە بۆ ئیحتیمالی ڕاستبوون و خزمەتکارنەبوونی بۆچوونەکە و ئەوەندەی لێ بە کافی دەگرێ کە دژی بۆچوونی خۆی ڕاوەستاوە [خۆی دواکار و خۆشی حاکم].

لێرەدا دەبێ شتێکی یەکجار گرنگ بدەمە بەر زیهن و چاوی خوێنەر، گرنگیەکەش لەوەدا نییە کە بە نووسین و باس لێوەکردنی ئەو گرفتانەی تێیدا دەژینەوە چارەسەر دەکرێن، بەڵکوو لە گۆشەنیگای فکری ڕووتەوە نمایشتێکی دەکەم، وەک تا ئێستا نمایشتی هەر شتێکی دیکەم کردوە هیچ بە تەماش نیم گەنجی کوردی سەربە ماددییەت وەیا مام ناوەنجی وەیا غەیبپەرست دڵ و دەروونی خۆی بۆ

---

[9]- زۆرینەی نووسەرانی ماددی بێ لێوردبوونەوە ئەم عنوانەی «فکری بۆرجوازی» بەسەر زوربە و زۆرینەی نووسەر و بیرکەرەوەی وڵاتی بۆرجوازیدا دەبڕن. ئەمەش هەڵەیەکی زۆر گەورەیە چونکە ئەوەی پێی دەڵێن فکری بۆرجوزای هەر لە ئیمانەوە تا ئیلحاد و لە سەرمایەداری تا سنووری کۆمیونیزم دەگرێتەوە، واش دەزانم ئەو بەسەردابڕینە هەندێکی خۆ بەسەهوو بردن تێدایە چونکە لێکدانەوەی فەلسەفی وەک دوکانی بەقاڵ نییە کە هەر دەبێ پێوەندی بە سەرمایە و بۆرجوازیەتییەوە هەبێت.

قسەکانی من بگۆڕێت. بەهەمەحاڵ چ هێزێکی پەکخەر لە پێش نووسینەکەی منەوە نییە خەڵق ناچار بکات بەدوای بکەوێت، بە پێچەوانە، ئەگەر چ هێزی لە پشتەوە هەبێ دوشمنانەیە، وەک کە مەعلوومە زۆربەی نووسینی تا ئێستا بەدوامدا هاتبێت دوشمنانە بوە.

من دەمەوێ بە خوێنەری ئەم نووسینە بگەیەنم، بەشێکی هەرا و ناکۆکیی نێوان باوەڕی سەربە غەیب و باوەڕی سەربە ماددە دەگەڕێتەوە بۆ نەگونجانیان لەگەڵ یەکتردا، نەختێکی دیکەشی داخوازی و فەرمانی باوەڕەکانە بەوەدا کە داوا لە پێڕەویکەرەکانیان دەکەن غەیری خۆیان ناچار بکەن بە وازهێنان لە باوەڕەکانیان، بەڵام بەشێکی بەرچاوی هەرا و ناکۆکیەکە هی مەیل و ئارەزۆی «زات»ی ئەوانەیە کە وا لە پەنا نەرمەفەرمانی باوەڕەکانیان بە نانەوەی ناکۆکی، ئاگر و جۆشی حەز و شەهوەتی خۆیان بۆ تۆقاندن و کەنەفت کردن و زەلیلگیری دەخەنە ناوک و ناوەرۆکی باوەڕەکانیانەوە بۆ ئەوەی لەبەر مەشخەڵی ئەو ئاگرە زاتییەدا خەنجەروەشێنی و خوێنڕێژی و وێرانکاری بنێتەوە.

رووپەڕەکانی مێژوو هەڵدەوە و دێڕە خوێناویەکانی هەرای نێوان باوەڕان بخوێنەوە دەبینیت شەبەنگی چەند جانەوەرێک لەو دێرانەدا خەریکن دەبڕن و دەدڕن و دەکوژن و دەسووتێنن، مەیلی نوستووی دڵکرمێیانیش بۆ دڕندەیی دەورووژێنن، هەناسەش لە مرۆڤی دڵخاوێن و هێمنیخواز دەبڕن. هەمان دیمەنی نێوان دەفتەری مێژوو لە رووپەڕەی رووداوەکانی ئەم رۆژگارەش دێنەوە بەر نیگای سەرنجدەر: لە هەموو هەنگاوێکی زێدە پێویستی یەکیەتی و برایەتیی نێوان گەل لەمپەرێکی تیژڕۆیی و چەپڕۆیی و گومان لە خەڵق کردن و غەیر تاوانبار کردن قوت دەبێتەوە و ڕەتێک بە هەنگاوەکە دەبات و هەنگاو هەڵێنەکە سەرەوبن دەکات، خۆ ئەگەر بەشێکی ئەو گومان و تاوانەش ڕاست بێ، پێویستە سوودی گشتی و بەرتەرەف کردنی خەتەری دەرەکی چاوپۆشی لەو هێندە گومان و تاوانە بکات کەچی، بەپێچەوانە، بڵقی نەفس و زاتی گومانکار و ئارەزۆی پەکخستنی غەیر وا دەکات لە هیچە گومان و تاوان وەک پرووشکەبارانی سەر قەپووچکە لە سەرانسەری وڵات پفکە بکات.

هەر لە بیرمانە، بەرەی نیشتمانیی یەکگرتووی عیراق چۆن لە ماوەیێکی یەکجار کورتدا دوای سەرکەوتنی شۆڕشی تەمووز پەرتوبڵاو بوو، بڵاوبوونەوەشی لەوەوە بوو کە یەکێک لە لایەنەکانی پێکهێنەری بەرە نیشتمانییەکە هەندێک لە لایەنەکانی دیکە پتر دەسەڵاتی پەیدا کرد، ئیتر مەیلی خۆ سەپاندن وای لێ کرد هیچ کەسێک و هیچ تاقمێک و هیچ کۆمەڵێک نەپارێزێ تا حاڵ گەییشتە جێگەیەک دەتگوت بەرەی نیشتمانی وەختی خۆی لە چەند دزێک و یەک خاوەن ماڵ پێک هاتبوو ئەویش وا خەریکە بە جەزای خۆیانیان دەگەیەنێ... هەڵوەشانەوەی بەرەی نیشتمانی بەڵگەی جوداوازیی زات و دەروونە پتر لەوەی جوداوازیی بەرژەوەند و سوود بێت، واتە بەرهەمی زاتە نەک بابەت و مەوزووع چونکە ناشێ ئەو حیزبانەی بە پێی لێکدانەوەی ماددی بەر لە دوو مانگ وەتەنی بوون ئێستا هەر بە پێی لێکدانەوەی ماددی ڕەوای لەناوبردن بن. جا ئەگەر لە مێژوودا نموونەی دیکەی وەک ئەمەیانت دیت بزانە ئەویش هەر لە ڕێی زاتکوێرییەوە بەهانەی بە غەیر گرتوە، لێرەدا نزیکترین نموونەی بەراورد کردن کارەساتەکەی شۆڕشی فرەنسەیە، ئەویش زات و دەروونی شۆڕشگێرەکانی پتر لە جوداوازیی بەرژەوەند وای کرد لە ئەنجامدا مەلیکێکی بێدەسەڵات بگۆڕێتەوە بە ناپلیۆنێکی نیوەدێو [ئێمە لە بەشی دوەمی ئەم نووسینەدا دەگەینەوە بە شۆڕشی فرەنسە].

هەموو ئەو لێک جودابوونەوانە و براکوژییانەی لە بزووتنەوەی قەومایەتی کوردیشدا ڕوویان دا، ئەوانیش چ پێوەندییان بە مەوزووعیەت و بەرژەوەند و سوودی کوردەوە نەبوو، بەپێچەوانە، دژی کوردایەتی و ئامانجەکانی بوون، جا ئەگەر نەختێکیش جوداوازیی ڕەوا و ئاسایی و چاوەڕوانکراویان تێدا بووبێت بەشی هەرە زۆریان دەگەڕێنەوە بۆ بڕیاری ئەو «زات»انەی سەرپەشتی کارەساتەکانیان دەکرد ئەگەرنا بەرژەوەندی کوردایەتی ئەوە هەڵناگرێ لە حاڵوباری ئەم ڕۆژگارەیدا ڕۆڵە سەربازەکانی یەخەگیری یەکتر بین و بە چەکی بێگانە یەکتر بکوژن.کە دەڵێم «لە حاڵوباری ئەم ڕۆژگارەیدا» دەمەوێ ڕەخنەی ڕەخنەگر بێدەنگ بکەم دەنا بەلای باوەڕی منەوە ڕەوا نییە هەرگیز لە مەیدانی کۆمەڵایەتی و خەباتی بەرەوپێشچووندا خوێن لە لووتی کەس بێت. ئەوانەی دەیانەوێ بە بەهانەی لێکدانەوە و شی کردنەوەی فەلسەفی خەڵق ئیقناع بکەن بە پێویستبوون و

ڕەوابوونی کوشتن و بڕینی ناوخۆیی خەباتگێڕان کەسانێکن ژەهری عەزیای نەفس و زاتی خۆیان دەڕژێننە ناو دەقی فەلسەفەکان وەیا هەر نەبێ بە جۆرێکیان واتا لێ دەدەنەوە کە پۆرگی ئەوتۆیان تێدا ساز بدرێت جێی ژەهری هەناوی ئەوانی تێدا ببێتەوە. گومانت نەبێ لەوەدا کەوا بەشێکی یەکجار گەورەی هەرا و ناکۆکی و دووبەرەکی و بەشەڕهاتن و ماڵوێرانیی تێکڕای ئادەمیزاد لە جوداوازیی ئارەزۆی نەفس و جۆری تێگەییشتن و بیروڕا و دژایەتی مەزهەب و ئایین ئەو تەرزە شتە «زاتی» یانە بوە کە هیچیان پێوەندییان بە بەرژەوەندی ڕاستەقینە و بێفێڵەوە نەبوە. ئنجا لە نێوا ئەو هۆیە زاتییانەدا دەوری زێدە گرنگی ئەو زاتە دڕندانە دەست پێدەکات کە ئەگەر زوربەی خەڵقیش لە هەرایاندا بەرەو هێمنایی ببنەوە ئەوان جارێ بورکانی پڕ کڵپەی دەروونیان دانەمرکاوەتەوە.

دەتوانم بڵێم ئەگەر لە جێگەی ئەوانەی بە درێژایی مێژوو هەرای وێرانکەریان ناوەتەوە، وەیاخود لە جێگەی هەموو ئادەمیزاد کە ناکۆکی و هەرا و شەڕ و کوشت و بڕینیان کردوە و لێیان کوژراوە، مەکینەی هۆشی ئەلیکترۆنی بڕیاری مەوزووعی و دوور لە عاتیفەی دابایە لە صەدی نەوەد و پێنجی ئەو کارەساتانە ڕوویان نەدەدا چونکە هۆشی ئەلیکترۆنی ئەگەر لێی داوا بکرێ بەدوا بەرژەوەندیدا بگەڕێ ئارەزۆی خۆی وەیا ترسنۆکیی خۆی وەیا نەزانیی وەیا... وەیا... هیچ شتێکی خۆی تێکەڵ بە بڕیاران ناکات، ئەوساش هەر دەمایەوە صەدی پێنجی حاڵەتی ئەو تۆ جۆرە بەرژەوەندی تێدا بێت کە بە هەرا و ناکۆکی و دووبەرەکی نەبێ پێک نەیەت وەیا زیاد نەکات وەیا نەپارێزرێت.

تۆ هەرگیز خۆشباوەڕی ئەو قسەلووسانە مەبە کە بە بەهارات و خوێ و سماقی زمانە پاراوەکەیان لە گەرمەی شایی و کەیف و دەهۆڵکوتاندا هەزار سەبەبی ڕێکوپێکی بەگژیەکتردا چوونت بۆ دەسازێنن. هەزاران لەو زاڵمانەی کۆتاییان بە تێداچوون و لەناوچوون هاتوە ئەگەر زەکاتێکی ئارەزۆیە نارەواکانیان بە قوربانی سەلامەتیی خۆیان کردبایە بە ئاسوودەیی دەمردن، دیاریشە خۆ لەناوبردن لە پێناو زەکاتی سوودی گەورە و بەردەوام چ مەوزووعیەت و بەرژەوەندخوازی ڕاستی تێدا نییە و بریتییە لە گومڕابوون و کوێربوونی زات. لەمەش پتر مەودای قسەمان ماوە بەوەدا کە بڵێین ئەگەر ئەو تەماعکارانە زاتە کوێرەکانیان بوون بە هۆی

فۆتانیان، ملیۆنەها زوڵملێکراویش لەبەر نەفسە سست و کول و ترسنۆکەکەیان بە مەزلوومی مانەوە: دەبینی ئەو بابایەی لە ئاست دەستدرێژیی ئاغایێک دەحەپەسێ و جورئەتی بزووتنەوەی پێ نامێنێ زۆر بێباکانە و پاڵەوانانە لەگەڵ رووتەیێکی وەک خۆی لەسەر کەوڵەگیسکێک کە نیو دینار ناهێنێت بەشەڕ دێت و لەوانەیە بیشی کوژێت و خۆشی تێدا بچێت.

ئەم ترسنۆکییە بێسنوورە و ئەم جورئەتە بێسنوورە هیچیان فەرمانی مەوزووعیەت و بەژەوەند نین بەڵکوو زادەی زاتی کوێرن ئیتر حەز دەکا با جنۆکە کوێری کردبێ وەیا لە سەرەتای ڕسکانییەوە کوێر بووبێت. زۆر جاران لەگەڵ خۆمدا دەڵێمەوە ئەگەر مەڕگەل بە بڕیاری سروشت تەسلیمی گورگ نەبێت، کاتێک گورگەکە تێی دەکەوێت و بەردەبێتە خنکاندنی، مەڕگەلەکە لە توانایدا هەیە دەوری بدات و بە قۆچ و بە پاڵەپەستۆ و بە هەر جۆرێک بێت فەراقی ڕەشی لێ ببڕێت بەڵام نەبوونی ورەی لەسەر خۆکردنەوە قەڵەمی دەستوپێی هەموو مەڕگەلەکە دەشکێنێت، کەچی چونکە مەڕ لە ئاست مرۆڤدا ئەو هووروەبەرداوە نییە شەکەنێر و بەرانی خورت هەیە شەڕی کوشندە لەگەڵ مرۆڤ دەکات، ڕەنگە وەهاش بووبێت مرۆڤی کوشتبێت.

من بۆ خۆم بەو چاوانەم دیتوە، ترس وای لە خەڵقی شارێک کردوە وەک مەڕگەل بێدەسەڵاتی کردوون و هیچ گیانێکی لەسەرخۆ کردنەوەی پێ نەهێشتون. مێژوو باسی جەماتێکی کاروانی سەردەمی دڕندەیی مەغۆلەکان دەکات کە چۆن یەک تاکە مەغۆلی تووشی کاروانەکە دێت و لێیان داوا دەکات لە شوێنی خۆیان بوەستن تا تیغێک پەیدا دەکات بۆ ئەوەی سەریان ببڕێت ئەوانیش هەموویان دەستەپاچە بۆی ڕادەوەستن، بەڵام یەکێکیان بە خۆی دەڵێ خۆ ئێمە هەر کوژراوین با من پێشدەستی بکەم ئیتر گاشەبەردێک لە کابرای مەغۆل دەدات و دەیکوژێت.

لێرەدا زۆر چاک دیارە چۆن ورەبەردان مرۆڤ دەکات بە بەرد و دار. بووژانەوەی نەفسیش چۆن سەرلەبەری واقیع دەگۆڕێ. ئەم حیکایەتەی مێژوو ئەگەر ڕاستیش نەبێ هی وەک ئەو لە کات و شوێنی دیکەدا ڕووی داوە. جا ئەگەر خوێنەر لێم بپرسێت و بڵێت ئەم ڕووداوە وردیلە و کەمتەنسیرانە کەی دەشێ لێکدانەوەی فەلسەفییان لەسەر هەڵستێت و چۆن دەشێ دەلالەتی دیاردەی «کۆمەڵایەتی-

ئابووری»ی وەک خەباتی چینایەتی و ڕووداوی گەورەی جیهانی لە بیران ببەنەوە، لە وەرامدا دەڵێم هەتا نموونەی گەورەتر بهێنینەوە دەوری زاتی مرۆڤیان باشتر پێ ڕوون دەبێتەوە بەتایبەتی لەو ڕۆژگارانەدا کە جارێ ڕێکخراوی سیاسی و دامودەزگای پڕۆپاگەندە و ڕۆژنامە و ئاجانسی خەبەران پەیدا نەبووبوون کە بڕیاری حکومەتێک وەیا کۆمەڵێک لەسەر هەموو میللەت حیساب بکرێت و بگوترێ ئەوەی دەکرا بە دڵخوازی جەماهیر بوە. لەبەر ئەمە ئەگەر بادەینەوە سەر مێژوو دەبینین لەو سەردەمە کۆنانەدا جارێ گەلان لە کرانەوەی زیهن و دەروون و زاتدا نەگەییشتبوونە پلەی تێگەییشتنی هاوچوونی سوود و بەرژەوەندی «چین»، لەوەش بە ئاگا نەهاتبوون کە وا ڕەنگە مومکین بێت خەباتێکی تێکڕایی «چین» بتوانێ دەستی زۆردار و چەوسێنەرەوەیان لێ کۆتا بکات، بگرە جارێ هەر لێیان ڕوون نەبوو ئایا ئەوەی لەم ڕۆژگارەدا پێی دەڵێن «چەوساندنەوە» چەندی ستەمە و چەندی ڕەوایە.

لەو سەردەمانەدا ژن و منداڵ بە بارمتە دانان لای خاوەن قەرز یاسا و نەریتێکی سەلمێندراو بوو، مرۆڤی دراوخریدەش زۆر بوون کەسیش لەوەدا خراپەی کارەکە و لۆمە کردنی نەدەبردەوە سەر خاوەن پارە و دەسەڵاتان هەرچەند نووسەری وەک من و تۆ دوای تێپەڕینی هەزاران ساڵ بەسەر ئەو مێژوەدا دێین و درۆ بۆ خەڵقە چەوسێندراوەکە هەڵدەبەستین و بە نارازییان نیشان دەدەین و ناوناوە لەگەڵ دەسەڵاتدارانیشیان بەشەڕ دەهێنین. مەبەسیشم لە نارازیبوون «نەسەلماندن و لێ بەدەنگ هاتن»ە نەک پێنخۆشنەبوون چونکە دیارە شتێک کە خۆش نەبێت هەستی پێ خۆشبوون دروست ناکات وەک یەکێک ماری پێوە بدات وەیا پارەی لێ بزر بێت وەیا گیسک و کاوڕی بمرێت لێی چاوەڕوان ناکرێ هەڵپەڕکێ بکات بەڵام یەخەی کەسیش ناگرێت.

ئەو حاڵوبارە نالەبارانەش کە بۆ ماوەی هەزاران ساڵ زوربەی مرۆڤی ناڕاحەت کردوە و خۆشیی لێ هەڵگرتوون هەر هێندەی کار تێکردوون کە هەستی تەبیعییان پێی ناخۆش بوە، وەک تامی گوژاڵ و ئێشی برین، لەوە بەلاوە بۆ هیچ بزووتنەوەیێک و نارەزامەندییکی تێکڕایی نەبردوون. ئەو کەسەی ئێشی گەیشتوەتێ بە پێی هەست و پێزانین و پلەی پێناخۆشبوون و دەسەڵاتی لەسەرخۆکردنەوەی

پەلەکوتکەی کردوە بەڵام خەڵقی دیکە بە ناوی «چین» وەیا گەل لەسەریان نەکردۆتەوە. لە خۆی و خزم و کەسی خۆی بەولاوە «بێگانە» جانفیدایی بۆ نەکردوە. تەنانەت خۆیشی چ نارەزایی دەرنەبریوە لە ناخۆشی و تەنگ و چەڵەمەیێکی کە بە کێش و تەرازووی «کۆمەڵایەتی»ی ئەو سەردەمانە رەوا دیتراوە هەوڵێ تێکراییش لەو رۆژگارانەدا نەدراوە بۆ گۆرینی یاسا و نەریت و داب و دەستووری زەحمەت بەخش. جا ئەگەر پاشایێکی دەسەڵاتدار لە خۆوە گۆرینی تێدا کردبن ناشێ خواهشتەکەی ئەو بۆ گەل حیساب بکەین وەیا بە درێژبوونەوەی کات و گۆرانی لەسەرەخۆی خۆرسک گۆران پەیدا بووبێت، وەک کە پایز لە خۆوە دەبێتە زستان، ئەویش نە بە چاک نە بە خراپ بۆ خواز و خواهشتی گەل نابردرێتەوە، نارەزایی تاکیش لە زوڵمێکی کە رووی لە خۆی کردوە ناوی «نارەزایی تێکرایی» هەڵناگرێت، تەنانەت ئەگەر هەموو تاکێکی گەل لە یەک کاتدا هەر یەکەیان بۆ حیسابی خۆی بەرهەڵستی زوڵمێک بکات کە لە خۆی دەکرێت هەر نابێتە هۆی ناولێنانی «نارەزایی تێکرایی» چونکە هەر یەک لەو تاکانە کاتێک زوڵمە تایبەتیەکەی خۆی لەسەر هەڵستا بێدەنگ دەبێت و پەکی لەسەر خەڵقی دیکە ناکەوێت و پەندی «ئاگرە سوورە لە خۆم دوورە» بەکار دەهێنێت.

خولاسە ئەوەی پێی دەڵێن «خەباتی چینایەتی» و نارەزامەندیی گشتی لەو سەردەمە کۆنانەدا پەیدا نەبووبوون و وەک لەمەوپێش گوتوومە دیاردەی «پەلەی ژیان» خەڵقی بزواندوە، زۆر بە درەنگەوە ئەو پەلەی ژیانە شێوەی بزووتنەوەی گشتی و خەباتی چینایەتی وەرگرت. لەگەڵ ئەم راستییەشدا کە بەشی هەرە زۆری درێژایی مێژووی گرتۆتەوە ناوناوییێکی زێدە زێدە نادر وەها بوە لە هەڵکەوت و بارێکدا گەل هەڵستاوە و لە زوڵمی زۆر بێ سامان و ئامان بەدەنگ هاتوە لە شێوەیێکدا کە پێی بگوترێ بزووتنەوەی گشتی بەڵام لەم حاڵەتانەشدا بزووتنەوەکە چەند تێبینی یەکجار گرنگ هەڵدەگرێت:

- یەکەم: بەشی هەرە زۆری ئەم بزووتنەوانەی جەماهیریەتی تێدا بەدی کراوە لە چارچێوەی بانگەوازی سەربە ئایین بوە و داد و چاکەی لە گۆشەی ئایینەوە رەچاو کردوە.

- دوەم: بزووتنەوە گشتییەکە شوێن تاکێکی بەرچاو و بەزیپک و ئازا و زۆرزان کەوتوە، لەوانە بوە ئەگەر ئەو تاکە نەبوایە بزووتنەوەی وەخرابایە وەیا هەر لە بنەڕەتدا نەبووبایە مەگەر تاکێکی دیکەی ئازا و بەزیپک هاتبێت و کەلێنی سەرۆکایەتیەکەی پڕ کردبێتەوە، هەر جارەش کە تاکەکە لەناو چوە بزووتنەوەکە دامرکاوەتەوە.
- سێیەم: ئەو جموجووڵەی کە بەرەو بێحەیایی و ڕاو و ڕووت و وێران کردن و شیرازە هەڵوەشاندنەوە بوە ناشێ لەسەر لایەنی چاکەی بزووتنەوان حیساب بکرێت؛ بە نموونە، بزووتنەوەی «مزدەک» کە لەسەر مەبدەئی دابین کردنی ئارەزۆ و شەهوەت هەڵستا نە جێی شانازییە و نە بەرەپێش بوە و نە هیچی چاتری لە جێگەی ئەو ڕێژیمە دادەنا کە ئەگەر سەرکەوتبا دەیرماند.
- چوارەم: بەزۆری ئەو هەرایانە کە ڕوویان داوە دروشمی چینایەتییان تێدا بەرز نەبۆتەوە بەڵکوو هەراییکی گشتی هەرەمە بوە، بە ڕوونیش نەیزانیوە چی دەوێت، لە حاڵی سەرکەوتنیشدا هەر بە بەرزبوونەوە و گەییشتنە دەسەڵاتی یەکێک یاخود چەند کەسێک کۆتایی هەراکە هاتوە، ئەو دەستە و تاقمە نوێیەش لەبەر بێ ئیرادەیی و بێ ئامادەیی زوربەی گەل سەرلەنوێ بۆتەوە بە حوکمرانی ستەمکار و خەڵقەکەش کرنویان بۆ بردوە.
- پێنجەم: ڕووداوەکان هەرگیز بایی ئەوە ناکەن پێیان بگوترێ بزوێنەر وەیا پێکهێنەری مێژوو چونکە ژمارەیان ئەوەندە کەمە و جغزەکەشیان وەها بەرتەسکە بە ئاسانی لە نێو دەریا دەریای حاڵوباری بێ بزووتنەوەدا نادیار دەبن و ئەگەر لە کتێبان نەیانخوێنینەوە ئاستەواریان دەبڕێتەوە. ئێمە ئەگەر بسەلمێنین کە وا ڕوودانی تاکە بزووتنەوەی گشتی لە سێ صەد، چوار صەد ساڵاندا، ئەویش لە یەک جێگەدا نەک لە هەموو دنیا وەیا بەشێکی زۆری دنیادا، بەسە بۆ ئەوەی خەباتی چینایەتی وەیا یاخیگەری و نارەزایی گشتی بە ئیسپات بگەیەنێت دەبێ بشسەلمێنین کە وا کژی بارانبارین لە جێگەیێکی وەک بەغدادا فەسڵی هاوینە، چونکە لە ماوەی هەر پەنجا ساڵێکدا وا دەبێ جارێکیان بە هاوین باران لە بەغدا بباریت، بەو پێیە لە مێژووی

> کۆندا تاکوو جارێکیان بزووتنەوەی گشتی لە بەغدا رووی داوە ڕەنگە حەوت هەشت جاران هاوینەبارانی تێدا باریبێت.

لە نەزەریەی ماددیدا فێڵێکی فکری لەوەدا دەکرێت کە پەلەی ژیان و نارەزامەندی تاکیش بە خەباتی چینایەتی حیساب دەکرێ کە چی بەلای منەوە و بەلای ڕاستیشەوە ئەگەر هەموو رۆژێ هەموو تاکی عەمەلە و کرێکار لەسەر ئەو زوڵمەی کە لە خودی خۆی دەکرێ بەدەنگ بێت هەر ناشێ بگوترێ خەباتی چینایەتیی ئەو تاکانە دەبزوێنێت چونکە بەدەنگ هاتن لەسەر سوودی شەخسی لەوانەیە لە نێوان دوو عەمەلەش ڕوو بدات وەک ئەوەی کە یەکێکیان خاکەنازی ئەوی دیکەیان بشکێنێت وەیا گیسکی فەلاحێک بچێتە ناو دەغڵی فەلاحەکەی دراوسێی خۆیەوە، تەنانەت هەموو رۆژێ و هەموو جاران ئەو تاکە لەگەڵ ژن و منداڵی خۆیشی هەرا دەنێتەوە لەسەر کاری نابەجێ وەیا لە فەرمان دەرچوون وەیا شت شکاندن وەیا... وەیا خەباتی چینایەتی شەقڵ و دروشم و دەقی تایبەتی خۆی هەیە کە لە پێش هەموانەوە «هەوڵی ناوکۆیی» دێت ئنجا دیاری کردنی دوشمنی گشتی، لەوەش ناپرسمەوە ئایا ئامانجی گشتی تێدا هەبێت یا نەبێت چونکە لە مێژووی کۆندا باسی ئامانجی گشتی و دەرنەزەر کردنی دەسەڵات گرتنەدەست و گەیشتن بە حوکم و ئەو جۆرە ئامانجە ئەریستۆکراتانە وڕێنەی بەنگکێشانە.

ئەگەر ڕاست با جەماهیر لە هەزاران ساڵەوە خەریکی خەبات دەبوو، ئەگەر بۆ ماوەی هەزار ساڵیش هێندەی هۆش لەو خەباتەدا پێ پەیدا نەکرێ بەشی حوکمڕانی بکات خۆ لە شەش هەزار ساڵدا چ عوزری کەمتەجرەبەیی و ڕانەهاتن و کۆمە کردنی ئەو جەماهیرە بەدەست مفکری ماددییەوە نامێنێت بیکاتە بەهانەی بەردەوامبوونی ژێردەستیی میللەت و دەسەڵاتی کەمایەتیی ستەمکاران. بۆ دەبێ ئەو دەسەڵاتدارانە سەرەڕای کەمبوونی ژمارەیان و نارەوابوونی دەسەڵاتیان هەر لە زگی دایکیان بەربوونەوە بزانن چۆن ڕابەرایەتی و قوماندانەتی و لێخوڕی و ڕاپێچەکدان فێر بن نە مامۆستاشیان هەیە و نە لە غەیبەوەش دەست لە پشتیان دەدرێت، مەعلووم لە مەریخەوەش یاریدە و ڕێنموونییان بۆ بەدیاری نایەت. کەچی ئەو ستەملێکراوانەی میلۆنەها میلۆنەهای خەڵق پێک دەهێنن و بە مافی خۆیانەوەش خەریکن نەک بە ستەم بە هەزاران ساڵ نەتوانن فێری لەسەرخۆ کردنەوە بن لەوە

هەر بگەڕێ کە نەزانن ستەمکاران لەناو ببەن و حوکمێکی عادڵانە پێکەوە بنێن کە لە سایەیدا بحەسێنەوە. ئێمە لە زاراوەی «خەبات» بە تێکڕایی و «خەباتی چینایەتی» بە تایبەتی چاوەنۆڕی جموجوولێکی بەردەوام و هۆشیار و ئازا دەکەین نەک هەر جارە خەریک بین بە میکرۆسکۆپی وردورد دێڕەکانی دەفتەری مێژوو بخوێنینەوە بەڵکوو خواوڕاستان لە گۆشەیێکی نابەرچاوی شڕەلاپەڕەی پەڕپووت و سپی بوویەوەدا خەبەرێکی ناڕاحەتی و شێواوی دەدۆزینەوە و بە زۆرەملێ ناوی خەباتی لێ بنێین.

لە یەکەم سەرنجدا مرۆڤ بە بیریدا دێت کە ئەگەر خەباتی چینایەتی ئەو بەردەوام و بێوچانە بێت کە نەزەریەی ماددی باسی دەکات دەبوو لە هەموو وڵاتێکدا بە چەند ساڵان جارێک ئاژاوە و شێواویی گشتی بەرپا بێت ئیر یا سەرکەوێت یا خەفە بکرێت. بەڵام وا چاوەڕوان دەکرێت کە ئەگەر دە جارانیش خەفە کرابێت دەبێ جارێکیان سەرکەوتوو بێت هەروەها لە نێوان بیست وڵاتدا وڵاتێک خەباتەکەی بە ئامانجی گەیاندبێت. ئەمە بۆچوونی سەرنجی سەرەتاییە. بەڵام کە پتر لە مەسەلەکە ورد دەبیتەوە شتێکی دیکەت بە بیردا دێت ئەویش هەر لە ڕێی هەڵسەنگاندنی بیروباوەڕی ماددییەوە سەری ڕێ بە هۆشی مرۆڤ دەگرێت: ئەگەر ڕاست بێ گەلان لە توانای هۆش و گۆش و هەست و زانین و ورەیاندا بووبێت خەباتی تێکڕایی بۆ وەدەستهێنانی مافەکانیان بکەن دەبوو ئەو توانایە لە سەرەتای کارەوە ڕێ بە کەمایەتی زۆرداران نەدات سواری شانی زۆرینەی ئەو خاوەن هەست و هۆش و توانایانە ببن.

تاکە یەک تەعلیلی قەناعەتبەخش لەو نەزەریەدا نییە کە پێمان دەڵێ لە کۆنەوە، لە سەرەتای کۆمەڵایەتی و پەیدابوونی «چین»ەکانەوە زوربەی ستەملێکراوان خەریکی خەبات بوون بۆ ڕزگارکردنی خۆیان و لەناوبردنی ستەمکارەکان بەڵام پێمان ناڵێت بۆچی وەها ڕووی دا کە بەشێکی یەکجار کەم لە نێوان گەل توانییان سواری بەشی هەرە زۆری گەل ببن. ئایا سیحر و تەڵەسم وای کرد لەو کامانەدا هێزێکی لەعادەتبەدەر پەیدا بێت و زوربەی خەڵق بێدەسەڵات بکات، یاخود سیحرەکە میللەتی بێهێز کرد و خستنیە بەر دەسەڵات و هێرشی ئەو بەشە کەمەی سیحری لێ نەکرابوو! لە سەرەتای کاردا جارێ داموودەزگای حکومەت و پۆلیس و

عەسکەر و یاسا و مانگانە و پێوەندی هەمەچەشنەی نێوان کۆمەڵ پەیدا نەبووبوو تاکوو بسەلمێنین ئەو لایەنە و کۆمەڵەی کە دامودەزگاکە و سەرۆکایەتی هێزی چەکدار و ئێستگەی ڕادیۆی گرت دەبوو بە خاوەن دەسەلات و ڕابەر و[10] لێخوڕ و قەمچی وەشێن و چەوسێنەرەوە.

دەسەلاتی کەمایەتیی حوکمڕانی هەزاران ساڵ پێش ئیمڕۆ کە لە نەبوونەوە ڕسکا خۆی حکومەت و ڕابەرایەتی و سەرۆکایەتی پێک هێنا، واتە لە سەرەتاوە حوکمەکە و حکومەتەکە لە مرۆڤەکەوە سەری هەڵدا نەک مرۆڤەکە بە هۆی حکومەتی حازر و بزرەوە بوو بە خاوەن هێز و دەسەلات. ئەم قسە سەرەتاییەم کە بەر لە منیش خاوەن بیری ماددی دەربیبڕیوە پێویستی بە ڕوون کردنەوە هەیە، لێرەش بەدواوە هەوڵ دەدەم بە کورتی و بە پێی باوەڕی خۆم ڕوونی بکەمەوە، ڕوون کردنەوەکەش بەم شێوەیە دەبێت:

لە نووسینێکی لینین بە ناونیشانی *«حکومەت و شۆڕش - State and Revolution - الحكومة والثورة»* دەخوێنینەوە کە دەڵێ بە پەیدابوونی «چین»ـە جوداکان و داهاتنی چەوساندنەوە لە کۆمەڵدا چینەکەی سەرەوە بۆ بەردەوامبوونی چەوساندنەوەکە و پاراستنی دەسەلاتی خۆی حکومەتی دروست کرد و پۆلیس و عەسکەر و حەپسخانەی پێکەوەنان، ڕۆژێکیش کە مرۆڤ گەییشت بە پلەی بەسەرچوونی چەوساندنەوە ڕێژیمی حکومەت لە خۆوە دەپوێتەوە و دەڕەوێتەوە چونکە هۆی مانەوەی، کە چەوساندنەوەیە، لەناو دەچێت. ئەم ڕایەی لینین کە بایەخی بە تاکە عامیلی ئابووری داوە و هیچی تر، تەنها لەلای خۆیەوە وەرامی ئەو پرسیارە دەداتەوە کە دەڵێ چۆن حکومەت پەیدا بوو، بەلام لە وەرامەکەدا

---

[10]- لێرەدا ڕێم هەیە بڵێم لەو ڕۆژگارەشدا ناتوانم بە پێی ئەو تەرزە شی کردنەوەیە ڕاستبوونی خەباتی چینایەتی بسەلمێنم چونکە دەقی نەزەریەکە ناتوانێ تێم بگەیەنێ بۆچی لەم سەردەمە پڕ ڕووناکییەدا، چەوسێنەرەوەی کەم ئەژمار ملیۆنەهای چینی هەژار بۆ قازانجی خۆی بچەوسێنێتەوە کوتەکی دەستیشی پۆلیس ■ عەسکەر بێت کەچی وەک دەزانین زوربەشیان لەو هەژارانە بوونەتە هێزی چەکدار. یا دەبێ بڵێین خەباتەکە وەها نییە کە نەزەریە باسی دەکات یاخود دەبوو لە ترسی خەباتەکە پۆلیس ■ عەسکەر لە غەیری هەژار پێک بێت، یاخود دەبوو زۆر بە زوویی حوکمی کەمایەتیی سەرەوە لەناو بچێت.

پرسیارێکی دیکە هەڵدەستێت لە نەزەریەکەی لینیندا وەرامی نییە ئەویش ئەوەیە بۆچی بەشێکی کەمی میللەت لە سەرەتاوە توانییان بەشی هەرە زۆری میللەت بچەوسێننەوە و ژێردەستی خۆیانیان بکەن.

من بەر لەوەی وەرامی ئەم پرسیارە بدەمەوە ڕەخنەیێکی یەکجار بنجیم هەیە لە نەزەریەکەی لینین هی پشتگۆیخستن نییە: پەیدابوونی حکومەت هەرگیز بەرهەمی تاکە هۆی چەوساندنەوە نییە، بگرە چەوساندنەوە لە سەرەتاوە چ دەخلێکی نەبوە لە پەیدابوونی ئەو حاڵوبار و بەرژەوەندانەی کە وەها لە مرۆڤی هەزاران ساڵ پێش ئیمڕۆ بکات ناچاری دروست کردنی حکومەت بێت. حکومەت دانان و پەیدابوونی نووسین و پەرستن و مامڵەت و دیاردەکانی دیکەی سەرەتای پەیدابوونی «کۆمەڵایەتی» هەموویان هەنگاوی یەکجار گەورەی بەرەوپێشچوون و فرەبوونی بەرژەوەندی مرۆڤایەتین هیچیان ئەوە نین بەرهەمی تاکە هۆیەکی زۆر بەدی نێوان گەلان بن. هەروەک بەرەژوورچوونی مرۆڤایەتی (بە پێی تێفکرینی ماددی) لە پلەی مەیموونییەوە بۆ پلەی نیاندەرتاڵی و لەوەوە بۆ مرۆڤی تەواو و گەییشتن بە دەسەڵاتی ئاخاوتن بەند نەبوە بە عامیلی چەوساندنەوەوە (چونکە جارێ چەوساندنەوە هەر پەیدا نەبووبوو) هەروەهاش پەیدابوونی حکومەت و نووسین و ئایین و دێ و شار و سنعەت و کشتوکاڵ و هەموو ئەو دیاردە بەرەوپێشچوانە چ پێوەندییان بە «چەوساندنەوە»وە نەبوە.

لە خۆوە دیارە کۆبوونەوەی مرۆڤ لە ئاڵقەی خێزان و ئێل و دێ و شار و دانانی حکومەت و یاسا و پەیداکردنی چەک و ئامێر... و هتاد، هەموویان پێداویستی ژیانی کۆمەڵایەتی و لەسەرەخۆکردنەوە و پەلەی ژیان بوە کە ئەگەر لە پێشەوە ئەوان نەبووبان دواتر شتێک نەدەبوو پێی بڵێن چەوساندنەوە. بە نموونە دەڵێم پێک هاتنی خێزان لە سەرەتاوە فەرمانی بەرژەوەندی ژیانی مرۆڤ بوە، دواتر زەرفی وەها پەیدا بوە داوای کردوە، وەیا سەلماندوویەتی، برا ژنبەژنە بە خوشکی خۆی بکات وەیا شیربایی وەربگرێت، وەک دەشزانین لە سەرەتاوە خوشکەکە بەو حاڵە نارازی نەبوە چونکە حاڵەتەکە جێگرێکی دیکەی نەبوە تاکوو خوشکەکە خەیاڵ لەو جێگرە بکات ئەوی پێ خۆشتر بێت.

تا ئێستاش عادەتی ژنبەژنە و شیربایی هەر ماوە، کچیش زۆری پێ خۆشە لەجیاتی ژنێک دوان بۆ براکەی بهێنێت وەیا شیربابییەکەی زۆر بێت چونکە لە ماڵی مێردەکەی و لە نێوان خەڵقیش پێی بەحورمەتتر دەبێت. ئنجا کە ئەمە ڕاستیی مەسەلەکە بێت نابێ بزووتنەوەی ئێستاکەی مافی ئافرەتان بگێڕینەوە بۆ ئەو «زوڵم»ـەی لە کۆندا لێی دەکرا: ئافرەتی بەر لە هەزار ساڵ ئەگەر داوای مافەکانی ئیمڕۆکەی کردبایە و پێی درابا لە برسان دەمرد.

هەڵبەت من مەدحی ئەو سەردەمانە ناکەم کە ئافرەتی تێدا دەفرۆشرا وەیا ژنبەژنەی پێ دەکرا، تەنانەت مەدحی ئەو ئازادییەش ناکەم کە لە کۆنەوە ڕێی داوە کچ ڕەدوو بکەوێت و دواتر مەسڵەتی لەسەر بکرێت، من تەنها لە گۆشەی تەفسیری نابەجێی «چەوساندنەوە» وە سەیری ئەم دیاردانە دەکەم و دەمەوێ فەرق بکەم لە نێوان زوڵمی بێفێڵ و لە نێوان ئەو شتە ڕەوایەی کە دواتر دەبێ بە زوڵم.

ئەوەی بیری لە داهێنانی نووسین کردەوە هەرگیز مەبەستی ئەوە نەبوو کوتەکێکی نوێ بداتە دەستی ئەو سوودپەرستەی دەیەوێ قازانجی «ربا» لە قەرزدار وەرگرێت ئیتر بەو نووسینە بتوانێ سەنەدی کۆمپیالەی پێ ئیمزا بکات... دادگاش بۆ ئەوە نەبوە قەرزداران لە حەپسخانان بپەستێت و دەوڵەمەندان بحەسێنێتەوە، بە پێچەوانە، بە درێژایی مێژوو زۆردار دژی دادگا بوە چونکە دیارە نەمانی دادگا [هەروەهاش نەمانی فەتوای مەلا و حوکمی ئیبنولحەجەر[11] و کتێبەکانی سەربە قورئان و حەدیس] دەستی زۆردار دەکاتەوە بۆ ئەوەی بێترس ستەم لە بێدەسەڵاتان بکات، هەر ئەمەیشە وا لە حکومەتی ستەمکار دەکات کەوا لە پێش هەموو شتێکدا دادگایان بێ هێز و دەسەڵات بکات.

بەشی زۆر لەو قسانەی کە بە ناوی شی کردنەوەی ماددییەوە وا ڕادەنوێنێت گۆیا دادگا و هەموو دەزگایەکی میری لە وڵاتی ناسۆشیالیستدا بۆ سوودی خاوەن

---

[11]- جارێکیان هەژارێک ■ مام حاجییێکی مەیلەو دەسەڵاتدار شەرعیان هێنایە لای باوکم، ئەویش دوای بیستنی قسەکانیان پێی گوتن ئەگەر بە «ابن الحجر» بێت هەق بەلای هەژارەکەدایە، ئەگەر بە «ابن الخنجر ■ یش بێت مام حاجی مەسەلەکە دەباتەوە. هەژارەکە بردییەوە، چونکە ئیبنولحەجەر کاری خۆی کرد.

دەسەڵاتان داندراوە. گەلێک لە ڕاستی دوور کەوتۆتەوە و بەحاڵ دەتوانێ لەگەڵ خۆیشیدا ڕێک بکەوێت هەم لەبەر تیشکی چۆنیەتی داهاتنی یاسا و دەستووران و هەم لە ئاکامی بەگەڕهاتنی ئەو ڕێکخراوانەی کە یاساکان تەتبیق دەکەن. بەڵێ دەزانم پیاوی دەسەڵاتدار و زەنگین زۆر جاران دەتوانن دادگا بەخەتا ببەن بۆ سوودی خۆیان بەڵام مەجبووربوونی دەسەڵاتدارەکە بۆ پارەبەخشین و بەرتیلدان وەیا هەڕەشە کردن ئەوە بە ئیسپات دەگەیەنێ کە یاساکە خۆی لە خۆیدا بەد نییە و لایەنی هەقی پاراستوە دەنا دەسەڵاتدار ناچار نەدەبوو بکەوێتە باری بەخشین و پاڕانەوە و هەڕەشە کردن. تەنانەت لەو سەردەمانەدا کە جارێ عەبدایەتی دیمەنێکی کۆمەڵایەتی بوو عەبدەکە لە یاساکان قازانجی دەکرد هەرچەند ئەو یاسایانە هەقی خاوەن عەبدەکەشیان دەپاراست، چونکە ئەگەر مەسەلەکە بۆ تاکە عامیلی دەسەڵات بەجێ هێشترابایە بێ ئەوەی یاسا مافی عەبد و خاوەن عەبد و ئازادبوون و خۆکڕینەوە و... هتاد بپارێزێت کابرای دەسەڵاتدار پتر سوودمەند دەبوو لە چەوسانەوەی عەبدەکە و بەرهەڵستی کردن لە ئازادبوونی و هەموو سەروبەرێکی دیکەی یاسای عەبدایەتی.

دەبێ بزانین ئەو لایەنە بەد و ناڕەوایانەی کە لە هەندێ ماددەکانی یاسایێکدا هەیە لە عەینی یاساکە هەڵنەقوڵیوە، بەڵکوو لە دەستووراتی کۆمەڵایەتیدا لایەنی بەد و ناڕەوا هەیە و پەڕیوەتە ناو یاساکە، خۆ ئەگەر نەشبووبا بە یاسا دەسەڵاتدارەکان دەیانتوانی بەزەبری کوتەک لەوە بەدتر بەسەر بێدەسەڵاتاندا بهێنن. بە نموونە دەڵێم کە ماددەیێکی یاسای سەربە قەرز و سەلەم و ڕێبدە هەقی لێکدانی قەرزدارەکەی دایە دەست خاوەن قەرز و ئەو هەقەی بە پێنج دار وەیا شەپەزللە بڕیوە لەوەدا یاساکە گوناهی نییە بەڵکوو وەکوو ئاوێنە گوناهی کۆمەڵایەتی دەداتەوە، ڕەنگە چاکەیێکیشی هەبێ بەوەدا کە ناهێڵێ خاوەن قەرزەکە دە دار وە یا پازدە شەپەزللە لە قەرزدادرەکە بدات وەیا حەبسی بکات وەیا سەری ببڕێ. بەڵام ئەگەر لایەنی چاکەی ڕووت لە یاسادا هەبوو بە هۆی یاساکە و ئەو هێزەی جێبەجێی دەکات چاکەکە دەگاتە مرۆڤی بێدەسەڵات ئەگەرنا هەژارێک ناتوانێ قەرز وەیا ڕۆژانەی کرێکاری لە زۆردارێک بستێنێ ڕەنگە نەشتوانێ لە بێگاری زۆردارەکە دەرچێت ئەگەر دادگا و پۆلیس و حکومەتێک نەیپارێزێت.

بێگومان پێویستە هەمیشە ئادەمیزاد خەریک بێت فەرمانی یاساکان بەرەو پاراستنی داد و نەهێشتنی ستەم ببات بەڵام دەبێ فێڵ لە خۆمان نەکەین و بسەلمێنین کەوا بەهەمەحاڵ هەبوونی دادگا و یاسا بۆ بێدەسەڵاتان چاکترە لە نەبوونیان. جا ئەگەر خەیاڵبازێک بێت و بڵێ یاسای قەرز وەرگرتنەوە لە قەرزدار بۆ خاوەن قەرزەکە خزمەتی دەسەڵات و ستەم دەکات و دەبێ ئەو تەرزە یاسایە لەناودا نەمێنێ، با ئەوەندە تەکلیف لە خۆی بکات کە هۆیەکی وەها بدۆزێتەوە کابرای هەژار لە قەرز وەرگرتن بێنیاز بکات دەنا لەوانەیە جاری وەها هەبێ ئەگەر قەرز وەرنەگرێ لە برسان بمرێت.

لە ساڵانی دوای «وثبة» خوێندەواری خوێنگەرم یەخەی شوان و گاوانی کوردیان دەگرت و پێیان دەگوتن ئێوە بۆچی ڕازی دەبن شەرتی[12] ساڵانەتان سێ چوار دینار بێت، وەرن واز لەو کەسبە بهێنن تا شەرتەکەتان بۆ زیاد دەکەن، زۆر لەو شوان و گاوانانە بەو پەڕی خاوێنی و ساویلکەیی خۆیانەوە پێیان دەگوتنەوە جەنابی ئەفەندی تۆ پێنج دینارم بدەیێ هەتا واز لە کەسبەکەم بهێنم.

لەم مەسەلەیدا جگە لەلایەنی ناواقیعیەتی ئەو خوێندەوارانە لایەنێکی زۆر سەیری دیکە هەیە کە خوێندەوارەکان تێیدا لە کەرەوارێش کەرەوارتر بوون: ئەو شەرتە کەمەی سێ چوار دیناری کە شوان و گاوانی پێ ڕازی دەبوو زۆر جاران خاوەن ئاژەڵەکان لە پەیداکردنی وەتەنگ دەهاتن چونکە بەشێک لەوان بێوەژەن و هەتیوی هەناسەسارد بوون کە چەند بزنێکیان هەبوو بەحاڵ بۆیان بەخێو دەکران، لە گەلێک زستانی سەختیشدا نەیاندەتوانی تفاقیان بۆ پەیدا بکەن ئیتر یا بە هەرزان دەیانفرۆشتن وەیا لێیان مردار دەبوونەوە.

ناڕازیبوون لە یاسا و نەریت و عادەت شتێکی ئاسان و دڵخواز نییە مرۆڤ لە سەری زمانیەوە بیکاتە توهمە و لە کۆمەڵایەتی بگرێت، بێگومان ئەو تەرزە کەسە لە حاڵوباری تایبەتی نێو ماڵ و منداڵی خۆیدا زۆر ژیرانە و هێمنانە گەلێک شتی وەها دەسەلمێنێت کە لە دەرەوەی ماڵەکەیدا زۆر بێباکانە دەیکات بە هۆی هاندان و

---

[12]- ئەو پارە مزەیەی شوان جوتیار وەری دەگرێت پێی دەڵێن «شەرت».

نەڕەنەڕ کردن و خەڵق تێکبەردان، خۆی و خەڵقیش ئەو تەرزە هەڕوگیفە بە شۆڕشگێڕیی دادەنێن، زۆر بەداخەوە.

ئێمە ئەگەر دڵمان بۆ ئەوە بچێت چاری قەرز کردن بەوە بکەین کە بە هۆی قەرزدانەوە لە بنەڕەتدا مامڵەتان مەنع بکەین، کەواتە دەبێ لە مەسەلەی ژنبەژنە و شیربابییش فەتوای مەنع کردنی خێزان پێکەوەنان و ژنهێنان و مارەبڕین بدەین تاکوو برا و خوشک لە بنەڕەتدا پەیدا نەبن نەکا خوشکەکە بە دەست براکەیەوە مەغدوور بێ، ئنجا لزومیش نەبینین جلک لای جلدروو بدرووین نەکا کابرای جلدروو خوێنمان بمژێت، باشتریش ئەوەیە فەلاحی بێدەسەڵات ئاژەڵەکانی سەربڕێت نەکا ئاغا بیاندزێت وەیا دەستیان بەسەردا بگرێت...

ئێستا دەمەوێ لە گۆشەی باوەڕی خۆمەوە وەرامی ئەو پرسیارە بدەمەوە کە لە نەزەریەکەی «لینین» دەربارەی پەیدابوونی حکومەت وەرامی نەبوو، ئەویش ئەوەیە بۆچی وەها ڕووی دا کە لە سەرەتای پەیدابوونی کۆمەڵایەتیدا کەمایەتییەک لە خەڵق توانی دەسەڵات بگرێتە دەست خۆی و بەسەر زوربەی خەڵقدا فەرمانڕەوا بێت و دواتریش لەو دەسەڵاتەوە ڕێکخراوی «حکومەت» پەیدا بێت:

ئەوەی ڕاستی بێ وەرامدانەوەی ئەم پرسیارە دەبێ لە زاناکانی ئاسار و مێژوو وەربگیرێت چونکە هەرچی دیاردەی کۆمەڵایەتی کۆن هەیە، لەوانەی ئەگەر تۆماری نووسراوی ڕێکوپێکیان هەبایە تۆژینەوەی ئابووری وەیا ڕامیاری وەیا فەلسەفی تێیاندا موحتاجی دۆزینەوەکانی ئارکایۆلۆجی و مێژوویی نەدەبوو، هەمووی دەکەوێتە ناو جغزی لێکدانەوەکانی ئاسار و بەدوا ئەودا مێژوو [ڕەنگە ڕێم هەبێ مێژوو و ئارکایۆلۆجی لە یەکدی جودا بکەمەوە وەک کە لەم وتوویژەدا دەیکەم و کردوومە] بەڵام فەلسەفەی ماددی لە بەرنامەیدا نییە چاوەنۆڕی فەتوای زاناکانی دەرەوەی دەسەڵاتی خۆی بێت بۆ ئەوەی لەوانەوە وەرامی ئەو پرسیارانە بداتەوە کە وا بەلای خۆیەوە لە ڕێی شی کردنەوەی ئابوورییەوە وەرامی بۆ حازر کردوون چونکە وەک دەزانین فەلسەفەی ماددی بە جۆرێک خۆی بە تەعلیلی ئابووری شریتپێچ کردوە لە ئیمکانیدا نییە هیچ پێچێکی ئەو شریتانە شل بکاتەوە تەفسیر و تەعلیلی دیکەی بەبەرەوە بچێت.

بە نموونە دەڵێم ئەگەر لێکدانەوەی ئارکایۆلۆجی وەهای دەرخست کە عامیلی ئایین لە فلانە سەرزەمیندا بوو بە هۆی پێک هاتنی حکومەت دەبێ فەیلەسووفی ماددی خەریک بێت یەک لە دوو کاران بکات: یا بتوانێ ئەو دەرخستنە بە درۆ بخاتەوە و هۆیەکی ئابووری بخاتە جێگەیەوە، یاخود بە هەر جۆرێک بێت دیاردە ئایینیەکە بباتەوە بۆ بنیچەیێکی ماددی.

لینین کە هات و گوتی لە سەرەتای پەیدابوونی چینە جوداکانەوە چینی سەرەوە حکومەتی دانا بۆ تاکە ئامانجی بەردەوام کردنی چەوساندنەوەی چینەکانی خوارەوە لەوەدا چ پرسی بە مێژوو و ئارکایالۆجی نەکرد بەڵکوو وەرامێکی مەیلەو مناسبیان هەبێت، بە پێچەوانە لە بیروباوەڕی قەراردادەی ئابوورییەو▪ تەعلیلێکی بەسەر ڕابردووی چەندین هەزار ساڵەییدا هێنا لەوێشەوە جۆگەی بۆ کێشا تا ئەو ڕۆژگارەی لە دوارۆژ ڕێکخراوی «حکومەت» لە نێو بەهەشتی بێ چەوساندنەوەدا دەتوێتەوە و دەوری بەسەر دەچێت... ئنجا کە من لەبەر تیشکی ئەم بیروباوەڕەدا خەریک بم وەرامی پرسیارەکە بدەمەوە خۆم بەناچار نازانم بگەڕێمەوە بۆ ئەو سەرچاوە مێژوویە و ئارکایۆلۆجییانەی باسی سەرەتای پەیدابوونی دەسەڵاتی خانەوادەیی و عەشیرەتی و حکومەتیمان بۆ دەگێڕنەوە هەرچەند لە دەربڕینی بیروڕاکانمدا هەمیشە گۆشەیێکی چاوی زەینی خۆم دەبڕمە ئەو سەرچاوانە، ناشیەتە بیرم شتێکی وەهام لێ دیتبن لەگەڵ لێکدانەوەی بێمەبەستی تایبەتی ڕێک نەکەوێت.

بەلامەوە هێندەی بەڵگەنەویست ڕوون و ئاشکرایە، پەیدابوونی دەسەڵاتی سەرۆکایەتی لە کۆمەڵگەی مرۆڤی سەرەتاکانی یەک گرتنی ئاپۆرەیی لە شێوەی خێزان و لە ئاڵقەی فرەوانتردا بەفەرمانی پێویستی ناچاری ڕووی داوە بێ ئەوەی جارێ نیازی چەوساندنەوە هیچ دەخلێکی لەو سەرۆکایەتیە و دەسەڵاتەدا هەبوویێت. دەرکەوتنی «سەرۆک» لە نێوان ئەو کۆمەڵگانەی بەر لە دەیان هەزار ساڵ کەوتنە باری ئەوەی بەیەکەوە ژیان ببەنە سەربە پلان و فێڵبازی و تۆقاندن و هەڕەشە نەبوە بەڵکوو وەک خۆڕسک بوویێت وەها دەستی کردوە بە دەرکەوتن و پەیدابوون، ئەمەش لە دوو هۆی زۆر بنجییەوە خۆی بەسەر شیرازەی ئەو کۆمەڵگانەدا دابڕیوە:

هۆی یەکەم پێداویستی سوودی گشتی هەموو ئەندامانی کۆمەڵگە بۆ بوونی ڕێکی و یەکیەتیی تەقەڵا و هاریکاری و چالاکی و ئەو جۆرە شتانەی تێری و سەلامەتی و بەردەوامی کۆمەڵگەکەیان پێوە بەندە، دیارە مومکینیش نییە لە خۆوە و بێ ڕابەر و فەرماندە، ڕێکی و هاریکاری و... هتاد بووبێتە پێڕەو و یاسا. لەبەر ئەمە بە شێوەیەکی یەکجار ئاسایی هاندەری پەلەی ژیان پاڵ بە کۆمەڵگەوە دەنێت ڕازی بێ بە بوونی ڕابەر و فەرماندە. هیچ بەلاتەوە سەیر نەبێ کە لە کۆنە حیکایەتان دەبیەیت پێداویستی بەرژەوەندی گشتی وەهای دەکرد خەڵقی شار «بازی دەوڵەت» هەڵدەن تا ئەو کەسەی بازەکە بەسەریەوە بنیشێتەوە بیکەن بە پاشای خۆیان. چەندین پەندی پێشینیان بێ مامۆستا و بێ هیچ مەبەستی ڕامیاری و ئابووری و فێڵ لە خەڵق کردن هەبوونی سەرۆکی بە پێویست و ناچاری و بەرژەوەند داناوە، وەک کە دەڵێ «لووت لە بەیندا نەبێ چاو چاو دەخوا». شوکری فەزلی دەڵێ:

قەومی بێ سەر نییە ئیمڕۆ لە هەموو عالەمدا
دەتەوێ تاجی سەرێ بی بە هەوا گێژی نەکەی

تەنانەت تا ئێستاکەش لە نێوان دروێنەکەراندا زاراوەی «سەرپاڵە» هەرماوە. لە سەرەتاکانی پەیدابوونی کۆمەڵایەتیشەوە جارێ نە پارە هەبوو نە تەماع سەری هەڵدابوو نە تیجارەت و بانک و ئۆتێل و... هتاد هەبوون لیکی مرۆڤ بهێننە خوارەوە و خەریکی دەردەست کردن و پێ گەیشنیان بێت و خەڵقیان بۆ بچەوسێنێتەوە. ئێمە ئەگەر سەیرمان لەوە بێتەوە کەوا دانیشتوانی دارستان و ئەشکەفتان بەر لە هەزاران ساڵ بۆ پاراستنی خۆیان لە خەتەری مردن و خوران یەکێک بە ڕێکخەر و فەرماندە قبوڵ بکەن، دەبێ هەر بە جارێک بحەپەسێین لەوەی کە کۆمەڵگەکانی ئەم سەردەمە لە هەموو مەیدانێکی گرنگ و خوێڕیلەی ژیاندا سەرۆکیان هەیە، واوەتری سەرۆک بەردەستی سەرۆک و سکرتێر و ئەندامی کارگێڕی و پلەی خوار و ژوورتری دەسەڵاتیشیان هەیە کەسیش سەیری نایەتەوە بەڵکوو سەیریان لە وەها نەبوونی کۆمەڵگە دێتەوە. خۆ ئەگەر لە ڕێکخراوی سیاسی و کۆمەڵایەتی و هونەری و ئەدەبی و لەشکری بگەڕێین و یەخەی ئەو چڵە

بچووکەی درەختی کۆمەڵایەتی بین کە پێی دەڵێن «خێزان» دەبینین لەوێشدا کە هیچ جێی فکرەی چەوساندنەوەی تێدا نابێتەوە یەکێک هەیە دەسەڵاتی ڕێکخستن و سزادان و فەرمانانی هەبێ، تەنانەت ئەگەر ئەو کەسەی چاوەڕوانی دەسەڵاتی لێ دەکرێ سەرکزەڵە بوو بەزۆری ژنەکەی جێگەی دەگرێتەوە.

بەکورتی ئەم دەسەڵاتە بەرچاوەی کە هێزی ڕێکخستنی پێیە لە سەرەتای پەیدابوونی کۆمەڵایەتییەوە هەبوە و تا ئێستاش بەردەوامە هەبوونەکەشی پێداویستی ژیانی کۆمەڵ بوە نەک دژی بەرژەوەندی، جا ئەگەر ئەوسا وەیا دواتر لە پێناوی کاری بەد وەیا سوودی بەرتەسکی شەخسی وەیا دژی کۆمەڵ بەکار هاتبێت نە لە سەرەتاوە بە خراپەی گەل پەیدا بوە نە دواتریش هەمیشەکات و لە هەموو جێگەیەک هەر بەد بوە، تەنانەت کە ڕووی لە خراپەش کردوە لەوە نەشۆراوە کە دەسەڵاتی سەرۆکایەتی پێویستە بۆ گەل بەڵکوو گۆڕینی وەیا چاک کردنی بۆتە پێویست...

هۆی دوەمی پەیدابوونی دەسەڵاتی ڕێکخستن و فەرماندەیی لەوەوە هاتوە کەوا تاکەکانی مرۆڤ بە پێی بڕیاری سروشتیی زاوزێ و بەخێوبوون و نما کردن... گەورە و گچکە و بەهێز و بێهێز و هۆشیار و کەمهۆش و فێڵباز و سافیلکە و چەندین پلەی خوار و ژووری لێهاتووییان هەیە کە ئەگەر وەک بەرد و دار بخرێتە ناو تەرازووی هەڵسەنگاندنی قابیلیەتەوە لە خۆوە یەکێکیان قورستر و یەکێکیان سووکتر هەڵدەستێتەوە، جا ئەگەر هەرا لە نێوانیاندا پەیدا بێ لە پێشەوە دیارە کێ دەیباتەوە، خۆ ئەگەر بە دۆستایەتیش ڕابوێرن دیسانەوە دیارە کامیان سەرووی کامیان دەکەوێتەوە، ئەوەی بشیەوێ ئەو تەرزە سەرەژوورچوونەی تاکی خاوەن هێزی ماددی وەیا مەعنەوی بەر لە هەزاران ساڵ بداتەوە بە تاکە هۆی ئارەزۆی چەوساندنەوە و ستەم کردن بابە خۆی بلێتەوە ئایا تاقمی سەرۆکە سیاسییەکانی ئەم ڕۆژگارەمان کە لە مەیدانی مرۆڤدۆستیدا یەکتر دەخنکێنن و بەسەر کەلەشی یەکتردا خۆیان دەگەیەننە تەختی حوکمرانی چەند پلە ژووررووی چەوساندنەوە و ستەم کەوتوونەوە و چ جۆرە گیانێکی مرۆڤایەتی و خۆنەویستی بەردەوامی حوکمڕانییان دەکات! ئەم پرسیارە دەکەم بۆ ئەوەی ڕۆشنبیرە شۆڕشگێڕەکانمان کە بە ڕاست یا بە هەڵە ماکی چەوساندنەوە لە سەرەتای پێک

هاتنی دەسەڵاتی سەرۆکایەتی و حکومەتی بەر لە هەزاران ساڵدا دەدۆزنەوە و دەستی حەسرەت بۆ ستەملێکراوەکانی لێرە بە پێشەوە دەگەزن چاوێکی بەراورد کردن لە نێوان کۆن و نوێدا هەڵێنن و ببینن:

1. ستەمێک لە کۆندا کرابێت ناشێ ببێتە رووسپیکەرەوەی ستەمکاری [نوێخواز و مرۆڤنەواز!] ی ئەم رۆژگارە.

2. ئەو سەرۆکە شۆڕشگێرەی زوڵمی لێرە بەپێشەوە دەکاتە بنیشتۆکەی ناو زاران و ریسوا و ناوزڕاوی دەکات گەلێک پتر لە زاڵمێکی بەر لە سێ هەزار ساڵ بێویژدانتر و ستەمکارتر و بێ عوزر و بەهانەتر دەبێ کە برادەری خۆی خەفە دەکات بۆ تاکە مەبەستی بەردەوامبوون لە سەر عەرشی حوکمڕانی.

3. رۆشنبیری سەردەمی سەدەی بیستەم دەمچەوتتر دەردەچێت لە ستەمسەلماندووی پێش سۆمەر و ئاکاد، کە هات و چاوی لە زوڵمی سەرۆکەکەی خۆی پۆشی، بەجارێکیش لە مرۆڤایەتی دەکەوێت ئەگەر خۆی دایە پاڵ بەرەی ستەمکار دژی ئەو گیان ئازادانەی لە سەر ئازادی دەکەنەوە...

خولاسە لە کۆنی هەرە کۆنەوە کۆبوونەوەی بەرژەوەندی گەل لەگەڵ بەرچاوی و توانای تاکی هەڵکەوتوو وەهای کردوە سەرۆک و پێشڕۆ و فەرماندە پەیدا ببن کە ئەگەر پەیدا نەبووبان کۆمەڵ زەرەری دەکرد پتر لەوەی تاک بە لەدەستدانی دەسەڵات زەرەر دەکات.

ئەم سەرۆکایەتییە ناچارییە کە لە دەمی پەیدابوونی خێزانەوە بوو بە پێویستی کۆمەڵایەتیی دواتریش کە جغزی «خێزان» لەبەریەک کێشراوە بۆ ئێل و عەشرەت هەر پێویست بوو بەڵام پتر لە جاران چونکە لەم قۆناغەدا فەرمانی سەر شانی سەرۆکەکە زیادی کرد بە زیادبوونی بارستی ئەو بەرژەوەندەی کە ئێل تەمسیلی دەکات بەرانبەر بەرژەوەندی تاکە خێزان. هەڵبەت نابێ رقهەڵگرتوش بین لەوەدا کە سەرۆکی ئێل پتر پێویستی بە بەردەست و خزمەتکار و وڵاغ و باربەر و مەر و ماڵ

و کەرستەی پێشەوایی هەیە لە سەرۆکی خێزان چونکە دیارە ئەرکی سەرۆکی ئێل بە دامودەزگای ناو خێزانێک هەڵناسێ.

لەو پلە یەکجار کۆن و سەرەتاییەی پەیدابوونی ژیانی کۆمەڵایەتی عەشرەتدا جارێ چەوساندنەوە پەیدا نەبووبوو، تەنانەت وێنەیێکی ئەو ژیانە مەیلەو سافیلکەیەی کە هەلی بیرکردنەوەی زوڵم کردنی لەبەر هەنگاوی سەرۆکدا نەخولقاندبوو تا ئێستاکەش هەر بەرچاوە بە تایبەتی لە نێوان ئێلی کۆچەردا کە وا هەمووی لە بارێکدا دەژین دەڵێی خێزانەکان لە ئێلەکەدا کوڕانی دایک و باوکێکی زۆرئەولادن کە هەر یەکەیان خێزانی خۆی پێک هێناوە.

وا دەزانم بیرکەرەوەیێکی وەکوو «ئەنگلز» پتر لە واقیع، ئەو ئێلە کۆنانەی بە بێشکەی خاوێنی داناوە چونکە وەک لە قسەکانی دەردەکەوێت لە بارێکی وەها جەوانمەردی و بێ فەرقی و بێ جوداوازییان دادەنێت کە وا ڕەنگە بە زەحمەت لە نێوان خوشک و برایانیشدا پەیدا ببێت. بەڵام دەزانم میقدارێکی پتر لە واقیع بەدی و چەوساندنەوە و ستەم دەداتەوە بەو پلەیەی کە ئێلەکان تێیدا گەییشتن بە نیشتەجێبوون و کێڵان و چاندن چونکە ئەو نیشتەجێبوونە نە یەکسەر دەکێشێتەوە سەر چەوساندنەوەی دڕندانە، نە لە هەموو وڵاتانیش هەمان ڕێبازی دڕندە دەگرێتە بەر.

لە وڵاتێکی دواکەوتووی بێ دەرامەد و بێ «سەرمایە» و بێ بورجوازیەتی وەکوو بەشی زۆری کوردستاندا ئەو پێوەندییە سەرەتاییە سافیلکەی کۆنینەی نێوان ڕەوەند و کۆچەران بۆ ماوەیێکی گەلێک دوور و درێژ دوای نیشتەجێبوون بەردەوام دەبێت چونکە پێوەندی کۆچەرایەتی لە وێنەی پێوەندی عەشرەتایەتی بەدەر دەداتەوە و سەرۆک عەشرەتەکە و کوێخاکان و قسەڕۆشتوەکانی عەشرەت بە خزم و کەسی ئاپۆرەی خەڵقەکە لە قەڵەم دەدرێن، تەنانەت بە فەلاحی نیشتەجێی ئەو عەشرەتانە ناگوترێ «مسکێن» هەروەک بە ئەندامانی خێزان ناگوترێ بەردەست و خزمەتکار و چەتیم.

کوردستانی خۆمان لەم شێوە کۆمەڵایەتیانەی زۆر تێدا مابوو تا ئەو دواییەی کە یاساکانی سەربە زەویسازی گۆڕان و شێوەی حکومەتانیش بەرەو مۆدیلی تازە

بوونەوە و گەلێ باری دیکەی شارستانەتیش پتر ترنجایە نێوان دانیشتووی گوندەکان، بەڵام تا ئێستاش ئەم گیانە هەر ماوە لە هەموو شوێنێکدا بە تەواوی بەسەر نەچوە.

بەهەمەحاڵ گۆڕانی باری کۆمەڵایەتی و ئابووری و پێوەندیی گەورە و چووکەیی لە ژیانی دەشتودەردا بەندە بەو کاریگەرانەی بیروباوەڕ و بۆچوون و قەناعەت و زات و دڵ و لایەنەکانی مرۆڤایەتی بە چاک و خراپیانەوە بەرەوژوور وەیا بەرەژێر دەبەن، لە هەموو حاڵانیشدا دروشم و شێوەیێکی کۆنینەی پێوەندی خزمدۆستانەی ژیانی کۆچەری و عەشرەتایەتی دەمێنێت تا ئەو کاتەی گۆڕانی باری کۆمەڵایەتی دەگاتە پلەیێک کە ئیتر ئەو تەرزە پێوەندییە بە خۆیەوە ناگرێت، لەوەشدا فەرق نییە ئاخۆ ئەو گۆڕانە بە هۆی بەرەوپێشچوونی کۆمەڵایەتیەکەوە بێت وەیا بە هۆی دەرسدان و هاندان و فێرکردن و ڕق هەڵستاندنەوە بێت چونکە مەرجی ڕازینەبوون و یاخیگەری لە نێوان خەڵقدا بڕیاری زاتەکەیانە.

ئەم قسانەی دواییم لە شریتەی باسی بەرەوپێشچوونی ژیانی سەرەتایی مرۆڤ لە پلەی پێوەندی خێزانییەوە بۆ بەرەو فرەوانتر دوورخستمەوە، با بۆی بگەڕێمەوە:

وەک دەزانیت و دەزانم لەگەڵ فراژیبوونی کۆمەڵایەتی و پەرەسەندنی چالاکییەکانی و زۆربوونی ئەژماری خەلق و هەمەچەشنەبوونی بەرژەوەند و چاکە و خراپە و کەڵەکە کردنی تەجرەبە و تەشەنەکردنی داخوازیی گوزەران [باسی لایەنی پەیدابوونی «عقیدە- دین» ناکەم مەگەر لە جێگەی یەکجار ناچاری و پێویستدا] و داهاتنی چەندین شتی ماددی و مەعنەوی، کۆمەڵگەی لادێ وردە وردە بەرەو بارستی شار بۆوە و لەو شوێنانەدا کە دەوروبەر لەباتر بوو، لێرە و لەوێ، شار پەیدا بوون، هەر لەو ماوەیەشدا پێبەپێی تێهەڵکشینی تێکڕای کۆمەڵایەتی، پێویست بۆ دەسەڵاتێکی ڕێکتر و ژیرتر و فرەوانتر لە هی سەرۆکایەتی ئێل داهاتنی حکومەتی سەپاند، لەوەشدا هەرچەند چەوساندنەوە خۆی بەرهەست کردبێ حیسابی پەیدابوونی حکومەت ناگەڕێتەوە بۆ تاکە هۆی چەوساندنەوە چونکە هەروەک دەسەڵاتی سەرەک خێزان و سەرەک عەشرەت لە بەرژەوەند و پێداویستی ژیان هەڵستاوە - با نەختێکیشی دەستدرێژی و ناڕەوایی تێدا بووبێت - هەروەهاش پەیدابوونی حکومەت بە فەرمانی بەرەوپێشچوونی باری تێکڕای کۆمەڵایەتی بوە،

واتە لە هەناوی بەرژەوەند و پێداویست ڕسکاوە نەک لە منداڵدانی خونخۆری و خەفەکردن هەرچەند دەسەڵاتداری حکومەت زوڵمیشی کردبێ وەیا لە ئاکامی دەسەڵاتداربوون خەڵقیشی چەوساندبێتەوە▪ چونکە ئەو شتەی چاکبوون و خراپبوونی حکومەتەکە نیشان دەدات هەبوون و نەبوونی حکومەتە نەک بە مەرج گرتنی هەبوونی چاکە و نەبوونی خراپە تێیدا.

ئێمە ئەگەر ئەمە بکەینە «مەرج» دەبێ هەموو حکومەتی ئەم سەردەمەش بە خراپ لە قەڵەم بدەین و لە ناویان ببەین هەروەهاش هەموو ڕێکخراوەکان و ڕشتە کۆمەڵایەتیەکان تا دەگاتە تاکی مرۆڤ چونکە سەرلەبەریان خراپەیان تێدایە. لەگەڵ ئەمەشدا ئەگەر باوەڕمان هێنا بەوەی کە «چەوساندنەوە» و خوێنمژی لە سەرەتاوە تاکە هۆی پەیدابوونی حکومەت بوە، دوودڵی پێ ناوێ لەوەدا کە بڵێین خۆزی حکومەت هەرگیز پەیدا نەدەبوو وەک کە دەڵێین خۆزی گورگ و بلەرزە و چاوئێشە و دەردی کانسەر و عەبدایەتی و شەڕ... هەرگیز نەبوونایە.

وەک دەبینی پەرەسەندنی دەسەڵاتی سەرۆکایەتی لە خێزانەوە بۆ ئێل و لەوەوە▪ بۆ شێوە▪ فیۆدالی و لەوەوە بۆ حکومەت بە پێی داخوازیی بەرژەوەند و پێداویستی بەرەوپێشچوون هاتە دی هەرچەند زوڵمیشی تێکەڵ بوە: لە داهاتنی حکومەتیشدا لێهاتوویی و ئازایی و زیرەکی و خەسڵەتەکانی دیکەی سەرۆکایەتی دەوری دیتوە چ لە دەسەڵاتداران بێت و چ لەو تاکە بێت کە لە هەموان ژووروو کەوتۆتەوە.

ئەمەیە ڕاستی مەسەلەی پەیدابوونی حکومەت، هەر ئەمەشە دۆزینەوەکانی ئارکایۆلۆجی و تۆژینەوەکانی مێژوویی دەریدەخەن. وسکتبوونی بیرکەرەوەکانی ماددیش لەم ڕاستییە لەوەوە دێت کەوا ڕاستیی مەسەلە لەگەڵ کاریگەربوونی تاکە هۆی ئابووری، لە ئابووریشدا لەگەڵ تاکە دیاری چەوساندنەوە ڕێک ناکەوێت کە ئەم ڕێککەوتنەش نەبوو بەشێکی هاندان و تین و تەوژمی شەڕی نێوان چینەکان دادەمرکێتەوە، چونکە لەوەوە کەم و زۆر جۆرە ڕەوابوونێکی مێژوویی لە پەیدابوونی «چین» جێگەی فکرەی زۆر ناڕەوای «چەوساندنەوە» دەگرێتەوە. بێگومان کە باباینکی پرۆلیتاریایی بزانێت لە کۆنەوە بەرژەوەندی کۆمەڵایەتی بڕیاری هەبوونی سەرۆک و ڕابەری داوە نەک خوێنمژی، زۆر بە سێتایی دڵ و دەروونی ناچێتە سەر ئەو قەناعەتەی کە کوشتن و لەناوبردنی سەرۆک و

دەسەڵاتدارەکانی ئەم ڕۆژگارە کە میراتگری دەسەڵاتی کۆنینە و مێژوویین هەروا بێ لێکدانەوە کارێکی ڕەوایە و خۆ تێدا شەهید کردن و بەخت کردن دەهێنێت.

بەهەمەحاڵ هاندانی هەژاران بەرەو شۆڕشگێڕایەتیی بێسنوور پتر لە ڕەوانەبوونی دەسەڵاتی سەرلەبەری قۆناغەکانی پێش سۆشیالیزمدا هەیە. بە نموونە دەڵێم دینی ئیسلام لە مەیدانی خۆیدا نەیگوت خوانەناسین لە هەموو بارێکدا هەر ناڕەوایە بەڵکوو ناڕەوابوونەکەی بەستەوە بە هاتنی پێغەمبەران و بەردەوامبوونی خەڵقەکە لەسەر خودا نەپەرستن «وما کنا معذبین حتی نبعث رسولا» هەر بۆیەش بوو دواتر کە دەسەڵاتی گرتە دەست ڕازی بوو بەوەی هەموو دینە ئاسمانیەکان لە سێبەری ئیسلامدا بەرانبەر بە «جزیة»-دان بەردەوام بن چونکە دانی بەوەدا دەهێنا کە وا کاتی خۆی لە داهاتنیاندا «ڕەوابوون» هەبوە. کەچی وەک دەزانین فەلسەفەی ماتیریالیزم کە دەسەڵاتی گرتە دەست ڕازی نییە غەیری خۆی یەک دەقیقە نەفەس هەڵێنێت.

لەم نمایشتەی پەیدابوونی دەسەڵاتی سەرۆکایەتی و سەرکەیاندنی دەسەڵاتەکەش بە ڕێکخراوی «حکومەت» دەوری «زات» ی مرۆڤ لە سەرلەبەری گۆڕان و بەرەوپێشچوونەکەدا نەک هەر کاریگەرە بنجییەکەیە بەڵکوو تاکە کاریگەرە، چونکە وێڕای لایەنی خەسڵەتەکانی لێهاتوویی و هێز و ڕابەرایەتی لە سەرۆکە کۆنەکاندا کە هەمووی هەر زەنەی زاتە، لایەنی بەرژەوەندیش کە داخوازی هەبوونی سەرۆک و ڕابەری کردوە ئەویش هەر دەگەڕێتەوە بۆ «زات» بەڵام لەمەیاندا زاتی تێکڕای تاکەکان بە سەرۆکەکان و ژێردەسەکانەوە بەرژەوەندیان لە هەبوونی سەرۆکدا دیتوە بۆیەیە بە ئاسانی و بێ شەڕ و هەرا پەیدا بوە. هەر بۆیەشە لە هەموو مێژووی کۆندا بەدەگمەن نەبێ بزووتنەوەی گشتی دژی چینی دەسەڵاتدار کە حکومەتی پێک هێناوە بەرپا نەبوە، خۆ ئەگەر دەسەڵاتدارەکە لە ڕادەبەدەر ستەمی نەکردبایە باوەڕ دەکەم کەمتریش بزووتنەوەی گشتی بەرپا دەبوو. لەو کەمتاکورتە بزووتنەوانەشدا، دیسانەوە وەک گوتم، دەوری «زات»ی سەرۆکی بزووتنەوەکان بە قەدەر هەموو بزووتنەوەکە کاریگەر بوە و هەرجارەش کە تێیدا سەرکەوتوو بوە خۆی بۆتە میراتگری دەسەڵاتی لە خۆی بەپێشەوە وەک ئەوی کردوە.

کە ببین و لە لایەنی ئابوورییەوە بەرەو هەرا زلەکانی مێژوو برۆین کە شەڕ و ئاژاوەی نێوان میللەتان دەگرێتەوە، لەوێدا دەوری «زات» پتر لە چاوان دەچەقێ چونکە جگە لەوەی کە وا بەزۆری لە مێژوودا شەڕ و هەرای زل بە خواهشتی سەرۆکەکان بوە بێ ئەوەی چینە بەردەستەکان هیچ ڕا و ڕاوێژێکیان تێدا هەبووبێت، سەرۆکەکانیش گەلێک جار بێ ئەوەی سوودی ماددییان مەبەست بووبێت، ڕقێکی شەخسی وەیا مەیلی بەخۆنازین و غەیر نزم کردنەوە، تەنانەت وەها بوە دەماری شێتایەتی و نەخۆشی نەفسی بەرەو شەڕی قورسی لێ خوڕیون ئیتر یا مەیلە ڕیزپەڕەکەیان بە سەرکەوتن کۆتایی بە هەراکە هێناوە وەیا کۆتایی بە خۆیان هێناوە.

تۆ سەرنج بگرە لەو وێرانکارییەی کە بە عادەت دوای سەرکەوتنی لایەنێک لە وڵاتی لایەنی ژێرکەوتوودا کراوە دەبینیت چالاکیەکی وەها بەکار هاتوە هەرگیز لە بنیات نان و تەعمیر کردندا نەدیتراوە بەشێکی زۆری ئەو وێرانکارییەش لە مەیلی نەفسە گومڕاکان بەولاوەی تێیدا نەبوە. گەلێک جار نەفسی عەسکەرەکانی لەشکری سەرکەوتوو لە وێران کردن و کوشتن و سووتاندندا ئەو حاڵەتەیان بەسەردا دێت کە بەسەر سۆفیی حاڵگرتوودا دێت ئیتر ئەوانیش وەک ئەو سۆفییە دەکەونە جەزبەوە بەڵام جەزبەی دڕندەیی بێسنوور و بێئامانج، وەک ئەو گورگەی دەکەوێتە نێوان گەلە و صەد جار لە پێویست زیاد دەکوژێت و دەخنکێنێت... لە سەربازی سەرکەوتووی بەر لە صەد ساڵ دەگێڕنەوە گوتوەتی کە وا لە ماڵی «دیندوشمنەکەی» منداڵی نێو بێشکەی فەساد کردوە ئنجا کوشتوەتی.

من ڕێم نییە بەدوا نیشاندانی ئەو هەموو وێنانە بکەوم لە مێژووی کۆن و نوێدا کە هەموویان دەوری زاتی مرۆڤ لە ڕووداو و هەڵکەوت و کاری بەد و چاکدا نیشان دەدن چونکە ئەمە کارێکە کۆتایی نایەت، لێرەدا بەوە ڕێگە کورت دەکەمەوە کە بڵێم ڕەوشت و ڕەفتاری خۆت بکە بە ئاوێنەی واقعی کۆن و نوێ و لێی ورد بەوە بزانە لە چەند هەڵوەستی ڕۆژانەتدا بە پێی مەیلی نەفسەکەت ڕەفتار دەکەیت و چۆن خۆشویستن و ڕقلێبوونەوە و ترسان و پێوێران دەتبزێوێ بێ ئەوەی جارێ بەرژەوەندی ڕاستەقینەت بەخەبەر هاتبێت، خۆ ئەوەی ڕاستی بێ بەشی هەرە زۆری بزووتنەوە و ڕەفتاری گەنجی بێ خێزان چ پێوەندی بە سوود و

بەرژەوەندەو■ نییە و هەموو بڕیاری نەفسە ناکامەکە و کاڵەکەیەتی هەرچەند بشیەوێ خۆی ئیقناع بکات بەوەی کە ئەویش وەک مرۆڤی خاوەن ئەرک و فەرمان بابایەکی مەوزووعی دوور لە عاتیفەیە.

ئەو گەنجە پڕ تەوژم و تین و تاوەی کە بە دوا گری زاتی خۆی کەوتوە و وا دەزانێ خەریکی پێکهێنانی سوود و بەرژەوەندی گشتییە، دوای بەسەرچوونی دەمی هەڵپەوکڵپەی زاتە شلک و تازەکەی هۆش و گۆشی بەخەبەر دێت و تێدەگا چەند گومڕا و زاتکوێر بوە ئەوساش یا پەشیمان دەبێتەوە و بە دڵشکستەیی ڕێگایەکی پێچەوانە دەگرێتە بەر یاخود هەر لە ژێر باری نەفسەکەیدا دەمێنێتەوە و بۆ داپۆشینی هەڵەی زەمانی گەنجایەتی پتر لە جاران خوێنگەرمی و تیژڕۆیی دەنوێنێ، واش دەبێ لە گێژی نەفسە بەسەهووچوەکەی دەردەچێت و دەکەوێتە باری ڕەفتاری ڕێکوپێک.

نەختێک هەڵوەست لە ئاست ئەم تێبینییەی تازە کردم، بۆت ڕوون دەکاتەوە کە وا مەسەلەی بەهەڵەداچوونی نەفسی گەنجەکانی ئەم ڕۆژگارە یەکێکە لە کاریگەرەکانی چەرخ و مەنگەنەی کۆمەڵایەتیمان چونکە ژمارەی ئەو گەنجانە خەریکە پتر دەبێ لە ژمارەی عەمەلە و کاسبکار و ئەو خەڵقەی بەرژەوەندێکی ماددییان بەدەستەوەیە و ئەرکی خێزانیان بەسەرەوەیە. دیارە گەنجی بێ ماڵ و حاڵ و ئەرکی گوزەران و بەڕێوەچوونیش بە زرە تەئویلان نەبێت نابردرێتەوە بۆ مەوزووعیەت ئیتر لەو عومرە شلکە و لەو بێ مەسئولیەتیە و لەو تەوژمی عاتیفە و لەو مەیدان بەرفرەوانیەی ژیانی تێکەڵ و پڕ شەهوەتەدا دەبێ میلۆنەها گەنجی جەمبوورەبەستووی قوتابخانە و کۆلیجەکان چیان بە دڵدا بێت و چۆن ئارەزۆی نەفس بخەنە بەرگی گەلپەروەری و بەرژەوەندی گشتی و پرۆلیتاریادۆستی و دژایەتی ستەم. هەروەهاش چەند بە ئاسانی لەوانەن لەلایەن زمانلووس و عەوام خەڵەتێنانەوە بۆ مەبەستی ناڕەوا بەکار بهێندرێن و خۆکوژیشیان پێ بکرێت.

بەڕاستی مەسەلەی ئەو گەنجانە کە بەرهەمی ژین و ژیاری ئەم ڕۆژگارەن و زۆر جارانیش پتر لەوەی پێی دەگوترێ «چین» چالاک و کاریگەرن، لە نەزەریەی خاوەن فکرەکانی لێرە بەپێشەوەدا حیسابێکی بۆ نەکراوە هەروەک هیچ حیسابێک لەو نەزەریانەدا بۆ دەوری هێزی چەکداری نێوان عالەمی سێیەم نەکراوە چونکە

هیچ کامێک لەوانە بە بیری خاوەن نەزەریەکاندا نەدەهات تاکوو لە بزووتنەوەی مێژوویی و رامیاری و کۆمەڵایەتیدا تێبخوێندرێنەوە. لایەنێکی مەیلەو حیساب نادیاریش لەو گەنجانە و لەو سپایانەدا ئەوەیە ناشێ سیفەتی چینایەتییان بەسەردا بهێندرێت چونکە وەک دەغڵی هەڕەمە لە هەموو چینەکانیان تێدایە. گەنجەکانیش بەوەدا لە سپاکان جودا دەبنەوە کە لەواندا کیژان بەشدارن سپاکانیش هەموو هەر پیاون مەگەر لە هەزاری یەکێکی ژن بێت.

پوختەی قسە و لێکدانەوە ئەوەیە کە بە هەر لایەکدا مرۆڤایەتی و کۆمەڵایەتی و مێژوو و بەرەوپێشچوون و بەرەودوابوونەوە و باوەڕ و ئایین و بزووتنەوە و وەستان و هەرچی سەربە ئادەمیزاد هەیە هەڵگێڕیەوە هەر دەگەی بەوەی تا ئێستا لەم نووسینەدا پێی گەیشتوین ئەویش کاریگەربوونی زات و کارتێکرانی ماددەیە لەو ڕووەوە کە مرۆڤ خەلقندەیێکی زاتییە و هەرچی مەوزووعیەتێکی لێشی بەدی بکرێت هەر لە ڕێی تێکەڵبوونی زاتی لەگەڵ دەوروبەردا پەیدابوە و دەبێت. لەوەش بەولاوە بیرکەرەوەی ماددی چ هەقێکی بەدەستەوە نییە مەترسی «دوانەتی» زەللە بە فکری بکات و دەوری یەکەمینایەتی و ڕابەرایەتی و کاریگەرایەتی پێ لە مرۆڤ بستێنێتەوە بۆ ماددی مردوو و دەوروبەری بێ هەست و ئاگا.

چی لەم ڕووپەڕانەدا لە بارەی ئەم ترسەی دوانەتییەوە نووسیومە شتێکە لە بۆچوونی خۆمەوە پێی گەیشتوم نەک لە دانهێنانی نووسەرانی ماددی بەو ترسە، بەڵام وا دەزانم بۆچوونەکەم بێ بنج و بنگە نییە چونکە ئەگەر ئەوەی گوتوومە لێم بسەلمێندرێ، لەگەڵ هەڵوەست و قسە و لێکدانەوە و شی کردنەوە و نیگای مێژوویی و کۆمەڵایەتی و ئەو نووسەرە ماددییانەدا جووت دەڕوات و تەفسیریان بەدەستەوە دەدات. بۆ تاقی کردنەوەی ئەم قسەیەی تازە کردم، شی کردنەوەیێکی ماددی لەوانەی بە عادەت مرۆڤ دەیەخەنە دوای هۆیە ماددییەکانەوە بەم بیروباوەڕەم بگرە و عامیلی ترسی دوانەتی لەو شی کردنەوەیەدا بەدەنگ بهێنە و تێبفکرە کابرای خاوەن نووسینەکە چەند جاران بەسەر مرۆڤدا تێدەپەڕێت و حیسابێک بۆ خواهشتی سەربەخۆی ناکات چ بە ڕازیبوون لە شتی ناڕەوا بێت و چ بە ناڕازیبوون لە شتی چاک بێت چونکە وەک دەزانین لە ژیانی عادەتیدا زۆر جاران مرۆڤ دڵخوازی خۆی لە شتی بەد و ترسنۆکانە و ناجایەزدا دەبینێت و

دەسەڵاتەکەی بە پێچەوانەی فەرمانی مەنتیق و داد و بەرژەوەند بەکار دەهێنێت، ناوناوەش کە نووسەری ماددی ناچار دەبێت ئەو گومراییەی گەل تێبخوێنێتەوە خەریک دەبێت هۆیەکە بداتەوە بە فێڵی فێڵبازان و خەتای باوەڕی چەوت و سافیلکەیی و تێنەگەیشتن و شتی ئەوتۆیی بە جۆرێک هەر دەڵێی ئەو دیاردانەش شتی ماددین وەک پارە و گەنم و ماش و پێستەڕێوی و فەردەلۆکە، کەچی لەگەڵ هەموو ناشیرنیەکی تێیاندایە بەچکەی هەناوی مرۆڤن و هۆی سەربە کۆمەڵایەتی و بیروباوەڕ و نەریت و شتی مەعنەوین.

بە نموونە دەڵێم بەر لە صەد ساڵ زیاتر ئەو هەموو مریدانەی شێخ نەبی ماویلی کە بە فەرمانی ئەو ڕژد بوون لەسەر کوشتنی حاجی قادر[13] کام بەرژەوەندی ماددی، شەخسی بێ یا گشتی، هۆی ورووژاندنی مریدەکان بوو؟ تێکهەڵقژانی ناوخۆیی بەرەی نیشتمانیی یەکگرتوو لە ساڵی 1958 و 1959دا بە کام سوودی ڕەوا و بێگەردی میللەت بوو؟ ڕێک نەکەوتنی کۆمیونیستەکان و سۆشیالیستەکانی ئەڵمانیای سەرەتاکانی 1930 کە کێشایەوە سەر بێهێزبوونیان و هاتنی پارتی نازی بۆ حوکم چی تێدا بوو غەیری زاتکوێری دڵگەرمەکانی هەردوو حیزب، بەتایبەتی حیزبی کۆمیونیست [چونکە دیارە ئەویان تیژڕۆتر بوو، دواتریش خەسارەتمەندتر بوو]؟ کۆمیونیستەکان هەر زەرەرێکی دیتبایان لە سەلماندنی داخوازیی سۆشیالیستەکان هەرگیز تووشی ئەو نەگبەتیە نەدەهاتن کە لە دەست نازییەکان چەشتیان. بێشکەی کۆمیونیزمیش کە ڕووسیایە نەدەگەیشتە ڕۆخی لەناوچوون بەو هێرشەی برایە سەری لە ساڵانی 1941-1942دا. هەر تەبریرێکی «ماددی!» و نامادی بۆ ئەو تەرزە ڕێک نەکەوتنە و هەزاران هەڵوەستی نابەجێی دیکەی وەک ئەو بهێندرێتەوە نە فلسێک دەهێنێت و نە تۆسقاڵێک قەناعەت بەدەستەوە دەدات، تاکە یەک بستیش بەلای ڕاستی و دروستیی لێکدانەوەمانەوە نابات لەوە پتر کە بە درۆ بروایێکی گومرایانە بە تەعلیلێکی چەوت و چوێر دەرهێنین.

---

[13]- لە هەر سێ بەرگی *«حاجی قادری کۆیی»* بە پێی پێداویستی باس و لێکۆڵینەوە، هەراکەی نێوان حاجی قادر و شێخ نەبی ناو نووسینەکەوە، بە تایبەتی لە بەرگی سێیەمی کتێبەکەدا.

ئا لێرەدا تێبینییەکی بچووک هەیە پێویستە لێی لا نەدەم. ئەویش لەلای خۆیەوە تیشکێکی روونکەرەوە دەهاوێژێت بۆ چۆنیەتی لەیەک دوورکەوتنەوەی دوو هەڵوەستی «زات» بەرانبەر دوو رووداوی وەکوو یەک: زۆر نووسەری ماددیم دیتوە دانی هێناوە بە هەڵەبوونی هەڵوەستی کۆمیونیستە ئەڵمانەکان لەو رێک نەکەوتنەیان لەگەڵ سۆشیالیستەکاندا، بەزۆریش هەڵەبوونەکە لەوەدا دەدۆزنەوە که دواتر بوو بە رێخۆشکەرەوەی هێرشی نازییەکان بۆ سەر رووسیا، بەڵام ناسەلمێنن کە وا رێککەوتنی رووسەکان لەگەڵ نازییەکان لە سەرەتای شەڕی دوەمدا هەڵەیێکی کوشندە بوو، کەچی وەک دەزانین ئەو رێککەوتنە وای کرد کە هەڵەی پێشووتری کۆمیونیستە ئەڵمانەکان تا ئەو رادەیە بکێشێتەوە سەر هەڕەشەی کوشندە لە ژیانی رووسیای کومیونیست چونکە ئەگەر ستالین رێی چۆڵ نەکردبایە بۆ هیتلەر کە لە 1939 پۆڵەندە بشێلێت و دواتریش لە 1940 دا فرەنسە لەناو ببات، هیتلەر نەیدەتوانی 1941 دا هێرش بباتە سەر رووسیا و ستالین. لەمەشدا چ تەبریرێک پەیدا نییە کە دەگوترێ لەترسی رێککەوتنی هیتلەر لەگەڵ فەرەنسا و ئینگلیز، ستالین ناچاری رێککەوتن بوو لەگەڵ هیتلەر چونکە دیتمان لە هیچ حاڵاندا دەوڵەتەکانی رۆژاوا لەگەڵ هیتلەر رێک نەکەوتن. ئێمە ئەگەر بەهانەی وەها سافیلکە و بێبنج لە ستالین بسەلمێنین دەبێ هەر لە پێشەوە هیچ گلەیی نەبەینەوە سەر کۆمیونیستە ئەڵمانەکان چونکە ئەوانیش دەتوانن بە فەندی زمانلووسی هەزار و یەک بەڵگەی رێکوپێکت بۆ بهێننەوە و خۆیان لە گلەمەندیی من و تۆ بپەرێننەوە، جا ئەگەر بیرکەرەوەی ماددی بیەوێ یەک هەڵوەستی هەبێ بەرانبەر ئەو دوو رووداوەی وەکوو یەک چاکتر ئەوەیە لە کۆمیونیستەکانیش عوزر و بەهانان بسەلمێنێت و گلەیی بباتەوە سەر بەرەی سۆشیالیست چونکە هەر نەبێ، کە پێمان نەکرێ مێژوو بگۆڕین و رووداوان هەڵگێرینەوە، با قسە و بیروڕامان بەرەو یەکچوونی بگۆڕین.

ئێمە ئەگەر رێمان هەبێ لە رووداوی زۆر گرینگی وەک هەرای نێوان دەوڵەتان دابەزین بۆ مەتەڵ و پەندی پێشینان بە نیازی بەسەر کردنەوەی لایەنی زاتیبوونی مرۆڤ لە نەزەر بیروڕای خاوەنی پەندەکان. کە دەکاتەوە گەل، دەبینین لەوێشدا بە شێوەیێکی عەفەوی هەست بەو لایەنە کراوە بەڵام بێ ئەوەی دەمەتەقەی زاتیبوون

و مەوزووعیبوونی مرۆڤ هەڵستێنێت [دیارە لە ئیمکاندا نەبوە ئەو لایەنە هەڵستێنێت]. من لەو پەند و مەتەڵانە چەند نموونەیەکی وەها دەهێنمەوە کە بشێ بخرێتە بەر پێوانەی زاتی و مەوزووعیەوە. ئەگەرنا پەند و مەتەڵی ئەوتۆ هەیە خۆیان لە خۆیاندا ئەوەندە زاتین کە لە سنووری عادەتیی زاتییەت تێپەڕیون بەرەو غەیب، بگرە ئەفسانەش بە لێکدانەوەی ماددی چ پێوەندیەکی ڕاستەوخۆی بە ماددییەت و مەوزووعیەتەوە نییە.

پەندێک هەیە دەڵێ «پووشکە بە چاوی خەڵقەوە دەبینێت بەڵام کۆڵەوژ [وەیا چیلکە] لە چاوی خۆیدا نابینێت». ئەم پەندە درێژییێکی ژیرانەی گوتە مەشوورەکەی کە دەڵێ کەس عەیبی خۆی نابینێت، هەروەهاش هەردوویان خزمی «کەس بە دۆی خۆی ناڵێ ترشە»ن. پەندەکان لەگەڵ تێخوێندنەوەی لایەنی سوودی شەخسی و خۆ تەرجیحدان بەسەر غەیردا. کە دەقاودەق لەگەڵ هەلپەرستی یەک دەگرنەوە، وەها ڕادەگەیەنن کە بە عادەت مرۆڤ دڵ و دەروون و ئارەزۆی خۆی دەکاتە پێوانەی چاکە و خراپە، دیاریشە ئەمە جەرگەی زاتییەتە و چ پێوەندی بە مەوزووعییەتەوە نییە. مرۆڤ ئەگەر لە دەروونیدا جۆرە باوەڕێکی نەبێ بە ڕاستبوونی «پووشکەدیتن لە چاوی غەیردا» ناوێرێ پڕ بەدەم لە خەڵقی بکاتە عەیب، هەروەهاش ئەگەر هەستی تەواو بکات بە عەیببوونی ئەو کۆڵەوەژەی ناو چاوی خۆی دیسانەوە جورئەت ناکات لچکولێوان لە پووشکەکە هەڵێنێت. عەیبی خۆ نەدینین و عەیبی خەڵق دیتن بەر لە هەموو شتێک هەڵوەستی زاتە، دواتر ڕەنگە باداتەوە سەر هەلپەرستی چونکە لەوێدا وێڕای «نیگای زاتی» بێشەرمی و بێپەردەییش هەیە کە هەر بە جارێ لە مەوزووعییەت دەترازێ.

- بۆیە پێت دەڵێم خاڵە چوێلەکانم بۆ بگری.
- دەستێ نەتوانم بیبڕم ماچی دەکەم.
- کێ داکی مارە بکات ئەو باوکیەتی.
- بەخێشەخێش لێت دێمە پێش.
- ئەگەر دیترام ئەزم، ئەگەر نەدیترام دزم.

ئەمانە هەموویان بەولاوەی زاتیەتەوە بەرەو هەلپەرستی و خۆویستییەوە ڕۆییشتوون. هەر ئەمانەشن لە بەیتەکەی شاعیر دەنگ دەدەنەوە و ڕێی دەربڕین لە بەر زمانیدا خۆش دەکەن:

زەمانە هەر کەسی هێنایە مەیدان
ئیطاعەی فەرضە لای قەولی حەکیمان

لێرەدا مەودام نییە لە گۆشەی زاتیبوون و مەوزووعیبوونەوە سەیری ئەو هەڵوەست و گوتە و پەند و قسەی نەستەق و بابەتە فولکلۆرییانە بکەم کە تاکە مرۆڤ بەرەو سوودی بەرتەسکی شەخسییەوە دەبات لەگەڵ ئەوانەی هانی زوربەی گەل دەدەن بۆ وەدەستهێنانی بەرژەوەندی گشتی، ئەوەی ڕاستیش بێ ئەم لایەنەی «سوودی تاک» و «سوودی گەل» سەر دەکێشێتەوە بۆ ئاکار و خەسڵەتی جوامێری و زێدە ژیری لەو پەند و قسە نەستەقانەدا کە وا بەهەمەحاڵ تەعبیر لە زات دەدەنەوە بەڵام زاتی مەرد و ژیر.

لەبەرەو دوای ئەم بەشەی نووسینەکەمدا بە پێویست دەزانم یەک دوو ڕوون کردنەوەی کورتیلە بخەمە سەر هەندێک لەو بیروڕایانەی لە شێوەی کەڵە کردن بە دوا یەکتردا هاتن:

ڕوون کردنەوەی یەکەم ئەوەیە کە وا من هەرچەند دەزانم لە مێژوودا «دەسەڵات» لەسەر تاکە بنەمای چەوساندنەوە هەڵ نەستاوە، پتر لە عادەت حەز بە نەبوونی دەسەڵاتی ناڕەوا دەکەم پتریش لە عادەت پێی سەغڵەت دەبم، بۆیەشە وەها بەڕاشکاوی هەڵوەستی بە فیز و نازی شۆڕشگێڕان تاوانبار دەکەم: شۆڕشگێڕێک کە ڕێ بە خۆی بدات لە سەرەک عەشیرەتێکی دەوری حامووڕابی نارازی بێت دەبێ شەرم بکاتەوە لە شکاندنەوەی فەلاحێکی ئەم سەردەمە کە بە پێی قەناعەتی خۆی داوای مافێک دەکات بەڵام لەگەڵ باوەڕی شۆڕشگێڕەکەدا ڕێک ناکەوێت.

هەر لە زیمنی ئەم ڕوون کردنەوەیەدا دەڵێم چی گوتم لە بارەی سوودی دادگا و یاسای کۆنینە بۆ هەژاران، بەیانی ڕاستییەکی مێژووییە نەک بانگ هێشتنە بۆ خامۆشبوون لە یاسای ناڕەوا و دادگای بە پێچ و پەنا، هەروەک کە بڵێم هەبوونی

کۆلکە حەکیمان بەر لە صەدان ساڵ چاکتر بوو لە نەبوونیان ئەوە ناگەیەنێت کە من کۆلکە حەکیم بەسەر خاوەن شەهادەی F.R.C.S دا تەرجیح دەدەم. دەبێ قسەکانم بدرێتەوە بەو سەردەمانەی لە بارەیانەوە دواوم.

ڕوون کردنەوەی دوەم، کە وا تاڕادەیێک دووبارە کردنەوەی سەرنج ڕاکێشانێکی پێشووترە، ئەوەیە کە لەو ڕەخنانەی من لە بیرکەرەوەی ماددییم گرتوون دەبێ حیسابی ئەوەم بۆ بکەیت کە وا بەشێکی زۆری شتە ڕەخنەلێگیراوەکان ئاکام و ئەنجام و بەرهەمی نەزەریەکەیەتی نەک قسەی دەقاودەق و پاتەوپاتی، وەک ئەوەی کە ئەو پێی گوتم «بە گۆڕانی هۆی بەرهەمهێنان، هەموو شت دەگۆڕێ» لزوم نامێنێ بە قسەی ڕەق ئیلیغای ئیرادەم بکات چونکە ئەنجامی نەزەریەکەی دەوری منی لەغوو کردوە، بگرە منی تێبردوە. بە نموونە دەڵێم ئەو کەسەی کە دەڵێ ئاسمان بەدەوری ئەرزدا دەخولێتەوە لە هەمان کاتدا گوتوەتی خێرایی سووڕانەوەی بەشێک لە ئەستێرەکان صەدان میلۆن جار هێندەی خێرای ڕووناکییە چونکە کە بزایین ئەو ئەستێرانە مەسافەی یەک ملیۆن «ساڵی ڕووناکی» لە ئەرز دوورن دەبێ بە خێرایی هەزاران هێندەی ڕووناکی بگەڕێن ئنجا بتوانن لە شەو و ڕۆژێکدا دەوری ئەرز بدەنەوە، کابرای خاوەن قسەکەش ڕێی نییە ئینکاری ئەم ئەنجامە بکا بەوەدا کە گۆیا ئەو لە دەقی قسەکەیدا شتی وەهای نەگوتوە. پێویستە خوێنەر لە زۆر جێگەدا بیری ڕوونی خۆی بداتە پاڵ بابەتی خوێندنەوەی بۆ ئەوەی سەرلەبەری چەشمەندازی بەر ڕووناکایی نووسینەکە بەسەر بکاتەوە.

دوای ئەم ڕوون کردنەوەنەش دەڵێم قسەکانم زەرەر لە کەس و لە هیچ نادەن.

«...»

لێرەدا بەشی یەکەمی ئەم نووسینە بە کۆتایی دەگات. لە سەرەتاوە بەر لە پێنج ساڵ کە دەستم کرد بە نووسینی باسەکە هەمووی یەک نەفەس و یەکسەر بەدوا یەکتردا هات. ئێستاش کە کەوتمە سەر ڕێکخستن و بڵاو کردنەوەی هەمان یەک نەفەسی کۆنی پاراست بەڵام گەلێک خۆی لەبەریەک کێشایەوە و شریتەی درێژ بۆوە تا ئەو ڕادەیەی کە دەشێ چاو و مێشکی خوێنەر ماندوو بکات بە تایبەتی کە دەزانم باسەکە لەوپەڕی وشکیدایە و هیچ شلکی و نەرمی تێدا ڕەچاو نەکراوە. ئەمە لە لایێکەوە، لە لایێکی دیکەشەوە ئەو هێندەی کردم بە بەشی دوەم بە تەواوی وەک ڕووی دوەمی سکەیە کە وا تەواوکەری ڕوەکەی دیکەیەتی بەڵام هەردوو ڕوو پشت لە یەکترن ئەگەر نەڵێم پێچەوانەن. لە بەشی یەکەمدا، لە پەراوێزی زاتیەتی مرۆڤ، بە شێوەی بنجی باسی ڕووی «ایجابی»ی هۆشم کردوە کە دەکاتە ڕووی تێگەییشتن و بۆچوونی ڕاست و لێکدانەوەی ژیرانە [هەرچەند بە پێی پێویستیش ناوناوە دەوری ڕوە سەلبییەکەش هەڵاتووم]. لە بەشی دوەمی ئەم نووسینەدا دێمە سەر باسی دەوری «سلبی»ی هۆش کە بەپێی باوەڕی من لە هیچ ڕوویێکەوە سەر ناگەیەنێتە سوود و بەرژەوەند. بەڵکوو لەماڵکاوڵی و ڕەنج بەخەساری و بەفیڕۆ ڕۆییشتن بەولاوەی تێدا نییە. تا کاتێک بەشێکی تر وەیا بەشەکانی تری ئەم نووسینە دەخوێنیتەوە، چی لێرەدا خراوەتە بەر چاوت ئەوە دەهێنێت کە هەر نەبێ وەک تەختەی دامە و شەترەنج نەختێکی لێ ڕابمێنیت.

«...»

مەسعوود محەمەد

«مرۆڤ و دەوروبەر» - بەشی دوەم

چاپخانەی «کۆڕی زانیاری عێراق». بەغدا 1984

نرخی دوو دینارە.

شەش هەزار دانە لەم کتێبە لەچاپ دراوە.

مێژووی لێبوونەوە لە چاپ 15-05-1984

لە کتێبخانەی نیشتیمانیی بەغدادا ژمارە 660ی ساڵی 1984ی دراوەتێ.

«...»

بەدوا ئەوەی لە بەشی یەکەمدا گوترا دەبێ ئێستا لەم بەشەدا هەنگاوێکی یەکجار بەرفرەوانی دیکە بەلای زاتییەتی مرۆڤەوە هەڵێنین کە لەوێدا ترسی دوانەتی Dualism بەجارێ ئەو بیریارانە دەتۆقێنێ کە لە دانهێنان بە دەوری ڕابەر و سەربەخۆی هۆش و زات هەڵدەهاتن. ئەگەر لایەنی هۆش و تێگەییشتن و ئیرادە و زات لەوانە بێ بیرکەرەوەی ماددی بهاوێتە سەر باری دۆزینەوەی تەعلیلی ئەوتۆ نەزەریەی ماددی لە داوی دوانەتی ڕەها بکات، وێنەیەکی دیکەی هۆش و زاتی مرۆڤ هەیە پێچەوانەی ئەو وێنەیەتی کە تا ئێستا لێی دەدواین. ئەو وێنەیەش شێوەی سەلبیی هۆش و تێگەییشتنە کە دەکاتەوە تێنەگەییشتن و ڕاست بە غەڵەت گۆڕینەوە و چاکە بە خراپە دانان و ئەو تەرزە وێنەی وەها بەرەواژ کە ئەویش بە درێژایی عومری هەزاران ساڵەی مرۆڤایەتی کاری زاتی نابەجێی کردوە و هەمیشە بۆتە زرەپارسەنگی ئەو دەستە تەرازوەی کە چالاکیەکانی لایەنی تێگەییشتن و دروستدیتن و لێکدانەوەی ڕاستی هەڵگرتوە: ئا لەم مەیدانە سەرەوبنەدا بیرکەرەوەی ماددی دەبێ بۆ پەڕاندنەوەی فەلسەفەی ماددیی تەقلیدی لە تەگەرەی «دوانەتی» وەها خەریکی سازاندن و گونجاندن و کەلێن گرتن و چاوبەستەکێ بێت کە واقیعی بەستەزمان هیچی بەسەر هیچەوە نەمێنێ.

لە مرۆڤدا هێزی هۆش [بە واتای بەرفرەوانیەوە کە هەموو لایەنە پێزانەکانی دەگرێتەوە] کە ئەمرازی تێگەییشتن و هەموو چالاکیە فکریەکانی مرۆڤایەتییە، زۆر بەسەیری، هەر خۆی سەرچاوەی بەهەڵەدا چوون و لێکدانەوەی بەرەواژ و بۆچوونی چەوت و گومڕابوون و تێکڕای ئەو تیوەگلانە فکرییانەیە کە تەنها لە مرۆڤدا بەدی دەکرێت و هەرگیز گیانلەبەری بێهۆش بە خۆی و غەریزە سافیلکەکەیەوە دووچاری نابێت.

باسی دەوری سەلبیی هۆش تا بڵێی بەربەرەڵڵایە و تا بشڵێی بە گرێوگاڵە هەر نەبێ لەبەر ئەوەی کە جارێ کەس بە جۆری سەربەخۆ لەسەر ئەم لایەنە زیندە وێرانکەرەی هۆش نەدواوە. وەها دەبێ دەخوێنیتەوە وەیا دەبیەیت کە فڵانە شت لەبەر نەزانی وەیا بەسەهوو چوون وەیا بێ تەگبیری... هتد... سەری نەگرت، بەڵام

لە قسەکاندا ڕووناکییەک نادۆزیتەوە هۆی ڕاستینەی ئەم دیاردە بەرچاوەی نەزانین و بەسەهووچوون و کاری بەرەواژ و نابەرژەوەندی بەدەستەوە بدات. خۆ ئەگەر هەموو جارانیش لە باس کردنی تاک تاکی ئەو تەرزە حاڵەتانەدا نووسەران و زانایان بۆچوونی ڕاست و دروستیان بەکار هێنابێت. دیسانەوە هەر ماوە یاسایەکی گشتی بۆ لایەنی سەلبیی هۆش و بڕیارە نادروستەکانی دابندرێت وەیا هەر نەبێ لەبەر تیشکی نەزەرەیەیەکی تازەدا سەیری بکرێت.

تا ئێستا لە خوێندنەوەمدا هیچ نووسینێکم نەدیتوە دەوری ئەو دیاردەیەی دابێت کە وا خەریکم لێرەدا بە پێی تێگەیشتنی خۆم ڕوونی بکەمەوە، سەیریش لەوەدایە من یەکەم جار شتێکم لەم باسە نووسیبێ لە ساڵی 1947 بوو ئەویش بە عەرەبی لە نێوان باسێکی بەر بڵاوتردا، هەر لە بیریشمە ئەم دەستە ڕستەیەم بەکار هێنابوو:

«فليس قصارى العقل ان يمتنع عن تفسير الاشياء التي لايفهمها وانما هو يفسرها تفسيرات خاطئة»

واتاکەی ئەمەیە: «ئەوپەڕەکەی هۆش ئەوە نییە واز لە تەفسیری ئەو شتانە بهێنێت کە تێیان ناگات، بەڵکوو تەفسیری هەڵەیان بۆ دەهێنێتەوە». دوای 30 ساڵ لەو نووسینە دەبینم هیچ ڕەخنەیەکم لێی نییە و زۆری لێ ڕازیم، تەنانەت دەشێ ئێستاکە بیکەمە دەروازە بەرەو ناوەڕۆکی درێژەی باسەکە و بڵێم:

هۆش، وەیا بە تێکرایی لایەنی هەست و زانینی مرۆڤ دوو ڕووی پێچەوانەی یەکتری هەیە: یەکێکیان ڕووی بەرەو تێگەیشتن و دروستبینی و دۆزینەوەی ڕاستی، ئەوی دیکەشیان نەزانی و حەپەسان و وڕێنەی ئەفسانەیی و هەڵەدۆستی... دیارە یەکەمیان ڕوە «ایجابي» و پەسەندەکەی هۆشە ئەوی دیکەشیان ڕوە «سلبي» و ناپەسەندەکەیەتی. لە ئاست ئەم دیاردەیەدا من کاتی خۆی هەر لەو نووسینە کۆنەمدا گوتبووم و ئێستاش دەڵێمەوە: هەرچەند لە حەقیقەتدا زانین و نەزانین. ڕاستی و وڕێنە، هەمووی هەر بەچکەی هۆشن بەڵام وەها لە هۆش دەوەشێتەوە بڵێین لایەنە پەسەندەکە بەچکە شەرعییەکەیەتی و ئەوی ناپەسەندیش بەچکە زۆڵەکەیەتی چونکە دیارە ئامێری زانین و دۆزینەوە باری ڕاستی شتان لە مرۆڤدا هۆشە، کە لە مرۆڤیشدا تەنها ئامێر بێ لە هەموو جیهاندا هەر تەنهایە. بە

هەموو دڵ و دڵنیاییەوە دەڵێم ئەو فکر و باوەڕە چەوت و چویێرەی کە ئادەمیزاد دەخاتە سەرخۆ بەقوربان کردنی مرۆڤی فێڵباز و درۆزن، بەڕاستی، بەچکە ناشەرعییەکەی هۆش و گۆشیەتی، بەدرێژایی مێژووی کۆنیش کە بوتی پەرستوە هەر پابەندی بەچکەیەکی زۆڵی هۆشەکەی بوە.

لە بەشی یەکەمی ئەم نووسینەدا، کە باسی دەوری سەربەخۆی هۆشم دەکرد و پێش دەوری مادەم دەیەخستەوە، بەشێوەی گشتی، لە ڕابەرایەتی و یەکەمینایەتی دەوری لایەنی «ئەریتی» ی هۆشم دەکۆڵیەوە هەرچەند ناوناوە بۆ زێدە جێگیربوونی قسەکانم دەورە «نەریتی» یەکەشیم دەکردە پاڵپشت، جا ئێستا پێویستە بڵێم بەشێکی زۆر ئاشکرای کارەساتە بەدەکانی مێژووی ئادەمیزاد لەوانە بوون بە چاوی کراوەوە دوای لێکدانەوەی ئاکامی باش و بەدیان بڕیاری کردنیان دەردەچوو، واتە ئەگەڕێتەوە بۆ ئەو ڕوەی ناومان نا ڕووی «ئەریتی - ایجابي» چونکە ئێمە مەبەستمان لە سەلبی و ئیجابیی دەوری هۆش لە کۆمەڵایەتیدا ئەوەیە ئاخۆ مرۆڤ هەستی بە چاکە و خراپە و چەوتی و ڕاستیی ئەو شتانە کردوە کە باوەڕی پێ هێناون و بۆیان کۆشاوە یاخود لەلایەن «نەریتی - سلبي»ی هۆشەوە وەک ئالەت بەرەو ئەو شتانەوە پاڵی پێوە نراوە.

ئێمە کاتێک کە باسی زاتی مرۆڤمان کرد هەقمانە هەموو کارە بەدەکانی کە بە چاوی کراوەوە کردوونی لەسەر لایەنی سەلبیی زاتەکەی حیساب بکەین هەرچەند لەو حاڵەشدا یەکەمینایەتی خۆی بەرانبەر دەوروبەر و ماددە پاراستوە. بەڵام لە حاڵی ئاگا لە خۆبووندا کاری بەد ناکێشێتەوە سەر لایەنی سەلبیی هۆش چونکە مەرج نییە زاتی سەلبی لە هۆشی سەلبییەوە بەوەلەد هاتبێت. بە نموونە دەڵێم دز لە حاڵەتی دزی کردندا هۆشەکەی بەخەبەر و بەئاگایە و دەزانێ خەریکی کاری ناڕەوایە و قانوون دەیگرێ و خەڵقیش تاوانباری دەکەن، کەچی لە حاڵەتی تەنەکە لێدان بەرانبەر مانگگیران هۆشی مرۆڤ بەتەواوی هێڕ بوە و بۆتە گومڕایەکی سادە چونکە ئەو تەنەکە لێکدانە لە هیچ ڕووێکەوە خزمایەتی لەگەڵ هیچ ڕاستییەکی ئەم جیهانەدا نییە، هیچ سوود و بەرژەوەندی ناڕەواش بە تەنەکە لێدەرەکە ناگەیەنێ وەک کە ماڵی دزیاری سوودێکی ناڕەوا دەخاتە گیرفانی دزەوە، تەنانەت لەوانەیە تەنەکەلێدەردەکە زاتێکی پاک و چاکیشی هەبێ. ئا لێرەدا نەبوونی زەرەری تەنەکە

لێدانەکە پاکانە بۆ «هۆش» ناکات چونکە مەبەستمان کولی و برشتی هۆشەکەیە نەک نەبوونی زەرەر و سوود لە کردەوەدا: هۆشی دز کول نەبوە هەرچەند کارەکەشی بەدە، تەنانەت ئەگەر تێشیدا بکوژرێ هەر نالێین هۆشەکەی پەککەوتە و کولە، بەڵام کە هات و بە فەرماییشتی فێڵبازێک و بە نییەتی چوونە بەهەشت دزیی کرد ئەوسا هۆشەکەشی کولە و کارەکەشی بەدە.

یەکێک لە شی کردنەوەی پرسیارێکی «حیساب» هەڵە دەکات وەیا لە هەڵگرتنەوەی ئاوی رووبار بۆ سەر زەوی سەهوو لە بڵندایی و نزمایی دەکات وەیا لە دانانەوەی تەڵە ناوەستا دەردەچێ وەیا لە پلانی عەسکەری هێندەی ناپلیۆن بلیمەت نابێ... ئا لەم بارانەدا کابرای تێشکاو هۆشکول و سەلبی نەبوە چونکە ویستوویەتی بەقەدەر حاڵ لە رێبازی روون و راستەوە بەرەو ئامانج بروات بەڵام هۆیەکی زاتی [غەیری سەلبییەتی هۆش] وەیا هۆیەکی دەرەکی بۆتە لەمپەر لە پێش هەنگاوە دروستەکانی هۆشیدا. لەو تەرزە بارانەدا دەتوانین بڵێین کابرا زێدە زیرەک نییە وەیا ماویەتی بەتەواوی بڕەسێت. بەڵام هەر هەمان کابرای کە بروسکەی دیت و بیری بۆ قەمچیی فرشتان رۆیی کە لە شەیتانانی دەوەشێنن وێنەیەکی زیهنی سەرانسەر هەڵە و نادروستی بەهزشدا هاتوە کە ئەگەر لە بنەڕەتدا نەیسڕێتەوە رێ نییە وێنەی راست بێتە جێگەیەوە. زاناکانی یۆنان لە کۆنەوە بۆ ئەوە نەچووبوون کە بروسکە دیمەنی چالاکیەکی کارەبایە، نەشیان دەزانی کارەبا چییە، بەڵام دەیانویست تەعلیلی لە سروشتەوە بۆ بهێننەوە نەک بیگێڕنەوە بۆ جندۆکە و شەیتان و هێزی ئەفسانەیی. لەمەوە دیارە ئەو زانایانە لە بروسکە ویستوویانە لەگەڵ زانست و مەنتیق جووت برۆن، هەروەک کە منداڵ لە رێی فراژیبوون و ئەزموونەوە دەگاتە گەنجایەتی و کامڵی و پێگەییشتنەوە. پلەی بەرەژێری زانست و ئەزموون بەعیبی هۆش حیساب ناکرێ، بە پێچەوانە دەتوانین بە پلەی غونچەی بەرەو کرانەوەی لەقەڵەم بدەین.

لەم لێکدانەوەی ئێستا لەبەر دەستدایە دەنۆڕینە ئەو لایەنە یەکجار سەلبییەی هۆش کە بە تەواوی بەرەواژە و هەرگیز لە خۆیەوە بەرەو ئەرێتی «ایجابیة» ناڕوات. هەرچی لایەنی ئیجابیی هۆشە بە بەرییەوە هەیە لە حاڵەتی بە سەهوو چووندا هەر لە عەینی ئەزموونی سەهوەکەوە بارە راستەکەی بدۆزێتەوە. بۆ پتر روون

کردنەوەی مەبەست دوو نموونە دەهێنمەوە، یەکێکیان بۆ «ایجابیة» و ئەوی دیکەیان بۆ «سلبیة» ی ئەو هەڵە و سەهوەی هۆش تێی دەکەوێ.

بۆ حاڵەتی بەسەهووچوونی «سلبی» هۆش لە سروشتەوە نموونە دەخوازمەوە و دەڵێم کە مرۆڤ وای زانی فرتەنەی دەریا لە هەناسەی عەزیای جەهەنەمەوە پەیدا دەبێ هەتا هەتایێ بە لێکدانەوەکەیدا بێت و بچێت ناگاتە هیچ ئەنجامێکی دروست. ڕەنگە هەرجارە جۆری قوربانی دان و خۆ بەسەدەقە کردن بگۆڕێت وەیا عەزیاکە لە جەهەندەمەوە بۆ پشت چیای قاف و جزیرەی واقلواق ڕاگوێزێت، بەڵام هەرگیزاوهەرگیز هیچ تیشک و تروسکەیەک لەو ئەفسانەیە هەڵناسێتەوە کوێری و هەڵەکەی ڕوون بکاتەوە چونکە هیچ تروسکەی حەقیقەتی تێدا نییە زهین نەیدیتبێ وەک کە لە حەقیقەتی شرایەوەدا هەیە: دەرچوون لەو هەڵەیە هەر بەوە دەکرێ کە مەسەلەی عەزیا لە بنەڕەتەوە ڕەفز بکرێ و بۆچوونێکی بەرەو ڕاست بخرێتە جێگەیەوە.

بۆ حاڵەتی بەسەهووچوونی «ایجابی»ی هۆش نموونە لە ڕیازیات دەهێنمەوە: قوتابی کە لە پرسیارێکی حیسابدا وەها دادەنێ 6x6=38 دەشێ بزانێ 38 لەگەڵ پرسیارەکە ناگونجێ ئیتر بە لێکدانەوەیدا بێتەوە و ڕاستییەکە بدۆزێتەوە. بەهەمەحاڵ ئەم 38 ـە لە تەختەی زانستی حیسابدا سێبەریشی نییە.

لەم هەڵسەنگاندنەی دەوری لایەنی سەلبیی هۆش دووچاری لێکدانەوەی بێبڕانەوە دەبین چونکە پەیدابوونی ڕووی سەلبیی هۆش و ڕووی ئیجابیی هۆش بەیەکەوە لەگەڵ پەیدابوونی هۆشەکە خۆی سەریان هەڵداوە، خۆ ئەگەر قسەکە خوردتر بکەینەوە دەبێ بڵێین ئەوەی ناوی دەنێین ڕووی سەلبی و ڕووی ئیجابی، پێکەوەیان، سەرلەبەری ناوەڕۆک و سروشتی هۆش پێک دەهێنن نەک تەنها دوو ڕووەکەی چونکە ئەو هۆشەی شتان دەزانێ وەیا بەرەو زانینانەوە دەچێ هەر خۆیەتی لە ئاکامی بۆچوونی نادروست وەیا دەسخەڵەتدان غەرقی ئەفسانە دەبێ. لەبەر ئەمە ئەگەر مەبەست ئاسان کردن و تێگەیاندن نەبێ زەحمەتە خەتێکی جوداکەرەوە بە نێوان سروشتی سەلبی و ئیجابیی هۆشدا بکێشرێت هەرچەند ئەنجامەکانیشیان ئەمسەر ئەوسەر و ئەمپەڕ ئەوپەڕ بن.

ئەم زەحمەتیەی لە یەكدی جودا كردنەو▪ قابیلیەتی ئیجابی و سەلبیی هۆش وردتر و تەماویتر▪ لە جوداكردنەوەی دەوری پەسەند و بەدی زات چونكە دەشێ زاتی بەد بەوپەڕی هۆش و گۆشەوە پلان بۆ نیازە ناپەسەندەكانی خۆی دابنێت و ژیرانە لە سەری بڕوات. لەمەش پتر: هەر چونكە زاتی بەد هۆشەكەی سەلبی نییە دێت ناوناوە كاری پەسەندی بچووک دەكات بۆ بەجێهێنانی نیازە بەدە زلەكانی خۆی، كەچی هۆشی ئەفسانەپەرست و گومڕا هەست بە گومڕابوونی خۆی ناكات، بگرە لە ناخی دڵیەوە وا دەزانێ خەڵقی دیكە گومڕان، ڕەنگە بەزەییشی پێیاندا بێتەوە وەیا لەعادەتبەدەر ڕقیان لێ هەڵبگرێ. بەڵام نابێ لە بیر بكەین كە بابای زات بەد هەموو جاران و لە هەموو كاراندا خاوەنی هۆشی ڕووناک نییە چونكە دەشێ ئەویش وەكوو كەڕەواری دیكە لە ئاست گەلێک دیاردەی ئەم جیهانەدا هۆشكول و تاریک بێ وەک ئەوەی كە بە زۆری دز و ڕێگریش لە كاتی مانگگیراندا تەنەكە لێ دەدەن وەیا پێڵاوی شێخی درۆزن ماچ دەكەن، هەر بەو پێیەش كابرای هۆشتاریک كە تەنەكە بۆ مانگگیران دەكوتێ دەشێ لە ئاست دیاردەیەكی دیكەدا هۆشكول نەبێت و پێی شێخی درۆزن ماچ نەكات. خولاسە هەروەک مەرج نییە زاتی بەد هەمیشە هۆشتاریک بێ وەیا هەمیشە هۆشڕووناک بێ، مەرجیش نییە زاتی پەسەند هەمیشە هۆشتاریک وەیا هۆشڕووناک بێ. ئاپۆرەی خەڵق لەم مەیدانەدا مزاشن.

زەحمەتیەكە جارێكی دیكەش لەوەوە پەیدا دەبێ كە دەبینین زۆر جاران خاوەنی هۆشی جنۆكاوی، وەک گوتم، زاتێكی چاک و پەسەندی هەیە كەچی زانایەكی ئاتۆم زاتێكی زۆر بەدە، بەمەشدا هەموو حیسابێكی سەر بە «هۆشی ڕوون و زاتی بەد» مان لێ تێكەڵ دەبێ چونكە وەک دەزانین سنووری نێوان هۆش و زاتیش یەكجار باریک و نائاشكرایە. لەگەڵ ئەمەشدا دەبێ بوێرین لە لێكدانەوەماندا نەهێڵین لایەنی «اخلاق» كە زاتی بەد چاكی پێ هەڵدەسەنگێ بەسەر بۆچوونەكانماندا زاڵ بێت نەكا هەست و هۆشمان بۆ خۆی بدزێتەوە و بمانكا بە پەندیار و ئامۆژگار. دەبێ لە دۆزینەوەی حەقیقەتی هەموو كێشەیەكدا بەولای بەزەیی و لایەنگیری و ڕق لێبوونەوەوە بچین تاكوو لە بەندی عاتیفە و حەزی شەخسی ڕزگار بین و بێ چاویلكەی تەرەفداری سەیری پرسیارەكە بكەین.

دیسانەوە دووچاری زەحمەتی دەبینەوە کە بێین جوداوازیی نێوان سەهووی لایەنی ئیجابیی هۆش بە کوێرەواری لایەنە سەلبییەکەی بگرین چونکە جوداوازیەکە هەموو جاران هێندەی فەرقی نێوان سەهووی حیساب و گومڕایی تەنەکە لێدان ئاشکرا و سێنایی نییە، بەتایبەتی کە ئاکامی سەهووی هۆشی ڕوون سەر بکێشێتەوە بۆ ماڵوێرانی و دڕندەیی کە ئیتر ناتوانین دڵی خۆمان بەوە خۆش بکەین گۆیا گرفتاری هەڵەی هۆشی سەهووکردوو بووین نەک تاریکستانی هۆشی ئەفسانەیی و جنۆکاوی.

بە نموونە دەڵێم چ فەرقێک نییە لە نێوان ئەو جەنگەی لە سەر دوو جۆری بوتپەرستی هەڵدەستی لەگەڵ ئەو جەنگەی لە ئەنجامی تێک نەگەییشتنی دوو بەرەی زیرەک بەرپا دەبێ: کێ دەڵێ بوتپەرستە هۆشکولەکان زووتر لە ئاقڵە زانا و ژیرەکان کۆتایی بە شەڕەکە نامێنن. بەڵام ئەم تێکەڵپێکەڵیەی کە نامێڵێ فەرق بە زەللەی هۆشی سەهووکردوو و هۆشی ئەفسانەدۆست بکرێ ئەوەندە زۆر و دائیمی نییە تۆژینەوەی دەوری هۆش و مادده وەیا هۆشی تاریک و هۆشی ڕووناکمان لێ مەنع بکات.

بەهەمەحاڵ دۆزینەوەی باری لێکدانەوەی ڕاست و دروست لە کۆمەڵایەتیدا چەندێکی ورد و زەحمەتیش بووبێ ئامانجی مرۆڤ بوە لەوەتەی مرۆڤایەتی داهاتوە. ئێمە ئەگەر لە ڕێی هەست کردن بە دەوری سەلبیی هۆشەوە بتوانین پتر لە کۆمەڵایەتی و مێژوو و ڕوەکان و ڕووداوەکانیان بگەین و هۆی ڕاستبنەی چاکە و خراپەی ڕۆژگارانی لێرە بەپێشەوە بزانین چ زەرەر ناکەین ئەگەر ناوناوە سنووری بەسەهوو چوونی هۆش و سنووری کوێرەواری ئەفسانە بگەنەوە یەکتر وەیا تێکەڵ بن، خۆ ئەگەر ئەم لێکدانەوەیە نەکەین سنوورەکان هەمیشە تێکەڵی یەکدی دەبن و هەستیشی پێ ناکەین. ئا لێرەدا وێنەیەکی دیکەی تێکەڵبوونی ئەم سنوورانەت بۆ باس دەکەم گەلێک عەنتیکەتر و «زاتیتر» و ئاڵۆزبڵۆز و بەئازارتریشە لەوەی تا ئێستا لێوەی دواوین، تێکەڵبوونەکەش تا بڵێی ئاشکرایە بەڵام چاو بەسەریدا دەکشێت و نای بینێت:

وا دەبێ ئەو ڕێبازەی کە خوێندەوار و مامۆستا و ڕابەر و هونەرکار بە سەریدا دەڕۆن بە هۆی کۆنبوونیەوە دەوری چاک و سوودبەخشی بەسەر دەچێت هەرچەند

لە بنەڕەتدا بە تیشکی زانست و تەجرەبە و بەرەوپێشچوون نەخشەی کێشراوە، بەڵام لەگەڵ بەسەرچوونی دەورەکەی و پێویستبوونی گۆڕینی بە ڕێبازێکی بەرەوپێشتر، بەشی زۆری ئەو ڕووناکبیرانە و ڕابەرانە وەک سۆفی و دەروێش کە پەنجە لە زەرگ و تەپڵ و دەفە گیر دەکەن، ئەوانیش بە شێوەیەکی جەزبەگرتوانە پێ لەسەر ڕاستبوون و پیرۆزبوون و دروستبوونی ڕێبازەکە دادەگرن و گیانبازیی بۆ دەکەن و بە بەژن و باڵایدا هەڵدەڵێن، بەوەشدا یەکجارەکی لە نوێ دۆستی و پێشکەوتن خوازی و خەسڵەتی ڕابەرایەتی دەتارێت و دەبنە جندرمەی کۆنەپەرستی و تاریک بیری و پاشەکشە و ستەم. دیارە لەم حاڵەتەدا دەوری سەلبیی هۆش بەدوا کاتەوە دەستی پێکردوە نەک لە سەرەتاوە، سەلبییەتەکەش وەک دەبینیت گۆڕانی ئیجابییەتە بە سەلبییەت. کەواتە لێرەدا حاڵەتێک دێتە بەرچاو کە بریتییە لە سەلبییەتی تەواو بەڵام لە بنەڕەتدا بەچکەی لایەنی سەلبیی هۆش نییە وەک ئەفسانە لە سەرەتاوە و یەکسەر بەرهەمی سەلبییەتی هۆشە.

ئەم دیاردەیە بێ زیاد و کەم وەک ئەوەیە ڕووناکی بزێت و تاریکایی لێ بەربێتەوە وەیا تیشکی ڕەش لە ڕۆژ هەڵستێتەوە. لێشتەوە دیارە بایی سەری دەرزی مەوزوعییەت لە مەسەلەکەدا نییە، بە پێچەوانە، دیاردەکە وەها لە زاتییەت ڕۆ چوە و تێیدا خنکاوە و ئاوەژووی ڕووکاری نەدیو بۆتەوە هەر دەڵێی خۆی لێ بزر بوە. ئەم خەسڵەتەی خۆ دانە پاڵ شتی ئاشنا و مەئلووف، لە نووسیناندا باس دەکرێت و دەبردرێتەوە بۆ خوە زۆر مەشوورەکەی Conservatism کە لە عەرەبیدا «روح المحافضة»ی پێ دەڵێن و لە کوردیشدا جارێ زاراوەی بۆ دانەندراوە[14]. ڕاستییەکەی، ئەم تەرزە باس کردنە ڕاڕەوییە لە سێ لاوە ڕەخنەی لێ دەگیرێ:

---

[14]- ڕەنگە وا باش بڵێین: [کۆنەپەرست = رجعي. کۆنەخواز = معجب بالسلف. کۆنەوار = محافظ] وشەی «کۆنەوار» وەک وشەکانی «کەڕەوار، خوێندەوار، کوێرەوار، ئاستەوار» لە ڕێی دەستووری وشەسازییەوە داتاشراوە، ناشبێ خەیاڵ بۆ «کۆنەهەوار» بڕوات کە کورت دەکرێتەوە دەبێتە «کۆنەوار».

یەکەم: لەوەدا کە خەسڵەتەکە بە هەند هەڵنەگیراوە و چ حیسابی بۆ نەکراوە نە لە رووداوی گشتی مێژوویی - کۆمەڵایەتی و نە لە کردەوەی تاکدا. هەر دەڵێی ئەویش وەک هەناسە هەڵهێنان و پێکەنین و نووستنە کە ئەنجامی کۆمەڵایەتی نادەنەوە.

لای دوەم، ئەوەیە لەبەر حیساب بۆ نەکردن و تێنەخوێندنەوە کەس لێی قووڵ نەبۆتەوە بۆ سەرچاوەی و بۆ جۆرەکانی و ئاکامەکانی و بۆ هیچ سەروبەرێکی، کەچی هەموو شتێکی سەر بەم دیاردەیە بە درێژایی عومری مرۆڤایەتی بەردەوام و بەرچاو و کاریگەر بوە تا ئێستاکەش کاریگەربوونی لە چاوان دەچەقێ.

لایەنی سێیەم، ئەوەیە کە خەسڵەتی «کۆنەواری» هەموو جاران لەگەڵ ئەم سەلبییەتەی لێرەدا خەریکی باس کردنین یەکدی ناگرنەوە چونکە لە بنەڕەتدا کۆنەواری کەرستەی لەسەرخۆ کردنەوە و بەردەوامبوونی مرۆڤ بوە بەو مانایە کە باوەش بە ڕابردوودا گرتن خۆ بەستنەوەیە بە سەرلەبەر و سەرجوملەی مرۆڤایەتی بە ئێستا و ڕابردوویەوە، دیارە «ئێستا»ش دەبێتەوە ڕابردوو تەنانەت دوارۆژیش دەبێتە ئێستا و ڕابردوو. بەو پێیە کۆنەواری مەعقوول و لە سنوور نەترازاو ڕێ نادا، بێلزوم، دەماری پێوەندی قۆناغەکانی ژیان (هی تاک و کۆمەڵ) هەڵبڕێتەوە بەمەشدا تاڕادەیەک دەرفەتی تێژڕۆ و پەلەکەر تەسک دەبێتەوە و وێرانکاریی پەرگیران درەنگتر دەست پێدەکات، ڕەنگە زەحمەتتریش سەرکەوێت. کۆنەواری عادەتی کە هارمۆنی ژیان و بەسەبردن دەپارێزێ و تام لە ڕایەڵەکانی پێوەندی کۆمەڵایەتی دەگێڕێ، کە هات و لە سنووری پێویست دەرچوو و ڕێی لە داهاتی تازەی سوودبەخش گرت تێکەڵ بە ڕوە سەلبییەکەی هۆش دەبێ.

خۆ بەستنەوەی زانا و ئەدیب و هونەرکار بەو باوەڕە ڕێزلێگیراوانەی کە دەوریان بەسەر چوە و بوونەتە لەمپەڕ لە پێش تێهەڵکشین و بەرەوپێشچوونی کۆمەڵایەتی، هەڵدەگرێ دەمەتەقە لەسەر بنگە و بناوانی بکرێ، بەڵام بێگومان بە هیچ جۆرێک پێوەندی بە مەوزوعییەوە نییە مەگەر پێوەندی دژایەتی و پێچەوانەیەتی وەک کە بڵێین ساردی پێوەندی بە گەرمییەوە هەیە لەو ڕووەوە کە بە نەمانی گەرمی ساردی پەیدا دەبێ. هەڵبەت کە دیاردەکە مەوزووعێ نەبوو هەر دەمێنێتەوە زاتی بێت ئیتر ناوێک و سەرچاوەیەکی بۆ دەدۆزرێتەوە با بدۆزرێتەوە فەرقێک بە نامەوزووعیبوونی ناکات: هەر ئەوەندەی تێدا دەبێ ئایا دابڕینی وشەی زاتی بەسەر

ئەو دیاردە و سەرچاوەیەدا بایی هێزی دیاردەکە دەکات؟ ئایا ناوی «زاتی» پڕ بەپێستی دیاردەکەیە؟ کە بگەڕێیتەوە بۆ سەرەتاکانی پەیدابوونی مەزهەبە جۆراجۆرەکانی ئیسلام دەبینیت هەر یەکەیان ناوێکی لێ نراوە مشتی خۆیەتی وەک: المرجئة، اللاأدرية، الظاهرية... سەیرێکی زاراوەی تەکنیک و زانستەکانی سەردەمیش بکەیت دەبینیت ئەوانیش بەتەواوی ڕەنگی بابەتەکەیان دەدەنەوە.

ئەوەی زێدە سەرنج ڕاکێشە لەم بەرەوژێبوونەوەی مەوزووعییەت بۆ ئەفسانە، زێدە سووربوون و پێ داگرتنی بەرەی بیری ماددییە لەسەر باوەڕە کۆن بوەکانیان، واتە بە ڕادەی داواکردنی مەوزووعییەت لە بیروباوەڕدا دەماری کۆنەپەرستییان ئەستوورتر دەبێ: بە نموونە، ڕۆشنبیری ئەو وڵاتانەی لە ڕواڵەت و نەزەریەدا دژی تاکپەرستنن یەکجار تاکپەرستترن لە ڕۆشنبیری وڵاتی وەک سوید و فنلەندە. گۆڤار و چاپەمەنی یەکێک لە وڵاتە شۆڕشگێڕەکانی ڕۆژهەڵاتی دوور هەمووی وەک داستانی ڕۆستەمی زاڵ بە شان و باهوو و قارەمانەتی و بلیمەتی و خالقیەتی سەرۆکەکەی هەڵدەڵێت. لە یەکەم ڕووپەڕی گۆڤارەوە تا دوایین ڕووپەڕەی هەر باسی یەکەمینایەتی و ڕابەرایەتی و پێغەمبەرایەتی و، بگرە خوایەتی، سەرۆکی باڵای ئەو وڵاتەیە. دەوجا فەرموو مەوزووعییەت لەو ماددییەتە هەڵێنجە کە لە قاڵبی جەماهیریەتیدا هەر خەریکی تاکپەرستیە وەک کە بابایەکی نوێژکەر لە بری «فاتحە و تحیات» هەر کفران بکات: تۆ بە چیدا دیارە دژی تاکپەرستیت؟ بەوەدا کە هەموو دەم تاک دەپەرستم. تۆش بە چیدا ئیسپاتی مسڵمانەتیت دەکەیت؟ بەوەدا کە هەر خەریکی کفر کردنم.

نامەوزووعییەتی بابای ماددی هەر لەوەندەدا ناوەستێ کە کڕنوو بۆ تاک دەبات وەیا پێ لەسەر باوەڕی کۆنینە دادەگرێ: کاری گومڕاتری ئەوەیە کە هەموو عومری لە ئیسپاتی ڕاستبوونی باوەڕە پووچەڵەکانی بەسەر دەبات و دەشبێتە ئاگر و لە عومری ئەو مرۆڤە ئازادانە بەر دەبێت کە دەزانن و دەڵێن باوەڕی ڕاست چییە و هی پووچەڵیش کامیانە.

ئەو تەرزە ڕۆشنبیرە وەرگەڕاوانە لە ڕۆژگارێکدا کە خۆیان خەریکی خەباتی نهێنی دەبن هەموو پۆلیسی نهێنی وڵاتەکەی خۆیان بە جاسووس دادەنێن کەچی دواتر کە

دەسەڵات دەگرنە دەست دەبنەوە جاسووس بەسەر غەیری تاقمی خۆیاندا، شەرمیش نایانگرێ کە شانازی بەو جاسووسیەتەوە دەکەن.

ساڵی 1959 گەورەترین لێپرسراوی بەرەی ماددی لە کۆبێ ئیخبارییەی لە چەند نیشتمانپەروەری «بەرەی یەککگرتوو» دا کە خۆی نوێنەری بەرەی لای خۆی بوو تێیدا، دواتر کە قسەکەی بە ڕوودا درایەوە وەک بوقلەموون چەتری فیز و نازی لێدا و گوتی: بە شانازییەوە بۆ لەناوبردنتان ئیخباریەتان لێ دەدەم... واش ڕێک کەوت دوای چەند ساڵێک هەمان «شۆڕشگێڕ!!» کەوتە بارێک مان و نەمانی خستە بەردەستی ئەو لایەنەی کە بە شانازییەوە لە ناوی دەبردن. ئا لەو دەمەدا کە هێز لە دەست خۆیدا نەبوو شەرەف و شانازی لەوەدا دەدیت کەوا کەس ئیخباریە لە کەس نەدات و کەس هەوڵی لەناوبردنی کەس نەدات و هەموو عالەم برا بن.

بێگومان ئەو تەرزە هەڵوەستە بەرەواژانە هەمووی زادەی زاتی گومڕا وەیا بەچکەی هۆشی تاریکهەڵگەڕاون، چ تەئویلێکی نیمچە ژیرانەش نییە بیانباتەوە سەر مەوزووعییەت و مرۆڤدۆستی. خۆ ئەگەر بە زۆرەملێش پێمان بسەلمێنن کە مەوزووعییەتی تێدایە من لە جیاتی هەموو مرۆڤایەتی دەڵێم دەک بە لەعنەت بێ ئەو مەوزوعییەتەی بریاری لەناوبردنی دڵسۆزان دەردەچوێنێ ئنجا ماوە بڵێم لەناوبردنی خەڵق بە بریاری ڕاستەوخۆی بێتەئویل بەشەرفترە لەو بریارەی بە درۆوە بەسترابێتەوە چونکە ڕاهێنانی بەرەی شۆڕشگێڕ بە درۆ خۆی لە خۆیدا تاوانێکی گەورەیە لەو ڕووەوە کە هەمیشە دەبێتە هۆی هەڕەشە کردن لە بێتاوانان کە ئیتر باوەڕ بە قودسیەتی مان و بوون و بەسەربردن، بگرە مرۆڤایەتیش، دەپوێتەوە.

بەهەمەحاڵ درۆ هەڵبەستن بۆ تاوانبار کردنی دڵسۆزان کاری مەوزووعیەت نییە، کاری زاتی پەسەند و هۆشی ڕووناکیش نییە: بەولای ناپەسەندی زات و تاریکیی هۆشەوە دەبێ زاتی کەسی درۆهەڵبەست و بوختانساز لە پەستیش ڕۆ چووبێت و دڵۆپی شەرمیشی تکابێت. ئەو کەسانەی مەوزووعییەت و سوودی گشتی لەو تەرزە و درۆیانەدا دەدۆزنەوە و بە خۆیانی ڕەوا دەبینن نایەن ئەو حەقە بۆ غەیری خۆیان ڕەوا ببینن و خۆیانی تێدا ببنە نێچیر و قوربانی، بە پێچەوانە، لەو تەرزە

حاڵەتەدا کە بوختان ڕوو لە خۆیان بکات دەبنە بولبولی هەزارداستان لە مەدحی داد و ڕاستی و برایەتی و مەوزووعییەت و سوودی گشتی...

بەداخەوە گەلێک لە مێژوونووسان بەڕاشکاوی هەڵوەستی پیاوە دڕندە سەرکەوتوەکانی بەر لە سەدان ساڵ بە هەڵوەستی مەوزووعی و دروست و پێویست دادەنێن. بەڵام ئەگەر لە ڕۆژگاری خۆیاندا سەرۆکی وڵاتەکەیان مانگێکیان حەبس بکات چ بەرژەوەند و مەوزووعییەت و سوودی گشتی لەو کارەدا نابینن بەڵکوو هەرچی شەرافەت و نرخی بەرز و ئاکاری مەردانە هەیە دژی ئەو سەرۆکە بەخەبەر دەهێنن، دامودەزگاکانی خزمەتی نهێنیشی تاوانبار دەکەن، ئیتر مەپرسە چۆن دەبنە داواکاری داد و وەفا...

هەڵبەت تێکڕای ئەم تەرزە هەڵوەستە چڵکنانە چ لە پیاوی مێژوونووسەوە بێت و چ لە بیرکەرەوەی ماددی بێت و چ لە مرۆی سەربە غەیب و میتافیزیکەوە بێت زەنەی زاتی کوێر و گومڕا و بێڕەحمن، هەتا تێشیدا قووڵتر ببنەوە پتر بە گومڕاییدا دەچنە خوارێ هەرچەند لەوەشدا بەڵگەی زانست و فەلسەفەی مەزووعی هەڵەبەستن بۆ پێویستبوونی هەڵوەستەکەیان...

ڕوون کردنەوەی تەواوی بەیەکدی گرتنی لایەنی سەلبی و ئیجابیی دەوری هۆش لە تێوەڕامانی کۆمەڵایەتی و مرۆڤایەتی هەرە کۆن چاکتر مومکین دەبێ و باشتر کاریگەرایەتی لایەنی سەلبییەکە جلوەدەبەستێ نەک ببین یەکەندەردوو یەخەی مرۆڤایەتی ئەم سەردەمە بگرین کە لە ئاکامی بەرەوپێشچوونی هەزاران ساڵەیدا دوو دیاردەی وەک «چوونە ناو مانگ» و «شەڵپتە خواردن» هێندە لەیەکدی ترازاون زەحمەتە بۆ چاوی بەپەلە ببنەوە بەچکە شەرعییەکە و ناشەرعییەکەی تاکە سەرچاوەی «هۆش». دەبێ لە سەرەتای بەیەکەوە هاتنی هەردوو لای سەلبی و ئیجابیی «هۆش» شێوەی «جمرانە» بیان ببینین، بە تەواوی وەک ئەوی کە دوو منداڵی جمرانە لە ساواییدا گەلێک پتر لەیەک دەکەن تا ئەو دەمەی کە بلووغیان دەبێت چونکە هەموو جوداوازیەکی نابەرچاوی ساوایی لە دواتردا بەرچاو و بەرهەست دەبێ. لەبەر ئەمە چاکترە لێرەدا قسەمان بۆ ڕۆژگارە دێرینەکان بگێڕینەوە، لەوەشدا بەسەر ئەو ڕێبازەدا بچین و ببێن کە فکری ماددی لێی خۆش دێت نەک ڕێبازی سەر بەغەیب کە دەزانین لەوێدا دوو شەقامە ڕێی چاکە و خراپە،

بینایی و گومڕایی، دەچێتەوە بۆ توانا و حیکمەتی کردگار چونکە ئێمە هەڵسەنگاندنی ترسی بیریاری ماددی لە فکرەی «دوانەتی»مان بەدەستەوەیە، دیارە دەبێ هەڵسەنگاندنەکەش بە کێش و تەرازووی بیری ماددی بکرێ دەنا مرۆڤی ماددی خۆی ناچار نابینێ ئاوڕیش لە قسەکانمان بداتەوە چ جایی ئەوەی بایەخی پێ بدات. ڕەنگە بەم حاڵەش نەتوانین هیچ ڕەزامەندییەکی وەدەست بهێنین هەرچەند دەشێ لە لایەکی دیکەوە پیاوی سەربە غەیب لە خۆمان بتۆرێنین بەوەدا کە تەنها بەڵگەی ماددی دەکەینەوە بە ڕەخنە لە ماددییەتە تەقلیدیەکە.

بە پێی ئەو حیکایەتەی زانایانی بایۆلۆجی و گۆڕانی گیانلەبەران بۆمانی دەگێڕنەوە و فەلسەفەی ماددیش زۆری لێ ڕازییە، مرۆڤ لە کۆنێکی زۆر کۆنەوە جانەوەرێکی وەک مەیموون و فیل و چەقەڵ بوە. لەو پلەیەدا کە جارێ «هۆش» پەیدا نەبوە ئەو گیانلەبەرەی کە بە دوایی دەبێتە «مرۆڤ» ئەویش هەر ملکەچی یاساکانی گۆڕانی بایۆلۆجی بوە بێ ئەوەی هیچ جۆرە شێوەی کۆمەڵایەتی نە بەرچاو و نە پەنامەکی لەو گیانلەبەرەدا دەرکەوتبێت. بە درێژبوونەوەی کات و کەڵەکە کردنی ئەو کاریگەرانە و هۆیانەی لە سروشتدا هەبوون ژیانی سادە و سافیلکەی گیانلەبەرە پێشکەوتوەکانی وەک تیرەی شامپانزی و گۆریللا و باپیرەگەورەی مرۆڤ بۆ پێشەوەتر و ئاگادارتری و هەستیارترییەوە بۆتەوە، بەوەدا سەرەتایەکی یەکجار کز و بێهێز و لێڵ لە هێوێنی هۆش و تێگەیشتن لە تاکە تیرەی باپیرەگەورەی مرۆڤدا ڕسکاوە. لەگەڵ ڕسکانی ئەم هێوێنەدا سەرەتای کۆمەڵایەتی لە دەوری گیانلەبەرییەوە بۆ دەوری «هۆشلەبەری» داکەوت. ئەم هۆشە سەرەتاییە بەدەم فراژیبوونێکی یەکجار سست و کزەوە بۆتە بنەمای پێوەندی و تەفاعولی تازەداهاتووی نێوان ئەو گیانلەبەرە و سروشت [وەک داتاشینی بەرد بۆ کاری ڕۆژانە - وەک پەیدا کردنی ئاگر- وەک هەڵگرتنی خۆراک بۆ دەمی پێویست - وەک پۆشاک...].

گۆڕان و بەرەوپێشچوون و هەمەچەشنەبوون و بەهێزتربوونی پێوەندی ئەو گیانلەبەرە «مرۆڤ ئاسایی»یە لەگەڵ بوونەوەردا، وردە وردە، سەری کێشایەوە بۆ داهاتنی جۆری تازەبەتازەی پێوەندی نێوان تاکەکان و کۆمەڵگە بچووکەکانی گیانلەبەرە هۆشلەبەرەکە و کەمەکەمە ژیان بەتێکڕایی ڕووەو ناسادەیی و ئاڵۆزان و

گرێوگاڵ بۆوە تا لە ئاکامی گۆڕان و بەرەوپێشچوونی سەدان هەزار ساڵەییدا نەوعی مرۆڤ بە هەموو خاسیەتە جوداکەرەوە و بەرچاوەکانیەوە پێی نایە ئەو قۆناغەی کە بە ئاشکرایی و ڕوونی دیاردەی کۆمەڵایەتی و مێژوویی بوو بە ڕاستییەکی نەوباوی هەرە گەورەی بوونەوەر [ئەم باسە دەبێ لە کتێبی تایبەتی خۆیدا سەری پێدا بگیرێ. لێرەدا هەر بایی پەنجە بۆ ڕاکێشان و پێدا تێپەڕین ڕێم هەیە دەوری هەڵبێم].

هەرچەند دەشێ زاناکانی ئەنترۆپۆلۆجی و مێژوو و کۆمەڵایەتی و هەموو ئەو لکە زانستانەی پێوەندییان بە مرۆڤەوە هەیە کەم و زۆر جوداوازیی لێکدانەوە و بۆچوون و شی کردنەوە لە دیاردەی کۆمەڵایەتی بەرەو باوەڕ و ڕاڕەوی جۆرجۆریانەوە ببات، تەنانەت دەشێ زاناکانی هەر یەکێک لەو زانستانەش لە بیروباوەڕدا یەکدی نەگرنەوە، دیسان گومان لەوەدا نییە کە:

1. کۆمەڵایەتی بەند بوە بە مرۆڤایەتییەوە.
2. مرۆڤایەتیش بەند بوە و هەر بەندیش دەبێ بەو خاسیەتانەی کە تەنها لە مرۆڤدا هەن. بە نموونە، مەیلی زایەند و هەستی برسییەتی و خۆپاراستن و ماندووبوون و حەسانەوە و ژین و مردن... و... و... هەموویان لە هەموو گیانلەبەراندا هەیە بەڵام ئەمانە و هەرچی خاسیەتی دیکەش هەیە لەوانەی مرۆڤ و گیانلەبەر تێیاندا بەشدارن نەبوونەتە بنەمای کۆمەڵایەتی لای هیچ کامێک لەو گیانلەبەرانەدا هەرچەند ناوناوە ژیانی هاریکاری و چالاکیی ڕێکوپێک و سەلماندنی سەرۆکایەتی و ئەو تەرزە مامڵەتانە لە نێوان هەندێک تیرەی ئەو گیانلەبەرانەدا هاتۆتە دی بەڵام لەوانەدا «کۆمەڵایەتی» و بەدوا ئەودا «مێژوو» پەیدا نەبوە.
3. ئاشکرایە بزوێنەری هۆش جوداکەرەوەی هەرە کاریگەر و بەرچاو و بەبرشتە لە مرۆڤدا چونکە بە کولبوون و پەککەوتنی هۆش مرۆڤایەتی لە خۆوە دەپووتێتەوە و دەچێتەوە، لەو ڕووەوە کە هیچ خاسیەتێک و شتێکی دیکە لە مرۆڤدا ناتوانێ بێ هۆش مرۆڤایەتیەکەی ڕابگرێت. بەڵێ، دەزانین بەدەم ڕەوتی بەرەو مرۆڤایەتییەوە، جگە لە هۆش، چەند خاسیەتی دیکەش کە هەر لە مرۆڤدا

هەیە [وەک ئاخاوتن، بەژنی ڕاست، پەنجەی لەبار...] بوون بە تەواوکەری پێداویستەکانی مرۆڤایەتی، بەڵام تێکڕای ئەو خاسیەتانە دەشێ پێیان بگوترێ کەرەستە و یاریدەر و پەراوێزی هۆش چونکە تێکڕایان ناتوانن بێ هۆش «مرۆڤایەتی» پەیدا بکەن. بە نموونە بێنە مرۆڤ بخەسێنە وەیا پەنجەکانی ببڕەوە وەیا باڵای بچەمێنەوە وەیا زمانی لاڵ بکە هەر بە مرۆڤی دەمێنێتەوە، بەڵام کە شێتت کرد لە ترووکەیەکی چاودا پەکی مرۆڤایەتیەکەی دەکەوێ هەرچەند هەموو ئەندام و خاسیەتەکانی دیکەی بێعەیب بن. خولاسە کۆمەڵایەتی و مێژوو بەندە بەو خاسیەتە تایبەتیانەی کە هەر لە مرۆڤدا هەن و زەمبەرەکی هەمووشیان بزوێنی هۆشە.

ئەو ڕێبازەی گۆڕانی کۆمەڵایەتی کە وا لە سەرەتاوە بە تیشکی یەکجار کزی هۆشی تازەپشکووتوو ڕوون دەبۆوە و پێبەپێی پتر ئالۆزکانی ژیان و تەفاعولی لەگەڵ دەوروبەردا تێبڕ کردن و هەست بەشت کردنی هۆشەکە زیادی دەکرد و باشتر دەیتوانی ڕێگە بۆ مرۆڤ دەرکات لە ماملەتی هەزار و یەک سەرەی «پەلەی ژیان»دا، ڕێبازێکی خوێناوی و دڕکاوی و پێچەلپێچ و پڕ ستەم و دزێوی و ترس بوە. «ڕەئیف خووری» لە وەسفی ڕێگەی مێژوویی کرێکار و فەلاح لە نێوان پێنج خشتەکیەکی بێن درێژدا دەڵێ:

سبيلي ملؤها الاشواک من خلفي وقدامي
عليها بقع حمر جرت من جسدي الدامي

ئەم ڕێگایە دڕکاوی و خوێناوییەی کرێکار و فەلاحی قەسیدەکەی «ڕەئیف...» لە دەیان هەزار ساڵەوە ڕێبازی تیرەی ئادەمیزاد بوە و تا ئێستاش شریتە بەرەو دواڕۆژێکی نادیارەوە درێژ دەکاتەوە. مرۆڤ لەم گەشتە پڕ ئەرک و زەحمەتی و چەکمەسەریەیدا، چەندی بە هۆی سەرەتایی و کەمبرشتی و بێهێزی و کزی لایەنە ئیجابیەکەی هۆشیەوە تێشکاو بوە هێندەش بەدەست لایەنە سەلبییەکەیەوە ڕەنجەڕۆ و قوڕبەسەر بوە.

مرۆڤی سەرەتایی، کە تا ئێستاش پاشماوەی تابلێی زۆرە، ئامادە بوە هەمیشە هێندەی کە لە پێناو ژیانی خۆی و خێزانی بجۆشێ و بخەبتێ هێندەش بۆ دڵدانەوەی ساحیر و کاهین و هێزی پەنامەکی بجۆشێ و بخەتبێ وەیا بەقەدەر پاراستنی گیانی خۆی و خێزانی بۆ پاراستنی بوتەکەشی گیانبازی بکات. ئەو مرۆڤە سەرەتاییە لەوانە بوە بایی ئەرکی جۆگا هەڵکەندن نەزر و سەدەقەش بۆ هێزێ پەنامەکی پێشکەش بکات وەیا لە ترسی شەبەنگی مردوان جۆگاکەی لە شوێنی هەموارەوە هەڵئەنگێوێ بۆ ئەستەنگ و هەڵدێران. من بۆ خۆم ئاگادارم، شایەدیشم زۆرن، بایزی مام کاکی ئاوایی «کانی کەند»ی سەربە قەزای کۆیێ مەڕێکی لە خۆی گرت بەڵکوو خوا تەرزە و ڕەهێڵێک دەنێرێ بۆ کوتان و لەناو بردنی پارچە دەغڵێکی کە لەعادەتبەدەر هەڵکەوتووبوو... هەر لەبیرمە لێم پرسی: مام بایز ئەم نەزرە بۆ چی؟ گوتی چوومە سوێی دەغڵەکەم دیتم سووڕاوە، لێم مەعیەن بوو ئەگەر خوای بۆ خۆ نەباتەوە سەرم دەخوا... چاک بوو خوا لێی قبووڵ کرد و تەزرەیەکی وەهای ناردە سەر دەغڵەکە نەبووی کرد، مام بایزیش- خوای لێ خۆش بێ- مەردانە نەزرەکەی بەجێ هێنا و مەڕەکەی لە عەردی دا و گۆشتەکەی بەشیەوە.

ئەم نەزر لەخۆگرتنە کە کاری سەلبیی هۆشە وەک ئەوە نییە مرۆڤ لە کۆنی هەرە کۆنەوە هۆشی بە سوودی نوێڵ نەشکاوە و پتر لە لزوم بە هەڵکەندنی بەردێکەوە ماندوو بوە... وەک ئەوە نییە لەبەر نەخوێندەواری گوێ نەداتە پاکژی... وەک ئەوە نییە منداڵ لەبەر نەفامی پەنچە بۆ ئاگر درێژ بکات... مرۆڤی نامەلەوان بخنکێت... خانووی دیوار خوار بەسەر خەڵقدا بتەپێ. ئەم ناتەواوییانە بەرهەمی لایەنی سەلبی نین چونکە بە چەند تەجرەبە و ڕاهاتنێک مرۆڤ تێیان دەگات، وەک دەشزانین گەشتی مرۆڤ بە ناو هەرێمی «ئەزموون و هەڵە»دا خشکەی عادەتی و ڕاست و دروستی هۆشە بەرەو ڕۆشنایی و ڕەسینەوە. بەڵام باوەڕهێنان بە مێردەزمە و قوربانی دان دژی دەغڵی هەڵکەوتوو و هەڵئەنگاوتنی جۆگە بۆ ئەستەنگان لەبەر خاتری دێو و پەری و سەدان ئەرکی دیکەی بێهوودەی وەک خۆ لە دار و بەردی قەبرستانی دوورەدەست هەڵسوون کاری لایەنی سەلبیی هۆشن... هەنگاوی بەرەو پاشن... تاریکی و کۆت و زنجیرن، هیچیشیان ئەوە نین لە خۆوە ببنە هۆی چاوکرانەوە و فراژیبوون و بەرەوپێش چوون.

دەشێ «ئەزموون و هەڵە» لە کەسبێ جزگە هەڵگرتندا ببێتە بنگەی پسپۆڕی ئاو هەڵگرتنەوە، هەروەهاش دەشێ هەموو ئەو ناتەواویانەی پەکیان لەسەر پتر تاقی کردنەوە و ڕاهاتن کەوتوە سەربە دروستی و تەواوی بگەیەنن. بەڵام باوەڕهێنان بەوەی کە جرەجرێ پەرەسێلکە بریتییە لە ئایەتی «اذ يتلقى المتلقيان عن اليمين وعن الشمال قعيد» هەرگیز لە خۆوە خۆی ڕاست ناکاتەوە. گومڕایی سەلبییەتی هۆش هەتاهەتایێ بزێتەوە هەر لە گومڕایی و تاریکایی و گێژان زیاد دەکات و یەک تروسکەی ڕۆشنایی ناداتەوە. تەنانەت ئەگەر یاسا مەشوورەکەی «گۆڕانی چەند بۆ چۆن - تحول الكم الى الكيف»یشی لێ بەکار بهێنن نابێ بەتەما بین کەڵە کردنی دێو و جنۆکە و ئەفسانە ڕۆشنایی و زانین و تێگەییشتن بداتەوە. هەتا جەهالەت و کوێری و کەرەواری کۆمەڵ بکەیت هەر لە تاریکایی زیاد دەکەیت و نایگەیەنیتە ئەو نوخنەیەی کە لە یاسای «گۆڕانی چەند بۆ چۆن» دا پێی دەڵێن «نوختەی تەنگەتاوی - النقطة الحرجة - Critical point» و خاسیەتی شت تێیدا دەگۆڕێت وەک کە پلەی گەرمایی ئاوت گەیاندە سەد دەکوڵێت و کە هێناتەوە سفریش دەیبەستێت. لێ زیاد کردنی گومڕایی و تاریکایی خۆی لە خۆیدا نوختەی تەنگەتاوی پەیدا ناکات تێیدا بگۆڕێت بە ڕووناکایی و بینایی بەڵکوو هەر لە تاریکایی زیاد دەکات هەروەک زیادبوونی نەساغی ڕوون لە مردن دەکات نەک چاکبوونەوە.

بە نموونە ئەگەر گومڕایەکی سافیلکە گیسک بکاتە قوربانی بۆ مێردەزمە، دواتر لە ڕێی دەرسدانەوە پتر لە گومڕایی ڕۆ چوو ڕەنگە قوربانیەکە لە گیسکەوە بگۆڕێ بە ئادەمیزاد. هەر تەعلیلێکی فێڵبازانە بۆ ماددیبوون و مەوزووعیبوونی ئەو تەرزە کوێرییە بهێندرێتەوە لەوە تێپەڕ ناکات کە خاوەن تەعلیلەکەش مۆدیلی ئەفسانەپەرستی و جنۆکاویەتی سەدەی بیستەمە. هەموو بلیمەتی جیهان کۆ ببنەوە ناتوانن یاسای «گۆڕانی چەند بۆ چۆن» لەو تاریکستانە بەگەڕ بهێنن. ئنجا یاساکەی «نفي النفي- Negation of negation» ئەویش پەک کەوتە دەبێ چونکە زەڕڕەیەک ماکی ڕووناکی لە تاریکاییدا نییە تاکوو تاریکاییەکە خۆی بۆ «نفی» بکات. دەبێ ڕووناکی لە دەرەوەی تاریکیەکەوە بێت و بیرەوێنێتەوە

هەروەک نەساغی بۆ خۆی نابێتە شیفای خۆی، واتە خۆی نەفی ناکات، دەبێ دەرمان لە هەرێمی ڕووناکی و زانستەوە بێت نەساغیەکە نەفی بکات.[15]

ناپەسەندایەتیی لایەنی سەلبیی هۆش هەر لەوەندە ناوەستێ کە خۆی لە خۆیدا پەسەندایەتی و ڕووناکی ناداتەوە، بە دەوراندەوری خۆیدا لە هەموو ڕووکار و ڕێکارێکی کۆمەڵایەتیدا نرخی قورس لە مرۆڤ دەستێنێ. واتە جگە بەفیڕۆچوونی ئەو هەوڵ و ئەرکەی کە لە خزمەتی تاریکایی بە مل مرۆڤیدا دەدات، بێلزومیش مرۆڤەکە بەشەڕ دەهێنێت لە پێناو ئەو فەرمان و پێویستییانەی کە تاریکایی و نابینایی بە سەریدا دەبڕێت. بە نموونە کە کوێرایی وای لە مرۆڤ کرد شەونخوونی بەدیار بوتەوە بکێشێت و قوربانی بۆ سەر ببڕێت جارێ مرۆڤەکە هەر لە جغزی ئەو کوێراییەدا ڕەنج بەخەسار دەبێت و زەرەر لە خۆی دەدات، بەڵام کە هات و چەکی پێ هەڵگرت و بە گژ جیرانەکەیدا هێنا کە بوت ناپەرستێ وەیا بوتێکی دیکە دەپەرستێ، لێرەدا وێرانکاری کوێراییەکە لە سنووری تاریکایی خۆی دەردەچێت و زەرەرەکەی دەگەیەنێتە سەلامەتی و سوودی خەڵق.

مێژوو زۆر وێنەی ئەو تەرزە تێکهەڵقژانەی تێدایە کە وەها بوە بەرەیەکی هەراکە لە بنەڕەگەوە دەرکێشراوە واش بوە جۆرە پارسەنگبوونێکی دەسەڵاتی لەناو بردن، هەردوولای لە قڕ تێکەوتن پاراستوە، واتە بەیەکدی نەوێراون. بێگومان کوشتاری نێوان خەڵق لەسەر باوەڕی پووچەڵ هەرگیزاو هەرگیز بەبەریەوە نییە یەک تروسکەی ڕووناکی وەیا یەک تۆسقاڵ چاکەی لێ پەیدا بێ، نە ماددییەت و نە مەوزووعییەت و نە یاسای گۆڕانی چەند بۆ چۆن و «نفي النفي»یش دەتوانێ بڵێ دەخلێکم هەیە لەو تەرزە تاریکیەدا، بە پێچەوانە، دەست سووربوونی ئەو خەڵقە گومڕایە بە خوێنی یەکدی و مەیلی تۆڵە سەندنەوە، بۆ ماوەیەکی دوور و درێژتر

[15]- پێویستە بڵێم، لێرەدا کە یاساکانی «گۆڕانی چەند بۆ چۆن و نفي النفي» بە عەیارەی بۆچوون و لێکدانەوەی ناو ئەم باسە بەشایەد دەهێنمەوە بێ ئەوەی لە لای خۆمەوە ڕەخنەیان لێ بگرم مەبەستم ئەوەیە بە کەرستەی فکری ماددی پاتەوپات ڕەخنەی ڕەوا لەو فکرە بگرم. دەنا ئەو یاسایانە هێندە بێعەیب نین ببنە ڕوانگەی تیوەرامانی جیهان. چ ئەم یاسایانە بێت و چ فکرەی «تناقض» بێت هیچیان ئەو دەورەیان لە گۆڕانی کۆمەڵایەتیدا نییە کە فکری ماددی بۆی داناون. بەداخەوە لێرەدا مەودای بەبەرەوە نیشتنی ئەو باسانەم نییە.

گیرۆدەی ئەو کوێرەوارییەی کردوون و نرخی یەک بە دە و یەک بە سەدی لێ وەرگرتوون.

ئەو هێندە زەرەرەی سەروماڵ و ئەرک کە لەم شێوە گومڕاییەدا لە مرۆڤ کەوتوە کەمێکی زێدە کەمە لە سەرجەمی ئەو زەرەرەی مرۆڤ لە پێناو تێکڕای گومڕاییدا لێی کەوتوە چونکە ئەگەر دەوری سەلبیی هۆش هەر لەوەندەدا وەستابایە کە خۆخۆری و یەکتر برینەوە بە بەرەی گومڕایانی دەکات دەشیا تاڕادەیەک لە پەرۆشمان کەم بکاتەوە چونکە من بڵێم و نەڵێم، جانفیدایی بۆ تاریکایی و گومڕایی و قوربانی دان لە پێناو کەرایەتی ناتوانێ ئەوپەڕی بەزەیی لە مرۆڤدا ببزێوێ. بەڵام زۆر بەداخەوە هۆشی تاریک دوو کاری زێدە گرنگی وێرانکەری لە مێژوودا کردوە کە هەریەکەیان دە ئەوەندە و سەد ئەوەندەی زەرەری خۆخۆریەکەی گومڕایانی لە مرۆڤایەتی داوە:

یەکەمیان ئەوەیە کە سەلبییەتی هۆش هێرشی بەو گومڕایانە بردۆتە سەر لایەنی رووناکبیر و لێی کوشتوە و بەستوە و سووتاندوە و ویران کردوە سەدانساڵیش شانازی بیژۆکی بۆ جیلاوجیلی گومڕایان لەو کارەساتە تاریک و نامەردانەوە بە میرات هێناوە نەشی هێشتوە هیچ خاوەن دڵ و دەروونی پاک یەک دڵۆپ فرمێسک بۆ ئەو شەهیدانەی بیری رووناک هەڵوەرێنێ، بگرە وەهاش بوە نەوەی ئەو شەهیدانە کەوتوونەتە بەر حوکمی تاریکایی ئەو سەلبییەتەوە کە ئیتر بە تێپەڕینی زەمانە ئەوانیش لە بیرەوەری کارەساتەکەدا شایی و هەڵپەڕکێیان کردوە و لەعنەتیان بە دیاری بۆ گیانی باپیرە رووناکبیرەکانیان هەناردوە.

دوەمیان ئەوەیە کە بیروباوەڕی پووچەڵ و بێگەن و گومڕا وەها ڕێگەی لە بیری ڕۆشن کوێر کردۆتەوە و بە جۆرێک پەردەی تاریکایی بەسەر مێشکاندا هێناوە کە لە ماوەی دوو سەد ساڵ و سێ سەد ساڵدا نەیهێشتوە تروسکەی ڕاستی لەو مەیدانە خەفەکراوانەدا هەڵستێتەوە، ئیتر ژان و ژواری بەوەلەدهێنانی ڕاستییەک لە جیاتی یەک دوو مانگ چوار سەد ساڵی خایاندوە وە یاخود حەقیقەتی گەشی سەردەمێک بۆ ماوەی سەدان ساڵ لە ژێر پەردەی تاریکایی گومڕاییدا شراوەتەوە واشدەزانم ئەم ڕێگە لێ برینەوەیە کە بە ئەسڵ باوەڕی پووچەڵ و نەفسی گومڕا لە کۆندا کردوەتی رووپێوێکی پان و بەرینیشی لە مێژووی لایەنی فکری و مەعنەوی

ئادەمیزاد گرتۆتەوە تا بڵێی ڕێ خۆشکەرەوە بوە بۆ ئەوەی لە سەردەمی هۆشی ئەلیکترۆنی و ئاسمانگەڕیدا، بەرەی ڕۆشنبیر و مرۆڤدۆست خێرابەخێرا ببنەوە جەردەی فکر و ئەوانیش هەمان ڕێبڕکێ لە بیری پێشڕۆ و باوەڕی ئازاد بکەن کە دەزانن خۆیانی بەجێ هێشتوەتەوە و لێیان پێش کەوتۆتەوە.

لەم حاڵەتەدا تەئسیری ڕەوشتی کۆنینەی تاوانبارکردنی فکری پێشڕۆ لەوەوە دێت کە ڕۆشنبیرە نەوباوەکان بە ناوی تۆڵە ستاندنەوە لە فکری کۆن مەنع کردنی فکری غەیری خۆیان بە توهمەی کۆنەپەرستی ڕەوا دەبینن چونکە ئەگەر لە کۆنەوە مەنع کردنی بیری ڕوون باو نەبوایە کاک دارایەکی ساڵی 1978 شەرمی دەهاتەوە ڕۆشنبیرێکی ڕەواندز دەمکوت و سەرکوت بکا.

بەهەمەحاڵ میراتە زێدە تاریک و ئەستوور و قورسەکەی ڕێبڕینەوە لە فکری ڕۆشن و پێشڕۆ، ئێستاکە، لە ژێر عنوان و لە بەرگێکی تازە مۆدێلدا هەناسەی فکری زێدە پێشڕۆ و زێدە ئازاد و ئازا دەبڕێ لەمەشدا هەرچی پاشکەوتوویی و تاریکی و تەسکبینیی خۆی هەیە لەو فکرە ڕووناکانەی وەردەپێچێت و لێیانی دەکاتە هۆی مەنع کردن و تاوانی ڕیسوایی. نۆڕینی ڕاست و دروست لێیەوە دیارە ئەم نرخە زێدە قورسە و بەردەوامەی کە مەنع کردنی بیروڕای پاک و پیرۆز لە مرۆڤی وەرگرتوە ئەگەر سەرەتاشی هەبێ کۆتایی نییە چونکە وشک و نەزۆک کردنی فکرێکی ڕوونی چەند سەد ساڵ لەمەوپێش هەروەک عەینی فکرەکەی لە کیس مرۆڤ داوە، هەموو ئەو بەرهەمانەشی لە کیس داوە کە لەوانە بوو پێبەپێی لە فکرەکە پەیدا بێ، ئنجا هەموو ئەو دەربوونانەشی کوێر کردۆتەوە کە دەشیا لەو فکرە ڕووناکەوە بەملا و بەولادا زریزە بکێشن و ڕۆشنایی بڵاو بکەنەوە. ئەو ڕاستییەش بهاوێژەوە سەر تێکڕای حیسابەکە، کە ئەگەر فکری ڕۆشن خەفە نەکرابایە ڕێگەی لە چەندین فکری تاریک تەسک دەکردەوە و نەزۆکی دەکردن. بەو پێیە ئەو زەرەرەی کە لە مەنع کردنی فکری ڕووناکی لێرە بە پێشەوە لێمان کەوتوە بێ کۆتایی و برانەوەیە هەرچەند ڕۆژێکیش بێت و دەرگەی هەموو فکرێکی ڕوون بخرێتە سەر گازەرای پشت چونکە ئەم دەرگە کردنەوەی هەر زەرەری لێرە بەدواوەمان بەلاوە دەنێ، هی پێشووترمان بۆ تێناهێنێتەوە.

سەیر لەوەدایە، ئەمما سەیر نەک گاڵتە، کەوا بەشێکی بەرچاوی هەوڵ و هەڵمەت و چالاکیی لایەنی ئەریتیی هۆش بە درێژایی مێژوو خزمەتکاری لایەنە سەلبییەکەی بوە: ئەوەندەی لە کۆندا هونەر و پیشەسازی و خانەسازی بە ڕازاندنەوەی بوتخانە و ئەفسانەخانە و ستەمخانەوە خەریک بوە و کرنووی بۆ تاریکترین باوەڕ بردوە و بە منەتبارییەوە مەرحەبای لالووتانەی لێ وەرگرتۆتەوە بۆی ڕێک نەکەوتوە دەیەکی ئەوەش کاری ژیاری (حضاري) خۆی بکات و بە ڕەهایی ڕەوڕەوەی پێشکەوتن خێراتر و لەبارتر بسووڕێنێت.

لە هەموو مێژووی پێش قۆناغی «ڕاپەڕینی ژیاری - Renaissance»ی ئەوروپا، ناوناوەیەکی کەم نەبێ فکر و زانست و فەلسەفە و هونەر و ئەدەب پتر لە پەنا خزمەتی ئەفسانەدا وێراوەتی تەعبیر لە خۆی بداتەوە، ئەمەش دیاردەیەکی هەمەکاتی و هەمەجێگایی بوە، تەنانەت زۆر جاران دەسەڵاتی دنیایی کە ئێستا ناوی چەوسێنەرەوەی لێ دەنێن، لەو سەردەمە کۆنانەدا پەنای فکر و زانستی داوە دژی هێرشی ئەفسانە چونکە هەرچەند دەسەڵاتەکە خۆی پەسەندیش نەبووبێ هێندەی ئەفسانە سڵی لە ڕاستییە سروشتی و زانستی و فکرییەکان نەکردۆتەوە لەو ڕووەوە کە هەموو جاران ڕاستی و زانست و فکر زەرەر لە دەسەڵاتی دنیایی نادەن، وەک ئەوەی کە ئاسماناسێک بەر لە 500 ساڵ گوتبێتی زەوی بەدەوری ڕۆژدا دەخولێتەوە کونتێکی ئەورووپایی پێ سەغڵەت نەبوە بەقەدەر قەشەیەک کە بەردەوامبوونی حورمەتی خۆی لە خولانەوەی ڕۆژ بەدەوری زەویدا دەدیت. دەسەڵاتی دنیایی و سیاسی حەزیشی بەو پێشکەوتنە زانستیانە دەکرد کە هێزی هێرش بردن و بەرگری پێ زیاد دەبوو ئیتر ئەو پێشکەوتنە لە مەیدانی باروت و چەکی شەڕ بووبایە وەیا کشتوکاڵ و بازرگانی و دەریاپەیمایی. کابرای دەسەڵاتدار لێی خۆش دەهات، تەنانەت سەفەری کۆلۆمبۆس بەرەو ڕۆژاوا، ڕووەو هندوستانی ڕۆژهەڵات، لەلایەن دەسەڵاتی دنیاییەوە و بە بەرهەڵستی لێکردنی قەشەکانی جێبەجێ کرا. شتێکی دەسەڵاتی دنیایی پێ تەنگەتاو دەبوو بیروباوەڕی ئازادی سەربە کۆمەڵایەتی و سیاسەتەوە بوو چونکە پەرەسەندنی ئەو ئازادییە لە مێشکاندا دەسەڵاتەکەی لێ کەم دەکردەوە.

هەر ئەم پەرۆشە بۆ پاراستنی دەسەڵاتەکەی بوو وای لێ دەکرد کە ئەدیب و شاعیر و زانا و هونەرکار بحەوێنێتەوە و بیانکات بە دۆستخوا و وەک ئێستگەی رادیۆ بۆ پرۆپاگاندە سوودیان لێ ببینێت. لەم سەردەمەشدا وڵاتەکانی سەربە ماددیی جەدەلی پتر باوەش بۆ شاعیر و ئەدیب و پرۆپاگاندەچی دەکەنەوە کەمتریش زانای کیما و سروشت و ژیان دادەکەن چونکە زاناکان بابای زارقەڵەباڵغ و قسەزان نین، زانستەکەشیان بەعادەت ئەو نایابە نییە کە وڵاتە جەدەلیەکان لێی بێبەش بن.

هەر ئەم مەبەستەی پروپاگاندەیشە وەها دەکات قوتابی زمان و ئەدەب و فۆلکلۆر و شتی سەربە مرۆڤ کە هەموی بۆ پرۆپاگاندە دەست دەدەن لەو وڵاتە جەدەلییانەدا قبوڵ بکرێ بەو نیازەی کە دوای بەسەرچوونی قۆناغی قوتابیەتی مەدحیان بە دنیادا بڵاو بکاتەوە. هەرچی وڵاتە سەرمایەدارەکانن چونکە دەزانن شۆرەتی سەرمایەداری وەها ناوزڕاوە کەس ناوێرێ مەدحی بکات ڕمووزەی زمانەوان و نووسەر و شاعیر و هونەرکار نابن بەڵکوو باوەش بە زانای زانستی تەتبیقی دا دەگرن با زاناکەش شیووعی بێت چونکە پارەی پێوە دێت...

ئەگەر لەم کولانەوە سەیری مێژووی کورد بکەین دەبینین ئەدیب و شاعیری کورد بەدەگمەن نەبێ مەدحی خەڵقیان نەکردوە. ئەو کەمتاکورتە مەدحەی کە شاعیرێکی کوردیش کەسێکی دیکەی پێ هەڵدابێتەوە بە مەبەستی پرۆپاگاندە نەبوە سەبەبەکەشی دەگەڕێنەوە بۆ نەبوونی سامانی گەورە و دەسەڵاتی بەرفرەوان و حاکمایەتی و پاشایەتی. دیارە کە ئەمانەش نەبوون کڕیاری شیعر و ئەدەبی پرۆپاگاندە دەست ناکەوێ. هەر لەگەڵ نەبوونی کڕیاری پرۆپاگاندە و بە هۆی هەمان سەبەبیشەوە کڕیاری زانستی سەربە بەرژەوەندی دنیایی لە نێوان کوردان پەیدا نەبوە چونکە ئەو هەژارییەی کە هەموو کوردی گرتۆتەوە ڕێی نەداوە پارەدار و بازرگان و پیشەساز و خاوەن بانک و فابریقە هەڵکەون کە ئیشیان بە زانستی تەتبیقی هەیە، زانستەکەش لەلای خۆیەوە ڕێی سەر هەڵدانی نەبوە لەو وڵاتە چۆڵوهۆڵەدا. لەو بارە یەکجار دەگمەنانەدا کە ڕێکەوت ئەمیرێکی بابان و سۆرانی بۆ ماوەیەکی کورتیلە دەسەڵاتدار کردوە، دەبینین سەرەتای سنعەتکاری و چەک دروست کردن و ئەو پیشەسازییەی کەڵکی بۆ کاروباری حوکمداری هەبێت وەک

دونبەڵان لە قەڵشتی زەویەوە دەرهاتوە، هەر لەگەڵ سەرەنگریبوونی حوکمداریەکەش بازاڕی ئەو هێندە سنعەتە نەرەسیوە لە خۆوە پێچراوەتەوە، هەرچی مەلایەتی و شێخایەتییە کاریان لەگەڵ غەیب و قیامەت و هەندێ باری شەرعی و کۆمەڵایەتییە کە هەمیشە ئاپۆرەی خەڵق کاریان پێیانەوە بوە بۆیەیە خوێندنی مزگەوت و تەریقەتی شێخایەتی بێ خاوەنی ڕەسمی لەناو کوردەواریدا ژیاوە.

لە ڕووی ئیش پێبوون و نەبوونەوە، بە کولەمەرگیش بێ هەڵبەست و بەستە و بلوێر و زوڕنا و دەهۆڵ و حەیران و لاوک گوێگر و بۆرە کڕیارێکی هەر هەبوە بابی ئەوەی لایەنی تەردەماغی هەژارانە داخوازی دەکات و پاداشتیشی دەداتێ. لەبەر تیشکی ئەم ڕاستییە ناخۆشەدا کە بێین ئەو نووسینانە هەڵسەنگێنین کە ناوناوە شانازی دەکەن بە نەبوونی شاعیر «مداح» لە نێوان کوردگەلدا بێجێ و بێسەبەب کەیفیان بە نەبوونی شیعری مەدحئامێزی کوردی دێت چونکە لەوەدا هەر هێندە لەسەر حەقن کە پیاوێکی هەژاری موفلیس کەیفی بەوە بێت چ پارەی نییە ڕیبای حەرامی پێ بخوات: کاتێک کەیف هاتن بە نەخواردنی ڕیبا دەبێتە مافێکی ژیرانە کە سامان و پارەی لەگەڵدا بێ. هەروەهاش نەبوونی مەدح لەگەڵ هەبوونی زەرفی مەدح کردندا دەبێتە مایەی شانازی ئەگەرنا هەموو دەنگ ناخۆش دەتوانن خۆیان هەڵکێشن کە لە دیوەخانەی زۆرداران گۆرانی ناڵێن، سواڵکەری کۆڵانانیش سینگ دەردەپەڕێنێت و بڵێت کچی ملیۆنێری چەوسێنەرەوەم مارە نەکردوە.

ئێمە ئەگەر بێین بە چاوی ماددییەت کە باوەڕی بە غەیب و دین و خوا و پێغەمبەران نییە سەیری خزمەتکاری و بەردەستایەتیی لایەنە ڕوونەکەی هۆش بۆ لایەنە تاریکەکەی بکەین هەر بەجارێ لێی دەتۆقێین چونکە ئەگەر مرۆڤێکی خواناس و دیندۆست خۆی بە خەسارەتمەند نەزانێ لەو ئەرک و مەسرەفەی لە پێناو باوەڕەکەی دەیکێشێت، مرۆڤێکی ماتیریالیست سەرلەبەری ئەرک و پارەیەکی لە ڕێی دین بەخەرج چووبێت بە زەرەری پاتەوپات و بێتەئویلی دادەنێت.

بەو پێیە زەرەری مرۆڤ لە پێناو دین کە بەلای باوەڕی ماتیریالیستدا هەمووی فیڕۆ چوونە بەولای هەموو حیسابێکەوە دەچێت چونکە لەوەتەی مرۆڤ هەیە خەریکی دین و غەیب و ئەرک و مافەکانیەتی ئیتر لێی خەرج دەکات و بۆی دەکۆشێت و

دەجەنگێت و دەحەجێت و قوربانی بۆ دەدات و بۆشی دەمرێت. مرۆڤ جارێ لە منداڵدانی دایکییەتی کە فەرمانی دینی بەسەردا دێت، فەرمانەکەشی بەملەوە دەبێت تاکوو دەچێتە قەبر، لەناو قەبریش ڕەها نابێ تاکوو حیسابی مەڕنەمووکەی لێ بەسەر دەچێت، ئەوساش هەر چاوەنۆڕی خێر و سەدەقەی دوای مردنیەتی کە خزم و کەسی بۆی ئاودیوی قەبرەکەی بکەنەوە.

بەم حیسابە سادە و ڕەوانە دین پتر لە ژیان و پێداویستی گوزەران و دنیا و ماددە مرۆڤ بە خۆیەوە خەریک دەکات چونکە دەبینین دوای مردنی و دەست کۆتابوونی لە هەموو شتێک هێشتاش دین کاری پێی دەمێنێ. فکری ماددی ئەگەر ڕاستییان لە بیر خۆی نەباتەوە ناچار دەبێ بسەلمێنێ ئەو دینەی کە بەلای ماددییەتەوە تەمومژی نەزانیی مرۆڤ و ساوایی گۆڕانی کۆمەڵایەتییە پتر چەنگاڵی لە ماددە و مەعنای مرۆڤ گیر کردوە لە هەموو ئەو یاسا و دەستوورانەی کە بەلای ماددییەتەوە کاکڵ و ناوەڕۆک و چەرخ مەنگەنەی بوون و بەرەوپێشچوون و کامەرانییە، ئیجا دەبێ، فەلسەفەی ماددی. ئەویش بداتەوە بە حسابی زەرەر و قازانجی «ڕووناکبیری» و «تاریکبیری»ی مرۆڤ کە وا فەلسەفەی ماددی بۆ خۆشی دوای جێگیربوونی لە دڵ و مێشک و هەست و نەستی مرۆڤدا دەبێتەوە بە دینێکی نوێ و «زەکات و سەرفترە» ی تازەبابەت لە مریدەکانی وەردەگرێت و لە جیاتی قودسییەتی غەوسی گەیلانی نیمچە خوایەتیش بە ڕابەری وەک ستالین دەبەخشێت.

لە تەجرەبەی ڕۆژانەدا دیتراوە، گەنجی خوێنگەرم و تیژڕۆی شەقامی ماددییەت گەلەک لە تەعەسوبی حاجییەکی کەشیدەبەسەر خەڵتزقێن و زراوڕژێن و هەناسەبڕ و پەکخەر بوە، من لە جۆش و خرۆشی ساڵی 1959 گەنجی ئەوتۆم دیتوە هێندە بە تەوژم شاڵاوی بردۆتە سەر لایەنێکی بەرەی نیشتمانی، بێ هیچ موبالەغە، بەرپێی خۆی نەدیتوە: ئەو خەنجەرەی، کە لێم بیست دەیگوت بۆ قەسابخانەی لایەنەکەی دیکەی بەرەی نیشتمانی هەڵکێشاوە، ئەگەر باوکی خۆی بەری کەوتبایە نەیدەگێڕایەوە.

هەڵبەت ئەنجامی وەها بێڕەحم و نامرۆڤانە لە هەر باوەڕ و فەلسەفەیەکەوە بکەوێتەوە، با ناوی خۆشی بنێ ئاوی کەوسەر. تەڕەشقۆی زەلکاوی گومڕایی و

شەوکوێری و هۆشکولییە کە بە عادەت هەر لە تاریکستانی ئەفسانەی وشکە باوەڕان دەزێتەوە کە دەکاتەوە بەچکە زوڵە نازدارەکەی هۆشی سەلبی!! زۆر بەداخەوە هەموو ئەوانەی دین وەیا فەلسەفە لە پێناو مەبەستی خۆیان بەکار دەهێنن پشت ئەستوور دەبن بە هۆی ئەو تەرزە خوێنگەرمانەی کە دەماری پێوەندییان بە هۆش و گۆش و بەزەیی و ئینساف و مەردایەتییەوە نامێنێت، وەهاشیان سەرشێواو دەکەن وا دەزانن دڕندەیی و خوێنڕێژی و بگرە ببەستەیان بۆ خزمەتی پاکترین و چاکترین ئامانجە. مریدە ئەفیوونکێش و پیاوکوژکانی «حسن الصباح»یش هەر وەهایان دەبرایە مێشک.

ڕەنگە لە ئاست ئەوەی گوتم کە مرۆڤ بە دینەوە پتر خەریک بوە نەک بە ماددە، بیریاری ماددی بڵێ خەریکبوونی مرۆڤ بە گوزەرانەوە کارێکی ڕۆژانە و هەمیشەییە نەک هی کژوکات، بەمەشدا ژووررووی دین دەکەوێتەوە، ئەم ڕەخنەیەی کە من لە جیاتی ماتیریالیستەکان لە خۆمی دەگرم ماوەم پێ دەدا پتر ڕووناکایی بخەمە سەر ئەو هەڵوەستەی کە ماددە و دین تێیدا ڕووبەڕووی یەکدی دەبنەوە، بەڵام بە شێوەیەکی کورت چونکە باسەکە لە ڕادەبەدەر درێژخایێنە.

خەریکبوون بە گوزەرانەوە دیاردەی ئەزەلی و ئەبەدی جیهانی گیان و ژینە، بگرە لە باکتیریا و ڕوەکەوە تا دەگاتە مرۆڤ. وەک دەزانین گوزەران و پەلەی ژیان و پێداویستەکانی ماددی لە نێوان گیانلەبەری دەرەوەی جغزی مرۆڤ هەرگیز سەری نەگەیاندوە بە کۆمەڵایەتی و مێژوو. لە ڕاستیدا، بە سەرنج ڕاگرتن دەردەکەوێ کە گوزەرانی سادە و سەرەتایی لە نێوان مرۆڤیشدا بەحاڵ و بەزەحمەت ڕەوڕەوەی مێژووی خولاندۆتەوە.

گوزەران و هەرچی چالاکیەکی مرۆڤ هەیە لە شێوەی عادەتی و ڕووتینی ڕۆژانەیدا نەیتوانیوە ببێتە وروژان و جۆشان و خرۆشان و تێکهاویشتن، هەر بۆیەشە دەبینی وڵاتی وەها هەیە لە ماوەی هەزار ساڵدا جووڵەی نەکردوە چونکە هەر بەقەدەر هەنگ و چوێلەکە و ڕێوی پەندی بەرەوپێشچوونی لە عەینی جووتیاری و قوڕکاری و بەقاڵی و سەپانی و کاروانچییەتیی عادەتی و نەگۆڕاو وەرگرتوە. هەر لە سۆمەرەوە ■ هەتا سەدەی بیستەم، مامڵەتی عادەتی ڕووتینی ڕۆژانەی کاڵەک و شووتی و هەنجیر فرۆشتن لە شوێنی خۆی جینگڵی خواردوە و لە خۆیەوە

بەرەوپێش نەچوە خەڵقیشی بەرەوپێش نەبردوە، حەجی عادەتی، نوێژی عادەتی، خانەسازی عادەتی، هەڵپەرکێی عادەتی... ئەوانیش وەک بەقاڵی و قەسابی عادەتی خۆیان لە خۆیانەوە بە درێژەی زەمانە نەیانتوانیوە ناوەڕۆک، بگرە ڕوخساری کۆمەڵایەتیش بگۆڕن، تەنانەت کوتانەوەی ڕێگەی حەج بۆ ماوەی پتر لە هەزار ساڵ یەک هەنگاو بەرەو ئاسان کردنی هۆی گوێزانەوە نەڕۆیی بەڵکوو لە دەرەوەی هەرێمی حەجەوە و لە دەرەوەی جغزی ئایینەوە پاپۆڕ و گەڕۆک و فڕۆک ڕێگایان بۆ مام حاجی هەموار و سەفەریان لێ ئاسان کرد.

چالاکیی عادەتی خۆی لە خۆیدا نەدەگۆڕێ و نەدەگۆڕێنێ، واتە یاسای «گۆڕانی چەند بۆ چۆن» وەها بە ڕاشکاوی لە هەموو حاڵوباردا ڕوو نادات. دەبێ شتێکی لەعادەتبەدەر پەیدا بێت وەیا بقەومێت و گۆڕان دابهێنێت. هەرچەندە لێرەدا ئیشمان بەو شتە لەعادەتبەدەرە نییە کە گۆڕان پەیدا دەکات دیسانەوە پێویست بوو بە پێی داخوازیی بابەت و بە نیازی دەرخستنی دەوری زێدە کزی چالاکیی عادەتی لە گۆڕانی کۆمەڵایەتیدا ئەوەندە ئیشارەتەی بۆ بکەم چونکە ڕوونبوونەوەی کەمبایەخیی چالاکیی عادەتی لە گۆڕان و بەرەوپێشچووندا پتر ڕێگە خۆش دەکات بۆ ئەوەی بتوانین «گوزەران» لە جێگەی ڕەوای خۆیدا دابنێین و بە زیادەوە نرخ لە لێکدانەوەمان وەرنەگرێ.

بێتەئسیربوونی نوێژ و ڕۆژوو و حەج و تەقوای عادەتی لە گۆڕانی کۆمەڵایەتیدا نابێتە دڵدەرەوەی بابای ماتیریالیست لە پێک گرتنی نرخی دین و دنیا لە نەزەر کۆمەڵانی مرۆڤ کە بە درێژایی ئەزەل دینداریی عادەتییان کردوە چونکە هەرچەند ئەو دیندارییە عادەتییە گۆڕانیشی پەیدا نەکردبێ دیسان بەلای کەمەوە لە دوو نوختەی زۆر گرنگەوە بۆچوونەکانی ماددی پاشگەز دەکاتەوە:

نوختەی یەکەم ئەوەیە کە دەبوو لایەنی ماددییەتی ژیان و کۆمەڵایەتی لە بنەڕەتەوە ڕێ نەدا بە پەرەسەندنی دین و زووبەزوو لە بن قورسایی و ڕۆشنایی ڕاستییە ماددییەکان دین خەفە بێت، کە دەزانین گەورەترین و کۆنترین دوشمنی ماددییەت دینەکەیە. چۆن دەشێ لەبەر ڕۆشنایی فکری ماددیدا بسەلمێنین کە دینی وەها بێبنج و بێبایەخ و زەرەربەخش [لە نەزەر ماددییەتدا] بتوانێ بارتەقای ماددییەت و پتریش لەو بەردەوام و بەرقەرار و ڕەگ داکوتاو بێ؟

نوختەی دوەم ئەوەیە کە وا دین بەولای بەردەوامییەوە، دێت و سواری بەرژەوەندی ماددی دەبێت و لە خۆی خەرج دەکات. حاجی لوقمەی زاری خۆی و منداڵەکانی دەگێرێتەوە و دەیکاتە بیتاقەی سەفەری سەر چاک و پیران... کوێخا گارەشەکەی بەدیاری بۆ خزمەت شێخ دەبات... تەڵاق خواردوو وەک دەروێشی گەڕیدە گونداو گوند لە مەلای دوازدە عیلم دەگەڕێ... ساڵانە دوو میلۆن بەرخ و شەک لە کۆی حەجدا بە دەوری کەعبەوە سەر دەبڕدرێت و گۆشتەکەشی خەسار دەبێت...

هەرچەند لێرەدا قسەمان لەگەڵ دینە بەڵام، ڕاستییەکەی هەموو ئایدیۆلۆجییەک لەنەزەر مریدەکانیدا ژوورووی مادده و گوزەران دەبێتەوە، لە گەلێک باردا ژوورووی گیانیش دەبێتەوە. جا ئەگەر ئەم جیهانە بەپێی لێکدانەوە و بریارە سادەکانی فکری ماددی بپێوین دەبوو هەمیشە حیسابەکە بە پێچەوانە بێت و مرۆڤیش وەکوو گیانلەبەرەکانی دەرودەشت لە «ژین و گوزەران و زایەند» بەولاوە بایەخ بە هیچ شتێکی دیکە نەدات کەچی نەک هەر بایەخی زۆری بەشتی نامادی داوە و ماددەی لێ خەرج کردوە بەڵکوو هاتوە بەشی هەرە زۆری ئەوەی پێشی دەڵێین «ژوورخان» لەسەر بنچینەی غەیبی و ئاسمانی [واتە: نا ماددی] هەڵستاندوە و بەگژ ماددەیدا هێناوەتەوە. تەنانەت ئەو مەفهوومانەی ڕاستەوخۆش لە ماددەوە هەڵستاونەتەوە بەرگی نامادی لەبەر کراوە ئیجا ڕێزی لێ گیراوە.

تۆ سەیری، چۆن شەڕی نێوان «مادده و نامادده» وەهای لە خەڵق کردوە جۆرێک جووتەوەری (ازدواجية) لە سەرانسەری کۆمەڵایەتیدا بەکار بهێنێت هەر بۆ ئەوەی لێی دیارە نەدا کە ماددەی خۆش دەوێت وەیا بە «شهوانی» نەناسرێت. بەشێکی هەرە گرنگی ئاکار (اخلاق)ی کۆمەڵایەتی بریتییە لە جنێودان بەو شتانەی خەڵق حەزی لێ دەکەن و بەدزیەوە دەیکەن. گیانلەبەری دەرودەشت چونکە هیچ «ژوورخان»ی نامادی نییە حەزەکانی ناشارێتەوە، ناشزانێ بە تەئویل حەڵاڵیان بکات.

کورتەی گوتەی گرنگ لێرەدا ئەوەیە کە مرۆڤ لە نێوان هەموو گیانلەبەراندا تەنها خەلقندەیەکە کە «ژوورخان»ی پێک هێناوە و بەسەر گوزەرانیدا ڕاشکاندوە و هەتا بۆی کرابێ حەز و شەهوانیەتی خۆی لەناو بەرگی نەشمیلانەی نامادیدا

شاردۆتەوە، کە لێشی ئاشکرا بووبێ ناوی پێوە زڕاوە. دیارە لەو مەیدانەشدا «دین» ئەوپەڕی «نامادەی»ی گرنگ و ڕێزلێگیراوی کۆمەڵایەتی بوە چونکە سەری بە مەڵبەندەی پاک و پیرۆزی غەیبەوە ناوە. لێرەشدا لزوم نابینم بەدوا چۆنیەتی و چییەتی «ماهیة»ی دین بکەوم: ئایا دیاردەی کۆمەڵایەتییە [وەک کە فکری ماددی و زانستی سەربە ئیلحاد بۆی دەچێت] وەیا زادەی «وحي» و «الهام»ە، تەنها ئەوەندە دەڵێم لە نوختە نیگای بەیەک گرتنی دین و ماددییەتەوە هێزی دین و بێهێزیی ماددییەت لەوەدا ئاشکراتر دەبێ کە دیاردەی کۆمەڵایەتی بێ چونکە ئەوسا لایەنی ماددییەت بەرانبەر شتێک کۆڵ دەدات کە ساختە و هەڵبەستراو و چاوبەستەکێی ڕووت و ڕەجاڵە.

یەکێک لە تایبەتە ناپەسەندەکانی ئەو لایەنە سەلبییەی زات و هۆش ئەوەیە کە ئەگەر قەناعەت زادەی ئەفسانە و تاریکی بوو لە زۆر ڕووەوە بەهێزتر و گەرموگوڕتر و دەمارکشتتر و وروژێنتر دەبێ لەو قەناعەتەی کە هۆشی ڕوون بە بیرکردنەوەی ڕاست و تەجرەبەی دروست پێی دەگات. بەعادەت مرۆڤی زانا و ڕووناکبیر مەیلی لایەنگیری بۆ باوەڕ و ئامانجی قەرارادە ناکاتە ڕابەری لێکدانەوەکانی چونکە ئەو دەیەوێ «ڕاستی» بدۆزێتەوە، دیارە کە هەڵپەش تێکەڵ بە تۆژینەوە بوو ئیحتیمالی بەهەڵەدا چوون پتر دەبێ، خۆ کە هات و مەیلی لایەنگیری بەسەر لێکدانەوەی تۆژەرەوەدا زاڵ بوو هەر بەجارێ لە ڕێبازی زانست و ڕاستی دەترازێ، وەک دەشزانین پیاوی زانا لە هی گومڕا زاڵترە بەسەر هۆش و لێکدانەوەی خۆیدا و ئاسانتر لە مەیلی بێزۆکی نەفس ڕەها دەبێ.

ئنجا هەروەک بە خوێنی ساردەوە دان بە شیرنایی شەکردا دەهێنێت هەروەهاش دەتوانێ بێتەرەفانە چاوەنۆڕی ئەو ئەنجامانە بێت کە لێکدانەوە و ئەزموون لە جیهانی ماددی و مەعنەویدا دەریان دەخات. مرۆڤی ڕۆشندڵ بە پێچەوانەی مرۆڤی کوێرەوار دڵگەرمیی بۆ جۆر و چەند و چۆنی ڕاستییان بەکار ناهێنێت لە پێشەوەش بڕیاری ڕاستی شتان نادات. ئەمە خەسڵەتی مرۆڤی زانای تەواوە، خۆ ئەگەر تارادەیەکیش لایەنی مەیل و حەزی فیتری بەرەو ڕووکارێکەوە ببات دیسان لەچاو مرۆڤی گومڕادا هەر بە حەقپەرست دەناسرێ.

بەهەمەحاڵ مرۆڤی دڵڕوون سەد جار مرۆڤی دڵتاریک خێراتر و ئاسانتر قەناعەتی پووچەڵ بە هی ڕاست دەگۆڕێ، هەر بۆیەشە ئەو بیروڕایانەی کە لە ڕێی زانست و ژیربێژی و تەجرەبەوە پەسەند دەکرێن زووبەزوو بە هی چاکتر و ڕاستتر دەگۆردرێنەوە تاکوو دەبینین لە ماوەی سەد ساڵێکدا زوربەی ئەو قەناعەت و نەزەریانەی لە مەیدانی زانستدا بە ڕاست خۆ دەنوێنن جێگە بۆ قەناعەت و بیروڕای تازەتر چۆڵ دەکەن، کەچی ئەو ئەفسانانەی شەڕیان بە کۆڵۆمبۆس دەفرۆشت دوای 400 ساڵیش لە دۆزینەوەی ئەمەریکا یەخەگیری ئاسمانگەڕی دەبنەوە. فەلسەفەی ئەفلاتوون و مەنتیقی ئەرەستوو کە لە سەردەمی خۆیاندا ڕۆشنترین بیری پێشڕۆ بوون یەک دێڕیان تێدا نەماوەتەوە هەڵنەگێڕدرابێتەوە کەچی دێو و درنجی سەردەمی ئەوان و پێشوو تریش هەر دێنەوە خەون و خەیاڵی ئەم سەردەمە هی تازەبابەتیش پەیتاپەیتا لە زاوزێ کردندایە.

تاریکیی هۆشی گومڕا گەلێک بەردەوامترە لە ڕۆشنایی هۆشی بینا. جگە لەوەی کە بەردەوامبوونی ڕووناکایی بەدرێژایی ئەزەل و ئەبەد دەبێ لێی خەرج کەیت و پێوەی ماندوو بیت و بی خوێنیت و تێی بگەیت و ئیمانی پێ بهێنیت و بە دەرسی بڵێیتەوە کەچی تاریکایی نەفس و هۆش لە خۆوە زاوزێ و زەنەش دەکات و چ ئەرک و مەسرەفی ناوێت و ئەگەر بە چرای زانست نەیرەوێنیتەوە بەبەریەوە هەیە هەموو جیهان بتەنێتەوە. فکری ڕووناک وەک چرایە، هەر نەوتی برا دەکوژێتەوە. جگە لەمانە، بابەتی زانستی تەتبیقی هەڵپەوکڵپە و حەماسەت و عاتیفە هەڵناگرێ، بەنموونە کە زانیمان مانگگیران کشانی سێبەری ئەرزە بەسەر مانگدا چ هۆیەکی پەلەفرە و فێ گرتن و تەنەکەلێدان لەو زانینە ساردوسڕەوە یەخەگیری مرۆڤ نابێ، بە پێچەوانەی ئەوەی کە شەیتان و جنۆکە مانگمان لێ تاریک بکەن. هەر بەو پێیە لە نێوان زانستەکانیشدا ئەوەی بەڵگەی ئەزموونی لەگەڵدا بێ کەمتر دەمەتەقەی دڵگەرمانەی بەدەورەوە هەڵدەستێ کەچی زانسیتە ئینسانیەکان لەچاو زانستە تەتبیقیەکاندا لەوانەن تاڕادەیەک مرۆڤ بەرەو دڵگەرمییەوە ببەن.

بیرکردنەوەی ماددیی تەقلیدی لەبەر خۆلکاندنی بە تەفسیری ماددی یەکسەر و پاتەوپاتەوە ناتوانێ دەربوونەیەکی گشتی فکر بۆ ناو ئەو ژێرزەمینە تاریک و نووتەکانەی سەلبییەتی زات و هۆشی مرۆڤ بکاتەوە چونکە هەر لە سەرەتای

بۆچوونەکانیەوە پەکخستنی دەوری زات و هۆشی مرۆڤی بە ئەستۆی خۆیەوە گرتوە. وەک دەشبینین هەموو چالاکیەکانی ئێستا و هی ڕۆژگاری لەمەوبەر دەداتەوە بە هاندەر و کاریگەرەکانی دەوروبەر ماددی، هەرچی دەستوورەکانی کۆمەڵایەتی و مێژووش هەیە هەر لەو دەوروبەرە و گۆڕانێکی تێیدا پەیدا دەبێ هەڵیان دێنجێت بێ ئەوەی لایەنی ناماددیی مرۆڤ کە هۆش و زاتە تێکەڵ بەو یاسا و دەستوورانە بکات. ئنجا کە بەلای بیری ماددیی تەقلیدییەوە مرۆڤ وەها بەردەست و بێدەسەلاتی ماددە و دەوروبەر بێت و وەک ئاوێنەی بێگیان تیشکی واقیع بداتەوە بێ ئەوەی بتوانێ بە ئیرادە و دڵخواز تیشک نەداتەوە ڕێم هەیە بڵێم ڕەنگە بابای ماددی وەها پەنجە لە بیروڕاکانی خۆی گیر بکات فەرقی نەبێ لەگەڵ دەروێشی تەریقەت، پتریش لە خەڵق چاو و مێشکی خۆی لەو ڕاستیانە دابخات کە ڕۆژانە قەناعەتەکانی بەدرۆ دەخەنەوە چونکە کە لە ڕێی نەزەریەکەو وەها دابنێت هەڵێنجانی دەستوورەکانی لە ماددەی بێ شوبهەوە تیشکی ڕاست و دروستی داوەتەوە و دنیای بۆ ڕوون کردۆتەوە ڕێی نابێ خەیاڵی بۆ دەوری سەربەخۆی زات و هۆش و زانین و نەزانین و هەڵوەستی شەخسی و مەیل و ئارەزۆی نەفس بڕوات کە تەئسیرێکیان ببێ لە جۆری تێگەییشتن و تێنەگەییشتن و ویستن و نەویستنی دەوروبەرەکە. هەروەک ئاوێنە شکڵی واقیع دەداتەوە بێ ئەوەی تێی بگات وەیا بتوانێ شکڵەکەی نەداتەوە، هەروەهاش دەبێ مرۆڤ بە سازی دەوروبەری هەڵپەڕێ بێ ئەوەی بتوانێ هەڵ نەپەڕێ.

ئەمە قەناعەتی بیریاری ماددییە لە بارەی بیروڕا ماددییەکانی خۆیەوە کە گۆیا وەک گڵۆپ تیشکی بە تاریکاییدا بڵاو دەبێتەوە کەچی لەوانەیە نەزەریەکەی بە تیشکی ڕەنگاوڕەنگ و دەسکرد دنیای دەوروبەری بۆ ڕەنگ کردبێ نەک ڕوون کردبێ وەیا لە گۆشە و سووچی چاوغەڵەتێنەوە پرشنگی هاویشتبێ وەیا جێگەیەکی ئاشکرا کردبێت و یەکێکی شاردبێتەوە وەیا... وەیا... کە هەمووی ئیحتیمالی بەسەهوو چوون و بە سەهوو بردنی مرۆڤ بەدەستەوە دەدەن ئیجا لەوانەیە چاوەکانی وردبین نەبن وەیا فەرق بەچاوبەستەکێی تیشکە دەسکردەکان نەکەن وەیا نەزانێ مەبەست لە زیاد و کەم کردنی تیشکەکان بەسەهوو بردنی مرۆڤە... ئنجا ڕەنگ بێ مرۆڤ لەگەڵ بێعەیبی و تەواوی نەزەریەکەی وێڕای ڕاستی و دروستیی

تیشکەکانی حەز بەو شتە نەکات کە ڕوون دەبێتەوە وەیا بڕوای پێ نەکات وەیا کە حەزی لێ کرد و بڕوای پێکرد بۆی نەیەتە جموجووڵ وەیا نەوێرێ دەستی بۆ بەرێت، لەوانەیشە بۆی شەیدا بێت و بەهەموو فێڵەکانی هەڵخەڵەتێ و خۆیشی لەبەر بمرێنێت... دوور نابینم هەستیش بە فڕوفێڵەکانی بکات و هەر بە قوربانیشی بێت.

خولاسە لەخۆڕازیبوونی نەزەریە بە هۆی ئیدیعای ماددیبوون و واقیعیبوونیەوە دەوری زاتی مرۆڤ بێتەرەف و ناکاریگەر دەکات و دەیداتەوە بە بڕیاری داخوازیەکانی ماددی و ئەو دەوروبەرەی کە نەزەریەکە دەڵێ لەوەوە تیشک دەدەمەوە. ئنجا کە هەڵوەستی نەزەریە لە ئاست دەورە ئیجابیەکەی زات و هۆشی مرۆڤ وەها لووتەلا و ئینکارکردوو و بایەخنەدەر بێ چۆن دێت حیسابی دەورە سەلبییەکەی دەکات.

لەبەر تیشکی ئەم لێکدانەوەیەی لەگەڵ خوێنەری کورددا دەیکەم دەتوانم لە ڕێی تێخوێندنەوەی دەورەی سەربەخۆی زات و هۆشی مرۆڤەوە تەفسیری لەیەکدی جودابوونی هەڵوەستی دوو برایان بکەم کە هەردوویان لە یەک بێشکەدا گەورە بووبن و یەک جۆرە ژیانیان ڕابواردبێت و یەک جۆرە ترس و ئومێد کاری لە ژیانیان کردبێت و یەک تاکە ئامانج میللەتەکەیانی بزاوتبێت. هۆی جودابوونەوەشیان بایی زەڕڕەیەک نەچووبێتەوە بۆ جودایی سوود و زەرەر و بەرژەوەند و ترس و تەما. زۆر بە ئاسانی یەکێکیان لە ڕێی دەرسدانی بەرەو چینایەتییەوە دەبێتە کۆمیونیست ئەوەی دیکەشیان بە بیستنی قسەی ئایینی وەیا لەبەر مەشرەبی سۆفیانە بەرەو مزگەوت دەڕوات. سێیەمیشیان پەندی قەومایەتی دەچێتە مێشکییەوە و دەبێتە وەتەنپەروەر.

ئەم جوداوازییە و چەندەهای دیکەی وەک ئەویش، بە غەیری تەفسیری نەفسی و زاتی [کە دەکاتەوە تەفیسری بەشەری] شی ناکرێتەوە چونکە بەرژەوەندی ماددی و هاندەری تایبەتی دەوروبەر دەستیان نەبوە تێیدا. خۆ ئەگەر بگوترێ باوەڕهێنان بە جۆرە قەناعەتێک وەیا جۆرە بەرژەوەندێک، قەومی بێ و چینی بێ، لەوانەی لە دەوروبەری مرۆڤدا هەن هەر دەبێتەوە تیشکدانەوەی دەوروبەرەکە. لە وەرامدا دەڵێم:

1. تیشکدانەوەی دینداری وەیا قەومایەتی و چینایەتی لە خۆوە خەڵقەکە بڕبڕ ناکات: دەبێ زاتی مرۆڤ یەکێک لەوانە هەڵبژێرێ ئنجا لە براکەی جودا بێتەوە. بەهەمەحاڵ هەرگیز نەمگوتوە زاتی مرۆڤ بێ ماددە و بێ دەوروبەر دەجمێت و دەجووڵێت. چی گوتوومە ئەوە بوە کە «زات» تاکە کاریگەری ئیجابیە و تەفاعول لەگەڵ بوونەوەردا دەکات یا لە ڕێی ڕاستەوە یا لە ڕێی چەوتەوە.
2. تیشکدانەوەکە تێمان ناگایەنێ بۆچی هەریەکێک لەو برایانە تیشکێکی جودای هەڵگرتەوە خۆ دەوروبەری ماددی نەهات هەر تیشکە بە مل برایەکدا ببڕێت. هەڵبەت دڵخوازی شەخسەکە - بیژۆک بێ وەیا پەسەند - سەرپشک بوە لە هەڵگرتنەوەی تیشکەکەدا.
3. لەلایەن گرتنەبەری ڕێی دینەوە ماددییەت هیچ قسەی پێ نامێنێ چونکە هەروەک حیسابی ئاو بۆ ئاگر ناچێتەوە هەروەهاش مەعنەوییات ناچێتە دەستە تەرازووی ماددییەتەوە لەو ڕووەوە کە فکری ماددی پشت ئەستوورە بە پووچاندنەوەی نرخی مەعنەوییان ئنجا چۆن دەشێ هێزی مەعنەوییات بدرێتەوە بە ماددە؟ کەس قۆنتەراتی گرتوە هێزەکەی بۆ بدزێتەوە؟

وەک دەبینیت تەفسیری ماددی کە دەوری «زات» لە بیر خۆی دەباتەوە لە هیچ ڕوویەکەوە ئەو سێ هەڵوەستە جودایە لە سێ براوە ڕوون ناکاتەوە چونکە ئەو باوەڕەی کە زەنەی هۆش و زاتە و لە هەناوی مرۆڤدا دەرسکێت نەک لە فابریقە و کێڵگە و ڕەز و باغدا وەها لە مرۆڤ دەکات مل بداتە ڕێبازی ئەو بەرژەوەندە ماددی وەیا مەعنەوییەی کە جێی قەناعەتی باوەڕەکەیەتی هەر بۆیەشە مومکینە مرۆڤ لە خەندەقێکەوە بۆ ئەوەی دیکە بپەڕێتەوە و لە ماوەی عومریدا چەندین جار خەندەق گۆڕکێ بکات [کە دەکاتەوە عەقیدە گۆڕکێ] بێ ئەوەی بەرژەوەندی ماددی لەوەدا دەخلێکی هەبێت وەیا ترس و هەڕەشە ڕێ خۆشکەرەوە بووبێت. پیاوم دەوێ بوێرێ لەگەڵ 10 گەنجی سانەوی و جامیعەدا بە شیرنایی ماددە و پارە مامڵەتی دڵ و دەروونیان بکات.

سەرەرای ئەمانەی گوتران دەشێ لەرێی تەفسیری هۆشەکی - نەفسییەوە تێبگەین بۆچی بابای دیندار وەیا قەومی وەیا چینپەروەر گەلێک بەولای پێداویستی باوەرەکەی خوێنگەرم و دڵرەق و سەررەقیش بێ تا هەندێ جار بگاتە پلەی خوێنرێژیش. هەر یەکێک لەمانە دوای ئەوەی باوەرەکە دەنیشێتە دڵیەوە، بە هۆی کاوێژ کردنەوەی بەردەوامی راگەیاندن و دروشمەکانی ئەو باوەرە و پتر ئۆگربوونی پێیەوە و کەڵەکەکردنی خۆشویستنی ئەو و رق هەڵگرتن لەو باوەرانەی سەری بۆ دانانەوێنن، وێرای هاندان و تانووت و دڵدانەوەی رابەرەکانی کە هەمووی هەر زات و نەفس و هۆشی دەورووژێنن، وردە وردە دەروونە نەگەییشتوە نەمەییوەکەی دەکەوێتە بەر تاوی ئەو تاریکییەی کە لەو تەرزە حاڵەتەدا لە باوەرەکەیەوە هەڵدەستێتەوە، ئیتر تێژرۆیی زاتە بێباکە فوودراوە کوێربوەکەی وەهای دەرەتێنێ کە هیچ خزمایەتی بە ئەسڵە باوەرەکەیەوە نەمێنێ.

لەوانەیە بابایەکی مرۆڤدۆست Philanthropist هەر لە رێی کوتانەوەی بەردەوامی گوتە و پەندەکانی ئەو باوەرەوە بگاتە حاڵەتێکی نەفسی وەها کە فەتوای لەناوبردنی هەموو ئەو کەسانە بدات کە سەر بۆ باوەرە مرۆڤدۆستەکەی فروو ناهێنن. بەلای بینینی منەوە هێندەی تیشکی نیوەرۆ ئاشکرایە کە ئەگەر ئەوانەی سەدان ملیۆن خەڵق بەدوا باوەرەکانیان کەوتوون رۆحیان بێتەوە بەر و بێنەوە ناو مریدەکانیان و دەقی نەزەریەی هەوەڵ جاریان پێ رابگەیەننەوە، ئەو مریدانە هەر بە حوکمی باوەرە زۆر گۆراوەکانیان ئیعدامیان دەکەن، هەزار جارانیش بڵێن کورینە ئێمە خاوەنی باوەرەکە و دینەکەتانین کە ئێمەی تێدا دەپەرستن کەس گوێیان ناداتێ و دەڵێن ئەمانە یا دەجاڵن یا پیاوی ئیستیعمارن یا شێتن.

بە خەیاڵ عیسا پێغەمبەر دڵسۆزی ئاشتیخوازی مرۆڤدۆستی شەرنەویستی فریشتەئاکاری هێمن راگوێزە بۆ سەدەی حەڤدەم و رووبەرووی دادگای Inquisition ی کەنیشتەی خۆی بکە کە هەر بە ناوی پاراستنی رەوشت و یاسا و ئایینی عیسا پێغەمبەرەوە چاوی بێگوناهانیان هەڵدەکەند: ئاخۆ سەرۆکی دادگای کەنیشتەی ئەو سەردەمە کە وەکیلی عیسا بوو چی لە عیسا بکردایە؟ بێگومان هەر تاکە گوتەیەکی عیسا کە لەبەر دەمی دادگادا شەفاعەتی بۆ بێتاوانێک بکردایە دەبوە بەڵگەی تاوان و گوناه و کفر و زەندیقایەتی کە دە جاران بەشی ئیعدام کردنی

شەفاعەتکارەکەی بکردایە. بە خەیاڵ، دیسانەوە، مارکس لە هەرای نێوان ڕووسیا و چین بەدەنگ بهێنە: بێگومان مارکس ناتوانێ بێتەرەف بوەستێ چونکە لە سەرەتاوە فەلسەفەکەی بریتی بوە لە یەخەگرتنی ئەو واقیعەی پێی ڕازی نەبوە، ئنجا یا دەبێ لایەنێک بگرێت و لایەنەکەی تر ببێتە ناحەزی، یاخود دژی هەردوو لایەن بوەستێ کە ئیتر بە هەردوو لایان یەک دەنگ و یەک ئاهەنگ لە «مارکسایەتی»ی دەیەخن هەر نەبێ بە بەهانەی ئەوەی کە مارکس کوڕی سەدەی نۆزدەم بوە و بە کێشانەی ئەم سەردەمە کۆنەپەرست دەردەچێ.

ئەم تەرزە پشترێبوونە لە بیروباوەڕی ڕەسەن تا ئەوەی بە ناوی «تطور» بیروباوەڕێکی پێچەوانەی خۆی لێ بەوەلەد دەهێنێ هەرگیز «تطور» و فراژیبوون و بەرەوپێشچوون و «تکامل» نییە بەڵکوو پوانەوە و بەسەرچوون و ئیفلاسی باوەڕەکە ڕادەگەیەنێ هەرچەند ناوی خوشکەڵەشی لێ بندرێت. بە نموونە دەڵێم هەموو ئەو تەئویلانەی بە ناوی نوێ کردنەوەی دین بنگەکانی دین هەڵدەوەشێنن و مۆدیلی تازەبابەتیان لە جێگە موتربە دەکەن، لە حەقیقەتدا ڕیسوا کردنی دینە نەک نوێ کردنەوە و دەوڵەمەند کردنی، وەک ئەوەی مەلایەک بە نیازی ئاسان کردنی سەلماندنی دین بێت و تەئویلی ئەو ئایەتانە بکات کە موژدەی داهاتنی قیامەت دەدەن. لە ڕاستیدا مەلاکە کۆڵەکەی دینەکە دەڕمێنێت چونکە ئەگەر قیامەت نەبێ دینەکە لە بنەڕەتدا لزومی نامێنێ.

تەئویلی ئەوتۆیی چ لە دین بێت و چ لە فەلسەفە و کۆمەڵایەتی و ئابووری بێت دەکاتەوە بەدرۆخستنەوە و ئیفلاس پێکردن نەک «تطور». نێرینە کە وردە وردە نیشانەکانی نێرایەتی لێ دیار دەدەن تا دەگاتە پلەی گەنجایەتی و پیاوەتی بەڕاستی تطوری کردوە بەڵام کە لە عومری دوازدەساڵیدا بوو بە کچ (وەک کە ناوناوە ڕوو دەدات) کارەکە لە تطور دەردەچێت و دەبێتە جۆرەک لە جۆرەکانی «استحالة Transmogrification».

بەشی هەرە زۆری ئەو تەرزە ئیفلاسەیە کە بەسەر بیروباوەڕاندا دێت بە چاوبەستەکێی فێڵبازانە و ترسنۆکانەی قسەلووسان ناوی «تطور»ی لێ دەندرێ و دەکرێتە بەڵگەی هێز و پێز و قابیلیەتی ژیانی بیروباوەڕەکان. ئەمەش چ پەیوەندی بە ماددییەت و مەوزووعییەتەوە نییە، بە پێچەوانە. کاری زاتی بەد و ناپاسەندی

ئەو ڕابەرانەیە کە ڕاستی لە خەڵق دەشارنەوە بەڵام بە هۆی نەزانی و کەمبڕشتی و کولیی زات و هۆشی زوربەی خەڵق مومکین دەبێ ڕابەرە درۆزنەکان تەئویلی نادروست بۆ پاراستنی ئابڕووی باوەڕە ئیفلاسکردوەکانیان بهێنێتەوە. ئاپۆرەی خەڵق بێ مامۆستا ئامادەیە تەفسیری جنۆکاوی لە دیاردە سروشتییەکان بداتەوە، چ جایی ئەوەی لە مەڵبەندی کۆمەڵایەتی مامۆستای جادووگەری لێ ڕاست بێتەوە.

ئەم تەقلەلێدانەی بیروباوەڕ لەبەر تیشکی لێکدانەوەی ماددیی تەقلیدی کە بایەخ بە دەوری سەربەخۆی زات و هۆش نادات تەفسیر ناکرێ. مارکسایەتی کە تەمای بێ بببێتە هۆی یەک گرتنی بزووتنەوە هەموو ئەوانەی یەکیان نەگرتوە. دواتر خۆی لە بارێکدا ببینێتەوە کە مارکسیەکان یەکدی نەگرن،،بەڵکوو بەشەڕیش بێن، چۆن هەر لە ڕێی تەفسیری مارکسییەوە▪ ئەم تەقلەلێدانە بە ئاکامێکی ماددی و پێشڕۆ و چاوەڕوانکراوی مارکسایەتی قبوڵ دەکرێ؟ ئەگەر بسەلمێنم، بە پێی نەزەریەی مارکس پێویستە مارکسیەکان ببنە دوژمنی یەکدی تا ئەوەی لەبەر ناکۆکیی ناوخۆیی دۆستایەتی ئیمپێریالیزم بکەن، وەیا مەسیحیەکان بە فەرموودەی ئەو مەسیحەی دەیگوت «ڕوومەتی ڕاستەت وەرگێڕە▪ بۆ ئەو کەسەی لە ڕوومەتی چەپتی داوە» خەڵقی بێتاوان دەسووتێنن، بۆچی نەسەلمێنم سەرمایەدار لەبەر خاتری کرێکار خۆی دەوڵەمەند دەکات، ئیستعماریش بە نیازی خزمەتی میللەتە ژێردەستەکان داهاتیان بۆ خۆی دەباتەوە، دەردەبەگیش بۆ بەختەوەری فەلاح سوورانە دەستێنێ؟ من ئەگەر لەبەر تیشکی نەزەریاندا سپی بە زەرد ببینم و دەنگ نەکەم نابێ لەو درەش بەدەنگ بێم کە پارێزم بۆ دێنێ... نابێ لەو دۆستەشم مەمنوون بم گیانبازیم بۆ دەکا... نابێ بەسەرکەوتن دڵخۆش و بە تێشکانیش دڵتەنگ بم.

هەرگیزاو هەرگیز تەقلەلێدانی بیروباوەڕان لە ڕێی شی کردنەوەی ماددییەوە تەفسیر ناکرێ تا عامیلی هەرە کاریگەری هۆش و زات و مەعنەوییاتی لێ بەکار دەهێنێ. ئەو فەلسەفەیەی کە لای وەهایە خۆی تیشکی ماددەیە ناتوانێ تێم بگەیەنێ چۆن ئەم تیشکە دوای دەیانساڵ لە دڵ و دەروون و مێشکی باوەڕپێکردوەکانیدا بەرەواژ دەبێتەوە هەر واشدەزانن بیروباوەڕەکەی پێش دەیان ساڵە و بەرەوپێش چوە، زۆر جاران دان بەوەشدا ناهێنن کە «تطور»ی کردوە و دەڵێن هەمان تیشکی

هەوەڵ جارە بەڵام وەک کە مریشک جووجەڵە هەڵدێنێ ئەویش ڕاستی تازەی هەڵێناوە، وەیا ئاشکرای کردوە. کەچی لە حەقیقەتدا ناواقیعیەت و کەموکووڕیی نەزەریەکە هەڵەی لێ بەدیار کەوتوە و هەڵەکە ڕاست کراوەتەوە وەیا بە هەڵەیەکی دیکە گۆڕدراوەتەوە.

بە نموونەی ڕوون کردنەوە دەڵێم ئەو قەشانەی لەسەر دانهێنان بە سووڕانەوەی زەوی خەڵقیان دەسووتاند ناتوانن بڵێن هەر خۆمان و بیروباوەڕە کۆنەکەمان بەیەکەوە «تطور»مان کردوە کە ئێستا دان بە ئاسمانگەڕی و سووڕانەوەی زەوی و هەموو ئەو ڕاستییانەدا دەهێنین کە خەڵقمان پێوە دەکوشتن، خۆ ئەگەر ئەمەیان لێ بسەلمێنین دەبێ کۆپەرنیکۆس و گالیلیۆ و زانا کوژراوەکان تاوانبار بکەین بە گوناهی ئینکار کردنی سووڕانەوەی زەوی. لێرەدا قەشە و باوەڕە کۆنەکەی تطوری نەکردوە، زانینەکەی کۆپەرنیکۆس و دووربینەکەی گالیلۆ و باوەڕەی زانا کوژراوەکان تطوریان کردوە بۆ قۆناغی ئاسمانگەڕی و زانستە سەرسووڕێنەکەی فەلەکناسیی نوێ. قەشەکان هەر ئەوەندەیان لێ دەسەلمێندرێ بڵێن لێمان ببورن لەو تاوانە و هەڵەیەی کە تاریکبینی لە کۆندا پێی کردووین مەرجیشە هیچی دیکەی وەهامان لێ ڕوو نەدات.

کەواتە هەڵوەستی قەشەکان هەرگیز نابرێتەوە بۆ ڕێبازی تطور، بەڵام دەتوانین بڵێین لەوە بە پێشتر فەلەکیاتی یۆنانیەکان بوو تطوری کرد بەرەو دۆزینەوەی فەلەکناسی و بزووتنەوەی ئەرز و ئەستێرە گەڕۆکەکان... و هتد... هەرچەند لەو سەردەمەدا زانستەکە وای دادەنا کە ئاسمان بە دەوری زەویدا دەخولێتەوە چونکە ئەوسا هیچ ڕێگەیەکی دیکەی زانستییانە نەبوو تەفسیری هەڵاتن و ئاوابوونی ڕۆژ و مانگ و ئەستێرەکان بکات، تەنانەت ئەو فەلەکیاتە بە پێی سەردەمی خۆی هێندە پێشکەوتوو بوو دەیزانی مانگگیران و ڕۆژگیران چین... مانگ تاریکە... چەندین پەنامەکی سەربە ئاسمان و ڕیازیاتی هەڵێنا بوو.

ئەم تەرزە فەلەکناسییەی ویستوویەتی لەگەڵ سروشت جووت بڕوات بە بەریەوە هەیە پێبەپێ بەرەوپێش بچێ و برەسێ بەڵام کە گوتت شێخی فڵانە شوێن حەفت ساڵان جڵەوی ڕۆژی ڕاکێشاوە لێت چاوەڕوان ناکرێ لە ڕێی ئەو باوەڕەوە هەتا هەتایێ بگەیتە تاکە یەک ڕاستی فەلەکناسی: دەبێ لە پێشەوە باوەڕەکەت بکوژیت

ئنجا بەرەو ڕۆشنایی ئاسمان و مانگ و ڕۆژ بڕۆیت، ئیجا کە فێری زانستی فەلەک بوویت ناشێ بڵێی لە هیمەتی باوەڕە پووچەڵەکەی جارانم گەیشتم بەم زانستەی ئیستاکەم.

نموونەیەکی دیکەی وەک ئەم بابەتە ئەوەیە کە ماددییەکان لە ڕێی شی کردنەوەی ئابوورییەوە زانستی سایکۆلۆجییان بە فڕوفێڵی بۆرجوازیەتی دادەنا لەو ڕووەوە کە بەلای باوەڕی ماددیی کۆنەوە نابێ نەفس کە شتێکی نائابووری و ناماددییە ببێتە هاندەر و بزوێنی مرۆڤ بەو جۆرە سەربەخۆیەی کە سایکۆلۆجی لێی دەدوێت، لەبەر ئەمە خوێندنی ماددەی سایکۆلۆجی لە زانکۆکانیان قەدەغە کرابوو. دواتر کە زانستەکە وەها پەرەی ستاند نەشێ پشت گوێ بخرێ ماددەی سایکۆلۆجی خرایە بەرنامەی خوێندن بە نیازی پووچاندنەوەی وەک مەلایەکی مسڵمان باوەڕی دەهری و زندیقان بە دەرس بڵێتەوە بۆ ڕەد لێ دانەوە و بە هەڵە دەرچواندنی. بەڵام سایکۆلۆجی هەر هات و خۆی بەسەر بیری ڕووناکدا سەپاند و گەیشتە پایەی زانستی تەتبیقی ئیتر مەودا لەبەر بیرکەرەوەی ماددیدا وەها تەنگ بۆوە کە چی دیکە نەتوانێ لە پەنا وشکە باوەڕەکەی خۆیەوە ئینکاری ڕاستبوونی بکات وەیا بوێرێ توهمەی بۆرجوازیەتی وەپاڵ بدات، بەڵام دیسان بەتەواوی کۆڵی نەداو بە منگەمنگ و قسەجوینەوە و زمان گرتن و وشەسازی بای دایەوە و لە زانستە مێژووکردەکەوە تێی کرد و گوتی «سایکۆلۆجیی مارکس زانستی تەواوە نەک هی بۆرجوازیەتی...!!!» ئیتر بەلای خۆیەوە زانستەکەی بۆ بەرەی مارکسیست دزیەوە، ئەوەی ڕاستیش بێ لە بازاڕی مامڵەتی سیاسیدا دزینەوەکە کارێکی سەرکەوتوو بوو چونکە مارکسیستەکان بە گشتی لێیان خۆش هات.

کەسم نەدیت و نەبیست لەو مارکسیستانە بەگژ فاکوفیکەکەدا بێتەوە و ساختەکاریەکە ڕەفز بکات. بەڵام لە دەستە تەرازووی ئینساف و مەنتیق و شەرم و شکۆدا ئەم تەرزە تەقلەلێدانە جۆرە بەردەوامبوونێکە لەسەر گوناهە هەرە زوەکەی ئینکار کردنی سایکۆلۆجی، ڕێ خۆشکەرەوەیشە بۆ ساختەکاری پێویست لەهەر جۆرە پێشکەوتنێکی زانست بێ کە لەگەڵ دەقی نەزەریەی ماددیدا نەگونجێ، سەرشێواندنی هەموو ئەو کەسانەیشە کە ماتیریالیزمیان لێ بۆتە دین.

بەهەمەحاڵ پێ دزیلکە و پاشەکشەی ئەوتۆیی بە هیچ کلۆجێک هەڵناگرێ پێی بگوترێ «تطور» چونکە ئەگەر ئەم هەڵگەڕانەوە و بادانەوەیە «تطور» بێ ئەدی بیرڕووناکەکانی کە لە سەرەتای پشکوتنی زانستی سایکۆلۆجی وەک مەردی دڵسۆز و ئازا پشگیرییان لێ دەکرد و لێیان خەرج دەکرد و خۆیانیان تێدا فەرامۆش دەکرد و توهمەی ناڕەوایان قبوڵ دەکرد چییان بۆ دەمێنێتەوە؛ لە ناو و حورمەت و خۆشی پێیان ڕەوا بدیترێ؟ کە دوژمنی زانستەکە بوو بە میراتگری ئەدی داهێنەرەکەی چ لێ بکەین؟ ئایا دەشێ سەر لە نوێ ببینەوە دۆستی مەعاوییە و یەزید دژی عەلی و حوسێن؟

هەڵبەت دەزانم قسەی من بەشی هەزاریەکی ئەوەش ناکات کە خاوەنی سایکۆلۆجیی مارکسی دان بەڕاستی مەسەلەکەدا بهێنن و خۆیان بە خەتابار لە قەڵەم بدەن [قسەی من ناشگاتە بەر گوێی ئەو تەرزە کەسانە تاکوو بەشی هیچ بکات یا نەکات]. دەزانم قسەکانم بایی هەزاریەکی ئەوەش ناکەن کە یەک زەڕڕە گۆڕین لەو مەیدانەدا پەیدا بکات کە چەندین پێ داگرتنی خەڵەت و پەڵەت تێیدا دەنگدلێر و بەردەوامە... دەزانم بایی دڵسۆزیەکی کە لە قسەکانمدایە ڕقی ئەو کەسانەش بەسەر خۆمدا هەڵدەڕێژم کە سوارچاکییان لە تەراتێنە و مەقەسەی مەیدانی هەڵبەستنەوەی فەلسەفیدا شۆرەتی بەستوە لەو ڕووەوە کە ئەگەر ئەم گومان تێخستنەی من دەیکەم سەربگرێ پایەی هەڵبەستنەوە و پینەچییەتییان دادەلەنگێ ئەگەر نەڵێم ئیفلاس دەکا. ئەمانە و گەلێک شتی دیکەش دەزانم لەوانەی بەعادەت دێتە ناو حیسابی سوود و زەرەرەوە، لەگەڵ ئەمەشدا بەقەدەر حەسانەوەی سوارچاکان لە پینەچییەتی فەلسەفیدا منیش هەستی حەسانەوە دەکەم کە دێم باری ڕاستی ئەو تەرزە هەڵکەوت و هەڵوەستانە لە مەیدانی فکر و فەلسەفە دەردەبڕم ئنجا لە گۆشەیەکی «توقع»ی زێدە کزیشەوە زڕە ئومێدێکی دەنگدانەوەی ئەم ڕاستییانە لە دڵ و مێشکی کەمتاکورتێکی گەنجی کورددا، لە پێشەوە، پاداشتێکی مەعنەوی خۆ ماندوو کردنەکەمم پێ دەدا کە ئیتر خامۆشبوونم بە زەرەر دەگەڕێ.

لێرەدا دەبێ ئەوەش بڵێم کە دانهێنانی هەڵەکردوان بە هەڵەی لێرە بە پێشەوە نابێتە چاکە و پیاوەتی ئەگەر سوور بن لەسەر هەڵەی ئێستا و دوارۆژیان. من چیم لەوەداوە دەروێشێک بەخێری خۆی دان بە ساختەگەری شێخێکی سەد ساڵ

لەمەوبەردا بهێنێ ئەگەر لێی داوا کردم چاو لە ساختەی رابەری ئێستاکەی بپۆشم؟ کەی دادی من دەدا رێم پێ بدرێ رەخنە لە هەڵەی کۆن بگرم ئەگەر رێی رەخنەگرتنم لە هەڵەی ئێستاکە لێ بگیرێ؟ زۆر جاران پیاوی فێڵباز دان بە هەڵەی کۆنیدا دەهێنێ فرمێسکانیش هەڵدەرەوێنێ هەر بە نیازی ئەوەی فێڵی نوێت لێ بکات. نەختێک وردبوونەوەی دەریدەخات کە دانهێنانی ناوناوە بەو نادروستییانەی سەرپۆش قبوڵ ناکەن هیچ بایەخێکی نییە لە مەیدانی فکر و فەلسەفە و ئابووری و رامیاری و بیروباوەردا چونکە مرۆڤایەتی پێویستی بە شەقامەرێی ئەوتۆ هەیە لە رەخنەگرتندا قۆرت و کۆسپ و هەرەشەی تێدا نەبێ. چ فایدە، دوای پەنجا شەست ساڵ لە داکوتانی رەگی سایکۆلۆجی ئنجا ئینکار کردوەکە لە کوێرەرێیانەوە بە تەقیە و ترس و لەرز بەرەو کانیاوی زانستەکەمەوە ببات و نەشیەڵێ بە دڵی خۆم لێی بخۆمەوە؟ ئنجا کە زانستی بێتەرەفی وەک سایکۆلۆجی حاڵی ئەمە بێ بە دەست رۆشنبیر و رابەری! کۆتایی سەدەی بیستەم دەبێ مێژوولۆجی و کۆمەڵایەتیلۆجی و رامیاریلۆجی و ئابووریلۆجی و بروالۆجی کە هەموویان بابەتی پڕ هەست و خوست و سەرقاڵی و دەمەقاڵێن چ ئازادیەکیان پێ رەوا بدیترێ؟

لێرەدا نموونەیەکی زیندووی ئەم تەرزە دان پێداهێنانە بە چەرخ و دۆلابەت دەخەمە بەر چاو تاکوو بە هێزی زیندوەتی نموونەکەوە باشتر بتوانین پەنجە لە بابەتی لێکدانەوەکەمان گیر بکەین:

لە ژمارە 2555 ی گۆڤاری «روز اليوسف»ی سیی مایسی 1977 گوتارێکی نووسەری زیرەکی بەرەی چەپی میسر «صلاح حافظ» لە ژێر ناونیشانی «التفكير بأثر رجعي» بڵاو کرایەوە. راستییەکەی سەرلەبەری گوتارەکە ژیرانە و تێگەییشتوانەیە بەو پێوانەیەی کە نووسەری خستۆتە سەر نووسین بەڵام هەموو نووسینەکەشی جێی لێ پێچانەوە و بەسەرگرتنەوە و لێ بەدەنگ هاتنە هەرچەند ئەوەی لێرەدا کارمان پێیەتی چەند دێرێکی سەرەتای گوتارەکەیە و بەس. دوای هەندێ گوتە و رستەی وەک دەربوونە بۆ ناو بابەتی گوتارەکە، نووسەر دەڵێ:

«إنتهى عصر الشيوعية الدولية واصبح الصراع سافرا فيما بين برلين وموسكو وبين بلغراد وبكين ومابين صوفيا وبلغراد. ولكن حكماءنا مازالوا مصممين

على إن الماركسية ضد الاستقلال ويخوضون معاركهم ضدها تحت راية "الولاء للوطن"».

دیاره مەبەسی نووسەر لە پووچاندنەوەی هێرش بۆ سەر ئینتەرناشناڵ هەم گاڵتە کردنە بە هێرشبەرەکان بەوەدا گۆیا لەو هێرشەدا مەسەلەکەی «خەنجەر لە کا» دەکوتنەوە، هەم پشتگیری کردنە لە بەرەی مارکسیستی میسر بەوەدا کە بەسەرچوونی ئینتەرناشناڵ لە خۆوە گومانی پێوەندی مارکسیستی وڵاتێکی وەک میسر بە شیووعیەتی جیهانییەوە دەڕەوێنێتەوە. لەمەشدا چ گلەیی نایەتەوە سەر نووسەر چونکە کە ئێمە لێی بسەلمێنین تاکێکی ئەو بەرەیە بێت باشتر لێی دەسەلمێنین پشتگیری لێ بکات. بەڵام گلەیی لێ نەکردنی نابێتە مانیع لە دەرخستنی ئەو چاوبەستەکنیە زیرەکانەی کە لە قسە و ڕاوێژەکەیدا هەیە، وەک بۆیشت ڕوون دەبێتەوە چی لە بارەی ئەو قسانەیەوە دەینووسم پێوەندی بە لێکدانەوەکانمەوە هەیە. دوای ئەمەش دەبێ بڵێم من لە دوورەوڵاتەوە چ دەخلێکم نییە بەسەر ئەو هەرایەی کە لە نێوان بەرەی چەپ و ڕاستی میسردا هەڵگیرساوە تەنها تێبینییەکم هەبێ لە بارەیەوە ئەوەیە کە چەپی میسر لەگەڵ بێدەسەڵاتی خۆیدا هەتا بڵێی پیتۆڵترە لە بەرەی ڕاست. ئەو کەسەی «روزالیوسف»ی سەردەمی سەرنووسەرایەتیی «عبدالرحمن الشرقاوي»ی بەرەی چەپ لەگەڵ «روزالیوسف»ی سەردەمی «مرسي الشافعي» بەرەی ڕاست پێک بگرێ دەزانێ فەرقی نێوانیان لە چ ڕادەیەکدایە. با بێینە سەر قسەکانی مامۆستا صلاح حافظ:

من و تۆش دەزانین بزووتنەوەی شیووعیی جیهانی کەرتکەرت و برببر بوو تا ئەوەی دۆستایەتی لەگەڵ ناشیووعییاندا دەگۆڕێتەوە بە هی نێوان شیووعییان بەڵام ئەم پووچانەوە و نەهاتنەدی بەڵێنەکانی شیووعیەتی جیهانی لەوەدا کە دەیگوت بەرژەوەندی چینی چەوسێنراوە لە هەموو جیهاندا دەبێتە یەک گرتنێکی ئەبەدی چینی هەژار و دەشبێتە هۆی لەناوچوونی چەوسێنەرەوە، ئا ئەم پووچانەوەیە هەزارویەک پرسیار هەڵدەستێنێ بە دەوری سەرجوملەی ئەو فەلسەفەیەی کە شیووعیەتی جیهانی لێ هەڵقوڵیوە. هەرچەندە من لێرەدا ماوەم نییە لەبەر تیشکی ئەم ڕاستییەدا بە دەرنەچوونی بەڵێنێکی زۆر گەورەی مارکسیزم هەموو ئەو

دەفتەرانە بخوێنمەوە کە لە جیهانی کۆمیونیستدا بە پووچانەوەی ئینتەرناشناڵ ڕەش بوونەوە، دیسانەوە ڕێم هەیە لەبەر ڕۆشنایی ئەو بیروباوەڕەی لەم نووسینەدا دەوری هەڵدێنم قسەکانی صلاح حافظ بە زۆر لادا هەڵسەنگێنم و ناواقیعیەتەکی تێیاندایە دەریبخەم بێ ئەوەی ناچار بم قسەکانی هەڵگێڕمەوە بۆ ئەو مێژوە دوورەی کە بزووتنەوەی «اممیة» تێیدا بوو بە بەردی بناخەی مارکسیزم.

صلاح حافظ بە تێبردن و چاونووساندن دەیەوێ بە خەڵق بسەلمێنێ تێکچوونی دۆستایەتیی نێوان هەندێک لە دەوڵەت و حیزبە شیووعییەکان بەڵگەیە بۆ ڕووخانی «اممیة» و بەوەدا شیووعیەتی وڵاتێکی وەک میسر بە شێوەی ئۆتۆماتیکی شوبهەی ناقەومایەتی و شوێن بێگانە کەوتنی لێ دەتەکێتەوە کەچی ڕاستییەکەی تا ئێستاش زۆرینەی بەرەی شیووعیی عالەمی سێیەم نەیتوانیوە لە داوی «اممیة» ڕەها بێ وەک کە حیزبە شیووعییەکانی ئەورووپای ڕۆژاوا خەریکن بە تەواوی لێی ڕەها بن. بێ ئەوەی هیچ توهمەی ناجاریەز لە صلاح حافظ و هاوڕێکانی بگرم دەتوانم بڵێم بەرەی مارکسیستی میسر لەوەتەی هەیە بەدرێژایی تەمەنی شۆڕشی 1952 ش بە ئاشکرا دۆستایەتی خۆی بەو بەرە کۆمیونیستە بەرفرەوانەوە بەخشیوە کە یەکیەتیی سۆڤیەت سەرکردایەتی دەکات و بۆی ماندوو بوە ناوناوە قوربانیشی بۆ داوە.

هەڵبەت ئەم قسەیەی من تەنها دەرخستنی هەڵوەستی مارکسیستەکانی میسری لە ئاست شیووعیەتی جیهانی مەبەستە و کەم و زۆر دەخلی نییە بەسەر هەڵوەستی بەرەی ڕاست و ناوەڕاست و مامناوەنجی میسرەوە کە بەرەیەکی هەڕەمەی بێسەروبەر و بێئایدیۆلۆجییە زۆر جارانیش ناوی مرۆڤی عەیبدار لە ڕووپەڕە هەرەپێشەوەکانی ئەو بەرەیەدا دێت یەکجاریش نازیرەکانە لە هێرش بردن و خۆپاراستندا دەجمێت و دەجووڵێت ژمارەیەکی بەرچاویشی لە گیرفان پڕکردن بەولاوە هیچ ئومێد و ئامانجێکی دیکەی نییە.

بێگومان مارکسیەکانی میسر و برادەرەکانیان هەمیشە لە تێکچوونی دۆستایەتیی نێوان دەوڵەتی میسر و بەرەی شیووعیەتی دەرەوەدا لایەنی شیووعی گرتوە نەشم دیت بۆ حیسابی میسر ڕەخنە لەو بەرەیە بگرێ، بەو دواییە نەبێ کمێک بەدەم پروپاگەندەی شیووعیەتی دەرەوەی میسردا هاتوە و نەختێکی لەسەر ڕێجیمی میسر کردەوە... بەهەمەحاڵ ئەم دیاردەیەی پشتگیری کردن لە بزووتنەوەی

کۆمیونیستی جیهانی لە غەیری میسریشدا ئاشکرایە، خۆ لە نێو کورداندا هەر مەپرسە. لەوەش بترازێین، ئێمە ئەگەر قسەکانی «صلاح حافظ»مان سەلماند ئەوسا دەبێ لە خەڵقی دیکەش بسەلمێنین کە «استیعمار» بەسەرچوە کەچی حافظ بەر لە هەموو کەس ئەم قسەیە ڕەفز دەکات و زمان لە «ئیستعماری نوێ» گیر دەکات و بە جێگری هی کۆنی دادەنێت. هەر چۆنێک بێ، لێرەدا، مەبەستی بنجیی دیکەم هەیە: من دەمەوێ لە ڕووی نامەوزووعیبوون و سەلبیبوونی قسەکانەوە لێیان بدوێم.

هەڵوەشانەوەی «دەولییەی سێیەم» و بەگژیەکدیدا چوونەوەی دەوڵەت و پارتە شیووعییەکان ئەوە ئیسپات دەکا کە هەموو ئەو دڵگەرمی و دەمارکشتی و توهمە لە خەڵق گرتن و قوربانی دان و نماییشت کردن و مان گرتن و هەزاران هەزار هەڵوەستی دیکە کە شیووعییەکان و دۆستەکانیان لەبەر ڕۆشنایی ئینتەرناشناڵدا دەیانکرد واشیان ڕادەنواند کە بەردەوامبوون و بەرەوپێشچوونی شیووعیەت و خەباتی چینایەتی و مافی هەژاران لە جغزی بەرفرەوانی مرۆڤایەتیدا بەندە بە ئینتەرناشناڵەوە، ئا ئەو هەموو ئەرک و زەحمەتە هیچی دروست و پێویست نەبوو بگرە بەشێکیشی لە خەباتی ئێرە و ئەوێدا زەرەربەخش بوو.[16]

صلاح حافظ ئەگەر ڕاستییان پشت گوێ نەخات و لەگەڵ خۆیدا بڵێ: ئومەمیەتێکی کە دەبوو بە پەیدابوونی دەوڵەتی شیووعی بەردەوام و گەشەکردوو بێ، ئنجا دەوام نەکات و تێبچێ، نەدەبوو بە هیچ کێشانە و پێوانەیەک ببێتە بەردی بناخەی خەباتی هەرچی ڕێکخراوی سەربە چینایەتی و هەرچی جەماهیری سەربە چەپ هەیە بە شێوەیەک یەکیان بەند بێ بەوی دیکە. کە پەیدابوونی دەوڵەتی شیووعی بکێشێتەوە بۆ نەمانی ئومەمیەت لە حاڵێکدا چاوەڕوان دەکرا ئەبەدیبوونی ئیسپات بگەیەنێ یەکسەر دەمخاتە سەر پرسینەوە لەوەی کە ئەرێ ئەی خزمینە، هاوڕێینە، کەس و براکانم، ئەدی ئەو هەموو خەڵق و خوایە بۆچی بە درێژایی پتر لە سەد ساڵ[17] خەریکی پاراستنی شتێک بوون کە دەبوو هەر بمرێ؟ هەر شیووعیەتیش

---

[16]- وەک هەڵوەستی زیندە عەیبداری شیووعییەکانی ئەورووپای ڕۆژاوا لە دەمی ڕێک کەوتنەوەی ستالین ▪ هیتلەر.

[17]- مەبەست ڕۆژی دەرچوونی کۆمیونیست مانیفێستۆیە لە 1840.

بیکوژێ نەک دوشمنەکەی؟ خۆ دەشزانم - من کە صلاح حافظم- پەیدابوونی دەوڵەتی شیووعی بە هێزی ئومەمیەتەو■ نەبوو: زەرفێکی مێژوویی یەکجار دەگمەن بە سەرکردایەتی «لینین» ێکی یەکجار بە بڕشت لە وڵاتێکدا شیووعیەتی دروست کرد کە بە پێی فکری مارکس نەدەبوو شۆڕشی شیووعی تێدا سەربکەوێ. دیتنی ئەم بەدیهییە وام لێ دەکا- من کە صلاح حافظم- خۆ بدزمەوە لەو پەرگیری و چەپڕۆییانەی ئێستا دەزانم بێلزوم بوون، ئەو قوربانییانەش نەدرێن کە هەڵوەشانەوەی ئومەمیەت بێلزومبوونیانی لە کۆن و نوێدا دەرخست...

بە نیسبەت صلاح حافظەو■ کە میسرییە دەبێ پتر لە عەرەبێکی دیکە دڵ بریندار بێ بۆ ئەو گیانبازییەی کە پرۆلیتاریای میسر لە پێناو ئومەمیەتدا کردوەتی چونکە میسر بەر لە سەد ساڵ تاکە وڵاتێکی عەرەب بوو سەرەتای چینی پرۆلیتاریای تێدا دەرکەوتبوو، پێبەپێش لەگەڵ فراژیبوونی دەلکا بە خەباتی چینایەتی و خزمەتی ئومەمیەت تاکوو سەرجەمی ئەرک و زەحمەتی پرۆلیتاریای میسر لەو خزمەتەدا لە تێکڕای ئەو ئەرکەی تێپەڕاند کە هەموو پرۆلیتاریای عەرەبی دەرەوەی میسر بەخەرجی دا، ئنجا لە خەسارەتمەندی بەولاوە نەچوە دەفری ئەو هەموو ئەرک و زەحمەتەوە...

سەیر لەوەدایە، ئەی خوێنەری کورد، کەوا ڕەنگە من تەنها کەسێک بم لە دوورەوە و بێدەسەڵاتانە خەفەتی ماڵکاولی سەدان و هەزاران کرێکاری ڕەنجبەری هەناسەساردی قاهیرە و ئەسکەندەریە و «المحلة الکبری»م خواردبێ لەو فیداکارییە بێلزومەی پێشکەشی ئومەمیەتیان دەکرد. کاشکی هەر نەبوایە یەک گوڵە گەنم لەو کێڵگە خوێناوییە زادی تێکەڕابایە... دەنکە زیوانێکیشی لێ شین نەبوو.

سەلاح حافز لە گوتارەکەیدا شتێکی گرنگی دیکەش فەرامۆش دەکات: بەر لەوەی ئومەمیەت برمێت ئەگەر کەسێک گوتبای ڕۆژەک لە ڕۆژان ئەم ئینتەرناشناڵە لەبەر ناواقیعیەتێکی تێیدایە دەرمێت سەدی وەک سەلاح حافز لە بەرەی شیووعیەتی ئەم جیهانە کابرایان دەدایە بەر هەزارویەک توهمەی نۆکەرایەتیی ئیستیعمار و بۆرجوایەتی و کۆنەپەرستی و دوشمنایەتیی هەژاران. خۆ ئەگەر کەسێک گوتبای دەوڵەتە شیووعییەکان زووبەزوو دەست دەدەنە دوشمنایەتیی ناوخۆیی، سەلاح حافز و سەدانی وەک ئەو دەیانگوت کابرا وڕێنە دەکا وەیا بەنگی کێشاوە یا هەر

نەبێ پارەی وەرگرتوە، کەچی ئەگەر مرۆڤ چاوی خۆی لە ڕاستییە زلەکانی ئەم جیهانە نەنووقێنێ دەزانێ و دەبینێ شەڕی نێوان خەڵق هەر لەسەر « Surplus Value - زێدە نرخ» و تەناقوزی نێوان چینەکان نییە. مێژووش لەسەر تاکە بنیچەی ماددە و سوود و زەرەر هەڵ نەستاوە. بەرژەوەندی قەومیش لەوانە نییە خێرا بە خێرا لە ژێر سێبەری چەند دروشمێکی تازەی ڕەگ دانەکوتاودا سپیپات ببێتەوە.

گرێوگاڵی بینسەروبنی دنیا و بەرژەوەندی هەمەجۆری کۆن و تازەزاو و نەفسی مرۆڤی وەها چین لەسەر چین و تۆژاڵ بە هەزارویەک هۆ و هاندەر و پەکخەر ڕاکێشەر تەفسیر ناکرێ، هەزارویەک ڕێگەی جوداجوداش بەشی ئەوە ناکات هەموو ئادەمیزادی تێرا بڕوات. دە هەزار یاسا و نەزەریە و پێشبینی و بیروڕا و فەلسەفەی لەیەک نەکردووش ناتوانێ هەموو جۆرە جموجووڵ و تێکهەڵقژان و ئاشتبوونەوە و ڕازیبوون و تۆران و ئازایی و ترسنۆکی و دوژمننەوازی و دۆست ڕەنجاندن و چاک و خراپ پیاوەتی و نامەردی و چونەپێش و پاشەکشە... و... هتد تێبخوێننەوە، ئینجا ئەوانەی لە لاباس و ڕێکەوتدا دان بەو ڕاستیانەشدا دەهێنن دەیانەوێ پێت بسەلمێنن کە فەلسەفەکەی ئەوان بەشی هەموو شت دەکات و لێشی زیادە ئیتر هەر جارە کە فەلسەفەکەیان کورتی هێنا دێن لەبەر یەکی دەکێشنەوە - وەک لاستیک- وەیا پارچەی زیادی پێوە دەنێن - وەک گوریس - بەلای باوەڕی منەوە سەلاح حافز و هاوڕێکانی لە جیاتی ئەوەی بە دەم ئەو کەسانەدا بچنەوە کە لچکولێو لە هەڵوەشانەوەی ئومەمیەت هەڵدەنێن وەیا هێرش دەبەنە سەر چاولێکەری شیووعیەتی ناوخۆیی لە شیووعیەتی دەرەوە، دەتوانن پەند لە نەگەیشتنەجێی بەڵێن و پێشبینیەکانی نەزەریەی ماددی وەربگرن بۆ ئەوەی شوێن هەنگاوی ئیمرۆ و سبەینێیان باشتر ببینن چونکە دیارە ئەو تیشکانەی لەو نەزەریەوە هەڵدەستنەوە بایی ڕوون کردنەوەی ئەم جیهانە نامەحدوودە ناکات، کەواتە پێویستە ڕووناکایی دیکە بهێننە سەر واقیع، ئیحتیمالی دوەم و سێیەمیش بخەنە پاڵ ئەو تاکە ئیحتیمالەی کە ماددییەت دەیکاتە «حتمية» و دەریش ناچێ.

ئاشکرایە بەشێکی زۆری هەڵوەستی سەلاح حافز زادەی داخستنی هۆش و نەفسی خۆیەتی بەرانبەر ئەو ڕاستییە ڕۆشنانەی کە لەگەڵ قودسییەتی باوەڕەکەی ڕێک

ناکەون دەنا دەبوو لەگەڵ خۆیدا بڵێ: «یا فاین!!» ئومەمییەت لە جیاتی چەسپان هەڵوەشایەوە... دەوڵەتە شیووعییەکان بوون بە دوژمنی یەکتر... سۆڤیەت و یۆغۆسلاڤیا لەگەڵ هەبوونی پێداویستێکی هاریکاری و ڕێککەوتن و تێکگەییشتن و گونجانی بەرژەوەندیدا نەیانتوانی بگونجێن، چ جایی برادەر بن... ئنجا چۆن دەشێ لەسەر تاکە بنجی تەماوی و خەیاڵاویی «هاوڕێیەتی»ی چینی کرێکار خۆمان بەوە ئیقناع بکەین کە دەبێ کرێکاری مەکسیک و «نجع حمادی» ڕێیان هەبووبێ بەر لە 130 ساڵ لە یەک بزووتنەوەدا کۆ ببنەوە؟

کە سەرۆکی دوو دەوڵەتی شیووعی بە دەوری مێزی ڕازایەوە لەبەر شەوقی کارەبا و نیعمەتی کۆندیشندا بە هەموو زانین و فەلسەفە و تەجرەبە و بەرژەوەندی موشتەرەکی بەینیان لە یەکدی دەست بدەنە خەنجەر و دەمانچە، ئەدی بەر لە سەد و ئەوەندە ساڵە چۆن دەشیا «عم دسوقي»ی میسر و «میستر سیمث»ی لەندەن و «گۆنزالیس»ی برازیل و «دیکران»ی ئەرمەنیا و «چاندرا»ی هیند کە هەتا مردن یەکدی نابینن و هەتا قیامەت لە یەکدی ناگەن و کێشەی ژیان و زەرفی خۆیان و میللەتیان لەیەک ناکەن بە تەلێکس و تەلەفزنییش [کە ئەوسا پەیدا نەبووبوون] قسەیان نەگاتە یەکتر، لەیەک بزووتنەوەدا کۆ ببنەوە؟

بانگەوازی ئیسلام بەر لە 1300 ساڵ بە 20 ساڵێک گەییشتە بەر گوێی قەیسەر و کیسرا تا ئەوەی هەردووکیانی کەڕ کرد کەچی ئەم بانگەوازەی «کۆمیونیست مانیفستۆ» بە سەد ساڵیش نەگەییشتە بەر گوێی عەمەلەی گەلێک لەم ئەرزە بەرینەی خودا هەرچەند لەچاو سەردەمی قەیسەر و کیسرا چەندین هۆی بڵاو کردنەوە و تێگەیاندن پەیدا بووبوو. ئنجا بۆ دەبێ ئیسلامێک کە بەلای ماددییەتەوە ئەفسانەی ڕووتە زووبەزوو بەڵێنەکانی بگەیەنێتە دی کەچی ئەو ماددییەتەی کە بەلای خۆیەوە هێوێنی ڕووناکی و ڕاستییە نەچێتە دڵی پرۆلیتاریای ئەو وڵاتە پێشکەوتوانەی کە دەبوو بە پێی دەقی نەزەرییەکە لە هەوەڵەوە ئەوان بتەنێتەوە و شۆڕشی سەرکەوتوویان پێ بگێڕێ؟

چەند سەیرە ڕێ هەبێ بۆ چین دوژمنایەتیی سۆڤیەت بکات لەبەر بۆرە بەرژەوەندیکی کە ڕەچاوی دەکات ئەمما دەبێ عەمەلەی میسر هەمیشە بەدەنگ بێ لەسەر عەمەلەی بنی دنیا!! کوا واقیعیەت لەو بەدەنگ هاتنەدا؟ بۆچی دەرچوونی

ئەلبانیا لە خەتی سیاسەتی سۆڤیەت ڕەوا بێ کەچی خەریکبوونی عەمەلەی میسر و عیراق بە بەرژەوەندی خۆیەوە دوور لە حیسابی بەرژەوەندی ئومەمیەتی خیانەت بێ؟ بۆچی خەریکبوونی عەمەلە و ڕۆشنبیری میسر بە سەریشەی گەلی برازیل ژیرانە و مەردانە و ناچاریش بێ کەچی گونجاندنی بەرژەوەندی خۆی لەگەڵ ئەو واقیعەی تێدا دەژیێت و پێشی ناوێرێت لادان و خیانەت بێ لە چارەنووسی پرۆلیتاریای جیهانی؟

چەند سەیرە حکومەتێکی شیووعی لەگەڵ ئەو هەموو بارە لەبارانەی هاریکاری و هاوڕێیی و هاوهەمووشتەی کە لەبەر دەستیدا هەیە بۆ ڕێککەوتن لەگەڵ دەوڵەتێکی دیکەی شیووعی، هەر نەگونجێت و ڕێک نەکەوێت پێشی نەگوترێ لە ڕێگە لاداو و غەیانی پرۆلیتاریا و بەهەڵەدا چوو، کەچی عەمەلەی میسر بەو ڕۆژانە کەمەی کە گوزەرانی کولەمەرگی پێ دەگێڕێ دەبوو خۆی و ڕۆژانەکەی و بەرژەوەندەکەی و ماڵ و منداڵەکەی بیەخێتە خەتەری تێچوون و گیران و لەبرسان مردن لە پێناو ئەو ڕووداوەی لە ئوستراليادا دەقەوما و نە دەستێکی ئەویشی تێدا بوە نە بە ڕەزامەندی ئەو قەوماوە و نە بە ئەویش چارە دەکرێ و نە ماڵکاولبوونی ئەویش دەبێتە سارێژکەری، نە ڕووسیا و ئەلبانیاش سوودێکی خۆیانی بە قوربان دەکەن؟

ئایا دوای موستەحیلبوونی برایەتیی دەوڵەتە شیووعییەکان ڕێم نییە [من کە سەلاح حافزم] لە واقیعیەتی بانگەوازی «کرێکارانی جیهان یەک گرن» بپرسمەوە؟ بەڵێ دەزانم دەوڵەتە شیووعیە گەورەکان تا ئێستاش بایی سوودی خۆیان ڕێز لەو بانگەوازە دەگرن بەڵام ئایا ڕێم نییە مامڵەتێک لەگەڵ ئەو دەوڵەتە گەورانەدا بکەم و بڵێم: بانگەوازەکە بان چاو و سەرم، بەڵام عەمەلەی دنیا بە مەرجێک قوربانی بۆ بانگەوازەکە دەدەن کە ئێوەی خاوەن دەسەڵات نیوەی ئەو قوربانییە لە پێناو ڕێککەوتنی نێوان خۆتان بدەن خۆ هەر چاوپۆشیەکیش لە یەکدی بکەن بەناوی «سوودی گشتی بزووتنەوەی شیووعی» بەر لە ئێمە بە چاکەی خۆتان دەگەڕێ، هەزاریەکی ئەو عەزابەش لەو ڕێککەوتنەتاندا نییە کە عەمەلەیەکی مەکسیکی بە ماڵ و ئازادی و بە گیانیشی لە پێناو بانگەوازەکەدا دەیکێشێت. ڕەنگە هیچ سوودێکیشی لێ وەرنەگرێت...

دەمێنێتەوە بگوترێ ئەو بانگەوازە ئەگەر بەو مەفهوومە ناواقیعیش بێ توانی جیهان بهەژێنێ و بزووتنەوەی کۆمیونیست پێش بیەخێت. لێرەدا دوو وەرامی گرنگی ئەم تێوەرێخە ڕەد دەکەنەوە:

یەکەم: هەموو ئەو بانگەوازانەی کە بەلای ماددییەتەوە نادروست و ناپەسەند و پووچەڵن، ئەوانیش جیهانیان وروووژاندوە و پتریش لە ماددییەت خەڵقیان بەدوا خۆیاندا هێناوە و بەردەوامتریش بوون. ئەگەر ئومەمیەت لە سەدەیەکدا هەڵوەشایەوە▪ کەچی مەسیحیەت دوو هەزار ساڵە دەژێت. بوودایی لەویش کۆنترە... مسڵمانەتی 1350ساڵە دەگەشێتەوە، خۆ ئەم باوەڕانەش هیچیان بەلای ماددییەتەوە لە ئەفسانەی ڕووت بەولاوە نین. وروووژاندنی خەڵق و ڕاکێشانیان خۆی لە خۆیدا نابێتە بەڵگەی ڕاستبوون و چاکبوونی ئەو شتەی دەیان وروووژێنێ و ڕایان دەکێشێت، بگرە زۆر جاران لایەنی ناواقیعیەت و عاتیفە لە باوەڕ و بزووتنەوەدا دەبێتە هێزی ڕاکێشەر و ڕاپێچەکەر هەروەک لایەنی ڕاستی و دروستی و زانست و مەنتیق لە بانگەوازی دڵسۆز و ڕێنما دەبێتە هۆی ناحەز کردنی چونکە ئاپۆرەی خەلقەکە تێی ناگات و کێشانە و پێوانەیان لەگەڵیدا ناگونجێت. تۆ بێنە کۆبوونەوە بە چەند زانا و فەیلەسووفێک بکە لەسەر بیروڕاکانی «ابن سینا» بدوێن، دەهۆڵ و زوڕنایەکیش لەو ناوەدا بەدەنگ بهێنە وەیا شەڕاخێوییەک ساز بدە بڕوانە ئاپۆرەی خەڵق بۆ کام لا دەجمێت.

دوەم: ئەم بانگەوازە خەڵقی وروووژاند و دوایی زانیمان ناواقیعی بوو، بەڵام ڕێگە ڕاستەکەی بێ هەڵە و بێ ئەرکی نابەجێ نەکرایە شەقامەڕێی خەباتی عەمەلان تا بزانین بە چ سوودێکی گەورەی دەگەیاندن و دەستبەتاڵی دواڕۆژیشی دەپاراستن.

«دەولییەی دوەم» ڕیسوا کرا چونکە داوای کرد لە باوەڕپێکردوەکانی کە هەر یەکە بە پێی زەرفی وڵاتی خەبات بکات تا بەلای شەڕی جیهانی یەکەم بەسەر دەچێ. ئایا ئەم داوایە ▪ خراپەیەکی تێدا بوو؟ کوێی هەڵە بوو؟ چۆن دەشێ کرێکارێکی فرەنسا هەر لە کولانەی دژایەتی شەڕەوە وا بەڕاست بزانێ کە پیاوەتی و چاکە و نیشتمانپەروەری و چینپەروەری لەوەدایە بەرانبەر سپای داگیرکەری ئاڵمان جووڵە نەکات! با ئەم سپایە بکوژێت و ببڕێت و بسووتێنێت، حەددی چییە عەمەلەی خاوەن باوەڕ بهێنێتە سەر ڕێبازی بەرگری و بەرهەڵستی؟ ڕاستییەکەی، عەمەلەی

ئەوتۆیی باشترین سوختەی عیسا پێغەمبەر دەبێ کە ڕوومەتی بۆ زللەی ستەمکار ڕادەگرێ!!

سەلاح حافز و هەزاران خۆبەختکەری وەک ئەویش هەم خۆیان دەحەسێننەوە هەم دوژمنی دەرەوە و ناوەوەش بێتەئسیرتر دەکەن و هەم بزووتنەوەی نیشتمانیی وڵاتەکەشیان لە تەنگ و چەڵەمەی بێلزوم دەپارێزن، ئنجا بزووتنەوەی جیهانیش دژی داگیرکەر و ستەم و دزێوی و هەژاری بەرەوپێشتر دەبەن ئەگەر لەبەر ڕۆشنایی واقیعی وڵاتی خۆیان و بەرژەوەندی میللەتەکەیاندا هەنگاو هەڵێنن بێ ئەوەی بەشێکی زۆری خەباتەکەیان بە بۆرە تەئویلان کز و پووچەڵ بکەن بە ناوی گونجاندنی لەگەڵ خەباتی فلانە شوێن و فیسار کۆمەڵدا چونکە خەباتی نیشتیمانی ناوخۆیی لە میسر و لە جێگەی دیکەدا لەسەر خەتی ڕاست و بێ جینگڵی بەرژەوەندی میللەتەکەی بڕوات هەر لە خۆوە بێ فاکوفیک و گونجاندن و بۆرە تەئویل لەگەڵ یەکتردا دەگونجێن، خۆ ئەگەر گونجانیش نەبوو، وەک لە نێوان دەوڵەتە شیووعییەکاندا نییە، ئەوسا چارە نامێنێ لەوەدا کە بزووتنەوەی نیشتمانی هەر وڵاتە بەلای وڵاتی خۆیدا دابڕێت نەک ببێتە محامی بێگانە.

سی ساڵ لەمەوبەر کە ناوچەی تریەستە کێشەی لەسەر پەیدا بوو لە نێوان یۆگۆسلاڤیا و ئیتالیادا پارتی کۆمیونیستی ئیتالیا خۆی دایە پاڵ داخوازی حکومەتەکەی ئیتالیا هەرچەند ئەوسا یۆغۆسلاڤیا لەگەڵ ڕووسیاش تێک نەچووبوو. هەڵبەت بزووتنەوەی نیشتمانی، چ بەرەو قەومایەتی چ بەرەو چینایەتی بێ، دەبێ وەک حیزبی شیووعیی ئیتالیا واقیعبین و ئازا بێ خۆ بداتە پاڵ بەرژەوەندی میللەتەکەی نەخۆ ڕیسوا دەبێ. بێگومان حیزبی شیووعیی ئیتالیاش کەڵکی لێ دەبڕا ئەگەر لەو کێشەیەدا لایەنی بێگانەی بگرتایە، ئەوساش مەرحەبا و ئافەرینی دووربەدووری هەموو جیهان بارە کەوتوەکەی بۆ ڕاست نەدەکردەوە. خۆ ئەوەی ڕاستی بێ مەرحەبای دووربەدوور و ئافەرینی بێگانە لە دڵدانەوەی سەرزارەکی تێپەڕ ناکات: ئەگەر حیزبی شیووعیی ئیتالیا لە کێشەی تریەستەدا خۆی دۆڕاندبایە دەیەکی ئێستاکەی حورمەت نەدەگیرا نە لەلایەن دەوڵەت شیووعییەکان و نە لە هیچ لایەنێکی دیکەوە، دەیەکی ئێستاکەشی پێ نەدەکرا لەنگەری سوودی جەماهیری خۆی و ئەو بەرەیەی بڕوای پێی هەیە ڕابگرێ. بەداخەوە دوای ئەو تەجرەبە

ڕابەرەی هەڵوەستی شیووعییەکانی ئیتالیا بزووتنەوەی شیووعیی وڵاتی عەرەب نەیتوانی لە کێشەی فەلەستین، لە زۆر مەسەلەی دیکەشدا، بە پێی بەرژەوەندی خۆی و بیروڕای میللەتەکەی ڕابوەستێ، زەرەری کوشندەشی لەوەدا کرد تا ئەوەی لە هەندێ شاری گەورەی عەرەبدا بارەگایان بەرد باران کرا.

خولاسە، سەلاح حافز لەو قسانەیدا بە نیازی لەسەرخۆ کردنەوە و پشتگیری کردن لەو کۆمەڵەی باوەڕی پێیان هەیە شریتەی فکریکی پسۆک و پوایەوەی چەپ بە قاچاغ دەهێنێتە ناو هەرای بەینی بەرەی چەپ و ڕاستی میسر و زەرەری بێلزومی تێدا دەکات چ سوودیش بە هیچ شتێکی وەها ناگەیەنێ کە خۆی خۆشی دەوێت. من بێ ئەوەی بمەوێ لەسەر سەکۆی پەندیاری و ئامۆژگارییەوە خۆمی لێ بەدەنگ بهێنم، تەنها لە گۆشەنیگای لایەنی سەلبیی هۆش و زاتی مرۆڤەوە دەڵێم ئەو جۆرە هەڵوەستەی سەلاح حافز کە دیفاع کردن لە بەرەی چەپی میسر دەبەستێتەوە بەو ڕووداوانەی دەروەی وڵاتی عەرەب کە بە کۆنە مەزهەبی ئومەمیەت دەبێ دیفاعی لێ بکرێ، نە پێوەندی بە سوودی عەرەب و میسرەوە هەیە نە پێویستیی خەباتی چینایەتی داوای دەکات، نە لەلایەن هەڵوەستی فکری و فەلسەفیشدا زادەی ڕوە ئیجابیەکەی زات و هۆشی بەسەهوو چوە.

ئەو تەرزە کوتانەوەیەی کوێرەڕێی زێدە تەماوی کۆنە مێژووی بە ئەسڵ هەڵە جۆرێکە لە دەروێشایەتیی لێڵ و تاریک، هەرچەند نازیش بە واقیعیەت بکات و ئەوپەڕی چاوبەستەکێی زیرەکانەشی تێدا بەکار هاتبێت. هەتا نموونەی سەلبییەتی زات و هۆش لە مرۆڤی زیرەکدا دەر بکەوێ پتر لە ناواقیعیبوونی ئەو دیاردە سەلبییە زیاد دەکات چونکە ئەگەر مرۆڤی کەمزان و نازیرەک نموونەی بەراورد کردن بێ، دەشێ بگوترێ دیاردەکەی سەلبییەت هی نازیرەکی و کەمزانینەکەیە نەک هی زاتەکە و هۆشەکە، واتە ڕێ دەمێنێ بگوترێ هۆشی مرۆڤ خۆی لە خۆیدا بەبەریەوە نییە لایەنی سەلبی هەبێ لە بەرانبەر لایەنە ئیجابیەکەیدا بەڵام هۆشی ناتەواو و زانینی کەموکەسر خۆی بە شێوەی سەلبی دەنوێنێ، دیارە کە زیرەکی و زۆرزانی بەرەواژبوون و هەڵەشەیی بە مرۆڤ کرد ئەو تەرزە تەئویلە لە خۆوە دەچێتەوە چونکە هەر دەمێنێتەوە سەلبییەتەکە کاری بەرەواژ بکات.

بەهەمەحاڵ ئەوەی من لەم نووسینەدا دەوری هەڵدێم بەوەندە ئیسپات دەبێ کە لەلایەنی سەلبیی هۆش و زات بە درێژایی مێژوو و هەمیشە کات و لە هەموو جێگەیەکدا کاریگەر بووبێ، ئیتر لەبەر نازیرەکی و نەزانی بێ وەیا بە هۆی سروشتی هۆش و زات بێ [کە ئەمەیان بیروڕای منە و باوەڕی پێ دەکەم].

لەگەڵ ئەمەشدا، بگرە بە هۆی ئەمەوە، ئەم دوو لایەنییە تا ماوەیەکی یەکجار درێژی دوارۆژ بەردەوام دەبێ هەرچەند نەشتوانم چۆنیەتی ئەو بەردەوامبوونە و مەوداکەی و جۆری کار کردنی لە کۆمەڵایەتی لێرە بەدواوە دەست نیشان بکەم. زەحمەتی ئەو پێشبینییەش لە زۆربوونی هۆی پێشخەر و پەکخەری مرۆڤەوە دێت هەر وەهاش لە کرانەوەی هەزاران مەیدانی زانست و هونەر و بیروباوەڕ و تێکهەڵقژان و ئاڵۆزکان و فەندی گێل کردن و خۆ بەسەهوو بردن و... هتد... ی ئەوتۆوە دێت کە پێشتر هەموویان داخراو بوون و بەمەشدا ژیانی ماددی و مەعنەوەی جاران کەمتر گرێیاوی و ئەرکدار بوو هەرچەند چاوکرایەوەش نەبوو.

کەس نازانێ ئەو ڕۆژەی بۆمبای ئاتۆمی دەکەوێتە دەست جەردە و نەفس نەخۆشان حاڵی مرۆڤایەتی چی لێ دێت کە دەزانین هەر لەو کاتەشدا هەزاران دەردی قورسی ئیمرۆکەی وەک کەمدەرامەدی و نەخۆشی و ناکۆکی و شەڕی فەلسەفان و قاتوقڕیی ئەوسا گرانتر دەبێ. تا ئەوەندەی زیهنیش تێبر دەکات پێبەپێ ئاڵۆزکانی باری ژیان و ئەرکی بەڕێوەچوون و تەنگبوونەوەی مەیدانی گوزەران و کشتوکاڵ لەچاو زۆربوونی ژمارەی مرۆڤ و دەیان و سەدان کاریگەری تەنگەتاوکەری دیکە لایەنی سەلبیی هۆش و زات پتر دەتوانێ وێرانکەر و تێکدەر و پەکخەر و کوژەر بێت. ئنجا ئەگەر لایەنە ئیجابیەکە هەنگاوی خێراتر و درێژتر هەڵنەهێنێ و هاریکاری گشتی لە نێوان سەرلەبەری ئادەمیزاددا زیاد نەکات و بە پێی گرنگی کارەکە لە چارەسەرکردندا ئازا و دڵسۆز نەبێ و خەتەری وێرانکاریەکە نەنیشێتە قەناعەتی ڕابەرەکانیەوە کەس ناتوانێ خەیاڵیش لە فرەوانی جغزی ئەو بەڵایە بکاتەوە کە بەسەر مرۆڤدا دێت هەر لە دەست مرۆڤەکە خۆیەوە.

لە تابلۆی هەڕەشەکانی دوارۆژدا کێشەی ئێستاکەی نێوان کرێکار و سەرمایەدار دەبێتە گەپی منداڵان وەک کە لە زۆر باری ئیمرۆکەشدا بێبایەخ بوە. ئنجا کە نێوان ئەم دیمەنە زێدە ئاشکرایەی گێروگرفتی مرۆڤایەتیدا سەیری فێڵە زیرەکانەکەی

سەلاح حافز دەکەم کە ڕێخۆشکەرەوەی ئیفلیجبوونی بەشێکی زێدە چالاکی دانیشتوانی میسر بەدەست خۆم نییە لە شێوەی بەدیهیەدا بە مرۆڤێکی سەلبی دەبینم نەک هەڵەکردوو. بێ تەئسیر کردنی خۆی و هاوڕێکانی لە پێناو ئامانجێکی دوور لە واقیعیەت و پوایەوە جۆرێکە لە پەرستنی شەبەنگی وەهمی بەر چاوی دراویلکەکردوو. چەندیش زەحمەتە بۆ سەلاح و هاوڕێکانی بادەنەوە سەر ڕێبازێکی واقیعی بێ ئەوەی هەستی بەخۆ نازینیان بریندار بێت... کە لەم نووسینەدا باسی ئەو گرووپەم کرد پێویستە بە هیوای چاکەیانەوە دوعاخوازییان لێ بکەم...

لێرەدا دەبێ شتێکی مەیلەو دەرەوەی لێکدانەوەکەم بدەمە بەر هەڵسەنگاندن: من کە دەڵێم هۆش و زاتی مرۆڤ لە سروشتیاندا دوو لایەنی سەلبی و ئیجابی هەیە ڕەنگە خەیاڵ بۆ ئەوە بڕوا کە ڕایەکەی منیش جۆرێک بێ لەو باوەڕەی کە یەکێکی وەکوو زەردەشت بەر لە هەزاران ساڵ دەیگوتەوە بەوەدا کە باوەڕی بە ڕووناکی و تاریکی و یەزدان و دێو هەبوو. بەڵام هەر نەختێک وردبوونەوە لە دەقی ئەو قسانە تێت دەگەیەنێ کە من سەلبییەت و ئیجابییەتەکە نادەمەو» دەرەوەی زات و هۆشی مرۆڤ وەک کە زەردەشت دوو هێزی چاکە و خراپەی «ڕووناکی و تاریکی» لە سەرەتای پەیدابوونی جیهانەوە، بەر لە پەیدابوونی مرۆڤ، تصور دەکرد و هەر یەکێک لەو دوو هێزەشی بە سەربەخۆ دەزانی. ئەمە لەلایەن زەردەشتەوە. لەلایەن زۆرینەی نووسەران و خاوەن ڕایانیشەوە، بەر لە من گوتوویانە زاتی مرۆڤ هێزی چاکە و هێزی خراپەی تێدایە بەڵام ئەوەی من بۆی دەچم بەلای کەمەوە دوو خاڵی گرنگ لەو قسانە و بیروڕایانەی جودا دەکەنەوە:

خاڵی یەکەم ئەوەیە کە نەمدیت هیچ کەسێکی من نووسینیانم خوێندبێتەوە باسی ترسی ماتیریالیزمی لە وەهمی «دوانەتی» هێنابێتەوە بە سەبەبی خۆ دزینەوەی ماتیریالیزم لە دانهێنان بە دەوری سەربەخۆی هۆشی مرۆڤ لە گۆڕانی کۆمەڵایەتیدا، ئنجا هیچ یەکێکیشیان بۆ ئەوە نەچوە کە دوانەتی هەر جارێک نییە بەڵکوو دوو جارە: دوانەتیی لایەنی ئیجابی و دوانەتیی لایەنی سەلبیی هۆش، وەک دەشبینی دوانەتی سەلبییەتەکە لەگەڵ لایەنە ئیجابیەکەی خودی هۆش پەیدا دەبێ، کەچی دوانەتی لایەنە ئیجابیەکە لە نێوان هۆش و ماددەدا پەیدا دەبێ.

هەر ئەم ڕاستییە وا دەکا کە لە زۆر باردا چەندێکی هۆش و ماددە یەک تیشکی گونجان و ڕێکهاتنیش بدەنەوە تا ئەوەی بیری ماددی دڵی خۆی بە یەکبوونی ماددە و هۆش خۆش بکا، لە نکاو لایەنە سەلبییەکە قوت دەبێتەوە و دوانەتییەک دروست دەکا کە بیری ماددی لێی هەڵدێ: یەک پەردەی ڕەشی سەلبییەتی هۆش لەوەدا خۆی دەتەنێتەوە کە دێت و لە جەرگەی حەقیقەتی دۆزرایەوەدا بە هێزی ڕسکاندنی دڵگەرمی و کوردەغیرەتی و لایەنگیری و دوژمنایەتی و بێئینسافی و تەعەسوب... و... هتد لە نەفسی مرۆڤدا یەک شەوەزەنگی گومڕایی و جەهالەت دەزێتەوە یەکی ڕاستییەکە و هەموو ڕووناکیەکەی دەخات.

بە نموونە، ڕەنگە تۆیش بیستبێتت کە مرۆڤی غەزاکردوو لە پێناو قودسییەتی کردگاردا هاتوە منداڵی ناو بێشکەی بەرەی دوشمنی فەساد کردوە وەیا جەرگسۆزی لەحەدبەدەر بۆ چینایەتی کێشاوەتیەوە بۆ زەرەردان لە قەومایەتی وەیا شەیدابوون بۆ قەومایەتی بەلاێ ستەمی بێئامان و ساماندا چۆتەوە وەیا ڕەگ داکوتان لە زانستێکدا زاناکەی بەرەو چاو داخستن و خۆ کەڕ کردنەوە بردوە وەیا زانای ماددی لە جیاتی خوا ماددەی گەیاندۆتە ڕیزی خالق.

لۆرد ئیمری لە یاداشتی خۆیدا دەنووسێ: لە دەوروبەری 1900 ئەفسەرەکانی ئەوسای ئینگلیز لە باشووری ئەفریقادا لە دانیشتنێکی عادەتی یانەی ئەفسەراندا وتووێژ دەهێننە سەر باسی گۆڕانی چەکی شەڕ و کزبوونەوەی دەوری «سوارە» بەرانبەر چەکی نوێ. دوو ئەفسەری گەنج «هێگ» و «فرێنچ» پشتگیریەکی بێمەنتیق لە دەوری سوارە دەکەن تاکوو دڵگەرمییەکی وەها خەست سواری هەستیان دەبێ لێیان بوو بە «گرێی ئەسپ». دواتر لە شەڕی جیهانی یەکەمدا، بۆ بێتالعی بریتانیا، ئەم دوو ئەفسەرە یەک لە دوای یەک دەبنە سەرۆکی هەموو هێزی سپای ئینگلیز و کرمی دڵی خۆیان بە فرە کردنی هێزی سوارە دەکوژن و 700 هەزار ئەسپ دەکڕن و دەینێرن بۆ ناوچەی شەڕی فەرەنسا. بەپێی قسەکانی ئیمری سپای ئینگلیز لە پێناو ئەم پەرە پێدانەی چەکی «سوارە» کە باشترین و بەپێزترین نیشانە بوون بۆ شەستیرەکانی سپای ئەڵمان خەریک بوو بڕبڕەی پشتی بشکێت... لەم تەرزە نموونانە چەندێکی ئارەزۆ بکەین دەتوانین لە ڕووداوی کۆن و نوێ شایەد بگرین، چی خستنمە بەرچاو بەسە بۆ ڕوون کردنەوەی بابەت.

خاڵی دوەم ئەوەیە کە کەسانێکی قسەشیان لە دوو هێزی پەسەند و بەدی نەفسی مرۆڤ کردوە نەهاتوون لایەنە ناپەسەندەکە بە کاریگەرێکی بنجیی چارەنووسی مرۆڤ لەقەڵەم بدەن بارتەقای لایەنی پەسەندی هێزی نەفس و هۆش. هەمیشە کۆمەڵایەتی و مێژوو لەبەر تیشکی لایەنە ئیجابییەکەدا شی کراوەتەوە وەک بڵێی لایەنە تاریکەکە دەخلی بەسەر ڕووداوی گشتی و گەورەوە نەبوە. ئەوپەڕی بایەخ بەو لایەنە تاریکە درابێ ئەوە بوە کە گوتراوە لە مرۆڤدا جارێ غەریزە و سیفەتی حەیوانی هەر ماوە. لێرەشدا چەند تێبینییەک هەیە بۆچوونە بەرفرەوانەکەی من لەو تەرزە بۆچوونە بەرتەسکانە جودا دەکەنەوە:

1. ئەو نووسینانە بەزۆری مرۆڤی بێتەرەف دڵ و دەروونی خۆی پێ کردوونەتەوە بێ ئەوەی بە هیچ جۆرە لێکدانەوەیەکی دیکەی ماددی و نامادّدی گرتبێ و لەو ناوەدا چەقەچەقێکی فکری هەڵستاندبێ وەیا هەڵوەستێکی خۆی لەتەک هەڵوەستی دیکەدا نەقش بەستوو کردبێ، گەلێک جارانیش کە هاتوون غەریزەیان کردوە بە بنەمای ناپەسەندییەکان پێوەندییان بەو دەورە سەلبییەی هۆشەوە نەماوە کە خزمایەتی لەگەڵ غەریزە نییە و من لەم نووسینەدا دەیخەمە بەر ئاوێنەی بیرکردنەوەی ماددیی تەقلیدی و دەمەوێ وەک کاریگەرێکی ناپەسەندی کۆمەڵایەتی و مێژوو بی ترنجێنمە ناو ئەو کاریگەرانەی بەلای ماتیریالیزمەوە جەڕ و مەنگەنەی کۆمەڵایەتین. غەریزەکان هی بەدیشیان تێدایە و هی باشیش، ڕەنگە بەشێکی ئەوان غەریزانەی لە ڕواڵەتیشدا بەدن بە لێکدانەوەی ورد بدرێنەوە بە لایەنی چاک وەک ئەوی کە ئەگەر مرۆڤ مەیلی خۆ هەڵدانەوە خۆسەپاندنی تێدا زۆر کز بوایە ڕەنگ بوو بەشێکی بەرچاوی ئەو پێشکەوتنە گرنگانەی کە خەتەری کوشندەی تێدایە بۆ ئەوانەی تییاندا خەریکن هەر ڕوو نەدات. مرۆڤ ئەگەر هەر مام سەلامەتۆکە و دەستوپێ سپیلکۆکە و سەرکزەڵۆکە بوویایە نەدەگەییشتە قوتبەکان و بنی دەریاکان و تاقی ئاسمانەکان و جەرگەی کارەبا و ئاتۆم، هەزاریەکی ئەو دۆزینەوە و داهێنانەشی پێ نەدەکرا کە پەکیان لەسەر ئازایی و بەخۆ نازین و ڕێ بڕکێ و خاسیەتی ئەوتۆ کەوتوە.

2. ئەو زانایانەی باسی نەفس و ناوەڕۆک و لەش و هەموو سەروبەری مرۆڤ بە شێوە «تطبيقي - مختبري - ئەزمووگەیی» دەکەن لە هیچ ڕوویێکەوە خەریکبوونەکەیان سەربە فکر و فەلسەفە و کۆمەڵایەتی - سیاسی - ئابووری و شەڕەدەندووکێی بیروڕا جوداکانی فەلسەفان ناگەیەنێ. بەتەواوی وەک بابایەکی توێژینەوە لە ژیانی «هەنگ» دەکات. لە نووسیناندا دیتوومە زانای نەفس بە جۆرێک مرۆڤ و ئیرادە و کردەوەکانی دەکاتەوە بە بەرهەمی ئالی و بێئیرادە کەڵکی کۆمەڵایەتی پێوە نایەڵێت مەگەر ئەو کۆمەڵایەتییەی کە ئەویش بێ ئیرادە و ئامانج بێت. ئنجا کە ئەمە وەها بێ هەرگیز نۆرەی قسە لێوە کردن ناگاتە باسی دوانەتی Dualism وەیا هیچ لێکدانەوەیەکی دیکە.
3. لێکدانەوەکەی من لایەنی سەلبی و ئیجابی لە هۆشی مرۆڤدا ناداتەوە بە دوو سەرچاوەی سەربەخۆ (وەک زەردەشت و ڕابەری دیکەش بۆی چوون) بەڵکوو هەردوویان وەک دوو ڕووی یەک سککە تەماشا دەکات لە شی کردنەوەشدا دەرم بڕیوە کە سەلبییەتەکە لە سروشتی هۆش و قابیلیەتی لێکدانەوە هەڵدەقوڵێت کە دێت و تەفسیری هەڵە دادەنێ بۆ ئەو دیاردانەی تێیان ناگات وەیا بایەخی زیاد بەو شتانە دەدا کە زۆریان خەریک دەبێ وەیا چاکەی دوژمن بە خراپە لە قەڵەم دەدا... وەیا... وەیا... تۆ سەرنج لە مرۆڤ بگرە کە خوو بە شتێکەوە دەگرێ چۆن بۆی بێئۆقرە دەبێ و لە ئاستیدا خۆی پێ ناگیرێ. خولاسە بەلای منەوە سەرچاوەی ڕۆشنایی و تاریکایی لە هۆش و پێزانینی مرۆڤدا یەک شتە نەک دوو، هەرچەندە ئەنجامەکانیشیان تا بڵێی لە یەکدی جودان و هەرگیز یەکدی ناگرنەوە.

جوداوازیی دیکەش هەن بینینی من لە هی غەیری خۆم هەڵاوێرن بەڵام پێی ناوێ ڕیزیان کەم چونکە لە تێکڕای نووسینەکەدا دێنە بەرچاوی خوێنەر.

ئەگەر مرۆڤ هاتبایە وەک کە بۆ لایەنە پەسەند و سوودبەخشەکانی چالاکی و بنیات نان و هەڵمەت بردن و دۆزینەوە و داهێنان و تێکڕای ئەو کارانەی مێژووی

نووسراوی هەیە، لیستەیەکیشی بۆ لایەنی ویرانکاری و سووتاندن و کوشتن و تۆقاندن ڕیک خستبایە دەیزانی سەلبییەتی هۆش و زات چ نرخێکی زلی لێ ستاندوە. ماتیریالیستەکان و خەباتگێران بە تێکڕای هەر ئەو زوڵمەی فیۆدال و بۆرجوازی و دەسدرێژکەر کردوویەتی لە نەخشەی مێژوو تۆمار دەکەن و دەیخوێننەوە بێ ئەوەی هیچ بەشێکی ئەو زوڵمە بدەنەوە بە لایەنی تاریکی هۆش و زات و دەستوورێک هەڵێنجن هەموو زوڵمێک بگرێتەوە، هەر بۆیەیە بەلای ئەو کارە بەدە وردیلانەدا ناچنەوە کە چەوسێنراوە بەدرێژایی ڕۆژگار لە ژیانی ڕۆژانەیدا کردوەتی، تەنانەت لە ورووژمی سپای پاشایەک بۆ سەر وڵاتی دیکەدا ورد نابنەوە لەو ستەمە بێلزومانەی تاک تاکی سەربازی هێرشبەر کردوویەتی، خۆ ئەگەر ڕێ هەبێ لەوێشدا دەڵێن سەربازی زوڵم کردوو هی چینی چەوسایەوە نەبوە بەمەشدا هانا بۆ لای میتافیزیک دەبەنەوە چونکە سەربازی چەوسایەوە دەکەن بە فریشتە. من لەو حیسابەی لێرەدا دەیکەم تەنها ئەو بەدایەتیەم مەبەستە کە هۆشی تاریک بە مرۆڤی کردوە نەک لە ڕێی زوڵمی پاتەوپاتی زیرەکانە و بە چاوی کراوەوە ڕووی داوە چونکە زوڵمی عادەتی ناچێتەوە بۆ لای سەلبیی هۆش: زاڵم بە زۆری ئاگاداری خۆیەتی چ دەکات و چۆن دادەبرێت. ئەو زوڵمە بەلای مرۆڤەوە خزمەتی ئامانجی «پیرۆز! ئاسمانی! بەرز!» دەکات ئەویان بۆ حیسابی سەلبیی هۆش دەگەڕێتەوە وەک جەزبەگرتوویەکی ئایین وەیا سیاسەت هەڵکوتێتە سەر بێتاوانان و لەناویان ببات و واش بزانێ لەوەدا خزمەتی غەیبی پیرۆز وەیا ئامانجی سیاسی مەردانە دەکات.

لە نووسینێکی دیکەمدا شتێکی سەر بەر لایەنەم باس کردوە کە دەڵێ کابرایەکی عەشرەتی چۆوە دێیەکەی و بە خەڵقەکەی گوت «لەو پەنا باسکەی پشت ماڵان حەنەفیلکۆکەکم کوشت...» دیارە کابرا شافیعی بوە، مەبەستی خەڵقیش لە گێڕانەوەی حیکایەتۆکەکە بێعەقڵی و گەمژەڵی کابرا بوە کە بەلایەوە حەنەفیش هەر کافرە، خۆ ئەگەر کوژراوەکە مەجووسی وەیا هیندوس وەیا گاور بوایە کەس گلەیی لە کابرای قاتڵ نەدەکرد. سەیری چۆن گومڕایی و تاریکایی توێژ لە دوا توێژ بەسەر هۆشدا کەڵەکە دەکات. بڕوات بێ بۆ ماوەی سەدان ساڵ خوێنی عەشرەتێک بەلای جیرانەکەیەوە حەڵاڵ بوە، دیارە بەدوا خوێنەکەیدا ماڵ و نامووسیشی.

کە دەوری عەشرەتگەریش بەسەر چوو وەیا تاڕادەیەک تەعەسوبی ئایینی ڕەویەوە سەدویەک سەبەب و دەرگەی نوێ لە بابەتی تازەداهاتووی ئەم ڕۆژگارە لە حەلالبوونی ڕۆح و ماڵ و هەموو شتێک بە ڕووی ئادەمیزاددا کرایەوە، بڕوا دەکەم ژمارەی کوژراوی خەباتگێڕ بە دەستی خەباتگێڕی میللەتەکەی خۆی پتر بێ لە ژمارەی کوژراوی بڵباس بەدەستی مەنگوڕەوە. هەر لەبیرمە. ساڵی 1961 لە دەمی دەسەلاتی عەبدولکەریم قاسمدا تازە هەرای کوردستانی خۆمان دەستی پێکردبوو، گوێم لە چەپڕۆیەک بوو دەیگوت بە فلانکەسم گوتوە پەلە مەکە لە ژنهێنان، هەر بەو نزیکانە بێوەژنی پارتییەکان زۆر دەبن ژنێکی کەممەسرەف بهێنە. لەلایەن تاریکی و ڕووناکیی هۆشەوە ئەو زاڵمە هێرشبەرەی کە بە چاوی کراوەوە دەست بەسەر گیان و ماڵی خەڵقدا دەگرێ نەفسی بەدە بەلام هۆشەکەی تاریک نییە، ڕەنگە ئەو ڕەشوڕووتەی شەڕەکەی بۆ دەبەنەوە ئەوان هۆشتاریک بن ئنجا زاتەکەشیان یا بەدە یا چاک چونکە ڕەنگە بەشێک لەو سەربازانە وەک سەرۆکە خوێنڕێژەکەیان بە چاوی کراوەوە دەسدرێژی بکەن و بەمەدا نەچنە ڕیزی هۆشتاریکان بەلام ڕەنگە بەشێکی دیکەیان وا تێبگەن لەو کارە بەدەدا خزمەتی چاکە و مەردایەتی دەکەن: ئەمانە گومڕای تەواون.

بیرکەرەوەی ماددی کە ئەم ڕاستییە وردانە لەبیر خۆی دەباتەوە دێت سەرزارەکی موجامەلەیەکی ساردوسڕی هەژارانی پێ دەکات و ڕەنگە لە دواڕۆژیشدا کە خۆی لێیان بوو بە سەرۆک بە تەئویلی نادروست زمانی ڕەخنەگرتن و مەیلی نارەزامەندییان ببڕێت. من دەڵێم با ئێمە هۆشتاریک نەبین وەک ئەو کەڕەوارانە، خراپەیەکی کردوویانە لە ژێر سەرەناوی «خراپە» دا بمێنێتەوە بەلام مافی ڕەخنەگرتن و ڕازینەبوونیشیان پێ بدەین هەر نەبێ لەبەر ئەوەی کە لە کتێبە پیرۆزەکانی شۆڕشگێڕایەتیدا ئەو ڕەشوڕووتە خۆی خاوەن ماڵە ئیتر بۆ دەبێ نەوێرێ لە ماڵی خۆیدا ڕەخنەگر و ناڕازی بێت سەرۆکەکەش هەر بە پێی مەزهەبی شۆڕشگێڕان خزمەتکاری ئەو ڕەشوڕووتانەیە. ئنجا چۆن ڕەوایە خزمەتکار مافی زمان بڕینی گەورەی خۆی هەبێ؟ ئەم هەڵکەوتە نارێکەی نێوان بەرەی چەپ و شۆڕشی سەربە ماددییەت کە «تناقض»ی بێتەئویلی تێدایە لە بەشێکی کەمزان و درشتبینی پیاوە ئایینییەکانیش بەدەر دەداتەوە کە جارێکیان دەڵێن هاوڕێیانی

پێغەمبەر (د.) لەلایەن زانینەوە ژووروروی پلەی «مجتهد» و مەلا و فەیلەسووفە زلەکانەوەن،کە لێشیان بپرسیت ئەدی بۆچی لە بارەی زانستەکانی سەربە سروشت و ئاسمان و شتی ئەوتۆییەوە لێیان نەبیستراوە شتێکیان ڕوون کردبێتەوە وەرامت دەدەنەوە دەڵێن لەو سەردەمانەدا هێشتا خەڵق لەلایەن زانستەوە ساوابوون و دەرکی ئەو وردەکارییەیان نەدەکرد: بەو پێیە موجتەهیدیشن و ساواشن. قسەی سەرکێڵ چ لە پیاوی ماتیریالیستەوە بێ چ لە ئایینی دەکێشێتەوە سەر مەتەڵی «بانێکە و دوو هەوا».

زۆرینەی ئەو خاوەن بیروڕایانەی لە بارەی کۆمەڵایەتی و مرۆڤەوە دەدوێن وەها ڕادەنوێنن کە مرۆڤ لە هەر پلەیەکی شارستانەتیدا بێت بایی ئەو پلەیە لە چالاکی و زانین و هۆش تێهەڵدەکشێت. من هەرچەندە دەزانم دەبێ جۆرە هاوئاهەنگییەک هەبێ لە نێوان زەرفی ماددی و لایەنی هۆشەکی - مەعنەوی مرۆڤدا هەر نەبێ لەبەر ئەوەی کە هۆش و مەعنەوییات تێکەڵ بە زەرفی ماددی دەبن و تەفاعولی لەگەڵدا دەکەن دیسانەوە لەگەڵ ئەو قسە سافیلکەیە نیم کە ڕێم نادا خوردی بکەمەوە لە ڕایەکی گشتییەوە بۆ ئەو هەڵکەوت و هەڵوەستانەی کە واقیع پڕ دەکەنەوە.

دەزانم دەبێ مرۆڤی سەدەی نۆزدەم لە پازدەم، بە عادەت، پێشکەوتووتر بێ هی ئەورووپاش لە هی قڕناقەی خۆمان هەڵکشاوتر بێ بەڵام دەبێ بشزانم کە ئەو مەیدانە بەرفرەوانانەی لەبەر دەست و هەستی مرۆڤی سەدەی بیستەم و ئەورووپادایە لێیان دەوەشێتەوە پێویستیان بە پتر ژیری و زانین ڕووناک و هۆشی بە بڕشت هەبێ لەوەی کە سەدەی بیستەم و ئەورووپا پێیان بەخشیوە.

بە تەعبیرێکی دیکە، هەر دەڵێی مرۆڤ لە صەدەیەکدا پێویستی بەو پێشکەوتنە نەفسی و عەقلییە هەیە کە لە دوو صەدەدا پەیدای دەکات. ڕەنگە ئەگەر لە ساڵی 1500 هۆش و گۆشی 1800ی هەبوایە توانیبای بەسەر گیروگرفت و تەنگ و چەڵەمەی ئەوسایدا زاڵ بێ، وەیا دانیشتوانی کوردستانی ساڵی 1700 لەو ژیانە سادە و هەژارەیدا هۆش و گۆشی ئەورووپای ئەوسای هەبوایە باشتر لەگەڵ بەرژەوەندی کۆمەڵایەتی خۆی لەو واقیعە دواکەوتوەدا بەڕێوە بچێ و ئەو گرفتانەی لە ڕێیدا بوون بیانڕەوێنێتەوە.

نموونەیەکی بچووک و بەرچاو ئەو دیارەدەیە لە تەجرەبەی خۆم و خۆتدا دەردەکەوێ: هەرجارە کە لە تەمەنێکدا هەڵەی زل دەکەین و دوای چەند ساڵێک بە هۆشێکی کامڵتر تێی دەگەین، ڕەنگ بوو ئەگەر پێشتر ئەو هۆشەمان هەبوایە هەڵەکە نەکەین. هەر لەو دەمەشدا کە هەڵەی تەمەنێکی کۆن دەدۆزینەوە هەڵەی تازەبەتازە دەکەین کە ئەگەر هۆشی تەمەنێکی دواترمان هەبوایە نەیانکەین. لەم بارەیەوە چی لە ژیانی خۆم و خۆتدا دەیبینین لە نێوان کۆمەڵە جۆراجۆرەکانی وەک حیزب و ڕێکخراو و دەوڵەتیشدا دێتەوە بەرچاو کە ئەوانیش وەک من و تۆ بە درەنگە کاتەوە لە خەڵەتەکانیان دەگەن، وەک من و تۆش خەڵەتی تازەبابەت دەکەن کە نەکردنی پێویستی بە تێگەیشتنی چەندین ساڵی دوارۆژ هەیە.

ئەم دیاردەیە لە نێو گیانلەبەراندا دەرناکەوێ چونکە هەمیشە بە غەریزە نەگۆڕاوەکانیان مامڵەت لەگەڵ واقیع دەکەن لەبەر ئەمە ناتوانن بە غەریزەی سەد ساڵ دوای ئیمڕۆ لە هەڵەی ئیمڕۆکە ڕزگار ببن. لایەنی نامادی مرۆڤ (مەبەست لە هۆش و نەفس و خاسیەتە جوداکەرەوەکانی مرۆڤە) وەک کەوی ناو قەفەسی لەش و دەوربەرەکەی نییە، نامادییەتی مرۆڤ ئەگەر یەکسەر و ڕاستەوخۆ لە ماددەوە هەڵقوڵبێت هیچ دەخلێکی هێزی غەیبی دیسانەوە لە هەردوو ڕووی سەلبی و ئیجابییەکەوە وەها بەرز و نزم و کەم و زیاد و تایک و ڕووناک دەبێ کە بەر هیچ ڕاستە حیسابێکی قەراردادەی دەوروبەری ماددی ناکەوێت: مرۆڤ لێی دەوەشێتەوە لە پەراوێزی بەرەو ئیجابییەتدا ئەوەندە بەرز ببێتەوە یەکجار ژووررووی پلەی ماددی سەردەمی خۆی بکەوێتەوە، لەوانەیشە بە تاریکایی لایەنی سەلبییەتدا بچێتە خوارێ لە تاریکستانی هەزاران ساڵە تێپەڕێنێت.

ئەمانە ڕاستی ئەوتۆن لە خۆوە جلوە دەبەستن، بە دەوراندەوری نزیک و دووری خۆشتدا بنۆڕیت نموونەی بێئەژماری ڕاستییەکەت بۆ دەردەکەوێ بەڵام لە پەنا ئەم ڕاستییەدا یەک ڕاستی دیکە هەیە هەتا بڵێی تاڵە: لە هەموو سەردەمێکدا ژمارەی نموونە تاریکەکان چەندین دەیان جار هێندەی نموونە ڕووناکەکانن جا ئەگەر لە جێگەیەکی وەک کوردستانی خۆماندا دە نموونەی جوان و پێشکەوتووی هۆشی «ڕووناکتر»ت دۆزیەوە سەدان نموونەی گومڕای هۆشی «تاریکتر» دەبینیت واش

دەبێ خەڵقی هەرێمێک سەرلەبەریان هەڵپەرکێ لە تەپڵی بنی جەهەندەمی گومڕاییدا دەکەن.

لە کۆمەڵایەتیدا شەقامەرێیەکی ناوەندی هەیە ژیان و بەرژەوەندی پێدا تێدەپەڕێ. بەڵام بەولای سنووری گەشەکەی ئەو شەقامەوە تاکوتەرایەکی نموونەی گەشتر هەیە [نموونە لە کوردان: ئەحمەدی خانی، ئیبنوئادەم، حاجی قادر] پرشنگ بۆ مەودای دوورتر دەهاوێژێن لەوەی ڕووناکایی عادەتی سەردەمەکە تێی بڕ دەکا. ئەمانەش نێوی «بلیمەت» یان لێ دەندرێ و دەگوترێ پێش ڕۆژگاری خۆیان کەوتوونەتەوە. بەمەندە ناولێنانەش حیسابیان دەپێچرێتەوە. بەولای سنووری تاریکەکەی شەقامەکەوە ژمارەیەکی زۆری تاک و کۆمەڵی خەڵق لە شەوەزەنگی وەها ڕۆ چوون بەر لە خۆیان هەر خەلق نەبووبوو.

تاک تاکی مێشککراوە هەن چاویان دوورتر دەبینێ لە بینینی عادەتی سەردەمی خۆیان کۆمەڵەهای مێشکتاریکیش هەن بە نابینایی ئەوتۆوە کوێر بوون هەرگیز دەوروبەری ماددی لە خۆوە ناتوانی بیتەنێتەوە. دەبێ لە هۆش و نەفسی تاریکەوە زەنەی کردبێ چونکە دەوروبەر بە عادەت شەقامە ناوەندییەکە دەرەخسێنێ کە وا چ پێوەندی بەو شەوەزەنگە ئەنگوستەچاوەوە نییە.

ژمارەی ئەو خەڵقەی بە ڕێبازە ناوەندییەکدا دەڕۆن هەمیشە زۆرتر بوە، گەلێکیش زۆرتر بوە، لە سەرجەمی زێدە پێشکەوتوەکان و زێدە پاشکەوتوەکان. ئەم ڕاستییەش وای کردوە بە درێژایی ڕۆژگار جۆرە پارسەنگبوونێک هەبووبێ لە گوزەران و بەسەربردن و هەڵکردن و تێکڕای ژیانی کۆمەڵایەتیدا بەڵام زۆر بەداخەوە سەرلەبەری ئەو خەڵقە زۆرەی بە ڕێبازەکەدا تێپەڕبوەتن کە هەر خۆشیان نوێنەر و خاوەنی بەرژەوەندی گشتی بوون، لەبەر خەریکبوونیان بە گوزەرانی عادەتیی نەگۆڕاو کە هیچ ئامانجێکی لەعادەتبەدەر خەڵق ناکات بیریان لەوە نەکردۆتەوە، دەرفەتیشیان نەبوە، لە دەستیشیان نەهاتوە. خۆیان وەها ڕێک بیەخن بتوانن ڕێ لە پیاوخراپ و هەناوکرمێ و ستەمکار و گومڕایان ببڕنەوە.

بەدەوری خۆتدا بنۆڕە دەبینیت بابای حەماڵ و سەرتاش و دارفرۆش و ئاشەوان و کاروانچی و زیندروو و کەبابچی خەریکن بەقەدەر حاڵ کەسبەکەیان بەرەوپێش

بەن و یەک دوو درهەم لە دەرامەدیان زیاد بکەن، نەدەزانن و نەدەشتوانن بیر لە پێوەندییەکی ناوکۆیی ئەوتۆ بکەنەوە کە لە داو و تەپکە و فرۆفێڵی ستەمکار و تەماعکاریان بپارێزێ. ئەوەی لەم سەیرکردن و توێژینەوەیەی بەردەستدا دەیبینیت شتێکە بەر لە هەزاران ساڵیش هەر دەتدیت، دوای ساڵەهای دیکەش دەیبینیت، ئەگەر ڕێگەت هەبوایە بیانبینیت.

ئەمە حاڵی شەقامە ناوەندییەکەیە، بەڵام زۆر زۆر بەداخەوە فێڵباز و قۆڵبڕ و عەوام خەڵەتێن و ستەمکار بە پێچەوانەی ئاپۆرەی خەڵق دەزانن و دەتوانن بە سەر شەپۆلی شەوەزەنگە لەعادەتبەدەرەکەدا بەرەو بەدترین ئامانجەکانیانەوە برۆن. بە درێژایی ڕۆژگار دەرفەت لەبەر مرۆڤی ناپەسەندا هەبوە کە لایەنی تاریک و بەدی کۆمەڵایەتی و مرۆڤایەتی بۆ ئەو ئامانجەی مەبەستیان بوە بەکار بهێنن بە ئاسانیش بایی کاردروستایی خۆیان خەڵقیان پێ ئیقناع کراوە، ئیقناع کردنەکەش لەگەڵ ئەو کەسانەدا بوە کە خۆیان لە نێو شەوەزەنگەکەدا بوون وەیا بەسەر ڕۆخیەوە ڕاوەستاون چونکە ئەم دوو دەستەیە ئامادەتر و ئامادەن بۆ سەلماندنی ورێنە، جلەوخۆشیشن بۆ کاری بەد.

ئەوانەی کە لە شەقامە ناوەندییەکەی کۆمەڵایەتییەوە بۆ ناو تاریکەکە ڕاپێچەک دراون یا بە زەبری قەمچی بوە یا لە ڕێی پڕ هەست و خوستی ئایینەوە سەرەتاتکەی هەڵخەڵەتێنانەیان بۆ ناو دڵ و دەروون کراوە. لەمەشدا بەراورد کردنی دوێنێ و ئەمڕۆ وا دەکات گلەیی نەچێتەوە سەر خەڵقی لێرە بەپێشەوە چونکە لەم سەردەمەدا خەڵقی وڵاتی پێشکەوتووش بە هۆی فرنداق و ئاینوئۆینی سیاسییەوە فێڵی گەورەیان لێ دەکرێ لەوە هەر بگەڕێ کە تا ئێستاش فێڵبازی ڕێی ئایین تێروتەسەل و ڕێزلێگیراوە، ئنجا بزانە لە بازاڕی پڕۆپاگاندەی ئابووری - هەر لە سینەما هەتا مۆدێلی جلک، هەتا بوورسە، هەتا پێشانگەکان، هەتا کەیفگەی شەوانە... هەتا... هەتا... چ فەندی خلیسکێنەری ژیرانەی جادووگەرانە بەکار دێت و سەریش دەکەوێت.

فێڵ کردن لە خەڵقی شەقامە ناوەندییەکە بەرچاوە و بەر هەستە، گلەیی هەڵستاندنیش لەسەر ئامادەبوونی خەڵق بۆ فێڵ لێ کران کارێکی بێجیە بەڵام لە نوختەیەکی پڕ سفتوسۆوە بەدەست خۆم نییە گلەییان دەبەمەوە سەرێ: بۆ چی

فیڵباز بتوانێ خەڵق لە خشتە ببات بەڵام دڵسۆز گوێگری نەبێ خۆ فیڵەکە لەو کەسانە دەکرێ کە گوێگری دڵسۆزەکە نین دڵسۆزەکەش بەرژەوەندی ئەوانی دەوێ و خۆیان بۆ بەخت دەکا؟ گوتم گلەییان دێتەوە سەرێ، ڕاستییەکەی گلەمەندییەکە هەر لە ڕێی بەراورد کردنی نێوان فیڵباز و دڵسۆزەوە هەڵدەستێ بەو مانایەی کە فێڵ و پەند وەک ڕەش و سپی لە یەکدی دوورن. بەزاهیر نەدەشیا فیڵەکە مەیدان بە پەندەکە چۆڵ بکات، لەوە بەولاوە دەزانم بابای فیڵلێکراو بە ئانقەست نایێ دژی بەرژەوەندی خۆی گوێ بۆ فیڵباز شل بکا. دیارە لە سروشتی کۆمەڵایەتی و مرۆڤدا دیاردەی وەها بەسفتوسۆ قابیلیەتی زەنە کردن و بەدەردانی هەیە گلەیی کردنیش لە «سروشت» کاری عەقڵ نییە.

ئەو قسانەی دواییم ڕێم دەدەن گلەییەکی گەورە لە بیریاری ماددی بکەم: ئەو بیریارە ماددییە زلانە لە لایێکەوە دێن بە بەژن و باڵای گەلانی لێرە بە پێشەوە هەڵدەڵێن و مێژووی ڕابردووی لێ مارە دەکەن، وەک دەشزانین و تازەبەتازەش گوتمان، ڕەوتی کۆمەڵایەتی و مێژوو بە هۆی جموجوڵ و چالاکی و زانست و هونەری ئەو زێدە هەستیارانەوە بوە کە لە جەرگەی بەرەی ناوەندی مرۆڤایەتی پێگەییشتون و خەبتاون با لەم بەینەشدا بەرژەوەندی خۆیانیان مەبەست بووبێت وە یاخود پێش بەرژەوەندی غەیری خۆیانیان خستبێتەوە، خۆ ئەگەر هاندەری بەرژەوەندی تایبەتی لە بەیندا نەبێ مرۆڤایەتی هەنگاوێک واوەی جانەوەرییەوە نەدەهات چونکە یەکجار بەدرەنگەوە گیانی کۆمەڵدۆستی و خۆ لە پێناو کۆمەڵدا لەبیر کردن پەیدا دەبێ.

ئەمە لە لایێکەوە، لە لایێکی دیکەوە بیریارە ماددییەکان لەگەڵ ئەوەشدا کە دەڵێن تێپەڕینی مرۆڤایەتی بەو قۆناغە مێژووییانەدا کە پێیاندا تێپەڕیوە و دیاردەی «چین» یان تێدا بوە شتێکی حەتمی بوە، ئنجا هەر بادەدەنەوە سەر ئەو بەرە ناوەندییەی کە ڕەورەوەی مێژووی خستۆتە گەڕ و شارستانەتی بنیات ناوە و لە فرەنسەوە تێکشیوە بۆ چین کوتاڵی بازرگانی ئاڵوگۆڕ پێکردوە و هونەر و زانست و فەلسەفە و ئەدەبی لێ هەڵقوڵیوە، کام توهمەی قورسە تێی دەگرن و کام قسەی بڕندەیە بۆی دادەبڕن و بە بەرپرسیاری بەشێکی زۆری تەنگوچەڵەمەی کۆمەڵایەتی دادەنێن هەر دەڵێی ماکی دواکەوتویی و ماف خوراویی هەژاران بەرە ناوەندییەکە

بوە تا ئەوی لە ئەدەبیاتی شۆڕشگێرانەی سەردەم بۆرجوازیەتی بۆتە عەیبی ئەو کەسەی وەپاڵی دەدرێ کەچی هیچ بەرە و چینێکی کۆمەڵ بەقەدەر ئەو بەرەیە حەزی بە ئازادی و پێشکەوتن و هێمنایی و تەعمیر و پیشەسازی و زانست و هونەر و خۆشگوزەرانیی گشتی نەکردوە. ئەو حەزەشی لە سەرچاوەی بەرژەوەندی خۆیەوە زەنەی کردوە چونکە پتر لە هەژارێکی کەمبەرژەوەند کاری بە هێمنایی ڕێگەوبانان بوە لەبەر خاتری ئەو کاروان و باروبینگەی کە ماڵە بازرگانیەکەی پێ گوێزاوەتەوە و چۆڵ و بیابان و دەریای پێ بڕیوە. هەژار لە دەوروبەری نزیکی خۆیدا حەزی بە هێمنایی کردوە بەڵام نەیزانیوە و نەیتوانیوە چاو ببڕێتە حاڵوباری وڵاتی دوور کە بە خەونیش نایگاتێ. کە ئەمە حاڵی هەژاران بووبێ دیارە هێمنایی هەرگیز لەگەڵ حاڵی جەنگخواز و جەردە و وێرانکەر نەگونجاوە کە هەر خۆیان ماکی شێواندنی هێمنایی بوون.

ڕق هەڵگرتنی بێجێ کە بیریاری ماددی دەیکاتە هۆی دوشمنایەتی لەگەڵ بەرەی ناوەندی کۆندا هەر خۆیەتی لەم ڕۆژگارەشدا دەبێتەوە بنێشتۆکەی زاری خەباتگێران کە دێن بەوپەڕی بێباکی و بە لەخۆباییبوونەوەش یەخەگیری بەرەی ناوەندی دەبن و بێ سێ و دوو لێکردن خەریکی ڕماندنی دەبن کەچی بەشی زۆری ئەو خەباتگێرانە خۆیان لەو بەرەیەن، ڕەنگە خەباتەکەش بە ئەرک و مەسرەفی ئەو بەرەیە بگێڕن. لێرەشدا بیریاری ماددی ئەوە لەبیر خۆی دەباتەوە کە پێشتر گوتبووی چینی نیوەڕاست لە قۆناغی پێش سۆشیالیزمدا پۆپی پێشکەوتنی کۆمەڵە هەتا ئەو چینە گەندەڵیش نەبێ و نەبێتە لەمپەڕ لەپێش هەنگاوی تطوردا ڕەوا نییە دەستدرێژی لێ بکرێ لەلایەن شۆڕشگێرانەوە. گەندەڵبوون و لەمپەڕبوونیشی سیحر و تەڵەسمی ئەوتۆ نین تێی نەگەین چونکە منداڵیش خەریکە بزانێ ئەو بۆرجوازیەت و چینە ناوەندییەی کە گۆیا لە ژیانی پێشکەوتووی پیشەسازی و بازرگانی زل و بەرهەمی بەرفرەوان و پەرەسەندنی تەکنیکدا بەبەریانەوە هەیە لەمپەڕ بخەنە بەر ڕەوتی بەرەوپێشتر چوون جارێ لە کاولگەی وڵاتی کورداندا شەبەنگ و سەرەتاشی پەیدا نەبوە. دەیان وڵاتی دیکەی وەک کوردستانیش هەر ئەو بێشکە کاول بوەیە کە هێشتا چینی بۆرجوازی تێدا نەڕسکاوە چ جایی گەندەڵ بووبێ.

لەگەڵ ئەمەشدا هەرچی - کوردی گوتەنی - کونی لە زاریدا بێ و زمان و قەڵەمی بگەڕێ لە تاقمی بیرکەرەوەی ماتیریالسیت و شۆڕشگێڕ هاواریەتی بۆ لە ڕیشە دەرکێشانی ئەو چینە ناوەندییە. تۆ سەیری، بیروباوەڕێکی کە بیریاری ماددی لە دەقی نەزەریە و سەر ڕووی کاغەزی نێو کتێبان نەخشەی کۆمەڵایەتی دەکێشێت و وەها دادەبڕێ کە چونکە سەرمایەداری جارێ خزمەتی کۆمەڵایەتی دەکات دەبێ چەپارە بدرێ لەو تەوژم و تینەی بەرەپێش چوونی شۆڕش دەیداتەوە، ئا ئەو بیروڕایە هەر خۆی بێتەئویل و چاوبەستەکێ و بەوپەڕی لەخۆ ڕازیبوونەوە بەر دەبێتە گیانی ئەو سەرمایەدارییەی کە جارێ پەیدا نەبوە.

سەیریش لەوەدایە کە بیریارە ماددییەکە و بەرەی شۆڕشگێڕ و کەرەستەی خەباتەکە هەمووی لەو بەرە ناوەندییە پەیدا بوە کەوا مردووزاد دەکرێ. بڕوام وایە ئەگەر بەچە و وەچەی ئەو بەرەیە - وەیا ئەو چینە- لە خۆوە نەکەونە گیانی بۆرجوزایەت [جارێ نەڕسکاو و نەگووراو] ـەکە کەسی ئەوتۆ لە دەرەوەی جغزی بەچە و وەچەکان پەیدا نابێ بیر لەو مردووزاد کردنە بکەنەوە. عەمەلە و فەلاح لە بارێکدا نین بتوانن فەلسەفە دانێن وەیا سەرۆکایەتیی شۆڕش و خەبات لە وێرانستانی کوردستان بگرنە دەست.

گلەیی لەو بیریار و شۆڕشگێڕانە هەم لەوەدایە کە دژی هەموو بەرژەوەند و ڕەوابوون هەرا لەگەڵ دۆستدا دەنێنەوە هەم لەوەدا کە ئەوانیش وەک فێڵباز و قۆڵبڕ و شەعبەدەبازی دنیادۆست بە چاو فرمێسک دەبارێنن و بە دەستیش باخەڵ دەبڕن چونکە دەقی نەزەریەکەیان و کردەوەیان هێندەی فرمێسکباراندن و قۆڵبڕین لە یەکدی دوورن. ئەم تەرزە ڕەفتارە جگە لەلایەنی وێرانکاری یەکسەر و ڕاستەوخۆ زەرەرێکی گەورەش لە باوەڕ بەخۆ کردن و بە خەڵقیش دەدات چونکە مرۆڤ هەر نەختێک سەرنج ڕاگرێ دەزانێ نووسینی ناو کتێبان و کردەوەی خەباتگێڕان لەیەکدی دوورن. ئەوەی ڕاستی بێ ئەگەر سەرکەوتنی بەرەی شۆڕشگێڕ پەکی لەسەر چاوبەستەکێکە و خەڵق شێواندنەکە و «بانێکە و دوو هەوا»کە کەوتبێ، مسڵمان گوتەنی «ان لله...» فەتوا دەدەین بەپێی مەزهەبی سوودپەرستی کە دەڵێ گەیشتن بە ئامانج بەر لە هەموو شتێکەوە دێت ئێمەش چاو لەو فاکوفیکە دەپۆشین

بەڵام لێرەدا هەڵوەستی ئەو شۆڕشگێڕانە دوو جاران بەولای سوودپەرستییە تەقلیدیەکەو▪ دەڕوات:

جارێکیان لەوەدا کە بەپێی هەلومەرجی چاکە و خراپەی سوودپەرستی ناشێ براکوژی و دۆست خنکێنی بە سوود حیساب بکرێ. جاری دیکەشیان لەوەدا کە هیچ پەک لەسەر قسەگۆڕی و فەلسەفە بەدرۆخستنەوە و لێ پاشگەزبوونەوە و زرەتەئویل نەکەوتوە چونکە شۆڕشگێڕان کە خاوەن نەزەریەن هەر خۆیان ئەو چینە پێک دێنن کە وا بەپێچەوانەی ڕاگەیاندنی نەزەریەکەیان دەیکوژن، بەتەواوی وەک ئەوەی دادپرس بڕیاری ئیعدامی خۆی بدات. شۆڕشگێڕانی بەرەی چەپی کورد نزیکی چل ساڵە خەریکی ئەو کارەن، لەو هەوڵەشدا حیساب دەکرێن بە دەست بەتاڵترین شۆڕشگێڕی جیهان چونکە لە دوو هۆی زێدە بێرەزاوە لە سەرەتاوە ئیفلاس کردوون:

هۆی یەکەم ئەویە کە ڕماندنی چینێکی کۆمەڵایەتی بەندە بە دەسەڵات گرتنەدەست ئنجا لە حاڵوباری کورددا لە کدوولەی تەڕیش ڕێگەی گەیشتن بە دەسەڵات و ڕماندنی بۆرجوازییەتی نەبوە چونکە جارێ بۆرجوازییەتی دەسەڵاتی نەبوە لێی بستێندرێ، هێزیشی نەبوو ڕێ لە کەس بگرێ.

هۆی دوەم ئەوەیە کەوا سەرەڕای نەزۆکبوونی ئەو ڕێگایە بۆرجوازیەتی هەر پەیدا نەبوە تا بڕمێندرێ بەوەشدا مەعلووم دەکرێ خەباتی بەرەی چەپی کورد لە پێچەبەدەورە «حلقة مفرغة Vicious circle»دا خۆی و خەڵقی دەخولاندوە.

ساڵی 1966 لە گۆڤارێکی ڕۆژاوادا لیستە ناوێکی شەریکەتە زلەکانی جیهانم خوێندەوە، لەو لیستەیەدا گەورەترین شەریکەت لە ساڵێکدا بایی 23 هەزار ملیۆن دۆلار شتومەکی فرۆشتبوو کە ئەوسا دەیکرد دە هێندەی داهاتی قەومی هەموو عیراق، بگرە پتریش. هەر لە بیریشمە لە ساڵانی سییەکاندا خوێندمەوە مەعاشی ساڵانەی کرێکارانی شەریکەی فۆرد 700 ملیۆن دۆلار بوو کە ئەوسا دەیکردە 140 ملیۆن دینار، واتە 30 هێندەی بودجەی حکومەتی عیراق لەو ساڵەدا... ئنجا ئەگەر ئەمانە نموونەی ئەو بۆرجوازیەتیە بن کە فکری ماددی سەربە ئابووری لێی تۆقیوە و دەیەوێ مرۆڤایەتی لێ ڕزگار بکا، خۆ بۆرجوازیەتی هەڵەبجە و ئاکرێ لەو

ساڵە بەسەرچوانەدا کە شۆڕشگێڕی بەرەی چەپی کورد دەیویست بیرمێنێ جارێ پێی نەکرابوو تاکە یەک عەرەبانە لە کارگەی پیشەسازی خۆی [کە تا ئێستاش وجوودی نییە] پێشکەش بە کۆمەڵایەتیی کورد و عێراق بکا. بەشێکی بەرچاوی ئەو بۆرجوازیەش لە ڕێی کوڕ و برا و خزمیانەوە بەشداری بزووتنەوەی قەومایەتی و چینایەتی بوون.

من لەم نووسینەدا چ مەبەستم نییە بزانم ئایا ڕێ دەدرێ یا نادرێ بە چینی ناوەندی مێژوویی دەوری خۆی لە پێشکەوتندا ببینێ، عیراقی خۆشمان ئەوەندە دەوڵەمەندە دەتوانێ بە داهاتە تێروتەسەلەکەی ئەو کەموکوورییەی لە تێبردنی ناوەند پەیدا دەبێ دەجاران تێبهێنێتەوە، لەلایەن باری شەخسیشەوە ڕەنگە نووسەران بە تێکڕایی پشکی ئابوورییان لە سۆشیالیزم پتر بێ نەک سەرمایەداری. من مەبەستم ئەوەیە لەبەر تیشکی لێکدانەوەی خۆم دەماری سەلبییەتی هۆش وەیا نەفس لە «تناقض»ی نێوان کردەوە و گوتەی بیریار و شۆڕشگێرە ماددییەکاندا بدۆزمەوە، ڕەنگە باشیشم دۆزبێتەوە:

تاریکایی نەفس لەو «تناقض»ە بەوەدا دەردەکەوێ کە پەلەی زێدە بێ کات و بێجێ لەو بیریارانەوە بۆ خنکاندنی سەرمایەیەکی نەزاو بەڵگەی حەز و شەهوەتی نەفسیانە نەک سوود و بەرژەوەندی گشتی وەیا پێداویستی نەزەرەیە چونکە ئەو بەرژەوەندە گشتییە بە پێی نەزەریە ماددییەکەش جارێ لە پاراستنی چینی ناوەندیدایە. هێشتا ئەو باوکەی لەسەر پشتی لانک کچە شیرەخۆرەکەی لە منداڵێکی شیرەخۆرە مارە دەکات کەمتر ناواقیعیەتی بەکار هێناوە لەو شۆڕشگێرەی کە دەیەوێ سەرمایەی لەدایک نەزاو هەر لە منداڵدانی کۆمەڵایەتیدا بخنکێنێ. جا ئەگەر باوکەکە لە ڕێی باوکایەتییەوە سوودێکیشی بۆ خۆی ڕەچاو کردبێ هەر لێی دەسەلمێندرێ بڵێ نەختێکیشم بەرژەوەندی ساواکەم ڕەچاو کردوە، بەڵام ئەم شۆڕشگێڕ و بیریارە ماددییەی کە دەیەویست لە پێش ناوەڕاستی ئەم سەدەیەدا چینی ناوەندی نەزاوی کورد مردووزاد بکا دەبێ بۆ تاکە حەزی بێزۆکی خۆی تەقلەی وەها بە واقیع و نەزەریەشەوە لێ بدا. ئەمە لایەنی تاریکایی نەفسە لە تەناقوزەکەدا.

لایەنی تاریکایی هۆشیش لەو تەناقوزەدا ئەوەیە کە بە هۆی دزەی حەز و شەهوەت بۆ ناو نەفسی شۆڕشگێڕەکە چاوی هۆشی کوێر دەبێ لە دیتنی مومکین نەبوونی گەیيشتن بە ئامانجی ئەو حەز و شەهوەتە: ئەو شۆڕشگێڕە لە پێشەکیەکانی فەلسەفەکەیدا مەرجی وەها هەیە بۆ پێک هاتنی زەرفی شۆڕش و گەیيشتنی پرۆلیتاریا بە حوکم کە هیچی لە زەرفی وڵاتی وەک کوردستاندا نەهاتبوە دی کەچی لە پشت چاویلکەی نەفسە برسییەکەیەوە وەها سەیری واقیعی دەکرد هەر دەتگوت بەولای پێویستەوە زەرفی شۆڕشی تێدا پەیدا بوە. ئەم تەرزە بەسەهوو چوونە وەک بەسەهوو چوونەکەی پرسیاری حیساب نییە کە بە چاوپێداگێڕانەوە سەهوەکەی تێدا دەدۆزرێتەوە چونکە لێرەدا تێکەڵبوونی حەزی نەفس لەگەڵ لێکدانەوە وەهای کردوە سەهوەکە بێتە «خۆ بەسەهوو بردن» ئنجا سەهووی حیساب ناکێشێتەوە بۆ دڵگەرمی و هەڵپە و بەستن و کوشتن بەپێچەوانەی هەوڵی تێکدانی ڕژێمێکی سەرلەبەر کە لە هەوەڵ هەنگاوەوە بریتییە لە هەرا و نمایيشت و دروشم و قەپوقیڕ کە وا خێرابەخێرا شقڵی هەڵپەوکڵپە لە دەروون و هەست و نەستی جەماهیرەکەی جێگیر دەکات و لای سافیلکان دەبێتەوە بە جەزبەگرتن و «طقوس» و تاریکستانە مێژووکردەکەی کە فکری ماددی بەلای خۆیەوە خەریکە گۆیا دەیرەوێنێتەوە.

دوای سەرکەوتنی شۆڕشی ئۆکتۆبەر نووسینی لینین هەیە دەڵێ سەرکەوتنی شۆڕش بەندە بە دوو مەرجەوە: یەکیان ڕوودانێکی ئەوتۆیە بەردەوامبوونی میللەت لەسەر حاڵوباری کۆن بکاتە نامومکین، دوەمیان پەک کەوتنی دەسەڵاتی حکومەتە بەرانبەر ئەو ڕووداوە. ئەم قسەیەی لینین وێنەکێشانی تەجرەبەی خۆیەتی بەڵام ڕەنگێکی تۆخی گشتیبوونیشی پێوەیە چونکە دیارە نە میللەتی سەرکزەڵە دەتوانێ شۆڕش بکا، ▪ جایی تێیدا سەربکەوێ، نە حکومەتیش کۆڵ دەدا ئەگەر پەکی نەیەخرێ و بێدەسەڵات نەکرێ. ئەمەش هێندەی بەدیهیە ئاشکرایە و لێی دەوەشێتەوە لغاویکی وەستێنەر بهاوێتە زاری ئەو حەز و تەمایانەی دەیانەوێ بۆ خاتری خۆیان خێرایی بکەن لە هەموار کردنی ڕێی شۆڕش با بە شێوەیەکی ڕووکەشانەش بێ...

بەهەمەحاڵ دڵنیام لەوەدا کە هەر کەسێک و هەر کۆمەڵێک و حیزبێک لەو وڵاتانەی جاریَ شۆڕشیان تێدا بەرپا نەبوە ئەگەر بۆی بلویَ خەڵق بەرەو شۆڕش ببات هەرگیز لەسەر پەندەکەی لینین و زەرفی واقیع پەکی خۆی نایەخێت و مل لیَ دەنیَ با نیوەی وڵاتیشی بە خۆڕایی تێدا کاول بیَ.

لەم ڕۆژگارەدا هەروەک زەرفی شۆڕش لە جاران زووتر ساز دەبیَ دەروازەی بەهەڵەدا چوونیش کراوەتر بوە لەچاو ڕۆژگارانی کۆن، هۆی ئەم ڕاستییەش زۆرن بەڵام دوانی لیَ باس دەکەم:

یەکەمیان ئەوەیە بیریار و سەرپەرشتی بزووتنەوەی ئەم سەردەمە ڕووبەڕووی واقیعێکی یەکجار ئاڵۆزکاوتر بوە لە واقیعی کۆن چ لە ڕووی تەنگوچەڵەمەی ژیان و گوزەرانەوە بیَ و چ لە ڕووی زۆربوونی جۆری ناو وڵات بیَ و چ لە ڕووی مامڵەت کردنی بیَ لەگەڵ ئەو هێزە دەرەکیانەی دەتوانن دەست بخەنە کاروباری شۆڕش و تێکڕای واقیعی ناوەوە.

دوەمیان ئەوەیە کە لە حاڵی بەهەڵەداچوونی بزووتنەوە، هێزی دەرەوەی وەها هەیە بۆ سوودی خۆی یاریدەی بەردەوامبوونی لایەنە بەهەڵەداچوەکە بدات و لە زۆر باردا یارمەتیەکە ببێتەوە پارسەنگی هەڵەکە و سەرپۆشی عەیبەکانی. لەو تەرزە حاڵەتەدا هێزە دەرەکیەکە لە یاریدەدانی هەڵەدا «هۆشتاریک» نییە چونکە هەڵەکردوەکەی بۆ دەبێتە بەردەبازی پەڕینەوەی بەرەو بەرژەوەند. بەڵام هێزە هەڵەکردوەکە بە هەموو کێشانە و پێوانەیەک هۆشتاریک و گومڕایە چونکە «هەڵە» خۆی لە خۆیدا سەرناکەویَ، یاریدەی دەرەکیش هەر ئەوەندە سوودە بە هەڵەکردوو دەگەیەنیَ کە بەکەڵکی خۆی دێت هەر کاتێکیش یاریدەدەر بە نیازی خۆی گەییشت یاریدە دەکێشێتەوە و دەماری هەڵەکردوەکە هەڵدەبڕێتەوە.

ئێمە لە سەردەمێکدا دەژین ڕۆژ بە ڕۆژ بەرەو سەختی و ئاڵۆزی و چەڵەمەی تێکهەڵکێش دەچێت و ژیان و گوزەران و هێمنی تێدا وەزحمەتتر دەکەویَ، هەر بەو پێیەش بەهەڵەداچوون ئاسانتر دەبیَ چونکە هەڵگرتنەوە باریکە ڕێگای ڕاست لە نێوان چەندین شەقامەڕێی چەوتدا ئەستەمتر دەبیَ، ئەنجامی هەڵەش قورستر دەکەویَ. بۆیە لە پێویست پێویستترە ڕابەرەکان و بیریارەکان بە هۆشی برندەتر و

چاوی بیناتر و نەفسی هەستیارتر و دڵی دابینتر و هەناسەی درێژتر ئاپۆرەی خەڵق بەرەو خەباتەوە ببەن.

ساڵی 1960 لە گوتارێکی عەرەبیمدا ئەمەم نووسیوە قسەشم ڕووی لە کورد و عەرەب بوو:

«والتأريخ الذي حمل أجنة الأخاء بين الشعبين يفضي بالأمانة الى حاضر راهن انبعثت نذره تصرخ في سمع العرب والاكراد بالتحذير من مغبة التفرق والشقاق فما كان بالامس من قبيل الخطر الاعمى يصيب الشعوب على خبط العشواء أصبح اليوم يقنن ويشرع وتأتي عليه المدارس بالتوجيه والتبشير وتمد به الدول كأذرع الأخطبوط، يدا من ورائها اساطيل البحر والبر والجو تصيب من الضحية مقاتل صعبة الشفاء».

واشدەزانم لە هیچ نوختە و پیت و وشە و ڕستەیەکی ئەو قسانەمدا بەسەهوو نەچووبووم. بێتەئسیربوونی ئەو قسانەش منی تێدا بەرپرس نیم، بەرپرسیی من لەوەدا دەبوو قسەکانم بشاردایەوە.

لێرەدا حەز دەکەم قسەیەکی باوکم بۆ خوێنەر بگێڕمەوە کەوا بەر لە 45 ساڵ پتر لێم بیستوە و گەشگەش لە بیرم ماوە: کتێبێکی بە دیاری بۆ هات لە دۆستێکەوە باسی ئاشتیخوازیی «بهاءالله»ی تێدا بوو بە «رسول السلام- پێغەمبەری ئاشتی» ناوی دەهێنا. باوکم لە پەراوێزی پەڕەیەکی کتێبەکە شتێکی لەم مەعنایەدا نووسی: تا ئێستا دوو «رسول السلام» هاتوون یەکەمیان عیسا پێغەمبەر ئەوی دیکەشیان بە پێی ئەم کتێبە «بهاءالله»یە، ئەگەر حیسابی ئەو کوشتارانە بکەین کە لە عیساوە تا هاتنی بەهائوڵڵا ڕوویان داوە پتر دەردەچێ لە تێکڕای کوشتاری پێش عیسادا. لە هاتنی بەهائوڵڵاشەوە تا دەرچوونی ئەم کتێبە هێندە خوێن ڕژاوە پترە لە سەرپاکی ئەو خوێنانەی پێشتر ڕژابوون. ئەمەیە داهاتی ئادەمیزاد لە خێر و خۆشیی پێغەمبەرانی ئاشتی. دوای نووسینی پەراوێزەکە بە قسە گوتی: ئەوانەی بەتەمان بەو زوانە فەرتەنەی سروشت و هەرای نێوان ئادەمیزاد دامرکێت خەیاڵی خاو بە دڵی خۆیاندا دەهێنن چونکە جارێ «طبيعة»یش و ئادەمیزادیش فرکەی دەمارانیان

زۆر بە توندی هەڵداوێت و گەلێکی ماوە ئادەمی بگاتە ئەو حەسانەوەیەی پێغەمبەرانی ئاشتی و ڕابەرانی اجتماع لێی دەکەن بە موژدە.

وەک دیارە قسەکانی باوکم لە جەرگەی ڕاستی و پەرۆشەوە هەڵقوڵیوەتن، لە لێکدانەوەی بەبنج و بنەماشەوە پرشنگیان داوەتەوە. بە ڕواڵەت زوربەی ئەو کەسانەی قسەی خۆشکەڵە بە عالەم ڕادەگەیەنن لەگەڵ بیروڕای باوکم ناڕۆن، بەڵام ئەوان هەر خۆیان لە کردەوەدا یارمەتی دوورکەوتنەوەی ڕۆژی حەسانەوە دەدەن هەندێکیشیان بە دڵی خاوێنەوە یارمەتیەکە دەدەن، ئەمانەش خاوەنی نەفسی پاک و هۆشی تاریکن. هی وەهاشیان تێدایە بە چاوی کراوەوە کارەکە دەکا. ئەم تەرزە کەسە نەفسی بەدە و هۆشی ڕووناکە. قسەشمان ناگەیەنێتە ئەوانەی نەفس بەد و هۆشتاریکن چونکە لە حیساب بەدەرن. لە نێوان ئەو سێ تاقمەدا مرۆڤی سەرنجدەر داغی ئەو کەسانە دەخوا کە بە ناوی ئاشتی و برایەتی نێوان گەلانیش ئاژاوەی ناپەسەند دەنێنەوە، بەداخەوە قسەشیان دەبیسترێ و ڕێزیشی لێ دەندرێ.

لەبارەی ئەو چینە ناوەندییەی کە بیری ماددی لە ڕووی کاغەز پشتگیری لێ دەکا و شۆڕشگێڕەکانیشی لە کردەوەدا دەیرمێنن شتێکی دیکەی گرنگ ماوە کە بە توندی لەسەری دەکاتەوە و شەفاعەتی لێ دەکا هەرچەند پرشنگی ئەو شتەش لە دەرەوەی چینە ناوەندییەکەوە بەرەو پیری لێکدانەوەمانەوە دێ: بیریار و شۆڕشگێڕی ماددی دوای ئەوەی بە دەسەلات دەگا و سەندەڵی حوکم لە بنیدا دەچەسپێ خۆی لە بارێکدا دەبینێتەوە کە مانەوەی خۆی و تاقمەکەی لە پتەوتر کردنی ئەو شەقامەڕییەوە دێ کە بە درێژبوونەوەی تەمەنی شۆڕش لەنگەر بە کۆمەڵایەتی نوێ بابەت دەبەستێ و بەرەو پێشیەوە دەبا، ئەوسا بیریارە ماددییەکە شەڕ لەگەڵ دوو تاقمدا دەکا: تاقمێکیان کۆنەپەرستی پاشماوەی کۆمەڵایەتیی کۆن، دوەمیان شۆڕشگێڕی چوست و چالاک کە داوای شۆڕشی پتر دەکا. من لەم حاڵەدا لایەنگیری ئەو بیریارە ماددییەم کە دەیەوێ لەنگەر بە کۆمەڵایەتی تازە ببەستێ بەڵام دوو مەرجم هەیە:

- مەرجی یەکەم، بەزیادەوە بەرهەڵستی لە نوێخوازی ناو شۆڕش نەکا چونکە ئەوسا هەر خۆی دەبێتەوە بەو لەمپەڕە کۆنەی کە زووتر پەنگاوی بە خورگەی کۆمەڵایەتی دەدایەوە. لێرەدا کێشانە و پێوانەی تاقی

کردنەوەی دڵ و دەروونی بیریارەکە ئەوەیە ئایا لەم بەرهەڵستی کردنەی لە چالاکیی نوێخواز تا ▪ رادەیەک عەرشی خۆی پتەوتر دەکا. ئەگەر پتەوتر کردنی ئەو عەرشە لە بەرهەڵستییەکەدا نەبوو رووبەرووی دوو ئیحتیمال دەبین:

- ئا- رەنگە بیریارەکە دڵسۆز بێ نوێخوازەکەش تیژڕۆی چەپڕۆ.
- ب- رەنگە بیریارەکە بەپێی هەلومەرجی تازەبابەتی شۆڕش هۆشتاریک بێ و کەڵکی سەرۆکایەتی و رابەرایەتی پێوە نەمابێ.

• مەرجی دوەم، بەو چاوەی کە سەیری شەقامەڕێی ناو شۆڕشی پێ دەکا سەیرێکی هەڵوەستی ئەو بەرە خەباتگێرە بکا کە بەر لە شۆڕش دەستی دەپاراست لە رماندنی بێلزوم و بێجێی چینی ناوەندی کۆن.

لەم شی کردنەوەیەی چەند دێڕی دواییدا بۆت روون دەبێتەوە کە شەقامەڕێی بەرژەوەندی کۆمەڵایەتی بە پێی سروشتی خودی کۆمەڵایەتیەکە لە ناوەندایە نەک لەمپەڕ و ئەوپەڕدا. ئەم ڕاستییەش بەر لە شۆڕش و دوای شۆڕش هەر بەردەوامە و بەسەر ناچێ تا ئەوەی نووسەرێکی وەکوو «جۆرج ئۆروێل» لە چیرۆکەکەی Animal Farm دا وەها دادەبڕێ کە سەرۆکایەتیی نوێی شۆڕش لە ئەنجامدا دەبێتەوە سەرۆکایەتیەکەی بەر لە شۆڕش. من لەگەڵ ئەم ڕایەدا نیم چونکە مومکیین نییە دوای ڕماندنی خانوویەک هەر بە کەرەستەی داروپەردووی ئەو خانوە سەرلەنوێ خانوەکە وەکوو خۆی دروست ببێتەوە، هەرچەندە دەشێ سەرۆکایەتیی نوێ لە حاڵوباری نوێدا هەموو ئەو شێواز و ئامێری لەسەرخۆ کردنەوەیە بەکار بهێنێ کە تاقمی دەسەڵاتداری پێش شۆڕش بەکاری دەهێنا.

بەهەمەحاڵ چوونەوە ناو قەپێلکی کۆن هێندەی گەڕانەوەی پەپوولە بۆ ناو قۆزاغە ئەستەمە. تارادەیەک گەڕانەوەی حاڵوباری کۆن بە تێشکانی شۆڕش دەبێ، نەک بە پاشەکشەی شۆڕش. تێشکانیش ڕێی گەڕانەوە بۆ ڕابردووی لەناوچوو نادا. کەسێک بیەوێ لە باری ڕاستینەی ئێستاکە و ڕابردووی سوود و زیانی مرۆڤ بگا بەر لە هەموو شتێک دەبێ سینەی فەراخ بکا بۆ لێکدانەوەی ورد و بێتەرەفانە ئنجا

بتوانێ نەخشەیەک بکێشێ بۆ ئەو سوود و زیانە و سەرکەوتن و تێشکانەی کە مرۆڤ بە درێژایی ڕۆژگار دیوەتی لەوەشدا پشکی هەموو کاریگەرێک لە چاکە و خراپە دیاری بکا و کاریگەرەکەی تێدا بە خاوەن بزانێ نەک پشکەکەی بنبوو بکا وەیا لێی بدزێتەوە بۆ لایەنێکی کە مەبەستیەتی. جا ئەگەر ئەمەی کرد، بێگومان، جۆرە ترسێکی لێ دەنیشێ کە دەبینێ پشکی کاریگەرە سەلبییەکەی هۆش یەکجار لەوە پتر، کە بە خەیاڵیدا هاتوە، ڕەهابوونیش لە دەست ئەو سەلبییەتە یەکجار زەحمەتتر، لەوەی ناوناوە لە نووسینی لابەلاییدا دەیخوێنێتەوە کە باسی بەسەرچوونی نەزانی و پاشکەوتن دەکا.

من ناتوانم هەموو ئەو ڕووپەڕە کۆن و نوێیانەت بۆ هەڵدەمەوە، کە تێشکانی مرۆڤ بەدەست سەلبییەتی هۆشەوە، دەخوێننەوە چونکە بەشێکی زۆری ئەو ڕووپەڕانە هەر لە کردەوەی تاک دەگرێتەوە، کە هەرگیز تۆمار ناکرێ، تا کردەوەی گەل کە ئەویش هەر هەرا زلەکانی دەنگ دەدەنەوە، هەر لە وردە خەیاڵی جنۆکاویشەوە دەخوێنێتەوە تا گەلێک لەو بیروباوەڕانەی بۆ ماوەی سەدان ساڵ و ڕۆژگارەها بەلای ملیۆنانی خەڵقەوە ڕێز لێگیراو بوە، ئنجا ئەو تەمومژ و تاریکاییەش دەبێ دەور بکەمەوە کە لە سەرچاوەی ڕوونەوە بە ئەسڵ تیشکی گەش بوە بەڵام بەناو دەروون و مێشکی لێڵ بوویەوەدا گۆڕاوە بە تاریکایی... ئنجا ئەو شەڕ و وێرانکارییانەی باوەڕی پووچەڵ لە نێوان دەوڵەتان و عەشرەتان و خەڵقی سەربە مەزهەبی جودادا هەڵی گیرساندوە... ئنجا حیسابی ئەوەش بکەم کە تا چ ڕادەیەک دەشێ سەلبییەتەکە لە دوارۆژدا ببێتە هۆی خەسارەتی گەورەتر و کوشندەتر لەوەی تا ئێستا مرۆڤ لە خۆی داوە. ئەم نەخشەکێشانە و وردە حیسابانە هەرچەند دەشێ بە کاوەخۆوە بشکرێت بەڵام لە سێ ڕووەوە کارەکە لەچاو هی دیکەدا وەزەحمەت دەکەوێ:

ڕووی یەکەم ئەوەیە کە ئەگەر کارەکە و لێکدانەوە و هەموو حەق و حسێبەکەشی بە ڕاستی و دروستی بکرێت و جێی متمانە بێ، باوەڕ ناکەم بیرکەرەوەی ماددی دانی پێدا بهێنێ با بە ڕاستیشی بزانێ چونکە ئەو پابەندی ماددییەتە ڕەق و تەقەکەیە کە نەیویراوە دان بە یەکەمینایەتیی «هۆش» دا بهێنێ و جایی ئەوەی

ئاودیو ببێتەوە بۆ لایە سەلبییەکەی ئنجا بوێرێ دوارۆژیش بداتەوە بە ئیحتیمالی جەهلدۆستی و لەوێشدا بسەلمێنێ کە وا ڕەنگە ڕووناکی ببێتەوە تاریکی.

دوور نابینم لەمەدا بیرکەرەوەی نامادديش ببێتە هاوباوەڕی بەرەی ماددیی تەقلیدی چونکە ئەویش هەڵوەستی خۆی لە مەڵبەندی فکردا بەسەر ئێستگەی پتەوەوە دەبینێ کە ناسەلمێنێ چوونە ناو هەڵە هێندە عەمەلیەتێکی ئاسان و ئاسایی و سروشت کرد بێ، بەڵام چونکە کەمتر لە ماددییەکان ئالوودەی ماددیبوونی هۆش و زاتە دەشێ کەمتر لەوان پێ داگرێ لەسەر موستەحیلبوونی ئەو هەموو نەرم و نیانیەی باوەڕ بۆ ڕۆچوون لە ورێنە و ئەفسانە چونکە ئاشکرایە ئەگەر ئەوانیش وەک ماددییەکان بسەلمێنن کە هۆش تیشکی مادده و دەوروبەر دەداتەوە ئیحتیمالی هەڵە کردنی یەکجار کەمتر دەبێتەوە لەوەی کە هۆش خۆی لە خۆوە وێنەی شتان وەربگرێ کە ئیتر ڕەنگە وێنەکە ڕاست دەرنەچێ، بەڵام کە گوتت هۆش بریتییە لە تیشکی مادده هەر لەپێشەوە ڕاستبوونی تیشکەکە ڕادەگەیەنیت واتە ڕاستبوونەکە دەبێتە حەتمی وەک کە تیشکی ئاوێنە هەمیشە ڕاستگۆیە کەچی تیشکی مادده لە ئاوێنەی هەستیار و خالق و زیندووی هۆشدا مومکینە هێندەی خۆی تیشکی «هۆشکرد» لەگەڵ خۆیدا بهێنێتەوە کە دەشێ ئەوسا چی هەڵەی هۆشەکە و زاتی پشت هۆشەکەیە لەگەڵ تیشکە ڕاستگۆیەکەی مادده تێکەڵ بێ. هەروەک دەشێ خالقیەت و هەستیاریی هۆشەکە گەلێک حەقیقەتی ئەولای تیشکە ماددییەکە لە عەینی تیشکەکەدا بدۆزێتەوە کە مومکین نییە ئاوێنەی عادەتی ڕێی پێ ببا.

فکری ماددی بەرەو ئەوە دەڕوا کە هۆش وەک ڕادار بوونەوەری ماددی بداتەوە، دیاریشە مادده بە هەموو وجوودی بێگومانیەوە نازانێ درۆزن بێ، ئنجا ئەگەر هۆشیش وەک تیشکەکەی ڕادار و ئاوێنە یەکسەر لە ماددەوە گەشابێتەوە لە شێوەی حەتمیدا بەرەو ڕاستی بێفێڵەوە دەڕوا، دیارە حاڵەکەش لە واقیعدا وەها نییە و نەبوە: لەوانەیە هۆش چ لە خۆوە بێ و چ لە ڕێی مامۆستای درۆزنەوە بێ وەک ئەو ڕادارەی لێ بەسەر بێ کە سەقەت بووبێ و لە جیاتی ڕاستی، شتی درۆزن بداتەوە. واش دەبێ ڕواڵەتی مادده هێندە چاوغەڵەتێن دەبێ چ مامۆستای فێڵبازی ناوێ مرۆڤی تێدا بەهەڵە ببات، لەوە هەر بگەڕێ کە هەرچی ڕاستییەکی ناماددی هەیە وەک فکر و نەریت و «تجریدات» و مۆسیقا و شیعر و هەست و هەزاران

شتی دیکەی نەدیتراو هیچی بەر ڕادار و ئاوێنە ناکەوێ تا وێنەی ڕاست وەیا هەڵەیان لێ بداتەوە.

خولاسە دانهێنان بەوەی من لێردا دەیڵێم و لێکی دەدەمەوە داخوازی لە بیریارەکان دەکا بە سەرجوملەی قەناعەتە بنجییەکانیاندا بێنەوە و دەسبژار و تەتەڵەی تێدا بکەن. بەڵام قسەکەم وا ڕاناگەیەنێ کە ئیللان و بیللان دەبێ بەشی زۆری ئەو قەناعەتانە هەڵە دەربچن، خۆ من پێشتر گوتم هۆش بەبەریەوە هەیە بە مەیدان لە زەرفی ماددی و لە هەموو چەرخی سەردەمیش پێش بکەوێتەوە هەروەک دەشێ بەرەو دوا تاریکستانی هەزاران ساڵە بچێتەوە. ئنجا چ قەیدێ دەکا ئەو بیریارانە لەو بەختیارانە بن کە پێش سەردەمی خۆیان کەوتبێتنەوە وەیا هەر نەبێ لەگەڵ ڕۆژگاری خۆیاندا جووت ڕۆیشتبێتن، گەلێک جار دوو باوەڕی لەیەکدی جودا بە دەست لێکدانێکی کەم تێکدەکەنەوە. بە نموونە، مومکینە دوو زانای کیمیا یەکیان مولحید بێ و ئەوی دیکەشیان خواپەرست لە هەموو تاقی کردنەوە و بۆچوونی زانستییانەدا یەکچوونیش بن و تەنها فەرقێک لە نێوانیاندا هەبێ هەر ئەوە بێ کە خواپەرستەکە دەستووراتی کیمیا بداتەوە بە کردگار مولحیدەکەش بیانداتەوە بە سروشتی ماددە، ئنجا هەرکامێکیان بچێتە سەر عەقیدەی ئەوی دیکە زەرەر بە دەستووراتی کیمیا ناگا. ئەمە دەڵێم دەشزانم ئەگەر ئەو بیریارانە لەو فکرە ڕۆشنانە بن پەکیان بە نووسینی من ناکەوێ، خۆ هەر بەرچاویشیان ناکەوێ... بەڵام دەربڕینی ئەو جۆرە تێبینیانە زەرەریش لەکەس نادات.

ڕووی دوەم ئەوەیە لایەنی سەلبیی هۆش کە دەکاتەوە هۆشی بەرەواژ پتر بەرەو ناماددییەتەوە ڕۆیشتوە لە لایەنە ئیجابییەکەی چونکە لە نێوان ماددە و لایەنە ئیجابییەکەدا گونجان و ڕێکی هەیە تا ئەوەی دەشێ بڵێین لەو گونجانەدا هۆش و ماددە وەک تیشک و ئاوێنە یەکدی دەخوێننەوە و یەکدی بەڕاست دەگێڕن. بە نموونە، کە مرۆڤ بەر لە هەزاران ساڵ بەلێکدانەوەی خۆی «گەنم، گاجووت، زەوی، باران، برسیەتی...» کۆ کردەوە و لەوەوە کشتوکاڵی داهێنا ڕاستەوخۆ تەرجەمەی دەوروبەری ماددی کرد بۆ بەرژەوەند و ئابووری و کۆمەڵایەتی. بەڵام کە هات لەبەر تێبڕ نەکردنی هۆش و کەم تەجرەبەیی دیاردەی بێبارانی و ساڵی وشکی بردەوە بۆ دێو و جنۆکە و شەیتان ئنجا قوربانی کردە بەرتیلی ڕەزامەندی

ئەو ناحەزانە یەکسەر تەرجەمەی واقیعی نەکرد. لە پێشەوە بە تاریکاییدا چوو لەوێوە شەبەنگی درۆزنی بە ڕەشکەوپێشکە هاتنە بەرچاو. ئنجا بازێکی شەوکوێرانەی دیکەشی دا بۆ بەرتیلدان بەو هێزە پەنامەکییانە، لەوەشدا خەسارەی بێلزومی لە خۆی دا.

ئا ئەم ناماددییەتەی وەک پەردە لە دوا پەردەی تاریکایی هۆش وەها دەکا دەستوور بۆ دانانی گەلێک زەحمەتتر بێ لە دەستووری ژێربێژی و ئەندازە و مەنتیق کە هەموویان لێکدانەوەی هۆشن. هەر وەکوو دەستوورەکانی فیزیا و کیمیا و حیساب ئاسانتر و نیشانە پێکاوترن لە دەستوورەکانی فەلسەفە، کە دەزانین فەلسەفە لایەنی تەتبیقی تێدا نییە وەک ئەو زانستانە. هەروەهاش هەڵێنجانی دەستووری فەلسەفە ئاسانتر و نیشانە پێکاوترە لەو دەستوورەی کە بمانەوێ لە سەلبییەتی هۆشی هەڵێنجین.

هەر ئەم ڕاستییەشە وا دەکات دەستووری زانستی تەتبیقی لە هەموو جیهان یەک شت بێت کەچی فەلسەفەی هەمان بابەت لە کەسێکەوە بۆ یەکێکی دیکە جودا بێ، ئنجا ئەفسانەش کە پەکی لەسەر زانا و فەیلەسووف نەکەوتوە وێنەی بێژماری هەبێ. مەبەستم ئەوەیە بڵێم لایەنی ئیجابیی هۆش لە بابەتی ماددی و تەتبیقی یەک ڕێگەی هەیە کەچی تاریکستانی لایەنی سەلبیی هۆش لەوانەیە سەد کوێرەڕێی بەهەڵەدا چوون و هێڕبوونی لێ بێتەوە، لەمەشەوە دیارە هەڵێنجانی دەستوور لەو تاکە ڕێگەیەی شتی ماددی و تەتبیقی دەبێتەوە تاکە ڕێگەیە کە خۆی واتە ڕێگەکە و دەستوورەکە دەبنەوە یەک شت کەچی ئەفسانە ڕێگە بۆ سەر دەستوور دەر ناکا. زانینی بارستی ئەو زەرەرەی کە لێرە بە پێشەوە سەلبییەتەکە لە مرۆڤی داوە پەکی لەسەر دانهێنان بە دەوری سەلبییەتەکە کەوتوە، واتە کە ئێمە هەستمان بەو دەورە کرد دەتوانین سەرجوملەی زیانەکە لەو ڕووداو و ڕوونەداوانەدا کە زادەی سەلبییەتەکەن بدەینە تصورمانەوە و بگەینە ئەنجامێک کەم و زۆر لەگەڵ میقداری زەرەرەکە خزمایەتی هەبێ (خۆ ئەگەر لێکیش دوور بوون زەرەری تازەی تێدا ناکەین) لەوە بەولاوە زەحمەتی دۆزینەوەی دەستوور لەو ڕووداو و ڕوونەداوانەدا دەست پێدەکا.

لێرە بەپێشەوە گوتمان ماتیریالیزم گەییشتۆتە قەناعەت بەرانبەر ئەو قۆناخانەی مرۆڤایەتی پێیاندا تێپەڕیوە [وەک دەرەبەگایەتی و سەرمایەداری...]. ئەم بۆچوونەی ماتیریالیزم چەندی ڕاست بێ چەندی هەڵە بێ لە لایەنی ئیجابی و بەرەپێش چوونی مرۆڤەوە هەڵێنجراوە و بەرچاوەترین ئادگار[18]ی هەر یەکێک لەو قۆناخانەی بۆ کردوە بە ناونیشان. ئنجا ئەگەر هاتبایە دۆزینەوەی ئەو قۆناخانەی مەبەست بوویایە کە ڕووی سەلبیی هۆش بەرەنگاری مرۆڤی کردوون ئایا کام ئادگاری دەکردە ناونیشان؟ چ ناوێکی لێ دەنان؟ چ دەستوورێکی لێ هەڵدێنجان؟ بەشێکی ئاکامی ئەو سەلبییەتە لە ڕووداوی بەد و بنیات نانی ناپەسەند و جنۆکەپەرستی شتی بەرهەستدا خۆ دەنوێنێ. کەچی بەشێکی گەورەی ئاکامەکانی بریتییە لە کوێر کردنەوەی ڕێی ئازادی و ڕاست و بەرەوپێشچوون و داد و چاکە، واتە بریتییە لە «ڕوونەدان، نەبوون»ی شتی پەسەند. ئنجا چۆن دەشێ باسی قۆناخی جوداجودا بکەین بۆ ئەو شتە چاکانەی ڕویان نەداوە؟ ناوی چییان لێ بنێن؟

قۆناخەکانی لایەنی ئیجابی، بە پێی فکری ماددی، هەریەکەیان دەور و تەسلیمی بۆ قۆناخی دواتر کردوە. ئەدی ئەو قۆناخە ڕوونەداوانەی لایەنی سەلبی چ جۆرە زنجیرەیەکی لێ هەڵبستێنین؟ چۆن دەور و تەسلیم لە قۆناخێکی ڕوونەداو بە قۆناخە ڕوونەداوەکەی دوای خۆیەوە وەربگرین؟ چۆن لە هیچێکی پێشوو مەلۆتکەی هیچێکی نەزاو هەڵگرینەوە؟ ئەمە لەبارەی ڕۆژگاری ڕابردوەوە کە دەنگوباسی بە ئێمە گەیشتوە و ڕێی بە مایریالیزم داوە قۆناخە ڕابردوەکانی لێ بفامێتەوە و قۆناخی سۆشیالیزم و کۆمیونیزمی دوارۆژیشی لێ تصور بکا. ئنجا ئەگەر ویستبای لەو شتانەی ڕوویان نەداوە دوارۆژێک هەڵبەستێ کە ئەویش ڕوو نادات وەیا بیەوێ قۆناخێکی زادەی ئەو قۆناخە ڕوونەداوانە ڕەنگڕێژ بکا دەبێ چ وێنەیەکی بۆ بکێشێ؟ چ ناوێکی لێ بنێ؟ خوێنەر وا نەزانێ کە ئەم پرسیارانە لە نرخی دیاردەی لایەنی سەلبیی هۆش کەم دەکەنەوە. بە پێچەوانە نەبوونی وەڵام بۆ ئەو پرسیارانە دەردی سەلبییەتەکە دەگەیەنێتە پلەی دەردی شێرپەنجە کە جارێ چارەی بۆ نەدۆزراوەتەوە. لەمەش بترازێ، ئێمە نەشتوانین لیستە بۆ ڕوونەداوەکان بگرین و عینوان بۆ قۆناخە پەیدا نەبوەکان دابنێین وەیا بە شێوەیەکی واقیعی لەو

---

[18]- ئادگار: ملامح.

کۆمەڵایەتییە و مێژووە بکۆڵینەوە کە لەبەر سەلبییەتی هۆش ڕوویان نەداوە. لە حەقیقەتدا زەرەرەکە و دواکەوتنەکە و لەکیس چوونەکە و ئیحتمالە پەسەندە ڕوونەداوەکان هەموویان باری بەرژەوەندی مرۆڤیان دالەنگاندوە و نرخی سەلبییان لێ وەرگرتوە و دەستە تەرازووی ناپەسەندایەتییان قورستر هەڵستاندۆتەوە.

بە نموونە دەڵێم وەرزێرێک کە توونتەکەی کلۆ خواردی وەیا لەبەر زرەخەونێکی جنۆکاوی ئاوی نەدا و وشک بوو دەزانین زەرەری کردوە هەرچەند نەشزانین ئەگەر توونتەکەی بووبایە پارە چەندی قازانج دەکرد. وێرانبوونی وڵاتی مسڵمانان بە هێرشی مەغۆلەکان تەقلەی بەرەوپشتی بە مێژوو لێ دا با نەشزانین و نەشتوانین دەستووری سەلبی لێ وەربگرین. نەزانینی بەرهەمی ئەو چالاکییەی تەگەرەی گەورە دەیکوژێ موستەحیلبوونی بەرهەمەکە و داهاتی بەرهەمەکە ئیسپات ناکا هەر نەبێ لە ڕێگەی ئەوەی کە بەرهەمی چالاکیەکی دیکەی وەک ئەو دەبینین کە تەگەرە نەیکوشتوە.

با لێرەدا هەنگاوێکی دیکەش بەرەژووری تاریکستانی ئەم سەلبییەتەوە بڕۆم: من ئەگەر چیرۆکنووس بوومایە، بە مەبەستی تێخوێندنەوەی ئەو شتە مومکینانەی ڕوویان نەداوە دەهاتم کۆمەڵایەتیەکم وێنەکێش دەکرد بۆ ئەو مرۆیانەی بە ساوایی مردن و ئەو منداڵانەی لە پزداندا خنکان و ئەو بلیمەتانەی دەست و قاچیان شکا و ئەو داهێنەرانەی ئیفلیج بوون و ئەو حەیوانە مەنەوییانەی نەگەیشتنە هێلکەی مێین. ڕەنگە لەو هەوڵەشمدا هەرجارە یەخەی یەک لەو بابەتە نەژیاو و نەڕسکاو و سەکەتبوانەم گرتبایە وەیا تێکم کردبانەوە... ئنجا دەهاتم لە چیرۆکدا جیهانێکم هەڵ دەنا بێ پێغەمبەرەکان... بێ ئەفلاتوون... بێ مارکس... بێ غاندی... بێ ئەسکەندەر و ناپلیۆن... ستالینم دەگۆڕی بە ترۆتسکی... عوسمانلیم لە شەڕی یەکەم بێتەرەف ڕادەگرت. ئەگەر بە کارەکە وێرابامایە وێنەی ڕووداوەکان و ڕوونەداوەکانم تێکەڵ دەکردن و بە مل واقیعێکی لێیان بوەشێتەوە دامدەبڕین. تێفکرە چەند هەزار بلیمەت بە ساوایی مردوون... چەندیان نەڕسکان... چەند گەمژەڵ سوڵتانەتی بەمیرات بۆ ماوەتەوە... چەند بڕیاری گرنگ لەوانە بوو نەدرێ چەندی دیکەی گرنگ دەبوو بدرێ و نەدرا! چەندین جار ئاواتم خواستوە و بریام کێشاوە «لینین» دە ساڵ پتر ژیابەیە و «ماو» یش دە ساڵ زووتر مردبایە، بێگومان سۆشیالیزمی مارکسی و

کۆمیونیزم بەو زوو کردن و درەنگ کردنەی مردنی ئەم دوو کەسە گەلێک دەحەسایەوە ملیۆنەها خەڵقی سافیلکەی دواکەوتەش ئەرکێکی زۆری لە کیسەدا دەمایەوە.

خولاسە نەبوون و ڕوونەدانی شتی مومکین دیاردەیەکە بۆ خۆی، هەرچەند نەشتوانین دەستووری لێ وەربگرین وەک کە دەستوور لە بوونەوەر وەردەگرین. بەلای بیریاری ماددیشەوە مومکین نەبوونی دەستوور لێ وەرگرتنی هەر لە سەرەتای باسی ئیجابی و سەلبیی هۆشەوە ئاکامەکی ئاسایی تێخوێندنەوەی سەلبییەتەکەیە کە دەزانین بیریاری ماددی دەستووری لە ئیجابیەتی هۆشیش وەرنەگرتوە چونکە دەیداتەوە بە دەوروبەر و ماددە و ئابووری.

نوختەی سێیەم زەحمەتی سنوورکێشانە لە نێوان دەوری تاریکایەتیی سەلبییەت و دەوری بەهەڵەداچوونی لایەنە ڕووناکەکەی هۆش، ئەویش لەبەر تێکەڵبوونی زاوزێی هەردوو ڕوە لە یەکدی نەچوەکەیە. ڕاستییەکەی ئەم نوختەیە بە تەنها مەیدانێکی بێسەروبنی وردبوونەوە و لێکدانەوە و بەراورد کردن و بەیەکدی گرتنمان پێ دەکوتێتەوە هەتا بشلێی ڕێچکۆڵەی باریک و پێچەکی پێکدا تێدەپەڕن. زۆر جاران ئاکامێکی گەشی لایەنی ئەرێتی هۆش دەکەوێتە باوەشی واقیعێکی هێندە دواکەوتوو هەر هەناسەی تێدا هەڵێنێ هەلا بە هەلا دەبێ. ئەوەی لە سەریشی بکاتەوە ماڵی دەڕمێ.

نموونەیەکی بچووک و مام سەلامەتۆکەی ئەم حاڵەتە لەم حیکایەتۆکەدایە: برادەرێکم، خوا لێی خۆش بێ، گێڕایەوە جارێکیان لە مزگەوتی نزیک ماڵیان مەلای پێشنوێژ دەیگوت یەکەم ڕیزی نوێژکەرانی دوای ئیمامەوە حەفتا خێری دەگاتێ، ڕیزی دوەم شەست، هی سێیەم پەنجا... برادەرەکەم گوتی قسەم لێ وەرگرتەوە و پێم گوت مامۆستا بەو پێیە ڕیزی هەشتەم دە خێر قەرزدار دەبێتەوە چونکە حەفتا خێرەکە لە ڕیزی حەفتەم وشکایی دێ... ئیمام خۆی سوور و شین هەڵگێڕا و گوتی هەی کافری بەدمەزهەب ئەدی چ دەڵێی بەرانبەر ئایەتی «سبع سماوات طباقا». برادەردەکەم گوتی سەیرم کرد کۆمەڵی نوێژکەران خەریکن ڕاسێنە لێ دانم، چارم نەما گوتم مامۆستا بمبەخشە ئاگام لەو ئایەتە نەبوو خوا سەد جار خێرت بنووسێ.

خۆڕایی نییە گوتراوە لە شاری کوێران دەبێ دەست بە چاوتەوە بگری. تۆ بڵێی ئەگەر دڵسۆزێکی زانا بەر لە دوو هەزار ساڵ بە بوتپەرستانی گوتبایە ڕێوی و پشیلە پاک و پیرۆز و تواناتریشن دەبوو چی لێ بەسەر بێ. هەر خۆت ئەگەر لە هەڵپەوکڵپەی بێسەروبەری سیاسەتدا ڕەخنەت بگرتایە حاڵت چۆن دەبوو؟ ئەمەت وەها، کەچی ڕێکەوت دەبێ تاریکترین هۆش بە پێی ئەو واقیعەی تێدا دەژی ڕاستترین هەڵوەست لە خزمەتی گشتیدا ڕاوەستێ ڕووناکترین هۆشیش بە پاڵەپەستۆی پەرۆش بۆ باوەڕ نەزۆکترین و نابەجێترین کردەوەی دڵسۆزانە بکات. بێگومان ڕۆژگاری کۆن پڕە لە نموونەی ئەوتۆیی کە عەقلی تێدا پەک کەوتە بوە و گومڕایی سەرکەوتوو بوە. دواڕۆژیش میلۆنەهای دیکە هەڵدێنێ.

لەمەوە و لە هەرچی هەیە دەردەکەوێ ڕاستی کە لە زەرفی گونجاوی خۆی دابڕا نەزۆک دەبێ، ڕەنگە بەدئەنجامیش بێ. لە لایەکی دیکەشەوە وەها بوە ترسنۆکیی بۆتە مانیعی دەربڕینی ڕاستی کە ئەگەر دەربڕابایە، لە زەرفی ناسکدا، هەڵەی گەورەی دەگێڕایەوە.. خولاسە جودا کردنەوەی ئەنجامی لایەنە ناپەسەندەکان و پەسەندەکانی هەردوو ڕووی ئەریتی و نەریتیی هۆش، بەدوا ئەویشدا زات، کارێکی ئاسان نییە، زەحمەتیشە دەستووری لێ هەڵێنجرێ. جا ئەگەر ئێستا لێم بپرسیت کە ئیمکان نەبێ زەرەری ئەو لایەنە لیستەی بۆ بگیرێ و نەشکرێ دەستووری لێ وەربگیرێ و پێشبینیش لە خراپەکانی دواڕۆژی مومکین نەبێ ، سوود دەبینین لەو وردەکارییە و حیسابە دووردرێژە و لێکدانەوە بە ئەرکەی لەگەڵ ئەم سەلبییەتەیدا دەکەین؟ بۆچی بە شتێکی باشتر و مەفهوومترەوە خەریک نەبین؟ وابزانم هەر لەوەی تا ئێستا گوتوومە دەتوانین وەرام بدەینەوە:

لە پێشەوە دەڵێم من کە هاتمە سەر لێکۆڵینەوە لەو دەورە سەلبییەی هۆش کارەکەم بۆیە بوو کە بە یادی فەیلەسووفە ماتیریالیستەکانی خۆماندا بهێنمەوە ئاگاداری لایەنە تاریکەکەی زات و هۆشی مرۆڤ بن کە بە هیچ جۆرێک لەگەڵ حیسابە لووس و لێکە ماددییەکەی ئەواندا ڕێک ناکەوێ و بە شێوەیەکی سەربەخۆی خواروخێچ دەوری وێرانکاری خۆی دەبینێت و گەلێک پتر لە دەوری لایەنە ئیجابییەکەی هۆش سەرپۆشی دوانەتی بەسەر خۆی و ماددییەتی تەقلیدیدا دادەداتەوە. لەوەش بترازێین، ئێمە بتوانین و نەتوانین دەستوور لەو سەلبییەتە وەرگرین یاخود بارستی

ویرانکاریەکەی بپێوین وەیا پێشبینی لە دەوری دوارۆژی بکەین، زەرەرەکە و کارە بەدەکە و شەقڵ و دروشمەکەی لە کۆن و نوێدا هێندەی فراژیبوون و گەشە کردن و داهات و خێروخۆشی وا لەبەر چاوانن ئیتر لەبەری هەڵنێین وەیا چاوی لێ بنووقێنین وەیا ئینکاری بکەین وەیا «تەئویل پۆش»ی بکەین بە چ سوود ناگەین و ناحەسێینەوە. لەلایەن بیرکردنەوەی فەلسەفیشەوە کشانی زیهنمان بۆ ئەو گۆشە پەنهان و وردانە ئەگەر نەشمان گەیەنێ بە دەستوورەکانیان هەر نەبێ بە راستە رێگایە میراتیەکەی فکر و لێکدانەوەمان شارەزاتر دەکا و دەمانهاوێتە سەر پتر وردبوونەوە لە بنج و بناوانی دیار و بزری واقیع، ئاشناتریشمان دەکا لە خۆمان کە ئیتر رەنگە ناچار بین پتر خۆمان لە هەڵە بدزینەوە. قسەیەکی زۆر مەشووری نێوان خەباتکەران هەیە دەڵێ «ئەوەی هیچ ناکا هەڵە ناکا» ئێمە ئەگەر بشسەلمێنین کە «هیچ نەکردن» خۆی لە خۆیدا هەڵە نییە دەبێ لە دوو نوختەی گرنگ باخەبەر بین:

1- دانهێنان بە حەتمیبوونی هەڵە نەبێتە رێ خۆشکەرەوەی هەڵە.

2- ئەوەی هەڵە دەکا مافی نەبێ زۆربوونی هەڵەکانی بکاتە هۆی شانازی بە زۆربوونی کردەوەکانی.

راستییەکەی ئەو گوتەیە تەنها شەفاعەت بۆ هەڵەیەک دەکا کە خۆ لێ لادانی مومکین نەبێ و کەسیش هەستی پێ نەکردبێ، نەخۆ هەڵە شتێک نییە دڵ خۆش بکا. لەبیرمە هاوینی 1954 لە هەڵبژاردنە پێشەکیەکەی «پەیمانی بەغدا» کۆمەڵێک لە دوورخراوەکانی سلێمانی شەوێکیان لەگەڵ دوورخراوەکانی کۆیێ لە بەندیخانەی هەولێر کۆ بوونەوە. ئەو برایانەی سلێمانی لەوپەڕی ئازایی و بێباکییەوە دەیانگوت «میللەت وەک گیای بەهارە، هەتا بیبڕیتەوە دێتەوە...». وەک لێتەوە دیارە، رەنگە قسەکە لەو هەڵکەوتە و کاتەدا بۆ تانووتدانە بەر خەباتگێران سوودێکی هەبێ لەوە بەولاوە تا بڵێی لە راستی دوورە و تا بشڵێی داشکێنی نرخی میللەتە. چۆن رەوایە سەرلەبەری میلۆنەهای میللەت بە گیای بەهار دابنێن و خوێنمژەکانیشی بە گیادروو، لەوەدا کەیفیشمان بە خۆمان بێ!! ستەمکار و چەوسێنەرەوە هەرگیز ئەوەندە لە خۆی بایی نەبوە میللەت بە گیا حسیاب بکا. رەنگە سەرپشکیش بایە لە دانانی پایەی خۆی و میللەت نەیزانیبایە بڵێ خۆم سەپان و میللەتیش قەرسیلی بەهاران. هەر ئەم گوتە هەڵەیەی حاڵەتی ژێردەستی میللەت رێ خۆش دەکا بۆ

ئەوەی کە کاتێک بەرەی شۆڕشگێڕان گەییشتنە حوکم مامڵەتی گیای بەهاران لەگەڵ میللەتدا بکەن چونکە هەروەک میللەت لە حاڵی ژێردەستیدا بە ڕابەرایەتی شۆڕشگێڕان خەبات دەکا، دوایی کە شۆڕشیش سەرکەوت خۆی لەژێر دەسەڵاتی شۆڕشگێڕاکاندا دەبینیتەوە▪ ئنجا کە شۆڕشگێڕەکە لەکاتی بێدەسەڵاتیدا بەچاوی گیان بەهار سەیری میللەت بکا دەبێ کە دەسەڵاتی پەیدا کرد و موحتاجی خەڵق نەبوو چۆن مامڵەتێک لەگەڵ میللەتدا بکا! وەڵام لە خۆوە دیارە.

ئێمە دەبێ بزانین ئامانجی هەموو خەباتێک و شۆڕشێک ئازادی و حورمەت و بەرژەوەندی گەلە، ئنجا پێویستە لە دەمی خەبات و شۆڕشدا هەر بایی وەدەستهێنانی مافە خوراوەکانی میللەت داوای جانفیدایی لە میللەت بکرێ دەنا ئەگەر بۆ وەرگرتنەوەی 10 دینار مافی خوارو داوای خەباتی 50 دیناری لە میللەت کرا قازانج سەری مایە دەخوا. دیارە لەو تەرزە حاڵەتەدا داوای خەباتێک دەکا کە خۆی پێی بگاتە دەسەڵاتی حوکم میللەتیش هەر لە ڕەعیەییدا بمێنێتەوە نەخۆ هەرگیز ناشی لە هیچ حاڵەتێکدا داوای زێدە نرخی لێ بکرێ.

بە نیسبەت شۆڕشگێڕەوە کە دەیەوێ لە چاڵی بەندیخانەوە بگاتە سەر سەندەڵی فەرمانڕەوایی هەر نرخێکی بیدات ▪ بە ماڵ چ بەسەر لێی زیاد نییە خۆ ئەگەر زۆرینەی ئەرک و مەسرەف و خوێنیش لەبەر میللەت هەڵنیشێت کێ زەرەر دەکا؟ بێگومان ئەگەر خەباتگێڕەکە بزانێ دوای سەرکەوتنی خەباتیش هەر لە ڕەعیەییدا دەمێنێتەوە هێندە خۆی شەکەت ناکا، لەمەشدا لەسەر حەقە. میللەتیش حەقیەتی زێدە نرخ نەدا حەقیشیەتی قۆناخی ڕەعیەتی ببڕێ بەرەو ئازادیی بیروباوەڕ و کردەوەی ڕەوا. بەداخەوە▪ نەمدیت و نەمبیست خەباتگێڕی کورد برادەرە کوردەکانی بەوە ڕاهێنێ کە لەسەر کاری نارەوا لە خۆی هەڵگەڕێتەوە. بە عادەت خەباتگێڕ هەر ئەوەندە داوای شۆڕش و نەسەلماندن لە میللەت دەکەن کە بە گژ غەیری خۆیاندا بینەوە منیش کە لێرەدا ئەم ڕەخنە زلەیان لێ دەگرم لێم داوا دەکرێ قسەکەم ڕوو لە هەموو خەباتگێڕان بکا نەک تەنها هی کورد. ئەوەی ڕاستیش بێ بە درێژایی نووسینەکانم لە پەنا ڕەخنەگرتن لە شۆڕشگێڕە کۆنەکانی جیهان کە دەوڵەتیان پێک هێناوە هەر جارە بادەدەمەوە سەر ڕەخنەگرتن لە کوردەواری، بەتایبەتی بەرەی چەپی کوردەواری، لەوەشدا خۆم لەسەر حەق دەبینم چونکە

خەباتگێڕی کورد و عەرەب و فەرەنگ چاو لەو خەباتگێڕە کۆنانە دەکەن کە ڕچەیان بۆ جیهان کێشاوە ئاینوئۆینی فکر و فەلسەفە و خەباتیش هەر لەوانەوە بە میرات بەجێ ماوە، ڕۆژ لەدوا ڕۆژیش فەتوا لەوانەوە وەیا لە جێنشینی ئەوانەوە دەردەچێ بۆ ڕەوابوونی چی لێرە بە پێشەوە کراوە و چی لێرە بەدواوەش دەکرێ و چی لە خەلقی سەردەم و دواڕۆژیش داوا دەکرێ.

بەهەمەحاڵ پارسەنگدانەوەی هەڵە و سەهوو و کاری نارەوای لێرە بە پێشەوە کە لەبەر قودسییەتی خەبات بۆتە ئایین و دەستووری شۆڕشگێڕان هەر بەوە دەکرێ کە میللەت لێی ڕازی نەبێ و ڕەخنەی لێ بگرێ و داوای دەستووری چاکتر بکا. کە قسەش لەگەڵ حاڵی تایبەتی کورد بکەین دەبێ بڵێین پێویستە دەنگی خەباتگێڕەکانمان بدەین کە کورد ڕازی نییە هەڵەی لێرە بەپێشەوەی شۆڕشگێڕە ڕابەرەکانی جیهان و ناوەقیعیەتەکانیانی لێ بکرێن بە دەستوور و ئاین. ئیسلامەتی بەر لە 1300 ساڵ ئەو گومڕایانەی دەشکاندەوە کە تەبریری شەوکوێری خۆیانیان بەوەدا دەکرد دەیانگوت «هذا ما وجدنا علیه آباءنا».

بێگومان هەڵەی ئەزەلی و ئەبەدی هەموو جیهان ئەوە ناهێنێ یەک گیسکی گەڕی بەسەدەقە بکرێ. ئێمە هەر هێندە لە خۆمان دەسەلمێنین بە هەڵەدا بچین کە هۆشمان بە ڕاستییەکە و دروستییەکە نەشکێ، لەوە بەولاوە کە هاتین بۆ خاتری خاترداران وەیا لەبەر ترسنۆکی وەیا لە ڕقی فلان و فیسار... وەیا... وەیا... چاومان لە هەڵە و کاری نارەوا نووقاند لە جفزی مرۆڤایەتی ڕێزلێگیراو دەردەچین و دەبینە ئەو کەرەوارە و گومڕایەی کە هەموو چەوسێنەرەوە و فێڵباز و دڵ کرمێیەک بۆ مەبەستی نارەوای خۆی ڕاپێچەکیان دەدا ئەوساش چ دادمان نادا بزانین بە چ ناوێک و بۆ کێ فێڵمان لێ کراوە چونکە تۆش دەزانی زەرەرەکەمان بەوەدا نابێتە قازانج کە کاک دارای شۆڕشگێڕ دەستمانی بری نەک مەلا عەولا و شێخ فەیزوڵڵا.

دەشێ لێرە پرسیارم لێ بکرێ و بگوترێ کە گەل هۆشی بە ڕاستی و دروستیی شتان نەشکا و نەیزانی هەڵە و ڕاستییان لێک بکاتەوە چ سوودێک لەم قسانە دەبینێ؟ کەی گلەیی کردن لە میللەتی خەسارەکردوو دەبێتە شیفای دەردی وەیا تێهێنەرەوەی زەرەرەکانی؟ کە میللەت جارێ نەگەیشتبێتە پلەی پێزانینی سوود و

زەرەری ڕاستینە لە کوێرەهۆش و زانین بخوازێتەوە وەیا هەنگاوەکانی بەرینتر بکا بۆ بڕینی ئەو ماوەیەی لە هەست و زانینی تەواوی دادەبڕێ؟ کە هانا ببەینە بەر تەفسیری شتان لە ڕێی تێخوێندنەوەی دەوری هۆش و زات و ببینین جارێ هۆش و زاتی گەل هێندە نەکراوەتەوە بتوانێ گەوهەری ڕاستی لە بن تەبەق ئەندەر تەبەقی تاریکایی و فڕوفێڵ و گێل کردن و چەوسانەوە دەربهێنێ چۆن ڕەوایە دڵی خۆمان خۆش بکەین بە تەفسیری زاتی و هۆشەکی و چاوەنۆڕ بین میللەت لەم ڕێگەوە خێراتر بە سوود و زیانی خۆی بزانێ لەوەی تەفسیری ماددی تێی دەگەیەنێ؟

زاناکانی ماددی دەڵێن ڕزگاربوونی مرۆڤ لە دەردەکانی بەندە بە ئامادەبوونی زەرفی ماددی بۆ ئەو ڕزگاربوونە. تەفسیرکەی زات و هۆشیش دەڵێ ڕزگاربوونەکە کاری مرۆڤەکە خۆیەتی کە تەفاعول لەگەڵ زەرفی لەبار دەکا بۆ ڕزگاربوون. ئنجا چ فەرق هەیە لە نێوان ئەوەی گیرۆدەبوونی مرۆڤ خەتای دەوروبەر و زەرفی ماددی بێ وەیا خەتای نەگەیشتنی هۆش و زاتی مرۆڤ بێ بە پلەی تەفاعولی ژیرانە لەگەڵ دەوروبەردا؟ ڕزگاربوونەکەش، ئایا، چ فەرق دەکا بەوەی کە بدرێتەوە بە دەوروبەری «متطور» وە یا بچێتەوە بۆ تەفاعولی زات و هۆش لەگەڵ ئەو دەوروبەری مرۆڤ تطوری پێکردوە؟

ئەو پرسیارانەی من لێرەدا لە جیاتی خوێنەر و ڕەخنەگر لە خۆمی دەکەم کەمێکن لە زۆر، هەمووشیان هەر بە دەوری ئەو جووتە عامیلەی ماددە و هۆشدا دەخولێنەوە هەر یەکێکیشیان لە دەربوونەیەکەوە بۆ سەر ناوەڕۆکی پرسیارەکان دەڕوا، بێگومان پرسیارەکان یاریدەی زەینی مرۆڤیش دەدەن کە لە هەموو لایێکەوە بەرەو حەقیقەت بڕوا، هەڵبەت مەترسی بەهەڵە بردنی کەسیش لەو پرسیارانە ناکرێ چونکە پرسیارەکان لەوەدا شەرەف وەردەگرن کە دەیانەوێ مێشک و زەین و هەست و زاتی مرۆڤ بە چاوی کرایەوەوە مامڵەت لەگەڵ بابەت بکا، ئەو بابەتە هەرچی دەبێ بابێ. پرسیارەکان هەروەک کۆتاییان نییە لەوانەن وەڵامیشیان بێکۆتایی بێ چونکە هەر تاکەی لەوانەی نووسیمن و ئەوانەی نەشمنووسین درێژەی هەیە، وێرای درێژە، لکیشی لێ دەبنەوە، بەڵام هەوڵ دەدەم ڕێی دوور

نزیک بکەمەوە و لە تێکڕای وەڵامەکانەوە نەک لە تاک تاکیانەوە ئەوەندە تیشکە بخەمە سەر پرسیارەکان بایی ڕوون کردنەوەیان بکا و گومانیش بڕەوێنێتەوە.

جارێ تۆ لە پێشەوە دەتوانی یەخەی بابای ماددی بگری و پرسیارەکانی لێ وەرچەرخێنیت و بە ڕوویدا بدەی بەو شێوەیەی کە بایەخی تەفسیری ماددی لەتەک تەفسیری ماددی - زاتی [= بەشەری] بخاتە گومانەوە وەک ئەوەی لێی بپرسیت بۆچی دانیشتوانی یەک شار و یەک ئابووری و یەک ڕامیاری بە هۆی جوداوازیی زمانیانەوە وەیا دین و بیروباوەڕیانەوە دوو کەرت و سێ کەرت دەبن خۆ هەمووشیان هاوبەشی یەک زەرفی ماددین؟ بۆچی سۆشیالیزمی مارکسی هەر لەو وڵاتانەدا سەر دەکەوێ کە دەبوو تێیاندا بەدەریش نەکەوێ؟ بۆچی لە هەندێ شوێنی ڕووت و برسی، مەیموون لە جیاتی ئەوەی بخورێن وەیا بکوژرێن دەپەرسترێن و نانی خەڵقەکە دەخۆن خۆ پەرستن وەیا هەر نەبێ ڕێز لێ نان دژی فکری ماددیيە و دژی ماددەشە؟ ئنجا ڕێشت هەیە تەفسیرە ماددییەکە تەنگەتاوتر بکەی بەوەدا کە تەفسیرەکەی دیکە هەمیشە زات و هۆش بە ناو واقیع و ماددە و تیشکەکانیاندا دەگێڕێ و چاوەنۆڕی ئەو ئاکامە دەبێ کە تافاعولی زات و هۆشەکە لەگەڵ دەوروبەردا پەیدای دەکا نەک ئاکامێک کە ماددەی مردوو ڕاستەوخۆ بە مل زات و هۆشی مرۆڤیدا دەبڕێ. واتە پرسیارەکان وەک لە من دەکرێن لە بابایەکی ماددیی تەقلیدیش دەکرێن. دوای ئەمە ئنجا ئاشکرایە دەبێ حەقیقەت بدۆزرێتەوە و بسەلمێندرێ با فەرقیش بە هیچ شتان نەکا و نەیانگۆڕێ، هەرچەند بێگومان برەوستاندنی حەقیقەت و پووچاندنەوەی هەڵە و نادروستی هەمیشە فەرقی گەورە بە واقیع دەکەن، یاخود هەر نەبێ مومکین نییە بێتەئسیر بن.

بە نموونە دەڵێم هەرچەندە دۆزینەوەی هیچیایەتیی ئەو شینە پانەی پێی دەڵێن ئاسمان ڕاستەوخۆ نرخی کاڵەک و شووتی بێستانەوانیش زیاد نەکا ئەوەندە سوودەی هەر دەبێ کە مێشک و دڵ و دەروونی لە ترس و لەرزێکی بێلزوم و ناپەسەند ڕزگار دەکات و هەزاران خوتخوتەی بێجێ و بێڕێ لە کۆڵ دەکاتەوە، ڕەنگە لە ئاست دیارەی دیکەی وەک ئەو شینە پانەشی ئازاتر و چاوکرایەوەتر بکا.

دیارە دۆزینەوەی ڕاستییەکانی سەربە مێژوو و کۆمەڵایەتی هەر نەبێ هێندەی دەستوورێکی ئاسماننناسی تەئسیری دەبێ، کە دەزانین زۆر بەتەئسیرترە چونکە

کۆمەڵایەتی و مێژوو یەکسەر لە مرۆڤ دەئاڵێن و ڕاستەوخۆ بێ واسیتە چاکە و خراپەی پێ دەگەیەنن. بە نموونە، کە مرۆڤ تێگەییشت خۆی کاریگەری یەکەم و تاکە کاریگەری ئیجابییە لە هەرچی جیهاندا هەیە بە دڵیدا نایەت دەستەونەزەر بۆ ئەو فەیلەسووفە ڕاوەستێ کە پێی دەڵێ دەستووورە ماددییەکانی ئەو خێروخۆشی بۆ بەرهەم دێنێ وەیا ماددەی ڕەق و تەق یەکەم سوارچاکی مەیدانەکانی کۆمەڵایەتی و مێژوە. لەمانەش بترازێین ئێمە هۆیە ڕاستەکانی شتان بزانین و نەزانین چەرخ و دۆلابی جیهان هەر لە گەڕدا دەبێ، واتە بە زانینی ئێمە دنیا لەگەڕ ناکەوێ، بە نەزانینیشمان باشتر ناگەڕێ. کەواتە ئەو بەهانەیەی فەرق نەکردنێ شتان بە جۆری لێکدانەوەمان و دۆزینەوەی ڕاستیمان لە خۆوە دەچێتەوە چونکە ئەو فەرق نەکردنە، بێ هیچ هۆیەکی دیکەی تەرجیحدانی ڕاستی بەسەر ناڕاستیدا، خۆی تەنها بەسە بۆ چوونەوەمان بەلای ڕاستیدا هەر نەبێ لەبەر ئەوەی کە ڕاستی بەشەرەفترە لە ناڕاستی: وەختێک تای تەرازووی ڕاستی لەتەک ناڕاستیدا دادەلەنگێ کە ڕاستییەکە بۆ گەل زەرەر بەخش بێ و ناڕاستییەکەش سوود بەخش بێ. کە هەردوویان لەلایەن سوود و زەرەرەوە وەکوو یەکدی بوون لە خۆوە ڕاستییەکە قورستر هەڵدەستێتەوە وەک ئەوەی کە دەزانین 2+2=4 پەسەندترە لە 2+2=7 با هیچ کامێکیشیان سوود و زەرەریان لێ نەکەوێتەوە. وەک یەکبوونی سوود و زەرەری ڕاستی و ناڕاستی یەکسەر تەرجیحی ڕاستی دەدا.

لەم بارەوە جارێکیان لە وتووێژدا ڕەخنەم لێ گیرا بەوەدا کە ئەگەر پەنابەرێک لای پەنادەرێک حەشار درابوو، دوژمنە ستەمکارە خوێنڕێژەکەی لە پەنادەرەکەی پرسی فلانت لایە یان نا؟ ئایا جەوابی ڕاست باشە یا درۆ چونکە ڕاستییەکە بێگوناحێک دەکوژێ؟ لە وەرامدا گوتم ئا لەم شوێنەدا ڕاستی و ناڕاستی لەیەک تەرازوودا نین چونکە ڕاستییەکە خزمەتی درۆ و ستەمێکی لە خۆی گەورەتر دەکا درۆکەش خزمەتی ڕاستی و دادێکی لەخۆی گەورەتر دەکا. لەوەش بەولاوە درۆ کردن لە ڕووداوی تاقانەدا، چاک بێ یا خراپ، وەک درۆ و هەڵەی نێو بیروباوەڕ و فەلسەفە نییە کە ساڵەها و ڕۆژگارەها بەردەوام دەبێ و ملیۆنەها خەلق گومڕا دەکا.

ئەم تێبینییانە و گەلێکی دیکەش کە پێویست بە کوتانەوەیان ناکا لە پەراوێزی پرسیارەکانەوە تێدەکەن بۆ ڕەواندنەوەی ئیعترازەکان کە ئەوانیش هەر خۆیان بە

پەراوێزی بابەتەوە لکاندوە. وەڵامی بە ڕێوجێ و بە هێزوپێز کە لە جەرگەی بابەتەکەوە هەڵستێت نەک هەر هەیە و بەس، بگرە کە بەتەواوی دەوریان هەڵبێین باشتر گرنگیی دەوری حەقیقەت لە چەندوچۆنی کۆمەڵایەتی و سوود و زەرەری مرۆڤایەتی نیشان دەدا. ئێمە هەرچەند بشمانەوێ خۆمان بەوە دڵشکستە بکەین کە گۆیا هۆش نەشکانی میللەت بە ڕاستی و ناڕاستیی شتان کەڵک لە قسەی واقیعی دەبڕێ، هەر ناتوانین قەناعەت بە خۆمان بهێنین کە ئەم هۆش نەشکانە بەهانەیەکی پەسەندە و ڕەوایە بۆ خامۆشبوون لە گوتنەوەی ڕاستی وەیا پشتیوانی کردن لە ناڕاستی: ئەگەر بشوێرین بڵێین نەگەییشتنی میللەت بە پلەی زانینی ڕاستییان و لێک کردنەوەیان لە ناڕاستییان عوزری خامۆشبوونمان بەدەستەوە دەدا، هەرگیز ناشێ و نابێ زاتی ئەوە بکەین کە هەڵە و درۆیان لەو میللەتە خۆش بێنین و فێڵبازانی لێ بە پێغەمبەر بگێڕین.

من نەشتوانم تەعلیلی بروسکە و باران بۆ منداڵێک بکەم ئینساف لێم ناسەلمێنێ بروسکەی لێ بکەمە قەمچیی ڕۆستەمی زاڵ و بارانیشی بۆ بکەمە فرمێسکی خاتوو زین. ئەو کەسەی دەیەوێ بە بەهانەی ساوایی و سافیلکەیی میللەت بایەخی دەربڕینی ڕاستی کەم بکاتەوە چۆن دەتوانێ خۆ هەڵکێشێ بە گوتنەوە و کوتانەوەی درۆیان؟ تۆ بڵێ کام سوود و بەرژەوەندی میللەت لە بیرباوەڕی هەڵەدا خۆی شاردۆتەوە؟ چۆن ڕەوایە خۆمان لە دەربڕینی ڕاستی بدزینەوە بە بەهانەی نەزانیی میللەت کەچی کۆمە نەکەین لە گوتنەوەی ناڕاستییان خۆ ناڕاستیش تێگەییشتنی دەوێ؟ بۆ دەبێ ئەو میللەتەی کە بەلای باوەڕی ماددییەوە خالقی تەئریخە [هەر لەبەرانبەر تاکدا!] نەتوانێ حەقیقەت بسەلمێنێ بەڵام ئەوەندە تێگەییشتنەی هەبێ بایی سەلماندنی درۆیان بکا؟

بەڵێ دەزانم ئەفسانە و ورێنەی جنۆکاوی خۆشتر دێتە باوەڕی سافیلکانەوە بەڵام شۆڕشگێڕ و بیریاری ماددی داوای جانفیدایی لە میللەت دەکەن و چاویش ناترووکێنن، ئیتر بۆچی کە بێینە سەر دەربڕینی ڕاستی و دەرخستنی هەڵە گومان بهاوێنینە قابیلیەتی میللەت لەوەدا کە هۆشی بە شتان دەشکێ یان ناشکێ خۆ بەهەمەحاڵ ڕاگەیاندنەکانی بیری ماددیش فەلسەفەیە و پێویستی بە تێگەییشتن و زەکاوەت هەیە نەک وەکوو ئەفسانەیە کە لەگەڵ فکری سەراوی و جنۆکاوی ڕێک

دێ؟ ئێمە ئەگەر لە گۆشەی ئینساف و ڕووناکبیرییەوە سەیری دیمەنەکە بکەین دەبینین و دەزانین ئەو ئاسانییەی کە لە وەرگرتنی ئەفسانە و بیروڕای پووچەڵدا هەیە پترمان داوا لێ دەکا کە بەرهەڵستی لێ بکەین چونکە ئەگەر وەها نەکەین تێخزانی ئەفسانە لە مێشکی سافیلکەکانمان دەبێتە کارێکی ئاسایی کە لە خۆوە ڕوو دەدا ئەوساش کە ئەفسانە و درۆ جێی خۆیان گرت بە پاڵەوانانیش دەرناکێشرێتەوە.

تۆ لەوە تێفکرە کە چەند بە زەحمەت دەتوانی فەلاحێک بۆ ڕیزی ئەو خەباتگێڕانە ڕاکێشیت کە بۆ ئەو خەبات دەکەن، کەچی بەچکە بوتپەرستێک پێبەپێی تێهەڵکشانی لە تەمەندا ڕەگ لەو باوەڕە پووچەڵە دادەکوتێ وەیا ئەو هەڵە فکرییەی لەگەڵ نەختێ دڵگەرمی دەنیشێتە قەناعەتی خۆتەوە چەند ساڵان دەتگێڕێ و بەشەڕت دێنێ و پشتت پێ لە ڕاستی دەکا و لە هەڵوەستی بەرەواژتدا ڕادەگرێ. لە ئەدەبیاتی شۆڕشگێڕی گوتەیەکی مەشوور هەیە دەڵێ «شۆڕشی هەمیشەیی»: بەلای منەوە پێوستتر لەو گوتەیە یەکێکی دیکە هەیە کە داوا لە فکر و فەلسەفە و شۆڕش بکات هەمیشە مێشکی میللەت بکەنەوە بۆ دیتن و ڕەفز کردنی ئەو هەڵەیەی لە فەلسەفەدا دەدۆزرێتەوە وەیا بەلاوەنانی هێندە تەتبیقاتەی کە پێبەپێ گەندەڵ دەبێ و هی پەسەندتر سەر وەدەر دەنێ.

ئەو سەرۆکانەی «شۆڕشی هەمیشەیی» دەکەن بە دروشمی سەر کاغەز و قوماش، لە ڕاستیدا، هەر هێندەی لێ بە مەبەست دەگرن کە بە ئیزن و ڕەزای خۆیان ڕوو بدات: لە کەس ناسەلمێنن داوای جۆرە شۆڕشێک بکا کە بەرژەوەندی سەرۆکەکەی تێدا نەبێ وەیا ئەوی لێ ڕازی نەبێ [وەک:ماو، ستالین،کیم ئیل...] بێگومان ئەو سەرۆکانە ئەگەر لە ڕواڵەتدا بشسەلمێنن ڕاست کردنەوە و ڕوون کردنەوەی هەمیشەیی لە شۆڕشدا پێویستە دیسانەوە هەر ئەوەی خۆیان پەسەندی دەکەن ناوی ڕاست کردنەوە و ڕوون کردنەوەی لێ دەنێن، هەرچی تیشکی دەرەوەی دەسەڵاتی خۆیان هەیە بە تاریکی لە قەڵەم دەدەن.

ئەم حەقیقەتە زلەبیشە وا دەکا پێ داگرتنی میللەت لەسەر بەکارهێنانی مافی ڕەخنە و ڕازینەبوون هەنگاوی هەرە پێویست بێ بۆ وەدەستهێنانی ژیانی ئاسوودەی هەموان نەک هی بەرەیەکی تەسکی دەسەڵاتداران. خولاسە ئەگەر بەرژەوەندی

ڕۆژانە و هی هەموو عومری مرۆڤیش بکەینە عەیارەی لێکدانەوەمان هەر بەوە دەگەین کە پێویستە چی ڕاستە ئەوە بە خەڵق ڕابگەیەندرێ، جا ئەگەر هەندێک لەو ڕاستییانە بە ئاسانیش دەرنەبردرێن هەر دەبێ بە جۆرێک لە جۆران و ڕۆژێک لە ڕۆژان بۆ میللەت ڕوون بکرێنەوە هەتا زووتریش بێ چاکترە، کوردی گوتەیەکی هەیە دەڵێ «کردەی پەشیمان لە نەکردەی پەشیمان چاکترە» منیش لەبەر تیشکی ئەم گوتە ڕاست و بەشەرەفەدا دەڵێم: مرۆڤ زەدەی ڕاستی بێ چاکترە نەک زەدەی درۆ، بگرە لە حەسایەوەی درۆش چاکترە.

وا دەزانم ئەم قسانەم وەڵامی ئەو ڕەخنەیە دەداتەوە کە دەیەوێ نەزانیی گەل بکاتە بەهانەی ڕاستی لێ شاردنەوەی بەمەشدا ویستم لە ڕێگە سەختەکەی وەڵامەوە بەرەو ڕەواندنەوەی ڕەخنەکە برۆم کە هاتم تێگەیاندنی گەلی نەخوێندەوارم کردە فەرمانی سەرشانی خەباتگێڕ لەو ڕووەوە کە نەخوێندوو و ساقیلکە بە ئاسانی تێ ناگەیەندرێن، ئنجا کە من پێ لەسەر پێویستبوونی تێگەیاندنی نەخوێندوو داگرم دیارە لەوە تێپەڕیوەتم کە دەربڕینی ڕاستی لەگەڵ ڕووناکبیراندا لە پێویست دەردەچێ و بەرەو بەدیهیەوە دەڕوا.

ئەمە لە لایێکەوە، لە لایێکی دیکەشەوە کە بێینە سەر سەراحەتی تەواو دەبێ بڵێین ئێمە وەها ڕاهاتووین کە لەسەر کاغەز ڕووی وتووێژمان لە جەماهیر بێ، ئەو جەماهیرەی کە ڕەنگە نەشتوانێ قسەکانمان بخوێنێتەوە. بێگومان جەماهیر فلسێک بەو نووسراوانە نادا کە باسی فکر و فەلسەفە دەکەن، ئەگەر لە هەزاری یەکێکی بشیان کڕێ ئەوانی دیکە لە گوێ ڕاگرتن بەولاوە ناچن: ئەوەی نووسراو دەخوێنێتەوە و دەمەتەقە لەسەر فکر و فەلسەفە هەڵدەستێنێ خوێندەوارەکە و ئەدیبەکە و هونەرکارەکە و ڕابەرەکە و بڕیارەکەیە ئیتر هێنانە ناوی باسی تێگەییشتن و تێنەگەییشتنی گەل یا لەبەر بیربڵاویمانە یا لەبەر نیازی تایبەتییە. گەلانی خەڵق بە درێژایی ئەزەل گوێی گرتوە بۆ ئەوەی دەرسدەر و مامۆستا و ڕابەر پێی دەڵێن ئنجا ئەو مامۆستایانە ئەگەر فێڵباز و مرۆڤ غەڵەتێن بێ پێویستە لەسەر دڵسۆزەکان پێشبڕکێ لەو فێڵبازییە بکەن. دەمەتەقە لەسەر شتی فکری و فەلسەفی بابەتی ڕۆشنبیری چەسپاوە کە هەر خۆی دەبێتەوە ڕابەری ڕۆشنایی و هۆشیاری هەزاران خوێندووی تازە پێگەییشتوو. ئنجا کە حاڵ ئەمە بێ هەر

بەهانەیەکی بهێندرێتەوە بۆ پشتگوێخستنی ڕاستی لە خۆوە ڕەش دەبێتەوە. لەلایەن ئاکار (اخلاق) یشەوە مامۆستای ڕابەر عوزری بەدەستەوە نامێنێ چونکە پایەی ڕابەرایەتی گەلێک بەرزتر و بەشەرەفترە لەوەی چاوبەستەکێی تێدا بکرێ بەتایبەتی کە ڕابەرایەتی ببێتە پێکهێنەری ئەو ئاو و هەوایەی کامەرانی گەشەی تێدا بکا.

ڕەنگە بگوترێ جوداوازیی بیرباوەڕ ئەنجامێکی ناچاری و حەتمی جوداوازیی بەرژەوەندی چینایەتییە وەیا هی قەومایەتییە وەیا هی شەخسییە، بەو پێیە ڕاستی شتان خۆی لە خۆیدا نابێتە هۆی ڕەواندنەوەی ناکۆکی ناشبێتە پارێزەری چالاکیی کۆمەڵایەتی لە بەفیرۆ چوون و ڕەزامەندی تێکڕاییش پەیدا ناکا. لە ئاست ئەم قسەیەدا سەرلەنوێ مەسەلەی لایەنی تاریکی هۆش و زات تێکەڵ بە حیسابی جوداوازیی بەرژەوەند دەبێتەوە بەوەشدا سادەییەکی کە لە ڕواڵەتی قسەکەدا خۆ دەنوێنێ بە وردبوونەوە و لێکدانەوەی بێتەرەفانە بەشی هەرە زۆری هێزی دەدۆڕێنێ. لێرە بەدواوە ئەم ڕاستییەت بۆ ڕوون دەبێتەوە بەڵام دەبێ تێکڕای قسەکانم پێکەوە سەیریان بکرێ نەک بڕبڕ و کەرتکەرتی:

جوداوازیی بەرژەوەند هی چین بەرانبەر چین بێ وەیا هی میللەت بەرانبەر میللەت بێ وەیا هی میللەت بەرانبەر تاکەکانی بێ تەنها لە حاڵەتێکدا دەبێتە بنەمای باوەڕ و قەناعەت و فەلسەفەی جودا کە لە پشت پەردەی هۆشی تاریک و زاتی بەتەماعەوە سەیری جیهان بکرێ نەخۆ ئیمکان نییە جوداوازیی بەرژەوەندی ببێتە هۆیەکی ڕەوا بۆ گۆڕانی یەک ڕاستی بە چەند ڕاستییەک چونکە ڕاستی خۆی لە خۆیدا هەڵناگرێ دوو وجوود و سێ وجوودی لە یەک کاتدا هەبێ. دوو بەرژەوەند کە بەرەنگاری یەکدی دەبن مومکین نییە هەردووکیان ڕەوابن، ڕەنگە لە هەر یەکەیاندا هەندێک ڕەوایی و هەندێکیش ناڕەوایی هەبێ پشکەکانیشیان خوار و ژووری هەبێ کە ئەگەر نەفس کوێر نەبێ بشێ مەسڵەتییان تێدا بکرێ بەڵام سوودی شەخسی ناڕەوا و حەز بە ستەم کردن ڕێگەی مەسڵەتی کوێر دەکاتەوە و مرۆڤ دەخاتە سەر ڕێبازی دابین کردنی نیازەکانی نەک ڕێبازەکە لە خۆیەوە مرۆڤ بەرەو ئەو لایەنەوە دەبات کە ناوی چاکە و داد و مرۆڤخاسی لێ دەندرێ.

بابای تەماعکار و ستەمکار و هەلپەرست و پشت لە داد و ئینساف، بە چاوی کراوەوە، بەرەو مەبەستە ناپەسندەکانیەوە دەڕوا و لە یەکەم هەنگاویەوە خەریکی

پێشێل کردنی داد و ڕاستی دەبێ. ئەوەندەی بیرم کردبێتەوە هەر بەوە گەیشتووم کە ستەم هەمیشە لە نەزەر ستەمکاردا ناڕەوا بوە و لێی بەسەهوو نەچوە تەنها لە حاڵەتێکدا نەبێ کە ستەمەکە بەشێکی ئایدیۆلۆجی و بیروباوەڕ بێ وەک ئەوەی کە تاڵانی وڵاتی داگیرکراو لە نەزەر دوژمنە داگیرکەرەکەیەوە بەشێکی تەواوکەری ئەو شەڕە «پیرۆز!!»ە بێ کە لە سەرەتای هەراوە فەتوای کوشتن و برینی داوە. ئەمەش یەکسەر دەچێتەوە بۆ لایەنی تاریکایی هۆش و نەفس کە چ پێوەندی بە بەرژەوەندی ڕەواوە نییە و لە گەلێک جاروباردا تاریکیەکە خۆی ڕەگی بەرژەوەندەکە هەڵدەبڕێتەوە. لەمەشدا پاشا و گەدا و هەموو ئادەمیزاد یەکسانە بۆ بەر حوکمی تاریکاییەکە هەرچەند دیارە سنووری بەدایەتیی هەژار لە سنووری پێنج پەنجەکانی تێپەڕ ناکا کەچی دەشێ پاشایەکی کۆن بە دەست و پەنجەی هەزاران هەزاران مرۆڤی بەکرێگیراو و پەکخراو و ڕاپێچەکدراو خەریکی خراپەی هەرە دوورەدەست بووبێ.

دەگەڕێمەوە و دەڵێم جوداوازیی بەرژەوەند هەرگیز ماف و ڕەوایی بە هەموو بەرژەوەندە جوداکان نادا چونکە لە نێوان هەموویاندا تەنها یەکێکیان دەشێ ڕەوا بێ واش دەبێ هیچیان ڕەوا نابێ وەک ئەوەی دە کەس لەسەر باغی بابایەکی هەژار بەشەڕ بێن وەیا بیست ڕێگر هەر یەکە بۆ حیسابی خۆی تەماع لە قافڵەیەک بکات وەیا دە دەوڵەت پێک نەیەن لەسەر بەتاڵان بردنی نەوتی ئیمەمانان. لەگەڵ ئەمەشدا کە بەرژەوەند خۆی لە خۆیدا ڕەوایی و دروستی پەیدا ناکا دیسانەوە هەمیشە ئاوات دەخوازم و دەڵێم کاشکی هەرچی ناکۆکی و هەرای دنیا هەیە هەمووی لەسەر جوداوازیی بەرژەوەند ڕوویان دابایە با ناڕەواییشی تێدا بێ چونکە ئەوسا بەشی هەرە زۆری ئەو هەرا و ناکۆکییانەی بە درێژایی ڕۆژگار ڕوویان داوە و دەدەن بەتاڵ دەبوونەوە لەو ڕووەوە کە لەسەر بەرژەوەندی حەقیقی ڕوو نادەن بەڵکوو لەبەر هۆیە مەلعوونەکەی تاریکی هۆش و نەفس و کەڵەکە کردنی حەز و شەهوەت و لەخۆ باییبوون و شتی ئەوتۆیی پەیدا دەبن.

ئەو هەرا و کارەساتانەی لەسەر تەماع و سامان و ناو و شۆرەت هەڵدەستن زرە تەفسیرێکی ئیقناعکەری لەگەڵدا هەیە هەرچەند تەفسیرەکەش هی نیازی چڵکن بێ.. بەڵام ئەو ناکۆکییانەی لەسەر تێکنەگەیشتن و بەهەڵەدا چوون و جودایی عەقیدە و

ناز و فیز و غەڕرایی پەیدا دەبێ یەکسەر لەو گۆشە تاریکەی سەلبیی هۆش هەڵدەقوڵێ و ماڵی تاک و کۆمەڵیش وێران دەکەن.

چەند هەزاران هەزار جار بوە لەسەر قسەیەکی ناشیرن وەیا لچکولێو بادان وەیا حورمەت نەگرتن کە هیچ زەرەر و سوودی ماددی تێدا نییە هەرا و لێدان و کوشتنیشی لێ پەیدا بوە. چ دەفەرمووی لەوەی دوو برادەر لەسەر شەشوبێشی تاوڵەی خۆڕایی نەک بە گرەو، دەستیان لە یەکدی داوەتە خەنجەر، وەیا گەنجی عەشیرتێک کچی لە عەشیرتێکی دیکە هەڵگرتوە و لە نێوانیاندا هەرا پەیدا بوە، وەیا لەسەر ڕاوگەی کەروێشک و چەقەڵ خوێن ڕژاوە، وەیا لە شەڕەگەڕەکێی منداڵ و گەوراندا دوژمنایەتی دەوامەی کردوە لە هیچیشیاندا بەرژەوەندی چینایەتی وەیا قەومایەتی وەیا ئابووری سێبەریشی نەبوە، تەنانەت لە شەڕەگەرکێکدا هەژاری ئەم گەڕەکە ئاغای خۆی بە دۆست داناوە و هەژاری گەڕەکەکەی دیکەی بە دوژمن لەقەڵەم داوە.

ئنجا ئەگەر هەرا هەر لەسەر بەرژەوەندی ماددی و ڕاستینە پەیدا بووبایە دەبوو بە درێژایی ئەزەل لەسەر ئەو شتە خوێروانەی کە بەرژەوەندی ماددییان تێدا نییە خوێن لە لووتی کەس نەبێ. لە گۆشەی تێوەڕامانی هۆشی تاریک و ڕوونەوە ئەو دزەی کە پارێز بۆ ماڵی دراوسێکەی دەبات هۆشی ڕووناکە چونکە دەزانێ چ دەکا بەڵام نەفسی بەدە چونکە نیازەکەی ناڕەوایە، ئەمما کە هات و لەگەڵ ئەو هەنگاوەی ئاودیوی ماڵی جیرانەکەی دەکا پڕ بەدڵ گوتی «خوایە بە تەمای تۆ! بسم الله!!» لەوەدا هۆشتاریکێکە بارتەقای نەفسە بەدەکەیە چونکە لە هیچ درزێکی هۆشی ڕوونەوە مومکین نییە ڕووناکایی و قودسیەتی ناوی پەروەردگار بەرەو دیواربڕین و ماڵدزینەوە بڕوا.

ئەم پێدزیلکەیەی هۆشە تاریکەکەی دز و جەردە و پیاوکوژ و دیکتاتۆر و ستەمکار بە تێکڕایی، بەسەر تەماع و حەزی ناڕەوادا بۆ ناو بارەگای گەش و پاکی خوا وەیا میحرابی ڕووناکی قەومایەتی و داد هەر خۆیەتی وەها لە هەندێ پیاوی ئایینیش دەکا کە بەسەر تەئویلاندا بۆ حەڵاڵ کردنی ماڵی حەرام و سوێندی درۆ و هەڵبەستنەوەی تەڵاق بپەڕێتەوە.

بەلای منەوە کابرای ئایینی حەرامخۆرێکی بێتەئویل بێ بەشەرەفترە وەیا کەمتر بەدە لەوەی بە فێلۆفرەوە حەرام بخوا چونکە سەرەڕای ئەوە کە حەرام هەر حەرامە نەفسی حەرامکردوەکە و بەرتیلدەرەکەش ڕەشتر و پەستتر دەبێ لەوەی بێ فاکوفیک سواری حەرامەکە ببن. تەئویل کردن و سازاندن، لە دین بێ یا لە دنیا، بۆ وەدەستهێنانی نیازی بەد خەتەری گەورەی لەوەدایە کە وا بەردێژبوونەوەی ڕۆژگار مەزهەبی نارەوای جۆرجۆر دادەهێنێ تەنگ بە ئەسڵی باوەڕەکە هەڵدەچنێ، خەڵقێکی زۆریش بەدوا خۆیدا ڕادەکێشێ بۆ ناو باوەڕ و مەزهەبی بەرەواژ. ڕێی خۆ لادانیش لە ڕاستی و مرۆڤایەتی هەموارتر دەکا بۆ تەماع و حەزی شەخسی، ئنجا لە جیاتی تاکە یەک مەزهەب [کە ئەگەر ڕاستیش نەبێ شەڕ بە خۆی نافرۆشێ] چەندین مەزهەبی نادروستی شەڕ بەیەکدی فرۆشتوو دادەهێنێ و ئاپۆرەی خەڵق تێک هەڵدەشێلێ.

ئەم گوتەیەی «جوداوازیی بەرژەوەند هۆی جوداوازیی بیروباوەڕە» یەکێکە لەو قسە تاریک و گومڕاکەرانەی کە لێیان دەوەشێتەوە بەشێکی بێسنووری ڕاستییە کۆمەڵایەتیەکان و دیاردە واقیعیەکان بشارنەوە و لە جێی هەزاران تەفسیری ڕاست هەزارانی چەوت دابنێن. هەر ساتەش بە پێی ئارەزۆی خاوەن تەماع و نیازی شەخسی کام هەڵوەستی پاک و مەردانەی عەمر و زەیدە لێڵ و دزێو بکرێ بەوەدا کە ببرێتەوە بۆ جوداوازیی بەرژەوەند نەک بدرێتەوە بە گیانی پاک و دڵی ئازا:

1- لەلایەن شاردنەوەی ڕاستییە کۆمەڵایەتیەکانەوە ئەوەندە بەسە بڵێم ئەو نەزەریەیە وا دەکا هەموو ئەو بیروڕا و هەڵوەست و هەڵکەوت و چوونەپێش و پاشەکشە و وەستان و قوربانی دان و هتد... کە پێوەندییان بە تەماع و جوداوازیی بەرژەوەندەوە نییە و ئیمکانیش نییە بەرگی درۆزنی بەرژەوەندییان بەزۆر تێهەڵکێشرێ- هەر لەبەر خاتری نەزەریەی جوداوازیی بەرژەوەند- دەبێ لە هەموو حیسابی شی کردنەوەی کۆمەڵایەتی و لێکدانەوەی مێژوویی دەربهاوێژرێن و بنبوو بکرێن و بایەخیان پێ نەدرێ نەوەک ماکەکەی «جوداوازیی بەرژەوەند» بە درۆ بخرێتەوە.

من کە بێم بسەلمێنم دەماری پیاوەتی و غیرەتمەندی فڵانە سەرۆکی خستە سەر حەواندنەوەی فڵانە بابای دەرکراو و پەنابەر و هێندەی لێ خەرج کرد و وەهای بۆ

كۆشا، بێ ئەوەی پاداشتێکی لێ وەرگرێتەوە وەیا کچی لە خۆی مارە بکا وەیا خزمەتی خۆی پێ بکا، هاتووم بەر لە هەموو شتێک دەستوورەکەی «جوداوازیی بەرژەوەند»م لەو حیکایەتەدا بێبایەخ کردوە. ئنجا کە تۆ محامی دەستوورەکە بی و نەتوانی هەڵوەستی ئەو سەرۆکە جوانمەردە بدەیتەوە بە تەئویلی دزێوکەر و حەیابەر ناچار دەبی خۆت لە ڕووداوەکە و هەرچی وەک ئەو هەیە بدزیتەوە و لە حیسابی لێکدانەوەی کۆمەڵایەتییان دەربهاوێژیت. خۆ ئەگەر هات و بەرێکەوت جوانمەردییەکە لەو سەرۆکەوە دژی کوڕی خۆی بوو بۆ بێگانەیەک ئەوسا ڕەنگە خۆ تێنەگەیاندن لەو حیکایەتە بەس نەبێ ئیتر خوا دەزانێ فکری دوژمنانەی بەردەوام چ لەو هەڵوەستە پڕ لە شەرافەتە بکا.

ئەم نموونە سادەیەی لێرەدا هێنامەوە یەکێکە لە هەزارانی وەک خۆی کە ئەگەر کمێک زەینی خۆتیان پێوە خەریک بکەی لە کۆن و نوێدا بەزۆری تێیان هەڵدەئەنگویت. خۆ ئەوەی ڕاستی بێ ڕووداوی ڕۆژانە زۆری لەو نموونانە تێدایە، جارانیش ژیانی خەڵق پێیان ئاوستر بوو چونکە ئەوسا هێشتان سەغلەتی گوزەران و ئاڵۆزکانی کۆمەڵایەتی و تێکهاویشتنی ئابووری و پەرەسەندنی خەباتی سیاسی و بڕبڕبوونی کۆمەڵان و هەمەچەشنەبوونی باوەڕان و... و... هتد هێندەی ئێستا دەماری مەردایەتی و بووردن و پەنادان و شتی ئەوتۆی لە تاکاندا پسۆک نەکردبوو، پڕۆپاگەندە و ڕاگەیاندنە سیاسیە فکرییەکانیش وەها پەیتا پەیتا هۆش و گۆشی ئەو خەڵقەیان لە کاری سادەی مەردانە نەدەدزیەوە تا ئەو ڕادەیەی کە دەبینین لە زۆر حاڵوباردا جەوانمەردی سیاسی لە بەلاوەنانی وەفا و گوێ نەدانە چاکەی کۆن و دۆستایەتیی میراتی و ئەو تەرزە ئاکارانەدا مەرحەبای لێ دەکرێ و دەبێتە بەڵگەی دڵسۆزی بۆ مەبدەء... ئنجا ئەگەر بیریارێک وێنەی کۆمەڵایەتی ئەم ڕۆژگارەمان بکاتەوە بە ئاوێنەی ئاکاری کۆمەڵایەتی دوێنێ و پێرێ وێنەی درۆزن لەو ئاوێنەدا بە خەڵق نیشان دەدا.

بیریاری ماددیی تەقلیدی کە ناوناوە سەرێک لەو سادەیی و سافیلکەیی و پیوریتانیزمەی ڕۆژگارانی ڕابردوو خوار دەکاتەوە، بایی ئەو سەر خوار کردنەوەیە، خۆی لە دەستووری «بەرژەوەند» و تەفسیری ماددی ڕەق و زەق دەشارێتەوە و نەختێک دەقە قاڵبەستوەکانی فەرامۆش دەکا دەنا ڕێی نابێ لە جادە

قیرتاوەکانی بەرژەوەندی سەرسەخت و ماددەی بێ هەست و بەزەییەوە کوێرەڕێگایان بۆ ناو مۆڵگەی مەردایەتیی بێتەئویل و چاکەی سادە و خۆبەخت کردنی بێمزە بباتەوە. ئەمانە دەڵێم لە زەمینەی چاکە و مەردایەتی شەخسی کە پێوەندی ڕاستەوخۆی بە ڕووداوی گشتییەوە نییە چونکە لەوێدا باسی ئەوتۆیی بۆ بیریاری ماددیی تەقلیدی وەک زێڕە بۆ هار...

2- لەلایەن دانانی تەفسیری چەوت لە جێی هی ڕاست قسەمان درێژتر دەخایێنێ ئەگەر لێی کورت نەکەینەوە چونکە ئەم پیشەیە پتر خۆی بەسەر زمان و قەڵەمی بیریاری ماددیی تەقلیدیدا دەهێنێ لە پیشەی شاردنەوەی ڕاستییان. ئەوەی لە مەیدانی کۆمەڵایەتیدا خەریکە شەڕ بۆ بەرژەوەندێک دەکا کە باوەڕی پێی هەیە وەیا لە خۆی کردوە بە ئامانج هەر ساتە ڕووبەڕووی هەڵوەست و واقیعی وەها دەبێ ئەگەر بە تەئویلان بۆ لای باوەڕ و ئامانجەکەی خۆی هەڵیان نەگێڕێتەوە شەڕەکە دەدۆڕێنێ. هەڵبەت دەبێ بزانین بردنەوەی شەڕی سەربە کۆمەڵایەتی لە ڕێی بەیەکدی گۆڕینەوەی ڕاستی و درۆ هەر بە سوودی ئەو کەسە و ئەو دەستەیە تەواو دەبێ کە درۆیەکان بە چاکەی خۆی و زەرەری غەیر هەڵدەبەستێ، لەو هەڵبەستنەشدا بەدایەتی خۆی بەسەر چاکەی غەیردا زاڵ دەکا.

زوربەی میللەت بە خۆیان و بەرژەوەندە سادەکەیانەوە ڕێیان نییە پەنا بەرنە بەر نوای درۆیان. بەرژەوەندی دروست کەماڵی حەڵاڵی زوربەی میللەتە کوڕی ڕاستی و ڕەواییە، فەرمانی ڕابەری دڵسۆزیش ئەوەیە بە فکری ڕوون و هۆشی کراوەیەوە، بە تیشکی حەقیقەتی بێ باهەڵدانەوە، سوودە ڕەواکانی میللەت لە جەرگەی واقیعدا بدۆزێتەوە نەک بە فەندی جادووگەرانە لە درۆیانیان ڕابهێنێ و سوودی ساختەکاریان پێ بە ڕەوا بسەلمێنێ.

بەنموونە دەڵێم، لە ساڵانی هەڵپەوکڵپە «وثبة»ی 1948 و غەزەب سەر کردنەکەی 1959 کە خوێنگەرمەکان دەیانگوت بە لەناوبردنی پارەدارەکان و دابەش کردنی پارەکەیان هەژار دەحەسێتەوە، دەیانتوانی کارێکی ئاسانتر و بێ زەرەرتر بگرنە بەر کە بێن لە جیاتی کوشتنی حاجی عەولا و سەلیم چەلەبی داوا لە حکومەت بکەن پارەیەکی تازە لێ بدات و بەسەر چینی هەژارانیدا ببەشێتەوە و بە پارەی کۆنیشی

نەگۆڕێتەوە نەکا پارەداری کۆن موفلیس نەبێ. ئەوسا بە چەورولووسی پارەش دەبەشرایەوە و پارەدارەکانیش ئیفلاسیان دەکرد و کەسیش سەر نەدەبردرا.

هەژاری بەستەزمانی کەرەوار کە دەگوترا پارەت بەسەردا دەبەشرێتەوە ئاگای لەوە نەدەما کە بەشینەوەی پارە نەبەستراوەتەوە بە لە ناوبردنی فلان و فلان. کابرای خوێنگەرمیش لەناوبردنی پارەدارانی مەبەستتر بوو لە تێر کردنی هەژاران جگە لەوەی کە بەلای خوێنگەرمەوە شۆڕشی بێخوێنڕێژی زڕەشۆڕش دەردەچێ، ئنجا نانەوەی هەرای ئیقلیمگیر حکومەتی پتر پێ بێدەسەلات دەبێ و ڕێگەی خوێنڕێژەکانیش بەرەو دەسەلاتی حوکم پتر پێی هەموار دەبێ. ئیتر لەو ناوەدا درۆ و ڕاست خۆیان پێکدی گۆڕیبۆوە و جەزبەیەکی دەروێشانەی تاریک ولاتی تەنیبۆوە کە هەموو ڕاستی و ڕوونی و بەرژەوەندێکی شاردبۆوە.

خوێنەر با بزانێ کە من لێرەدا دەڵێم لە جیاتی کوشتنی پارەداران پارەی نوێ لێ درابابە دەزانم چارەسەر کردنی هەژاری و برسییەتی وەها ئاسان و سادە نییە: من موناقەشەی ئەو بەرگە درۆزنە دەکەم کە خوێنگەرمەکان ڕاستییان تێدا دەشاردەوە ڕەخنەش لەوان دەگیرێ نەک لە من کە دێن چارەی هەژاریەتیی میللەت بە سەربڕینی تاقمێک دەکەن ناشڵێن کە ئەو پارەیە خورا و بڕایەوە دواتر لە کوێوە هەژار پارەی مفت و خۆڕایی لێ دەبەشرێتەوە.

من لێرەدا مەبەستمە لە خوێنەری کوردی نەوباوی بگەیەنم چۆن بەندوباوی «جوداوازیی بەرژەوەند دەبێتە جوداوازیی فەلسەفە» داخوازی لە خاوەنەکەی دەکا درۆ لە جێی ڕاست دابنێ و چاوبەستەکێشی تێدا بکا دەنا گوتەکە نەزۆک دەبێ و ئەنجامێک نازێتەوە. خاوەنانی گوتەی «جوداوازیی بەرژەوەند...» ئەگەر ڕازی بن پارەی نوێ بەسەر هەژاراندا دابەش بکرێ مەبەستە بنجییەکەی شەڕی چینایەتی کە بە پێی باوەڕی خوێنگەرمەکان بریتییە لە تێکهەڵقژان و یەکدی بڕینەوە نایەتە جێ و ڕەنگە ئاگری دەروونی هەژارەکەش دژی تێرەکان سەر نەکا چونکە دابەشینەوەی پارەی نوێ پێویستی بە لەناو بردنی پارەداری کۆن نییە. ئنجا هونەرێکی ئەوتۆی خوێنگەرمەکەش لەوەدا دەرناکەوێ کە پارەی نوێ لە حکومەتەوە یەکسەر بە هەژاران بگا وەک ئەوەی کە بە دەستی خۆی جڵەویان بۆ سەر خەزنەی پارەدار ڕاکێشێ...

لێرەدا چەندین بەڵگە و بنەمای فکری دیکە هەیە کە هەڵوەستی خوێنگەرمەکان بۆ وررووژاندنی هەژاران دژی پارەداران دەباتەوە بۆ مەبەستی تایبەتی وەیا هۆشتاریکی نەک دەوڵەمەند کردنی هەژاران. یەکێک لەو بەڵگە و بنەمایانە ئەوەیە ئەگەر چارەسەر کردنی هەژاری بە بەشینەوەی پارەی پارەداران مەبەستی خوێنگەرمەکان بێ خۆ کابرای پارەدار دەتوانێ هەرچی زێڕ و پارەیەکی هەیبێ لە چارەکێکدا تەفروتوونا بکا و نەیەڵێ بە هەژاران بگا. دیارە خوێنگەرمەکەش ئەمە دەزانێ چونکە هەرگیز بەتەما نییە پارەدار هەژاردۆست بێ، بە دەستی خۆی پارە و زێڕ و گەوهەرەکانی بەرەوپیری ئەو کەسانەوە ببات کە خەریکن دوای تالان کردنی سەریشی دەبڕن!

لەمەش بترازێین پرسیارێکی دیکە هەڵدەستێ: پارە لە خۆوە برسی تێر ناکا و رووتانیش پۆشتە ناکا. کەواتە شۆڕشگێڕ جڵەوی هەژاران بابداتەوە سەر قەساب و بەقاڵ و بەزاز و مەیدانی دەغڵ کە ئیتر لزومیش بە پارە نامێنێ مامڵەتەکەی پێ بکرێ وەک دەشزانین کە پارە لە بەیندا بوو رێی تێدەچێ سەرلەنوێ بچێتەوە گیرفانی چەند کەسێک و بیانکاتەوە بۆرجوازی...

دەزانم مامۆستا و رابەرەکانی ئەو خوێنگەرمانە باخەبەرن لەوەی کە بەشینەوەی پارەی دەوڵەمەندان تیماری دەردی هەژاری و پاشکەوتن ناکا، بەڵام ئەو رابەر و مامۆستایانە لەبەر تیشکی فەلسەفەکەیان کە دەڵێ: «جوداوازیی بەرژەوەند...» ناچارن دەبێ بەدوا ڕاستەواتای ئەو گوتەیە بکەون و ئاپۆرەی خەڵق بەو تەرزە دروشمە چاوغەڵەتێنە بەرەو جموجوولێک ببەن کە لەناو بردنی بەرژەوەندی دەوڵەمەندان بداتەوە بە دەقی نەزەریەکەیان تاکوو جموجوولەکە قودسییەتەکی وەها وەربگرێ دوودڵی و دەستپاراستنی خەباتکەران تاوانبار و ریسوا بکا. تۆ کە سەپاندت جوداوازیی بەرژەوەند دەبێتە جوداوازیی بیروباوەڕ چارت نامێنێ لەوەدا کە بەرژەوەندەکە و خاوەنەکەی بەیەکەوە لەناو ببەی تاکوو یەکجارەکی لە دوشمنەکە و فەلسەفەکەشی ڕزگار بێی. لەو ناوەشدا جێگەی هودنە و مەسڵەتی پەیدا نییە چونکە لەبەر تیشکی نەزەریەکەدا جوداوازیەکە هەتاهەتایی دەبێتە هۆی دوشمنایەتی لەبەر ئەمە مومکین نییە بە هێمنی و تێگەیشتن و لێکدی ڕازیبوون چارەسەری جوداوازیەکە بکرێ.

بەلای ڕای منەوە بەرژەوەند هەر بایی ڕەوایی و شەرعییەتەکی تێیدایە مافی دروستبِ کردنی قەناعەت و باوەڕی هەیە دەنا ئەو بەرژەوەند و سوودەی لەسەر ستەم و دەسدرێژی هەڵدەستێ هەرگیز ناشێ فەلسەفە بتەنیتەوە، ئەوەی فەلسەفەشی لێ هەڵدێنجێت باوەڕی پێی نییە. ستەمکار دەزانێ چ دەکات و چی دەوێت و قەت وەها لەخۆی بێ ئاگا نابێ کارە بەدەکانی بە پەسەند بزانێ. هەر ئەو هەست بەخۆ کردنەیشە دەیخاتە سەر فروفێڵی فەلسەفی و خەڵق گێل کردن. هەروەک ڕابەرە ماددییکە دەزانێ پارە بەشێنەوە هەژار تێر ناکا ستەمکار و شێخی درۆزنیش دەزانن نیاز و تەماکانیان ڕەوا نین.

سەیر لەوەدایە کە ئەو شاگرد و دەستوپاوەند و مریدەی بەو درۆیانە هەڵدەخەڵەتێن وەهایان لێ بەسەر دێ کام زەرەری قورسە ئەویان قبوڵ بکەن کەچی لە سەرەتاوە بەتەمای سوود و خۆشی بوون واتە کابرای ڕابەری درۆزن دڵ و دەروون و هۆشی ئەو خەڵقە وەها دەدزێتەوە چی مەبەست بێ ئەوەیان پێ دەکا و دەبنە قوڕەچەورە بە دەستییەوە. بەرژەوەندی ڕەوا حەقیەتی ببێتە بنەمای قەناعەتێک کە لەسەرکردنەوە هەڵبگرێ وەک ئەوەی کە دایک و باوک بە خوێنی خۆیان منداڵیان بەخێو دەکەن لێیان دەسەلمێندرێ لە دوارۆژدا بەتەمای وەفا و بەزەیی منداڵەکەیان بن چونکە لە هەر لایەکەوە سەیری پێوەندی باوک و دایک بە منداڵیانەوە بکەی پتر بۆت دەردەکەوێ کە حەقی دایکەتی و باوکەتی بەسەر منداڵیانەوە مافێکی پیرۆز و بەشەرەفی مرۆڤایەتییە.

بە نموونە دەڵێم: ئەو لایەنەی هانی منداڵەکە دەدا بۆ دەرچوون لە جغزی وەفاداری بەرانبەر دایک و باوک هەزاریەکی ئەوان بە منداڵەکەوە خەریک نابێ هەزاریەکی ئەوانیش بۆی دڵسۆز و پەرۆشدار نییە کەچی پتر لەوان لێی داوا دەکا. هەر لە پەنا خەباتیشەوە بە نیازەکانی خۆیەوەی خەریک دەکا. منداڵیش کە بوو بە باوک یا دایک دەچێتە ڕیزی ئەو باوک و دایکەی کە وەختی خۆی چاویان لە وەفا و سۆزی ئەو بوو... قورئان لێرەدا شتێکی ڕاگەیاندوە ئەوەندە گەش و ڕەوا و دادپەرستە هەموو ئەو غەڵبەغەڵبەی کە دەیەوێ منداڵ لە باوانی تار بکا دەداتەوە بە تاریکی و نامەردی و دێوپەرستی: «واخفض لهما جناح الذل من الرحمة وقل ربي ارحمهما كما ربياني صغيرا».

جگە لەم مەیدانە پڕ هەست و سۆزی باوک و ئەولادەتی ژیانی کۆمەڵایەتی لە کۆنەوە زۆر لەو بەرژەوەندە ڕەوایانەی تێدا بوە کە دەشێ ببنە بنگەی قەناعەت و بیروڕای پاک و چاک و هەموو لەسەر کردنەوەیەک هەڵبگرێ، وەک ئەوەی کاسبکار وەیا بازرگان وەیا وەرزێر وەیا تیرێژێکی دیکەی کۆمەڵ بێ، بەر لە قۆناخی سۆسیالیزم بە پێی یاساکانی ڕۆژگاری خۆیان، بێ دەستبڕین و فڕوفێڵ گوزەرانیان پێک هێناوە وەیا شتێکیان پاشەکەوت کردوە وەیا میراتێکیان بۆ وەچەکانیان بەجێ هێشتو▪ ئیتر حەقیان بوە بەروبومی بخۆن و لە زاڵمانی بپارێزن وەیا لەو نیازەی خەرج بکەن کە دڵیان بۆی دەچێ.

ئێستاکە کە هەندێ لە بیریاری ماددی دەیانەوێ هەموو دەسکەوت و داهاتی غەیری فەلاح و عەمەلەی لێرە بە پێشەوە بە ناڕەوا نیشان بدەن بەرگێکی درۆزن لەبەر هەڵکەوتێکی ڕاست و دروست دەکەن، خۆ لەو سەردەمانەدا مومکین نەبوە چاکە و ڕەوایی بە کێشانەی سەردەمی سۆشیالیزم هەڵکێشن و فەتوای پەسەندبوون و نەبوونی ڕەفتاری ئەو سەردەمانە لەبەر تیشکی بیروباوەڕی لەدایکنەزاوی دواڕۆژدا دەربهێنن، بیریارە ماددییەکەش ئەم ڕاستییە دەزانێ بەڵام بە نیازی دڵگەرم کردنی مریدەکانی بۆ لەناوبردنی دەوڵەمەندەکانی ئەم ڕۆژگارە دێت پارەدارەکانی سەدان ساڵ بەر لە ئیمڕۆش دەداتەوە بە حوکمی کۆمەڵایەتی سەدەی بیستەم و سۆشیالیزم. ئەو تەرزە بیریارە، بێ دوودڵی، گوتەیەکی «جوداوازیی بەرژەوەند...» دەکاتە بنگەی ڕەوا کردنی ئەو تەدبیرە ناڕەوایانەی بە چاکیان دەزانێ وەیا حەزیان لێ دەکا وەیا سوودیان لێ وەردەگرێ.

بێگومان خوێنگەرم کە باوەڕی هێنا بە ناپەسەندبوونی سامانی سەدان ساڵ لەمەو پێش هەر بەجارێ هار و شێت دەبێ لە ئاست سامانی بەرچاوی خۆی، ئەمەیشە بیریارە ماددییەکە لە ڕاگەیاندنە سەرەوبنەکانی خۆی ڕادەپەڕموێ و بەتەمای بەرەکەتیەتی. لەم مەیدانەدا هەتا بەدوا شی کردنەوە و نموونە هێنانەوە بکەوین لێیان نابینەوە، هەر ئەوەندە دەخەمە سەر قسەکانم کە بڵێم ڕاست و درۆ بەیەکدی گۆڕینەوە لە کۆنی هەرە کۆنەوە باو بوە، هێندە هەیە ئەوەی بەر لە سەدان و هەزاران ساڵ بە سادەیی دەکرا لەم ڕۆژگارەدا لەبەر تێکهەڵقژانی زێدە بە هەرا و

گرمەی بیروباوەڕی جودا و فەلسەفەی جۆرجۆر دەخریتە چارچێوەی قودسییەتی ئایین و مەبدەئەو هەمیشەش بە بیستن و دیتن و خوێندنەوە دەخریتە دڵانەوە.

3- لەلایەن دزێو کردنی هەڵوەستی پاک و مەردانەی غەیرەوە ئەم گوتەیەی «جوداوازیی بەرژەوەند...» ئەویش وەک ئەوەی لە خاڵی دووەمدا باس کرا، چونکە لە تاکتیکی تێکهەڵقژانی ڕۆژانەدا بەکار دێ لەحەدبەدەر هانای دەبرێتە بەر و شەڕی ئایدیۆلۆجی پێ دەکرێ، خراپەشی لەوەوە دێ کە بزووتنەوەی نیشتمانی لەو وڵاتانەی وەک عیراقی پێش 1958 ژێردەستی بێگانە بوو، بەشی زۆری ڕۆشنبیرانی تێدا بەشدار دەبوون زۆرینەشیان لە بەرەی تێروتەسەلی ناوەند بوون چونکە ئەوان پتر لە هەژاران دەیانتوانی بخوێنن و هەستی چینایەتی و قەومایەتییان تێدا بگەشێتەوە.

کە هیچ تەئویل و دزێو کردن لە نێواندا نەبێ دیارە کوڕە دەوڵەمەند لە پلەی خوێندندا بێ تەنها ئامانجی نیشتمانپەروەری بە گژ حکومەتیدا دەهێنێ [کە لە حقوق بوم کوڕی وەزیری «عدل» شیووعی بوو]. تەنانەت وەک کرێکار بە ئومێدی زیادبوونی ڕۆژانەی عەمەلەیەتیش نییە کە مان دەگرێ وەیا نمایشت دەکا. ئنجا ئەگەر تەئویلی وەک «جوداوازیی بەرژەوەند...» لەلاوە نەیەت و گومانی نیازی پیس و مەبەستی شەخسی بخاتە هەڵوەستی ئەو خۆبەختکردوانەی تێروتەسەل، دەشێ بزووتنەوەی ئازادیخواز لە پلەی وەدەستهێنانی سەربەخۆیی وەیا مافە دیمۆکراتەکان هەرای ناوەکی و چینایەتی توندوتیژی تێدا ڕوو نەدات و هەموو هێزی خۆی ڕووبەڕووی داگیرکەر و ستەمکار بکاتەوە زووتریش بە ئامانج بگا و کەمتریش قوربانی بدا.

دەبێ بزانین بیریارێک کە وا دابنێ ڕووبەڕووبوونی خەباتگێڕی تێروتەسەل لەگەڵ داگیرکەر و دیکتاتۆر هەر دەبێ بدرێتەوە بە حوکمی ئەو بەرژەوەندەی کە لە هەژارانی جودا دەکاتەوە، ئا ئەو بیریارە لە هەزار و یەک ڕووەوە دوشمنی سوود و چاکەی ڕاستیینەی مرۆڤایەتییە چونکە بیریارێک کە هاووڵاتی دڵسۆز و نیشتمانپەروەری خۆبەختکردووی لە پێناو گەل و مەفتەن بە دوژمنی میللەت دابنێ دیارە لە دواڕۆژدا کە داگیرکەر و دیکتاتۆر لە بەیندا نەما بیریارەکە بڕیاری لەناوبردنیان دەدا چونکە ئەگەر لە دەمی هەبوونی داگیرکەر ڕێی تێبچێ بەشێکی

بەدایەتی ئەو دڵسۆزانە ڕووبەڕووی داگیرکەر بووبێ دواتر دەبێت هەموو بەدایەتیەکەی ڕوو لە پرۆلیتاریا بکات.

بەم جۆرە بیر کردنەوەیە کە لەسەر بنەمای «جوداوازیی بەرژەوەند...» هەڵچەقیوە نیشتمانپەروەری «ناپرۆلیتاریا» ناتوانێ هەرگیز هەژاردۆست بێ... ڕێی خیانەتی بە بڕیاری ئەو دەستوورە لە سەرەتاوە هەتا کۆتایی کار ڕەنگریژ کراوە و هەر دەبێ غەیان بێ... نووکی قەڵەمی ئەم فەلسەفەیە مۆری خوێنمژی و بەدایەتی لە چارە و چارەنووسی نیشتمانەپەروەری دەرەوەی جغزی پرۆلیتاریا داوە. کە ورد بینەوە دەبینین تەسک کردنەوەی ڕێی دڵسۆزی و هەژارویستی و مرۆڤخاسی تا ئەو ڕادەیەی بە قەفەبلوولی زێدە تەنگی باوەڕی ئەو تەرزە فەیلەسووفە گومانکارەدا بەڕێ دەکرێ وا دەکا هیچ کەسێک لەوانەی خوا نانێکی پێ داون بەتەمای یەک تۆسکال مەردایەتی و شەرافەت و حورمەت نەبێ لەو فەلسەفەیەوە پێی بگا و غەیری لەناوبردن هیچی پێ ڕەوا بدیترێ.

بێگومان ئەو فەلسەفەیەی کە لە ڕێی جوداوازیی بەرژەوەندەوە کۆمەڵایەتی کەرت کەرت و بڕبڕ دەکا بەو شێوەیەی ئاشتی لە بەینیان حەرام بکرێ هەر لە سەرەتاوە چاوی خۆی نووقاندوە لە هەموو ئەو پێوەندییە سوودبەخشانەی لە نێوان تێکڕای گەل کە بە درێژایی ڕۆژگار کاری پەسەندی کردوە، کە ئەگەر وەها نەبوایە و هەموو مێژوو بریتی بووبایە لە یەکدی خواردن و یەکدی خەفە کردن نەدەشیا ئەو پێشکەوتنە ماددی و نامادییانە ڕوویان دابایە کە لە هەر پلەیەکی گۆڕانی کۆمەڵایەتیدا بووبێ پۆپی ژیان و بوونیان گرتۆتەوە.

ئێمە بە چاوی خۆمان دەبینین لە نێوان دڕندانda هاریکاری و بەیەکەوە ژیان و لەسەریەکدی کردنەوە هەیە بایی ئەوەی بەردەوامبوونیان پێی دەوێ، ڕەنگە وەهاش بووبێ لە ماوەی ساڵێکدا دوو شێر وەیا دوو پڵنگ وەیا دوو گورگ بەشەڕ نەهاتبن، ئنجا بڕوا دەکەم ئەگەر ئەو جانەوەرانە نەزەریەی «جوداوازیی بەرژەوەند...» بخوێنن وەک کە مرۆڤ دەیخوێنێ و دەیسەلمێنێ تا ئەوەی نابێ نیشتمانپەروەری تیروتەسەل دڵسۆزی بەشەرەف بێ، خێرا بە خێرا- دڕندەکان- یەکدی لەناو دەبەن و ئاستەواریان دەبڕێتەوە چونکە بەزاهیر لە نێوان دڕندانda چ بیروباوەڕی سەربە خواپەرستی و داد و غەیردۆستی و دەستووراتی ئاکار و ئەو

تەرزە خەسڵەتانە نین پارسەنگێکی خۆخۆریەکەیان بداتەوە کە نەزەریەی «خوداوازیی بەرژەوەند...» بەرپای دەکا.

ئنجا کە لە نێو مرۆڤدا بە هەموو باوەڕ و فەلسەفە و ئاکار و دینیەوە مومکین نەبێ نیشتمانپەروەری تێر بە دۆستی هەمیشەیی میللەت قبوڵ بکرێ چۆن دەشێ گورگ و گورگ برادەر بن لەسەر «جوداوازیی بەرژەوەند...» یەکدی نەکوژن!! ڕەنگە بگوترێ لە نێوان گورگاندا جوداوازیی چین نییە تاکوو بەشەڕیان بهێنێ، لە ئاست ئەم تەئویلەدا دوو تێبینی کورتیلەم هەیە: یەکیان ئەوەیە کە گورگ و ڕێویش جوداوازیی چینایەتیان لە نێواندا نییە کەچی گورگەکە ڕێویەکە دەخوا. دوەمیان ئەوەیە شێر و شێر لەسەر نێچیر بەشەڕ نایەن بەڵام شێر و پڵنگ لەسەری بەشەڕ دێن نە شێرەکە و نە پڵنگەکە و نە نێچیرەکەش هیچیان جوداوازیی چینیان لە نێواندا نییە... سەیری شێر و شێر، پڵنگ و پڵنگ بە «برایەتی!» نێچیر دەخۆن.

وا بزانم چار نییە لەوەدا خۆشی بێ و ترشی بێ، دەبێ دان بەوەدا بهێنین کە مێژووی مرۆڤ و بەیەکەوە هەڵکردنی کۆمەڵایەتی جگە لە تاکە سوودی دەسەڵاتدار، ئەوەندە دۆستییە و هاریکارییە و یەکدی ویستنەی گشتی تێدا بووبێ بە پێچەوانەی داخوازیەکانی نەزەریەی «جوداوازیی بەرژەوەند - جوداوزیی چین» بووبێتە هۆی مانەوەی نەوعی بەشەر وەک کە ڕێوی و مەیموونیش ماونەتەوە.

من داوا لە نەزەریەی «جوداوازیی چین و بەرژەوەند» دەکەم کە لە نوختە نیگای بەردەوامبوونی نەوعەوە بەچاوی ڕێوی و مەیموون سەیری مرۆڤ بکا چونکە ئەویش وەکوو ئەوان بەردەوام بوە، ئنجا جارێکی دیکەش داوای لێ دەکەم نیگای خۆی فرەوان بکا بایی ئەوەی کە ویێرای بەردەوامبوونی نەوع بەرەوپێشچوون و گۆڕانە کۆمەڵایەتیە - زانستییە - تەکنیکیەکەش تێبخوێنێتەوە چونکە ئەگەر هەر بەقەدەر پشیلە و مەیموون حیساب بۆ برایەتی و هاریکاریی نێوان مرۆڤ بکا بەوەدا هەر تەفسیری بەردەوامبوونەکەی مرۆڤ بە دەستەوە دەدا نەک تەفسیری چوونە مانگ و زەڕڕە قڵاشی و جەزری تەکعیبی... نەزەریەی «جوداوازیی بەرژەوەند و چین» لە وردبوونەوەدا زۆر قەرزدار دەمێنێتەوە لەتەک مانەوەی نەوع و پێشکەوتنی مرۆڤدا، ئنجا گەلێک بەولای قەرزداریەوە بەرەو ئیفلاسیش دەڕوا کە فەتوای لەناوبردنی شۆڕشگێڕی تیروتەسەل دەدا، بەولای ئیفلاسەوە لە

دڵپیسیش ڕۆ دەچێ کە خەریک دەبێ هەمیشە تەئویلی بەد لە کردەوەی مەردانەی غەیری هەژاران دەداتەوە.

هەڵبەت دەزانم ڕاستییەکی گرنگ هەیە پێی دەڵێن «جوداوازیی بەرژەوەند...» هەروەک دەزانم لەتەک ئەودا جوداوازیی بێئەژماری وەک جوداوازیی دین، جوداوازیی حەز، جوداوازیی بۆچوون، هی نەتەوایەتی، هی عەشیرەت، هی ڕقلێبوونەوە و خۆشویشتن، هی نەریت، هی زمان... هەیە ئنجا لە دەستە تەرازووی بەرانبەریاندا ماکی: برایەتی، بە یەکەوە ژیان، سوودی موشتەرەک، هاوباوەڕی، هاووڵاتی، هاوزمانی، هاودینی، هاودەردی، ئەمەک، سۆز، خزمایەتی... هەیە مەعادەلەکەی کۆمەڵایەتی تەواو دەکەن تێکڕاشیان دەچنە ژێر سەرەناوی «پەلەی ژیان» نەک «جوداوازیی بەرژەوەند - شەڕی چینایەتی».

من تەمام نییە لێرەدا بە دەماری نەزەریەی «تناقض»دا بچمە خوارێ کە هەر خۆی سەرچاوەی فکرەی «جوداوازیی بەرژەوەند»ی تازەیە، تەنانەت ناتوانم بەرەو لەیەکدی جوداکردنەوەی «تناقض»ی نێوان دوو لەشکر کە یەکدی دەبڕێننەوە و هی نێوان هێزی «-» و «+»ی کارەبا کە خزمەتی هەزاران دیاردە دەکات بڕۆم، وەیا تەناقوزی نێوان ئاو و ئاگر جودا بکەمەوە لە تەناقوزی وێرانکەر هەروەها ڕێم نییە تەناقوزی ڕاستەقینە هەڵاوێرم لەو «تکامل»ەی نێوان شتی لە یەکدی نەچووی کە ئەویش زۆر بە سەیری دراوەتەوە بە فهوومی تەناقوز... تەمام بەوانە نییە چونکە من لە گۆشەی «فکر و مادده - مرۆڤ و دەوروبەر»ەوە بە هەندێ لە بیروڕایە ماددییە تەقلیدیەکاندا دێمەوە بایی ئەوەی یارمەتی ڕوون کرنەوەی دەوری ڕاستینەی مرۆڤ لە گۆڕانی کۆمەڵایەتی و مێژوویی دەدات، ئنجا کە من لە گۆشەی وەها بەرتەسکەوە باسی بەیەک گەییشتنەوەی فکر و مادده بکەم دیارە ڕێم نییە خۆم بهاوێمە باوەشی شەپۆلە بێ ئەمانەکانی ئەو دیاردەیە بێسەروبنەی «تناقض» کە دەنگ و سەدای لە زوربەی نەزەریەی ماددی و نامادی دەبیسترێ.

ئەوەی لێرەدا جێی باسی «تناقض»ی تێدا دەبێتەوە لەوە پتر نییە کە بڵێم وشەی تەناقوز و واتاکەی وەها لەبەریەک دەکێشرێتەوە تاکوو بێلزووم و بێمەعنا باوەش بە زۆر شتاندا دەگرێ کە هیچ خزمایەتی لەگەڵ تەناقوزدا نییە، یەکێکیش لەو شتانەی بە زۆرەملێ وەیا بە هەڵە دەدرێتەوە بە تەناقوز ئەم گوتەیەی جوداوازیی

بەرژەوەندە، لە نێوان تەناقوز و جوداوازیشدا فەرقێکی وەها گەورە هەیە کە نەیەڵێ بە یەک چاو سەیر بکرێن و یەک دەستوور و بڕیاریان لێ وەربگیرێ. هەرچی «تناقض»ـە بە واتای «یەکتر هەڵوەشاندنەوە» دێ کە هەبوونی لایەنێکی تەناقوزەکە نەبوونی لایەنەکەی دیکە پێک دێنێ واش دەبێ هەردوولا یەکدی تێدەبەن وەک کە دوو هێزی ئەمسەر و ئەوسەری گوریسکێشەکێ یەکدی بەتاڵ دەکەنەوە وەیا ئاو ئاگر دەکوژێنێتەوە وەیا مرۆڤ بەرخ سەر دەبڕێ... «جوداوازی» لە بنەڕەتدا تەناقوزی تێدا نییە تا ئەو دەمەی شکڵی ڕووبەڕووبوون وەیا پشت لە یەکدی کردن وەردەگرێ.

هەڵبەت مەعلوومە لە تەناقوزدا جوداوازی هەیە بەڵام جوداوازی تا نەچێتە ناو تەناقوز وەیا نەگاتە ئەو پلەیە، حیسابی یەکدی بڕینەوەی تێدا نییە. هەندێ جاران جوداوازی ناڕێکیشی تێدا نابێ وەک ئەوەی کەسبی من ڕاوەماسی بێ و هی تۆش کاروانچییەتی: لەوانەیە لێشاوکە و قوڕاوی باران زۆرترم ماسی بەدەستەوە بدا و کاروانەکەی تۆش بوەستێنێ و زەرەرت لێ بدا هیچ لایەکیشمان لەیەکدی عاجز نابین هەرچەند بەرژەوەندیشمان لە بارانەکەدا جودا بوو. وەها دەبێ جوداوازییەکە دەکێشێتەوە سەر نەگونجانی لایەنەکانی یەک مامڵەت وەک کە تۆ خانوو دروست بکەیت سوودت لەوەدا دەبێ گەچ و بەرد و عەمەلە و وەستای هەرزانت چنگ بکەوێ دیارە سوودی بەردفرۆش و گەچ فرۆش و عەمەلە و نەجاریش لەوەدا دەبێ پترت پارە لێ وەربگرن بەڵام ئەم جۆرە جوداوازییە ناچێتەوە بۆ لای «تناقض» چونکە تۆ و هەموو ئەوانەی مامڵەتت لەگەڵدا دەکەن هیچتان بە فەوتانی ئەوی دیکە قازانج ناکات، بە پێچەوانە، بەرژەوەندتان ڕادەوەستێ، قسەشمان لێرەدا لەگەڵ قۆناخی پێش سۆشیالیزمە کە ژیان و گوزەران و خانوو دروست کردن سەرێشەی تاک بوو نەک هی کۆمەڵ. ئەم جوداوازییەی نێوان سوودی گەچفرۆش و عەمەلە و خانووساز زۆر بە سەیری ناوی «تناقض»ی لێ دەندرێ و لە کردەوەدا بەو پێیە مامڵەتی لەگەڵ دەکرێ واش دەزانن ڕاستییەکی گرنگیان پێکاوە کەچی ڕاستییەکی گرنگ کوژراوە. ئێمە ئەگەر فێڵ لە خۆمان نەکەین دەبێ هەر دیاردەیە ناوی ڕاستینەی لێ بندرێ بۆ ئەوەی بایی چاکە و خراپە و جوانی و دزێویەکی تێیدایە لەگەڵی دۆست یا دژ بین. گۆڕینی واتای شتان ناچێتەوە بۆ چاکەی کۆمەڵ،

ئەوپەڕی چاکە لەو گۆڕینەدا هەبێ ئەوەیە کە دەچێتە گیرفانی بابای کە واتای گۆڕی، دیارە زەرەری تێکڕای گەلیشە بۆتە سوودی واتاگۆڕ وەک کە شێخی درۆزن و مەلای قیلەشەرعان قازانجی خوارەکەوخێچەکەیان لە گیرفانی خەڵق دەردەهێنن.

لە بیرمە جارێکیان لە دوو ژمارەی ڕۆژنامەی «النور»دا گوتارێکی «ماوتسی تۆنگ» بڵاو کرایەوە لەسەر «تناقض» دەدوا. لەو گوتارەدا قسەیەکی ماو ئەوە بوو «إن الحركة في أساسها تناقض» واتە بزووتنەوە لە بنەڕەتدا تەناقوزە. من لەو دەمەدا چەندین وێنەی بەردەست و بەرهەستم بە بیردا هات کە هیچیان لەگەڵ ڕایەکەی «ماو» ناگونجێ بە نموونە: ئەگەر بزووتنی گەڕۆک تەناقوز بێ دیارە پێ لە بەنزین نان تەناقوزەکە زیاد دەکا، جا ئەگەر وەها بێ ئەدی برێک ڕاکێشان و وەستاندنی گەڕۆک چییە لەتەک بزووتنەوەکەدا؟ ئەگەر زیاد کردنی خێرایی گەڕۆک لە ڕێی پێ لە بەنزین نانەوە زیادکردنی «تناقض» بێ ئەدی پێ لە بەنزین هەڵگرتن دەکێشێتەوە سەر نەهێشتنی بزووتنەوەکە لە ئاست بزووتنەوەکەدا چی پێ دەگوترێ؟ بزووتن و وەستان لەبەر ڕۆشنایی فکری ڕاست و دروستدا کە گێژ نەکرابێ بە فەلسەفەی با هەڵدراو دوو لای ئەمسەرەوسەری تەناقوز پێک دەهێنن ئیتر چۆن دەشێ پتر بزووتنەوە پتر «تناقض» بێ؟ دەزانین «ژین، زیندوەتی»یش جۆرێکی هەرە بەرەوپێش بۆوەی بزووتنە: بەو پێیە کە «ماو» لە گوتارەکەدا ڕای دەگەیەنێ خۆراک یاریدەی «تناقض»ی ناو ژینەکە بدا، ئەدی لە برسان کوشتن و زەهر دەرخوارددان چی بۆ دەمێنێتەوە لەو تەناقوزە نازدارە؟ ڕەنگە ڕێزمان بۆ ماو بەرەو ئەوەمانەوە ببا کە بڵێین مەبەستی ماو لە گوتەکەدا ئەوەیە بڵێ «بزووتن» لە بەرانبەر «وەستان» دا تەناقوزە کە ئەمە تەفسیرێکی فیزیایی دوور لە کۆمەڵایەتی و مرۆڤایەتییە و چاری ئەو کێشە فکرییە ناکا کە لە مەیدانی «مرۆڤایەتی» - بە مێژوو و کۆمەڵایەتییەوە - ڕووبەڕووی تەناقوزمان دەکا. لەگەڵ ئەمەشدا بۆ چەند دەقیقەیەک چاو لەو گرفتە دەپۆشین و مرۆڤ و فیزیا لێکدی ناترازێنین، ئەوساش لە دوو نوختەوە حەقی ڕەخنەمان دەمێنێ:

نوختەی یەکەم ئەوەیە کە زاناکانی فیزیا بزووتن بە بنەمای بوونەوەر دادەنێن نەک وەستان بەو پێیە دەبێ قسەکە هەڵگێڕینەوە و بڵێین وەستان لە بنەڕەتدا تەناقوزە

بەڵام دیسانەوە ناگەینە ئەوەی فیزیا لە حەقیقەتی بزووتن و وەستانی مەبەستە چونکە ئێمە هەر وەستانی قەواڵەی بەرچاو دەبینین کەچی وردیلە پێکهێنەرەکانی ئەو قەواڵانە بە جۆری هەمیشەیی لە گەڕدان، ئنجا ئەرز و ئاسمانەکان و کاکێشەکان... هەمووی لەو بزووتنەوەیەدان کە بوە بە «دوورایی چوارەم» لەتەک سێ لانەی «درێژایی، پانایی، بەرزایی»دا، تا ئەگەر ئەو بزووتنە نەما نە ئەو جیهانەی دەیناسین دەمێنێ نە ژین و بوون و هۆش و ماش و تەڕەماشیش دەمێنێ.

نوختەی دوەم ئەوەیە ئەگەر «ماو» مەبەستی «تناقض»ی نێوان بزووتن و وەستان بوایە نەیدەگوت «لە بنەڕەتدا» چونکە ئەو تەناقوزە پەکی لەسەر بنەڕەت و سەرەتا و کۆتایی نەکەوتوە، یەکسەر و ڕاستەوخۆ لە هەموو ڕوێکەوە بزووتن و وەستان، مردن و ژین، گەرمی و ساردی دژی یەکدین. دیارە «ماو» مەبەستی تەناقوزی ناوەکیی بزووتنەوەیە نەک بزووتنەوەی بەرانبەر وەستان. لەگەڵ ئەمەشدا لزوم نابینم کێشەکە لە کۆمەڵایەتییەوە ڕاگوێزم بۆ فیزیا چونکە لە کۆمەڵایەتیشدا نە بزووتنەوە نە وەستان، هیچیان، خۆی لە خۆیدا «تناقض» نییە: دەبێ لە دەمی تێکهەڵنگوتنی شتان نەگونجان و تەناقوز پەیدا ببێ. لەمەوە دەردەکەوێ ئەو بزووتنەوەیەی یاریدەی بزووتنەوەیەکی دیکە دەدات دەوری پشتیوانی دەبینێ نەک بەرهەڵستی. ئنجا پێ لە بەنزین نان و خۆراک دان یاریدەدەرن نەک زیادکەری تەناقوز.

هەر بەو پێیە کە بەر لە هەزاران ساڵ سەوداگەرێک ئاوریشمی لە چینەوە دەهێنا بە شتومەکی ئەورووپای دەگۆڕیەوە لە بزووتنەوەی بەرەوپێشی مێژووی زیاد دەکرد، هەر لەو مامڵەتەشدا قازانج بە خۆشی دەگەییشت چونکە تیجارەتی بێ قازانج نە دەکرێ و نەکراوە، ئیتر دیارە تیجارەتەکە نە خۆی لە خۆیدا تەناقوزە نە لەگەڵ بەرژەوەندی مرۆڤایەتیش تەناقوزی هەیە. ئنجا ئەگەر یەکێک لە ڕێی نەزەرەیەی «جوداوازیی بەرژەوەند»ەوە خەیاڵی تەناقوز بهێنێتە نێوان سوودی توجارەکە و سوودی کۆمەڵ بەوەشدا مامڵەتەکە ناڕەوا نیشان بدا و توجارەکەش بە خوێنمژ دابنێ دیارە سەرلەبەری بەرەوپێشچوونی مرۆڤایەتی دزێو و تاوانبار دەکات و مەیموونایەتی و ورچایەتی بەسەر مرۆڤایەتیدا تەرجیح دەدا چونکە ئەوان قازانجی ئاوریشمی چین لە کڕیاری ئەورووپا وەرناگرن. بەرەوپێشچوونی مرۆڤ هەر ئەو

تەرزە ڕێگەیەی لەبەر بوە کە مام توجار گرتبیە بەر، ئەو نیشتیمانپەروەرەی کە یەخەگیری داگیرکەریش دەبوو ئەگەر توهمەی «جوداوازیی بەرژەوەند» لە دواڕۆژدا بیکاتە غەیان ئەویش لە سەرەتاوە بەگژداچوونی داگیرکەری لێ دەبێتە شێتی چونکە دەستی داوەتە کارێک سەرەتاکەی کوشندەیە و کۆتاییشی خیانەت.

لێرەدا ناچارم قسە کورت دەکەمەوە و دەڵێم کۆمەڵایەتی و مرۆڤایەتی گەلێک بەرژەوەندی گشتی و موشتەرەکی تێدایە کە ناهێڵێ وەها بە ئاسانی و بە سەرپێیی خەتی «تناقض» لە نێوان چینەکان و تیرێژە بەرتەسکترەکانی بکێشرێت هەر چینەش لە کۆنەوە پەراوێزێکی بەرینی سوود و بەرژەوەندی موشتەرەک بە چینەکانی دیکەی دەبەستەوە کە ئەگەر بە چەقۆیەکی سیحر و غەیبی هەڵبڕابایەوە خوێن لە هەردوو چین دەهات. سەیرش لەوەدایە، هەتا مرۆڤ لە پلەی ژیار و زانست و تەکنیک سەردەکەوێ پێوەندییە موشتەرەکەکانی زیاد دەکەن و هەڵبڕینەوەیان پتر خوێنی لێ دەهێنێت.

بەنموونە دەڵێم هەڵبڕینەوەی پێوەندیی نێوان فەلاح و خاوەن زەوی ئاسانترە لە بێتەرەف کردنی سەرمایەدار، سەرمایەداریش ئاسانتر بێتەرەف دەکرێ لەو بنگە پیشەسازیانەی بەندن بە تەکنیک و زانستەوە. مرۆڤ بەسەر ڕێبازێکدا دەڕوا هەنگاو لەدوا هەنگاو پتر تێیدا موحتاجی هاریکاری و یارمەتیی ناکۆیی و ناوخۆیی دەبێ بە پێچەوانەی بیرکردنەوەی ئەو فەیلەسووفانەی شەیدای جەڕ و مەنگەنەی تەناقوز و جوداوازیی بەرژەوەندن. دوور نابینم ئەو ڕۆژەی کە فەیلەسووفی ئەتۆیی تێدا پەککەوتە دەبێ نزیکتر بێ لەوەی وەها بەڕواڵەت خۆی دوور دەنوێنێ.

گێژەلوولکەکانی سەرەتای پەیدابوونی بیری چینایەتی و تەناقوز و جوداوازیی بەرژەوەند بەشی هەرە زۆری داینەمیکیەتی خۆی لە نەزەر ڕۆشنبیریی سەردەمدا ون کردوە تا ئەوەی ئەو بزووتنەوانەی لە وڵاتە پێشکەوتوەکان لەسەر بنەمای چینایەتی هەڵسان خەریکن ڕادەگوێزنە سەر بنگەی پێکەوە ژیان و هەڵکردن و هاریکاری هەم لە خغزی مەفتەن و هەم لە جغزی جیهاندا هەمووشی لەسەر حیسابی کز کردنەوەی دەوری تەناقوز دەبێ، خۆ ئەوەی پێی دەڵێن Surplus Value وا جێ چۆڵ دەکا بۆ ئەوەی لە ئابووری تێکڕای وڵات گیروگرفتی گوزەران

چارەسەر بکرێ نەک لە شەڕەدەندوکێ کۆنەکەی نێوان جووتە کەڵەشێری خاوەن پارە و عەمەلە.

وڵاتی دواکەوتوو جارێ ئەوەندە بە ڕوونی هەڕەشەی چەکی ئاتۆم لەتەک پەلەفرەی گوزەرانی ڕۆژانەدا نابینێ، تەنانەت ڕۆشنایی ئاسمانگەڕی و پێشکەوتنە بێسنوورەکەی زانست و تەکنیکیش نەیتوانیوە لەو وڵاتانەدا تاریکیی میراتی بڕەوێنێتەوە هێشتاش هوتافەکانی سەردەمی شۆڕشی فەرەنسە هەڵدەبڕێ... بەڵام ئەم کورتبینییە و تاریکییە نابێتە کێشانە و پێوانەی بزووتنەوەی ماتیریالیزمی کۆتایی سەدەی بیستەم: هێزی پاڵەپەستۆی پێداویستەکانی تێکرایی مرۆڤ، چ لە مەیدانی سەلامەتیی تێکرایی بێ و چ لە مەیدانە جۆرجۆرەکانی ئابووری و کۆمەڵایەتی و زانست و تەکنیک بێ خەریکە تەناقوزە کۆنەکەی نێوان لایەنە ئەوپەڕەکانی چەپ و ڕاست لە ڕووبەڕووبوونەوە بۆ لابەلابوونەوە و بە تەنیشت یەکدیدا ڕۆیشتن دەباتەوە، خۆ ئەگەر هێزی ئەو پاڵەپەستۆیە نەیتوانی لە یەکتر کوتانی ڕووبەڕووەوە ڕاگوێزێ بۆ لێک خشان و لێک ترازان، ئەوسا، ڕۆژەڕەشی مرۆڤایەتی گەلێک گەلێک لەوە تێدەپەڕێ لە ڕوانگەی Surplus Value ەوە سەیری بکرێ و لەوێوە تریاقی مارانگاز بخوازرێتەوە.

بەهەمەحاڵ چی لەو ڕوپەڕانەی دواییدا نووسیمن هەوڵدانێکە لە منەوە بۆ ئەوەی نەختێک حەقیقەتی «جوداوازیی بەرژەوەند و تناقض» و پێوەندییان بە «جوداوازیی بیروباوەڕ» بۆ خوێنەری شلکی کوردی ڕوون بکەمەوە، هەرگیزاو هەرگیزیش ناشێ ئەم قسانەم ببردرێنەوە بۆ درێژ کردنەوەی عومری سەرمایەداری. بڕوا ناکەم لە من ئارەزۆمەندتر هەبێ بۆ ئەو ڕۆژەی مرۆڤایەتی بێنیاز دەبێ لە تۆخمی پارە نەک هەر سەرمایە و تیجارەت و بنگەی مالییەکان کە دەزانم پارەی مەلعوون و وەک شاعر دەڵێ:

یحرک الناس شئ عن الحیاة معری
مزخرف مستدیر علیه نقش وطغری

تبدو علیه سطور تکاد باللمس تقرا
به ضمائر بعض تباع حینا وتشری

من کە فکرم ژووررووی تێکڕای ئەو ماددەیە برد کە بنەمای فەلسەفەیەکی بەرین و بە هێز و پێزی ئەم ڕۆژگارەیە دەبێ پتر لە بیریاری ماددی ناحەزی هەموو جۆرە زاڵبوونێکی ماددە بەسەر فکر بم بەتایبەتی ئەو ماددەیەی یەکسەر و دەرلەحزە فکری پێ دەکڕدرێ و دەنرخێندرێ و دەشخنکێندرێ کە دەکاتەوە «پارە». شەرەفی ماددە لەوەدایە خزمەتی فکر بکا چونکە فکر چرای مرۆڤایەتییە، لە چرا بەولاوە چاویەتی، لە چاویش بەولاوە ناوەڕۆکیەتی.

بەلای منەوە سەرمایە و ماددە داروەکازێکی دەستی مرۆڤن لەو ڕۆژگارانەدا کە ئیشی پێیانە. ئنجا سۆشیالیزمیش وەکازێکی ڕێکتر یاخود جلکێکی جوانترە لە سەرمایەداری بۆ ماوەیەک بەدەستیەوە دەگرێ و لەبەری دەکا و هەرگیز ناشێ بیروڕای مرۆڤکرد ببێتە دین و پەکی بیروڕای بەرزتر بیەخێت بەوەدا کە دەرفەتی دەرکەوتنی لێ کوێر بکاتەوە. کەس ناتوانێ پێشبینی لەوەدا بکا ئایا زانست و تەکنیکی نوێ چ ڕێگایەکی گوزەران بۆ مرۆڤ قیرتاو دەکەن چونکە ئەو مەیدانانەی تەکنیک و زانستی نوێ دەیکوتنەوە و ئەو ئاسۆیانەی سەرەتاتکەی نەدیوی لێوە دەکەن بەوەهم و خەیاڵی بیریاری ماددی لێرە بەپێشەوەدا تێنەپەڕیوە تاکوو لە فکرە کۆنەکانی ئەوەوە یاسای ئەزەلی و ئەبەدی بۆ کۆمەڵایەتی و ئابووری بخوازێتەوە. هەموو ئەو فەلسەفانەی داوای ئەبەدییەت دەکەن دوو ڕاستی هەرە گەورەی ئەم جیهانە لەبیر دەبەنەوە:

ڕاستی یەکەم ئەوەیە کە ئەبەدیبوونی یاسا و بیروڕای سەربە مرۆڤایەتی بەو هۆشە مەحدوودە کە مرۆڤ هەیەتی و لەو ماوە کورتەی تێیدا دەژیت و لەم جیهانە نامەحدوودەدا شتێکە بەولای موستەحیلەوە، ئەگەر بەولای موستەحیلەوە شتێک هەبێ.

ڕاستی دوەم ئەوەیە کە دەچێتەوە بۆ سروشتی مرۆڤ چەندین لکی لێ دەبێتەوە: لکێکیان ئەوەیە کە ئەبەدینەبوونی هەزاران بیروڕا و نەزەریەی لێرە بە پێشەوە هەزار و یەک گومان دەهاوێتە ئەبەدیبوونی بیروڕای ئەمڕۆکە و دواڕۆژیش،

لەمەشدا موجامەلە لەگەڵ ماددیی تەقلیدی دەکەم کە دایدەنێم بە بیروڕای ئەمڕۆکە چونکە هی سەدە و نیوێک پێش ئەمڕۆیە.

لکێکی دیکەی ئەوەیە کە چەندین بیروڕای جوداجودا هەموویان داوای ئەبەدیبوون دەکەن لە زیمندا ئەبەدیبوونی یەکدی هەڵدەوەشێننەوە چونکە لە هەزاری یەکێکی ڕاست بێ 999 فکرەکەی دیکە بەدرۆ دەخاتەوە [ڕەنگە هیچیشیان ڕاست نەبن]. لکێکی دیکەی ئەوەیە کە کۆمەڵایەتی وەک کیمیا و فیزیا نییە یاساکانی هەتا هەتایێ نەگۆڕێن، ئنجا چۆن دەشێ دەستوورەکانی کۆمەڵایەتی ساڵی 1975 بۆ ماوەی هەزار ساڵ دواتر هەر ڕاست بن، تۆ لەوە هەر گەڕێ کە دوای پەنجا هەزار ساڵ چۆن و چی دەبێ...

لێرەدا دیمەنێکی سەیر دێتە بەرچاوی سەرنجدەرەوە: بیرياری ماددیی تەقلیدی لە مەسەلەی گۆڕانی کۆمەڵایەتیدا بێ ئەوەی پێوەی دیار بێ کە هەست بە خۆی دەکا دوو جاران دژی دوو ڕاستی هەرە گەورە هەڵدەچەقێ: جارێکیان کە دێ لەگەڵ دانهێنان بە گۆڕان و بەرەوپێشچوونی مرۆڤدا داوامان لێ دەکا بسەلمێنین گۆیا دەستوورەکانی ئەو دۆزیویەتەوە بۆ بەرەوپێشچوون دەستووری ئەبەدین و شەقامەڕێی ئەوپەڕی گۆڕانن. ئەمەش خۆی لە خۆیدا دژی گۆڕان و بەرەوپێشچوونی بەردەوامە چونکە کۆمەڵایەتیمان لێ دەکاتەوە بە کیمیا و فیزیا کە دەستوورەکانیان ئەبەدین. دژی ڕاگەیاندنەکانی خۆشیەتی لەوەدا کە گۆڕان بە شتێکی ئەزەلی و ئەبەدی دادەنێ بەڵام دەستوورە قاڵببەستوەکانی خۆیشی بە ئەبەدی لە قەڵەم دەدا. ئنجا خۆیشی دەکاتە مامۆستای زانا و فەیلەسووف و ڕابەری دوارۆژ بە هۆی ئەبەدیبوونی نەزەریەکەیەوە کە ئیتر هەموو مامۆستایەکی دوارۆژ هەر قوتابی دەبێ و هەموو بلیمەت و زانا و هونەرکارێکیش کاوێژکەرەوەی بەرماوەی فکری ئەو. عەجایب! هەر لە ئێستاکەوە خەڵق ڕازی نییە بە مامۆستایی ئەو کەچی هەر خۆی خۆی تەعین کردوە بە مامۆستای قالوبەلا...

جاری دوەمیشیان لەوەدا کە دێ بەشێکی گرنگی خاسیەتە بەردەوامەکانی مرۆڤ دەباتەوە بۆ عامیلە نابەردەوامەکەی جۆری گوزەران وەک ئەوەی مرۆڤ بەتەواوی ئاوێنەیەکی بێ ئیرادە و بێ خوایشتی دەروونی و بێ ڕقبوونەوە و بێ خۆشویستن

و ترس و تەما و ئومێدی تایبەتی و... و... بێ کە هەر دەبێ تیشکی ئەو هاندەرە ماددییە یەکسەرانە بداتەوە کە دەوریان لە لەشی داوە.

هەڵبەت ئەم بۆچوونە نە ڕاستە و نە ئەگەر ڕاستیش بێ مرۆڤ کەڵکی پێوە دەمێنێ: کە دەڵێم ڕاست نییە ئەوەندە بەسەر بۆ بەڵگەی قسەکەم کە دەبینین مسڵمان و گاور و هیندۆس بۆ ماوەی هەزار ساڵ لە یەک دەوروبەردا دەژین و نابنە «یەک - دین» تەنانەت ژنیش لەیەکدی ناهێنن، ڕەنگە دەسکوژی یەکدیش نەخۆن، جا ئەگەر ئاوێنە بێ چۆن یەک دەوروبەر لە سێ ئاوێنەدا سێ شکلی جودای دەبێ. کە دەشڵێم «مرۆڤ کەڵکی پێوە نامێنێ» لەوەوەیە کە بەردەوامبوونی خاسیەتی بنجییەکانی وەک بەزەیی و وەفا و هەستی کەرامەت و... و... چەندین خاسیەتی دیکەی پەسەندی مرۆڤایەتی هۆی بەرەوپێشچوون و کامەرانی و لەزەتی ژیانن هەر خۆشیان پارسەنگی خاسیەتە بەردەوامە ناپەسەندەکان دەدەنەوە لە موعادەلەی بەیەکەوە ژیاندا وەک حەسوودی و خۆپەرستی و بەدایەتی و... و... بێگومان ئەگەر مرۆڤ عەبدی زەلیلی بێ ئیرادەی گوزەرانی ڕۆژانە بوایە هەر لە بنەڕەتدا کۆمەڵایەتی پەیدا نەدەبوو، چونکە ئەگەر تەنها لە کولانەی سوودی شەخسی و گوزەرانەوە چەشمەندازی بەسەر ئەم جیهانەدا کردبایەوە و چ تیشکی لە بەرژەوەندی غەیر و پێکەوە ژیان و هاریکارییەوە تێکەڵ بە تیشکی ئەم کولانەیە نەکردایە لەوانە بوو هەموو نرخە مەعنەوییەکانی لە مامڵەتی نێو دیناردا پێشێل بکا، خۆ ئەوەی ڕاستی بێ نرخی مەعنەوەی هەر پەیدا نەدەبوو، ئەوساش نەدەبوو کەس جیرانەتی کەس بکا لە ترسی خیانەت.

بەڵێ دەزانم مرۆڤ لەوانەیە بە تەماعێکی زۆر - وەیا هی کەم - وەیا لەبەر ترس خیانەت بکا وەیا مەیلی بە هێزی بۆ لای ناڕەوای ببا، بەڵام بەستنی کۆمەڵایەتی و سوود و بەرژەوەندی گشتی لەسەر ئەم خەسڵەتە بێزۆکانە ڕووی نەداوە. کڕینی خەڵق وەها ئاسان و هەرزان نییە کە ببێتە مامڵەتی کۆڵانان وەک وڵاغ و مەڕ و ماڵات دەکڕدرێن. هەر ئەم نائاسانی و ناهەرزانییەیە ڕێ نادا داگیرکەر بەشی زۆر خەڵق بکڕێ چونکە بێگومان مەسرەفی کڕینەکە لەو سوودە زیاتر دەبێ کە داگیرکەر بەتەمایەتی. باسی خەڵق کڕینم کرد بە نیازی هێنانەوەی نموونەی هەمەجۆر و بەو مانایەی کە کڕین و فرۆشتن یەک مامڵەتن ئنجا ئەوەی خۆی

دەفرۆشێتە کڕیار بەرژەوەند و سوودی شەخسی هەرە گڵاوی هەڵبژاردوە کڕیارەکەش پاکترین نوختەی شەرافەتی گڵاو کردوە.

بیریاری ماددیی تەقلیدی کە دێت و تێمان دەگەیەنێ دەستوورەکانی ئەو بۆ گوزەران و پێشکەوتنی مرۆڤ لە واقیع و مێژوویان هەڵدێنجێت بە هۆی نەهێشتنی تەناقوز لە نێوان خەڵقدا ژیانێکی تەبا و ڕەبا و بێهەرا پێک دەهێنێ. ئاگادارە کە ئەم قسەیە بەزاهیر چاری «تناقض»ی کرد و لەناوی برد بەو پێیە دەبێ بەرەوپێشچوون ڕاوەستێ چونکە بەلای ئەوەوە تەناقوز بزوێنەری کۆمەڵایەتییە. بۆ چارەسەرکردنی ئەم تەگەرەیە بیریاری ماددی سەرلەنوێ موژدەیەکی خۆشکەڵەمان دەداتێ کە دێت و دەڵێت دوای نەهێشتنی تەناقوز لە کۆمەڵدا تێکڕای مرۆڤ بە شێوەیەکی برایانە خەریکی سەر نەرم کردنی سروشت دەبن بۆ سوودی کۆمەڵ. واتە ئەوسا تەناقوزی نێوان مرۆڤ و سروشت دەمێنێتەوە بە بزوێنەری کۆمەڵ لە شێوەیەکی تازەدا. بەلای بیریاری ماددیی تەقلیدییەوە کۆمیونیزم چاری تەناقوزی کۆمەڵایەتی دەکا و سەرلەبەری چالاکیەکانی کۆمەڵایەتی ڕووبەڕووی سروشت دەکا. لێرەدا نامەوێ دەمەتەقە لەسەر ئەوە هەڵبستێنم ئایا ڕاستە زاڵبوونی مرۆڤ بەسەر گرفتەکانی سروشتدا وەک زاڵبوونی فەلاحە بەسەر مڵکداردا لە ڕووی تەناقوزەوە؟ باران و ئەرز، کە دوو کەرستەی هەرە بنجیی فەلاحەتی کۆنینە بوون، هیچیان بەرهەڵستییان لە مرۆڤ نەدەکرد، بە پێچەوانە بارانەکە لە پیاوەتی خۆی بێ ئەرک و مەسرف دادەبەزی بۆ سەر ئەو ئەرزەی خۆی گامەڵاس دابوو بۆ بەر نووکی گاسن و پێمەرە. بەهەمەحاڵ قسەم لەم مەیدانەدا زۆرن، من لێیان هەڵدێم بۆ سەر چەقی ئەو قسانەی خەریکیان بووین.

ئەو گەشبینیەی بابای ماتریالیست لە بەلاوەنانی تەناقوزی کۆمەڵایەتی و دەستەویەخەبوونی تەناقوز لەگەڵ سروشتدا هێندەی حیکایەتە کۆنینەکانی بەرئاگردانی زستانان سافیلکە و خۆشباوەڕە، وەک بڵێی نەختێکیشی لە سەرگورشتەی تەورات دەکا کە دەڵێ بە شەش ڕۆژان دنیا ساز درا و ڕۆژی حەفتەم (شەمۆ) دۆشەکی حەسانەوەی لێ ڕایەخرا. ماڵی دەوڵەتە کۆمیونیستەکان ئاوا بێ، قسەی درێژیان بۆ کورت کردووینەوە بەو هەزار بەڵگەی ناکۆکیی

ناوخۆیان هەر لە دامەزرانی یەکەم دەوڵەتی کۆمیونیستەوە ئەو بۆچوونە سەراوییەیان بۆ ڕەش کردووینەوە.

من لە کوێوە دەتوانم بەڵگەی بەهێز بێنمەوە بۆ عەمەلینەبوونی ئەو فکرە گەشبینە بگاتە بەڵگەی ڕێک نەکەوتنی دەوڵەت و حیزبە شیووعییەکان چونکە کە ئەوان لە وڵاتی دوورەوە لەگەڵ یەکدی لەسەر بیروباوەڕ بەشەر بێن بەر لەوەی جوداوازیی بەرژەوەند چ ئومێدێکم هەبێ بە برایەتی ئەو شیووعیانەی کە لە یەک قاپدا لوقمە ساز دەدەن. ئەگەر ترسی سەرووتر ئەو لوقمە خۆرانە نەوەستێنێ کەی بە ڕەواندنەوەی تەناقوزی سەر کاغەز لە یەکدی ڕادەوەستن... کورسیی سەرۆکایەتی و کیژی نازدار و باڵەخانە و کۆندیشن و گەڕۆکی شەنگ و هەزاران نیعمەتی زلی ماددی و مەعنەوی و سەدان نوختەی حەسادەت و تۆران وەک ئەوەی سفیتلانای ستالینی گەیاندە باوەشی ئیستیعمار- ئنجا هەرچی جودایی بۆچوون و بیروڕا هەیە لەوانەیە کۆمیونیستان بەشەڕ بهێنێ.

زۆر ئاشکرایە، مرۆڤ هەروەک بوونەوەرێکی ماددی - مەعنەوەی زۆر لایەنی یەکجار تێکهەڵکێش و گرێیاوی و ئاڵۆزکاوە، دابینبوونی حەز و خوایشتەکانیشی یەکجار زەحمەتترە لەوەی نەزەریەی ماددی لە ڕێی سادە کردنی تصوراتی خۆیەوە بە ئاسانی دادەنێ. چارەسەرکردنی هۆی گوزەران کە کارێکی زێدە گرنگە بەشێک لە گرێکانی کۆمەڵایەتی دەکاتەوە ئەویش بە مەرجێک کە ئەوپەڕی داد و ڕاستی لە دابەش کردنی داهات بەسەر خەڵقدا لەکار هاتبێ، داهاتەکەش خەڵق تێر بکات و هەموو کەرستەی خۆش گوزەرانی سەردەم بگەیەنێتە زوربەی خەڵق، ئەوساش ئەگەر مرۆڤ نەگەییشتبێتە پلەیەک لە هەستی کۆمەڵایەتیی بەرز کە تێیدا بە بەشی خۆی ڕازی دەبێ چارەسەر کردنەکە ناتوانێ ناکۆکیی نێوان خەڵق بەرتەرەف بکا چونکە لەوانەیە خەڵق بە بەشی خۆی ڕازی نەبێ و بە دوو قسەی هاندەر داوای شتی لە توانا بەدەر بکا بەتایبەتی کە خەڵقەکە یەکسەر لە حکومەتەوە بژی و نوا و پۆشاک و پێویستی گوزەران وەرگرن نەک بە مامڵەتی شەخسی و چالاکیی تاک. لەوە هەر بگەڕێ کە هەزار هۆی غەیری گوزەران، کە تەنانەت ماددیش نییە و زەرەربەخش و سوودبەخشیش نییە بۆ کەس، خەڵق لێکدی دڕدۆنگ دەکا [دیتوومە لەسەر تف لە ئاگر دەمەقاڵێ بوە].

کە سەرنج بگری دەبینی ئاژەڵ بەو هەموو سافیلکەیی خۆیەوە، جگە لە ئالیک و زایەند، لەسەر هیچەش بەشەڕ دێ، چ جایی ئادەمی بە خۆی و بەو هەموو لایەنە ماددی و نامادیيانەی نەفس و کۆمەڵایەتیشیەوە. بێگومان چارەسەر کردنی گوزەرانی ئامانجێکی زلی مرۆڤە بەڵام ناشێ بگوترێ بە دابین کردنی گوزەران نەفس و حەزەکانی مرۆڤ فش دەبنەوە وەیا هەتاهەتایێ پێداویستە ماددییەکانی کە ئێستا گرنگن هەر بە گرنگی دەمێننەوە و دەبنە بنەمای بیرکردنەوە لە چارەسەرکردنی تەناقوزی نێوان خەڵق. ئنجا تێبینییەکی هەرە بنجی دەمێنێتەوە لە ئاست ئەو کەسانەی بەسەر گوزەرانی خەڵقەوە دەبنە میر و گزیر و چاوسوورکەرەوە: خۆ ئەوان کەسانە لە ماڵ و میراتی باب و باپیران مەردم تێر ناکەن تاکوو لێیان ببنەوە بە خوا و پێغەمبەر، هەرچی تێربوون و حەسانەوەیەکی هەیە بە ئارەقەی ناوچەوانی زەحمەتکێش و پسپۆڕ و ئەندازیار و زانا و... و... ئەو تەرزە خزمەت گوزارانەوە پەیدا دەبێ کەچی بابای بیریار لێیان دەبێتە مامۆتک و دەڵێ: هونەر هونەری خۆمە و دەست بەسەر هەموویان و ئەرک و بەهرە و بەرهەمیان دادەگرێ و مافی «رازق» یان لێ بەکار دەهێنێ، هەر تێشکان و دۆڕاندن و بەفیرۆ چوونێک و نەهاتنە دییەکیش هەبێ کە لە تەتبیقی نەخشەکانی ئەوەوە پەیدا ببن لە یەخەی ئەوان دەپێچێت، وەک تەوقی لەعنەت، وەیا باران و با و تەرزەی تێدا دەکاتە بەرپرس.

ئەم قسانەم تەنها لایەنی ئیجابیی هۆشی مرۆڤ تێدەخوێنێتەوە، ئەو هۆشەی کە لە ڕێی بیر کردنەوەی ماددی تایبەتییەوە بۆ ئەوە چوە کە تەناقوز و جودایی بەرژەوەند بنەمای ناکۆکیی کۆمەڵایەتییە، خۆ ئەگەر بەشێکی ئەو بۆچوونەش ساختە بێ دیسانەوە حیسابی چاوساغی لەگەڵدا دەکرێ تا ئەو دەمەی کە قسەکانی خۆی لێ دەبێتەوە باوەڕ بە خۆی هەڵدەخەڵەتێ، ئەوسا لەوەدا هۆشتاریکە. هەرچۆنێک بێ، بێ تێخوێندنەوەی ئیحتمالی ساختەگەری، بەو بیریارە ماددییە تەقلیدییە دەڵێم و دەڵێمەوە چارەسەر کردنی ناکۆکی و تەناقوز و جوداوازیی حەز و ئارەزۆ لەوە زەحمەتترە کە بیر کردنەوەی ماددی بۆی دەچی هەرچەند لایەنی سەلبیی هۆش لەوەدا جارێ دەوریشی نەبووبێ: تۆ سەیری، هەتا ئیختراعێک دادەهێنرێ چەند تەجرەبەی تێدا فشەڵۆک دەبێ خۆ لەوەدا هەرچی لایەنی ڕوونی

هۆشە تەنها ئەو بەشدار بوە لە کارەکە ئنجا حاڵوباری کۆمەڵایەتی کە ئیرادەی ژین و هۆشی لەگەڵدایە و جۆرەها جۆرەهای تەناقوزی مرۆڤکردی تێدا دەزێتەوە کە هیچی لە سروشتدا وێنەشی نییە ئایا ئەو حاڵوبارە کۆمەڵایەتییە لەچاو مەڵبەندی اختراع و دۆزینەوەی سروشتی دەبێ چۆن بێ؟

ئێستا دەورە سەلبیەکەی هۆش بە جۆرێک ڕووبەڕووی فکری ماددیم دەکا کە تا ئێستا لێی نەدواوم. ڕووبەڕووبوونەکەش گەلێک بەئەرکترە بۆ فکری ماددی لەو ئەرکەی پێشتر «دوانەتی»ی سەلبییەت خستییە بەر فکری ماددی لەچاو ئەرکی لایەنی ئیجابیی هۆش.

دەوری سەلبیی هۆش وەک پێشتر گوتوومە بە چەندین جۆر ڕێ لە پێشکەوتن و خێر و خۆشی دەبڕێتەوە، بگرە مرۆڤیش بەرەو دوا دەگێڕێتەوە. ئەم ڕێ لێ بڕینەوەیە و بەرەوپاش گێڕانەوەیە «تناقض»ی ڕاست و بێ فێڵن چونکە لایەنە سەلبییەکە لایەنە ئیجابیەکە هەڵدەوەشێنێتەوە کە دەکاتەوە تەناقوز نەک جوداوازی و نەگونجان. ئنجا بەزاهیر بیر کردنەوەی ماددی کە خۆی بە تەناقوزەوە بەند کردوە دەرفەتی دەبێ خۆی لە مەسەلەکە هەڵقوتێنێ و بڵێ: ئەدی نەمگوت تەناقوز چەرخ و مەنگەنەی جیهانە؟ بەڵام ئەرکە زلەکەی فکری ماددی کە تازە باسم کرد لەوەدایە کە ئەم تەناقوزەی لایەنی سەلبیی هۆش لەگەڵ لایەنە ئیجابیەکەی نابێتە ئەو پێپلکانەیەی کە بەلای فکری ماددییەوە کۆمەڵایەتی بەرەوپێش دەبا.

لێرە بەپێشەوە گوتم، وەیا گوتوومە، تاریکایی سەلبییەتی هۆش هەرگیز خۆی لە خۆیدا ڕاست ناکرێتەوە وەک کە هەڵەی حیساب بە پێداهاتنەوە هەر بە پێی داخوازی دەستوورەکانی حیساب ڕاست دەکرێتەوە، ئەوساش کە ئەمەم گوت و باسی ڕاستییەکی موتلەقی بەدی دەکرد، تەنها لەگەڵ دوو دەستوورەکەی «گۆڕانی چەند بۆ چۆن» و «نفي النفي» نەختێک ڕووبەڕوو بوونەوە، چی ئێستا لێرەدا دەیڵێم حەقیقەتێکە لەگەڵ فکرەی «تناقض»دا تێک هەڵدەئەنگوون و دژ دەوەستن چونکە سەلبییەتەکە وەک من دەیبینم تەناقوزی ناو فەلسەفەی ماددی لە ئاست خۆیدا بەتەواوی پەک دەیەخێت و بەرەو دوای دەکاتەوە:

ئەم تەناقوزەی دەوری سەلبیی هۆش کە ئیجابیەتەکە دەکوژێ هیچ سیفەتی «بزوێنەرایەتی» تێدا نییە تاکوو هیچ شتێک بەرەو ئەو لایەنە ببزێوێ کە فەلسەفەی ماددی بە تەمایەتی لە تەناقوزەوە پەیدا بێ، بە پێچەوانە تەناقوزەکەی سەلبییەتی هۆش لە مەیدانی خۆیدا هەموو بزووتنەوەیەک و ڕووناکییەک دەکوژێ، واتە لە عەینی پێک کەوتنەوەی سەلبییەتەکە لەگەڵ دەوروبەرەکەیدا هیچ لەرزە و چەخماخە و جۆش پەیدا نابێ بزووتنەوە و تیشک پەیدا بکا بەڵکوو مردن و وەستان و تاریکی دەزێتەوە مەگەر لە دەرەوەی مەیدانی ئەو سەلبییەتەوە تیشک بێت و تاریکیەکە و مەرگەکەی پێ بڕەوێتەوە. بە نموونە کە گوترا شێخی فلانە شوێن جلەوی ڕۆژ رادەکێشێ هیچ بنەمایەکی ماددی ڕوون و ڕاست لەو قسەیەدا نییە بمانباتەوە بۆ فەلەکناسی. بۆیەیە هەتا قافی قیامەت قسەی ئەوتۆیی لە تاریکایی خۆیدا جینگڵ دەخوا و تاریکی زیاد دەکا. ئەوپەڕی تەعدیلی تێدا بکرێ ئەوەیە ئەگەر گوترا شێخەکە لە 25 سەعاتدا دەورەیەک بە ڕۆژ دەکات دەشێ 25 سەعاتەکە بکرێتە 24 سەعات کە ئەمەش تەعدیلێکە بە هۆیەکی دەرەوەی تاریکییەکە پێک هات.

ڕەنگە بگوترێ مردنیش هەمان جۆر دژی ژینە و چ بزووتن و ڕووناکی لێ ناکەوێتەوە و بریتییە لە کوشتنێکی موتلەق: لە ئاست ئەم تێبینیەدا کە لە جیاتی خوێنەر ڕووبەڕووی خۆمی دەکەم چەند ڕوون کردنەوە هەیە:

1- مردن ڕووداوێکی سروشتییە دەخلی بەسەر سەلبییەتەوە نییە.

2- لە سروشتدا ڕوەکساڵەوساڵ لە عەینی هەناوی خۆیدا تۆوی نوێ بە زەویدا بڵاو دەکاتەوە و زیندوەتی نوێی لێ دەکەوێتەوە.

3- زیندەوەرەکانیش بەر لە مردنیان دەتوانن ژیان بەردەوام بکەن بە هۆی ئەوە وەچانەی لە دوایان دەمێنێتەوە.

4- مردن بریتییە لە بەسەرچوونی ژیان نەک حاڵەتێکە وجوودی سەربەخۆی هەبێ و لەلاوە یەخەگیری بوونەوەری زیندوو ببێ، ناشبێ لێرەدا مردنی بە گوللە وەیا خنکان وەیا هەڵدێران و نەخۆشی تێکەڵ بە حیسابەکە بکرێ چونکە ئەم هۆیانە لە دەرەوەی عەمەلیەتی «بەسەرچوونی ژیان»ەوە دێن و ڕەوتی سروشت دەوەستێنن، هەروەک کە زیندووێک بگاتە پلەی مردن و بە دەرمان

درێژە بە ژیانی بدرێ، ئەوەندە درێژبوونەوەیە هونەری یاساکانی بایۆلۆجی نییە کە زیندوەکەیان گەیاندە لێوی مردن.

5- مردن کە دژی ژینە و پێوندی بە سلبییەتەوە نییە، لە ئاست دوو یاساکەی «گۆڕانی چەند بۆ چوون» و «نفي النفي» بە گژ بیری ماددیدا دێتەوە چونکە نە نوختەی تەنگەتاوی تێدایە گۆڕان پێک بهێنێ و نە خۆیشی نەفی دەکاتەوە بەرەو ژیان. هەتا مردن سواری مردن بکەیت [کە ناکرێ سواری یەکدی ببن] هەر مردنە و بەس.

بەهەمەحاڵ هەر نموونەیەکی هەبێ لە بابەتی سەلبییەتی هۆش کە نەزۆکی موتلەقە، ئەویش بێگومان بەر ئەو تەناقوزە ناکەوێ کە بیریاری ماددی مرخی لێ خۆش کردوە، گەلێک شێوەی جوداجودای دیکەش هەنە کە هەموویان خراونەتە ژێر یەک سەرەناوی «تناقض» لە حەقیقەتدا ناچنە بەر یەک حوکم و تەفسیریشیان لە گۆڕانی کۆمەڵایەتی و لە سروشتیشدا یەک جۆر نییە، هەندێکیشیان لە بنەڕەتدا تەناقوزیان تێدا نییە بە زۆرەملێ لە ڕێی زاراوەی «وحدة الاضداد»دا چەتری تەناقوزیان بەسەردا هەڵدراوە. بەداخەوە ناتوانم لێرەدا خۆمیان بۆ باسەکە بدزمەوە وەک دەشزانیت باسەکە بە ئەسڵ لاباسە و لە بابەتێکی دیکەوە جودا بۆتەوە.

لەم پێداچوونەوەیەی بە پەلە بە هەندێ قەناعەتەکانی بیری ماددی لە مەیدانی «تناقض»دا دیتمان جارێکیان بیریاری ماددی واتای تەناقوز لێک دەکێشێتەوە تاکوو باوەش بە جوداوازیشدا دەگرێ، جارێکی دیکەش جۆرێک تەناقوزمان دۆزیەوە لە سەلبییەتی هۆش پێچەوانەی ئەو تەناقوزەیە کە فکری ماددی بە ماکی «تطور»ی دادەنێ. ئەم مەیدانەش هێندە بەرینە زەحمەتە لێی تێپەڕین، لەبەر ئەمە چی دیکە بەدوای ناکەوم خوێنەریش لە لای خۆیەوە دەتوانێ هەر جارەی ناوی تەناقوز لە «تطور»دا هات لە مەسەلەکە ورد بێتەوە ئایا تەناقوزی ڕاستینەیە یا نەگونجان و جوداوازییە، کە ڕاستینەش بوو یاریدەی بەرەوپێشچوون دەدا یاخود دەیوەستێنێ یا دەیکوژێ.

بەڵام دەبێ پەنجە بۆ شتێک ڕابکێشم لە مەسەلەی تاریکایی لایەنی سەلبیی هۆش دژی ڕووناکیی حەقیقەت لەوەدا کە گوتم لە هیچ ڕوویێکەوە و هەرگیزاو هەرگیز

ناکێشێتەوە سەر بەرەوپێشچوون. ئا لێرەدا پێویستە بڵێم هەرچەند ئەمانەی گوتم وەک بەدیهیەن، هەرنەبێ بەلای خۆمەوە، لەگەڵ ئەمەشدا جۆرێک نرخاندن و بەیەکدی گرتن هەیە لە دەوری جغزی کۆمەڵایەتی و مرۆڤایەتی پەسەندەوە لەوێدا سەلبییەتەکە شێوەیەکی بەرەوپێشچوون وەردەگرێ ئەویش کە بێین پەیدابوونی ئەفسانە لای مرۆڤ و نەبوونی لای جانەوەران بەراورد بکەین دەبینین هەرچەند ئەفسانە گومڕاییش بێ دیسانەوە لەچاو نەبوونی لێکدانەوەی بەرەو ئەفسانە لای جانەوەران دەبێتەوە نیشانەی بەرەوپێشچوون، بەڵام نابێ لە دیاردەکە بەسەهوو بچین و نرخی بۆ بخوازینەوە: لایەنی سەلبیی هۆش لە هەموو مەیدانەکانەنی مرۆڤایەتیدا ڕووخێنەر و لەمپەرە، ئەویش وەکوو کردەوە بەدەکانی مرۆڤ و لایەنە ناپەسەندەکانی کۆمەڵایەتی لەو ڕووەوە بە دیاردەیەکی بەرەوپێش دەژمێردرێ کە بەندە بە مرۆڤەوە و تایبەتی مرۆڤایەتییە و لە پلەی مرۆڤایەتیدا پەیدا دەبێ. بە نموونە، خەسڵەتی درۆزنی خەسڵەتێکی بەدە بەڵام ئاژەڵ ناتوانێ درۆزن بێ چونکە نازانێ بدوێ. بەلای منەوە ناپەسەندایەتی بەوەدا شەرەف پەیدا ناکا کە لە مرۆڤەوە سەر دەکا هەر وەکوو دەرد و نەخۆشیەکانی تایبەت بە مرۆڤ، ئەوانیش هەر مەلعوون و بەدن. دەتوانین لێرەدا قسەمان نەختێک دابڕێ و بڵێین سەرلەبەری چالاکیی هۆش و هەموو خاسیەتەکانی دیکەی مرۆڤ بە چاک و بەدیەوە، بە سەلبی و ئیجابییەوە، لە سەرووی پلەی گیانلەبەراندایە لەو ڕووەوە دەتوانین پێیان بڵێین دیارەی ناپەسەندی بەرەوپێش بوویەوە.

لێکدانەوە لە مەیدانی کۆمەڵایەتیدا کە یەکسەر پێوەندی بە چاکە و سوود و خراپە و شکست و نوشوستی مرۆڤەوە هەیە دەبێ بەوپەڕی خۆ لەبیر کردنەوە بکرێ بۆ ئەوەی حیسابی لاوەکی وەک خاترانە و خۆشویستن و دزاندن و شەرم و سوودی شەخسی و ئەو تەرزە تێوەرێخانە دەوریان نەبێ لە هەڵنانی ئەو مەعادەلە کۆمەڵایەتییانەی کە پرۆژەی کامەرانی و بەختیاری و پێشکەوتنیان لەسەر هەڵدەستێ و بێگومان هەموو ئەو درۆیە خۆشکەلانەی کە مەبەستی تایبەتی دەیانهاوێتە ناو دەقی فکری و فەلسەفە و باوەڕ وەیا ڕووداوی مێژوو، دەبنەوە بە کۆت و زنجیر لە دەست و پێ و گەردەنی ئاپۆرەی میللەت دەئاڵێ هەرچەندە درۆکەش بەنیازی سوودی میللەت هەڵبەسترابێ. زێدە بەدایەتیی درۆی سەربە

فەلسەفە و فکر و سەربە باوەڕیش لەوەدایە کە بە زۆری شەقامەڕێی ناوەندی کۆمەڵایەتی کە دەکاتە جەمبوورەی بەرهەمهێن و زەحمەتکێش و خزمەتگوزار گێرۆدەی ئەو درۆیانە دەبێ، مرۆڤی دنیاخواز و فێڵبازی سیاسەت و ئایین و ئابووری و بابای ستەمکار و داگیرکەر هێندە دەربەستی ڕاست و درۆیان نییە پەکی ئاشی خۆی لەسەر باراشی خاوێن بخات.

گوتەی «لە کوێ پسا لەوێی گرێ دەداتەوە» لەلایەن ئاپۆرەی میللەتەوە لە شتی خوێریلەی کەمبایەخ بەڕاست دەگەڕێ، هەرچی ساختەگەری کاری گەورەیە بە وەستای پسپۆڕ و مەعلان و شەیتان نەبێ هەڵنابەسترێ. درۆ هەڵبەستن لە فەلسەفە وەیا لە ڕووداوی مێژوویی وەیا لە هەر بارێکی گرنگی سەربە کۆمەڵایەتیدا بێ، یا بە نیازی چاکەی مرۆڤیش بێ، وەک ئەوەیە خزم و کەسی نەخۆش لەبەر پەرۆش بۆ نەخۆشەکە درۆ لەگەڵ دکتۆردا بکا و ڕاستی حاڵەتی نەخۆشەکەی لێ بشارێتەوە. لە نوختە نیگای سوودی مرۆڤیشەوە فەرق نییە لەوەدا ئایا هەڵەی فکر و فەلسەفە بە درۆی ئانقەست بوە یا لەبەر کەمزانی و بەسەهوو چوون و تێنەگەیشتن چونکە لە هەردوو باردا کەموکووڕی و هەڵەی فکرە کە سەر دەکێشێتەوە بۆ بیر کردنەوە لەو تەرزە چارەسەر کردنەی کە نەخۆشیە درۆزنەکە داوای دەکا. بەڵام لەلایەن ئاکار و بەرپرسیارییەوە دیارە ئەو دوکتۆر و فەیلەسووفەی کە بە ئانقەست خۆی بەسەهوو دەبا تاوانبارترە لەو دکتۆر و فەیلەسووفەی بەسەهوو دەچێ چونکە درۆزنی زۆرزانی ئانقەست هەروەک عوزری بەدەستەوە نییە لە درۆکەدا دوژمناتیشی تێڕا دیارە، ئنجا ئومێدیشی لێ ناکرێ بەرەو پەسەندی بچێتەوە وەک کە پیاوی سەهوو کردوو هەمیشە لێی دەوەشێتەوە لە سەهووی بگەڕێتەوە.

ئێمە هەرچەند ناتوانین فەیلەسووف و بیریار و مێژووناس و کۆمەڵناس بهاوێینە سەر ڕێبازی ڕاستگۆیی و دڵسۆزی ئەگەر خۆیان ڕێبازەکە نەگرنە بەر، بەڵام دەتوانین و لەسەریشمانە، بە دوا فەرمانە ناتەواوەکانیان نەکەوین و بەرزەپێ لەبەریان هەڵنەستین، خۆت دەزانی بیریاری ماددی بەوپەڕی بێباکی و سادەییەوە داوا لە هەموو جیهان دەکا واز لە هەرچی بیروباوەڕی پێش هەیە بهێنن و ئەو ڕێبازە بگرنە بەر کە خۆی بۆیانی ڕەنگرێژ دەکا، جا کە ئەو وەهامان پێ بوێرێ و

تەمامان تێبکا بۆچی نەوێرین لە جغزی بیروڕای خۆماندا بۆچوونەکەی ئەو ڕەت بکەینەوە کە لەگەڵ لێکدانەوەی ژیر و بێمەبەست و ئازاددا ڕێک نەکەوێ و بەپێی بەرژەوەندی ڕاستینەش دروست دەرنەچێ. خۆ ئەگەر ڕەخنە و ڕازینەبوونێکی لە دەرەوەی ماددییەتی تەقلیدییەوە تێی بگیرێ گومانی ناحەزایەتی و دوشمنایەتی لێ بکرێ ناشێ ڕەخنەی حیزبە ماددییە مارکسیستە کۆمیونیستەکانیش کە دێن هەڵە و نالەباری و ناتەواویی فەلسەفەکە دەڵێنەوە و فکری تازەتری لە جێگەدا دەکەن بە پرۆژە ناشێ ڕەخنەی ئەوانیش هەر بە کەفوکوڵی دوشمنایەتی و هەستی چینایەتی و خزمەتی ئیمپێریالیزم حیساب بکرێ.

ئەمە دەڵێم بۆ پتر ڕوون کردنەوەی بێسەروبەریی ئەو تەرزە توهمانەی بیری ماددی لەو ڕەخنەیەی دەگرێ کە بیری ناماددی ناکۆمیونیست بەڕوویدا دەداتەوە چونکە بەعادەت هەرچی ڕەخنەی هەبێ دژی ئەو فکرە لە دەرەوەی ئاڵقەی خۆی تاوانبار دەکرێ، دیارە ڕەخنەی ناو خغزەکەی ماددییەت پتر فرزەی ئەو جۆرە توهمانە دەبرێ، ئەو ڕۆژگارەش بەسەر چوو کە هەموو هەڵوەستە ڕاستەکانی وەک هی تیتۆ لە ساڵانی دوای شەڕی دوەمدا بە شێواندن (تحريفية) ناوی بزڕێ. چەند سەیر بوو ئەو دەمەی مرۆڤی وەکوو تیتۆ و جیلاس و کامۆ لەسەر مرۆڤایەتی و شەرافەتی هەموو تاک و کۆمەڵی بەرەی چەپیان دەکردەوە دژی لادانێکی ئاشکرای درندەی کەهەنووتی «چەپایەتی» لە ساڵانی دوای شەڕدا، میلۆنەها میلۆنەها بوتپەرستی چەپپەرستی چاوبەسترایەوەی دەروونديلی کاوێژکەرەوەش ئەو قارەمانانەیان ڕیسوا دەکرد دژی ئازادی و نرخ و حورمەتی خۆیان، هێندەشی نەبرد دەرکەوت ڕیسواکراوەکان چەند دڵسۆز و ئازاد و ئازا بوون و تاوانبارەکەرەکانیشیان چەند درۆزن و خۆپەرست بوون!! جاری وەها یەک دوو دڵۆپی ئارەقەی شەرم و بەخۆدا شکانەوە دەبێتە... ئەرێ دەبێتە چی؟ بڕوا بکە نازانم ناوی لێ بنێم!!!

هەڵبەت من داوا لە مرۆڤ دەکەم، ئەوساش داوام دەکرد، بەتایبەتی لە کورد کە بایی فلسێک و سەلکە پیازێکی ڕزیو قەرزداری هیچ فەلسەفەیەکی ماددی و ناماددی ئەم جیهانە نییە، ڕەنگە قەرزی خوێشی بەسەر فەلسەفەوە هەبێ، ئەوەندە ئازاد و چاوکرایەوە بێ بوێرێ بە هەڵە بڵێ هەڵە و ڕاستیشی بکاتەوە با هەموو

دنیای ماددی و ناماددیش یەکدەنگ و یەکنەوا لەسەر هەڵە مێژووییە فکرییەکانی خۆیشی بکاتەوە.

لە تەجرەبەی بەرچاوی خۆمدا دیتوە بابای سەربە فکری ماددیی تەقلیدی هاتوە هەڵوەست و بیروڕای غەیری خۆی بەکێشانە و پێوانەی خۆی هەڵکێشاوە و بڕیاری وەهای بۆ داوە هێندەی بڵێی نادروست و بێئنساف بوە، ئنجا کە بابای تومەتێگیراو بەو کێش و تەرازوە و بەو بڕیارە ڕازی نەبوە کابرای تەقلیدی پتر لەسەر قسەکانی خۆی سوور بوە و هەڵوەستی کابرای دیکەشی بە بەڵگەی تازە بۆ خۆی لە قەڵەم داوە.

خولاسە لە بڕیارەکانیدا شەختە کردن و قاڵب بەستن و دەق گرتنێک هەبوە بە تەواوی حیکایەتی ئەو شەعبەدەبازەی دەهێنامەوە یاد کە دەهات دەست و پێی نەساغی دەبەستەوە بە نامەی ئەوەی جندۆکە دەستیان لێ وەشاندوە ئیتر بە تێڵا لێی ڕادەکێشا و دەیگوت دەی! ناوەکان بڵێ... کابرای بەستراویش زیرەی دەچوە عاسمان و چ ناوی نەدەگوتن چونکە جندۆکەی نەدەدیتن هەتا ناویان بڵێ... خۆ ئەگەر لەبەر عەزابی لێدان ناوێکی عادەتیشی گوتبایە شەعبەدەبازەکە لێی نەدەسەلماند چونکە بە پێی ئەو «تەزکەرە نفووس»انەی بۆ جندۆکەکانی دەر کردبوو دەبوو ناویان سووژن، مەشکەڕەق، دەرزی بزۆت... بێ. هەمان شکڵ کابرای کە ڕەخنەش لە بیری ماددی دەگرێ چاری ناچارە دەبێ بسەلمێنێ جندۆکەی دەرەبەگ و کۆنەپەرست و ئیستعمار چۆتە کلێشەیەوە چەندێکیش هاوار بکا و بڵێ: کاکەینێ و بابەینێ من هەموو شتێکم قوربانی گەل کردوە، ئەوەی دەشی بێژم لە فکری ئازادەوە بۆ سوودی میللەتەکەم و بەرزیی نیشتمانەکەمە، دادی نادات و لە نێوشانانی ڕادەکێشرێ و دەبێ ناوان بڵێ: شاپڵیتە... قوڵەشین... خۆفرۆش... سەلکەسیر... پاشەکشە... غەیاب... پەڵپێنە... هەتا کرمی دڵی ماددییە تەقلیدییەکە دەمرێ ئەوسا کابرای جندۆکاوی - ئیستعماراوی شایەدیەکی نابەحەق دێنێ و گوناهەکانی دەشۆرێتەوە[19].

---

[19]- نووسەرێکی موحتەرەمی کوردی سەر بەفکری ماددیی تەقلیدی لە نووسینێکی چاپ نەکراویدا کە کاتی خۆی بۆمی ناردە «کۆڕی زانیاری کورد» بە هەمان ڕێگە کوێربوەکەی تەفسیری

ئەلبێر کامۆی بەدبەخت بەچەند قسەیەکی ڕاست و دروست و مرۆڤانە ڕەخنەی هەرە بەجی و هەرە دڵسۆزانە و هەرە گیانپاکانەی لە هەندێ شتی هەرە نارەوا و هەرە نادروست و هەرە بەدی سەردەمی ستالین گرت، دەرحاڵ جندۆکە برایە کڵێشەیەوە و ناو و ناتۆرەی بەدوادا هات تاکوو لە ڕووداوێکی ئۆتۆمۆبێلدا کۆتایی بە ژیانی هات و لە دەست قسەی بێ سەروپێ و خوێڕوو ڕزگار بوو. بێگومان ئەگەر شیووعییەکانی ئەوسای فرەنسە تێگەییشتنی ئێستاکەیان هەبوایە جۆرێکی دیکە پێشوازییان لە کامۆ دەکرد چونکە ئەو بەقەدەر شیووعییەکانی ئێستای فرەنسە دەنگ دلێر نەبوو.

مرۆڤ بایی ئەوەی دژی ناتەواوی و نادروستی و ناڕاستیی فکری فەلسەفە و هەڵوەست ڕاوەستێ لایەنە سەلبییەکەی هۆشی بەزاندوە، بەڵام ئەو پرسیارە دەمێنێ لە خۆمانی بکەین: چۆن دەتوانین یا دەزانین دژی هەڵە و نادروستی و نارەوایی و ئەو جۆرە تاریکییانە ڕاوەستین بەر لەوەی تێیان بگەین؟ چۆن تێیان دەگەین؟ ئێمە کە لەبەر حوکمی لایەنە سەلبییەکەی هۆش شەوکوێر بین چۆن و لە

---

چینایەتی و سوود و زەرەری شەخسیدا بۆ ئەوە چوە گۆیا بیر کردنەوەی من لەو «خەسارەت!!»ـەوە هاتوە کە لە ساڵانی نێوان سەرەتای شۆڕشی 1958 و ساڵی 1963 دا لێم کەوتوە، دیارە مەبەستیشی ئەو ساڵانەیە کە بەرەی چەپی سەربە ماددییەتی تەقلیدی بە هۆی دۆستایەتییان لەگەڵ عبدالکەریم قاسمدا بەدەسەڵات بوو. زۆر بەسەیری من تەنها لەو دەورەیەدا بەندیخانەم نەدیتوە، ڕەنگە ڕێشم هەبێ بڵێم ئەو دۆستایەتیەی لە نێوان ساڵانی 60-61 [کە چەند مانگێکی خایاند] لەگەڵ عەبدولکەریمدا بۆم ڕێک کەوت لەگەڵ هیچ سەرۆک و زەعیمێکی کورد و عەرەب و عەجەم و فەرەنگ نەمبوە، هەر لەبەر نەگونجانی بیروباوەڕیشمان دۆستایەتیەکە هەڵوەشایەوە نەک لەبەر خاتری هیچ لایەنێک چونکە لە مێژە سەربە هیچ لایەنێک نیم. لە ڕووی بەرژەوەندیشەوە منداڵیش دەزانی مەرحەبایەکی کەریم قاسم، کە بمویستبایە سوودی لێ وەربگرم، بایی داهاتی چەند ساڵی مڵک و ماڵی میراتیمی دەکرد. ئەو نووسەرە دەبێ تەقلە بە بۆچوونەکەی لێ بدا ئنجا بەرەو حەقیقەتی هەڵوەست و بیروباوەڕی من بێتەوە. من بە هەموو عومرم لای تێشکاو بووم بەڵگەشم ئەوەیە، من لە ساڵی 1954 بەشداری یەکەم کۆبوونەوەی ئاشکرای ئاشتیخوازی بووم لەگەڵ ئەو مەترسییەی تێدا بوو بەڵام دواتر پاش شۆڕشی 1958 کە ئاشتیخوازی بوو بە سەرچاوەی خێر و بەرەکەت من لێی تەریک بووم و مەیدانەکەم بۆ سوودخوازەکان بەجێ هێشت.

کوێوە ئەو چاوە گەش و بینەرە بخوازینەوە تاریکاییەکەی پێ بڕەوێنینەوە و ڕاستییە بزر بوەکانی تێدا بدۆزینەوە؟

من کە خۆم لە شەوی تاریکی ئەنگوستەچاودا بەرەو ڕەشایی بنۆڕم دەست بۆ کام تیشک پان بکەمەوە و ڕووناکی لێ بخوازمەوە؟ ئەم پرسیارانە دەشێ بکرێن هەر نەبێ لەبەر ئەوەی کە قسەکانی من وەها دادەنێن لایەنی سەلبیە هۆش پێکهێنەرێکی هۆشەکەیە، کەواتە لێ ڕزگاربوونی مومکین نییە وەیا زۆر زەحمەتە، تێکەوتنیشی هەتا بڵێی ئاسانە ڕەنگە تێنەکەوتنی سەیر بێ. ئەوەی ڕاستی بێ، بمانەوێ و نەمانەوێ، مرۆڤ هەمیشە لە بەر تاوی تاریکایی ئەو لایەنە سەلبییەدا دەبێ هەر جارەش بە شێوەیەک و لە ناو واقیعێکی نوێ و لەبەر تیشک و سێبەرێکی ساختەدا.

من کە بزانم لایەنە ڕووناکەکەی هۆش، لەبەر زۆر مەجهوولاتی موعادەلەی کۆمەڵایەتی وەیا لەبەر کەمزانین وەیا لەبەر هێز کردن و بەهەڵە بردن وەیا لەبەر ترس وەیا... وەیا...، لەوانەیە ڕەش هەڵبگەڕێ و گومڕا بێ. دیارە هەمیشە چاوەڕوانی تێکەوتن لە قۆرتە ڕەشە تاریکەکانی لایەنی سەلبیی هۆش دەبم، لەو ڕووپەڕە تێپەڕیوانەشدا بایی ئەوەی حەقیقەتی هێندە دەست هەڵێنج ڕوون بێتەوە لە زۆر ڕووی مەسەلەکە دواوم زۆریشم خەڵق لە خۆم ڕەنجاندوە، تۆش لەلای خۆتەوە دەتوانی بە لێکدانەوە بۆ ئەو ئیحتیمالانە بڕۆی کە دەشێ هۆشی مرۆڤ تێیاندا بەرەواژ بێتەوە. بگرە لە غەریزە سادەکانەوە تا دەرسدانی هەڵە تا بیروڕای میراتی پڕ ئەفسانە تا ئاڵۆزکانی ژیان تا وەزەحمەت کەوتنی گوزەران تا تێکهەڵقژانی بێوچان لە سەرانسەری جیهان تا هەڕەشەی ستەم تا خەفەکردنی بیری ئازاد... تا... تا... هەموو هەر ڕێ خۆشکەرەوەن بۆ بەهەڵەدا چوون و کوێری و گومڕایی.

بەڵام دوو ڕوون کردنەوەم هەیە یەکێکیان هەرچەند لەو پرسیارانە هەڵدەستێ پێوەندی بە خۆمەوە هەیە: بەولای ئەو پرسیارانەوە وەها بوە ڕۆشنبیری گەنج و کامڵ لێیان پرسیوم تۆ کە ڕەخنە لەو شتە ڕەگداکوتاوانە دەگری بۆچی پێمان ناڵێی ■ ڕێگەیەک دیکە ڕاست و دروست هەیە بیگرینە بەر؟ جێگری ئەو شتانە چین؟ بە چیی چاکتریان بگۆڕینەوە؟ لە بەتاڵایی مەمانخولێنەوە!! لە ئاست ئەو تێبینییە ڕەخنەدارانەدا گوتوومە و دەڵێم مەرج نییە لەسەر ئەو کەسەی کە هەڵە لە شتێکدا دەدۆزێتەوە باری ڕاستی شتەکەش بدۆزێتەوە چونکە ڕەنگە ڕاستی شتەکە بەند بێ

بە سەرەدەری کردن لە گەلێک ماک و پێکهێنەر و پێوەندی و دەوروبەر و ئاوهەوا... و... کە لە توانای بابایەکی کەمتوانای وەک مندا نەبێ وەیا لە من بەدەسەلاتتریش نەیبێ. من دەزانم 5396821 X 2379547 ناکاتە 1500 بەڵام مەرج نییە بزانم دەکاتە چەند. بەر لە 500 ساڵ یەکێکی ڕووناکبیر کە دەیزانی پەلکەزێڕینە ئاورینگی کەزی فریشتە نییە ڕێی نەبوو هۆی ڕاستینەی دیاردەکە بزانێ. بەر لە 2500 ساڵ کە دەیانزانی زەوی خڕە نەیاندەزانی بۆچی ئاوی دەریاکان نارژێنە بۆشایی چونکە جارێ نیووتن دەستووری کێشەری نەدۆزیبۆوە ئاسماناناسیش لە پلەی سەرەتاییدا بوو. بۆ من ئەوەندە بەسە بڵێم گۆڕانی هۆی بەرهەمهێنان خالقی گۆڕانی کۆمەڵایەتی نییە و کەرستەیەکی کەمنرخە بەدەست مرۆڤەوە کە هەر خۆی دروستی کردوە و خزمەتی خۆی پێ دەکا.

ئەوەی ڕاستی بێ من لە بارێکدام و بە جۆرێک لایەنی کۆمەڵایەتی لە کردەوەدا بەرێ دەکەم لێی هەڵناستێ بچمە سەر سەکۆی ڕابەرایەتی تا مەردم بەرەو هەڵوەستی واقیعی وەیا فەلسەفییەوە هان بدەم چونکە لەوەدا بەرپرسی و چوونە بەرباری ئەخلاقی هەیە نامەوێ بچمە ژێرەوە. لەوەتەی خۆم ناسیوە بە کەسم نەگوتوە فلان ڕێگە بگرە بەر: ئەوپەڕی ڕێنمایی لە منەوە دەرکەوتبێ ئەوە بوە گوتوومە من لە جیاتی تۆ بامایە وەها و وەهام دەکرد، خۆشت خاوەن بڕیاریت. هەڵگرتنی ئۆباڵی تێوەگلانی خەڵق دڵ و دەروونێکی دەوێ زۆر باکی بە چارەنووسی خەڵق نەبێ. من لەوانە نیم. ئنجا ئەگەر من جێگری هەرە ڕاستی ئەو شتانەش بزانم کە ڕەخنەیان لێ دەگرم وەهای دەرنابڕم ببێتە هاندەر بەرەو هەڵوەستی ترسناک.

وتووێژی من لەگەڵ هۆش و گۆشی گەنجی کورد و ڕۆشنبیری کوردە بایی ئەوەی قوتابییەک لە نێوان قوتابیاندا کە هیچ دەسەڵاتی ئەمر و نەهی نییە خورپەی هەناوی خۆی پێ وەدەر بنێ. من کە کابرایەک ببینم خەریکە بە خۆ فڕێدان لە بانێکی بەرزەوە بێتە خوار هەر هێندەی پێ دەڵێم خۆ فڕێدانت مردنی لەدوایە، لەوە بەولاوە حەقی نییە لێم بپرسێ «کوانێ پەیژە و قادرمە پێی بێمە خوار؟». ئەگەر من بۆ ئەو شوێنەم ناردبایە حەقی بوو داوای پەیژەم لێ بکا. بەرپرسیار بوون لە چارەنووسی خەڵق بەولای تەحەمولەوەیە. لەگەڵ ئەمەشدا ڕوون کردنەوەی واقیع وەیا تاریکایی

ناو فەلسەفان و دەستنیشان کردنی ئەو هەڵانەی بەبەریانەوەیە، لێی دەوەشێتەوە نەختێک لە کۆسپ و لەمپەڕی سەرەڕێ تەخت بکا، خۆ ئەگەر تەختیشی نەکرد منی تێدا بەرپرس نیم. وا دەزانم بەرپرسی لەو خامۆشبوونەدایە کە بریتییە لە خەفە کردنی دەنگی ڕاستی و دروستی.

ڕوون کردنەوەی دواتر لەگەڵ تێخوێندنەوەی چی تازە گوتم دەوری پرسیارەکان دەدا:

ا- کە لایەنی سەلبیی هۆش هێندە چالاکە و هێندەش سەرچاوەی بە پیت و بەرەکەت بژێوی دەدەنێ، لایەنی ڕووناکی هۆشیش لە چالاکیدایە و بە درێژایی ڕۆژگاریش خۆی دەوڵەمەند کردوە. خۆ ئەگەر لایەنە سەلبییەکە زاوزێ نەکات و مەجهوولات هەر ئەوە بانایە کە لە دەرەوەی هۆشی مرۆڤ تاریکاییان دابایەوە لەوانە بوو بە دۆزینەوەی حەقیقەتی ئەو مەجهوولاتە لایەنە سەلبیەکە سپی هەڵگەڕابایە. مرۆڤایەتی بە هۆی دۆزینەوە زانستییەکانی مەیدانە هەمەبابەتەکانی ناوەوەی دەروون و دەرەوەی وجوودی خۆی چەندین شەیتان و مێردەزمەی ئەفسانانی کوشتوە و هەروا دەیانکوژێت.

ب- تەجرەبە مەودایەکی پتر ڕووناک دەکاتەوە لەوەی سەلبییەتەکە هەر جارە تاریکایی خۆی تێدا بڵاو دەکاتەوە. لەبەر ئەمە بە درێژبوونەوەی عومری تەجرەبە، ڕەنگە، بەرەبەرە ڕووپێوی تاریکایی لەچاو ڕووپێوی ڕووناکی بەرتەسکتر بێ. کە دەشڵێم «ڕەنگە» نەوەک لە دواڕۆژدا حاڵوباری وەها هەڵبکەوێ کە تاکە یەک زانەوەی لایەنێکی تاریکی مرۆڤ ئەنجامی هێندە ناقۆڵا بەدەستەوە بدا ڕووپێوێکی پان و بەرینی ڕووناکایی تاریک بکاتەوە وەک بەرپابوونی شەڕی ناوخۆیی کە هەموو ڕۆشنایی و پێشکەوتنی لە خۆی بە پێشەوە دەپووچێنێتەوە و شەوەزەنگی ئەنگوستەچاو دادەهێنێ. لەگەڵ ئەمەشدا کە ئێمە حیسابی ئەو تەرزە ئیحتیماڵە بۆ سەلبییەتەکە بکەین دەبێ ڕێگەش بە ئیحتیماڵی لایەنی چاکی ئیجابیەتەکە بدەین کە لە دواڕۆژدا هەنگاوی بەرینتر هەڵێنێ. کێ دەڵێ کەڵەکە کردنی ناخۆشی و پەرەسەندنی گومان لە یەکدی کردن و گەورەتربوونی هەڕەشەی شەڕ و تاریک داگەڕانی ئاسۆی پێوەندیی نێوان دەوڵەتان و بەڵای وەها زل دڵی دڵڕەقە خاوەن دەسەڵاتە جیهانیەکان نەرم ناکا بۆ ئاشتی و هاریکاری و بەیەکەوە هەڵکردن. کەس

نازانێ جڵەوی چارەنووسی مرۆڤ لە دوارۆژدا دەکەوێتە دەست ئەهریمەن یا فریشتە...

ج- هەقم هەیە بڵێم کە مرۆڤ بە چاوی کرایەوە سەیری خۆی کرد و حەقیقەتی رووناک و تاریکی لە خۆیدا دۆزیەوە و هەستی بەو لایەنە مەلعوونەی سەلبییەتەکە کرد باشتر دەتوانێ خۆی لە تەپکەکانی بدزێتەوە وەک ئەوەی کە نەخۆش دەردی خۆی ناسی چاکتر دەتوانێ دەرمانی بکا. لێرەدا نامەوێ بڵێم نووسینەکەی من وەک زەنگۆڵەی قەدەر لەبەر گوێی رۆژگاردا دەزرینگێتەوە و نوستووان وریا دەکاتەوە، کە دەزانم لە میلیۆنێک کەس تاکێکی دەنگی منی پێ ناگا، ئەو تاکانەش کوردی بێدەسەڵاتن هەندێکیشیان بەگژمدا دێنەوە: مەبەستم ئەوەیە بڵێم مرۆڤ بە تێکڕایی رۆژ لە دوا رۆژ پتر لە خۆی و دەردەکانی دەگات و چاکتر بۆ ناو دەربوونە تاریکەکانی دەروونی خۆی قووڵ دەبێتەوە، ساڵ لە دوای ساڵیش لە رێی تەکنیکەوە ئامێری وەها هەستیار لە پشکنینیەوەکانی بەکار دەهێنێ لەو غەڵەتانەی رزگار بکات کە هەست و زانینی خۆی تێیانەوە دەگلێ.

د- ئەو رۆژەی مرۆڤایەتی دەگاتە قۆناغی برایەتی و ئاشتیی راست، هەزارویەک گرێوگاڵی نەفسی حەزۆک و هۆشی تاریک دەکرێتەوە. واتە بەشێکی زۆری ئەو تاریکیانەی لە دەرەوەی هۆش پەیدا دەبن و دنیای لێ تاریک دەکەن بەرتەرەف دەبن و بەوەدا ژمارەی ئەو مەیدانانەی تاریکایی بەسەر هۆشدا دەهێنن لە خۆوە روون دەبنەوە، ئەمەش لەو ئومێدە خۆشکەڵە درۆزنانە نییە کە مرۆڤ زرەخەونی پێوە دەبینێ چونکە هەتا دێ ئاشتی و هاریکاری و بەیەکەوە هەڵکردن دەبنە شتی ناچاری، ئنجا ئەگەر مرۆڤ بڕیاری لەناوبردنی خۆی نەدا دەبێ بەرەو ئاسۆی سپی هەڵگەراوی فەجری ئەو برایەتییەوە بڕوا تا ئێستاش کەم زۆر ماوەیەک لەو گەشتە پێچراوەتەوە. بەڵام نابێ بە گەشبینیەکی سافیلکانە چاوەنۆڕی ئەو رۆژە بین و بە نامەی ئەوەوە کە هاتنەکەی حەتمییە پشتی لێ بکەینەوە. بردنەوەی گرۆی ئاشتی و برایەتی کارێکی هەرە هەرە سەختی کۆمەڵایەتییە.

بەهەمەحاڵ ئەو قۆناغە یەکجار پان و بێسەروبنەی کە مرۆڤ لە ژیانی ئەشکەفتەوە بۆ ئاسمانگەڕی بڕیویەتی موژدەی خۆی لەگەڵ خۆیدا هێناوە و موژدەی گەورەتریشی پێیە هەروەک هەڕەشەی گەورەتریشی پێیە. لەگەڵ ئەمەشدا و لە

هەموو ئیحتیمالێکی دوارۆژیشدا، چ چاک بێ و چ بەد، قسەکانی من ئەگەر ڕاستییان پێکابێ نابنە بەرپرسیاری ئەو سەرەنجامەی کە لە دوارۆژدا دەستەملانی مرۆڤ دەبێ. من نەهاتووم قۆنتەراتی خێروخۆشیی پاشەڕۆژ بگرمە ئەستۆمەوە تا ئەگەر چاک دەرنەچوو تێیدا خەتابار بم. ئەوەی من گوتوومە ڕووبەڕوو کردنێکی بچکۆلانەی فکری ماددییە لەگەڵ واقیعی مرۆڤایەتی لە مەیدانی دەوری ڕاستینەی هۆش و ماددە لەوەی پێی دەڵێن گۆڕانی کۆمەڵایەتی. کە نەختێک ورد بیتەوە بۆت دەردەکەوێ فەلسەفەی ماددی بەرپرسیارە لە چۆنیەتی دوارۆژی ئادەمیزاد چونکە فەلسەفەکە هەر بیر کردنەوەی تەنها نییە بەڵکوو بەشە هەرە گرنگەکەی بریتییە لە سیاسەت و ئابووری و ڕابەری و ڕەوشت و ڕۆشنبیری و پرۆژە و نەخشەی سەرلەبەری ژیانی ئێستا و دوارۆژ، بگرە ڕێکخەری جەمی خواردن و دەمی نووستنیشە، کە واتە هەر خۆی لێپرسراوی چۆنایەتی ئێستا و دوارۆژی مرۆڤە وەک کە دەستوورەکانی ڕادەگەیەنن.

بیروڕای من یا هی تۆ کە لە دەرەوەی فکرخانەی ڕەسمیی ماددییەتەوە لێکدانەوە دەکەین ئەگەر لێکدانەوەمان ڕاست بێ پێویستە لەسەر فکری ماددی حورمەتی بگرێ. خۆ ئەوەی ڕاستی بێ بەشێکی بەرچاوی لێکدانەوەکانی من لە نەهاتنە دی بەڵێنەکانی ماددییەت و نادروستیی هەنگاوی ماددییەکانی کورد سەری هەڵداوە چونکە ئەگەر داوا چەور و شیرنەکەی بیری ماددی کە گۆیا بینین و موژدەکانی لە ماددەوە تیشک دەدەنەوە داوایەکی بەجێ بوایە من و یەکێکی دیکە کەی بیری لەوە دەکردەوە دەردی سەری ئەو تەرزە لێکدانەوەیە بچێژێ و وەختە تەسک و تروسکەکەی پێ تەسکتر بکاتەوە و هەرچی بیری ماددیی نێو کوردەواریش هەیە لە خۆی بەدەنگ بهێنێ. وەی کاشکی ئەو فکرە پەرەسەندوە و پرچەکی چالاکی و هەڵمەتە لەجیاتی هەموو چاو و مێشکی کرایەوەی ئەم جیهانە ڕاستییەکانی کۆمەڵایەتی و مێژوویی بدیتایە و داواکانی لە ئەزموونەدا دەرچووبانایە و موژدەی خۆشکەڵەکانی بگەییشتنایە جێ. بەڵام وەک گوتراوە «داری بریا بێبەرە». لەم مەیدانەشدا لە هەموو میللەتان دەست بەتاڵتر کوردەکەی خۆمانە کە سەرەڕای سوودمەندنەبوونی لە بەرەکەتەکانی بەرەی ماتیریالیزم گەنجەکانیشی پتر لە عالەم شەیدای بیری ماددین و عاشقانەتر لە سەری دەکەنەوە و مەجزووبانەتر

ناتەواویەکانی دەپۆشن. دەشتوانم بڵێم لەو سی ساڵەی دواییدا کورد هەنگاوێکی هەڵنەهێناوە ئەرکێکی فکری ماددی تێدا هەڵنەگرتبێ و نرخێکی بەشوێندا چوونی نەژماردبێ، هەمووش بە بەخشین و بێ مزە.

ئێمە لەتەک فکری ماددیدا تا ئێستا پەندێکی مەشووری کوردیمان بە وەرگەڕاوی دەور کردۆتەوە و گوتوومانە «پێت دەڵێم خاڵە هەتا چوێلەکانت بۆ بگرم» هەرچۆنێک بێ جیهان لەبەر زۆر هۆی تازەی بەیەکدی زانین و لێکتر تێگەیشتن و بەیەکتر گەییشتن، ئەم سەرەوسەری وەها لێکدی نزیک بۆتەوە▪ میللەتە لە یەکدی دوورەکانی ئیمڕۆکە پتر لە میللەتە دراوسێکانی بەر لە 100 ساڵ ئاگاداری حاڵوباری یەکدین و تین و تاو لە هەڵسوکەوتی یەکدی وەردەگرن و بە بیروباوەڕی یەکدی دەورووژێن، جا ئەگەر بەر لە سەد ساڵ و دوو سەد ساڵ فەیلەسووف ڕێی هەبایە لە ژوورەکەی خۆیدا بە دیار دەریای بالتیک وەیا کێوی ئەندێزەو▪ ڕەخنە لە بیروڕای کونفوشیۆس و بوودا و عیسا بگرێ، ئێستا بابایەکی کوردی کە لەسەر گوفەکی دێی «هەڵەدن» و «پشتاشان» بەدیار چینەی مریشک و گەوزینی گوێدرێژەکەیەوە ڕاوەستاوە و قم لە سبیلە قیردەرکردوەکەی دەدا فەلسەفەی ماددی دێت و سەری ڕێ بەهەست و هۆشی دەگرێت و بەرەو ڕێگایەکیەوە دەبات کە لە خۆوە بێ مامۆستا بە هەموو عومری خۆی و ئەولادیشیەوە بۆی نەدەچوو ئنجا بەگژ دەروجیران و خزم و کەسیشدا دەهێنێ و بەرەنگاری کاری وەهای دەکا کە لەو حاڵوبارەدا سەربە هیچ خۆشیەکەوە نانێ.

فەلسەفەی ماددی یەخەی دنیا دەگرێ بەر لەوەی کەس یەخەی گرتبێ، هەر هێندەش لەوەدا حەقی هەیە کە خۆیشی ڕێ بدا خەڵق ڕەخنەی لێ بگرێ وەیا هێرشەکانی ڕەت بکەنەوە وەیا ڕێبازێکی غەیری ئەو بگرن، وەک دەشبینیت من کە مافی خۆ ڕوون کردنەوە و بیروڕا دەربڕین بەکار دەهێنم نەهاتووم لە دەرەوەی مادده و لێکدانەوەی سەربە ماددەوە بەڵگە بۆ خۆم بخوازمەوە وەیا بەڵگەی سەرچاوەیەکی ناماددی بکەم بە ڕاستییەکی سەلمێندراو وەیا حیکایەت هەڵبەستم و بەسەرهات دروست بکەم و مێژوو بشێوێنم بۆ هیچ مەبەستێک: من هاتووم بە پێی باوەڕی خۆم نەختێک بەرەو ئەولاتری ڕواڵەتی سەرتوێژی مادە و یاسا کۆمەڵایەتیەکانی سەربە ماتریالیزمەوە ڕۆییشتووم لەوەشدا ویستوومە بە سەوز

بڵێم سەوز و بە ڕێویش بڵێم ڕێوی. چی منیش دەڵێم لەچاو ئەوەی فکری ماددیی ئەورووپای سەردەم دەیڵێ و لە ژیاندا بەکاریشی دەهێنێ و بۆچوونەکانی ماددیی تەقلیدی پێ بەرپەرچ دەداتەوە سەرەتا و ئەلفوبێ و گروگاڵێکە ئەگەر بیکەی بە چەکوچیش هێلکە ناشکێنێ.

گۆیا ئەم نووسینە و هەموو ئەو کەسانەی دەیخوێننەوە دەکەن چەند؟ وا دەزانم ئەو کەسەی بە خوێندنەوەی نووسینی ناو ئەم کتێبۆلکە دەماری کشت و هەناسەی سوار دەبێ و وا دەزانێ هەر ئێستا دنیا ڕەش دادەگیرسێ، هەستێکی شەخسی و لەخۆدا ڕۆچوو لە نێو قەپێلکی نەفسە وێک هاتوەکەیدا تەنکاوەکانی فکری دەکوڵێنێ وەک کە دەروێشی زەرگوەشێن بە تاکە یەک قسەی گوماناوی لە شێخەکەی بگیرێ فرکەی دەمارانی دەبێتە کڵپە و چاو سپی هەڵگەڕان و کەف پژاندن و لەرزوتای خۆ ون کردن، نە ئەوەی منیش دەیڵێم دنیا سەروبن دەکا نە گومان کردنیش لە شێخ یاسا ئەزەلییەکانی کردگار دەشێوێنێ. هەرچی هەیە لەوە تێناپەڕێنێ کە تەنگژەی نەفسی ئەوانەی قسەی ڕەخنەگرانە تەحەمول ناکەن قسەکان دەکاتە ڕەشکەوپێشکە و چاو ئەبڵەقبوون، لەوەش تێپەڕیوەتم سەیرم بە مرۆڤی وەها بێت وەیا لێی زوێر ببم.

لێرە بە پێشەوە گوتم ئەو فێڵەی فێڵبازی چاوکراوە دەیکا ناچێتەوە بۆ لای هۆشی تاریک بەڵکوو بۆ نەفسی چڵێس. بەڵام وا دەزانم کە فەلسەفە و بیرکردنەوە و زانست بەچاوی زەق بەرگی درۆزن لەبەر ڕووداو وەیا مێژوو وەیا کۆمەڵایەتی وەیا بیری ڕووت بکەن بەلای تاریکاییدا دەچنەوە نەک بەلای فێڵی تەماعکارانە هەرچەند لەوەشدا جودا کردنەوەی هۆشی تاریک لە نەفسی ئاڵۆز کارێکی ئاسان نییە بەڵام شتێک ڕێم پێ دەدا دیاردەکە بۆ لای هۆشی تاریک ببەمەوە ئەویش ئەوەیە کە زانست و فکر و فەلسەفە دوای نووسین و بڵاوکردنەوەیان ڕێگەی ئینکار کردنیان دەبەسترێ و لەسەر داهێنەرەکانیان حیساب دەکرێن چونکە وەک فێڵی حیلەبازان نین کە بە زۆری بریتییە لە چاپوکدەستی و زمانلووسی و بەهەڵە بردن. فێڵباز بەعادەت خۆی دەدزێتەوە لەو شتانەی درۆی لێ بەسەر دەگرنەوە وەیا فێڵی لێ ئاشکرا دەکەن. کە هەر ڕێشی نەما و ناچار بوو خۆی بەلایەکدا بخا تەعبیری

وەها توێکڵدار بەکار دەهێنی، بەتایبەتی لە نووسین. بشێ تەئویل بکرێ هەر نەبێ بایی ئابڕوو پاراستن.

ئنجا ئەگەر دەقی فەلسەفە و زانست وەک نوشتەی دوعایان نەبێ کە لە هەردوو حاڵەتی شیفا و مردنی نەخۆشدا ڕێزی خۆی دەپارێزێ، هەر ناتەواویەکی ئانقەستی تێدا هەبێ هی تاریکیی هۆشە نەک حەزی نەفس. هەر کاتێک فەیلەسووف و بیریار بە پێی خواییشتی نەفسی حەزۆک بۆ گەییشتن بە سوودی نێزیکەدەست بەرگی درۆزنی لەبەر قسەکانی خۆی کرد و بڵاوی کردەوە وەک کە «گوبلز»ی نازی دەیکرد بزانە ئەو کابرایە فەیلەسووف و بیریار و زانا نییە بەڵکوو مرۆڤی سیاسەتە کە بە درۆ و دەلەسە بازارەکەی گەرم دەکا پەکی بەوە نەکەوتوە لە دوارۆژدا درۆی لێ سپی دەبنەوە.

فکری ماددی هەرچەند لەگەڵ سیاسەتیش تێکەڵە، دیسانەوە لە سەرەتای پشکووتنیەوە لە بارێکدا نەبوو بتوانێ بە فێڵ و چاوبەستەکی خەڵق بۆ خۆی ڕاکێشێ چونکە وتوویژی ئیقناعکارانەی لەگەڵ بەرەی ڕۆشنبیران بوو، هەراشی دژی فەلسەفە باوەکانی ئەو سەردەمە بوو ئنجا لە دواپلەدا بەرەنگاری بەرژەوەند و سوودی ناڕەوای سەرمایەدار و زۆرداران دەبوو.

لەبەر ئەمە، وا دەزانم بەهەر نیازێک و هەر بارێکدا فەلسەفەی ماددی بێ یا ناماددی هەڵەی ئانقەستی خستبێتە ناو دەقەکانی و توویژەکانی لە هەڵوەستێکی تاریکی هۆشدا ئەمەی کردوە بەتایبەتی چونکە هەموو هەڵەیەک دژی بەرژەوەندی بەردەوامی ئەو کەسانەیە کە پێڕەوی هەڵەکە دەکەن هەر نەبێ لەبەر ئەوەی کە ڕۆژەک دێ هەڵەکە بدۆزرێتەوە و لەسەر فەلسەفە حیساب بکرێ بە درۆنایەتی و شێواندن. ئەوساش یا دەبێ دان بە هەڵەکەدا بهێندرێ و لە فەلسەفەکە ڕەش بکرێتەوە [ئەمەش بێهێزییە بۆی] یا دەبێ مریدەکانی بە درێژایی ئەبەد خەریکی پینەچییەتی و تەئویل هێنانەوە بن هەر خواش دەزانێ ئەو هەموو پینە و تەئویلە بە چەند دەوەستێ لەسەر فەیلەسووفەکان و پێڕەوەکانیان چونکە لە باشترین حاڵدا تەئویلی شتی نادروست بە نادروستێکی نەختێک لە خۆی ژیرانەتر دەکرێ نەخۆ مومکین نییە بیری ڕاست ببێتە پینەی کەلێنی چەوت، ئیتر بۆ خۆت لێک بدەوە کار و بازاڕی پینەچییەتی کە درێژەی کێشا مەسرەفی پینە لەسەر پینە بە چ دەگا. ئەمە

لە باشترین حاڵدا ئاکامی پینەچییەتی فەلسەفی بەردەوامە چونکە سەپاندنی ساختەی ئاشکرا بەسەر زوربەی میللەتدا دەکێشێتەوە بۆ قەمچیکاری و بگرەببەستە لەو ڕووەوە کە تەئویلی بێ کوتەک کەمبڕشتە بە تایبەتی لە شتی دنیاییدا هەرچی پینەچییەتیی سەربە غەیبە بەر لە قیامەت درۆی لێ سپی نابنەوە...

بەلای منەوە هەڵوەستێکی تەریک و بەردەوامی فکری ماددی ئەوەیە کە دێت و بەرگی ماددی لە قەد و باڵای فکری و فەلسەفە و ڕووداوی سەربە غەیب و دین دەئاڵێنێ، ئنجا چونکە دینیش لە تەمەندا هێندەی کۆمەڵایەتی بەعومرە وەهاش پێدەچێ گەلێک بەردەوامتر دەبێ لەوەی فکری ماددی بەتەمای بوو، لەبەر ئەمە ئەرک و مەسرەفی کە فکری ماددی لە تەئویلی دیاردەکانی سەربە غەیب دەکێشێ هەتا بۆ لای ماددەکان هەڵدەگێڕێتەوە ئەویش سەدان جار لەوە پتر بێ کە دەبوو ڕواڵەتە بەهەند هەڵنەگیراوەکەی غەیب لە ماددەدۆستانی بستێنێ.

چەندین نووسەری زیرەک، بگرە بلیمەتیش، و لێزانی فکری ماددیم خوێندۆتەوە هەموو مێژوو و ئێستاکە و خاسیەتەکانی مرۆڤ و بزوێنەرەکانی کۆمەڵایەتی و هاندەرەکانی تاک و کۆمەڵی هەڵگوشیوە و چەند دڵۆپێکی هۆی ئابووری لێ چۆڕاندۆتەوە بۆ ئەوەی وەک دەرمان بە دڵۆپڕێژی قەڵەمەکەی لەو هەموو چاوگانەی بتکێنێت کە وا زەق زەق لە غەیبەوە، لە دین و پێغەمبەرانەوە، تەڕایی و ڕووناکایی دەدەنەوە بۆ ناو واقیعی کۆن و سەردەم. لێم ڕوونە ئەو نووسەرانە پاش ئەوەی زانست و تەکنیکی نوێ گەلێک کۆنە قەناعەتەکانی زانستی سەربە پێک هاتنی ماددەی بەرەواژ کردەوە تا ئەوەی لە زۆر مەیدانی تێوەڕاماندا بینینی نوێ خەریکە لەگەڵ تصوف لە یەکدی نزیک دەبنەوە، ئا ئەو نووسەرانە بۆ ماوەیەکی درێژی داهاتوو ڕووبەڕووی شەڕێکی تازە دەبن لەگەڵ ئەو زانستە نوێیانەدا چونکە زانستەکانیش لەگەڵ فکری ماددیی تەقلیدی ناگونجێن لەو ڕووەوە کە ماددیی تەقلیدی دۆستی زانستەکانی بەرەو کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم و نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمە، تارادەیەک ئەو نووسەرانە بۆیان دەلوێ زانستەکانی نوێ بە بۆرجوازیەتی گوماناوی بکەن و خۆیان مرۆی سافیلکەی پێ هەڵخەتێنن بەڵام وا دەزانم ئەو پینەچییەتییە زۆر ناخایێنێ چونکە فکرە ماددییەکە کە دێت و چەنگەوبازی زانستی تەتبیقی دەبێ بۆ خۆی دەچێتە ڕیزی خەیاڵ و خەون هەموو

بەڵگەکانیشی هەر ئەو بنەما فکرییانە دەبن کە پێشتر بەحاڵ لە رێی بەکارهێنانی هەڕەشەوە بەشی ئیقناع کردنی دەروێشەکانی خۆی دەکرد.

پێش 40 ساڵێک برنارد شۆ یەخەگیری ڕاشنالیست و مارکسیستەکان بوو لەوەدا کە بەپێی دەقە تەسکەکانی بیروڕای خۆیان ئەو ڕاستییانەیان نەدەسەلماند کە لە ڕێگەی بۆچوونی ماددی بەرفرەوانەوە تەفسیر بەدەستەوە دەدەن، وەک کەرامەتەکانی جان دارک، هەڵبەت پاش دۆزینەوەی هەزاران ڕاستیی نوێ ماددییە تەقلیدییەکە هەر بە جارێ کەڵکی تەفسیری پێوە نامێنێ.

ڕووداوێکی مێژوویی هەرە گەورەی سەربە دین کە تەنانەت بەشێکی نووسەرانی غەیری مارکسیست لە دینی دەدزنەوە بۆ دنیا شەڕە دوور و درێژ و وێرانکەرەکەی خاچپەرستەکانە. نووسەرەکان وەهای بە دنیاوەی دەلکێنن هەر دەڵێی لە بنەڕەتدا ئەویش وەک شەڕی یەکەم و دووەمی جیهانی ڕاستەوخۆ بۆ نەوت و موستەعمەرە و شەمەندەفەری بەغدا و بنگەی سپایی هەڵگیرساوە کە ئەگەر لێیانی بسەلمێنین دەبێ گوێ بۆ ئەو ڕایەش شل بکەین کە دەڵێ جەنگی یەکەم و دوەم و پێوەندییە سیاسی و ئابووریەکان و بزووتنەوە کۆمەڵایەتیەکانی ڕۆژهەڵاتی مسڵمان کە چاولێکەری ئەورووپا دەکەن سەرلەبەریان درێژەی شەڕە ئایینیەکەی خاچپەرستانە کە لە کۆنەوە دەیانەوێ ئیسلامەتی لەناو ببەن. چونکە هەروەک مومکینە لە شەڕی خاچدا دنیادۆست و هەلپەرست و شەهوەتباز و ڕیباخۆر بدۆزیتەوە هەروەهاش مومکینە لەو هەرا و تێکهەڵقژان و نوێخوازی و بیروڕایانەی کە لە ئەورووپاوە ڕوویان لە ڕۆژهەڵات کردوە، کەم زۆر، شوێن پەنجەیەکی «جوداوازیی دین» و دوژمنایەتیی ئیسلام بەرچاو بکەوێ.

یەکێک لەو ڕووداوە ئاشکرایانەی بێتەئویل ئەم مەعنایە ڕابگەیەنێ هەڵوەستە زۆر باسکراوەکەی «لۆرد ئەللێنبی» سەرکردەی لەشکری ئینگلیز بوو کە دوای داگیر کردنی شام لە شەڕی یەکەمی جیهانیدا چوە سەر قەبری سەلاحوددین و بە دەنگی بەرز پێی گوت ئەو زاڵبوونە درێژەی شەڕی خاچە. دەشێ دینداریکی بێفێڵ و دڵپاک بڕوا بەوە بکا کە هەموو ئەو نەریت و پیشە و نۆشین و کەیف و ئاهەنگ و پشت لە دین کردنانەی کە مسڵمان لە ئەورووپاییان فێریان دەبێ. بە نیازی بێهێز کردنی دینی ئیسلام، بکرێن بە دیاری بۆمان. بگرە لە جلکی کورتی ئافرەتانەوە تا

دەگاتە ئەو ئیلحادەی کە لە فکری ماددیی ئەورووپای سەردەمەو■ دەڕازێنرێتەوە هەموویان لە نەزەر پیاوی دینداردا تەپکەی بێتەئویلن بۆ لەناو بردنی ئیسلام.

ئەمە دەڵێم تاکوو خوێنەری کورد بە بیری خۆیدا تێی بپەڕێنێ کە ئەگەر بە بەڵگەی بێهێزی بیریاری ماددی و ئیلحادی سروشتی شەڕی خاچ لە دینەوە بگۆڕێ بە دنیا مومکینە ئاسانتر بەشێکی زۆری فکری ماددی و ئەو چالاکییانەی بۆ دنیا دەکرێن ببرێنەوە بۆ سەرچاوەی دین و بکرێن بە شەڕێکی خاچپەرستانەی مۆدیلی سەدەی بیستەم دژی قورئان، ئەوساش هەروەک بیریارە ماددییەکان بەڵگەی یەکدی دەسەلمێنن لە گۆڕینی هەوییەی شەڕی خاچ، پیاوە ئایینیەکانیش لە نێوان خۆیاندا سەدان بەڵگەی بە داکوباب و بە تاموشام لەیەکدی وەردەگرن و دەسەلمێنن.

مرۆڤ نابێ جڵەوی هۆشی خۆی بداتە دەست هۆش و ئارەزۆی غەیری خۆی.

شەڕی خاچ وەک گەلێک شەڕی نێوان دوو دین وەیا دوو مەزهەبی یەک دین، لە بنەڕەت و لە ڕواڵەتیشدا شەڕێکی ئایین بوو هەرچەند لەوەشدا وشکەباوەڕی سەر لێشێواو هاندەر بووبێ. بێگومان هەرای هێند گەورە و بەردەوام بە بەریەوە هەیە چەندی بڵێی لە سوودپەرست و تەماعکار و جەردە و زۆردار و نیازمەند و فێڵبازان بخاتە جموجووڵ، هەتا خەیاڵیش بکەی کاری بەد و بێداد و بێڕەحم و دزێوی تێدا ڕوو بدا. هەڵبەت من و تۆ شەڕەکە لە قاڵبی دین و دنیاش هەر تاوانبار دەکەین، تەنانەت ئەگەر هەموو خاچپەرستەکان بۆ تاکە مەبەستی خزمەتی کردگاریش هەراکەیان نابێتەوە ئنجا هەر لە ڕێی قودسییەتی خزمەتی کردگارەوە تاوانبارتریان دەکەین چونکە ئەو کردگارەی ئەوان خەڵقیان بۆ دەکوشت و وڵاتیان بۆ وێران دەکرد هەر خۆی خوای کوژراوەکان و وڵاتە وێرانکراوەکانیش بوو. دەستە تەرازووی عەدالەتیشی بۆ مەزلوومیەتی ئەوان پتر دەنیشت.

ئەمە ڕاستییەکە دەخلی بەسەر سیفەتی ئایینی و دنیایی شەڕەکەوە نییە، بەتەواوی وەک ئەوەی کە دز ماڵت دەدزێ نوێژکەر بێت و مولحید بێت هەر دزە، بەڵام فەرقی نوێژکەر و مولحیدیش بەوەندە تێ ناچێ کە هەردووکیان دز بن. چەند پاشا و توجار و شەڕخواز و جەردەیەک مەبەستی خۆیان لە شەڕێکی سەربە ئایین و باوەڕدا ڕەچاو دەکەن وەیا لەپێناو ئەو مەبەستەدا پتر هانی خەڵق دەدەن تەنها

هەڵوەستی دنیادۆستانەی خۆیان دەستنیشان دەکەن نەک «هویة» بۆ شەڕەکە دەردەکەن چونکە زوربەی ئەو خەڵقە ڕەشوڕووتەی کە بە شمشێر▪ کولەکانیان و پاشۆڵە بێ تێشوەکانیان و بە لەشە زەرد و زەعیفەکانیان لە دوورایی هەزاران کیلۆمەترەوە بۆ فیداکاری خۆیان هەڵدەکوتا چ سوود و بەرژەوەندی دنیاییان لەو قوربەسەریەدا نەبوو تاکوو لە ڕێی تەفسیری دنیاخوازییەوە بەرەو تێگەییشتنی هەڵوەستەکەیانەوە بڕۆین. ئەو ڕەشوڕووتە بە چاوی فرمێسکاوییەوە گوێیان دەدایە قسەی هاندەرەکانیان کە بەشی هەرە زۆریان لەو قەشانە بوون کە بە قەدەر جبە ڕەشەکانیان لایەنی دینیان پێوە دیار بوو.

مێژوو دەگێڕێتەوە دەڵێ هەزاران مێردمنداڵ کۆشی گەرموگوڕی باوانیان جێ هێشت بەرەو «قدس»ێک کە هەر نەیگەییشتنێ چونکە هەر لە ڕێگەدا بوونە نێچیری مرۆڤفرۆشان، خۆ ئەگەر نەشفرۆشرابانایە هەر بە ڕێگەوە لە برسان و لە سەرمان و گەرمان و ماندوەتی دەمردن. سەدان کەسی وەها تێروتەسەلیش ڕەوەو قودس پشتەوماڵ بوون ئەگەر باوەڕی ئایینی دنیاکەی لەبیر نەبردبانایەوە ڕازی نەدەبوون تاکە یەک شەو بە سەد دنیار لە نوێنی غەیردا بخەون. هەروەک خەریکبوونی سوودپەرستان لە ئایینیدا بە ماڵی دنیاوە شەڕەکە ناکاتە تیجارەت، هەروەهاش خەریکبوونی چەند ئەفسەر و عەسکەرێک بە نوێژ و تاعەتەوە جەنگی یەکەم و دوەمی جیهانی ناباتە ڕیزی حەج و زەکات. ئەو لەشکرەی کە دەچوو لە دەردەنێلەوە بۆ داگیرکردنی ئەستەمبۆڵ لە شەڕی یەکەمدا ئەگەر هەمووی تێکڕا سەر و خاچێکیان لە مل بوایە و ڕۆژی هەزار نیشانەی خاچیان بە ئەنگوست لەسەر سینگیان کێشابایە هەر سپای داگیرکەری دنیایی ئیمپێریالیست دەبوو.

گومان نییە لەوەدا کە گێڕانەوەی شەڕی خاچ بۆ هۆی ماددی و ئابووری و تەمای دنیایی کارێکی سافیلکە و سەراوییە دژی هەموو ڕاستییەکی مێژووییە. ئەگەر پارە و مڵک و عەبد و جاریە هاندەر بوونایە خۆ ئەو کەسانەی کە خەڵقەکەیان بەرەو شەڕ دەبرد زمانیان نەبڕابوو هاوار بکەن: هۆ خەڵقینە بابچین بۆ سووریە و فلەستین و میسر خۆمانیان پێ دەوڵەمەندە بکەین. جا ئەگەر خەڵقیان بەدوادا هاتبایە دیارە شەڕەکە بۆ دنیا بوە. هۆی ئابووری و ماددی ئەگەر ئەو کاریگەرەیە لەو شەڕەدا کە بیریارە ماددییەکان باسی دەکەن ئەدی بۆچی نەیوێرا خۆی ئاشکرا

بکا؟ چەند سەیرە بگوترێ هۆی ڕاستینە لە شەرمان خۆی لەناو درۆدا شاردبۆوە زوربەی خەڵقەکەش لە چاوبەستەکێ درۆزنەکەدا بەشدار بوون.

بەڵێ دەزانم وا دەبێ مەنفەعەتپەرست دەزانێ مەبەستەکەی بەلای خەڵقەوە ناپەسەندە ئەویش لە شەرمان بەرگی درۆزنی جوانکیلەی لەبەر دەکا، بەزۆریش لە حاڵی وەهادا، جاران، هانا دەبرایە بەر ئایین هەروەک ئێستا هانا دەبرێتە بەر «مبدأ» بەڵام کە بێین حاڵی وەها لەتەک شەڕی خاچ ڕاگرین چەند تێبینییەکی گرنگ ڕەچاو دەکرێ:

یەکەم: شەرم هاتتەوە لە دەربڕینی ئارەزوی دنیایی نارەوا خۆی لە خۆیدا شەڕی نێوان هەستی زگماکی پاک و نیازی ناپاکی دنیاییمان بۆ دەگێڕێتەوە کە هەردووکیان زەنەی زاتن، ئنجا ئەوەشمان تێدەگەیەنێ کە ماددە و بەرژەوەند ئەو خودایە پەرستراوە بێ شەریکە نییە کە بیری ماددی بەرەهایی دەیکاتە تاکە بزوێنەر و هاندەر دەنا بۆچی شەرم بکا لە خۆ ئاشکرا کردن؟ بۆچی کە حاجی دەچێتە حەج وەیا نوێژکەر دەسنوێژ دەشوا وەیا سۆفی قاچی شێخەکەی ماچ دەکا هیچیان خۆی ناچار نابینێ وەک بابای دنیادۆست کارەکەی بشارێتەوە وەیا ئینکاری بکا وەیا بەرگی دیکەی تێوەرپێچێ؟ هەر لەو کاتەدا کە «سۆفی زەردە» قاچی «شێخە شینکە» ماچ دەکا ئەگەر کوڕێکی مەکتەبدیدەی هەبێ ئارەقەی شەرم و پەستی لێ هەڵدەڕژێ بەدیار داهاتنەوەی باوکی بۆ سەر پێڵاوی شێخ چونکە کوڕەکە هەم باوەڕی بە شێخ نەماوە هەر دەشزانێ کارەکەی باوکی شەرم هێنەوەیە.

لە شەڕی خاچیشدا ئەو کۆمەڵانەی بۆ ناوی «عیسا» و شوێنە پیرۆزەکانی فلەستین دەکوژشان و خۆیان بەخت دەکرد بەو پەڕی شانازییەوە و پڕ بەدەم مەبەستە ئایینیەکانیان دەردەبڕی. هەر لە پەنا ئەو خۆ بەختکەرانەشدا سوودپەرستە دنیادۆستەکانی سەد بەرگی درۆزنی تەفرەدەری بەهەڵەبەریان لەبەر تەما و حەزە بەدەکانیان دەکرد و هەرچی دزێویەکی سەربە دنیای تێیاندا هەبوو بە نەخش و نیگاری دین دەیانڕازاندەوە وەک کە لەو ڕۆژانەدا دێن دەموچاوی ناشیرن بە ماکیاژ جوان دەکەن.

بیریاری ماددی کە دێت لە نێوان تۆفانی هەرایەکی ئایینی وەک ئەو شەڕەدا چەند جۆگەلەیەکی بیژۆکی دنیادۆستیی خۆ حەشارداو دەدۆزێتەوە و بەوەدا دەیەوێ سەرلەبەر تۆفانەکە لە سوودی ماددی مارە بکا، لە حەقیقەتدا ئیعلانی ئیفلاسی بیروڕاکەی خۆی دەکا چونکە بە پێی تەفسیری ماددی، کە هۆی ناماددیی بێبایەخ دەکا، دەبوو بیریاری ماددی خەریک بێ لە شەڕەکەدا چەند جۆگەلەیەکی تەسک و کورتی سەربە ئایین دەسبژار بکا و بڵێ ئەو دزەم گرتن کە خەریک بوون هەرا ماددییکە بۆ دین بە قاچاغ ببەن، نەک بەحاڵ و بە هەناسواری چەند پاتاڵخۆرێک بکاتە هەڵگری ئاڵای شەڕی خاچ.

بیریاری ماددی دەبوو لەجیاتی ئەو پاتاڵخۆرانە چەند قەشەیەکی ترساوی سەرکزەڵە بدۆزێتەوە کە بە دزیەوە خەریکن بە بەرتیل و تەماعی دنیایی کەمتاکورتێکی سۆفیمەشرەبان لە تۆفانی دنیادۆستەکانی ئەو شەڕە بۆ لای خاچ و عیسا و خوا بگێڕنەوە. ئەم تەنگەتاوبوونەی بیریاری ماددی بەدەست بنگە و بنجی ناماددییەوە لە ڕووداوی وەک ئەو شەڕەدا ئەو دیندارانەم بەبیر دەهێنێتەوە کە لە موناقەشەی بیروباوەڕدا پێدزیلکە بەرەو دواوە دەکەن لە قەناعەتەکانیان تا دەگەنە ئەوەی کە دیفاعیان لە ڕوکنێکی زێدە بنجیی وەکوو نوێژ ئەوە دەبێ کە بڵێن «خۆ هیچ زەرەری تێدا نییە». ئنجا تۆ سەیرکە: دوای ئەوەی کە نوێژ بە پاسپۆرتی ڕێی بەهەشت و لیقای کردگار دادەندرا، دێن کۆڵ دەدەن و بۆ نوێژ دەپاڕێنەوە هەر دەڵێی شەفاعەت بۆ گوناهبار دەکەن. خۆ ئەگەر زەرەر نەدان پاکانەی تەواو بێ سێباز و کەوشەک و «بابی بابی عەوڵای ڕابی تەقلەی لە چەندان دابی»ش بێ زەرەرن. بڕوات بێ نوێژ و ڕۆژوو بەو تەرزە دیفاع لێکردنە لەوە دەشۆڕێن کۆڵەگەی دین بن. دەبێ مەلا پێ داگرێ لەسەر پێویستبوونیان بۆ دنیا و دین، بە هەزارویەک بەڵگەش پێوەندییان بە غەیب و فەرماییشی کردگارەوە ئیسپات بکا و بە نەسەلمێنانی بسەلمێنێ کە ڕۆژوونەگر و نوێژنەکەر گومڕا و خەسارەتمەندی دین و دنیان.

هەروەهاش بیریاری ماددی کە بە خۆ و ئەو هەموو لەخۆباییبوونەیەوە دەوری ماددە لە ڕووداوی کۆمەڵایەتی و مێژوودا ژووررووی هەموو شتێک دەبات لەسەریەتی بۆمان ئیسپات بکا کە ماددە لە شێوەی ماددی و لە بەرگی ماددی و بە

ڕاگەیاندنی ماددی جلەوی مرۆڤایەتی بەرەو هەڵوەست و جموجووڵ و کردەوەوە ڕادەکێشێ و ڕایکێشاوە نەک لە پشت جبە و مەنتەشای دیندارانەوە. بەڵکوو لە سەریەتی بۆشمان ئیسپات بکا کە عەقیدەی دینی هەر لەم دنیایەدا خۆی لەناو جلکی درۆزنی ماددیدا دەشارێتەوە لە ترسی ئابڕوو چوون بە توهمەی خواپەرستییەوە نەک تەئویلان بهێنێتەوە بۆ خۆ حەشاردانی دنیا لە پەردەی دیندا.

ئنجا دادی بیریاری ماددیش نادا بڵێ دینیش بە سەراحەت و بێتەئویل بایەخی بە دنیا داوە چونکە دین بەر لەوەی بیری ماددیی سەربە سیاسەتیش پەیدا ببێ و بەر لە هەزاران ساڵ، بۆ حیسابی خۆی نەک بۆ حیسابی دنیا گوتوەتی ماددە پشت گوێ ناخرێ، خۆ ئیسلامەتی لەلای خۆیەوە هەموو سەروبەرێکی دنیای لەبەر ڕۆشنایی دین ڕێکخستوە و گەلێک گۆشەی گرنگی گوزەرانیشی بە یاسا و بە دەستوورەکانی خۆی تەنیوەتەوە. ئنجا شەرمیشی نەکردوە بڵێ دنیایەکە پردە بۆ قیامەت. لەوەوە دەزانیت بایەخدانی دین بە دنیا نە بەرگی درۆزنە لە خۆی ئاڵاندوە نە فکرەکەشی لە فەلسەفەی ماددی وەرگرتوە. بەهەمەحاڵ تەبریری دنیادۆستی بە تیهەڵسوونی بۆیاغی دین نەک تەنها ئیسپاتی هێزی دین لای زوربەی خەڵق دەکات بەڵکوو تێشمان دەگەیەنێ چۆن دنیای ماددی لە زۆر حاڵوباردا بەسەر داروەکازی دینەوە خۆی ڕاست ڕادەگرێ.

دوەم: بابای نیازمەند کە دێت بەرگی دین دەپۆشێ و دنیای پێوە دەخوا لەو تەرزە کەسانەیە کە لە نێوان بەرژەوەندخوازانی عادەتیشدا ڕیزپەڕ و بێحورمەت حساب دەکرێ چونکە هەر بۆی بلوێ فێڵ دەکا. ئنجا ئەگەر بشێ فێڵبازی لە دیندا بۆ نیازی دنیایی ببێتە بەڵگەی بێبایەخی دینەکە ئەوسا دەبێ بسەلمێنین کە نیازە دنیاییەکە هەر هیچ حورمەتی نییە چونکە بەسە بۆ بێحورمەتی کە بەهۆی شتێکی بێبایەخەوە خۆی خۆشەویست بکا.

بەهەمەحاڵ فێڵ کردن و تەڵەکەبازی هەرگیز نابێتە بەڵگەی بێبایەخیی ئەو کارەی فێڵی پێوە دەکرێ، لە هەموو ئەو بارانەشدا کە بەرگی ساختە لەبەر نیازی نهێنی دەکرێ حورمەت و بایەخی بەرگەکە بە ئیسپات دەگا... وای کە وەها بوە کوردی وڵاتی عیراق لە سەفەری بەرەو کوردستانی ئێراندا شاڵێکی سەوزی لە سەری یا لە کەمەری پێچاوە و بۆتە خاڵە سەیدێکی درۆزنی بەحورمەت... لەباری دیکەدا ئەگەر

بابای دینپەرست هات و بۆ خۆشەویست کردنی دینەکە تەمای دنیایی پاتەوپاتی لەبەر خەڵق نا دیارە دنیاکە بەلایانەوە خۆش و شیرنتر و بەشەرەفترە. بەڵام وەک دەزانین کە دین دنیاش دەکاتە هۆی ڕاکێشانی خەڵق، خۆی لەناو پەردەی دنیاکەدا ناشارێتەوە، واتە شەرمی لە خۆی نایەتەوە. ئنجا دین، وەک گوتم دوژمنایەتیی ئەو دنیایەشی نەکردوە کە لەگەڵ دەستووراتی خواناسی دژ نەبێ. بە پێچەوانەی فەلسەفەی ماددی کە بوونی خۆی لەسەر نەبوونی دین هەڵدەستێنێ ئیتر بە پێی داخوازی هەڵکەوت جارێکیان بە بەرپرسیاری بەشێکی زۆری خراپەی مێژووکردی دادەنێ و جارێکیشیان بایەخی پێ نادات بە کەف و پووش و پەڵاشی سەر لووزەوی ماددەی حیساب دەکا.

سێیەم: هەڵوەستی دنیادۆستەکانی ناو هەرای خاچپەرستەکان لەتەک هەڵوەستی سەدان هەزار کەسی کە هیچ مەبەستی ماددییان لە هەراکەدا نەبو، بە هەموو جۆرێک و لە هەموو ڕوویێکەوە جودا دەبێتەوە بەتایبەتی لە نوختە نیگای لایەنی سوود و زەرەرەوە: هەرچی دنیادۆستەکان بوون هەنگاو بە هەنگاوی سەفەرە نەحسەکەیان بارگەیان قەبەتر و گیرفانیان پڕتردەبوو کەچی دیندۆستەکان ڕۆژ لە دوا ڕۆژ دەتوانەوە. ئەم دیمەنەی تێشکانی سەربازی دڵسۆز و قەڵەوبوونی مفتەخۆری فێڵباز نەک هەر لەو شەڕەدا بگرە لە ڕووداوی ئێستاکە و دوێنێ و پێرێش زۆر بەرچاوە.

لە کوردستانە نیمچە ئاوەدانەکەی خۆماندا چەندین ڕابەری درۆزنی چەپ و ڕاست و ناوەڕاست بە تەڵەکەبازی و لەسەر حیسابی دۆستە سافیلکە بێدەسەڵاتە دڵسۆزەکانیان گەلێک پتریان لەو سامانە چڵکنە پەیدا کرد کە لە کاتی هەژاریی خۆیاندا دەیانکردە بەڵگەی خوێنمژی نیمچە دەوڵەمەندان. بەر لە 40 ساڵ پتر کە «عونی» شاعیری کۆیی بە دەوڵەمەندەکانی ئەوسای دەگوت «تفوو لە چارەیان بێ، لە ملک و پارەیان بێ» بە خەیاڵیدا نەدەهات ڕۆژێک دێ گەلێک لە دڵسۆزەکان!! و نیشتمانپەروەرەکان!! چینپەروەرەکانمان!! ڕوویان دەدەنە بەر ئەو «تفوو»یە و نایەڵن بەرەکەتەکەی بگاتە دەموچاوی ڕەجعی! و بۆرجوازی! و دەرەبەگ - سەد جاران بەداخەوە.

ناوناوە بە پێویست دەزانم خوێنەر خەبەردار بکەمەوە لەوەی کە من هیچ نیازێکم لەو قسانەدا بۆلای پێداهەڵگوتنی دین و بانگ هێشتنی خەڵق بۆ دین ناچێتەوە: من دەمەوێ واقیع وەک هەیە بە دین و دینا و ماددی نامادددییەوە. بێتە بەر نیگای خوێنەرەوە بێ ئەوەی نیازی تایبەتی و خۆشویستن و ڕقلێبوونەوە وەیا هیچ هۆیەکی خواروخێچ تێکەڵ بەو واقیعە ببێ و ڕەنگی درۆزنی خۆی تێهەڵسوێ. لەبیرت بێ من دەمێکە باسی «Dualism - دوانەتی» و ترسەکەی دەکەم کە بیریاری ماددی بەرەو کز کردنەوەی دەوری مرۆڤ لە گۆڕانی کۆمەڵایەتیدا دەبا. هەر لەوەشەوە گەییشتمە هەڵسەنگاندنی ئەو دوانەتییەی کە جارێکی دیکە سەر هەڵدەداتەوە لەلایەنە سەلبییەکەی هۆشەوە و شەڕێکی گەورەتر بە بیریاری ماددی دەفرۆشێ. خۆ ئەوەی ڕاستی بێ من کە بە پەرۆشەوە موناقەشەی ناتەواویی لایەنە فکرییەکەی فەلسەفەی ماددی دەکەم ترسی ناتەواوی و هەڵەیی لایەنە عەمەلییەکانی پاڵم پێوە دەنێ کە لە سنووری تواناادا چی بە ڕاست بزانم بە خوێنەری کوردی بڵێم چونکە دیارە فەلسەفەیەک نەوێرێ دان بەو ڕاستییە نەزەریانەدا بهێنێ کە لەگەڵ دەقە نەزەرەیەکانی خۆی ڕێک ناکەوێ دە جاران پتر بەگژ ئەو ئەنجامە عەمەلیانەدا دێتەوە کە هەڵەی لایەنە عەمەلییەکانی خۆی ئاشکرا دەکا.

فەلسەفەی ماددیی تەقلیدی کە ترسی دوانەتی. یا هەر شتێکی دیکە بێ. لێی نەگەڕێ ڕێ بدا بە «مرۆڤ» لە جێگەی ڕەوای خۆی پاڵ بداتەوە دیارە قەت دان بەوەدا ناهێنێ کە کرێکاری سوید و دانمارک لە هی بولغاریا و مەنغۆلیا تێرتر و ئاسوودەتر و ئازادتر بێ. خۆ ئەگەر بە منگە و لە بن لێوانەوە بۆرە سەلماندنێکی ئەو ڕاستییەش بکا سەد هەنجەت و بەهانە و قسەی لووس و زرەپەندی وەها بەکار دەهێنێ کە کەمتاکورتە مافەکانی کرێکاری مەنغۆلیا لە مافە بەرفرەوانە ڕەگ داکوتاوەکانی کرێکاری فنلەندە و نەرویج پەسەندتر و مرۆڤانەتر و ڕەسەنتر نیشان بدا. هەر لەو هەڵەشیدا کە ڕاستییان خەفە دەکا ئاگاداری خۆیەتی نەهێڵێ کرێکاری مەنغۆلیا ورتەی لەبەرەوە بێ نەکا فەرمووودە موقەدەسەکانی هەڵوەشێنێتەوە و بڵێ باوکە بە خوا نە تێرترم و نە ئاسوودەتر و نە ئازادتر. سەیریش لەوەدایە کە خوێنەرێکی کورد لە بەرەو کۆتایی سەدەی بیستەمدا لە جیاتی ئەو بیریارە ماددییە دوورەوڵاتە هیچ نەسەلمێنانە ڕقی لە قسەی ئەوتۆیی هەڵستێ کە دەیەوێ کرێکاری

کورد[20] ئازادتر بێ لەوەی فەلسەفەی ماددی پێی ڕەوا دەبینێ وەیا ئەو مافانەی پێ بدرێ کە فەلسەفەکە لێی بەزیاد دەگرێ.

ئەمە دەڵێم چونکە لە نووسین و دەمودووی بەشی زۆری ئەو بەرەیەی خۆی بە چەپی کورد دادەنێ دەردەکەوێ تا چ ڕادەیەک وەتەنگ دێن لەو تەرزە قسانەی وەک هی من کە مافی ڕەخنە گرتن و ڕازینەبوون لە بیر کردنەوەی فەیلەسووفانەی ماددییەت و ناماددییەت بە گەلانی خەڵق دەدا، بۆ پتر مسۆگەر کردنی دەنگدانەوەی ویژدانی پرۆلیتاریا لە ئاست ئەو یاسا و ڕاڕەو و فەلسەفانەی پلان بۆ ژیان و گوزەران و خوێندن و... و... ی پرۆلیتاریا و غەیری ئەوانیش دادەنێن. هەر دەڵێی بەلای ئەو بەرەیەی کورد میللەت کێڵگەی ئەزموونە لەبەر دەستی ڕابەری ماددی، دیارە کێڵگەش حەقی بەدەنگ هاتنی نییە ■ جایی ڕەخنە و داوای گۆڕین.

وەک پێشتر گوتوومە نەمدیت کەسی ماددی و ناماددی هیچ حیسابێکی تایبەتیی بە بنچ و بناوان و بەردەوام بۆ دەوری سەلبیی هۆش کردبێ. ناوناوەیەک لە تەعلیلی چەندوچۆنی تاک تاکی ڕووداو و کردەوە و کەینوبەینی ئێرە و ئەوێدا باسێکی جەهل و ئەفسانە کراوە و بەحاڵ بایەخی پێ دراوە، لەوە بەولاوە هەرچی کاری سەلبییەتی هۆش هەیە بەتەواوی پشتگوێ خراوە.

یەکێک لەو حاڵوبارە دەگمەنانەی باسی نەزانی تێدا کرابێ لە ڕووداوی مێژوویی ئەو ڕەخنەیەیە کە نووسەری گەورەی مارکسیزم پلێخانۆف [من بە پیتی «پ» ئیشارەتی بۆ دەکەم] لە بیریاری مارکسیستی ئیتالیا «لابریۆلا» دەگرێ: لابریۆلا [بە «ل» ئیشارەتی بۆ دەکەم] لە ئاست دەرنەچوونی بەڵێنەکانی شۆڕشی فرەنسە «ئازادی، برایەتی، یەکسانی» بە سەرسامییەوە دەڵێ هۆی نەگەییشتنە جێی ئەو بەڵێنانە و پێچرانەوەی دروشمە نەشمیلانەکانیان هەر دەبێ «نەزانی - جهل»

[20]- لەو ڕۆژانەی مانگی کانوونی یەکەمی 1981 کە بە نووسینەکەمدا دێمەوە پاکنووسی دەکەم، «عەسکەریتاریا»ی پۆڵەندە یەخەگیری چینی کرێکار و زوربەی میللەتی پۆڵەندە بوە بەو جۆرەی قەیسەرەکان یەخەگیریان دەبوون، بەهانەشی توهمە ڕەجاڵەکەی موفلیسەکەی شوێن پرۆپاگاندەی ئیستیعمار کەوتنە. دەبوو حکومەتەکە خۆی تاوانبار بکا بە قەرزداربوونی پتر لە 20 هەزار ملیۆن دۆلار لای بانکەکانی ئیستیعمار.

بووبێ. وەک دەبینی «ل» لە گۆشەی بەرتەسکەوە سەیری کاریگەریی نەزانی دەکا بێ ئەوەی بیداتەوە بە تەکوینی هۆش وەیا فەرقی نەزانیی بێتەجرەبەیی و نەزانیی لایەنی تاریکی هۆش بکا، کە ئەمە وەها بێ چاوەڕوان ناکرێ «ل» کاریگەریی زاتی [یا هەر نەڵێم رووی سەلبیی هۆش] بە ماکێکی هەمیشەیی رەفتاری تاک و گەل دابنێ. «پ» ئەم رایەی «ل» بەتەواوی نابوود دەکا و هیچ بایەخی پێ نادا و وەهای هەڵدەگێڕێتەوە کە نەزانینەکە بە زانین دادەنێ. ئەمەش لێکدانەوەکەی «پ» ـە کە رایەکەی «ل» ی پێ دەشکێنێتەوە.

لەبارەی نەزانین «جهل»ـەوە «پ» وردەکارییەک دێنێتە پێشەوە کە لە بنەڕەتدا نەزانین دەکا بە دوو جۆر. جۆری یەکەم نەزانینی ئەو راستییانەی کە گۆڕانیان بەسەردا نایێ وەک فەلەک و ئاتۆم و فیزیا و کیمیا... و سروشت بە تێکڕایی. کە لە ئەزەلەوە بۆ ئەبەد بێ گۆڕان سەرەولێژ دەبنەوە. لێرەدا بەپێی «پ» نەزانینی ئەو تەرزە راستییانە سیفەتی «مطلق»ی دەبێ، واتە ئەوەی نەیزانێ نەزانی تەواوە، هەر نەزانیش دەبێ لەو بابەتانەدا هەتا لێیان بەڵەد دەبێ. تۆ کە نەزانیت دوو گۆشەی ستوونی دەکەن 180 پلە لەوەدا نەزانی موتلەق دەبیت، دوێنێ و هەزار ساڵی دیکەش یەکێک ئەمە نەزانێ هەر بە موتلەقی نەزان دەبێ چونکە نەزانینەکە بەند نییە بە جێگە و کاتەوە. موتلەقە... رەهایە.

جۆری دوەم نەزانینی ئەو راستی و رووداو و بەسەرهاتانەیە کە لە گۆڕان و زیاد و کەم کردندان و لە جێگەیەکەوە بۆ جێگەیەک دەچنە باری جوداوە. لێرەدا مەبەست کۆمەڵایەتییە بە یاساکان و پێداویستەکان و رووداوەکانیانەوە کە بەلای «پ»ـەوە ناشێ مرۆڤی سەردەمێک بڕیاری نەزانی سەردەمێک بدات لە رێی بەکارهێنانی کێشانە و پێوانەی خۆیەوە: رۆژگاری رابردوو دەبێ بە گەز و گرێی خۆی بپێورێ نەک هی رۆژگارێکی دواتر. کەواتە «ل» مافی ئەوەی نییە لە شێتایی و بە دواکاتەوە شۆڕشی فرەنسە بە «نەزانی» تاوانبار بکا چونکە دەبێ رووداوەکانی شۆڕشەکە و هەڵوەستی سوارچاکەکانی و جموجووڵی جەماوەرەکانی بخرێنە بەر تیشکی ئەو واقیعەی کە تێیدا رووی داوە ئنجا بڕیار بدرێ ئاخۆ هێوێنی رەنگی غاڵبی شۆڕشەکە تاریکایی و نەزانی بوو یا رووناکی و زانین. ئایا مومکین

بوو شۆڕشەکە ڕێکتر و ژیرتر و زاناتربێ لەوەی هەبوو تا بزانین تەنگوچەڵەمەکانی لە نەزانینەوە بوو یان نا.

هەرچی «ل»ـە سەرسوڕمانی توش دێ لەو جوداوازییەی کە هەستی پێ دەکرێ لە نێوان دروشمە سەرەتاییەکانی «برایەتی و یەکسانی و ئازادی» لەگەڵ ئەو هەموو ئەنجامە سەرەوبنانە کە ڕووباری خوێنی شۆڕشگێڕانی لە سەرانسەری فرەنسەدا هەڵڕشت و هەزاران بێتاوانی بە پەتەوە کرد. برایەتی و براکوژی کوجا مەرحەبا؟ ئازادی لە کوێ و هەڵواسینی ئازادیخواز لە کوێ؟ کوانێ یەکسانی لە جەلادبوونی هەندێکیان و قوربانیبوونی هەندێکیان؟ هەرچی «ل»ە وەرامی سەرسوڕمانی خۆی بەوەدا دەداتەوە کە دەڵێ «نەزانی» ئەو کارەساتانەی لێ کەوتۆتەوە ناشزانین «ل» ▪ وەرامێکی دەبێ بەرانبەر پرسیارێکی لێی بکرێ و بڵێ ئەگەر شۆڕشی فرەنسە وەها نەزان بوو تا ئەوەی خۆی بە پەتەوە بکا ئەدی چۆن توانی ڕێژیمێکی ڕەگداکوتاوی پاشایی و فیۆدال و کەنیشتە لە ڕیشەوە دەرکێشێت و بشبێتە مەشخەڵی شۆڕشگێڕایەتی لە سەرانسەری جیهانی سەدەی نۆزدەم و دواتریش.

چی لە قسەکانی «ل» بە ئێمە گەییشتوە هەر ئەوەیە کە «پ» لێی دەگێڕێتەوە، لە ▪ سەرچاوەیەکی دیکە درێژەی بیروڕای ئەو مرۆڤەم لە بارەی شۆڕشی فرەنسەوە نەدیتوە تاکوو بزانم بەولای تاوانی نەزانی چی دیکەی چاک و خراپی تێدا ڕەچاو کردوە. بەهەمەحاڵ «پ» ڕایەکەی «ل» دەپووچێنێتەوە و پاتەوپات دەڵێ شۆڕشەکە بە پێی سەردەمی خۆی دەیزانی چی دەوێ و چ دەکا و ئەو ئەنجامەی لێی کەوتەوە پڕ بە پێستی توانای فرەنسەی کۆتایی سەدەی هەژدەم و سەرەتای سەدەی نۆزدەم بوو، جا ئەگەر ئەنجامەکەی بە گەز و گرێی سەردەمی «ل» کە دەوری 150 ساڵێک بەدوا شۆڕشکەدا تەجرەبە و زانینی تێدا کۆبۆتەوە ئەنجامێکی ناشیانە و کەمزانانە بووبێ گوناهێکی شۆڕشەکە لەوەدا نییە، بەڵکوو سەهووی لابریۆلایە کە داوای نامومکین دەکا وەک ئەوەی یەکێک دوای 150 ساڵ لە سەردەمی «ل» بێت و بیروڕاکانی «ل» بەرانبەر واقیعی خۆی بەهەڵە دەچوێنێ لەبەر ڕۆشنایی بیروڕای بەرەوپێشتر بوویەوەی 150 ساڵ دواتردا.

شۆڕشی فرەنسە ڕووداوێکی هێندە گرنگە لە مێژووی ئادەمیزاددا سەرلەبەری بیریاری چەپ و ڕاست و ناوەندی بە خۆیەوە خەریک کردوە خەریکیشیان دەکا

هەرچەند لەوانەیشە رۆژەک بێت چەپ و راست و ناوەندی تێدا جودا نەکرێتەوە. جا ئەگەر یەکێک بیەوێ هەموو ئەو مەیدانای تێدا بکوتێتەوە کە هەزاران لێکدانەوە و پشکێنەوە و شانۆگەری و چیرۆک و هونەر تێیاندا بەگژ یەکدی دا هاتوون دەکەوێتە دەریایەکی بێکنار و سەحرایەکی بێپایان و خەونێکی بێبڕانەوە. منیش لێرەدا کارم بە تاکە داوێکی رایەڵەکانی شۆڕشی فرەنسە هەیە ئەویش دوای ئەو زانین و نەزانینەیە کە جێی جودایی فکرە لە نێوان دوو بیرکاری گەورەی فکری ماددی هەر هێندەش تێی دەئاڵێم کە بایی چوونەوەی فکرەی «نەزانی» بەلای تاریکایی سەلبییەتی هۆش بکات.

ئەنگلز، هاورێ و هاوپشکی مارکس لە فەلسەفەی ماددی، لە کتێبی *«دژی دۆهرینگ»*دا وا دادەنێ کە شۆڕشی فرەنسە هەر ئەوەندەی کرد کە مافی «شەوی بووکێنی»ی لە دەرەبەگەوە بۆ سەرمایەدار راگوێست. وەک لێتەوە دیارە ئەم رایەی ئەنگلز زۆر لە رای پلێخانۆڤ دوورە چونکە هەرگیز ناشێ بسەلمێنێ مەبەستی «پ»یش لە هاتنەدی دروشمەکانی «برایەتی... و...» هەر راگوێستنی ئەو مافە نارەوایە بوە. بەڕاستی ئەگەر گوێزانەوەی مافی بووکێنی لە یەکێکەوە بۆ مەلعوونێکی دیکە بەرهەمە بنجییەکەی شۆڕشی فرەنسە بێ دەبێ میللەتی فرنسە نەک هەر نەزان بووبێ بەڵکوو هەستی شەرەفیشی زۆر کز بووبێ.

میللەتی فرەنسە لەبەر رووناکایی قسەکەی ئەنگلز رەنجەرۆترە لەو سۆفی و دەروێشەی ژنی خۆیان بە شێخی تەریقەت رەوا دەبینن چونکە هەر نەبێ سۆفی و دەروێش نایەن لە پێناو «فەحلگۆڕی»دا گیانی خۆیان بهاوێنە خەتەرەوە وەک کە شۆڕشگێڕانی فرەنسە، بە پێی قسەکەی ئەنگلز، کردیان.

کە حاڵ وەها بێ باشتر بۆ میللەتی فرەنسە ئەوە بوو لە هەرای نێوان دەرەبەگ و بۆرجوازی کنارەگیر بن و لێیان بگەڕێن بە ئەرک و مەسرەفی خۆیان مافی شەوی بووکێنی لەیەکدی ببەنەوە. هەڵبەت من کە ئەوە دەڵێم شوێن پێی قسەکەی ئەنگلز هەڵدەگرمەوە بەرەو پەند و ئامۆژگارییەکی کە دەبێ لە قسەی ئەوتۆیی وەربگیرێ دەنا کەموزۆر بەو قسەیە رازی نیم بڵێ میللەتی فرەنسە خۆی کوشت و بری و دنیای هەژاند و لە کۆتایی دا زاوایەکی نوێی پێشکەش بە ژنەکەی کرد: نە راستە

بگوترێ بەر لە شۆڕش دەرەبەگ لە کچە تازە شوو کردوەکان بەزاوا دەبوون نە ڕاستیشە بگوترێ بۆرجوازی دوا شۆڕش جێی دەرەبەگی گرتەوە لەو کارەدا.

بەهەمەحاڵ چوونە پاڵ بووکی خەڵق وەها ئاسان نەبوە ببێتە مافێکی میراتی دەستاودەست بکات، بەڵێ دەزانین دەسەڵات و پارە زووتر نیازان دەگەیەننە جێ، بەڵام ئەمە ئێستاش ڕاستە نەک هەر لە شۆڕشی فرەنسە. لە دەوڵەتە سۆشیالیستەکانیش ڕاستە نەک هەر لە دەوڵەتی سەرمایەدار. بەدایەتی و ناپەسەندایەتیی ئەو دەسەڵاتەی کە بە بەدی لەکار دێت شتێکە و هەوڵدانی میللەتێک بۆ فەحلگۆڕانی سەر بالینگانی ژن و مێردایەتی جودایە... هەرنەیسە...

دەشێ لە ڕێی تەئویلی پێچەڵپێچ و بە دەرگە و دۆڵاب بۆرە گونجانێک لە نێوان ئەم دوو ڕایە جودایەی ئەنگلز و «پ» هەڵبەسترێ بەوەدا کە بڵێین چونکە بەلای «پ»یشەوە شۆڕشی فرەنسە هەر هێندەی پێ دەکرا دەسەڵاتی دەرەبەگ بۆ بەرەیەکی پێشڕۆتر بگوێزێتەوە، کەواتە هەرچەند تەعبیریش جودا بێ ڕایەکان لە واتادا یەکدی دەگرنەوە. لەگەڵ ئەمەشدا دەبێ بسەلمێنن ئەگەر گونجاندنەکە بکێشتەوە بۆ نزیکخستنەوەی ڕای ئەنگلز لە هی «پ» ئەوسا هەردوویان برادەرانە ڕووبەڕووی دروشمە گەشەکانی «برایەتی... و...» دەبن ئەنگلزیش تەعدیلی ڕایەکەی خۆی دەکا. ئەگەر ڕای «پ» بۆ لای ڕای ئەنگلز ببەینەوە دەبێ بابدەینەوە سەر شۆڕشی فرەنسە و بڵێین ئەو ئەنجامانەی لێی کەوتنەوە، باش و خراپ، هی لێڵی بینین و تەماویبوونی ئامانج و بێ ڕابەرایەتی و پەرتوبڵاویی ئیرادە بوون. هەر ئەم قسەیەش باشترە بۆ حورمەتی شۆڕشەکە و میللەتی فرەنسەش.

بەر لەوەی بگەڕێمەوە بۆ قسەکانی «پ» لە بارەی دوو جۆری نەزانییەوە دەمەوێ زۆر بە کورتی ڕای خۆم لە ڕادەی «زانین و نەزانی»ی شۆڕشی فرەنسە بڵێم، بەلای منەوە، لەگەڵ تێخوێندنەوەی هەموو هۆیەکانی کە شۆڕشگێڕەکانی لەیەکدی جودا دەکردەوە دیسان لە دوو نوختەی گرنگەوە جوداوازیەکەیان لە سنووری مەعقوول و بەرژەوەندی تێپەڕاند:

نوختەی یەکەم ئەوەیە، ئەگەر بسەلمێنین جوداوازیی «چین» وای دەکرد ڕیزە بنجییەکانی شۆڕش کەرت کەرت ببن ناشێ بسەلمێنن شۆڕشگێڕەکان حەقیان بوو

تا پلەی یەکدی براندنەوە و دوژمن بە خۆ خۆش کردن پێ لەسەر جوداوازیەکە داگرن. بێگومان هەر لایەنێکی شۆڕشەکە بێ، ئەگەر بۆ خاتری پاراستنی خەتی شۆڕش و مافە بنجییەکانی میللەت و بەرگری دوژمنی دەرەکی و سەلامەتی تێکڕایی بزووتنەوە وازی لەوەندە داخوازیەی هێنابایە کە دەبێتە لەمپەڕ لە پێش هەنگاوی بەرەو مەسڵەتی و برایەتی نێوان شۆڕشگێران، خۆی پتر سوودمەند دەبوو پتریش سوودی بە شۆڕش و میللەت دەگەیاند. دانتۆن و رۆبسپیر بەرەو یەکدی هاتبانایە قەت ئەوەندە خراپەی بۆ شۆڕش و بۆ خۆشیان لێ پەیدا نەدەبوو وەک ئەوەی کە یەکترکوژی پەیدا کرد. جا ئەگەر بیریارێکی باوەڕوشک خۆی لێمان بکاتە مامۆستای سوختەخانە و پێمان بڵێ: ئەی رۆڵەکانم جوداوازیی ئەو بەرژەوەندە ئابوورییانەی کە هەریەکەیان چینی نوێنەری خۆی هەبوو گەورەتر بوو لەوەی لەسەری پێک بێن، پێی دەڵێمەوە: مامۆستا، بۆچی پەرۆش بۆ جوداوازیی بەرژەوەند رەوایە رووبکاتە دۆڕاندنی بەرژەوەندەکە و رامانی دامودەزگاکەی بەسەر هەموو پارێزەرەکانیدا بەڵام رەوا نییە خاوەن بەرژەوەند بۆ پاراستنی ئامانجی گەورەتریش واز لە نەختێک بەرژەوەند بهێنێ بایی رێککەوتن و مەسڵەتی بکا؟ ئەو هۆشە کولەی کە نەیهێشت شۆڕشگێڕانی 1789-1795 رێبازێک بۆ سەلامەتیی خۆیان و شۆڕشەکەش بگرنە بەر وا ئێستا لە شوێنێکی وەک ئیتالیادا، ئەو هۆشە، وەها گەش بۆتەوە کە بۆ پاراستنی بزووتنەوە چەپ و چەپارەدانی میللەتی ئیتالیا لە خوێنڕێژی و کوێرەوەری پاڵ بە حیزبی شیووعیی ئیتالیاوە دەنێ بۆ تێکگەییشتن لەگەڵ دیمۆکراتی مەسیحی و ڤاتیکانیش.

ئەگەر حیزبی شیووعیی ئیتالیا بەسەر رێبازەکەی چەپڕۆیی و خوێناوی بێ لێکدانەوەدا بەرەو کاول کردنی ئیتالیا و لەناو چوونی خۆشیەوە رۆیشتبایە وەک کە بەرە جوداکانی شۆڕشی فەرەنسە بۆی رۆیشتن هەر هێندەی لە کیسەدا دەمایەوە کە چەند خوێنگەرمێکی بێباک و بەهەڵپە بڵێن ئەی ئافەرین شۆڕشگێرە بێفیڵەکانی ئیتالیا بۆ خۆتان و قارەمانەتیتان، مامۆستایەکی سوختەخانەش پەیدا دەبوو پێمان بڵێ: رۆڵەینە جوداوازیی بەرژەوەند چۆن رێ دەدا بە حیزبێکی شیووعی مەسڵەتی لەگەڵ دوژمنەکانی مرۆڤایەتی بکا؟ چی لە ئیتالیا رووی دا فەرمانی مێژوو بوو... ئەوەی راستی بێ زۆر جاران خەباتی گەلان خۆی بە قوربانی ئافەرینی بێبنچ و

بێنرخ کردوە و پشت لە چاکە و سوود و مەنتیقیش بەرەو هەڵدێری چەپڕۆیی ساوایانە و خەیاڵباز ڕۆیشتوە.

دەبێ ئەوەش بڵێم کە خۆ ڕزگار کردن لەو چەپڕۆییە و ناواقیعیەتە کارێکی ئاسان نییە چونکە وشەی شۆڕش بۆ خۆی، ئەگەر لە حەقیقەتی نەگەی، لەگەڵ دڵگەرمی و هەڵپەوکڵپەدا باشتر دەڕوا و بە درەنگەوە لە ڕێی لێکدانەوە و تێوەڕامان و وردبوونەوەوە تێکەڵ بە هێمنی و لەسەرەخۆیی دەبێتەوە، ئاغڵەبیش بەدوا فەلاکەتدا هەڵپەوکڵپە دەنیشێتەوە نەک لە ئەنجامی وردبینی و ژیرییەوە. گرتنەبەری ڕێی مامناوەندی جارێکی دیکەش لەوەدا دووچاری بەرهەڵست دێ کە لە سەرەتاوە دیارە ڕێیەکی بە درێژەیە، سەبر و خۆگرتن و چاوەنۆڕی دەوێ، کەچی ڕێی چەپڕۆیان بە ڕواڵەت هەر بایی بازدان لە جۆگەلە ئاو دەخایێنێ. ئنجا هەر ئامانجێکی لە ڕێی ناوەندیشەوە پێی بگەیت دەبێتە جێی هێرشی چەپڕۆیان بەوەدا کە دەڵێن ئەگەر ڕێی شۆڕشگێڕانەی تەواو گیرابایە دە ئەوەندە سوودی بە میللەت دەگەیاند، بەڵام لە حاڵەتی تێشکانی چەپڕۆیەتیدا کەس ڕێی نابێ سەرکۆنەی بکا چونکە بە زاهیر ئەو تیژڕۆییە و نەسەلماندنەی کە لە چەپڕۆییدا هەیە پاکانەی سەد لە سەد بۆ دەروێشەکانی دەکا و ڕەخنەگریش قەرزدار دەکاتەوە.

بە کورتی، چەپڕۆیی کە تێشکا عوزر و بەهانەی بێئەژماری بەدەستەوەیە، کە سەریش کەوت دە ئەوەندەی سەرکەوتنی هێمنانە بە خۆی دەنازێ. کەچی تێشکانی خەباتی ژیرانە یەکسەر بە خیانەت تاوانبار دەکرێ هەرچەند زەرەرەیشی لە تێشکانی چەپڕۆیی گەلێک کەمتر. ئەم ڕاستییە بە ئەرک و ئێشە لە خەباتی مرۆڤدا ڕووپەڕەیەکی تاریکایی لایەنی سەلبیی هۆش و زاتە، چ چارێشی دیار نییە مەگەر لەو پلەیەدا کە لزوم بە خەبات نەمێنێ، ئەو ڕۆژەش جارێ هێندە دوورە ناتوانین دڵی خۆمانی پێ خۆش بکەین بەتایبەتی ئێمەمانانی ڕۆژهەڵات کە وا تا ئێستاش تەجرەبەکانی خەباتی ئەورووپای سەدەی نۆزدەم دەکوتینەوە.

نوختە دوەم ئەوەیە، لە نێوان دەریا پڕ شەپۆلەکەی تێکهاویشتن و ئاڵۆزی و بێسەروبەری و سنووربەزاوی شۆڕشەکەدا کە وەکوو کەشتی بێساحێب لووزەوی تێکهاویشتنی بێ ڕابەری ڕاستەقینە دەیهێنا و دەیبرد، مرۆڤی دڵسۆزی تێگەیشتووی وردبین هەبوون دەیانزانی خەڵەت و ڕاستی ناو شۆڕشەکە چییە و چۆنە بەڵام

دەسەڵاتیان نەبوو بتوانن بەرهەڵستی لافاوی گومڕایی و تیژڕۆیی شۆڕشگێڕان بکەن. ئنجا ئەگەر بمانەوێ کێشانە و پێوانەی زانین و نەزانینەکەی «پ» لە شۆڕشی فەرەنسە بەکار بهێنین ڕێمان دەبێ بڵێین تەنها بەشێکی کەمی میللەتی فەرەنسە بە پێی سەردەمی شۆڕشەکە «زانا» بوون و لەگەڵ پێداویستی واقیع دەیانتوانی جووت بڕۆن. بەڵام کەس دەفتەری ئەو کەمتاکورتە هۆشیارانەیان نەخوێندەوە چونکە زوربەی شۆڕشگێڕان کە زۆر جاران لەگەڵ جەردە و باخەڵبڕ و حەرامخۆر وەها تێکەڵ دەبوون لە یەکدی جودا نەدەکرانەوە ئیتر لە بارێکدا نەدەبوون دەنگی هۆش و مەنتیق ببیەن وەیا هەڵوەست لە ئاست ڕەوا و ناڕەوادا بکەن. خوێنڕێژی وێرانکاری وەها بەری چاوی ئەو قەوغایەی دەگرت کە سەدان خەتیب و نمایشتگێڕ و زارقەڵەباڵغ و ڕقلەدڵ سات لە سات بیرەوەرییە سۆزناکەکانی سەردەمی پێش شۆڕشیان لێ بەسفتوسۆتر دەهێنانەوە کە ئیتر هەموو پەندیکی ژیرانە و هێمانە و دڵسۆزانە لە هەراکەدا بە خیانەتی ڕووت دەژمێردرا، لەوە هەر بگەڕێ کە فێرگە سیاسییە جوداکان و ئەو بەرژەوەندەی دەیانپاراست بایی مستەحیلبوونی ڕێککەوتنی خەڵقەکە ڕیزی شۆڕشگێرەکانی لەیەکدی ترازاندبوو.

ئەو هەموو قۆڵ و باسکانەی کە وەک لکوپۆپی دارستان و بە کوتەک و تیغەوە هەڵبڕابوون تەنها ئامۆژگاری بکوژە ببڕەیان جێبەجێ دەکرد با بەسەر گەردەن و پشتی ڕۆڵە هەرە دڵسۆزەکانی فرەنسەشدا هاتبانایە خوارێ. ئەم تەرزە دیمەنەی هەڵپەوکڵپەی چاونووساو و دڵداخراو کە هەر دەبێتە تیژکەرەوەی چەمبۆڵە و ددان هەرگیز ناتوانێ قسەی پەندامێز و لێکدانەوەی ژیرانە ببیەت، من و تۆش لە دەوروبەری خۆماندا دیمەنی وەهامان دیتوە و تەجرەبە تاڵەکەی بگرە ببەستەمان چێشتوە و دەزانین چۆن لەو تەرزە بارەدا هەرچی هۆش و ژیری و بەرژەوەندی دروست هەیە خامۆش دەبێ بۆ نەعرەتەی خوێنکوڵاو و دەمارکشت و دەروون ئاگرینەکان.

کەواتە، وەک من بۆی دەچم، شۆڕشی فرەنسە بە تێکڕایی لە پێداویستی قۆناخی خۆی بەڵەد نەبوو تاکوو بزانێ چ جۆرە پلانێک لەو هەرایەدا بەکار بێ. سەرلەبەری کارەساتەکە هەڵچوونێکی تێکڕایی عفوی بوو پتر لەوەی بزووتنەوەیەکی بە پلان و

رابەر بێ، گەورەترین بەڵگەی ئەم قسەیەش کە بەر لە منیش گوتوویانە، لەیەک نەچوونی دروشمە شیرنەکانی «برایەتی... و...» بوو لەگەڵ دڕندەییەکی بەرەی شۆڕشگێڕان لە نێوان خۆیانیان بەکار دەهێنا لە زۆر سەریشەوە دڕندەییەکەی ناوخۆیی دیمەنێکی ڕەجاڵی ڕامالدانی رابەرەکان بوو لەلایەن غەڵبەغەڵبی قەوغاوە. هەڵبەت من ناڵێم دەبێ شۆڕش هێندەی یاری فووتبۆڵ و سەیرانی بەهاران و نوێژەبارانە لەسەرەخۆ و ڕێکوپێک بێ چونکە دەزانم لەسەرەخۆیی و بێهەرایی لە راوەبەرازیشدا مومکین نییە، بەڵام بێگومان هەروەک راوەبەراز دەبێتە تازیمانە ئەگەر بەقەدەر بەرازان راوکەری تێدا کوژرا هەروەهاش شۆڕش لە سیفەتی زانین و تەدبیر و ڕێکی دەشۆرێ کە ژمارەی شۆڕشگێڕی کوژراو بەدەستی شۆڕشگێڕی وەک خۆیەوە پتر بوو لەوەی دوژمن کوشتوونی.

کە دروشمەکانی «برایەتی...» هەر ئەوەندەیان لێ کەوتبێتەوە کە بیریارێکی وەک ئەنگلز ناوی لێ بنێ «گوێستنەوەی مافی شەوی بووکێنی» دیارە هەڵگری ئەو دروشمانە نە زانیوەتی چ دەکا نە زانیوەتی چۆن دەکا. جا ئەگەر پێم بڵێنیتەوە وەک پێشتر خۆشم گوتم شۆڕشی فەرەنسە بەهەمەحاڵ توانی ڕێژیمی دەرەبەگ بگۆڕێ بە سەرمایەدار لێت داوا دەکەم بە وردی تێبفکریت ئایا گۆڕانی ڕێژیمەکە بە هۆی ژیری و برایەتی و پلانی دروستەوە بوو یاخود ئەنجامی فرتەنەیەک بوو کە هەموو شتە چاکانەی تێدا خەفە کرابوو؟ ئنجا دەبێ لەبیرمان بێ شۆڕشەکە پاشایەتیەکی دڕندەتری لێ کەوتەوە.

بەلای منەوە هەروەک لە شۆڕشی فەرەنسەدا کەمتاکورتێکی مرۆڤی ژیر و دڵسۆز دەیانزانی ئامانج و پلانی واقیعی لەو پلەیەدا چییە لە زۆر شۆڕشی دیکەشدا تەنها بەشێکی کەمی شۆڕشگێڕان و رابەران هۆشیان بە حەقیقەتی حاڵ و پێداویستی هەڵکەوت و هەڵوەست شکاوە بەڵام ئەوانیش نەیانتوانیوە لغاو بهاوێژنە زاری چەپڕۆیی و پەرگیری و تیژدابڕینەوە، تەنانەت نەشیانوێراوە بە ئاشکرا ڕەخنە لە ڕەوتە چەپڕۆکەی شۆڕش بگرن لە ترسی توهمەی ترسنۆکی و بڕوا بە شۆڕش نەهێنان و تەرزە توانجە بێبنج و بێبنەمایانە. ئەگەر کەس هەبێ بڵێ ڕووداوی وەها لە شۆڕشدا بە هەموو جۆش و تەقینەوەیەوە شتی حەتمی و ناچارییە، لە وەرامدا دەڵێم بایی ئەوەی پێی دەگوترێ حەتمی و ناچاری چاوی لێ دەپۆشرێ وەک کە

چاو دەپۆشرێ لەو ئازار و خوێن لەبەرڕۆییشتنەی عەمەلیەتی برینکاری داوای دەکا، بەڵام کە شێواوی کێشایەوە بۆ وێرانکاری ئەوسا دەبێتە ئاکامی حەتمی و ناچاری ئەو نەفسە بەد و ناپەسەندانەی حەز لە شێواوی دەکەن نەک ئەو حەتمی و ناچارییەی کە گۆڕانی کۆمەڵایەتی و مێژوویی پەکی لەسەر دەکەوێ.

دەزانم بەرخ سەربڕین شتێکی ناچارییە و گلەیی لە قەساب ناکرێ کە بە چەقۆی تیژ لە گەردەنی بەرخەکە دەدا، بەڵام کە هات و لەشی بەرخەکەی بە دەمی تیغ شەقاڵ شەقاڵ کرد و ورگەکەی هەڵدڕی و دونگەکەی کەرتوپەرت کرد و دەست و قاچەکانی وردوخاش کردن لەوە دەردەچێ فەرمانێکی ناچاری جێبەجێ کردبێ چونکە لەو پەلپەل کردنە بێلزومەدا دیارە مەیلێکی «سادیزم»ی نەفسی خۆی دابین دەکا. هەڵپە و جۆشان و خرۆشان و کوشتن و برینی لەحەد بەدەریش هەر دەکێشێتەوە بۆ مەیلی سادیزم وەیا دەردێکی نەفسی وەک ئەو. با بە ناوی شۆڕشەوە وەیا دینەوە بکرێ. ئەم تیژڕۆییە کە لە یەکەم هەنگاوەوە کارێکی بەد و وێرانکەرە دوای بەسەر چوونیشی دەبێتە مەعشووقەی ئەو کەسانەی حەز لە خوێنڕێژی و شێلان و وێران کردن دەکەن. واش دەبێ پێدا هەڵگوتنی تیژڕۆیی تێکەڵ بە ئەدەبی سیاسی دەبێت و ویژدانی هەزاران گەنجی شلکی بێ تەجرەبە لێڵ دەکا و بەرەو عیشقی توندوتیژییەوەیان دەبات.

جارێکیان لە دەمی غەڵبەغەڵبەکەی ساڵی 1959 لە قەسیدەیەکی شۆڕشگێڕانە ئەمەم خوێندەوە: «وسنجعل من جماجمهم منافض للسجائر» [قەپێلکی سەریان دەکەینە تەپڵەکە جگەرە]، منیش بێ چاوەدێری کێش و قافیە ئەمەم خستە سەر بەیتەکەوە: «ومن أمعائهم خراطيم نرگيله» [ڕیخۆڵەکانیشیان بە مارپێچی نەرگەلە]. جگەرە و نەرگەلەکێشانی شۆڕشگێڕانە وەها نەبێ بە کەڵکی چی دێ؟ بەڵام لێرەدا تێبینییەکی گرنگ هەیە لە بارەی تیژڕۆیی شۆڕشی فرەنسەوە دەبێ لەبیر نەکرێ: ئەو تیژڕۆییە هەر ئەوەندەی پیاوەتی کرد کە خۆی کوژاندەوە بێ ئەوەی بگاتە حوکم، نەخۆ فرەنسە هەتا ئێستاش بەناوی شۆڕشی دائیمیەوە نەدەحەسایەوە. تۆ سەیری ئەو مەزهەبە دینییانەی کە لە سەرەتاوە بە پەرگیری و ڕیزپەڕی دەستیان پێکردوە چۆن هەتا هەناسەی لەبەرەوە بێ هەر بەسەر ڕارەوی ڕەق و کۆسپدا

دەڕوا، لەمەشدا وەک بڵێی شۆڕش و مەزهەبی دینی تیژڕۆ و پەڕگیری سروشتی خۆیان زاوزێ دەکەن هەتا دەبڕێنەوە.

خوێنەر ڕێی هەیە لێم بپرسێ ئایا ئەگەر حاڵی تیژڕۆیی وەها بێدەرمان بێ چی دەمێنێتەوە بگوترێ لەوە بەولاوە کە شۆڕش کارێکی نارەوایە؟ لە ئاست ئەم پرسیارەدا وەرامی ڕێکوپێک هەیە بەڵام لە پێشەوە دوو تێبینی دەردەبڕم وەک پەراوێز بەدەوری بابەتەوە:

1. بەر لەوەی گلەیی لە شۆڕشگێڕی بە هەڵپە بکەین دەبێ ئەو ستەمکارانە سەرشکێن بکەی کە شۆڕش دەکەنە کارێکی ناچاری و تاکە ڕێگەی ڕزگاربوون لە ستەم.
2. بەزۆری ئەوەی لە بارەی شۆڕشەوە نووسیویانە گوتوویانە ئەگەر ناچاری نەبێ شۆڕش وەها خۆش نییە خەڵق بەرەو پیریەوە بچێ.

من ناڵێم و نەمگوتوە هەرچی شۆڕشێک و بزووتنەوەیەکی کۆمەڵایەتیی دژی ستەم هەیە پابەندی تیژڕۆیی و بەرەڵایی و پەڕگیرییە. بە نموونە شۆڕشی چین بە سەرۆکایەتیی پارتی شیووعی لە سەرەتاوە تا چەند ساڵێکیش دوای سەرکەوتنی هەر دەتگوت بە بڕیاری هۆشی ئەلیکترۆنی کە هیچ دڵگەرمی تێدا نییە کەوتۆتە گەڕ. ئەم ڕاستییە بە ڕوونی لە کتێبەکەی ئەدگار سنۆ لە ژێر سەرەناوی *«ئەستێرەی سوور بەسەر چینەوە»* کە لە 1936 لە سەردانێکی چین و شیووعییەکانی ئەوێ نووسی دەردەکەوێ.

قسەی من لێرەدا لەگەڵ شۆڕشی فرەنسەیە کە لە گۆشەنیگای زانین و نەزانینەوە لەلایەن لابریۆلا و پلیخانۆفەوە قسەی لێ کراوە. ئنجا ئەنگلیزیش جۆرە وەسفێکی کردوە داوای هەڵسەنگاندن و پێ ڕازیبوون و نەبوونێکمان لێ دەکا. لەوە بەولاوە من نەهاتووم بەراتنامە بۆ عەمەلیەتی شۆڕش دەر بکەم و وەسفێکی قەرارداده بۆ شۆڕشێک دابنێم. هەروەک شۆڕش هەیە پڕە لە هەڵە و دڵگەرمی و ناکاملی هەروەها زەرف و باری وەهاش هەیە ئەگەر شۆڕشی تێدا بەرپا نەبێ وەک ئەوەیە میوەی گەییشتوو بەسەر درەختەوە وشک بێتەوە و کەس دەستی بۆ درێژ نەکا.

[هەڵوەستی لینین و ترۆتسکی و پێ داگرتنیان لەسەر گۆڕینی ڕووی شۆڕشی 1917 بەرەو کۆمیونیزم نموونەی هەرە مەشووری ئەم ڕاستییە].

هەندێ جاریش وەها ڕێک دەکەوێ کە ئەگەر هەڵپە و زێدە بزێوی و تیژڕۆیی دەستەیەکی لەخۆبووردوان نەبێ بورکانی شۆڕش ناتەقێتەوە وەک ئەوەی کە ئەگەر پروشکەیەک بە تیزکەی تۆپەوە نەنێیت تۆپەکە بارتەقای برکەدار دەبێ هەرچەند هەموو کەرستەی تەقینیشی حازر بێ. حاڵوباری شۆڕش شتێک نییە بە خەیاڵ ڕەنگرێژ بکرێ.

ئەو ڕەخنە و تێبینییانەی کە من لێرەدا بەرەوپیری شۆڕش فرەنسەیانەوە دەبەم بە سەرنج گرتن لە ڕاستییەکی زۆر گرنگ و ئاشکرا، لە قەناعەتی خوێنەر باشتر جێی خۆیان دەکەنەوە:

شۆڕشی فرەنسە کە لە خۆوە بێ حیزبی ڕابەری دەسەڵاتدار و بێ سەرۆکایەتیی سەلمێندراو تەقییەوە و سەرلەبەری میللەتی فرەنسەی بە گژ کەنیشتە و دەرەبەگدا هێنا زۆر بەخێرایی توانی ئەو چینە چەوسێنەرەوەیە بێدەسەڵات بکا بەمەشدا ماوەیەکی یەکجار بەرینی بڕی و هەنگاوە هەرە گرنگەکەی هەڵێنا ئنجا بەگژ خۆیدا هاتوە و ئەوەی بە خۆی کرد کە دوژمنەکانی پێیان نەکرد. قسە مەشوورەکەی لینین کە دوابەدوای سەرکەوتنی شۆڕشی ئۆکتۆبەر هەلومەرجی سەرکەوتنی شۆڕش باس دەکا و دەڵێ: بۆ سەرکەوتنی شۆڕش دەبێ ڕووداوێک بقەومێ هەم میللەت بگەیەنێتە شۆڕش هەم دەسەڵاتی حکومەتیش بەرەژێر بهێنێ بۆ پلەی خۆڕانەگرتن ئا ئەم قسەیە بە خۆی و بڕیارە مەنتیقیەکەیەوە لە شۆڕشی فرەنسە بەڕاست دەگەڕێ: شۆڕش بەرپا بوو، دەسەڵاتی حکومەتیش وشکایی هات، فیودالیش ڕما بەڵام شۆڕشەکە نەیتوانی جڵەوی کۆمەڵایەتیی جۆشاو و خرۆشاو بگرێ و بەرەو ڕێی ڕاست و هەمواری لێ بخوڕێ.

بێگومان ئەم ڕاستییەی نەبوونی ڕەوتی ڕێکوپێک لە شۆڕشی فرەنسەدا یەکسەر دەگەڕێتەوە بۆ نەبوونی سەرۆکایەتیی یەکگرتوو و یەکئیرادە، ئیتر هۆی نەبوونی ئەو سەرۆکایەتییە هەرچی بێ. دەتوانم بڵێم، خەڵقی دیکەش گوتوویانە، سەرۆکایەتیی لینین و یەک دوو هاوڕێی هەلومەرجی سەرکەوتنی شۆڕشی

بۆلشەڤیکی لە ڕووسیادا خەلق کرد نەک دۆزیەوە. هەروەک مۆسیقاری پسپۆڕ بە لەراندنەوەی ژێیەکانی ژێر پەنجەی ڕەنگینی دڵ و دەروونی گوێگرەکانی بهەژێنێ، بشزانێ یەک دوو هەڵەی بچووک لەسەری پەنجەکانیاوە سیحرەکەی بەتاڵ دەکاتەوە، هەروەهاش لینین و هاورێکانی زۆر شارەزایانە لەسەر تەلە هەرە کشتەکانی نەفس و ویژدانی میلۆنەها مەزلووم و ڕووت و برسی و شەڕدۆڕاندوو لە ڕووسیای ئەوسادا پەنجە ماهیرەکانیان بە ئاهەنگ دەهێنا و دەبرد. دەتوانم بڵێم ئەگەر ئەو مەهارەتە و ئیرادەیەی کە لە سەرۆکایەتیی لینین هەبوو لە هەر بەشێکی ڕابەری شۆڕشی فەرەنسەدا هەبوایە دەیتوانی شۆڕشەکە بە ڕێگەیەکدا ببات کە بەرەو ئامانجەکانی میللەتی فەرەنسەوە بڕوات.

تۆ سەیری، چۆن ناپلیۆن کە تاکێکی دەرەوەی شۆڕشیش بوو توانی ئەو دەورە لە ڕابەریدا ببینێ کە هیچ بەرەیەکی شۆڕشەکە نەیتوانی ببینێ، ئنجا هێندەش سەرکەوتووبێ بە ماوەیەکی کورت میللەتی فەرەنسەی کردەوە ئەوە شاپەرستەی کە نەتدەگوت تازەبەتازە شایە میراتیەکەی کوشتوە. تۆ سەرنج بگرە زەرەفی ماددی [لە شۆڕشی فەرەنسەدا هەمووی دەسکردی مرۆڤ بوو] چەند ئامادەیە بۆ ئەوەی زاتی بە زیپک و هێز و پێز و بە ئیرادە تا سنووری نامومکین واقیع بجمێنێ و بە پێی مەهارەتی خۆی بی ڕەقسێنێ.

قسە لە بارەی شۆڕش بە گشتی و شۆڕشی فەرەنسە بەتایبەتی کۆتایی هەڵناگرێ و هەزار و یەک لکی لێ دەبێتەوە هەمووشی ڕەخنە و نرخاندن هەڵدەگرێ، واشدەزانم چی لەم ڕووپەڕانەدا گوترا بایی ئەوە دەکا جۆری بۆچوونی من لە باسەکەدا دەربخات و بشبێتە عەیارەی ئەو لاباسانەی لێی نەدواوم.

ئێستا دەگەڕێمەوە بۆ نرخاندنی بیروڕاکەی پلیخانۆڤ دەربارەی جۆری «نەزانی» کە ناوی نا «مطلق» و «نسبي» بە پێی ئیمکانی گۆڕان و نەگۆڕانی بابەتە نەزانراوەکە تا ئەگەر بابەتەکە گۆڕانی تێدا نەبوو نەزانینی مطلق دەبێ ئەگەر سەربە کۆمەڵاتیش بوو کەوا لە گۆڕاندایە نەزانینەکە نیسبی دەبێ. بەهەمەحاڵ نەک عەیارەی زانین و نەزانین بەڵکوو سەرلەبەری کۆمەڵایەتی لە ڕۆژگارێکەوە بۆ ڕۆژەگارێک ناناسرێتەوە. بەڵام بەر لەوەی بکەومە سەر نرخاندنەکە دەبێ لە ڕووی

بەراورد کردنی ڕایەکەی «پ» لەگەڵ بۆچوونی خۆم یەک دوو تێبینی سەرەتایی ڕوون بکەمەوە:

یەکەم: هەرچەند قسەکانی «پ» دەوری شۆڕشی فەرەنسە دەدەن کە بزووتنەوەیەکی گشتیی میللەتی فەرەنسەیە و هی تاکە مرۆڤ نییە، هەمیسان پێیەوە دیارە کە بەلای ئەوەوە زانین و نەزانینی تاک گرنگ نییە و ئەوە ناهێنێ بیریار و فەیلەسووفی پێوە خەریک بێ، واشدەزانم ئەم بایەخ نەدانەی بە زانین و نەزانینی تاک ڕاستەوخۆ لە قەناعەتە ماددییەکەیەوە هەڵدەقوڵێ کە یەکێک لە ئەنجامە حەتمییەکانی کز کردنەوەی دەوری تاکە لە مێژوودا.

دوەم: وەک دەبینیت «پ» زۆروکەم بەلای دەوری سەلبیی هۆشدا نەچوە، فەرقی نێوان نەزانینی بێ تەجرەبەیی و نەزانینی گومڕایی [ئەفسانە- ڕووی تاریکی هۆش] یش ناکا، بگرە «نەزانیی کۆمەڵ» هەر بە جارێ پشت گوێ دەخات، ئەوپەڕەکەی نەزانییەکی نیسبی وەپاڵ دەدات کە لە دەمی خۆیدا زانین بوە.

لێرەدا هەلی قسەیەک هاتوە بەسەریدا باز نادەم: تاک بنەمای کۆمەڵە نەک بە پێچەوانە. هەبوونی کۆمەڵ بریتییە لە هەبوونی چەندین تاک بەیەکەوە، واتە بێ تاک کۆمەڵ پەیدا نابێ بەڵام دەشێ تاک وەیا تاکە خێزان هەبێ و کۆمەڵایەتی «کۆمەڵ» نەبێ. لە سروشتدا دیمەنەکە بە عەکسەوەیە بە نموونە، خۆڵ، هەوا، بەرد، ئاو... سەرلەبەرن کە بتەوێ تاکی لێ پەیدا کەیت دەبێ لێی دابڕیت هەرچەند سەرلەبەرکە و دابڕاوەکە فەرقێک لە نێوانیاندا پەیدا نابێ وەک کە تاکی مرۆڤ جودایە لە کۆمەڵایەتی. دیاردەی «سەرلەبەرایەتی» کە لە سروشتدا هەیە لە جغزی گیانلەبەراندا دەگۆڕێ چونکە هەر تاکێکی هەبوونی سەربەخۆی هەیە...

ئەمە دەڵێم مەبەستیشم نییە لە نرخی کۆمەڵی مرۆڤ دابشکێنم، دەشزانم تاکی تەنها ئەگەر عەنتەری ئەفسانانیش بێ نە هەڵ دەکات و نە پێشیش دەکەوێ، بەڵام دەبێ بزانین لەلایەن هەبوونەوە پەیدابوونی کۆمەڵ بەندە بە هەبوونی تاکەکانیەوە. لەلایەن پێک هاتنی «کۆمەڵایەتی» شەوە دەبێ دان بەوەدا بهێنین کە کۆمەڵ مەوجوودێکی خەیاڵی و تریفەیی نییە لە دەرەوەی وجوودی تاکەکانیەوە هەبوونی خۆی ڕاببوێرێ وەیا بەولای فام و تێگەییشتنی تاکەکانیەوە «کۆمەڵایەتی» خۆی

بەسەر ببا، خۆ ئەگەر لەبەر تیشکی خەباتی چینایەتیدا کۆمەڵ بڕبڕ بکەین بۆ چەند چینێک و تیرێژێک ئەوساش هەر چینە و تیرێژەی بریتی دەبێ لەو تاکانەی بار و ڕێکاریی ژیانیان لە یەکدی نزیکە، لەم حیسابەدا ئەگەر وەها ڕابنوێنین کە هەموو تاکەکانی کۆمەڵ بەقەدەر مریشکی مەکینە وەیا بەرهەمی فابریقە یەک چوونن دیسانەوە کۆمەڵ هەر بریتی دەبێ لە تێکڕای تاکەکانی وەک هێشووی ترێ بریتی دەبێ لە تێکڕای دەنکەکانی.

ناڕەزامەندیی کۆمەڵ وەیا زوربەی کۆمەڵ کە سەر دەکێشێتەوە بۆ شۆڕش بریتییە لە ناڕەزامەندی زوربەی تاکەکانی هەرچەند لە ئاپۆرەی کۆمەڵدا چەخماخە و هێز و تەوژمێک پەیدا دەبێ کە ئیمکان نییە لە ناڕەزامەندی تاک پەیدا ببێ لەمەشدا چ سەیروسەمەرە و سەرسوڕمان لزومی نییە چونکە نەک تەنها شۆڕش بەڵکوو هەموو چالاکی و کردارەکی کۆمەڵایەتی هەیە شێوەیەکی وەها پەیدا دەکا کە لە چالاکیی تاکدا نادیترێ، تەنانەت سەپانی دەغڵ لە هەرەوەزی دۆستانەدا بڕشتێک پەیدا دەکا دروێنەی عادەتیدا بەخۆیەوە نابینێ وەیا ئەو گەنجەی دەتوانێ لە شایی ڕەشبەڵەکدا چەندین سەعات لە دەست «دۆ»ی[21] شلکدا هەڵپەڕێ ناتوانێ چاریەکی ئەوەش لە هەڵپەڕکێی تەنهادا بەردەوام بێ.

لەگەڵ ئەمەشدا دەبێ بڵێم مرۆڤ لە هەرا و بگرەبەردەدا پتر تاو دەگرێ نەک لە کاری عادەتیی دروست کردن و کەیف و هەرەوەزدا، خۆ ئەو تاکانەی حەز لە هەراومەزاد دەکەن لە ئاژاوەدا وەها دەکەونە گەڕ دەڵێی وەک پاتری لەلاوە بە مەکینە هێزی بزۆزی و نەسرەوتن و نەخەوتن و نەوەستانیان تێدەکرێ. ئەو تەرزە کەسانە لەلایەن نەسرەوتن و کۆڵ نەدانەوە قیاسیان لەو مرۆڤ خاسانە ناکرێ کە زۆر حەز بە چاکە دەکەن: پیاوی چاکەخواز گەلێک زووتر ماندوو دەبێ لەو کەسەی نەفسەکەی پاڵی پێوە دەنێ بەرەو خراپە و هەڕوگێف.

وا بزانم پاشماوەی غەریزەی جانەوەری لە مرۆڤدا کە بەخەبەر دێ و پەت دەپسێنێ ئەو زێدە تین و تاوەی تێدا بەڕەڵڵا دەکات و خێرا بەرەو کاری بەدی لێ دەخوڕێ.

---

[21]- ئەو ئافرەتەی لە دەستی پیاو هەڵپەڕکێ دەکا پێی دەڵێن «دۆ» وشەکە لە «دۆت- بە واتای کیژ - دختر، Daughter» ەوە هاتوە، چ پێوەندی بە «دۆ» یان «ماستاو» ەوە نییە.

ئەمە لە لایێکەوە، لە لایەکی دیکەشەوە هەرچی چاکەیە بریتییە لە ئەرک و بەخشین کەچی دامرکاندنی حەز و شەهوەت و دەست بەسەردا گرتن و لەزەت بردن و شتی ئەوتۆیی کە لەسەر حیسابی غەیر تەواو دەبێ ئەرکەکەشی بەشێکە لە پێکهێنانی ئارەزۆ. وا دەزانم هەرچی تێژڕۆیی بێ بە عادەت پشت لە مرۆڤایەتییە، بەڵام پێویستە لەسەر ئەو لایەنەی بەری تێژڕۆیی وێرانکەر دەگرێ بۆ خۆشی تێژڕۆ بێ دەنا زوو کزڵ دەدا.

بەهەمەحاڵ دەماری غەریزەی جانەوەری تا ئێستاش لە مرۆڤدا بە فرکەیە و دەبێ لە هەموو مامڵەتی کۆمەڵایەتیی گشتیدا تێبخوێندرێتەوە نەکا ئارەزۆی تایبەتی زاڵ بێ بەسەر بەرژەوەندی کۆمەڵدا. ئەم دەمارەی جانەوەری لە سەدی سەد بابەتی زاتە. لە غەلەبە کردنی دەماری جانەوەری وێنەیەکت بە بیر دەهێنمەوە: ڕۆژی دوای کوژرانی «نوري سعيد» لە 16 وەیا 17ی تەمووزی 1958 کۆمەڵەک خەڵق تەرمەکەیان لە قەبر دەرهێنا و بە قرچەی گەرمای نیوەڕۆی چلەی هاوین ئەم تەرمە بریندارە بێن تێکەڕاوەیان بە کووچە و شەقاماندا ڕادەکێشا تا دەبوورانەوە... ئەوسا گوتم گەنجێکی خورتی بیست ساڵەیی کچێکی جوانی خۆش بوێ، ناتوانی بۆ ماوەی دوو سەعات لەگەڵیدا لەو گەرمایە پیاسە بکا. هەمان کەسانی کەلاشەکەیان ڕادەکێشا ڕازی نەدەبوون بۆ ماوەی یەک سەعات بە خۆڕایی کاری خێر بکەن...

**موناقەشەی رایەکەی «پ»**

هەست کردن بە جودایی نێوان شتی گۆڕاو و وەستاو لە نوختە نەزەری «مطلق و نسبي»بوونی زانین و نەزانینیانەوە بەڵگەی وردبینی و قووڵ داگرتن و سەرنجدان و لێکدانەوەیە، نەشمدیتوە بەر لە «پ» کەسی دیکە بۆ ئەم وردەکارییە چووبێ، بە ئاشکراش دیارە وردبوونەوەکە لە ڕووتەنی لێکدانەوەی خەیاڵی نەهاتوە وەک کە بەشێک لە فەیلەسووفەکان لێکدانەوەی بێبنگە لە جیهانێکی نامومکینی نەدیتراوی نەبوودا دەکەن و ئەنجامی مەوهوومی لێ هەڵدێنجن و دەشیکەن بە بنەمای بڕیاری زۆر گرنگ بەسەر جیهانی مەوجووددا. «پ» لەو لێکدانەوەیەدا بە واقیعەوە لکاوە چونکە وەک دەزانین دوو مەیدانی هەرە گەورەی جیهانی ماددی گۆڕان و نەگۆڕان، بزووتنەوە و وەستانە. ئنجا کە دێت نەزانین و زانینی موتلەق و نیسبی لەو دوو دیمەنە گرێ دەدا، بە پێی فکری خۆی، پێوەندییەکی مەحکەم لە نێوان فکر و ماددە هەڵدەستێنێ بەوەدا کە سیفەتی موتلەق و نیسبی زانین نەزانینەکە لە ماددە دەخوازێتەوە بۆیان.

تازەیی و بێسابیقەیی رایەکە نرخی ئاشکرای هەیە بەڵام هەردوو لایەنی موتلەقبوون و نسبیبوونی دیاردەی «نەزانی» بەو جۆرەی کە «پ» بۆی چوە ڕەخنەی بە ڕێوجێ هەڵدەگرێ:

یەکەم: لایەنی نسبیبوونی ئەو نەزانینەی دەدرێتە پاڵ شۆڕشی فرەنسە: نەختێک لێرە بە پێشەوە گوتم بەشێکی کەمی دڵسۆزانی شۆڕشەکە دەیانزانی پێداوستی شۆڕش چییە و ئامانجی دەبێ چی بێ، لەوە بەولاوە ئاپۆرەی خەڵقەکە لە جموجووڵێکی ئالەتی وەک پەندۆڵی سەعات بە پێی تانووت و نەعرەتەی دڵگەرمەکان جۆلانەیان دەکرد هەر ساتەش کە باری تەرازووی لایەنێک دادەلەنگا بێ ئەوەی بزانن زەرەریانە یا قازانج بەردەبارانیان دەکرد. لەوانە بوو ڕۆژی شەمۆ میسۆ «X» ببرێ بۆ ئاسمان ڕۆژی جومعەش لەسەری بدرێ. جا ئەگەر ئەم تەقلە لێدانە بەڵگەی زانینی نسبی بێ لە کوێ بەڵگەی «نەزانیی مطلق» بێنمەوە؟

دوەم: بەلامەوە دیارە «پ» کە کاغەزی سپی بۆ شۆڕشی فرەنسە ئیمزا دەکا لە هەڵوەستێکی زاتیی خەستوخۆڵەوە مەسەلەکە هەڵدەسەنگێنێ و بە چاکە بۆی

دادەبڕێ. وا پێدەچێ تەمومژی قودسییەتی کۆنایەتی و لایەنی «مێژوویبوون»ی شۆڕشی فرەنسە خەرمانەیەکی پیرۆزی پاکی و ڕەوایی و «زانایی!» بەزیادەوە تێوەرپێچاوە و ناتەواویەکانی لەبەر چاوی «پ» دا شاردۆتەوە وەیا هەر نەبێ سەرپۆشێکی وەهای بەسەردا داون کە نەهێڵێ خۆیان بنوێنن، لەمەشدا بەڵگەیەکم بەدەستەوەیە باوەڕ ناکەم لێم هەڵبوەشێتەوە چونکە وەک بۆت دەردەکەوێ بەڵگەکە لە کردەوەی «پ» خۆیەوە ڕووبەڕووی دەبێتەوە نەک لە لاوە بەرەنگاری دەکرێ. بەڵگەکەش ئەمەیە: ئەگەر قودسییەتی کۆنینەیی و مێژوویی لەبەرچاوی «پ» دا نەبووبایە سەرپۆش بۆ ئەو هەموو ناتەوایەی لە شۆڕشی فرەنسادا ئاشکران، دەبوو شۆڕشی ئۆکتۆبەر بە ڕابەرایەتیی لینین گەلێک بەولای شۆڕشی فرەنسەوە جێی پیرۆزبایی و بە خێرهێنان بێ لای چونکە دیارە شۆڕشی ئۆکتۆبەر گەلێک ڕێکتر و بە بڕشتتر و ئامانج ڕوونتر و شارەزایانەتر و بێ کەموکووڕیتر و سەلامەتتر بوو لە هی فرەنسە کەچی هەر چونکی «پ» بەچاوی خۆی ڕووداوەکانی شۆڕشی ئۆکتۆبەری دەدیت و سەرۆکەکانی دەناسین و ئاگاداری شتە نالەبارەکانی کارەساتەکە دەبوو ئامانجەکانیشی بەلاوە پەرگیربوون پێی نەکرا خۆی لەگەڵ شۆڕشەکەدا بگونجێنێ. چ جێی نەسەلماندن نییە کە دەڵێم شۆڕشی بۆلشەڤیک لە هەموو ڕوویێکەوە پتر تەئیید هەڵدەگرێ لە شۆڕشی فرەنسە بەتایبەتی لەلایەن یەکێکی وەک «پ»ەوە کە بە واقیعیەت ناسراوە و لێی چاوەڕوان دەکرا زووتر لە خەڵقی دیکە ڕازی بێ بەو ئەنجامانەی کە شۆڕشەکە وەستایانە بەسەر واقیعیاندا دەسەپێنێ.

هەڵبەت لینین و هاوڕێکانی گەلێک بەولای داخوازیەکانی سەرەتای شۆڕشی ئۆکتۆبەرەوە تێهەڵکشان و مەیدانی تێهەڵکشانیشیان خزمتر بوو لەگەڵ مەیدانی «پ» تا مەیدانی «کێرێنسکی»، لە ڕووی یەکیەتی و ڕێکوپێکیشەوە بەرەی بۆلشەڤیکەکان و بە درێژایی شۆڕش و لە هەموو عومری لینینیشدا پێوەندی هاریکاری و تێکگەیشتن و یەکیەتیی ئیرادەیان بەردەوام بوو و براکوژیشی تێدا نەدیترا بە پێچەوانەی حاڵوباری شۆڕشی فرەنسە، ئیتر بۆ دەبێ «پ» هێندە دۆستانە بڕوانێتە ئەویان و هێندەش حیسابی ورد لەگەڵ بۆلشەڤیکەکان بکا ئەگەر لە گۆشەیەکی بینینی زاتییەوە سەیری هەردوو شۆڕشی نەکردبێ؟ مەبەستیشم لە

گۆشەی بینینی زاتی ئەو هەڵوەستەیە کە لە ئاورینگ و پرشنگی بریقوباقی مێژوو و لە ڕەقی و زبری و عەیبی ئاشکرای حازرەوە سەرسوڕکێ بە مل مرۆڤدا دەبڕێ.

قارەمانەکانی شۆڕشی فرەنسە بە هەموو عەیب و عار و سەرنەکەوتنیانەوە لەناو تەمی کۆنینەیی و تیشکی مێژوودا لە دوورەوە وەک بەچکەی خەون و خوولیا شەبەنگ لەبەر چاوی خەیاڵ دەبەستن و دەبنە مەخلووقی مەیلەو ئەفسانەیی. بەڵام ڕابەرانی شۆڕشی بۆلشەڤیک مرۆڤە عادەتیە تراشهاتوە خۆڵاویە یەخە چڵکنەکەی زۆرخۆرەکەی درۆ لێ سپییوەکەی وردە فێڵکردوەکەی و دەنگ و ڕەنگ زڕەکەی قرقینەدەرەوەکەی کووچە و دەربوونە و مەیخانەی گەرەکەکەی «پ» بوون کە لە زەمینەی مەئلووفبوونیانەوە یەک زەڕڕە قودسییەت و پیرۆزییان پێوە دیار نەبوو. هەموو ئەو کارەساتەی کە بەلای دڵی ئارام و هۆشی ژیریشەوە نەدەبوو ڕوو بدەن و بە ناچاری لە شۆڕشی 1917 ڕوویان دەدا، ئەوانیش بە عەیبی گەورە دەهاتنە بەرچاوی بینەرەوە کەچی دەنگ و سەدای شۆڕشی فرەنسە لە پشت پەردەی سەدەی نۆزدەمەوە کە بەسەر هەموو دڕندەیی و بڕندەیی و دزێوکانیدا کشابوو وەک لەرە و ترینگەی مۆسیقا دەهاتنە بەر گوێی بیسەرەوە، شەبەنگی قارەمانەکانیشی تارماییەکی تریفە و گەشایی بوون لەبەر چاوی بینەردا. خۆ یەکدی کوشتنی ئەو قارەمانە بەسەرچوانەی کۆتایی سەدەی هەژدەهەم لە دەنگوباسێکی بەسفتوسۆ پتر نەبوو کە ئەویش سۆزی شۆڕشگێڕێکی سەرەتاکانی سەدەی بیستەمی بۆ تێکرای شۆڕشی فرەنسە دەبزاوت، بەڵام هەموو ڕەفتارێکی کەچی جیرانە زیندوە بە سەنگ و پۆزە ئارەقدەرکردوەکەی شۆڕشی 1917 گوناهی بێ بەخشین بوون بەلای جیرانە هێمن و خوێن نەڕێژ و سەلامەتخوازەکەیەوە.

ڕەنگە بیر بۆ ئەوە بڕوا کە «پ» بە هۆی جودابوونی لە بیروڕای بۆلشەڤیکەکان عوزری تەئیید نەکردنیانی پێ بێ بەڵام ئەم عوزەرەش خۆی لەبەر لێکدانەوەی ورد ناگرێ: «پ» کە بێتەقیە و بێسنوور تەئییدی شۆڕشی فرەنسە دەکا ئاگادارە لەوەی ئەوساش چەند حیزبی وەک ژیرۆند و یەعقووبی لە شۆڕشەکەدا بوون و یەخەی یەکدییان دەگرت، ئنجا ئەگەر خۆی لەو شۆڕشەدا بایە دەبوو بەگەڵ یەکێک لەو حیزبانە بکەوێ. بەو دەبێ بڵێین پلیخانۆڤی 1789- 1794 یش مەوقفێکی وەک مەوقفی پلیخانۆڤی 1917 ی وەردەگرت لە ئاست شۆڕشەکەدا ئەوساش ئەو

گلەییانەی لە شۆڕشی فرەنسە دەکرد کە لە شۆڕشی ئۆکتۆبەری کرد. خۆ ئەمەشی نەکردایە هەر نەبا لێی کنارەگیر دەبوو و پێیدا هەڵنەدەگوت چونکە ئەوسا کە حیزبایەتی نەکات و لە شۆڕش کنارەگیر نەبێ چی بۆ نامێنێتەوە ئەوە نەبێ کە ببێتە لایەنگیری ناپۆلیۆن بەو مەعنایە کە ناپۆلیۆن بوو بە وارسی شۆڕشەکە؟ ئنجا ئەگەر «پ» ڕازی بێ لە شۆڕشی فرەنسەدا ببێتە لایەنگیری پاشایەک کە تاجەکەی لە هی «لوی» شازدەم گەورەتر بێ ئایا مەوقیفی چی دەبوو لە ڕووسیای 1920 ئەگەر قەیسەرێک هاتبایە حوکم؟ ئەگەر بە قەیسەری 1920 ڕازی نەبێ بۆچی بە ناپۆلیۆنی 1810 ڕازی بێ؟ هەرچەند ناشێ مرۆڤ بڕیار بۆ ئەو ئیحتیماله ڕوونەداوانە بدا بەڵام چونکە لە بەراورددا شۆڕشی 1917 بەسەر شۆڕشی فرەنسەدا ڕادەشکێ بڕوا دەکەم ئەگەر «پ» بە هەموو قەناعەتەکانیەوە کوڕی سەدەی هەژدەم بوایە نەیدەتوانی تەئییدی شۆڕشی فرەنسە بکا وەک نەیتوانی تەئییدی شۆڕشی بۆلشەڤیک بکا. جا ئەگەر ڕێی ئەم قسەیەم نەبێ ڕێی چیم دەبێ؟ خۆ ئەوەی ڕاستی بێ کە دەڵێم ناشێ حوکم بەسەر ئیحتیمالی ڕوونەداودا بدەین زێدە خۆ گرتنێکە دەیکەم دەنا زۆر نووسەری ماددی و ناماددی لە مەیدانی ئەدەب و زانست و کۆمەڵایەتی و مێژوودا، بە ڕەهایی، دەم لەو تەرزە ئیحتیماله دەدەن و موناقەشەی ئەو ڕوونەداوانە دەکەن کە ئەگەر ڕوویان دابایە چییان لێ دەکەوتەوە وەک ئەوەی کە لە نووسیناندا خوێندوومەتەوە ئەگەر ناپۆلیۆن بۆی ڕێک بکەوتایە ببێتە ئەفسەرێکی هێزی دەریایی ئینگلیز ئەوپەڕی بەرەوپێشچوونی ئەوە دەبوو ببێتە ئەدمیراڵێکی زێدە بەناوبانگ.

یەکێک لە ڕوە گرنگ و دنیاهەژێنەکانی شۆڕشی فرەنسە کە دەشێ لەلایەن نیسبیبوون و موتلەقبوونی ئەو نەزانینەی تێیدا بووبێ دەمەتەقەی لەسەر هەڵستێ شریتەی ئەو شەڕانەیە کە ناپۆلیۆن هەتا تێچوو لەسەریان بەردەوام بوو بەتایبەتی هێرشەکەی بۆ سەر ڕووسیا کە تێیدا سەرەنگرێ بوو. ئایا ناپۆلیۆن لەو شەڕانەدا بە پێی ئەو بارەی تێیدا دەژیا لە نێوان ئەو هەموو تاک و بەرتەکەی دەوریان لێ دابوو زانینی بەکار هێنا یا نەزانی؟ من نامەوێ ناپۆلیۆن و شەڕەکانی لەسەر بیرواکەی «پ» حیساب بکەم و بڕیارێک کە بە سەر ئەودا بدرێ بۆ شۆڕشەکە بگەڕێتەوە لە شۆڕشیشەوە بۆ «پ» هەرچەند دەقی ڕایەکەی «پ» سەرلەبەری

شۆڕشەکە لەسەر خۆی حیساب کردوە. لە شەڕەکانی ناپۆلیۆنیش تەنها هێرشەکەی بۆ سەر ڕووسیا دەدەمە بەر لێکدانەوەوە چونکە ئەنجامەکەی لە گوماندا نییە و ئینکار کردن هەڵناگرێ.

ئایا ناپۆلیۆن لەو هێرشەدا کە بەرچاوترین دیاردەی مێژوویی سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەمە و بەرهەمی هێزە بزوێنەرەکانی ڕامیاری - کۆمەڵایەتی - ئابووری - زانستی - ئایدیۆلۆجی ئەو سەردەمەیە، ئایا کارێکی کرد کە بە پێی سەردەمی خۆی پێی بگوترێ زانایانە؟ ئایا نموونەی «زانین»ی سەردەم بوو؟ ڕەنگە لێرەدا پێم بڵێن هەڵوەستی ناپۆلیۆن لەو شەڕە و لە هەموو کارەکانی دیکەی وەک ئەویش ڕەفتاری تاک بوو نابێتە وەرامی پرسیاری سەربە مێژوو وەیا کێشەی فەلسەفە و فکر، بەڵام بەر لەوەی من بەدەنگ بێم بیریاری ماددی ئەم پرسیارە ڕەت دەکاتەوە چونکە لە فکری ماددیدا، تاک هەرکێ بێ، بایەخی سەربەخۆی نابێ بایی ئەوەی کردەوە گشتییەکانی بۆ خۆی ببرێتەوە. دوای بیریاری ماددی کە نۆرەی قسە بگاتە من، دەڵێم هەرچەند من لەوانە نیم بایەخ بە تاکێک نەدەم کە وەک ناپۆلیۆن بگاتە پایەیەک بە یەک فەرمان ■■ ئەوەندەی نمایشتی هەموو پاریس کار بکا بۆ بنیات نان و وێران کردن، دیسانەوە فەرقی نێوان قوماندانی قەمچی وەشێن و قوماندانی قەناعەت بەخش دەبێتە شەقڵی جوداکەرەوەی «سەرۆکی نوێنەری خۆی» لە «سەرۆکی نوێنەری گەل» وەک دەشزانین «ن» [= ناپۆلیۆن] تاکێکی عادەتی نەبوو، کردەوەکانیشی لە چارچێوەی خێزان و ماڵ و منداڵ نەبوو، خەریکی کاری شەخسیش نەبوو هەرچەند خۆپەسەندیش بوو. میللەتی فرەنسەش لێی دڕدۆنگ نەبوو، تەنانەت دوای نەفی کردنیشی بۆ «ئێلبا» کە گەڕایەوە فرەنسە سەرلەنوێ بۆوە پێشەنگی میللەتەکەی و هێندەی نەمابوو جارێکی دیکەش لە شەڕی «واتەرلوو» بەسەر ئەورووپادا زاڵ بێ.

لەمەش بترازێ، ئێمە ئەگەر بمانەوێ قسەکەی «پ» بکەینە عەیارەی مێژوو نەک هەر تاکە ڕووداوی وەک شۆڕشی فرەنسە دەبێ لە کۆنی کۆنەوە ئەو تێبینییە ڕەچاو بکەین و بزانین ئایا کۆرش و هانیبال و حامورابی و ئەسکەندەر بە پێی سەردەمی خۆیان زانا بوون یا نەزان چونکە ئەگەر پرسیارەکە هەر لە ئاست بزووتنەوەی گشتی وەک لە شۆڕشدا بەدەنگ بێ کەڵکی پێوە نامێنێ لەو ڕووەوە کە

بزووتنەوەی گشتی بەتایبەتی بەر لە شۆڕشی فرەنسە بە دەگمەن نەبێ رووی نەداوە ئیتر هەر دەمێنێتەوە کردەوەی پاشاکان و قوماندانەکان بیانخەینە نەزموونەوە چ نوێنەری میللەتان بن چ نوێنەری خۆیان. جا کە ئەمانەمان مەنع کرد بە نامەی بێبایەخی کردەوەی تاک لێکدانەوەکەی «پ» بایەخی زۆر دەدۆڕێنێ. لەبەر ئەمە ئەگەر لە خۆم بپرسم ئایا «ن» لە هێرشەکەی ساڵی 1812 کە بردییە سەر رووسیا بە کێش و تەرازووی «مطلق و نیسبیة» لەو سەردەمەدا زانا بوو یا نەزان؟ لە هۆشی هەبوو یا نا؟ بێ دوودڵی دەڵێم کارێکی نەزانانەی هۆشتاریکانەی کرد.

ئەمە دەڵێم نەک چونکی شەڕەکەی نەبردەوە و خۆشی دۆڕاند، خۆ ئەگەر دۆڕاندنەکەشی کە کردەی خۆیەتی بکەمە بەڵگەی «نەزانی»ی خۆی، هیچ عەیبی لاوەکیم لێ نەگرتوە، غەدریشم لێی نەکردوە، چی ئەوتۆشم نەگوتوە مافی خۆم نەبێ، بەڵام بەراستی لەو شەڕەدا «ن» بە تەواوی خۆی دەسخەڵەت دابوو لەو گۆڕانەی بەسەر ئەورووپادا هاتبوو، هیچ حیسابێکیشی بۆ بووژانەوەی گیانی نیشتمانپەروەری و نژادپەرستیی تازەبابەت نەکردبوو کە شۆڕشی فرەنسە و کارەکانی «ن» خۆی هۆی پەیدابوونی بوو. وەک بڵێی «ن» غەرقی خەرمانەی شۆرەت و دەسەڵاتی خۆی بوو لەوەشدا نەختێک لەسەر حەق بوو بەڵام زۆریش تێیدا بەسەهوو چووبوو.

بڕوا دەکەم «ن» شکستی هەر دەهێنا ئەگەر دوای داگیر کردنی مۆسکۆ مەسڵەتیشی لەگەڵدا کرابایە چونکە ئەورووپا لەوەدا نەمابوو سەردانەوێنێ بۆ ناپۆلیۆنێک بەحاڵ توانیبێتی سوڵحێک بسەپێنێ کە هەر بایی ئابرووپاراستن سەرکەوتنی تێدا بێ. ئێستا من دەڵێم لەبارەی زانین و نەزانینی «ن» لەو شەڕەدا پتر دەبێتە جێی باوەڕ کە مێژوو بۆت دەگێڕێتەوە چۆن پیاوی ژیر و دڵسۆز بە دەورییەوە هەبوون دەیانزانی شەڕەکە بێلزومە و کاری عەقڵ نییە. ئامۆژگاریشیان دەکرد خۆی تێوە نەگلێنێ. جا ئەگەر رێ هەبێ عەیارەی «پ» بەکار بهێنین دەبێ بڵێین ئەو کەسانە بەپێی سەردەم زانا بوون نەک «ن».

بەلای منەوە «ن» لەو شەڕەدا نموونەی هۆشی تاریکداگەڕاو و نەفسی گومڕا بوو [بەتایبەتی نموونەی نەفسی گومڕا] واتە حیسابەکەی لەوەدا نەبوو بکەوێتە بەر ئەو

سەهو، عادەتییەی کە لە ڕێی تەجرەبەوە ڕاست دەکرێتەوە. هۆشتاریکیی «ن» جارێکی دیکەش بەوەدا ئاشکراتر دەبێ کە دەزانین شەڕەکە لە ناچارییەوە نەبوو بەڵکوو خۆی بە پیریەوە چوو، لەمەشدا وەک هیتلەری 1941 بوو کە ئەویش دژی هەموو لێکدانەوەیەکی ژیرانە و پێداویستی هەڵکەوت و داخوازی بەرژەوەند خۆی خستە بارێکی وەها تەنگەتاوەوە کە لێ دەربازبوونی بەولای مومکینەوە بێ. بەڵێ شکستی ڕووسیا لە ساڵی 1941 - 1942 شتێکی نامومکین نەبوو بەڵام ئیحتیمالی نەشکانی وەها بەهێز بوو کە ئەوە بهێنێ هیتلەر لێی بێدەنگ بێ و تەحەمولی دنیایەک بکا، جارێ یەکیەتی سۆڤیەتی تێدا بەردەوام بێ. بەدەوری هیتلەریشەوە زۆر کەس هەبوون دەیانزانی پەلاماردانی ڕووسیا لەو حاڵوبارەی ئەڵمانیای 1941 تێی دابوو بێلزومیش بوو پڕ مەترسیش بوو.

ئەگەر بە وردی لە هەڵوەستی «ن» و هیتلەر بکۆڵینەوە دەبینین لەو هێرشەی بردیانە سەر ڕووسیا هاندەرێکی زۆر بەهێزی «زاتی» دوور لە مەوزووعییەت پاڵی بە هەردوویانەوە نا بۆ هەڵە هەرە گەورە و کوشندەکەی هەموو عومریان، هەڵەکەشیان زۆر کەس دەیدیت و لێشی نارەزا بوون، وەک بۆشی دەچم هاندەرە زاتییەکەیان هەم هۆشی تاریک و هەم نەفسی تاریکی تێدا بوو چونکە لە حاڵەتی هەردوویاندا وێڕای نەزانی عادەتی کە مرۆڤ بەرەو هەڵە دەبات باوەڕ بەخۆ هێنانێکی ئەفسانەیی و غەیر بەکەمزانینێکی پڕ لە فیزونازیش دڵ و هۆشی هەردوویانی گرتبۆوە، خۆ هیتلەر خەریک بوو باوەڕ بە پێغەمبەرایەتیی خۆی بهێنێ. لایەنی تاریکایی نەفسی سێبەری خستبوە سەر هۆشیان و تاریکی کردبوو بەڵام لە هیتلەردا ئاشکراتر...

نموونەی مرۆڤی زانای بە پێی سەردەم لەبەر تیشکی لێکدانەوەکەی «پ» وەزیرەکەی ناپۆلیۆن «تالیران» بوو کە توانی لە کۆنگرەی «ڤیەنا»دا بەزەیی دوژمەکانی فەرەنسە ڕاکێشێ و لە زەرەری کوشندەی دوای تێشکانی بپارێزێ. سەرنج لە تالیران ڕاگری لێت ڕوون دەبێ کە کابرا نموونەی دووربینیشی و تێگەییشتن بوو بە عەیارەی هەموو سەردەمێک، واتە پێش ڕۆژگاری خۆشی کەوتبۆوە.

قسە زۆرن بەڵام بەوەندە واز لە «نیسبی»بوونی نەزانی لە شتی گۆڕاودا دەهێنم.

دوەم: موتلەقبوونی نەزانی لەو شتانەی گۆڕانیان تێدا نییە وەک ڕاستییەکانی فەلەک و حیساب و کیمیا... کە بە پێی ڕای «پ» نەزانینی موتلەقە و هەمیشە یەک جۆرە.

لەبارەی ئەم بۆچوونەی «پ» تێبینییەکی بنجیم هەیە کە ئەویش درێژەی هەیە و دەشێ دەمەتەقە بە دەوری خۆیەوە هەڵستێنێ هەر جارەش لە بەیەکدی گرتنی واقیع و ئەو جۆرە بۆچوونەدا ڕووبەڕووی ئەنجامی فکری وەها ببین ناچارمان بکات چاو بە هەندێک لە قەناعەتی کۆندا بگێڕینەوە. بە نموونەی ئەم تێبینییە دەڵێم کە هاتین خەتمان لە نێوان زانین و نەزانینی موتلەق و نیسبی کێشا لە زۆر حاڵدا دەبینین خەتەکە ناتوانێ ڕاست و ڕاست بڕوات و موتلەق و نسبییەکانی لەیەکدا جودا بکاتەوە چونکە زۆریان تێکەڵ بەیەکدی دەبنەوە وەک ئەوەی کە بەر لە هەزاران ساڵ زانست و ئەفسانە لە یەک سەرچاوەوە هەڵدەقوڵان تاکوو فەلەک و «تنجیم» یەک لکی ڕۆشنبیری ئەو سەردەمە کۆنانە بوون وەیا پزیشک و ساحیر لە ناو قەبیلە سەرەتاییەکاندا یەک کەس بوو. جا ئەگەر بسەلمێنین کە لە شتی گۆڕاودا نەزانی بە پێی سەردەم نسبی دەبێ ناچارین بڵێین بەر لە دوو سێ هەزار ساڵ لە وزەی خەڵقدا نەبوە پتر بزانن لەو فەلەک و پزیشکییەی کە دەیانزانی، ڕێشیان نەبوو پزیشک لە ساحیر جودا بکەنەوە... بەهەمەحاڵ مەیدانی دەمەتەقە و لاپەڕە هەڵدانەوە لەم لێکدانەوەیەدا زۆر بەرینە و گەلێک ڕێچکۆڵەی لێ دەبنەوە و تێشی دەکەنەوە لەبەر ئەمە ناچارم هەر بایی ڕووکەشێکی ڕایەکەی «پ» پرسیارەکە شی بکەمەوە.

وەک من تێی دەگەم، زانستی ڕووتیش کە هیچ دەخلی بەسەر گۆڕان و نەگۆڕانی ڕاستییەکانیەوە نەبێ، وەیا با بڵێین کە ڕاستییەکانیشی نەگۆڕین، لە دەرەوەی خۆیەوە لایەنی کۆمەڵایەتی پێوەی دەلکێ و لێی دەبێ بە شەقڵ و توێکڵ و ڕوخسار کە ناشێ لە یەکدی جودا بکرێنەوە و بڵێین زانستەکە خۆی بەر حوکمی موتلەق دەکەوێ و پێوەندیشی بە کۆمەڵایەتییەوە دەکەوێتە بەر حوکمی نیسبی، چونکە زانستەکەش بە عەیارەیەکی موتلەقی پشت پەردەی غەیب ناپێورێ تاکوو زانینی ئەو زانستە موتلەق یا نیسبی بێ: سەرلەبەری زانستە ماددییەکان و سروشتییەکان و ئەو نەزەریانەی سەربە شتی نەگۆڕاون بە هۆی لێکدانەوە و تاقی کردنەوە و هەڵە تێدا کردن و ڕاست کردنەوە و دۆزینەوە داهێنان لە «ڕاستیی مطلق»ەوە

دەبن بەو دەستوورانە و زانیارانەی پێیان دەڵێن زانست و فەلسەفە. هەڵبەت حەقیقەتی فەلەک و فیزیا و کیما و گەرما و زەڕرە و... و... لەوەتەی لە ئەزەلەوە هەن، وەیا پەیدا بوون بە خۆیان و دەستوورەکانیانەوە و بەو ئەنجامانەی بەدەستەوەیان دەدەن هەر هەبوون و هەر دەبن، مرۆڤیش خەڵق نەکرابایە دەستوورەکان بە خامۆشی و بێ ئەوەی باس بکرێن لە «هەبوون»دا دەبوون، بەڵام ئەو ڕاستییانە لە خۆیانەوە پێیان ناگوترێ «زانست» تا ئەو دەمەی مرۆڤ هۆشی پێیان دەشکێ و سەرنجیان لێ دەگرێ و دەستووریان لێ هەڵدێنجێ و تاقی دەکرێنەوە و... و... ئیتر ڕەنگە هەڵەیان تێدا بکرێ و هەڵەکەش لە هەوەڵەوە بە زانست حیساب بکرێ [وەک فەلەکیاتی بەتلیمۆس] و دواتر ڕەش بکرێتەوە وەیا ڕاست بکرێتەوە، وردەوردەش بارستی ئەو ڕاستییانە زیاد دەکا و تۆمار دەکرێن و دەخوێندرێن...

خولاسە ڕاستیی ڕووت کە هەر لە هەناوی سروشتدا ڕاستییە [بە گوتەی فکری میتافیزیکی: لە عەقلی موتلەقدا دەزاندرێ] لە خۆوە زانست نییە. خۆ ئەگەر لە سروشتەوە ڕاگوێزرێن بۆ ناو بەرهەمەکانی مرۆڤ لەوێشدا بە شێوەی ئۆتۆماتیکی «زانست» لەو بەرهەمانەوە پەیدا نابێ. بە نموونە، ئاخاوتن یەکسەر نابێتە زانستی زمان و ڕێزمان و فۆنۆلۆجی، قورئانیش لە خۆوە ئەو هەموو زانستانەی لێ نەکەوتەوە کە پێی دەڵێن «العلوم الاسلامیة» کشتوکاڵیش زانستی ڕووەک و سینعەتی تراکتۆری لێ نەباری... بە کورتی هەرچی پێی دەڵێن زانست چ لە سروشتەوە یەکسەر تیشکی دابێتەوە چ لە دەسکردەکانی مرۆڤەوە دزرابێتەوە و هەموو ئەو ڕاستییانەی لە پێشکەوتنی کۆمەڵایەتییەوە دەستووریان لێ وەردەگیرێ هیچیان بێ مرۆڤ زانست نین و نابن. ڕاستیی «مطلق» بەر لەوەی مرۆڤ تێی بگا و دەستووری بۆ دابنێ و لە شتێکدا چەسپی بکات [وەک بەرد، کاغەز، پێست، کۆمپیوتەر...] وەیا هەر نەبێ دەماودەم بکات نابێ بە زانست.

لەمەوە و لە هەموو بەدواکەوتنێکی دیکەش دەردەکەوێ کە زانستی شتی نەگۆڕاو و بابەتی سەربە مرۆڤ تێکڕایان لە سەرەتاوە بەچکەی مرۆڤن کە خۆی سەرچاوەی هەموو گۆڕانێکە، واتە ئەو ڕاستییەی کە «مطلق»ە و خۆی لە خۆیدا گۆڕانیشی بەسەردا نایەت بە کارگەی هۆشی مرۆڤدا تێدەپەڕێ ئنجا دەبێتەوە زانست و دەست

بە زاوزێ و فراژیبوون دەکا و بە هەزارویەک هەڵسوکەوتدا خۆی تاقی دەکاتەوە و هەزارویەک مامۆستای پسپۆڕیش بە دەوری خۆیدا دەگێڕێ. کەواتە هەموو زانستێک لایەنی کۆمەڵایەتی تێدایە کە دەشێ زیاد و کەم بکات و هەڵە و ڕاست کردنەوەی تێدا بێ. بە نموونە، ئەگەر بەر لە دوو هەزار ساڵ بابایەکی نەخوێندوو لە ئاست فەلەکیاتی ئەوسادا گوتبای چی ئەوتۆی ڕاست نییە، قسەکەی ڕاست بوو بەڵام دیسانەوە هەر خۆی نەزان بوو زانای فەلەکیش زانا بوو چونکە لەو سەردەمەدا ئەوپەڕی تێبڕ کردنی هۆشی مرۆڤ لە فەلەکناسیدا هەر ئەوەندە بوو کە فەلەکناسەکان بۆی چووبوون ئیتر کەسێکی ئەو هێندەی زانیبایە بەڕاستی فەلەکناس دەبوو، ئەوی نەشی زانیبایە نەزان دەبوو.

«پ» هەر خۆی لەو زەمینەیەدا قسەیەکی دیکە دەکا هێند ڕاستە وەک بەدیهیە وایە بەڵام لەگەڵ زانین و نەزانینی موتلەق ناگونجێ کە دێت و دەڵێ لە نێوان ئەو هێندە زانینە نیسبییەی کە مرۆڤ لە سەرجوملەی زانستێکدا دەیزانێ بەشێکی بە شێوەی «مطلق» ڕاستە وەک کە لە زانستی فەلەکدا دەیزانی سێبەری ئەرز بەسەر مانگدا دەکشێت و تاریکی دەکا بەڵام نەیدەزانی ئەرز بە دەوری ڕۆژدا دەخولێتەوە... بەداخەوە سەرچاوەی قسەکانی «پ» لەبەر دەستدا نییە دەمێکیشە خوێندوومەتەوە بۆیە بوو نەمتوانی دەقی قسەکانی بۆ ئێرە ڕابگوێزم جا ئەگەر فەرقێک هەبوو لە نێوان ئەوەی لێرەدا بە قسەی «پ» حیساب کراوە لەگەڵ دەقی قسەکانی داوای لێ بووردن دەکەم. وابزانم ئەو قسانەی لە کتێبی *«کێشە بنجییەکانی مارکسیزم»* نووسراون و یەکێکیشە لە کتێبە هەرە ڕوونکەرەوەکانی بیری مارکسیزم.

چی لەم بەراورد کردنەدا بە شێوەی ڕەخنە ڕووبەڕووی «پ» دەبێتەوە تەنها لە گۆشەی زاتیبوونی تێوەرامانیەتی لە شۆڕشی فەرەنسە و ئۆکتۆبەر نەک بە نیازی تاوانبار کردنی لە تێکڕای هەڵوەست و بیروباوەڕی بەرانبەر بۆلشەڤیزم وەیا قەناعەت نەهێنانی بە پەیدابوونی زەرفی لەبار بۆ شۆڕشێکی کۆمیونیست لە وڵاتێکدا کە بە پێی ڕاستە حیسابی مارکیسزم جارێ مابووی لیبەرالیەتێکی ڕێکوپێک بەڕێوە بیا.

بەلای باوەڕی منەوە پێلخانۆڤ پتر قوتابی مارکس بوو لەو کەسانەی ملیان نایە شۆڕشێک کە بازی بەسەر دوو قۆناغی مێژووییدا هاویشت. وا دەزانم پەنجەگیر

کردنی «پ» لە تەعلیمات و ڕاگەیاندنە فەلسەفیەکانی مارکس خستیە سەر ڕارەوی خەباتێک کە لەبەر ڕووناکایی مارکسیزمدا نەدەشیا بە هیچ کلۆجێک تەمای کۆمیونیزم لە ڕووسیای 1917 دا بە دڵی قوتابیە ئەکادیمیەکانیدا بێ. «پ» لەو هەڵوەستەدا وەکوو ئەو بزکسەرە مستوەشێنە بوو کە لە سەر دەستوور و یاسا قەراردادەکانی یاریەکە دەڕوا. هەرچی لینین بوو پەکی خۆی لەسەر یاسا و دەستوور نەیەخست و مستی لە بیبیلەی چاوی غەریمەکەشی دەدا تەنانەت لە زەرفێکی سەختدا پەیمانی «برێست لیتۆفسک»ی لەگەڵ قەیسەری ئەڵمانیادا ئیمزا کرد و کۆمەڵێک مەرجی قورسیشی قبوڵ کرد هەر هەتا بەسەر پێیانەوە خۆی ڕابگرێ.

لە بیرمە قسەیەکی زۆر بایەخداریم لەو مەسەلەیەدا خوێندۆتەوە وەرامی ئەو کەسانەی پێ دەدایەوە کە گوتبوویان ئەو پەیمانە بریتییە لە تەسلیم کردنی دەمانچەیەک قافڵەی پێ دەپارێزرێ بۆ ناو لەپی ڕێگر. لینینیش یەکجار ژیرانە لە وەرامیاندا نووسی بووی: من دەمانچەم تەسلیم ڕێگرێک کرد لێم لە کەمین دانیشتبوو، ئەگەر نەمدابایێ دەشی کوشتم و دەمانچەکەشی دەبرد و قافڵەشی ڕووت دەکردەوە. بە تەسلیم کردنی دەمانچەکە گیانی خۆم و قافڵەکەشم پاراست بەو ئومێدەی لە دوا ڕۆژدا دەمانچە و هەموو شتێک لە ڕێگرەکە وەربگرمەوە.

لە لینیندا خەسڵەتی ڕابەرایەتی و پلانگێری و هەلقۆستنەوە و تاکتیک بەکارهێنان زۆر بەهێز بوو، کە ئەگەر وەها نەبوایە شۆڕشەکەی بۆ بەرپا نەدەبوو بەڵام لە «پ»دا خوێندەواری و فکری ورد و نەزەریەزانی بەهێزتر بوو. نەک «پ» بەڵکوو مارکس خۆیشی لە مەیدانی شۆڕش و هەرا بەڕێوەبردندا تۆزی لینینی نەدەشکاند تەنانەت برنارد شۆ لە ئاست مارکسدا دەڵێ: نووسینەکانی مارکس بێنی ئارەقە و دووکەڵی فابریقەی لێ نایەت.

لەم ڕوانگەوە دەڵێم «پ» قوتابی ڕاستینەی مارکس بوو هەرگیزیش ئەو تاوانەی لینین وەپاڵی دا کە گۆیا «پ» هەڵگەڕایەوە [Renegade - مرتد]ە ناسەلمێنم. بەهەمەحاڵ ئێمە لایەنێک نین لەو شۆڕشەی بەر لە 60 ساڵ هەڵایسا چی لێرەشدا دەگوترێ بیرکارییەکە لە ئەسڵی بابەتی «دوانەتی» و «لایەنی سەلبیی هۆش»ەوە زەنە دەکات، وەک پەندی ئینگلیزیش دەڵێ «هیچ شتێک وەک سەرکەوتن

سەرناکەوێ» ئنجا کە لینین بە گۆپاڵ پەلاماری دا و پڵنگی کوشت تازە بوو بە پڵینگکوژ، هەرچەند ڕاوکەریش بە گۆپاڵ ناچنە ڕاوی پڵینگ.

بەهەمەحاڵ هەڵوەستی لینین و «پ» دەگەڕێتەوە بۆ قەناعەتی دەروونییان نەک بۆ جوداوازیی دەوروبەر و چین و ئایدیۆلۆجی وەک کە دوو دکتۆر سەیری یەک نەخۆش دەکەن بە دوو تەشخیسی جوداوە. خوێنەر بابزانێ کە من بە زۆری هەر لەگەڵ ماتیریالیست و هۆی بەرهەم و جوداوازیی بەرژەوەند و چین ڕەخنەکاری دەکەم لە چەند سەرێکەوە بە ناچاری ئەو ڕێگەیە دەگرم:

1. ڕۆشنبیری کورد و زوربەی وڵاتانی جیهانی سێیەم لەو فکرە بەولاوە نەچۆتە مێشکیان. فەلسەفەی ماددیی مارکسی هێندەی دینەکان پەرەسەندوە و یەخەگیری هەموو سەروبەرێکی کۆمەڵ دەبێ هەر لە سەرەتای بوونیەوە هەتا ئەوسەری دوارۆژ، گەلێک ناتەواویشی لێ بەدەر داوە کە وا جارێ لەم جیهانەی خۆماندا پەردەی لەسەر هەڵنەگیراوە.
2. پشکی کورد لە جانفیدایی نەزۆک بۆ ئەم فەلسەفەیە لەچاو میللەتانی دیکە تا بڵێی لە ڕادە بەدەرە. حەیفە ئەو گەنجانە وەکوو چینی بێستان لەو ڕێگەیەی وەها بێ ئیستگەی حەسانەوە و قۆناغی بە مرادگەییشتن بەسەر بچن و زەمانێک نەگەڕێ بە هۆشیار کردنەوەیان.
3. لەلایەن فکرەوە فەلسەفەکەی مارکس، بە دەقی کۆنیشیەوە، گەلێک گەلێک پێشکەتووترە لەو فەلسەفە میسالیانەی ناویان دەرکردوە، زوربەشیان ورێنەی وەهایان تێدایە عەیبە لە زاری مرۆڤەوە دەرچێ. ئەو میسالیانە بەر لەوەی ماتیریالیست بە دەمیاندا بێتەوە دینی ئیسلام پێیان ڕازی نییە چونکە هێندە لە بوونەوەر دوور کەوتوونەتەوە خەریکن بەسەر خەیاڵیشەوە ڕانەوەستن بەڵام خواوراستان کەس بەدوایان ناکەوێ.

بەرەی مارکسیستی کورد ئەگەر مارکسیزمەکەیان بۆ کوردایەتیی بێتەئویل وەرگێڕن خزمەتێکی گەلەکەیان دەکەن نە بەکەس دەکرێ نە خۆیشیان لە هیچ مەیدانێکی دیکەدا دەتوانن خزمەتی وەها گەش بکەن.

لێرەدا کۆتایی بە بەشی دوەمی ئەم نووسینە دەهێنم. عومر یار بێ و بار لەبار بێ کولانەی دیکە زۆرن لەم ئێسگەیەی فکر و ماددەوە بەرەو جیهان و کۆمەڵایەتیی بەفرەوانەوە تەماشاچی و سەرنجدەر بین.

«...» مایس 1978

مەسعوود محەمەد

«مرۆڤ و دەوروبەر» - بەشی سێیەم

بەسەریەکەوە لەتەک بەشی یەکەم و دوەمدا، ساڵی 1999، لە سوێد، لەلایەن «کتێبی ئەرزان» ـەوە بڵاو کراوەتەوە

یەکەم و دوەم بەشی ئەم نووسینە لە بواری هێنانەدەری چارەنووسی مرۆ لە چنگاڵی هۆی بەرهەم و کاریگەریی «تناقض»ەوە بەرەو پێشخستنی دەوری مرۆ خۆیەوە لە چەندوچۆنی کۆمەڵایەتی و فراژیبوونی مێژوویی و لەوەشدا دوو لایەنی ئایەتی و نایەتی (ئەرێتی و نەرێتی) لە ڕابەرایەتیی هۆش [لە پلەی یەکەمدا] ڕوون کرایەوە کە دەزانین، یاخود دەبێ بزانین، بێ وزەی هۆش نە کۆمەڵایەتی و نە هیچ زانست و هونەر و دۆزینەوە و بەرەوپێشچوون لە منداڵدانی «مرۆڤایەتی» نەدەڕسکا و تەنانەت چەکوچ و داس کە سەرەتاییترین و خوێڕووترین هۆی بەرهەمن پەیدا نەدەبوو هەتا ڕۆژگارێکی پاش چەندین هەزار و میلۆنەها ساڵ، بە کاوەخۆ هۆش دەپڕا و دەبوو بە کاریگەرێکی تازەبابەت لە هەموو بوونەوەری جیهانی بەرهەستدا. بەو پێیە دەبوو هەرای بیردۆزییە هەمەچەشنەکان لە ڕاڤەکردنی سروشت و کۆمەڵایەتی، ئەو ماوەیەی وەها درێژخایێن لە پشت پەردەی «نەبوون»دا وەک شیمانەیەکی (ئیحتمالیکی) هێزەکی[22] لە هیچایەتیدا بە نەبوویی مابانایەوە.

ئەمە دەڵێم لە سنووری ئەو ڕووبەرەدا کە تیشکی ڕۆژ تێیدا هێندە هێز و گەرماییە ڕوونکەرەوەی هەبێ بایی ئەوەی «ژین و ژیار» (حیاة وحضارة) پێیانەوە بگوورێت و بڕسکێت وەک کە لە زەوی گووراوە و ئافراوە. تەنانەت لەولای ئۆرانۆس گەڕۆکی نیپتۆن ئەو گەرمایییەی ناگاتێ زیندەوەرێکی لە لاوە بچێتێ پێی بژێت چ جایی ئەوەی زیندەوەر بئافرێنێ.

جارێ قسە هێنان و بردن لە بارەی جیهانی دەرەوەی تاقمەی ڕۆژ لە ڕووی بوون و نەبوون و چەندوچۆنی ژیوەر تێیدا [تا ئەم ڕۆژەی 9ی تشرینی دوەمی 1996] ڕەنج بە فیڕۆدانە مەگەر بە دەم خەیاڵی فەلسەفییەوە کە مەرجی نەگرتبێ ڕەمڵ لێکدانەکەی سەربە ئەنجامێکەوە بگەیەنێ. دەشبێ بڵێم، فەیلەسووفی هێژا و مێشک ئاوەدان بە زانستە بنچییەکانی جیهانی ماددی، وێڕای جیهانی هۆشلەبەر و گیانلەبەر، هەقی خۆیەتی [بەڵکوو فەرمانی بەرپرسیارییەتی] وەکازێکی دەسکردی

[22]- هێزەکی: وجود بالقوة: Potential

خۆی لە بابەتی تیشکدەری زیهنی بە دەستەوە بگرێ، وەکوو عەساکەی مووسا پێغەمبەر شەقامی بەرهەنگاوی زاناکان بە سەح[23] بکاتەوە.

لێرەدا روون کردنەوەیەک پێویستە: مەبەست لە «زاناکان» بە تێکرایی زانای هەموو لکەکانی زانست دەگرێتەوە. لە نوختەنیگای دەرخستنی نهێنیەکانی سروشتیش، پتر لە ئاست زاناکانی فیزیا و فەلەک و تێکرای سروشت بە راست دەگەرێ، تەنانەت کە لە حاڵی مرۆ و گیانلەبەر دەتۆژنەوە لە کولانەی سایکۆلۆجی و بایۆلۆجییەوە رادەمێنن نەک کۆمەڵایەتی و سیاسەت و مێژوو... بەڵام بابەتی سەربە «مرۆڤ و دەورووبەر» لەم نووسینەی بەردەستدا، بەناچاری و فەرمانی درێژەکێشانی رچەی دووبەرگی لێرە بە پێشەوە، لە پلەی دوەم و سێیەمدا هانا دەباتە بەر زانستی رووتی بێلایەن کە هات و تیشکێکی بوو بە روونکەرەوەی تاریکایی بە دەوری بابەتەوە، ئەگینا نیاز و ئامانجی رێنموونی کردن بۆ کوردێکی هەڵخەڵەتاو بە «ئایدیۆلۆجیا»ی سیاسی و ئابووری و ئایینی یان هەر جۆرێک بێ کە واقیعی راستییە بێفێڵەکانی کۆمەڵایەتی دەشێوێنێ یەکسەر مل لە شارێی کۆمەڵایەتیی سەربە سیاسەت و ئابوورییەوە دەنێ کە وێکرایان دەبنە چاویلکەی ئاپۆرەی جەماوەری خۆشجڵەو بۆ دیتنی واقیعی هەڵبەستراوە و باوەر پێهێنانی، بەتایبەتی لە جیهانە سەرلێشێواوەکەی پێی دەڵێن سێیەم و من بە بیستوسێیەم و سەد و سێیەمی دادەنێم. سەیریشت لەم رەفتارەم نەیەتەوە چونکە زۆرینەی کۆمەڵگەکانی ئەم جیهانە دواکەوتوەی ئاخەلێوەی سەدەی بیستەم شەیدای خەیاڵبازی و بوتپەرستی و تاکپەرستی و هیچپەرستییە و زێدە ئەستەمە بەلایەوە، لە خۆوە ئایدیۆلۆجیای پووچەڵ بتفێنێتەوە و بە پێی داخوازیی لێکدانەوەی ژیرانە. لە حاڵەتێکدا، کە بەرێکەوت، بیروباوەرێکی پووچەڵی رەتکردەوە [گوتم: بەرێکەوت] لە سایەی باوەرە پووچەڵەکەی خۆی ئەو بریارە راستەی بۆ هاتوە چونکە بەرێکەوت لەگەڵ پووچەڵەکەی خۆی رێک ناکەوێت کەوا رەنگە ئەمیان پتر رۆچووبێت لە هێری: وەک ئەوەی کە باوەرێکی پووچەڵ وەها رانووێنێت

[23]- ئەم «سەح»ـە پێوەندی بە «صح»ی عەرەبییەوە نییە: وشەیەکی زێدە کۆنی زمانە ئێرانییەکانە. لە کوردیدا گۆرانێکی بەسەردا هاتوە، لە «سەھ» بۆتە سەح. لە بەهلەوی «سهیتن» چاوگیەتی.

پەلکەزێڕینە تریفەی قژی عەیشێ و فاتمانە، یەکێکی دیکە بڵێ، نەخێر ئەمە تاقی خودایيە و بەر ئاسمانانی داوە بە موعجیزە نیشانمان دەدات.

زاناکانی دوور لە سیاسەت و هەراوەزادی بورسەی بەرژەوەندی بە چەرخ و دۆلاب، زۆر بە داخەوە، پتر ڕۆچووی کاری خۆیانن تا ئەوەی بە جۆرێکی کاریگەر و ڕێکوپێک تێکەڵ بە سوودی سەرلەبەری مرۆڤایەتی بن وەیا لایەنگیری ئاپۆرەی ستەمدیدەی وڵاتی خۆیان[24] بنەوە هەرچەند جێی سپاس و منەتبارییە، کورت دەهێنێ:

1. لە چاو چی لێیان چاوەڕوان دەکرێت و
2. لە چاو گرنگیی کێشەکان و
3. لە چاو، با بڵێین، قوتابی و گەنج و خوێنگەرم وەیا کرێکار و وەرزێری وڵاتی پێشکەوتوو لەو مەیدانانەی باسی لێوە دەکەین.

بەڵێ: دەزانم لەوانەیە قوتابی و گەنج فڕکەی دەمارانیان پتر لە تەوژمی هۆش و هەستیارییان دڵیان ببزێوێت، کرێکاری و وەرزێریش پتر لە چارەنووسی ڕۆژانە و پشووی مانگانە و مسۆگەر کردنی مافی کۆمەڵایەتیی خۆیان خەریک بن تا دەربەستبوون بە دوارۆژی ئادەمیزاد. دیسانەوە بە پێی پلەی شیاوی بۆ هەڵگرتنی ئەرکی «بەرپرساییەتی» لە چەندوچۆنی جیهانی ئادەمیزاد زاناکان پشکی گلەمەندییان قورسترە بەسەرشانیانەوە لەچاو خەڵقی دیکە. بێ ئەوەی بکەومە داوی ئاڵوزکاری یەخەگرتنی ئەو تاقمە زێدە مومتازە لە رووی کەمتەرخەمیانەوە بەرانبەر «چارەنووس» هەر ئەوەندە دەڵێم دوو کەڵەقارەمانی ڕێی مرۆڤدۆستی، بیرترەند ڕەسل و زاخارۆف، بە نموونە دەخەمە یادی خوێنەر کە ئەگەر زۆرینەی زانا زلەکانی جیهان قورسایی خۆیانیان خستبایە چەرخوفەلەکی سیاسەت، وەک ئەم دوو مێرخاسە کردیان، بێگومان لەنگەری تەرازووی کاروباری جیهان، تارادەیەک بەلای چاکەی «مرۆ»دا قورستر هەڵدەستایەوە. جا ئەگەر خوێنەرێکی حەز لە ڕەخنەبازی بکات و بە دەممدا بێتەوە و بڵێ: کەی دەلوێ بۆ زانای ختمبووی

---

[24]- ئەو هێندە خەریکبوونەی بەشێک لەو زانایانە بە چارەنووسی «مرۆ».

لە کارە سەختەکەی و دژشداماو بەدەست ئەو ئامێر و جیهازە بێ ژمارە و سنوورەی زەرڕەقڵاشی و ئاسمانگەڕی و میکرۆبدۆزی و... و... باداتەوە سەر نمایشت و مانگرتن و جەبهە ڕێکخستن و نازانم چی، دەڵێم فارس گوتەنی: «نە بدین شوری شور و نە بدین بی نمکی»... نە هێندە سوێر و نە هێندەش بێخوێ، ڕێگایەکی مامناوەنجی هەیە، وەک تەیەمووم لە نێوان دەستنوێژ و بێ دەستنوێژیدا، نوێژەکەی پێ بەڕێ دەکرێت. وەک کە شەریعەت عوزری بێئاوی ڕەت کردەوە بە تەیموومی ئەوان زانا زلانەش ئەگەر وەک سۆفی بایز کە مەراقی نوێژی لە دڵدایە، ئەوانیش بە مەراقێکی ئەوتۆیی لە خانەی بێ جووڵەیی دەردەچوون و «ئحم ئحم»ێکی دزدەنگدانیان لەو سیاسەتمەدارانە دەکرد... بەهەمەحاڵ سەد جار ماڵیان ئاوابێ کە چرای زانستەکانیان بە درێژایی ڕۆژگار ڕووناکایی هاویشتوە بۆ دیتنی ڕاستییەکان و داهێنانی ئەو ئالەتانەی لە جیاتیی ئادەمیزاد قورسایی ناقۆڵا هەڵدەگرن و ڕێی درێژ کورت دەکەنەوە... ئەمما هەزار لەعنەت لە چەکی ئاتۆم و بایۆلۆجی!

ئەم سەرنجانەش لە حاڵوباری زاناکان هەر دەچێتەوە حیسابی «مرۆڤ» و «دەوروبەر» کە مرۆڤ مەخلووقێکی زاتییە نەک ئالەتی وەیا غەریزی تا ئەوەی تاک تاکی زاناکان لە مەیدانی پەروەش بۆ مرۆ هەموو ئەو مەودایە پڕ دەکەنەوە کە غاندی و عومەر عەبدولعەزیز جودا دەکەنەوە لە هیتلەر و ستالین و جەنگیزخان: هەر لە ڕەسل و زاخارۆفەوە هەتا زانای زانستفرۆش و بەتەماع لە کاردان بەڵام، بێگومان زانای نزیک لە فرشتە گەلێک پترن لە زانای خزمی شەیتان: خۆ ئەوەی ڕاستی بێ من لە باوەڕێکدام کە ڕزگاربوونی «مرۆ» لە دەست ماکە بەدەکانی دەروونی [و لە نیازە چڵێسەکانی فرنداقبازیی سیاسەت و سەروەت و خوێنخۆریی «سادیزم» و نەخۆشیەکانی نەفس] لە پلەی یەکەمدا بەندە بە زانست و زاناکانەوە کە هەر ئەوانن دەتوانن نەخۆشیی عەمەلە و وەرزێر و قوتابی و هەموو خەڵکی «ناوەندی» چاک بکەنەوە دژی ڕیزپەڕی و تێکدان و تاوان.

لەم قسانەم ئاکامێک خۆ بە دەستەوە دەدات کە بە مەبەستم نەگرتوە دووچاری خۆمی بکەم بەڵام، وەک مووی لووت، لێ دەربازبوون و پشتگوێخستنی بەلای نامومکینەوەیە: کە بسەلمێنین زاناکان زوربەیان بەهۆی نقوومبوونیان لە کارە

گرنگەکانیان و کەم دەرفەتیی خۆهەڵقوتاندن لە کاروباری سیاسەت و چارەنووس... و... و ناکەونە سەر باری خەفەتی لاوەکی و پەرۆشی نامەئلووف. ئنجا دەبێ حاڵوباری ئاپۆرەی میلیارەها خەڵقی جیهانی سێیەم کە بەحاڵ پێی ناوەتە جغزی «مێژوو» و گەرمەتەریقی ئەفسانە و ورێنە و دەجاڵی ئاخرزەمان و پابەندی رابەری شەعبەدەباز و عەوامخەڵەتێن و لەخشتەبەرە و هەتا فاکوفیکی باهەڵدراوتر هەبێ توخنی گومرایی سادە ناکەوێ. ئەم ملیارەهای نەفام و نەزان و سادەلەوح کە ئەگەر تەنها بە فەرمانی غەریزە، وەک جانەوەر، خەریکی پەلەی ژیان بایە نەدەهات فرمێسک داباریێنێ بۆ رۆژگیران و مانگیران و خۆی بەقوربانیی درۆزن بکات... مێزی چێڵی نەدەخواردەوە بە ئومێدی نازانم چی... لەسەر توانجێک دژی رابەرە شەیتانەکەی چاوی کوڕی خۆی نەدەکۆڵی و دەیان و سەدان ئەوتۆی نەدەکرد کە هەر شێت و گێل و لە خشتەبراو دەیکەن.

تۆ بڵێ چەندین ساڵی دەوێ بۆ ئەوەی، بەلای کەمەوە، دوو ملیار تا سێ ملیار مرۆی مێشکداخراو و چاونووساو و هەستهێڕ بگاتە پلەیەک لە هۆشیاری و تێگەییشتن حاڵەتی شەختەکردوویی تێپەڕێنێت وەک ئاو شل بێتەوە بە گەرمایی ناوەکیی لەش و هەناوی نەک لە لاوە گەرمایی بە شرینقە تێبکرێت؟ چونکە ئەگەر گەرماییەکە لاوەکی بوو سەرلەنوێ حاڵەتی شەختەکردوو دەگرێتەوە مەگەر هەمیشە شرینقە لە کاردا بێت! ئاوی بێ هەست و هۆش بە بەریەوە نییە لە خۆوە گەرمای بزێتەوە و لە حاڵەتی شەختەیی دەرچێت. گلەیشی لێ ناکرێت بەڵکوو کەڵکی نامێنێ ئەگەر وەها نەبێ. چی پێی دەڵێن «داخوران و داشۆران» (تعرية وتآكل) کە لە ماوەی ملیۆنەها ساڵدا بە شەختە کردن و توانەوەی ئاو خۆڵ پەیدا دەبێ لە بەردی رەق، ئا ئەم دیارەیەی وا بە پێز و بڕشت پەیدا نەدەبوو. هەرچی مرۆیە بە پێچەوانەی حاڵەتی ئاو هەمیشە بە دەست کاریگەرەکانی نەزۆکی «کۆمەڵگەی مرۆ» شەختە دەکات و سەدەها ساڵی دەوێت هەتا نەختێکی شەختەکە دەتوێتەوە. لەم حاڵەشدا «کۆمەڵایەتی» دەتوانێ و توانیویەتی، بارتەقای پێشکەوتنی لایانە رۆشنەکانی، هەر لە گەییشتنەوە یەکتری حاڵەتی «رۆشنایی»ی کارەبا و تاریکایی «شەپلەخۆری» جۆرێک شەختەی حەرامزادە دروست بکات کەوا بەر لە

کارەبا و ئاسمانگەری نەدەشیا پەیدا ببێت، تا ئەگەر لە سەدەکانی نۆزدە و هەژدە و دوازدە... چرا قزدیلە و مۆم ڕووناکییان دەبەخشی.

لە سەدەی بیستەم میللەتی ئەفغان بە دەستی خۆی هەموو ئەو بنەمایەی سەربە زانستی نوێ کە مەلیک ئەمانەڵڵاخان بنیاتی نابوو تەفرووتوونی کرد...[25] چاوبگێڕیت بەم جیهانەی ناسازی سێیەمدا و پتریش هەڵکیشت بۆ جیهانی نێوان سێیەم و لە خۆی بەرەژووتر قەسابخانەی ئەوتۆ دەبینێت هێندەی قەسابخانەی بازاڕی گۆشت بە برەوە گۆشتەکەشی نەک ناخورێ و بەس بەڵکو بە مەسرەفی قورس و ئەرکی کوشندە دەبێتە خۆراکی دڕندان.

بەهەمەحاڵ ئەم تێبینییە کورتە و وردە هێمای ڕوە و حاڵوباری سەردەم کە نەتەوەی کورد لە ناوەندی دۆزەخەکەی و تاریکایی ئەنگوستە چاوەکەیدا دەژێیت پتر ڕێگە تەخت دەکات بۆ قەڵەمێکی کوردی لە *«مرۆڤ و دەوروبەر»* بدوێت و ڕوون کردنەوەی واقیعی ئەو مرۆڤ و دەوروبەرەی بە مەبەست گرتبێت لەبەر دوو هۆی زێدە بنجی:

1. نورسینەکە بە کوردییە و غەیری کورد تێی ناگات.
2. نموونە هێنانەوە و ڕووداوی شاهیدی حاڵ پێوەندی بە کوردەوە هەبێ ئاسانتر قسەی بڕندە و زەق و تفت و تاڵ لە قەناعەتی خوێنەر نزیک دەخاتەوە چونکە ئێشی برینی خۆی، کوردەکە، بەڵگەی دروستی قسەکانە بۆ تاک و کۆمەڵی کوردزمان و کوردویژدان.

بە عادەت نووسینی ئەکادیمی لە ڕوانگەی بەرینەوە چەشمەندازی سەربە بابەتەکەی دەداتە بەر لێکۆڵینەوەی بە کێش و تەرازوو، هەروەهاش مێژوونووس (مەگەر چۆنها) ڕووداوی تێپەڕیو کە دڵی لێ نادات و خوێنی لەبەر ناڕوات و گرمەی تۆپ و لرمەی ڕماندن و دووکەڵی سووتەمەنی لێوە هەڵناستێت، بە گیانی ئارام و هەستی بێلایەن دەخاتە ژێر تیشکی یاسای ئەوتۆ دەست بدات بۆ قاڵبی ڕووداوەکان وەک کە من و تۆ دەچینە بەر دوکانی قەساب گۆشتی بێگیان دەکڕین،

[25]- کوردی هەرێمی کوردستان عێراق، لە ساڵی 1991، 1992، و... 1995، 1996 بەشی زێدە بە بۆزی ژێرخانی حازربەدەستی ڕیشەکێش کرد و وەک ماڵی قاچاغ بە دوژمنی خۆی فرۆشت.

هەتا ناسکتریش بێ پتر لێی ڕازی دەبین، هەقی پەلەفرتکێی دەمی سەربڕینی ئاژەڵەکەشمان نییە...

دەڵێن ئەبو عەلای مەعەڕڕی نەساغ کەوت گۆشتاوی فرووجیان لە پێش دانا. گوتی، بۆچی بەچکەشێرێکتان سەرنەبڕی بۆم... گۆشتاوەکەی نەخوارد! [شەوی 14 لەسەر15ی تشرینی دوەم، سەعات 10:25 ئەمە دەنووسم. بەدەست خۆم نییە چاوم ئاوی تێگەڕا].

داخوازیی حاڵی ڕووبەڕووی دەمەتەقەیەکم دەکات لەگەڵ نیوە بەیتێکی حاجی قادر کە دەفەرموێ: «تەماعی گەورەیی بێ چەک نەکەن نەک!» ئەم چەند وشەیە بەدیهیەکی ئاشکرا و ڕاڕەوێکی شاڕێ دەستنیشان دەکات بۆ سەر ئامانجێکی ژووررووی ئامانجانەوە کە دەمەتەقە هەڵناگرن. هەر حاجی لە هەمان برە شیعردا دەفەرموێ:

هەتا وەک ئاگری ژێر کان لەگەڵ یەک
ئەگەر تووفانە لەشکرتان بە پووشەک

باوکیشم لەم بوارەوە بۆ ئەم بەیتە چوە:

ئێوە هەرچەند کە قەومەکی زۆرن
فائیدەی چی کە توخمی خۆخۆرن

شاعیر و خاوەن دڵ و دەروونی پاک زۆرن بۆ هەمان جۆرە بیروڕا ڕۆیشتوون و تێنشیاندا هەیە پەندی تێکەڵ بە تاوگیری کردوە. تەنانەت حاجی و باوکیشم لە مەیدانی تانووت وەبەرنان ئەوەیان گوتوە کە دەبێ بگوترێ. بەڵام لەگەڵ پێویستبوونی ڕێز ڕاگرتنی تانووت و دنەدان و بووژاندنەوەی گیانی هەڵمەت و یاخیگەری، ناچارین بە پێی هێز و توانا و زەرفی لەبار خەباتی خۆئازاد کردن بەڕێوە بەرین. دەزانین دەبێ چەکمان هەبێ دوژمنی پێ کەننەفت بکەین. بەر لە چەک پەیدا کردن دەبێ هۆشی تاکتیک و ستراتیجی شەڕ و ورووژم و کشانەوەمان

بە دەرس خوێندبێ... دەبێ بزانین وتووێژێکی لەگەڵ کوردی سەربە تورکیای دەکەین زۆر بە درەنگەوە دەگاتە بەر گوێی کوردی کوردستانی ئێران یان هەر نایگاتێ: گریمان دەنگەکە بە کزی و بە جۆرەک لە جۆرەکان کەوتە بەر گوێی ئەو کوردانە ئایا چەندی دەوێ هەتا دەبێتە ئایین... هەتا ڕیزی خەباتکارانی بۆ ساز دەدرێت... هەتا تۆپ و شەستیر [ی ئەو سەردەمەی حاجی قادر]ی بۆ لە هەندەرانەوە جەلب دەکرێ... پارەی چەک و ئازووقەی چەکی ئاگرین لە کوێوە هەڵدەقوڵێ؟ ڕاستییەکەی ئەم پرسیارانە لەسەر کاغەز وەرامیان بێ وەرامییە ■ جایی لە مەیدانی واقیعی ڕەجاڵ کە جەمە نانی سبەینە و ئێواران بۆ خەباتگێڕ و جەنگاوەران لە ماوەی ساڵ و دوو ساڵ و دە ساڵدا (کە لەوانەیە شەڕە خەیاڵکردەکە بیبڕانەوە■ بێت) ئەرکێکی پشتشکێن و هەناسەبڕی دەوێت.

دەزانم، تۆش دەزانێت، خەباتی گەلان بە درێژایی ڕۆژگار و بە هەژاری و نەداری و ماڵکاولی چۆتە سەر، بەڵام لێرەدا کە ئێمە ڕێمان هەیە لەسەر کورسی و مێزی نووسینەوە و دوور لە هێرشی جەندرمە و پۆلیس، بە دڵی ئارامەوە. سەیری پانۆرامای بزووتنەوەی ڕزگاریی گەلان بکەین دەبێ بە چاوێکی واقیعبین و هۆشێکی کرایەوە قەڵەم و زمان لە «خەباتی گەل» بخەینە گەڕ کە دەکاتەوە خەریکبوون بە «چارەنووس». لەو کولانەیەی تێوەرامان لە خەباتی گەلان چەند خاڵێک لە تێبینی و هەڵسەنگاندن نیگا ڕادەکێشن:

1- مەگەر چۆنها، دەنا خەباتگێرانی نەتەوە کە ملیان لە بزووتنەوەی چەکدار ناوە بەتەمای سەرکەوتن بوون نەک تێشکان. لە چەند دڵگەرمێک بەولاوە، ئاپۆرەی خەڵق مل لە چەقۆ ناخشێنێ بۆ تەڕدەماغی و فیزوناز: کە بزانێ بزووتنەوە نەزۆکە - مەگەر شێت بێ - ڕێگەیەکی هەموارتر لە «مردنی بێسوود» دەگرێتە بەر. ئەم بڕیارەی ڕستەی دوایین بەڕاست دەگەڕێ نەک هەر لە خەباتی خۆبەختکەران، بگر■ لە شەڕی نێوان حکومەتانیش هەر ڕاستە. لە نموونەدا دەڵێم: ژاپۆن لە جەنگی جیهانی دوەم کە بۆمبای ئەتۆمی بە دیاری بۆ چوو دەرحاڵ ئاڵای تەسلیمبوونی هەڵکرد. ئەگەر لە سەرەتای شەڕیشەوە زانیبای دوژمن ئەو بۆمبایە پەیدا دەکات، شەڕەکەی دژی ئەمریکا و ئینگلیزی بەرپا نەدەکرد و خەریکی داپەڵۆسینی چین دەبوو.

پەندیکی لەم ڕاستییەوە هەڵیگرتیتەوە ئەوەیە کە ئومێدی سەرکەوتن لە خەبات، لە جەنگ، نابێ لە 50% کەمتر بێ (هەرچەند دەزانم خوێنگەرم بە 10% ش ڕازییە، زۆر جاران بە هیچیش).

2- ئەو نەتەوانەی کە لە ئاکامی خەباتی قەڕناوقەڕن بە ئامانج گەییشتن دوو هۆی کاریگەر یاریدەدریان بوو [جگە لە: 1- وزەی جەنگ، 2- هێزی بەردەوامبوون بە هۆی تێری و تەسەلی نەتەوە خۆی]:

هۆی یەکەم: غالبی ئەو نەتەوانە ئەگەر داگیرکەر لێیان گەڕابایە لە خۆوە دەبوونە دەوڵەت چونکە هەموو مەرجەکانی پێویست بە بنیاتنانی دەوڵەتیان هەبوو. لە نموونەدا دەڵێم: پۆڵەندەی لەتلەتکراوی بەر لە شەڕی یەکەمی جیهانی پتر لێهاتوو بوو بۆ دەوڵەت پێکهێنان لە تورکیای ئەوسا. وارشۆ شارێکی مەشووری جیهان بوو...

هۆی دوەم: زەرفی لەبار هەمیشە بۆ ئەو نەتەوانە لە کەمیندا بوە، واتە وەک نەتەوەی کورد نەبوە کە دەرگەی ئومێدی لێ داخرابێ بۆ ماوەی 2500 ساڵ. حاڵوبارێکی ژیاری و ئابووری و هونەری کە لەو نەتەوە ژێردەستانەی وەکوو پۆڵۆنیا و ئۆکرانیا و کوێ و کوێ هەبوە ڕێز و حورمەتێکی بۆ دیاری کردوون لە نێو دەوڵەتان تا ئەوەی بێگانەی داگیرکەر حیسابی بە بنەمای کردوە بۆ ڕەزامەندیی ئەو نەتەوە پێشکەوتووانە، چ جایی ئەوەی دەوڵەتی نزیک و دوور، بە تایبەتی هی نزیک لێیانەوە، هەموو دەم ویستوویەتی ئەو داگیرکراوە پێشکەوتووانە سەربەخۆ بن مادەم مومکین نەبێ ببن بە هی خۆی.

تۆ سەیری پاش شەڕی گەورەی یەکەم چەندەها و چەندەها لە حکومەتی نۆژەن وەکوو دوومەڵان هەڵپۆقین. هەر لە دەوری خۆتدا سووریە و عێراق و ئوردون و لوبنان و ئەرمینیا بوون بە دەوڵەت. کورد نەبێ مایەوە بە پارچەکراوی بە تێبینی ئەوەی کە پێشتر کەرتی کوردستانی عێراق و کوردستانی تورکیا خاکێکی سەرانسەریان هەبوو بێ حدودی جوداکەرەوە. کوردی سووریەش دابڕا لە کوردی عێراق و کوردی سەربە تورکیا... پەیمانی سێڤر، هەرچەند ئەگەر نەسڕابایەوە، زەرەری لە تورکیا دەدا کە دوژمنی ئینگلیز و فەرەنسە بوو بەڵام بەرژەوەندی زلتر

لە مافی کورد دوژمنی کوردی پاراست لەو زەرەرە. ئنجا ئەگەر بگوترێ ئەو وڵاتە باسکراوانەی کە گوتمان حکومەتیان بۆ دانڕا هەر بوون بە ژێردەست پێت دەڵێم: خۆزی کوردیش وەک ئەوان دەبوو بە ژێردەست! تەنانەت ئەگەر بە ژێردەستیش یەک پارچە بوایە هەر لە سووددا بوو خۆ ئەو بە چەندین کەرتەوە هەر ژێردەستەیە. ئەمە دەڵێم لە حاڵێکدا تازە حکومەتەکان هەموویان دوای شەڕی دوەم سەربەخۆ مانەوە. کوردیش، بە زاهیر، وەک ئەوان دەبوو. لێرەشدا تێبینی ئەوە دەکرێ کە ئەگەر کورد لە رۆژی یەکەمی بوونی بە حکومەت، «حکومەتی خەیاڵی» سەربەخۆ بوایە نەیدەزانی حکومەت دابنێت و کەس نازانێ حاڵوباری ئەو وڵاتە دواکەوتوەی بێ ژیار (حضارة) بە دەست خۆیەوە چی بەسەر دەهات. نموونەش لە عێراق وەردەگرین کە ئەگەر لە پاش شکانی تورکەکان ئینگلیز وازی لە عێراق هێنابایە چڕناوچۆنی خۆی بەڕێوە دەبرد: بەغدا نەیدەتوانی پۆلیسێک بنێرێ بۆ دەڵتاوە ئنجا ئیدارەی بەسرە و رەواندزی بە چی دەکرد؟ شیعە و سوننە چۆن دەبوون؟ تورکیا و ئێران چەند رادەوەستان لەسەر داگیرکردنەوەی؟ وەهابیەکان تاکوێ دەهاتن؟ چ هێزێک بەری دەگرتن؟ خولاسە گەپی خەبات و شۆڕش و دەوڵەت دانان وەک کایەی منداڵان نییە بە تیروپشکێ یەکێک ببێتە میر و یەکێک وەزیر و ئەوی دیکە گزیر: باوەڕ دەکەم «میر و گزیر» یش چاوسوورکەرەوەی دەوێ دەنا یەکێک لەلاوە بە زۆرەملێ خۆ دەکاتە میر و دەکەوێتە شەڕەچەپۆلک لەگەڵ میری تیروپشکێ...

ماوە بڵێم فەلاکەتێکی زلی بێئامان هەیە لەبەر هەنگاوی هەر میللەتێکی جیهانی سێیەم و وەک ئەو کە هات و بە ئامانجی دەوڵەت و سەربەخۆیی گەییشت: لەو رۆژە گەشە پیرۆزەوە کولەمەرگیی میللەت بە دەست «زۆردار»ی خۆیی چ هی حکومەت چ هی نفوز و پارە، دەست پێدەکات؛ خەباتگێڕەکەی لێی دەبێتەوە بە جەندرمەی وەک کە دەگوترا؛ هەیتە تەڕ و وشک پێکەوە دەسووتێنێ. لە بیرت بێ پۆڵپۆت چی کرد بە میللەتی خۆی. هیچ دوژمنێکی لاوەکیی دڵبزگەن و رقلەدەروون خەیاڵ ناکاتەوە لەو تەرزە دڕندەییەی نەزۆک! بێگانەی دەسەڵاتدار خەریکی کارێک دەبێ زێدە سوودی لێوە وەربگرێ بە تایبەت کە بێگانەیەکی توجارمەشرەب بێ نەک پاڵەوانێپفێکی خۆپەرست و قزڕەدەماغ کە وەک گورگ نێچیر داپەلۆستێ.

پۆلپۆت، باوەڕە پووچەڵەکەی دژی بۆرجوازی بوو بە حەڵاڵ کردنی قڕتێخستنی سەرلەبەری چینی ناوەند و بەرەژوورتر.

خەباتگێڕی سەرکەوتووش لە ئاکامی کۆبوونەوەی دوو کاریگەری:

1. ئەرکی ڕۆژگاری خەباتی سەخت،
2. خۆ بەزلزانین و ناز کردن بەسەر واقیعێکی لە حیسابی خۆیدا دەستچێنی خۆیەتی.

ئەم دوو کاریگەرە لە نەتەوەیەکی دواکەوتووی سەدان و هەزاران ساڵدا بەشێکی پێکهێنەری خەباتگێڕیەتی کە دڵ و نەفس و لەشی برسییە بۆ بژێوی خۆشمەزەی ماددی و مەعنەوی. لە وڵاتی پێشکەوتوو [مەبەست نەتەوەی پێشکەوتوە] خەباتگێڕ و سیاسی یەک شتن. چڵێسیش لە نێواندا نییە، هەشبێ مەیدانی بەرتەسکی بۆ کراوەتەوە. ئەو بەرتەسکەش خەڵقێکی هوشیار و دابونەریتێکی سەربە نیزام و یاسا تێیدا زاڵە. هەرچی ناڕەزامەندییەک هەبێ لە ڕێی هۆی سەلمێندراوی کۆمەڵ، بە حکومەت و نا حکومەتییەوە ڕەخنەی لێ دەگیرێ و هەوڵی نەمانی دەدرێ. ڕەخنەلێگیراویش مافی خۆ ڕوون کردنەوە و نیازپاکیی هەڵوەستەکەی لە دڵخوازی خۆی دایە ئیتر یا بە کاری دەهێنێ یا واز دەهێنێ. ئەمە شێوەی واقیعە، بە تێکڕایی دەیشوبهێنم بە دەشتێکی بە زاهیر هەموار و بێقۆرتە لەچاو گرد و تەپۆڵکە و شاخی بەدەورییەوە. بەڵام بێگومان مرۆ نابێتە فرشتە. ئنجا ئەگەر نەبوونی بە فرشتە ڕێ بدا قسەکانم هەڵوەشێنێتەوە لە بارەی کۆمەڵگەی پێشکەوتوەوە بەوەندە ڕازیم کە بسەلمێندرێ ئەو پێشکەوتووانە مرۆن نەک شەیتان و عیفریت کە دەزانین لە جیهانی پەنجاوسێیەم بە زەحمەتێکی زێدە زەحمەت دەسەڵاتداری تێدا نەبێتە «عیفریت» بەهەمەحاڵ لە خوێنەر ڕادەپەرمووم هەست بکات بەو ڕاستییە چاوگیرە زراوتۆقێنەی نەبوونی وزەی ناڕەزامەندی لای زۆرینەی هەرە زۆری تاکانی جیهانی سێیەم، کە تاک ئیرادەی نەبوو کۆمەڵیش دەبنە ئاپۆرەی بێئیرادە! تاکی تەنها تاکیش دەبێتە خەڵتەی وەک سەلکە پیوازی کوتراو بەڵام فرمێسک لە چاوان پەیدا ناکات وەک کە پیاز دەیکات!

دەبێ بۆ خوێنەر بە دەنگ بێم لە پرسیارێکی بە دڵیدا دێت و ناگاتە بەر گوێم: بەڵام دێتە بەر هەست و هۆشم. دەفەرمووێت، ئەم نووسینە دەمودووی جودایە لە هی دوو بەشێ پێشووتر منیش دەسەلمێنم و مەبەستیشمە هێوێنی بەشی سێیەم خزمایەتی هەبێت لەگەڵ شیری لەوەرگەی کۆتایی 1996. بەشی دوەمی نووسینەکە لە ساڵی 1984 نووسراوە. لەوساوە تا ئەم رۆژگارە رووداوی تازەی بێسابیقە لە هەرێم و لە خاوەری نزیک و لە سۆڤیێتستان و گەلێک شوێنی تری دوور و نزیک کەوتۆتە بازاڕی سیاسەتی بەرتەسک و بەر بەرەڵا.

ئەم زگوزارەی سیاسەت کە وشاری بۆ هۆش و دڵی مرۆ دێت بەشێکی زەقوپۆزی کوردەکەی خۆمان دەگرێتەوە. هەر نەبێ خەبەراتی سەربە کورد، جگە لەوەی بارستی چەندین جار لەچاو ڕابردوو زیادی کردوە، پتر لە هی دیکە سەرنجی کوردەکە ڕادەکێشێت و دەیجوێتەوە سەرەڕای ئەوەی کە جۆری دەم و ڕاوێژی خەبەرسازان لە کولانەیەکی چەشمەندازی نوێ بۆ کورد حکایەتخوانی دەکات.

لایەنێکی تایبەت بە هەستی شەخسی خۆشمەوە پتر ئاشنام دەکات بە خەبەراتی تازەی کورد، لەگەڵ ئەو هەموو دزێویەی تێیدایە، و بە چەندوچۆنی سەرەنجامی کۆمیونیزم و سۆڤیێتستان کەوا ڕەنگە نووسینەکانی پێشووم (لە 1960ەوە) بە دەوری ئەو باسانەوە خۆیان لە نیشانە خشاندبێت ئەگەر نەڵێم پێکابێتیان. چاوێک بە «إعادة التوازن...» دا بگێڕیت دەبینیت بەر لە نزیک 20 ساڵ گوتوومە، نەبوونی کیانی کورد ▪ نرخێکی زلی مەعنەوی لێ سەندوە کە لە ماوەی تێشکانی 2500 ساڵدا «نرخی نژادپەرستی» ی تێدا نەڕسکا بەو جۆرەی کە سنووری «کیان» بە دەوری نژاددا دەیڕسکێنێ. لە بیرمە نووسیوومە «فنحن مرعى بلا سياج وحي بلا ديدبان وضيعة خلت من فزاعة الطيور». لە بەشی یەکەمی *«مرۆڤ و دەوروبەر»* یش کە دێمە سەر تاوانبارکردنی گوتاری «دنیادیدە» کە تەڵەبەی کوردی ئەڵمانیای بە سەگی نێوان تەپەڵۆ و لەیلان شوبهاند، ئەو خۆ بەکەمزانینەی ژێردەستی دوو هەزار ساڵی دەهێنمەو▪ بە سەبەبی کۆمە نەکردنی «دنیادیدە» لەو قسەی وا لەوجڕ و زێدە نزم و ئێسکشکێن کە ئاراستەی تەڵەبەی کوردی دەکات...

خولاسە نووسینی بەردەست لە ئاووهەوایەکی جودای دوو بەشی لێرە بە پێشەوە دەدوێت. لەگەڵ ئەمەشدا بیروڕای دوو بەشەکە بەو ڕووداوانەی تازەبابەت پتر

دەچەسپێ، چونکە ڕووداوەکان هیچیان بەر ئەو تەفسیرە ماددییە ناکەون کە بەرەی چەپ و مارکسیست ڕامالّی گوێی گوێگرانی دەکرد: تومەز ئەوەی دەبوو بڕمێ نەڕما ئەوەی دەبوو نەڕمێ ڕما. کوردەکەش ملی ناوەتە گەپێک چ پێوەندی بە «زێدە نرخ - فائض القیمة» و تەناقووزی چینایەتییەوە نییە. لە دووبەرەکییەکدا هەرەمەی هەموو چینەکان و ئایدیۆلۆجییەکان تێکئالاون بە تێبینی ئەو حەقیقەتەوە کە چینی پرۆلیتاریا [زوربەی وەرزێرە، کرێکاری ئەم رۆژگارە جارێ لە کوردستاندا پەیدا نەبوە] بایی یەک سەرۆک عەشیرەت یان سەرۆکجاشی کۆن حورمەتی نییە، خۆیشی بە خەیالّیدا نایەت ببێتە گزیر. مالّم حەقە وەرزێری بێدەرەتان و بێسەواد و بێ وزەی باوەڕ بەخۆ کردن و بێ ئامانجی نەقش بەستوو لە دەروونا بە تەواوی ئەم دێڕە بەیتەی پێنج خشتەکیەکەی قازیی هەلّەبجە. مەلا حەسەن، کە لە سییەکاندا یان کمێک پێش سی، هۆنیوەتەوە و دەلّێ:

هەرکەس کە گوتی ئەمتە بەچەن[26] دەبنە غولامی

نەخشەکێشی وەرزێری هەرێم بوە بێ زیاد و کەم لەوەتەی شۆڕشی 1961 هەلایساوە تا ئەم دەمەی بەرەو کۆتایی سالّی 1996. من نامەوێ وەرزێر بشکێنمەوە لە حالّێکدا شۆڕشگێڕ خەریکە شۆڕش دەکوژێنێتەوە: کە عەیبدار هەبێ، بسەلمێنین و نەسەلمێنین، میراتێکی مێژوە پشکی هەموومانی تێدایە: هەتا پتریش هەلّکشاو بین لە دەسەلاتدا پتر عەیبدارین.

ئنجا ئەگەر بێین لە ڕێی «ذاتیة و موضوعیة»ـەوە ڕووداوان هەلّسەنگێنین، ئەوسا بە زەڕەبینیش تۆسقالّی مەوزووعیەتیان تێدا نادۆزینەوە [لەم ڕستەیەدا کوردەکە مەبەستە هەرچەند دەیان نەتەوەی تریش خەریکی خۆفۆتاندنن]: «هەرێمی کورد» و گەلێک شوێنی تریش جۆرێک زاتیەت بەکار دەهێنن هەر دەلّێی بە دیاری لە دوژمنە هەرە کوشندەکەیەوە بۆی هاتوە. لەگەلّ ئەم ڕاستییە ئاشکرایەش پینەچی سیاسی و ئایدیۆلۆجی زۆرن تەقلە بە واقیع لێدەن لەسەر کاغەز وەیا بە زمان باری لەنگولۆری فەلسەفەی بە چەرخ و دۆلاب و داوا تەقلیدیە پێچەلّپاچەکان لەنگەربەند

---

[26]- دەقی وشەی «بەچەن» جێی گومانە لەوانەیە «بچن» بێ یاخود «ئەمتە بەچەن» تێکڕای جۆرێکی دیکە بێ.

بکەن و سووچ و تاوان بخەنە گەردەنی بەدکاری ناوەکی و دەرەکی و ناسازیی هەڵکەوتی سیاسەتمەدارە زلەکانی جیهان و وەسوەسەی شەیتان و ئەرکی گران. لەم بەهانانەشدا تەنها ئەرکی گران قەناعەتبەخشە بەڵام نابێتە پاکانە. بە پێچەوانەوە. تاوانی تاوانبارەکان خەستتر دەکاتەوە: یەکێک ئەرکی زیادی بەسەرەوە بێ چۆناوچۆنی بێ ئارەزووی چلێس و چڵکن شەڕی ناوخۆیی و وێرانکاری دەکاتە سەربار؟ چ دەبوو ئەگەر لە جیاتی دڕندەیی پشووی حەسانەوەی دابا بە خۆی... لە پۆپنە و چەتری عەلەشیش ڕامابایە... گوێی دابایە زەرەزەڕ و وەڕەوەڕ و هەر دەنگێک و هەر شتێکی تر بێ... چەڵەمشکێنەی کردبایە... خۆی هەڵداشتبایە لەسەر شاخەوە و ملی شکابایە!! ئەشەدوبیللا مەیلی شەڕ و دندوکێی خوێناوی دابین نابێ ئەگەر حۆریی بەهەشتیش باوەش بکاتەوە بۆ قوتەی مل نێرکەکاردووی سەر شانۆی نمایشت!!

بێگومان، چ لە تێکهەڵدایی بێت و چ لە حاڵوباری ئاسایی بێت، ئاپۆرەی خەڵق وەک ئەو دانە گەنمانە نین، کە ئاش دەیانهاڕێت و سەرلەبەریان دەکاتە ئارد: تێیاندا هەیە بایی پێویست (لە زۆر حاڵدا پتریش لە پێویست) دروستایی سەلامەتیی خۆی و پاوەند و سامانی دەبینێت تا ئەوەی لە تەجرەبەی شەڕی نێوان عێراق و ئێران نەمانزانی یەکێک لە کوڕ و کچ و برا و خزمی نێزیک لە دەسترۆیشتوەکانی دەوڵەت خوون لە لووتی هاتبێت وەیا لە کەیف و سەفای خۆی کەم کردبێتەوە. بەشێکی بەرچاویش لە هەلپەرست و بەرتیلخۆر و بەرتیلدەر بە درێژایی 7-8 ساڵی شەڕ خەریکی خۆشگوزەرانی بوون لە پارس و لەندەن و بە جۆرێکی بەرچاو سامانیان دوو چەند و چوار چەند دەبوو. خوێن و ماڵکاولی کوژراوەکان بێ وەخران و پاتەوپات دەبوو بە زێڕ و پارە لە قاسەی شەیتان پێداوەکان. هەر ئەو سوودمەندانەش لە ئاهەنگی ڕێزنان بۆ شەهیدان دەبوون بە سەرامەدی ئاهەنگ و پرسە و شۆرەت و مەدالیایان بەسەرشان و سینگدا شۆڕ دەبوونەوە و سەڵەواتیان بۆ لێ دەدرا.

ئەم وێنەیەی وا بەرەواژ، حەقیقەتی حاڵەتی «مرۆڤ» و «دەوروبەر»ە لەو وڵاتانەی میللەتەکانیان جاری وەکوو مێردمنداڵە، بلوغیان نەبوە و، کوردی گوتەنی، چەپوڕاستی خۆیانیان نەناسیوە. لەم قسەیەشمدا بایی سەری دەرزی لە حەقیقەتم

لانەداوە چونکە ئەگەر هەوڵی نان پەیدا کردن بکەین بە پێناسەی «مرۆ» فەرقێک نامێنێ لە نێوان مرۆ و ئاژەڵدا کە ئەویش خەریکی خۆراک پەیداکردن و بەچکەهەڵێنان و خۆپاراستنە بە پێی غەریزەیەکی ڕێ بەدێیی پێ دەکا لە نێوان سوود و زەرەردا. کۆمەڵایەتی مرۆ، وێڕای کاریگەریی غەریزە، کاریگەرێکی گرنگتری هەیە خاڵقی کۆمەڵایەتیەکەیە ئەویش «هۆش»ی مرۆیە. گرێوگاڵی گوزەران و بەرەژوور چوون و پاشەکشە و یاسای چاک و بەد و باوەڕی ڕاست و پووچەڵ و تاریکیی و ڕۆشنایی زانست و جەهل و تێکئاڵقانی بەرژەوەند و مجێز و خۆشویستن و نەویستن و واقوڕمان بەرانبەر جیهان... و.. ترسی مەرگی بێبڕانەوە و ئومێدی ژیانەوەی ئەودیوی قەبر... ئنجا دەرسدەری فێلباز و فرنداقی تەماعکار و سادەلەوحیی زوربەی هیچ نەزانان و هێربوون بە ئایدیۆلۆژی بیژۆک و سەرانسەری تەنگوچەڵەمەی بێ ئەژماری ژیان و ژیار وەکوو بارانی زستانان هۆشی مرۆ لە خۆیاندا دەگرن.

هەڵبەت لە تای تەرازوودا کەرەستەی زانست و تەکنیک و هونەر و داد و بەرژەوەندی ڕەوا و دەرسدەری بە ویژدان قورسایی خۆیان دەدەنە لایەنی سوود و چاکەی مرۆ بە درێژایی مێژووش ڕۆڵی خۆیانیان بینیوە و قوربانیان داوە تا ئەوەی دەتوانین بڵێین پشکی هەرە گەورەی هونەری بەرپەچدانەوەی دڕندەیی و گومڕایی دەچێتەوە بۆ ڕۆشنایی و هەوڵی ڕووناکبیران و نهێنی دۆزەوان و داهێنەری هۆی ئارامی و خۆشگوزەرانی. بەڵام، بە داخەوە، بەرزی و وردی و نازکیی کاڵای ڕۆشنبیران بێ ئەوەی مەبەستی بێت، هەر بە فەرمانی واقیعی ئەو کاڵایە، هێندە ژووررووی ڕێکاری وزەی چاو و گوێ و مێشکی ملیارەهای شەپلتەخۆر و جنۆکاوی و هیچ نەزانانەوەیە دەستیان پێی بگات دەیسووتێنن، خاوەنەکانیشیان لەگەڵدا بێ لە ئەرخەمیدسەوە تا ئاینشتاین و ئەم چەند لاپەڕە شڕەی منیش...

ئەگەر مرۆ نەکەین بە خاڵقی دەوروبەر و مێژوو و کۆمەڵایەتی [کە خۆی مێژووەکەیە] و خاڵقێکی دیکەی وەکوو هۆی بەرهەم و ئابووری و ئایین و سروشت بێ، دەبوو تێکڕایی ئادەمیزاد یەکچوون بن وەک کە ڕەسەنی پلنگێک و گورگ و پێشوولە و حووتی دەریا یەکچوونن بە حوکمی غەریزەی نەگۆڕاویان و مامڵەتی

سادە و یەکچوونیان بە درێژایی ڕۆژگاری سەدان هەزار ساڵ لەگەڵ سروشتدا، شکڵیان نەگۆڕا... جل و بەرگیان نەپۆشی و نوێژ و حەجیان نەکرد... فێری ئاخاوتن نەبوون لەسەر «دەڕۆم و ئەڕۆم» بەشەڕ بێن... دابەش نەبوون بە لایەنگیریی ماملێ و حەسەن زیرەک... مووسا و مەسیح و مارکسیان نەبوو تێکیان بەر بدا... لە فەرزی ناکۆکییەک بکەویتە نێوان دوو پڵنگ یا دوو کەمتیار، ناکێشیتەوە بۆ شەڕی سۆران و بادینان و بابان.

لە گۆشەی «ئاخاوتن»ـەوە سەیری مرۆ و بە جانەوەرانی بگرە. جوداوازیی زمان و لە نێوان ئادەمیزادا خۆی لە خۆیدا و بە تەنها و بێ زایۆنیزم و کۆلونیالیزم و ڕەگەزپەرستالیزم، بایی ژمارەی «نەتەوە»ی مرۆ دوژمنایەتی ناوەتەوە... نەخێر دوژمنایەتیەکە لەوەندەدا ناوەستێ، هەر نەتەوەیە ناحەز دەبێ لەگەڵ 3-4-5 نەتەوەی دەوروپشتی خۆی. ئنجا ئەگەر هەزار نەتەوە هەبێ چوارپێنج هەزار جۆرە دوژمنایەتی پەیدا دەکات و بە درێژایی ڕۆژگاریش بەردەوام دەبێ. کە لە تەگەرەی زمان بوویتەوە و لێی حەسایتەوە تەگەرەی ئایینی بخەرە پاڵ... ئنجا مەزهەب... ئنجا چەپی و ڕاستی... ئنجا جوداوازیی سوود و بەرژەوەند... پاش ئەمانە وردە حیساباتی مجێز و تەبیات و خووڕەوشتی هەر تاکێک بگریت و تێوەی ڕامێنیت چ بە ئادەمی دەکات، سەرت سوڕدەمێنێ لەو مەخلووقەی 50-60-80-100 کیلۆ گۆشت و ئێسک و خوێن و خوڕەی پێکی هێناوە.

تۆ سەیرکە ئەو زیندەوەرانەی ئۆگری مرۆ بوون بە پێی درێژایی و کورتیی زەمانی ئۆگربوونەکەی شکڵگۆڕیی کردوە، لەمانە مریشک و کەڵەشێر[27] جۆری بێ ئەژماریان لێ پەیدا بوە، کە بەلای منەوە، دەبێتەوە بەڵگەی زێدە کۆنیی کەویبوونی[28] لەچاو عەلەشیش و قاز و مراوی کەوا بێگومان عەلەشیشی مەلی وشکایی ئاسانتر کەوی دەبێ لەچاو مەلی ئاوی بۆیە جۆری پترن لە هی قاز و مراوی. پشیلە جۆری زۆرە بەڵام هێندەی سەگ هەمەجۆر نییە چونکە سەگ

---

[27]- وشەی کەڵەشێر و کەڵەباب لە «کەهرکە شێر» و «کەهرکە باب»ـەوە هاتوە. «کەهرکە» بە واتای مەل هتوە لە کۆنی کۆنەوەی زمانە ئێرانییەکان.

[28]- لە جیاتی «کەوی» وشەی «کەیی» ڕاستە. «کەی» بە واتای خانوە.

ئاشناترە بە مرۆ... هەر لەم کولانەوە سەیری مرۆ بکەیت دەبینیت هەر تاکێکی، چ ڕەش چ سپی چ زەرد... لە هیچ تاکێکی دیکەی جیهان ناکات.

دەڵێن مۆرکی پەنجە چەپی کەس لە هی کەسی دیکە ناکات. من دەڵێم، نە چاو نە لووت نە گوێ، نە برۆ نە هیچ ئەندامێکی مرۆ لە هی مرۆیەکی دیکە ناچێت... باوەڕ دەکەم دەنگی کەس نوسخەی دەنگێکی دیکە نەبێت... ئنجا هەر بۆ شۆخی، دەڵێم ئەگەر بێبەختی وەهای لە توخمی جانەوەرێک کرد وەکوو مرۆ حەزی چوە تاوڵە یان فووتبۆڵ یان بانگدانی نوێژ یا خۆراکی کوڵاو، ئایا ئەو چارەڕەشە چۆن دەحەوێتەوە؟ چەند دەژیت؟ چەندی دەوێت تا ڕەچەڵەکیشی دەبڕێتەوە!! جاران، کە مریشک لە تاو هێلکەکردنی وەزەحمەت کەوتوو، یان هۆیەکی نامەئلووف، قاسپەکەی لە بانگی کەڵەبابی دەکرد دەرحاڵ سەریان دەبڕی نەکا سەری ساحێبی بخوات!

خولاسە، بێ هیچ مەبەستێکی نیاز لەخۆگرتوو دەڵێم. مرۆ بە خۆی و بە تایبەتمەندەکانی سەربە مرۆڤایەتیەوەی کە بەر لە هەموان کاریگەریی «هۆش» دێت و دەبێتە جوداکەرەوەی مرۆ لە هەموو کائینات، دەشبێتە مەودای بێسەروبنی نێوان هۆتنتۆتێکی بێسەواد و نێوان مارکس یا ئاینشتاین تا ئەگەر یەکێک لە سادەلەوحیی ڕەفتارێکی کرد لە هی دڕندە یا لە هی فریشتە بچێت ناشێ یەکسەر لێی بکەوینە گومانەوە ئایا کام دەرسدەر فێری ئەو فەندەی کردوە. دەسا وەها بوە شوێن هەڵگرەوەی بێسەواد و کارەبانەدیتوو دە ئەوەندەی مودیر پۆلیسی تاجدار و خاوەن کتێب لەسەر دۆزینەوەی تاوانبار، ماڵی دزراوی بەسەر گرتۆتەوە بێ مزە و بێ مەبەست...

یەکێک لەو پسپۆڕانەی بێسەواد شوێنی پێی سووسکەی بەسەر ڕێبازەوە دیت گوتبووی: ئەمە شوێنی نێرە سووسکەیە... لە دووراییی 40-50 مەترێک سووسکەیەک هەڵنیشتبوو بەسەر بەردێکەوە، گوتبووی ئەمەش سووسکەکەیە (توومەز ڕووکاری پەنجەی سووسکەکە بەرەو ئەو لایەنە بوو، لەوەوە زانیبووی هەمان سووسکەیە) سووسکە بە ساچمەزەن کوژرا... دەرچوو نێرە...

کە بێینە سەر گوزەری مەسەلەی «کەرامەت» و غەیبناسی، تووشی نموونەی ئەوتۆ دەبین لە کرداری سروشت کە مرۆیەکی مەیلەو سادەی کەمزان هێندەی مرۆیەکی دانسقەی دەرسخوێندوو و خاوەن تەجرەبە لەم مەیدانەدا، پتریش لەو، هەستی «نهێنی» ی لە بابەتی دوور و نزیک کردوە. مەشوورە کە جانەوەر بەر لە مرۆ هەستی چەندوچۆنی کەشی هەوا و باران و با دەکات... بوومەلەرزەی پزدانی دەروونی خاک پێ دەزانێت کە خەریکی تەقینەوەیە... هێزی «ژیوەری، زیندوەتی» بەر لە پلەی غەریزەی مەیموون و جانەوەری تێهەڵکشیوو و مرۆی هۆشتێگەڕاو نموونەی سەیروسەمەرە بە دەستەوە دەدات لە فەندی خۆپاریزی و ڕێ دەرکردن بۆ خۆراک...

من ئەم درێژییە بە قسەکانی خۆم دەدەم نەک بۆ نمایشی فەساحەت و بەلاغەت، بەڵکوو چاوی خوێنەری بەپەلە با دەدەمەوە سەر واقیعێکی فرەوانتر و زیندووتر و نهێنیتر لەو واقیعە زێدە زەق و زۆپی ناو نەزەرییان و کەلەشی بەرخی قەسابخانە و خوتبەی نوێنەران و چەمەنتۆ و مەرمەڕی وەستای بەننا... جارێ جیهانی ماددیی ئاو و هەوا و ئاگر و گڵ [چوار ماکی سروشتی کۆن] کە لە ڕواڵەتدا بێخواز و بێهەستە و بەتەما نییە خۆی داخات دژی هۆش هەستی مرۆ[29]... و «غەریزەی جانەوەر»، بەشێکی کەمی بە تەواوی یان نیوە تەواوی لە نهێنییەکانی خۆی دەرخستوە [یان دەرکەوتوە] بۆ بەر چاو و هەستی ئامێرە سیحرییەکانی زەڕڕەقڵاش...

لە کتێبی، وابزانم، *«الكون المرآة»* - تەرجەمەی لە زمانێکی غەربییەوە کرابوو بۆ عەرەبی - لەبارەی گەورەتربوونی کوتلەی ماددە لە ڕێی زیادبوونی خێراییەوە، دەڵێ لە ئالەتێکی سێ کیلۆمەتریی خێراکەر کە سورعەتی ماددەی گەیاندە نزیکی سورعەتی ڕووناکی کوتلەی زەڕڕە 28 جاران زیادی کرد... دەڵێ، بۆ ئەوەی زەڕڕە هێندە گەورە بکەین بتوانین بچینە ناوی پێویستیمان بە خێراکەرێک هەیە بەقەدەر ڕێی کاکێشان درێژ بێ کە درێژاییەکەی سەد هەزار ساڵی تیشکە (قسەکە هی حەفتاکانە)... بە تەجرەبە یەک زەڕڕە بۆ دوو کون بەڕێ کراوە لە هەر دوان،

---

[29]- بەڵێ: بە تەما نییە، بەڵام لە زۆر باردا هێندەی «بەتەمابوون» داخراو و ڕواڵەتگۆڕە.

بە جارێ تێپەڕیوە... کە زەڕڕەیەک خراوەتە بەر چاوەدێریی ڕەفتاری گۆڕاوە لەچاو زەڕڕەی تر... لەم بابەتە نائاساییەی ماددەوە چەندەها دیاردە بەر چاو و هەست کەوتوە کە لەگەڵ ڕاستە حیسابی ڕواڵەتی ماددەی مردوو ناگونجێ...

نیسبییەی ئانیشتاین چشتی ئەوتۆ بە ئیسپات دەگەیەنێ باوەڕت بە گەلێ قەناعەتی بنجیت دەلەرزێ. کە ڕۆژێک لە ڕۆژان خوێندمەوە: تا ئێستا بیست ملیۆن کلافەی تیشک دۆزراوەتەوە، مرۆ یەک کلافەی ڕەنگەکانی پەلکەزێڕینە دەبینێت (گۆیا دەکاتە یەک لە دە ملیۆنی ئەو کلافە باسکراوانە)[30]. لە حیسابی خۆمدا ئەو ڕاستییانە یاریدەدەرم بوون نەک یەکخەر چونکە لە دەمێکەوە کەوتوومە سەر ڕەهابوون لە سیحری قسەی برا گەورە و پێشەوا و قسە ڕۆیشتووان هەر چونکە لە چەند تەجرەبەی مام سافیلکەوە دەروونبەتاڵیی ژمارەیەک لەو «سەرامەدان»ەم بۆ ڕوون بۆوە تا ئەوەی کە گەیشتمە تەمەنی دەمەتەقە و یەکتر هێنان و بردن بێ ئومێد بووم لە زوربەی هەرە زۆریان کە بتوانن ڕەها بن لەو کۆتە فیکرییەی پێیەوە قاڵب بەستوو بوون.

لە نموونەدا دەڵێم: بەر لە شۆڕشی 1958، ڕەنگە لە 1957، لەگەڵ سیاسەتمەدارێکی هەرە زلی بەری سەربە دیمۆکراسی وتووێژی هەمەلایەنەمان دەکرد، بە جووتە، و لە بواری مێژووی ژیاری مرۆوە گوتم، بەلای باوەڕی خۆمەوە وا دەزانم وڵاتی وەک خوارووی عێراق کەساڵی لە دوو کۆدا لافاوی وێرانکەر و «صیهود»[31]ی هاوین و پاییزی ڕێ نادا بیر بۆ ئەوە بچێ کە ئەسڵە دانیشتووی هەرێمەکە بەر لە بیست - سی هەزار ساڵەوە خەریکی کشتوکێڵی ئەو تەرزە شوێنە بووبن چونکە لافاوی کۆتایی زستان و سەرەتای بەهار هەموو وڵاتەکە دەکاتە گۆمی ئاوی لافاو کە ئاویش نزم بۆوە لە هاویندا دەستیان ناڕوات بە دەولکە ئەو مەزرایانە ئاو بدەن. وا دەزانم کۆمەڵی ئادەمی لە قەوارەی عەشیرەت، کە دەتوانێ بەربەرەکانی لافاو بێ و کەرەستەی ئاو سەرخستنی لە وزەدا بێ، بە خۆ و بەو هێزەوە هاتوونەتە دەوروپشتی دیجلە و فوراتی حیللە و

---

[30]- کلافە: حزمة

[31]- صیهود: لە زاراوەی عەرەبی عێراق، بە کزی کەمبوونەوەی ئاو دەگوترێ.

بەغدا. ناشێ مرۆی ئەسڵەوڵاتەکە کە هیچ فامێکی نەبوە بەکاری بهێنێ لە خۆپارێزی، هەموو ساڵێک پاش تووفان و صەیهوود وەکوو کرمی ناو لیتەی قوڕ سەر دەردەهێنێ بۆ زەراعەت کە ئەگەر بە خەیاڵیش ئەو زەراعەتەی بۆ ساز بدەین ئەو دوو دەردە کوشندەیە نایهێڵن... هەر لە نموونەدا گوتم، وڵاتی میسر بە «وفاء النیل»ی ساڵانە، بێ وێرانکاری، خاکەکەی زبڵڕێژ دەکرێتەوە، بە خێری خۆیان ساڵانە کچێکیان لە قەبەڵ دەکرد لە بری سپاسگوزاری...

چەندی کردم فایدەی نەبوو فکرەکەی ئەو سیاسەتمەدارە وەرگێڕمە سەر وردبوونەوە■ لە کێشەکە بەڵکوو، ڕووکەشیش بێ، باس لە چارێکی تووفان و صەیهوودی بەر لە بیست هەزار ساڵ بکات... هەر لەو بوارەوە پێم گوت: ژیار بە دەوری ئاوی سەرچاوە و کانیاوەوە، لەو وڵاتەی وەک عێراق، سەری هەڵداوە و دواتر پەڕیوتەوە بۆ دەوری دیجلە و فورات چونکە سەرچاوە و کانیاو لە دەستەڵاتی مرۆی بەر لە سەد هەزار ساڵیشن...

ئنجا ئەگەر خەباتگێڕی مێشک ئاخناو بە ئایدیۆلۆجیا و گرەگری سیاسەتی «بژی برمێ» ڕێ بە خۆی بدات بە دڵێکی ئارامتر و چاوێکی وردبینتر و هۆشێکی کرایەوەتر سەیری جیهانی بێگیان و گیانلەبەر و هۆشلەبەر بکات بتر تێوەی ڕامێنێت، بێگومان، پاش ئاشنابوونی لەگەڵ بەشێک لە نهێنیە تازە زانراوەکانی گێتی هەم لە نەڕەنەڕی کەم دەکاتەوە و هەم لە پەلەپەل. بۆ خۆی لە بیریەتی کە هەرزەکار بوو چ جۆرە بیروڕای کاڵوکرچی دەکردە دروشمی خەباتەکەی و لە تەمەنێکی کامڵتردا گاڵتەی بەو منداڵبازاڕییە هاتۆتەوە. با یەقینی هەبێ کە ئێستاکەش لەچاو 5-6 ساڵ بەدواتردا هەمان هەرزەکار دەردەچێت هەرچەند هەست بە خۆیشی نەکات وەک کە سادەلەوح و کەمفامیش بوو هەستی بە خۆی و نەفامیەکەی نەدەکرد.

ئەم دەردەی تێوەگلانی تاک و کۆمەڵ، بە تایبەتی لە مەیدانی خەباتدا (بە دوای بیرکولی و سەراوی و بێتەجرەبەیی) بڕیاری پێشەکیی داوە بە نەزۆکبوونی هەوڵ و تەقەلای گەییشتن بە ئامانجی بەرنامەی ئومێدەکانی. گریمان کۆمەڵگەی ئەوتۆیی ورووژا بەرەو گەشترین داخوازیی سیاسی کە بەسەر دروشمەکان دەشەکێتەوە و لە قوڕگ و سەرزمانان دەلەرێتەوە، کە دەزانین هۆشی بۆش لە خۆی حەرام کردوە

ڕازی بێت بە «مومکین» و ناموکینیش جێی ئومێد نییە، گومانت نەبێ لەوەدا، ئەو دروشمە گەش و بەتامە لە هەڵپەهەڵپ و غەڵبەغەڵبی خوێنکوڵاوان و نەعرەتەی پاڵەوانپفانە سپییات دەبێتەوە و تەنها پەڕۆیەکی بێگیانی کەمڕەنگ، گێلوگێل، بەسەر دارێکەوە بارتەقای هەنگاوی ئاپۆرەی شەپتکێکەران هەڵمەقۆیێ دەکات.

مرۆی خام، بیگرە لە خەڵقی بازاڕ و کووچە و کۆڵانان تا دەگاتە ڕابەری کاڵ، هەریەکە بە پێی حاڵوباری خۆی زۆر دادەبڕێ لەو داخوازییەی لێی دەبێتە مەراق یان بە دەرسدان لەم و لەوی وەرگرتوە، لە نموونەدا کە ئەم تەرزە مرۆیە کاڵە پڕ بەدەم و دڵ دەنەڕێنێ، یان ئازادی یان مردن، بیری نەکردۆتەوە لە جۆری ئازادی و مانای ئازادی و کەرەستەی ئازادی و بەرهەڵستی ئازادی، هەر هێندەی بە دڵدا دێت کە بە کەیفی خۆی بڵێت و بنەڕێت و بخەوێت و بخوات و بگەڕێت... هەرگیز بیر لەوە ناکاتەوە چۆناوچۆنی ئەو هەموو کەیفە بۆ ماوەی مانگ و ساڵ و دە ساڵ و درێژایی عومر بەردەوام دەبێ! جل و بەرگ و نان و سووتەمەنی و شەکرەمەنی... لە کوێوە هەڵدەقوڵێ! هەر هێندەی زانی تێکهەڵقژان پەیدا بوو لە نێوان کەیفەکەی خۆی و هی بەرەیەکی دیکە کە جۆری کەیفی ئەو جودایە لە هی خۆی... بە دڵیدا نایەت ئەو ئازادییە بێ سوود و نەتیجەی پێوەی هەڵدەپەڕێ بە ناچاری وشک دەبێتەوە چونکە بژێوی خەیاڵی نابێتە خۆراکی بەردەوامبوون، تا ئەگەر بە قودرەتی چاک و پیران بەردەوام بوو زۆر نابا برسییەتی و هیچ نەداری ئازادی و مازادی دەپێچێتەوە دەنا خەڵکەکە لە برسییەتیْ و ڕووتوقووتی، بێ نەخۆشی، هەڵدەوەرێ.

زۆر بە سەیری، یەکێک لەو هۆیانەی چاوەڕوانی لێ دەکرێ «بژی، بژی» بەربگرێت ئەوەیە کە نەڕەنەڕی خەباتگێران بە تەواوی کپ و خامۆش بێت هەتا بشێ دەنگی فام و هۆش و واقیع ببیسترێ. من بە چاوی خۆم مەرگی هەڵپەی وەسبە (وثبة)ی 1948 و تێکهاویشتنی خەباتگێرانی پاش سەرکەوتنەکەی شۆڕشی تەمووزی 1958م دیت. بازاڕ و جادەکان کە جێی گوزەرانی دوکاندارەکانی شار بوون بەحاڵ و کولەمەرگی کەمتاکورتێکی کاری ڕۆژانەیان پێ دەکرا لەبەر ڕێپەیمایی و موزاهەرە و شەڕەدەندووکێ و منداڵبازاڕی. ئەگەر هیچ توانایەکی دنیایی یان قیامەتی بەرهەڵستیی ئەو دوو گێژەلوولکەی نەکردبابە، هەردوویان لە خۆوە دەفشانەوە ئەمما بە وێرانکارییەکی لە ڕادەبەدەر.

ئازاری ئەو دیاردەی وەها درندە لەو هێندەی هێمای بۆ کرا ڕاناوەستێ. ئازاری کوشندەتر ئەوەیە کە ئەگەر هێزی گێژەلوولکەکە گەیشتبایە ئامانج و حوکمی گرتبایە دەست خۆی، ساڵەهای ساڵ و پشتاوپشت کوشتن و بڕین و پەلپەل کردن بەردەوام دەبوو وەک کە دیتمان ناپۆختەیی شۆڕشی ئۆکتۆبەر بە ڕابەریی ستالین و بریژنێڤ پتر لە 60 ساڵی خایاند کە دەبوو بە پێی هەموو پێوانە و کێشانەیەکی مێژووکرد و هۆشپەسەند، هەر لە سەرەتای شۆڕشی شوباتەوە، شۆڕشگێڕان دەست توند بکەن لە چەسپاندنی دیمۆکراسی نەک بە ڕووکەش و لەسەر کاغەز و لە ژێر دروشمی خۆتەفرەدان، کوانی دەردەکانی گەل بە ڕاگوشین نەرم بکەنەوە گۆیا گەییوە بۆ نەشتەرکاری... چەند ڕاستە گوتوویانە: لە من مەدەن لە برام بدەن وا دەزانم لە جەواڵی کا دەدەن! با کوتەکێکی بەرەی هەر بەرەیەک بوایە، بە ناوشانی ڕابەرانی ئۆکتۆبەر کەوتبایە بە نیازی خێراکردن لە وەدەستهێنانی مافەکانی گەل، ئەوسا دەماندیت ئۆکتۆبەر چییەکان چۆن دەکەوتنە دژی «تۆقاندنن» و ستەم و بێ قانوونی!!

هەرچەند ئەم نووسینە لەگەڵ «ڕەخنە لە خۆگرتن» ناگونجێ ئەمما دەستخاوێنی لێم داوا دەکات بڵێم، من لە نووسینی بەر لە 15-20 ساڵمدا لایەنگیری لینین و هاوڕێکانی بووم کە هاتن پەیمانی «بریێست لیتۆڤیسک» یان ئیمزا کرد بۆ ئەڵمانیا لە پێناوی سەلامەتی شۆڕشەکەیان لەوەشدا بە سەهوو چووبووم هەرچەند گوتووشمە و دەڵێمەوە، ئەگەر لینین دە ساڵی دیکە ژیابایە بە بێ نەخۆشی گەلێک تیژڕۆیی و کاڵۆکرچیی بزووتنەوەی بۆلشەڤیزمی تاوانبار دەکرد و لێی ژێوان دەبۆوە. ڕاستییەکەی، من وا دەزانم لینین لە توندییەوە بۆ نەرمی دەچوو بە پێچەوانەی ماو کە لە نەرمییەوە بۆ توندی چوو تا ئەوەی سەری نا بە چەپڕۆیی ساوایانە و لێشی زیاد کرد بە تاوانی شۆڕشی ڕۆشنبیری. من کە پێریێسترۆیکای گورباچێڤم خوێندەوە زانیم لە «بریێست لیتۆڤیسک» لینین و هاوڕێکانی ڕازی بوون بە وازهێنان لە پەنجا ملیۆن دانیشتووی وڵاتەکەیان کە ئەوسا سێیەکی خەڵقەکەی دەگرتەوە. بێگومان لینینی لەخۆڕازی بە خەیاڵیش لە غەیری خۆی نەدەسەلماند سێیەکی میللەت و خاکی ڕووس ببێتە شاباش بۆ دوژمنەکەیان لەلایەن کەسانێکی ئەوتۆوە کە بە دڵ تاوانباریان دەکات و دەیکرد بەر لەو پەیمانە.

ئێمە بە خەیاڵ وەها دابنێین کە چینی سەرووی پرۆلیتاریای رووسیای 1917 و 1918 وازیان لە سامانی خۆیان هێنابایە بۆ دەوڵەت ئایا بۆلشەڤیزم لێی دەسەلماندن ئەو سینەفەراحییەیان بۆ بە چاکە و پیاوەتی حیساب بکرێت؟ بەلامەوە روونە، تیژڕۆیانی ئەو سەردەمە لە دوو روەوە ئەو هەڵوەستەیان تاوانبار دەکرد: رووی یەکەم ئەوەیە کە لێیان گران دەهات چاکە بۆ چینێک غەیری چینی پرۆلیتاریا بچێتەوە. رووی دوەم ئەوەیە کە گیانی شۆرشگێرایەتیی نوێنەرانی پرۆلیتاریا بەو سەلماندنە دادەشکا و گەشەی سەرکوت کردنی «ناحەز» کزدەبوە. بەڵگەی ئەم گوتەیەم زۆرن من یەکێکیان دەخەمە روو. بۆلشەڤیزم بە دەیان ساڵ وەچەی چینی ناوەند و هەورازتر کە هیچ هێزێکیان نەمابوو، مامڵەتجودایيان لەگەڵدا دەکرا وەک بڵێی کۆنە حورمەتێکی باب و باپیران نەخۆشیی ساری بێت و بتەنێتەوە. لە موقارەنەدا کە ئەنوەر سادات بە بۆلشەڤیکەکان دەگرم لەوان سینەفەراحتر دەردەچێ کە کوری مەلیک فاروق لە دوای مەرگی باوکی داوای کرد لە سادات رێی پێ بدات بگەرێتەوە نیشتمانەکەی، سادات بە حورمەتەوە تەکلیفەکەی هەڵگرتەوە. ئەم میساله بچووکە وەکوو هەزارانی تر هەڵوەستی لێکتر جودای دوو ئیرادە بەرانبەر یەک جۆر هەڵکەوت بە ئیسپات دەگەیەنێ کە «مرۆ» بە تەبیاتی جودا لە مرۆیەکی دیکە رەفتاری جودا دەبێ لەگەڵ دوو «دەوروبەر»ی چوونیەک.

نەختێک جغزی پێک گرتنی هەڵوەستی کەسان و کۆمەڵان بەرانبەر واقیع فرەوان بکەین، ئاشکراتر دەبینین ئەندامانی یەک حیزب کەرت کەرت دەبن لە ئاست کێشەیەکی کمێک تێکەڵ پێکەڵ تا ئەوەی دەبن بە دوو حیزب یان بەشێکیان واز لە حیزبایەتی دەهێنێ... سەیری دینی ئیسلام بکە: دەیان مەزهەبی جودا لە جووتە سەرچاوەی قورئان و حەدیس هەڵقوڵین هەر چونکە مەلاکان بۆچوونیان لەیەکتر جودا بوو بێ ئەوەی بەرژەوەند یا ترس رۆڵێکی هەبووبێ. هەرای خەڵقی قورئان لە سەردەمی مەعتەسەمی عەبباسی لە تاکە نوختەی «عقيدة» هەڵایسا. نە تەما نە مەیل نە دردۆنگی و نە هیچ هۆیەکی دیکە دەخلی هەبوو بەسەر ئەو «فتنة»ی بێلزوم کە یەخەگیری بەرەی رووناکبیر و زاناکانی مەزنی دین بوو. دواتریش کە کڵوکۆی فیتنەکە دامرد بەسەر ئەو لایەنەدا شکایەوە کە هاندەری خەلیفە بوو بۆ سزادانی مەلایەکی نەڵێ قورئان مەخلووقە. ئاپۆرەی میللەتیش، هەناسەسارد و

هەناسەسوار و بێ ئیرادە و بێ تێگەیشتن ملەچەرخێی بوو بەملاو بەولاودا بزانێ دنیا چ باسە. دەوروبەرەکە بۆ هەموان یەک شت بوو بەڵام جۆری عەقیدە و بەس عەقیدە، هەم ئاگر بوو هەم ئاوی کوڵاو هەم شەکراوی بەفرینی هاوینە!

لە لاپەڕەی 32ی بەرگی سێیەمی کتێبی *«حاجی قادری کۆیی»* ڕایەکم دەربڕیوە لە بارەی ڕۆچوونی مرۆ لە دەروونی خۆی... بە داخەوە بەرگەکانی *«حاجی قادری کۆیی»*-م لا نەماون بەڵام خۆشبەختانە لە بەرگی یەکەمی تەرجەمەکراوی *«مرۆڤ و دەوروبەر»* بە عەرەبی [کە ئەمیشیان نوسخەی کوردیم لا نەماون] ئەو 20-30 دێڕەی سەر بەو بابەتە بەردەستە و من تەنها یەک ڕستەی دەقە عەرەبییەکە ڕادەگوێزم بۆ ئێرە:

> «ان البشر، ومعه الاجتماع، يرخي جذور ارتباطه بالوجود عبر قشرة سطحية رقيقة من المادة الى اعماق دخيلته...»

واتە، مرۆڤ، کۆمەڵایەتیشی لەگەڵدا بێ، ڕەگی پێوەندیەتیی خۆی بەناو توێژاڵێکی تەنکی ماددەدا بەرەو دەروونی دەنێرێ... (بێگومان دەقە کوردییەکە قاڵبێکی دیکەی هەیە بەڵام هەمان واتا بە دەستەوە دەدات).

دەزانم، کەسانێکی غەرقی شیتەڵ کردنی ماددین بایەخێک بەم بۆچوونە نادەن هەروەک بابایەکی غەیبپەرست ماڵی دنیا بە «چڵکی دەست» حیساب دەکات. نە بابای ماددی لە بێبایەخ کردنی «دەروون، ناخ» نیشانەی پێکاوە نە غەیبپەرستیش لە ئاست «چڵکی دەست» دروستبین بوە. من مامڵەتم لەگەڵ غەیبپەرست بەوەندە تەواو دەکەم کە بڵێم: ئەگەر چڵکی دەست، کە ماڵی دنیایە، شۆرا و دەستەکە خاوێن بۆوە بەچی دەچێتە حەج؟ چۆن برسییەک تێر دەکات؟ کەی دەتوانێ ژن بۆ کوڕەکەی بهێنێت؟ منداڵی ساوا بەڕێ دەکات بۆ خوێندنی پزیشکی و ئاتۆمی؟ چەکی خۆپارێزی لە کوێوە پەیدا دەکات؟ چەکەکە بێ «چڵکی دەست» چۆن پەیدا دەبێ...؟ ...؟ دەشبێ بڵێم هەر باوەڕی سەربە غەیب پتر لەگەڵ سۆز و بەزەیی و تەمای بەهەشت و ترسی دۆزخ (دوور لە کێشانە و پێوانەی هەندەسە و فەلەک و فیزیا و کیمیا و ئاتۆم، کە لە دەمی هاتنی کتێبە ئاسمانییەکان مەردمی غەریبپەرست ئەو حیکایەتانەی نەبیستبوو) خەریک بوو، باوەڕیشی بە خوا هەموو کەلێنی گومانی

کوێر کردبۆوە، بە ئاسانی دەگونجا لەگەڵ دەقە سادەکانی ئایین کە خوا تێیدا کاریگەرە و خاوەنە و خالقە... و چی بیەوێ دەیکات... «کونوا قردة خاسئین» بەسە بەلای دیندارەوە بۆ پەیدابوونی مەیموون لە مرۆی مەسخکراوە... داروین و لامارک و ئەێ و کێ و بیردۆزی و مێشکگوشینی پێ ناوێت...

هەرایەکی کەم! هەیە لە نێوان زانایانی ئایین و زانایانی سروشت لێرەدا مەودا نییە لێی بدوێین. هەر ئەوەندە دەڵێم کاریگەریی «خالق» لە باوەڕی دینداردا هەزار هێندەی کاریگەریی هێزەکانی سروشت متمانەبەخشترە بۆ تەفسیری بوون و زیندوویەتی و مردن و سووڕانی چەرخوفەلەکی جیهان و ئیمکانی داهاتی قیامەت...

ڕووی قسەم لە مرۆی ماددیی عیلمانیە کە بەلایەوە «دەوروبەر - سروشت» کاریگەر و مرۆ کارتێکراوە، لێرەش بە پێشەوە بە نووسین دەوری ئەم باسە هەڵاتووم زۆریشی تێدا شەکەت بووم نەک لەبەر تامەزرۆییم و بۆ شەڕەدەندووکێی دەمەتەقە بەڵکوو لەبەر پەرەسەندنی ماددیی سەربە چینانەتی و خۆدانە پاڵ لایەنێکی سیاسی جیهانی بە شێوەیەکی دەروێشی بۆ ماوەی 50-60 ساڵی لەمەوبەر بە پانایی و درێژایی کوردستانەکەی لەتلەتکراو. ئەگەر ڕەنجەڕۆیی و ناکامی و قوربانی دانی خۆڕایی لەلایەن بەرەی چەپی کورد لە پێناو خەیاڵاتی بەهەشتی پرۆلیتاریا، وێرای یەخەگرتنی «کوردایەتی» و تۆمەت و پاڵدانی و لەمپەڕ خستنەپێش هەنگاوەکانی، ئا ئەمانەش بخەینە سەر خەرمانە بەتاڵەکەی «خۆڕایی» حیسابەکە تامێکی دیکەی تێدەگەڕێ.

بۆ ئەوەی، بە پێی توانا تاکایەتیی مرۆ لە «کاریگەربوون» و ڕاشکان بەسەر دەوروبەردا ڕوونتر بکەمەوە، ئەم ئەزموونە فکرییەی چەند دێڕێکی بەدوا ئەم قسەیەمدا دەخەمە بەر نیگا و هۆشی خوێنەر. دەزانی جیهان بریتیە لە:

1. بوونەوەری بێگیان.
2. بوونەوەری گیاندار.
3. بوونەوەری هۆشدار کە مرۆ خۆیەتی.

سەرنجێکی سەرپێی و بێ مێشکگوشین تێتدەگەیەنێ کە جیهانی بێسەرەتا و بێکۆتایی و بێگیان، واتە جیهانی ماددی، لەچاو بوونەوەری گیاندار هێندە بەرین و قووڵ و بێ سنووورە، دەریا بە دڵۆپیش دەرناچن: ئنجا ئەم جیهانە ماددییەی وا زەبەللاح کە هۆش لە لێکدانەوەی دوورابییەکانی پەککەوتەیە لە ئاست ئەم دڵۆپە گیاندارە، سڕ و سارد و بێئیرادە و مردوە، نە دەزێ نە دەمرێ نە دەیەوێت نە هەست دەکات نە دەخوات نە دەزەڕێ نە دەنەڕێ و دەمیاوێنێ و دەجریوێنێ و نە تورە دەبێت و نە ئاشت... هەر هیچ هیچ هیچ سێبەرێکی کاریگەرایەتیی هێزی «زیندوەتی»ی پێوە نییە... یەک تەڵە گیای وشک، یەک میکرۆبی چاو نەدیتوو سەرلەبەر جیهانی مردوو پەک دەیەخێت لە ئەزموونی کاریگەرایەتیی دڵخواز. وابزانم لەمەدا چ خوێنەری چەپ چ ڕاست چ ناوەند، بەرهەڵستییان نییە چونکە بوونەوەری بێگیان پێناسەی «بێهەستی» و «بێخواز» مۆرکی هەرە گەورەی ئەزەل و ئەبەدیەتی.

سەلماندنی ئەم ڕاستییە، ئەگەر تاوگیری و دەمارکشتی بە خەبەر نەیەت، لەوانەیە «چەپگیر» زووتر لە ڕاستگیر قبوولی بکات چونکە حەقوحسێبی پرۆلیتاریا و «زێدە نرخ...» و خوێنمژی تێیدا بەخەبەر نایەت. لە نموونەدا دەڵێم چەپگیر هیچ بە خەیاڵیدا نایەت بڵێ جاڵجاڵۆکە بە هۆی ڕیسەکەی، کە هۆی بەرهەمهێنانیەتی، لێی چاوەڕوان دەکرا بەرەوپێش بچێت و ڕیسەکەشی پێش بیەخێت. مادەم هەرای نێوان کرێکار و خاوەن پارەی تێدا نییە جاڵجاڵۆکە و ڕیسەکەی خاڵەبەخش بێ لە نەگۆڕانی بەرەو پێشەوە... ملی وەقوتەوە!

بێینە حاڵوباری بوونەوەری بێگیان و گیاندار بەرانبەر بوونەوەری هۆشدار کە مرۆیە: هەروەک نەبوونی هێزی زیندوەتی لە جیهانی مردوو کاریگەرایەتیی پێوە نەهێشت لەتەک جانەوەر، ئەم جارەیان جیهانی ماددی و جیهانی زیندەوەر سەرلەبەریان سڕ و پەککەوتەن لەتەک هێزی «هۆشداری»ی مرۆ کە دیاردەی «کۆمەڵایەتی - مێژوو»ی لێ کەوتۆتەوە بە هەموو کاریگەرایەتی و گۆڕانکاری و بەرەوپێش چوون و مەتەڵ هەڵهێنانی «نهێنییەکانی»ی جیهان و بە هونەر و تەکنیک و زانستیەوە... بە چاکە و خراپەیەوە... بە گێژەلوولکەی تێکهاویشتنی ئایدیۆلۆژیەکان و گوریسکێشەکێی گونجان و نەگونجانی سوود و

بەرژەوەندەکانەوە و بە هێزی و گێژیی هەڵەی فیکرەوە تا ئەوەی هێندێک لەو مرۆیە دەفتەری نامۆیی جیهان دەخوێنێتەوە لەبەر تیشکی زانست و فەلسەفە و تەکنیک و هێندێکیش شەپلتە دەخوات و مەیموون بەرد و گاجووت دەپەرستێت... ئنجا ڕێی قسەم دەبێ کە بڵێم هەرچەند گیانلەبەر (غەیری مرۆ) بەو هێزەی ژیوەریی سروشتکرد و غەریزەی خۆپارێزی و بەردەوام کردنی نەسل لە نوختەنیگای کاریگەرایەتییەوە ڕاشکا بەسەر هەرچی بوونەوەری بێگیان هەیە. دیسانەوە بێ ئەوەی کەس مەنعی بکات. نەیتوانی «هۆی بەرهەمهێن» و ئامێری خۆپارێزیەکەی یەک میللیمەتر بباتە پێشەوە. بەمەشدا دیارە «دەوروبەر» چ تەئسیرێکی نەبوە لەلایەن بەرەوپێشتر بردنی حاڵوباری جانەوەر. تومەز کاریگەرایەیی هەستی غەریزە هەر ئەوەندەی بەبەرەوەیە کە لە سەدان هەزار ساڵەوە کردوویەتی و بایی ژین و بەردەوام کردنی نەسل جانەوەرەکەی تەیار کردوە...

نە ڕیسی جاڵجاڵۆکە و نە شانەی هەنگ و نە هێلانەی فندەگولە و شارەمێروو و نە هیچ سەروبەرێکی تێکڕای گیانلەبەر (غەیری مرۆ) گۆڕانێکی بەسەردا نایەت مەگەر لە ماوەی ملیۆنەها ساڵدا کە بۆ ئێستاکەمان جێی سەرنج لێگرتن نییە و کەسیش نازانێ لەو دوارۆژە دوور و درێژە سامناکەدا چەند جۆر جانەوەر قڕی تێدەکەوێت و چەندی بەردەوام دەبێت.

لەم حەقیقەتە بێ پەردە و تەئویلەی وەک بەدیهیەی ئاشکرا بۆت ڕوون دەبێتەوە کەوا هەروەک دەوروبەر بەهانای جانەوەر نەهات هۆی بەرمهێنی پێش بیەخێت و تەنها غەریزەکەی و هەستی ژیوەریەکەی بەڕێوەی دەبات، هەروەهاش مرۆ، بارتەقای جانەوەر، چ قەرزی دەوروبەری بەسەرەوە نییە لەو پێشکەوتنە کۆمەڵایەتیەی خەڵقی دەکات. هەستی ژیوەری و کاریگەریی غەریزە جانەوەری جوداکردەوە لە سروشتی مردوو، هەستی «هۆش» و سەرلەبەری سیفەتەکانی ئادەمیزادیش بوون بە هۆی پێشکەوتن و گەشە کردنی لێهاتوویی و خالیقیەتی، دەوروبەریش هەر ئەوەیە کە بێئیرادە خۆی گامەڵاس کردوە بۆ بەر ئیرادەی گیانلەبەران، ئیتر غەریزە تەنها ئامێری جانەوەرە و هۆش و غەریزەش ئامێری مرۆیە. هۆی بەرهەمهێنان لە مەڵبەندی «مرۆ» نەدەگۆڕا ئەگەر «هۆش»

نەیگۆڕیبایە وەک کە غەریزە نەیتوانی ڕیسی جاڵجاڵۆکە و هێلانەی لەکلەک و لانی بەراز بگۆڕێت وەیا جۆری نێچیر گرتن بە دەم ڕۆژگارەوە فرەبابەت بکات و بابەتەکان تێک ببەستێت و فەندی نوێی پێ پەیدا بکات بۆ خۆژیاندن و حەسانەوە.

من سەرم سوڕدەمێنێ لە مرۆی وەک ئەنگلز کە خەیاڵی بەم لایەنەدا نەچوە خۆ هێندەی شلایەتیی ئاو و ڕەقایەتیی بەرد ئاشکرایە. لەمەش زیاتر، «مرۆ» خۆی بە هۆش و غەریزەیەوە، دەوربەریشی لەگەڵدا بێ، قەرزداری «چۆنایەتی» ی یەکێک لە ئەنگوستەکانی دەستیەتی کە لە ڕیزی چوار ئەنگوستەکەی دیکەی لاداوە و بەرانبەریان دێت و دەچێت و - لە نموونەدا - داو بە کونی دەرزیدا ئاودیو دەکات. ئەگەر قامکی ئەستووری، وەک هی مەیموون، لە ڕیزی چوار قامکەکەی دیکەی بایە سەدان هەزار ساڵی دەویست تا «مرۆ» دەگەییشتە پلەیەکی ئەوتۆ لە بەرەوپێشچوون پێی بگوترێ «پلەی نیاندەرتاڵ».

بێگومان ئەوەی دەیڵێم بۆ ڕاکێشانی زەینی خوێنەرە کە بە ڕوونی بچێتە دڵیەوە، دەوروبەر و هۆی بەرهەم سێبەری مرۆن و لە دوایەوە دەڕۆن نەک جڵەوی ڕادەکێشن، ئەگەرنا هەر لە سەرەتای تێپەڕینی مرۆ لە «جانەوەری»یەوە بۆ «مرۆڤایەتی» پەنجەی پێنجەمی دەستی کردوە بە لاربوونەوە بۆ بەرانبەر چوار پەنجەکانی دیکەی ئیتر لە ماوەی سەد هەزار، میلۆن، پتر... ساڵدا بەتەواوی پەنجەکە جێی لەباری گرتوە... ڕێخۆڵەکوێرە بێ مامۆستا و هەر بەهۆی گۆڕانی جۆری خواردن و هەزم کردن بچووک بۆوە تا خۆی کرد بەو تەگەرەیەی کە زۆر جاران مرۆ دەکوژێت (ئەم مەیدانەی ئەندامانی لەش و خوار و ژوور کردنیان درێژخایێنە و دەمەتەقە هەڵدەگرێت، من لێی هەڵدێنم چونکە باسەکە پەکی نەکەوت لەسەری).

وەک دەبینیت تاکە یەک ئەنگوستی کاریگەر، بە تەنها خۆی و بەس، هەزار هێندەی دەوروبەر و میلۆن جار بەقەدەر هۆی بەرهەم کە مەخلوقی مرۆڤەکەیە، پێشخەری ئادەمیزاد بوە، ڕەنگە ئەگەر ئەنگوستەکە یاریدەدەر نەبوایە هەزاران ساڵی داهاتووی دەویست تا مرۆ دەگەییشتە پلەی داهێنانی ڕێی ئاسن و گەڕۆک... سەدان و پتر ساڵی دەویست تا فڕۆک نازانم چی دەکرد.

ئنجا ئەگەر بە چاوێکی نیوە خەوالووش سەیری حاڵەتەکە بکەیت سەیرت دێتەوە لەوەدا کە بلیمەتێکی وەکوو ئەنگلز بە دڵی ئارام و باوەڕ بەخۆ کردووە▪ دەیەوێ بە جیهان بسەلمێنێت کە «هۆی بەرهەم» و گۆڕانێکی بەسەریدا دێت خالقی مێژووە، ئیتر مرۆ دەست بگرێ بە کلکی نوێڵ و گاسن و چەکوچ و تەڵە و تەپکە و سەرەژوور پێیاندا هەڵکشێت بۆ ئاسمانگەڕی، پەحا چ گاڵتەیەکی بەو عالەموڵلایە و بە خۆیشی کردوە کە نەزانێ و نەزانن لاربوونەوەی پەنجەیەکی مرۆ لەگەڵ پژانی هۆش. وردەوردە، ڕێی فراژیبوون و سەرەژوور چوونی مرۆی قیرتاو کرد تا چەرخوفەلەکی ڕاستەقینەشی بە دیاری پێشکەش بە سروشت و بە گیانلەبەر و بە هۆی بەرهەم کرد کە دەزانین تا دەمی ئەم نووسینە - لە بەرەو کۆتایی ساڵی 1996ز - وەرزێر و کرێکاری کورد هەر لەگەڵ چەکوچ و داس خەریکە و ڕێی نەبوو بزانی ڕەگی دووجای «[س + ج] توان دوو» چ دەفەرموێت!! تومەز چەکوچ و داسەکە و ئاشی ئاوی و گێرەی کەر و گایەکە و خەڕەک و دەباغچیەتەکە و تەون و چنینە میراتیەکە غەززین و خۆیان نەگۆڕی.

ئەم بەستنەوەی گۆڕانی کۆمەلایەتی بە گۆڕانی هۆی بەرهەم وەک ئەوەیە بڵێی، کە مێردمنداڵە ڕیشی دەرکەوت دەبێتە هەرزەکار لە جیاتی ئەوەی بڵێی کە منداڵ گەیشتە تەمەنی هەرزەکاری مووی ڕیش و سمێڵی دەردێن... یان بڵێی کە گەنجیان گرت بە عەسکەر تەمەنی دەبێتە هەژدە ساڵی، واتا هەتا نەگیرێت بە عەسکەر ناگاتە هەژدەی ڕەبەق! دەسا مرۆ هەیە دەگاتە 25 ساڵیش نە مووی لە ڕیش و سمێڵان دەڕوێت و نە دەشکرێتە عەسکەر سەبەب بە نەخۆشیەکی خەفەکەری نەفەسبڕ وەک ئەو دەردەی ژێر دەستیی کورد کە لە ماوەی 2500 ساڵدا خوێن بە ڕەهایی لە دەمارانی نەسووڕایەوە ئەگینا ئەویش وەک نەتەوە دوابراوەکانی دەسەڵاتدار و ستەمکار - لەعنەت لە ستەمکاری ئەزەل و ئەبەد - سمێڵەخنکەیەکی دەهاتێ و چاوێکی دەبڕیە ماڵ و نامووسی جیرانەکانی و خۆی تەیار دەکرد بە سامانی ژێردەستان و تەپڵی تۆپانی بە دیل و نۆکەری بێگانە دەکرد.

دەڵێن مەلای مەشوور لەکلەکێکی گرت نیوەی دەندووکەکەی و نیوەی دوو لاقەکانی بڕینەوە و بەڕەڵلای کرد، گوتی: ئێستا دەڵێی تەیری... کوردەکە بە پێچەوانەی مەلی مەلا دەبێ لە قاچ و دەست و لووتی زیاد بکەیت هەتا وەک مەل تەقەتەق و

جرەجرێکی لە بەرەوە بێت... تومەز ناوناوەیەک، خواوراستان، میرێکی بابان و بەگلەرێکی سۆران و نازانم کوێ ماوەیەکی پشوودانی بۆ ڕێککەوتوە، ئەویش وەکوو مرۆی ئەو جیهانە شەق و زللەیەکی لە دۆست و دوژمن داوە، تاڕادەیەکیش، هەر نەبێ بۆ کاردروستایی خۆی لەشکرێکی پێکەوە ناوە و خەریکی ئاوەدان کردن بوە بۆ بژێو و دەرامەد و چەک و بەرچاوی و حەسوودکوێری. خولاسە، هۆی بەرهەمهێنی کورد نەغەزری بوو دژی کورد و گۆڕانکاری، کوردەکە خۆی بەرفەتی فراژیبوونی نەبوە سەبەب بە وشاری داگیرکەر لە چەپ و ڕاست و پێش و پاشەوە و بۆ ماوەی سەدەها ساڵی ڕەشوڕووت.

لێرەدا تێبینییەکی وەک تێوەرێخ خۆی ڕەپێش دەخات، ئەویش، تیشکێکی ڕوونکەرەوە دەهاوێژێ بۆ حیکایەتی دەوروبەر لە گۆشەنیگای سەربە هۆی بەرهەمەوە، کەڵەسیاسەتمەداری وەکوو ئەنگلز و بەرەی پانوپۆڕی مەدرەسەکەی کە دێن بە شان و باڵی چەکوچ و داس و فابریقە و بایسکل و مۆتۆرسکل و شەمەندەفەر... هەڵدەڵێن بە نیازی زل کردنی دەوری کرێکار و وەرزێر لە بەرەو پێشبردنی کۆمەڵایەتی، زۆر بە سەیری، لە چەند خاڵێکدا حیسابەکەیان بەرەواژ دەبێتەوە. حیکایەتەکەش هێندە ئاشکرایە، ئەگەر دەمارکشتی لەگەڵدا نەبێ، هی نەسەلماندن نییە.

خاڵی یەکەم: تاکە یەک هۆی بەرهەم کە لە ڕێکار (مستوی Level)ی تەپکە و بەردەقانی ژووررووتر بێت، ئیتر هەر لە چەکوچ و داسەوە تا دەگاتە فابریقەی زەڕڕە هیچ کامێکی بە دەستی عەمەلە و وەرزێر دروست نەکراوە، هەمووی وەستای شارستان کردوونی (مەبەس لە ئامێری سەرەتایی وەک چەکوچ و داسە، ▪ جایی فابریقەی قوماش) خەڕەک، ئاش، کاروباری جووت و چشتی ئەوتۆیی کەسانێک لێی مەعلانن کە دروستی دەکەن و، بە زۆریش، دەیانفرۆشن. تەپکە و بەردەقانی وەک کەلا بە گوزانێ لەوانەیە هەموو کەسێک بیانسازێنێ بەڵام تیروکەوان هی مرۆی لێزانە. لەگەڵ ئەمەشدا کە کرێکار و وەرزێر لەو جۆرە ئامێرەی سەرەتایی وەک تیروکەوان و گاسن و داس و چەکوچ نابەڵەدە، وەستای لێزانیش کە بە عادەت نەخوێندوو بوو ڕاستە و کۆنیا و پەرگار و وردیلەکانی هەندەسیی بەکار نەدەهێنان چونکە هەم بێسەواد بوو هەم کاری پێیان نەبوو.

سندووقی قوڕی سواغ لیزانێکی بازاڕ بێ قەڵەم و پەرگار دروستی دەکرد، عەمەلەی قوڕکێششیش، جاران، بەکرێی زیادەوە و بێ هیچ مەهارەتێک وەک ئالەت یان، دوور لە حورمەتی مرۆڤایەتیەکەی، ئاژەڵێکی لێراهاتوو قوڕی سەردەخست بۆیان...

خاڵی دوەم: کە لەو ئامێرە سەرەتاییانە هەڵکشایت بەرەو صناعة - پیشەسازی - و بەولاترەوە بۆ ئاتۆم و ئاسمانگەڕی و کاری ساحیرانە، پێبەپێی هەڵکشانت، ژمارەی «لێزانان» کەم دەبنەوە... هەروەها کە ڕووت کردە فەلسەفە و زانست و تەکنیک پێوەندیت بە کرێکار و وەرزێر و وەستای مەعلان و زرە خوێندەوار و شاعیر و نووسەر و هونەرکاری عادەتییەوە نامێنێ و دەچیتە جیهانێکی پێی بڵێی «سدرة المنتهى» ی ژووررووی هەموو بوونەوە... لەم مەیدانەدا کەمتاکورتێکی مرۆ خانەخوێن و چەند میوانێکی ئەدیب و هونەرکار و زانای سەربە کۆمەڵایەتی تێیدا سەرەتاتکە لە چەندوچۆنی هەرێمەکە دەکەن. لەم تاقمە بەرەژێرتر کەس نییە دەوری خزمەتکاریش ببینێت لە هەرێمەکە چونکە بە دەرسدانیش ناتوانێ بزانێ هێلکەوڕۆن و شلەساواری ئەو شوێنە چۆناوچۆنی ساز دەبێت. لەوانەیە بە نووسینی ڕەمز مووبەق ئیش بکات...

خاڵی سێیەم: کە لەم سەرەژوور چوونەدا گەییشتیتە شوێنێکی هەرە بەرزی وەک مەجلیسی وەزیران کە پارێزەر و سەرۆکی ئەرکانیش نایگەنێ، خۆت لە جیهانێکی چۆڵوهۆڵ دەبینیتەوە لەچاو جنجاڵی کووچە و بازاڕ و سینەما و زەماوەند و لەشکر چونکە بێگومان ئەو کەسانەی کە بە ڕاستی ڕەوەڕەوی مێژوو - کۆمەڵایەتی دەگێڕن تاکوتەرایەکن ژمارەیان ناگاتە یەک لە هەزاری ئادەمیزاد... بەشێک لەو زانستە سەختانەی وەک «نیسبیة» بەحاڵ یەک لە ملیۆنی بنیادەم تێی دەگات. دەشبێ بزانین بەرەوپێشچوونی کۆمەڵایەتی بەندە بەو زانستە بنەڕەتیانەی بێ ئەوان و زاناکانیان یەک هەنگاو بەولای سنووری ئێستاکەی شارستانەتیەوە لە ئیمکاندا نییە. بەڵکوو مەودایەکی هەرە پێشەوەی شارستانەیتی ئەم ڕۆژگارەش دەسەڵاتی مرۆی لێ دەکشێتەوە چونکە خەتی گردەبڕ نییە لە نێوان قۆناغی زانست و تەکنیک، کە وێکڕا بەرەوپێش دەچن لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێک. بەناچاری هەر قۆناغە وردە دەماری پێوەندایەتیی هەیە بە قۆناغی لە خۆی پێشکەوتووتر و

پاشکەوتووریشەوە ئنجا ئەگەر قۆناغی پێشکەوتووتر وێران بوو داوەکانی قۆناغی بەرەژێرتر کە پێکەوە بەندە وشک دەبنەوە و قۆناغەکە دادەلەنگێت.

ئەم حیکایەتەش خۆی لە خۆیدا سەرەتایی و مەیلەو بەدیهییەیە، بەداخەوە هەنگاوی بێپەروا و گوێ نەدەر و بە پەلە بە سەریدا دەکشێت و ئەنباز بۆ مەودای ئەولاتر دەهاوێت بەمەشدا نە لە قۆناغی خۆی نە هی دواتر دەگات. هەر دەشبێ وەها بێت چونکە کە فکری مرۆ چاوبڕکێی لەگەڵ هۆی بەرهەمهێنان کرد و پشتی پێی بەست وەک کە هۆیەکە لە ئاسمانەوە بۆی دابەزیبێت و ڕۆستەمانە گیروگرفتی گۆڕانکاری مێژوویی [کۆمەڵایەتی] تەخت کردبێت. ئیتر فلتەفلتی دیکە چ لزومێکی دەمێنێ.

خاڵی چوارەم: پەنچەگیر کردن لە هۆی بەرهەم بۆ تەفسیری بەرەوپێشچوونی مرۆ خۆخافڵاندنێکی سادەلەوح و ساکارە لە حەقیقەتی هۆیەکانی بەرەوپێشبوونەوەی کۆمەڵگەی مرۆ کە دەزانین ئامانجێکی سیاسی بریتی لە بایەخدان بە دەوری پرۆلیتاریای بەستەزمان حورمەتی چەکوچ و داس و ئامێری وەک ئەمانە بەسەر مێژوودا دەسەپێنێ کە لەوانەوە حورمەت بۆ وەرزێر و کرێکار بڕوات. ئەو ئامێرانە و هی وەک ئەوان، سەرلەبەریان، هەر بایی هونەری چەنبۆڵە و کەڵبەی گورگ و ڕێوی دەوریان هەبوە لە پێشخستنی مرۆ چونکە تەنها لە جغزی بژێو پەیدا کردن، کە مەیموون و پشیلە و لەکلەکیش خەریکی بژێوە و پێشیش ناکەوێ، بەکارهێنراون و هەرگیز بیری وەرزێر و عەمەلەیان نەبردوە بۆ تاکە مەسەلەیەکی حیساب وەک:

6+1=7

9/1.5=6

5-3=2

مەبەستیشم لەمەدا ئەوەیە کە شەبەنگی ئەم مەسەلانە بە مێشکیدا تێنەپەڕیوە نەک دەقی نووسراوی مەسەلەکان چونکە نەخوێندوو بوە.

چەکوچ و داسی سیحراوی وەهای لە دەروێشەکانی خۆی کردوە تێنەفکرن لەو ڕاستییە زەبەللاحەی کەوا نەک هەر ئامێری خوێڕیلە بەڵکوو هی لەوانیش

هونەراویتر دەخلی نەبوە، یەکسەر، کار بکاتە چەندین هونەر و چالاکیی هزشەکی و زانستی بنەڕەتی: فەلسەفە ئەگەر لە مشار و چەکوچ و داس هەڵسابایە دەبوو یەک فەلسەفە هەبێ... ئاسماننناسی بەر لە 3000 ساڵ بیری بۆ ئەوە چوە کە ڕۆژ سەدەها جار لە ئەرز گەورەترە [ئێستاش وەرزێر و کرێکار لەم مەسەلەیە بێئاگایە] و دەیزانی ڕۆژگیران و مانگگیران چین و لە قوتبەکان شەش مانگ شەو و شەش مانگ ڕۆژ بەردەوامە. هەندەسەی ئیقلیدس ئیمرۆکەش تاکە یەک وەرزێر نییە (بە ورێنەش) بیری لێ بکاتەوە. تەحنیت و مۆمیای میسری کۆن لە هی ئەم سەردەمەش پێشکەوتووتر بوە. پەیکەرتراشی و مۆسیقا و وێنەکێشی و نەخش و نیگار و هەموو هونەرێکی جوان... ئەدەب و داب و دەستووری ژیانی تەلار و قەسرەکان... چەکوخشڵی زینەتی... دین و ئایدیۆلۆجی سەربە غەیب و سیاسەت...

خولاسە دەریا دەریای سەنعەت و تەکنیک و دۆزینەوە و داهێنان هەن خۆیان دەبنە هۆی گۆڕانی ئامێری بەرهەمهێنان، لە هەموو حاڵانیشدا وەرزێر و کرێکار کە خاڵقی تەئریخن بە پێی بۆچوونی ئەنگلز و مەدرەسەکەی لە هیچ ڕوویەکەوە، نە بە چەکوچ و داسەکەی و نە بە فکرە جنۆکاویەکەی و نە بە هیچ سەروبەرێکی ژیان و بەسەر بردنیەوەی، یەک هەنگاو چەرخی مێژووی نەسووڕاندوە خۆ ئەگەر بیشی سووڕێنێ سەکەتی دەکات.

هەڵبەت من کە ئەمە دەڵێم لە نوختە نیگای حەقیقەتەوە تابلۆی کۆمەڵایەتی دەخوێنمەوە. هەر لەو نیگایەوەش من پتر دۆستی کرێکار و وەرزێرم و لایەنگیری ئیرادەی ئازادیانم چونکە بێگومان هەرچی مەدح و سەنای هەڵبەستراو هەیە لەسەر کاغەر و لە وتوێژدا هەمووی بەرەواژ دەبێتەوە لە ئەزموونندا: مەدح و سەنای درۆزن تەپکەی ڕاوکردنە. کەسێکی مێشکی عەمەلە بە ورێنەی بەنگکێشانە بۆ خۆی بدزێتەوە، بیەوێت و نەیەوێت، هەر دەکێشێتەوە بۆ سەرکوت کردن و دەستوپێ بەستن چونکە ئەگەر وەها نەکات و پەندە ناعەمەلیەکانی ببنە دەستووری مامڵەت کردن لەگەڵ کرێکار یەک حەفتە بەردەوام نابێ لەسەر سەکۆی پەندیاری. ئەو بۆیە بە کرێکار دەڵێ «خاڵە» هەتا چوێلەکانی بۆ بگرێ نەک خۆی چوێلکە بگرێ بۆ کرێکار.

لە مانگی تشرینی 1996 کتێبێکی بە ناونیشانی *«المخابرات السوفیاتیة من الداخل: الاسطورة والواقع»* بە قەڵەمی ڤلادیمیر کوزیشکن کەوتە دەستم و خوێندمەوە. ئەگەر دەیەکی ئەو کتێبە ڕاست بێ دیسانەوە زیادە لە پێویست... ئەو هەموو خواری و بێقانوونی و ستەم و سووک کردنی خەڵق، هیچی ڕەنگ و دەنگدانەوەی هۆی بەرهەم نەبوە تەنانەت ڕاڕەویشیان پێکتردا ڕەت نابن. هەرچی هەیە لە سەرەچاوی دڵ و دەروونی دەسەڵاتدارەکانی دەوڵەت زەنەی کردوە و لەوانەوە سەرەژێر بۆتەوە بۆ کاربەدەستانی حکومەت.

چ لە سۆڤیتستان بێت و چ لە شوێنێکی دیکە بێت، هۆی بەرهەم و نابەرهەم لە خۆوە چاکە و خراپە ناکەن، بوونیشیان خەڵقی مرۆیە کە لە کاریشیان دێنێت ڕۆحیان بەبەر نایەت مەگەر خۆی زیندوو بێت وەک وڵاخ و شەهێن و تاژی. مرۆ لە سەرەتای خەڵق کردنی هۆیەک لە هۆیەکانی بەرهەمهێنانەوە نیازی دەروونی خۆی و بەرژەوەندیکی ڕەچاوی کردبێ لەو ئامێرەی دەپێچێت نەک ئامێر مرۆ پەت دەکات بۆ ئەو بەرژەوەندەی لەو ئامێرەوە بەدەست دەکەوێت: ڕاستە بڵێین بابایەکی سەنعەتکار مەهارەتی خۆی بەکار دەهێنێ لە دروست کردنی ئامێرێک بەکەڵکی مرۆ بێت و بەوەدا دەشێ بگوترێ سنعەتکار پێی دەکرێ سواری مجێزی خەڵق ببێت تا ئەوەی پسپۆڕانی پۆشاک و خۆراک و کەیفەمەنی هەموو عومریان بەسەر دەبەن لە ڕام کردنی ئیرادەی میلۆنەها کەس، بە جۆرێکیش ئەسیریان دەکەن دەبنە قورەچەورەی ناو لەپیان.

ڕەنگە لەو نموونانەی هێنامنەوە بە بابەتی ئەوتۆ کە هۆی بەرهەم پەیوەندی پێوە نییە، هێندێکیان تارادەیەک سەروکاری لەگەڵ هۆی بەرهەم و ئامێری سازاندن هەبێت، بەڵام دیسانەوە نموونەکانی و هۆیەکانی بەرهەم و ئامێرەکانی گشتیان زادەی هۆش و ئیرادەی مرۆن. پەیکەرتراشێک وەیان نیگارکێشێک کە لە کاغ وەیا کەنیشتە مەڕمەڕ و فرچە و چەکوچ و بۆیاخ و نازانم چی بەکاردەهێنێت ئیرادەی خۆی زاڵ کردوە بەسەر ئەو شتانەدا کە زووتر شتەکان مرۆ دروستی کردبوون. سەرێک لە قورئان خوار بکەوە کە لە ماوەی سی ساڵێکدا دوو دەوڵەتی هەرە زلی ڕۆژهەڵاتی سەرەنگرێ کرد، تاکە یەک پیتی نییە بەند بێ بە غەیری دڵ و زمانی پێغەمبەرەوە تا ئەوەی لە سەرەتادا نەشدەنووسران. بەر لە قورئان دەریا دەریای

شیعر و پەندی شاعیر و کاهینەکان، لە وڵاتی ڕەمڵستانی عەرەب. هیچ کارگەیەک نەبوو مەگەر حوشتر و خورما ئەو جۆرە حیکمەتە و هەستەی وەها ورد و نازک بتەنیتەوە. چەندێکی ئەم دێڕە شیعرە لەگەڵ خۆمدا دەڵێمەوە، کە نازانم خاوەنەکەیشی کامیانە، دڵم میروولان دەکات:

سئمت تكاليف الحياة ومن يعش
ثمانين حولا، لا أبالك، يسأم

یان لە بوارێکی دیکەوە دەڵێ:

رأيت المنايا خَبْطَ عشـواء مَـنْ تُصِـب
تُمِـتْهُ ومـــن تـخـطـئ يُـعَـمَّـرْ فـيـهـرَمِ

یان کە تەعبیر لە واقیع دەداتەوە:

وَمَنْ لَـمْ يَـذُدْ عَنْ حَوْضِهِ بِسِلاحِهِ
يُـهَدَّمْ وَمَنْ لا يَظْلِمِ الـنَّاسَ يُظْلَمِ

شیعری ئەوتۆ، پەند، بەستە، بالۆرە، لاوک، عەتابە، ئایای، ئەڵڵاوەیسی، هەبوو نەبوو کەس لە خوا گەورەتر نەبوو، ساڵحی نسۆی قاوەچی و کەژ، کاکە مەم و زین هیچی خزمایەتی نییە لەگەڵ ئامێر و سەرمایە و گۆرانی هۆی بەرهەم... لەمانە گرنگتر زمانی ئاخاوتن کە نەتەوان لە یەکتر دڕدۆنگ دەکات مادەم دوو جیرانی خاوەن دوو جۆرە زمان بن، بە خۆ و بەو هەموو وشەسازی و ڕێزمان و ڕستە و دەستەواژەی تێدایە مەخلوقی سەد لە سەدی ئادەمیزادە چونکە هیچ کامێکی غەیری هۆش و ویژدانی مرۆ دەخلی نەبوە بەسەر پەیدابوونی، تەنانەت زمان پتر ئەولادی مرۆیە لە کوڕ و کچەکانی چونکە لەشی منداڵ بە خۆراکی دایکی دەڕسکێ خۆراکیش بریتییە لە گۆشت و سەوزە و ئاو و کمێک خوێ. ئەم نیسبەتەی زمان لەگەڵ ئاخێوەر، هەر خزیەتی درێژ دەبێتەوە بەرەو دوارۆژ و چەندین کەڵی لێ دەبێتەوە وەک: گۆرانی، حیساب، هەندەسە، پزشکیی، فەلسەفە...

خولاسە هەرچی ئەدەب و زانست و هونەر هەیە زادەی دوو کاریگەرن

1. بڕشتی هۆش
2. توانای ئاخاوتن...

دیارە هەمان دوو کاریگەر خۆیانن دەبنە درۆزن و جنێوەدەر و عەوامخەڵەتێن و قۆڵبڕ و ستالین و هیتلەر و سادیست و مازۆخی و نەرجسی و خۆفرۆش و وەتەنفرۆش... لەم لێکدانەوەیە و هەرچی وەک ئەو هەیە دەردەکەوێ [بێ قسەی منیش هەر ئاشکرایە] سەرلەبەری باوەڕ و زانست و هونەر و داهێنان و دۆزینەوە یەکسەر و سەرانسەر لە ماکی «مرۆڤایەتی» دەزێتەوە، هۆی بەرهەمیش چ داس بێت و چ فابریقەی زەڕڕە بێت و چ بووکەشووشەی ساوایان بێت فەرقیان نییە لەگەڵ قسەی دەم کە زادەی مرۆیە. هەرگیزاو هەرگیز بەر لە پەیدابوونی مرۆ، بە خۆی و وزەی هۆش و لەباریی دەست و پەنجەکان و لەشیەوە، لە ئیمکاندا نەبوە «کۆمەڵایەتی»ی سەربە تەئریخ پەیدا ببێت. کە دەشڵێم «سەر بە تەئریخ» لەگەڵ ئەم ڕاستییەی کە تەئریخ و کۆمەڵایەتی یەک شتن، مەبەستمە بەعزەک لە مەهارەتی وەک هێلانەی قولتە و شانەی هەنگ و تەرزە فێلێکی غەریزەی جانەوەران دەرهاوێژم لە چغزی «تەئریخ - کۆمەڵایەتی» کە بەڕاستی جودایە لە ڕەفتار و کرداری جانەوەری غەریزەداری بێهۆش، لەم ڕووەوە کە کاری غەریزە گۆڕان هەڵناگرێت و هەتا سەدهەزار و پێنجسەدهەزار ساڵیش و بەولاوە تریش هەر خۆی دووبارە دەکاتەوە، کاری مرۆ بەهۆی لێکدانەوەی هۆش بەبەریەوە هەیە لەباری لەباردا دەوروبەر بگۆڕێت بە ئامێر و بە قانوون و بە خانوو و بە باوەڕ و بە گۆشتی بەرازیەوە. چی بوە لە گۆڕانکاریی دەروون و دەرەوەی مرۆ بە خانە و مۆسیقا و ساحەی گۆلفیەوە بەرهەمی یەکسەری هۆشە. لایەنی غەریزە کاری ئاسایی خۆی دەکات وەک هی جانەوەر، نەشمدیتوە نووسرابێ غەریزە دەوری هەبووبێ لە فراژووتنی ژیاری مرۆ... دەمێنێتەوە مەڵبەندی هەستی شەشەم و چەندەم و مەڵبەندی جیهانی دەروون و هۆشی وون کە جارێ ئەو مەڵبەندانە خەبەرێکیان بە من نەگەیشتوە لەبارەی هەبوونی پەیوەندییەک لە نێوان چالاکییان، بە چاکە یا بە خراپە. و هێزی هۆشی ئاگاداری مرۆ... بەهەمەحاڵ ئەم لایەنەی وا

پەنامەکی کە نەزانین دەخلی بەسەر هۆشەوە هەیە یان نییە هەر بە جارێ کەڵکی دەبڕێ لەوەی سەروکارێکی هەبێ لەگەڵ ئامێر و هۆی بەرهەم.

سیفەتی «زاتیبوونی» مرۆ، پێبەپێی پێشکەوتنی زانست و تەکنیک [بە تایبەتی لەوەتەی بیردۆزیی «نسبية» تێکەڵ بە ژین و ژیار بوە] گەیشتە ئاستێک پێویستی بوو بە ئالەتی ئەوتۆ لە خۆی هەستیارتر بێ، لێرەوە زاناکانی ئاسمانگەڕی شوێنێکی هەمواریان دەستنیشان کرد بۆ دابەزینی کەشتییەکی ئاسمانی کە لەسەر مانگ دەسووڕایەوە و جێی لەباری نەدەدۆزیەوە... ئێمە جارێ لە سەرەتاکانی فتوحاتی زانستی مرۆین: لەو دەمە تێفکرە کە مرۆ لە خێرایی تیشک تێدەپەڕێ [وەک بڵێی دەچێتە ئەو دیوی جیهانی ماددی...]. زەمانە لغاو دەکات بۆ بەر خوازی خۆی... دەچێتە ناو زەڕرە... دەڕوا بۆ دواڕۆژ... هەڵدەگەڕێتەوە بۆ ڕابردوو. ئێمەش خەریکین وەک بوتپەرست بایەخ و پیرۆزی بۆ هۆی بەرهەم ساختە دەکەین هەر هەتا، لەسەر ڕووی کاغەز، کرێکار و وەرزێر ببنە حکومەت کە دەزانین و دەبێ بزانین پرۆلیتاریا تا ئێستاکەش لە وڵاتی پێشکەوتوو ناتوانێ ببێتە مامۆستای زانکۆ یان ئەندازیاری جیهانی ئاتۆم یان سەرۆکی سپا یان پارێزگاری شارێکی وەک دهۆک [لە ئەورووپا].

خولاسە هەتا وەرزێر و کرێکار لە قەپێلکی پرۆلیتاری دەرنەچن ناتوانن ببنە حکومەت، بەڵێ لە وڵاتی پێشکەوتوو هەموو مافێکی پارێزراوە و قسەی هەڵدەگیرێتەوە و لە دەنگدانی هەڵبژاردنی نوێنەران دەتوانێ حکومەت بڕمێنێ و حیزبێکی دیکە بکات بە حکومەت، ڕۆژێکیش دێت [با بڵێین دوای 200، 100 ساڵ] لزوم نامێنێ بە هێزی ماسولکەی ئادەمیزاد چونکە ئامێری فەننی ئەوسا لە مرۆ شارەزایانەتر کارسازیی هەموو پێداویستێک دەکات. ڕاستییەکەی دروشمی چەکوچ و داس کە زێدە سەرەتایی و ناجۆرن بەیێکە زڕ بوون. هەر نەبێ ئامێرێکی پێشکەوتووتر ببێتە سەرپەرگ، دەنا ڕێ دەبێ بگوترێ لەلایەن عەقیدەشەوە پێویستە بوتەکانی بەر لە 1400 ساڵ دەپەرستران بگەڕێنەوە بۆ حورمەتی ئەوسایان چونکە مخابنە گاسن ناز بکات بەسەر تراکتۆردا و چەکوچیش گاڵتە بەو ئامێر نوێیانە بکات کە ناویشیان نازانم چ قەیدی دەکرد قەڵەم یەکێک بوایە لەو

دروشمانە؟ تۆ بڵێی تۆمەتی بۆرجوازیەتی وەپاڵ بدرێت؟ ئەدی چ دەڵێت ئەگەر دینداران دروشمی زەرگ و دەفیان دانا لە جیاتی؟

ڕاستییەکەی، هەڵگرتنی شکڵی چەکوچ و داس خۆی لە خۆیدا هێمایەکی زێدە بەهێزی هەیە بۆ جۆری بیر کردنەوە و کردار و ڕەفتاری خاوەنەکانی ئەو دروشمە. جاری بەر لە هەموو شتێک بایەخیان بایی پوولێک نەداوە بە زانست، هونەر، فەلسەفە، جوانکاری، کە ئەگەر ئەمانە نەبوونایە فکری سەربە پرۆلیتاریا نە دەرسکا لە پزدانی کۆمەڵایەتی. 5000 ساڵ بوو چەکوچ و داس لە کاردا بوون تاکە کەسێک نەهات بەستەیەکی بە هیچیان هەڵبڵێ. عەمەلە و ڕەنجبەر لە ناچارییەوە نەبایە یەک تۆپە قوڕیشیان پێدا نەدەدان (مەرج نییە چەکوچ و داس لە ئاسن دروست کرابن).

ئێمە ئەگەر بە پەلە نەبین یان فێڵ لە خۆمان نەکەین یان لایەنگیر نەبین دەبێ بسەلمێنین، بە پێی کاریگەرایەتیی هۆی بەرهەم و ڕاشکانی بەسەر ئیرادەی مرۆڤدا، هەر کاریگەرێکی بوە دەستوور لای خەڵق یەک جۆرە ڕەفتار بە هەموو خەڵق بکات. لە نموونەدا دەڵێم، کە مرۆ گەیشتە پلەی «مارەکردن و زەناشوییی» دەبێ یەک جۆرە مارەبڕین پەرەبستێنێ وەک کە جانەوەر تاکە یەک ڕەفتاری هەیە لە گەییشتنی نێرینە بە مێینە، کەچی مرۆ چەندین نەوعی مارەبڕین و بێ مارەیی و یەکژنە و دەژنە و سەدژنە و جاریەی بێ ئەژمار و تەڵاقدان و حەرامبوونی تەڵاق و چی و چی هەیە تا ئەوەی بە یەکتر شیان لە نێوان نێر و مێ داستانێکە بۆ خۆی.

برای شیری و خوشکی شیری لای قەومێک پێکتر دەشیەن و لای غەیری ئەو ناشیەن... فیرعەونەکانی میسر خوشکی خۆیان مارە دەکرد تا کچێکی ببێت و دواتر مارەیان ددکرد بۆ ئەوەی منداڵەکەیان سەدی لەسەد خوێنی پاکی فیرعەونایەتی لە دەماران بگەڕێ... لە هەندێ شوێنی کەنداوی عەرەب پیاو شووی دەکرد بە پیاو و دەکەوتە حەرەم و دەگوترا «إنستر» واتە «پۆشرا» بە مەبەستی شوو کردن و حەرامبوونی خۆ نیشاندان بە نێرینەی نامەحرەم.

پیاوێکی موحتەرەمی کۆیی لە شەڕی یەکەمی جیهانی ئەسیر بوو، کەوتە هیندستان و برادەرێکی خەڵقی مەسکەت بوو بە ئاشنای... مەکسەتیەکە زووتر ئیزن درا...

کاتێک کۆییەکە لە گەڕانەوەی بۆ وڵات گەیشتە مەسکەت، ئەحواڵی برادەرەکەی پرسی گوتبوویان «إنستر» نەیتوانی سەردانی بکات...

تۆ سەیری هەڵوەستی مرۆ بکە لە «خۆراک» چەندی حەرامە و چەندی حەڵاڵە: خۆراک بە پێی راستەحیسابی دەخلی بەسەر ژیانەوە. دەبوو حەرامی نەبا یان هەر نەبێ حەرام کردنەکە بۆ هەموو مرۆڤایەتی بێت کەچی حیکایەتەکە جۆرێکی ترە، هێندەش نامەفهوومە تارادەیەک کە ئەگەر تیغ لە جێگەیەکی گەردەنی کوشتی سوریچک هەڵنەبڕێتەوە مردار حیساب دەکرێت و ناخورێ کەچی لە دینێکی تر مریشک خەفە دەکەن نەکا خوێنی خەسار بێت. خەڵقیش هەیە دین و مینی بەلاوە ورێنەیە... لە بیرمە عومرم دە ساڵی بوو عەسرێکیان لە ماڵی خۆمان مریشکێک، ئەمما مریشک، سەربڕا پووری گەورەم سەیری کرد گوتی مریشکەکە مردار حیساب دەکرێ کەس گۆشتەکەی نەخوات. چەندی باوکم ویستی ئیقناعی بکات نەیسەلماند، ناچار مریشکەکە درایە خەڵقی تر لەسەر فتوای باوکم... پوورم خوشکی گەورەی باوکم بوو، بەچاوی دایکی خۆی سەیری دەکرد...

شەراب لە ئیسلامەتی بە دەقی قورئان نەک حەرامە بەڵکوو... «رجس، من عمل الشیطان» داندراوە کەچی لە دینی مەسیح شەراب و نانی قوربانی دەبێتە خوێن لە لەشی مەسیح کە Transubstantiationی پێ دەڵێن لە ئینگلیزی. هەر چونکە گۆشتی بەراز حەرامە لە ئیسلامدا ساڵەها وا دەبوو شوێنی وەک بێتوێن لەبەر زۆریی بەراز مەرەزە برنجی دەبوە خۆراکی بەراز و دەیشێلا تومەز ڕاو نەدەکرا وەک مامز و کێویی تر...

لە ئیسلامدا کمێکی لەشی ئافرەت دەشێ بدیترێ، وەک ڕوو و دەست... کەچی نەتەوەهای ئەفریقیا و ئەسڵە دانیشتوەکانی ئوستراڵیا و بەشێکی جەزیرەکانی دەریا زلەکان رووتبوونی ئافرەت بەلایانەوە وەک بە پۆشتەیی بوو... ئینکاییەکانی ئەمریکای باشوور ڕۆژێک لە ڕۆژانی ساڵیان تەرخان کردبوو بۆ «ڕاوەکیژ» کچان لە مەزرایێکی بەرین ڕایان دەکرد و کوران دوویان دەکەوتن. هەر کوڕەی کچێکی گرتبایە لەو شوێنەدا، بێ بەرهەڵستی، لەگەڵی جووت دەبوو... دوور نەڕۆین لە نێوان هەندێ عەشیرەتی کوردەواری باوک بە ڕەهایی کچی خۆی دەشکاندەوە کە پێی دەگوت: ئەگەر کەڵکت پێوە بایە پیاوێکی بۆ خۆی هەڵدەگرتی...

خولاسە لە هەر لایەنێک و بابەتێکەوە کردار و ڕەفتار و گفتاری مرۆ بە تاقی بکەیتەوە ڕێ دەرناکەیت بۆ دەستوورێکی ئەوتۆ قەراردادەی ئامێر و بەردەقانی وەیا پەسەندی هەموو نەتەوەیەک بێت. مرۆی سیاسی، بەزۆری، قسەیەک دەکوتێتەوە کە لەگەڵ بەرنامەکەیدا بڕوات: ئا لەم دەمەدا کە سەعات شەش و نیوی 18ی کانوونی یەکەمی ساڵی 1996 ز یە کتێبی: *«الجغرافیا الاقتصادیة لبلدان العالم»* بە نموونە دادەنێم کە لایەن شەش مامۆستای زلی سۆڤێتی دانراوە و لە ساڵی 1979 هەر لە مۆسکۆ وەرگەڕاوەتە سەر عەرەبی. براکانم، خۆ و تالع پاش تێکچوونی سۆڤێتستان کتێبەکە دەخوێنمەوە کە بە ڕاستی بریتییە لە کۆمەڵە گەپێکی سیاسی بە نیازی دزێو کردنی هەموو ئابوورییەکی ناکۆمیونیست. هەرچی دەیفەرمووێت پێداهەڵگوتنی ئەو وڵاتانەن بە شیووعی ناسراون و دزێو کردنی ئەرز و ئاسمانی دەرەوەی کۆمیونیزم... کتێبەکەم کردەوە لاپەڕە 74 و 75 دەرچوو. لە سەرەتاکانی لاپەڕە 75 دەڵێ بەرهەمی ڕووسیای سۆڤێت یازدە جاران زیادی کردوە لەچاو بەرهەمی پێش جەنگ (جەنگی 1939-1945). خۆ ئەگەر بیست جاریشی گوتبایە کەس ڕێی نەبوە بڵێ لەل... مەدحی مەنغۆلیا دەکات بەو جۆرەی نەیناسیتەوە مەنغۆلیاش دەرفەتی چنگ کەوت و کۆمیونیزمی بەلاوەنا...

خوێنەر لێم بسەلمێنێ کە دەڵێم چەندێکی دەمەوێ خۆم ئیقناع بکەم بە هۆیەکی ئەوتۆ بشێ ئەو زرەدرۆیانە بکاتە کاری ناچاری، بێسوودە و هەر دەمێنمەوە بە نەسەلماندنی درۆی بێکۆتایی چونکە لە ئیمکاندا نییە سەد ساڵ و دوو سەد ساڵ درۆ ببێتە پەردەپۆشی عەیبوعار و داروەکازی دەستی لەرزۆک. سەر دەهێنم و دەبەم هەر ئەوەندەم بۆ قووت دەدرێ کە کاربەدەستانی سەرووی دەوڵەت بە ئومێدی بەردەوامیی حاکمایەتییان لە دەمی ژیانی ئەواندا پڕۆپاگاندە و تۆقاندن و درۆ دنیاکەیان بۆ ڕاگرێت کە مردنیش پێچانیەوە ملی ڕۆژگاری دوای خۆیان وەقوتەوە... با دواڕۆژیش چاری حاڵی خۆیان بکەن بۆ بەردەوامی، کە چاریان نەکرد مەرگی نوێیان لێ موبارەک بێ!! ئەمە دەڵێم بە پشت ئەستووری، کردار و ڕەفتاری سەرزکەکانیان کە لە پلەی یەکەم و سێیەم و حەفتەمدا پارە و قەسر و کچیان مەبەستە ڕێڕای دەسەڵات کە بنەمای هەموو نیازێکە بە تایبەتی لەو وڵاتانەی دەستەی شۆڕشگێران خەڵقەکەیانی خەساندوە بۆ مجێزی خۆیان...

ئەمە دەڵێم و دەزانم پارە لە هەموو جێگایەک کارگوزارە بەڵام فەرق زۆرە لە نێوان پارەیەکی ناچاری ڕازی کردن بێت بۆ گەییشتن بە ئارەزۆ و پارەیەکی دەسەڵات و هەڕەشەی کوشندەی لەگەڵدا بێ کە تەماع تێکراو نەتوانێ بڵێ لەل... واتە فەرق لە نێوان دوو حاڵەتەکەدا هەبوون و نەبوون دیمۆکراسییە... بێ گومان و بێ خوارکە و خێچکە، کەسانێکی ئاشقە داد و ڕاستی و هێمنین تاکە یەک ڕێگەیان لە پێشە بۆ گەییشتن بەو ئامانجە ئەویش خەباتی بێ وچان و بێ ماندووبوونە بەرەو داسەپاندنی دیمۆکراسی بەسەر بەدایەتی و دڕندەیی و زۆر و ستەمیدا. هەر هەنجەت و بەهانەیەکی دژی ئەم ڕاڕەوە بەکار بێت، پاتەوپات، دوژمنی مرۆڤایەتی و، تاڕادەیەکیش هی جانەوەرە کە دیمۆکراسی ڕێ نادات خەڵق بە کەیفە گیانلەبەر بکوژێت. کە چوویتە مەڵبەندی نادیمۆکرات دەبینیت سەرۆک و دەستوپاوەندی، بەر لە خەڵقی دیکە، دەبنە دز و جەردە و جەللاد هەر ئەمەیشە مەنتیقی زۆر و ستەم لە مەیدانی «نەبات»ی شۆڕشگێڕانەی بێ لێپرسینەوە. دەسەڵاتدار بەسەر وڵاتێکەوە، بەر لە هەموو شتێک، مەبەستیەتی خەڵقەکە بخەسێنێ ئیتر بەناوی نیشتیمانپەروەری بێ یان چینپەروەری بێ یادینپەروەری. چونکە دەماری پیاوەتی و بەخۆ نازین ڕێ نادا بە ئاسانی مەرد و نیوەمەرد ببن بە گەسکی خۆڵماڵین. دەبێ دەماریان دەرکێشرێ تاکوو بە پێی مەنتیقی گورگ کە دەڵێ «دەیخۆم دونگی تەڕ نابێ لە لەوەڕ» ئەو کۆنە مێرخاسە لووتبەرزانە کرنوویان پێ ببردرێت یان لەناو ببردرێن.

خەباتگێڕی وڵاتی دواکەوتوو چەندێکی لە خەباتدا دلێر بێ دواتر کە بوو بە کارسووڕێن بە هەموو لەشی و گیانی برسییەوەی دەکەوێتە سەر خۆ تێر کردن بەو ناز و نیعمەتەی خوا خەڵقی کردوە لە خانەی قەشەنگ و جلوبەرگی بەگزادانە و کیژۆڵەی تەڕ و تازەخۆراک و نۆشەمەنی و کەیفەمەنیی ئاخر مۆدێل، دەسەڵاتداری ئەوتۆیی کە لە ئاست تەماع و مجێزی خۆیدا تەڕ و هیشک پێکەوە دەسووتێنێ بە درەنگە کاتەوە بیر دەکاتەوە لە ئاینوئۆینی ناحەزی هاندەران. هەرچی ناحەزی ناوخۆیی هەیە کە لە ئاکامی بێدادی و بێ نەزمیی تازە حاکمەکان دەبزرکێنێ و تەپوشەپ دەکات. ئا ئەمانە جێی مەترسین بۆ تازە حاکمان چونکە خۆشی بێ و ترشی بێ بە حوکمی ناچاری تا ماوەیەکی مەیلەوە بیندرێژ بە جیرانەتی ڕادەبوێرن.

ئەگەر فرسەتیش یار بوو لەوانەن پاڵێک بە تازە زاڵمەکانەوە بنێن. ئنجا ئەم هۆیەیە وا دەکات حکومەتی خەباتگێران بەر لە هەموو شتێک گەڕەکی تایبەت بە خۆیان ئاوەدان دەکەنەوە، دوور لە عەلۆ و جەلۆی کووچە و بازاڕ...

تۆ وەرە دەفتەری قوربانیی خەباتگێران بگرەوە لە هەرچی شۆڕشی سەرکەوتووی جیهان هەیە: تاکە یەک شۆڕش نادۆزیتەوە ڕۆڵەکانی خۆی نەخواردبێتەوە لەلایەن سەرۆکایەتیی حکومەتی پاش سەرکەوتنی شۆڕشەکەوە. ئنجا ئەگەر پتر نە حیزبێک و ئایدلۆژییەک بەشداری شۆڕش بووبێت لە پێشەوە یەکێک لەو لایەنانە دەبێتە شوان و ئەوانی دیکە دەوری مەڕ دەبینن و دەکوژرێن یان خەفە دەکرێن. پاش ئەم قەسابییە سەرەتاییە، برینکاریی تاکە حیزبی سەرکەوتوو دەست پێدەکات بە نەهێشتنی هەر ئەندامێکی چالاک هەبێت کە سەری دڵی هەڵداوێت بەرانبەر رابەر و تاقمەکەی حیزب کە ماوەتەوە بە تاکە چاپوکسواری سەر شانۆی سیاسەت و کیاست و ڕیاسەت و میاسەت...

خولاسە ئاکامی شۆڕش دەبێتە قەبرستانی ئەو دروشمە ڕوحسووکانەی کە گێلەپیاوی سادەلەوح و خۆشباوەڕ و نەمەییو گیانبازییان دەکرد بۆ سەپاندنیان. هەر هێندەش مۆڵەت دەدران هەناسە هەڵبێنن تا ئەو دەمەی قارەمانی سەرناسی لێخوڕین و ڕاپێچەکدان و پاکسازیی و قاڵ کردنەوەی شۆڕش و حیزب ڕ حکومەت لێیان بێنیاز دەبێت و بە لەمپەریان دادەنێت ئیتر بە چەند پفێکی ترومپای D.D.T. ئەو مێش و مەگەس و تەپزیە دڵشێوێنە هەڵدەوەرێن...

لە دەمی هەڵگەڕانەوەی خەڵقی ئێران دژی حەمەڕەزادا کە شاپوور بەختیار شای بەڕێ کرد و جۆرە حوکمێکی دیمۆکراتی گرتەبەر بارەها و جارەها دەمگوت ئەگەر حیزب و ڕێکخراوە سیاسییەکان هۆشێکی لێککەرەوەی چاکە و خراپەیان هەبێ دەست لە شاپوور بەختیار گیر دەکەن و لە سێبەری حکومەتەکەیدا چالاکیی سیاسیی خۆیان بەردەوام دەکەن. چونکە بێ دوودڵی و بێ گومان هەر لایەنێکی شۆڕشگێڕ دەسەڵات بگرێتە دەست تاکێکی ئەو هاوڕێیانەی خەبات و ڕزگاری گیان بەسەلامەتی دەرنابەن و هەمووی دەبنە مایەی ئەو مەتەڵە کوردییەی کە دەڵێ: «یەکپای لە دەشتی دووپای گەییشتێ یەخستیە سەرپشتێ». مەبەستیش لێی پاڵەی

درويتەيە کە بە دوو پايەوە دەغڵی گەنم و جۆی يەکپا دەدرويتەوە و دەيخاتە سەر زەوی...

تاکە بزووتنەوەيەکی ڕزگارکەری کە قارەمانەکەی، «سوار الذهب»ی سوودان، حکومەتی ناجۆری ئەوسای لادا و خۆی کيشايەوە لە حوکم و تەسليمی پاڵەوانپفەکانی سەر شانۆی سياسەتی کرد. ئا ئەو مرۆيە بەشەرەفەش خۆشباوەڕ بوو بە فشەفشی نەيژەنەکانی سياسەت و هەر هيندەمان ديت قەسابخانە دەستی پيکردەوە... لەگەڵ ئەمەشدا کە دەزانم دڵ و دەروونی «سوار الذهب» وەک زيڕی قاڵ بوويەوە بێ خەوشە، ديسانەوە ئەگەر خۆی کردبايە حکومەت نەيدەتوانی لە ڕێی ديمۆکراسييەوە پاکيی بزووتنەوەی خۆی بپاريزيت چونکە لايەنە سياسييەکان کە چالاکی سياسييان پێوەيە و چەرخودزڵابی کووچە و بازاڕ و سەرای حکومەتيش دەسووڕێنن ئۆقرەيان لێ هەڵدەستێ هەتا هەناسە لە ئازادييە خاوێنەکە دەبڕن... هەرچی ئاپۆرەی خەڵقوڵڵای شار و لادێ و خێڵەکانن هێندە دوورن لە بێنەوبەرەی سياسەت و حوکم، جارێ، مەيدانەهای سرێ و بێهەستی و خۆنەناسين و بێ بيری تێکەڵبوونی سياسەت، لە تەمومژی «دادی کۆمەڵايەتی» و «مافی سياسی» و ئەو جۆرە دروشمەی بە ناز و فيزيان دادەبڕێت...

گريمان گرەگرێکی ئەو دروشمانە کەوتە بەر گوێی حوشترەوانێک و وەرزێرێک و لووتبەخەرزێمێک، تۆ بڵێی هەستی وەها سەراو و سەرەتايی و بێ بنەما و بێ ژێربينا و بێ ژيار و داد و ڕێکی و ڕوونبينی و بێ ديارببوونی تەمايەکی يەک لوقمە نان لەو گرەگرەوە، ئا ئەو هەستە لێی چاوەڕوان بکرێت ببێتە نوێڵێکی ڕيشەهەڵکەنی نەزانی و بەداوەت و فکری بناوبووی ژێر ئەفسانە و ورێنەی دێوی سپی، ئيتر قۆڵ و باسکی شەکەتی هەزار ساڵەيی، لە هێکرا، هێز وەرگرێت و باوەش بە باوەڕی گەش و مافی پيرۆزدا بگرێت حکومەتی عومەری عەبدولعەزيز بسازێنێت...؟

هەڵبەت ئەم زرە خەونی خۆشکەڵەی بنبزێوکەی وا بە خەياڵی مندا دێت لەگەڵ هەموو بێبايەخييەکی تێيدايە چەندين هەڵوەستی لێکتر جودای خەڵق بە دەوری خۆيدا قوت دەکاتەوە: کەسانێک هەن خەريکی بەرژەوەندی واقيعين وەک توجار و قۆنتەراتچی و کاسبکاری بازاڕ [و بەشێک لە گۆشەنشينی مەلايەتی و شێخايەتی و

دەروێشی و سۆفیەتی و ملکەچی قەزاوقەدەر] هەڵگەڕانەوە لە «أولو الأمر» و شێواندنی حاڵوباری هێمنایەتی بە کاری ناڕەوا و نابەژەوەند دەزانن [توجار و قۆنتەراتچی و کەسانی وەک ئەوان چاوساغ، پتر بەلای هێمناییدا دەشکێنەوە سەبارەت بە مەسڵەحەتیان و چی ئەوتۆ گوێ نادەنە «أولو الأمر» کە بەلایانەوە زاڵم و دژی دینن]...

کەسانی ئەوتۆش هەن پێوەندییان بە دەوڵەتەوە کز و سستە و خۆیان بە غەدرلێکراو دەزانن بەرانبەر بەرە و تاقمی دیکەی کە دۆستی دەوڵەتن و ڕێز و سامانیان لە برەودایە. ئەمانە خەونی ناخۆش نەبێ بە دەوڵەتیەوە نابینن تا ئەو دەمەی مێزانی مجێزی دەوڵەت دەگۆڕێت و دۆستی کۆن دەگۆڕێتەوە بە هی تازە ئیتر هەڵوەستی هەردوو لا بەرانبەر حکومەت سەرەوبن دەبێ... کەسانی دیکەش هەن لە ئەفەندی و نیوەخوێندووی نێوان ئاپۆرەی نەخوێندوان و نێوان خوێندەواری سیاسی سەربە ناڕەحەتی و ناڕەزایی و هەڵگەڕانەوە...

تاقمی هەرە مومتاز ئەو خوێندەوارانەی ئاشقە سیاسەت و هەڵپەوکڵپە و حیزبایەتی دوور لە واقیع و مومکینن کە هەتا ئەم دەمەی نووسینی بەردەست ڕێگەیەکیان نەگرتەبەر ئاکامێکی مەیلەو بەرتەمای بە دوادا بێت. چ تاوگیری لە قسەمدا نییە کە دەڵێم خەباتگێڕی شۆڕشاوی هەموو ئامانجێکی مومکینی بەلاوە خیانەتە لەو ڕووەوە کە داخوازییەک حکومەت بیسەلمێنێ هەر دەبێ تەپکە و داو و «مساومة»ی تێدا بێت، کەچی بە درێژایی ساڵەها و بارەها ئەو حکومەتانە بەشێکی هەرە گەورەی مەراقیان پێکهێنانی پێشکەوتن و گەشە کردنی ئابووری و ئاوەدان و پەرەپێدانی زانست و ڕۆشنبیریی خەڵکەکە بوە بە تایبەتی لەو وڵاتانەی حورمەتی ئادەمیزادی تێدا پارێزراوە.

زۆر بە سەیری، حکومەتانی جیهانی «بیست» و سێیەم، هەر بە حوکمی زێدە سەرەتایی و پاشکەوتەییەوەی، چەندێکی سەربەخۆ بووبن دڕتر و ستەمکارتر و خوێنڕێژتر بوون: وڵاتێکی «زاڵم»ی بێگانەی پێشکەوتووی بەسەرەوە بووبێ ڕێبەدیی تێدا کراوە، هەر نەبێ بایی ئەوەی کە مجێز و تابیاتی مرۆی ڕاهاتوو بە یاسا و دیمۆکراسی و سەقافەت بە پێویستییەکی ناچاریی حیساب دەکات. بەڵی، حاکم و دەسەڵاتدار لووتبەرزییەکی پێوە دیار دەبێ بەڵام فەرق زۆرە لە نێوان

ئەوەی کە یەکێک نابەدڵی حاکمی پاشکەوتووی هۆشبەتاڵ بوو لە گەردەنی بدرێت و وەیا لە بەندیخانە برزێتەوە لەگەڵ ئەوەی کە حاکمی ڕووناکبیر لێی زوێر بێت وەیا بیدات بە دادگا.

دەبێ بزانین و دان بەوەدا بهێنین کە دادگای عێراق و میسری ژێر دەستی ئینگلیز بارەها خاوێنتر و دادپەرستتر و ئازادتر بوو لە دادگای ئێران و تورکیا و ئەفغانی سەربەخۆ... لەمەش زیاتر «روزالیوسف» کە بەلای چەپدا بوو لە قاهیرە، ڕایگەیاند کە بە درێژایی حوکمی ئینگلیز هەڵبژاردنی نوێنەران فێڵی تێدا نەکرا، ئەو ساڵەی کە خدێو جۆرە سەربەخۆییەکی وەرگرت تەزویر دەستی پێکرد... ئا لەمانە هەمووی واز بهێنە: ساڵی کۆتایی شەڕی یەکەمی جیهانی کە سپای تورک دەشکا و دەکشایەوە و گرانی قڕی خستبوە وەڵات، ئەو زاد و زەخیرەیەکی کە پێی نەدەکرا لەگەڵ خۆیدا بیبات ئاگری تێبەر دەدا نەوەک خەڵقەکە پێی تێر بن. کە سپای ئینگلیز گەییشتە کۆیێ بەر لە هەموو شتێک فەقیرخانەی کردەوە و بژێوی برسییانی مسۆگەر کرد. لەمەشدا بەلای خۆیەوە هیچی ئەوتۆی نەکردوە شانازی پێوە بکات چونکە بەزیادە خۆراکی خۆی پێ بوو، تەمایشی نییە بە وڵاتێک خۆی تێر بکات کە لە برسان دەمرێت... ئەو نەهاتوە مامڵەت لەگەڵ سواڵکەر بکات چونکە تۆز لە ئاو هەڵناستێت. دەبێ خەڵکەکە ئاهێکی بە بەرەوە بێ قوماشی مانجستەر و لەندەن بکڕێت. کە غاندی بانگەوازی بڕینی پێوەندی بە کوتاڵی ئینگلیزەوە بەرز کردەوە لەندەن تای دەهاتێ و دەپاڕایەوە لێی لەگەڵیدا بێتە ڕەدایێ. بێگومان، کورد و عەرەب و تورک و فورس ئەگەر ئەو جۆرە بێحەیاییە لەگەڵ حکومەتەکانیان بکەن لە جیاتی کەباب بە شیشەیانەوە دەکەن... هەڵبەت ئەم قسەیە هی دەمێکە کە تازە ئینگلیز پێی نابوە عێراق...

خولاسە خەلقوڵڵای هەموو دنیا بیری جودا جودایان هەیە لە ئاست ڕووداو... هەڵکەوت... هەڵوەست... بڕیار... لەگەڵ تێبینی ئەو ڕاستییە کە نەتەوەی پێشکەوتوو (مەگەر چۆنها) لە سنووری یاسا و ڕێکی و ماف چالاکی خۆی دەنوێنێت تەنانەت ئیزرابی قانوونی لەلایەن مزەخۆری حکومەتەوە مانگانە و ڕۆژانە کەم ناکاتەوە و خەلەل بە هیچ مافێک ناگەیەنێ... وەک دەبینیت دەوروبەری جودا... بیروباوەڕی جودا... بەرژەوەندی جودا... پاشخانی سەقافی و نەتەوەیی

جودا بگرە دەرسدەری جودا، لەزۆر بار و جاریشدا قۆرەدەماغیی جودا خەڵکی یەک وڵات لێکتر تار دەکات هەرچی هەیشە لەو جوداکارییە هەمووی تاکە ئاکتەرێکی سەر شانۆ کە پێی دەڵێن «مرۆ» بە خۆی و مجێز و باوەڕ و بینین و ئاکاریەوە، چ چاک و چ بەد، ماکی جوداوازییەکەیە کە دەزانین هەرچی سەربە کۆمەڵایەتییە مەخلووقی مرۆکەیە و لە ئاسمان دانەبەزیوە و لە درزی ئەرزیش هەڵنەتۆقیوە.

ڕاستییەکەی، تا ئەم ڕۆژەش کە مرۆی تێهەڵکشیو چەنگەو ئاسمان بوە و مەودایەکی بەرینی بڕیوە لە دۆزینەوەی هۆی «شت» بە ماددە و مرۆ و گیانلەبەریەوە، بە تەواوی و لە هەموو ڕوویەکەوە نەگەیشتوەتە زانینی ڕاستینەی «بزوێن»ی مرۆ: بەڵێ دەزانین کاکە ئازاد، کاکە وێسف، خوشکە پەرێزاد دەتۆرێت و ئاشت دەبێتەوە... ڕاست دەڵێ و درۆش دەکات... فلسێکی بەلاوە چاوە و ڕۆحی خۆیشی بەخت دەکات... شەیدا دەبێت و بێباکیش... خولاسە چی کرداری لەیەکتر نەچوە ئەویان دەکات بێ ئەوەی هەموو جاران هۆی مەعقوولی هەبێت یاخود کارەکەی لەوانە بێت چاوەڕوان بکرێت... مەراقی تاوڵە و ڕێسز هێندەی باوەڕی دینی و دنیایی دەیخەریکێنێت و زەرەری گەورەی لێ دەبینێت بەڵام یەک درهەم بە هەژار ناداب... دەمار دەیگرێت و تا ڕۆخی مەرگ لەگەڵی دەڕوات... ترس سواری دەبێت و هۆشی پێ نایەڵێ... دەمدیت ئافرەتی ساڵی 1948 لە دوورەوە دزەی دەکرد بۆ ئاگری نەورۆز و دەستی بە چاویەوە دەگرت و ملی دەسوڕاند و دەیزریکاند: ئەیرۆ نەکەن تەماشای ئاگرەکە بکەن کۆر دەبن، وەردەگەڕێن... ئیتر بۆ خۆت بیربکەوە لەو هەموو ئاکار و ڕەفتار و گفتار و کرداری مرۆ کە تێک دەئاڵقێن و دژ دەوەستن و تێک دەکەنەوە و دەفشێنەوە یان کشت دەبن بۆ شەڕە چەپۆلک...

پیاوی دیندارم دیتوە کاری بێشەرعی کردوە بەڵام بە جۆرێک لەو جۆرانەی دڵی خۆی پێ تەسکین کردوە کە بشێ بە کاری شەرعی بڕوات هەر نەبێ لە ڕواڵەتدا. تۆیش ئەمانەت دیتوە، ڕەنگە بیرت لێیان نەکردبێتەوە... تاکە یەک نیگا بۆ حاڵوباری ئێستاکەی خەباتگێرانی کوردی هەرێم [لە کۆتایی کانوونی یەکەم، ساڵی 1996ز] هەڵکەوتێکت نیشان دەدا کە بە هیچ دینێک و دنیایەک و هۆشێک و شێتییەک نەدەشیا ڕوو بدات کەچی بلیمەتیی «مرۆ»ی شێواو ئەو نامومکینەی کردە تاکە مومکین...

ئەمەو زیاتریش دەڵێم لە حاڵوباری سەرەوبن کە هەر هۆشی سەرەوبن دەتوانێ دروستی بکات و هەرگیز لە وزەی جانەوەردا نییە چشتی ئەوتۆیی دابهێنێت. بەڵام لە بیر ناکەم کە من و تۆیش و فلان و فستانیش بەش بە حاڵی خۆمان ڕەفتاری لەیەکتر نەچوومان هەیە و، ڕەنگە، کەمیش نەبن... کەسانی ئەوتۆش زۆرن لەوانەی بۆیان بلوێت هەمان ڕەفتار دەکەن [وەک کە دەڵێن بۆرژوازیەتی دروست دەکەین و دەیرمێنین بۆ بەراست گێرانی فەرمووودەکانی نازانم کام پێغەمبەر]. ماوە ئەوەش بڵێم، کوردێکی لە 2500 ساڵەی مێژووبەدەر بوە و ساتێکی سانەوەی نەدیتوە و دەرفەتێکی نەبوە بە هۆشێکی ئاسایی و گیانێکی ئارامەوە پێوانە و کێشانە بکات و لە حاڵەتێکی زێدە دەگمەنی دەورەدراو بە دوژمن خەریکی کولەمەرگییە، تاڕادەیەک، چاوەپۆشیی لەگەڵدا دەکرێت. کە دەبینین نەتەوەی خاوەن کیان و دەوڵەت لەسەر هیچە هەمان خۆکوژی و وڵاتکاولی دەکەن... بۆرە هەنجەتێکیش هەیە پەنجەی بۆ ڕابکێشین و بڵێین: خەباتگێران و سەرۆکەکانیان پشت ئەستوورن بە تاکە سەرمایەی عاتیفەی کوردایەتی، ئەگەر لەوانە بانایە ئەندامی نەتەوەیەکی خاوەن سەروەت و ژێربینا و تیجارەت و کێڵگەی زەنوێر بن لە سەرەتای خەباتیانەوە دەستپارێزییان دەکرد لە ڕماندن و کاول کردنی بێلزوم. هەر چونکە بینا و ساختمان و پرۆژەیەکی لە هەرێم هەبوو دەسکردی بێگانە بوو نەک هی نەتەوەی کورد، واتە دەتگوت منداڵی هەڵگیرایەوەن نەک هی کەمەری باوکی، بۆیە بوو بێپەروا و بەر لە شەڕی براکوژی هەر حکومەتەکەی هەرێم هەمووی ڕیشەکێش کرد. دەسا بە کوردستان سوێند دەخۆم ئەگەر ئەو بینا و پرۆژانە دەسکردی خەباتگێرانی کورد بووبایە زۆر بە درەنگترەوە و لە حاڵەتی بێئومێدبووندا زاتیان دەکرد توونایان بکەن.

بۆ ئەوەی قسەکانم نێوەچڵ نەبن، سێبەرێکیان دەهێنمەوە بەر زەینی خوێنەر کەوا ڕەنگە لەخۆوە تارمایی نەداتەوە بایی دەرک کردنی[32] کە دەڵێم ئەگەر خەباتگێران خاوەن فلان شت و فیسار دارایی بانایە دڵیان نەیدەهێنا وا بە ئاسانی کاولی بکەن، لە ناوەڕۆکی قسەدا ئەو ڕاستییەی واقیعی خۆی ڕەپێش دەخات کە بوونی دارایی و

---

[32]- دەرک: بە واتای «دیتن» هاتوە لە ئاڤێستادا کە بە «دەرش» ئەوسا دەربڕاوە. کەڵەشێر «پرودەرش»ی پێ گوتراوە بە واتای «زووبین».

ساختمان و تیجارەت و بینای دە نهۆمی بەڵگەی هەبوونی ژوورخان و ژێرخانێکی دێرینە کە خاوەنەکەی بە داخوازیی ئەو سامانە و بنگە سەقافی و پیشەسازی و هونەری و زانستی و ئابووریەکانی پلەی بەداوەت و نەزانی و بێ نەزمی بەجێ هێشتوە و دەمێکیشە ڕاهاتووی ژیان و داب و دەستووری ژیارە و دەست لە بینەقاقەی خۆی نانێت.

بێ ئەوەی من بیڵێم وەیا یەکێکی تر بفەرموێ ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات هەرگیزاو هەرگیز پەلاماری ئەڵمانیای ڕۆژاوای نەدەدا بۆ تێکدان و کوشتن و بڕین: لەوانە بوو وشاری ڕووسەکان بەشێکی شیووعییە ئەڵمانەکانی هان دابایە بۆ کارێکی ئەوتۆیی... کە ئەم ئیحتیمالەش زێدە کز بوو، ڕووشی دابایە گەلی ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات هەر هێندەی دەکرد بە بەهانەی شەڕ خۆی هەڵکوتێ بۆ باوەشی براکەی... باڵکانی ئەم ڕۆژانە شەڕی تێدایە ئەمما لە نێوان دوو نژاد و دوو ئایینی لێکتر جودا. لێرەدا بە هەلی دەزانم شتێک بڵێم لەبارەی حوکمدارە کوردەکانی بەر لە 100، 200 ساڵ و پێشتریش کە دەگوترێت و دەگوترێتەوە هێندە فامەیان نەبوو دۆستایەتی و هاریکاری لەگەڵ یەکتردا بکەن بۆ خاتری کوردایەتی و بۆ خاتری خۆیان.

ڕەنگ بوو بەر لە پەنجا ساڵ ئەم قسەیە ڕێوجێیەکی هەبایە کە جارێ براکوژی و دووبەرەکی، و لێکژەنینی خەباتگێران سەری دەرنەهێنابوو بەڵام لەم ڕۆژگاری سەردەمدا پاش ئەوەی خۆخنکاندن تەنگی هەڵچنی بە خۆڕزگار کردن (کەی؟ لە کۆتایی سەدەی بیستەم!) دەبێ چەپکە گوڵ بۆ حاکمە کۆنەکان بە دیاری ئاوای قەبرەکانیان بکەین کەوا بە دەگمەن نەبێ خەریکی یەکتر بڕینەوە نەبوون... خوێنەری ئازیز! گیانی کوردایەتیی ڕاستەقینە تا ئەمرۆکەش ڕەگی دانەکوتاوە لە دڵ و گیانی کوردپەروەران بایی ئەوە بکات زاڵ بێ بەسەر گیانی حیزبایەتی و ناوچەپەرستی...

بە خەیاڵ خۆت بەرەوە بۆ ئەرزەڕۆمی بەر لە 200 ساڵ، ئایا کەی و چۆن و چەند بیرت دەکردەوە لە کرماشان و سنەیەک کە ڕەنگ بوو ناویانت نەبیستبێ. لەوە هەر بگەڕێ کە هیچ شتێک لە بارەیانەوە نازانیت و کەم زۆر بە دڵتدا نایەن! دامنا پەرییەک، شەیتانێک ئەو خەیاڵەی لە مەڵاشووت گێڕا ئنجا چی؟ تۆ کە نەتوانیت بیر

بکەیتەوە لە تێکبەستنی ئەرزەڕۆم و دیاربەکر بۆ بەرژەوەندێک، هەرچی دەبێ ئەو بەرژەوەندە با ببێ خوام دەیکرد جۆری لەوەڕاندنی بزن بێت یان بە گژدا چوونەوەی هەیتە بێ، ئاخۆ چ جۆرە بیر کردنەوەیەک، دەربارەی سنە و کرماشان بە کەللە حەتاڵ و بەتاڵەکەتدا دەهات؟ ئایا بیرگێڕیت دەکرد بۆ پەرەپێدانی متوربەی فستەق لە دارمازووەکانیان یان جۆری ئاگربڕی لە پووش و پاوانەکانیان!! خۆ بەو حەق و ناحەقە قەسەم بابی نووکی دەرزی بیرت بۆ کوردایەتی و تورکایەتی و فارسایەتی و ئیسلامەتی و کافرایەتی نەدەچوو، ئەشهەدو بیللا بیرت بۆ هیچ شتێک نەدەچوو چونکە وەکوو تاکێکی بێدەسەڵات و تێنەخوێندرایەوە و بێئاگا لە جیهان هەر ئەوەندەت پێ دەکرا خۆت و منداڵت تێر بکەیت ئەویش بە ئێش و ئەرکەوە. ئەوسا نەک مرۆی بێسەواد، بەڵکوو خوێندەواریش [مەلا و شێخ] بێئاگا بوو لە سیاسەت چ جایی کوردایەتی. دەشیا دەسەڵاتدارێکی وەکوو شێخی نەهری پەلەیەکی حوکومداری کردبێت بەڵام نەک کوردایەتی، بە بەڵگەی ئەوەی ئەگەر غەوسی گەیلانیش زیندوو بایەوە و داوای حاکمایەتی کردبایە لە نێوان کوردان شێخی نەهری بەگژیدا دەچۆوە.

گیانی نەتەوەیی و نژادی بەندە بە گەلێ هەلومەرج، لە پێش هەموانەوە سنووری دیاریکراوی وڵاتەکەی دێت کە دەبێتە عەلامەتێکی ئاشکرای هەبوونی نەتەوەیەک لەو جغزەدا. نەتەوەی ژێردەست و کەمزان ئەگەر سنووری مەعلوومی نەبێ هەر ئەوەندە هەست بە قەومایەتی دەکات کە زمانەکەی پێناسەیەتی، ئەویش بە مەرجی لەتنەبوون و لێکتر نزیکبوونی جۆری ئاخاوتنیان. هەبوونی سنووری ئاشکرا ئەگەر لەژێر دەستی بێگانەشدا بێت ئەوەندەی بە دمەوەیە کە بەرهەمی ناوچەیەکی نابێتە قاچاغ لە ناوچەیەکی دیکەی. ئنجا بەرهەمی وڵاتێکی دراوسێ کە بە قاچاغ دەژمێردرێ سەر لەنوێ دەبێتەوە بە شایەد بۆ هەبوونی نەتەوەیەکی خاوەن ماڵ. خۆزی سەرلەبەری کوردستان ژێر دەستی یەک سولطان بایە ئنجا با لە خەفەتان دڵەکوتکەمان پێوە نووسابایە.

برا شیووعییەکان لەم ڕووەوە حەسایەوەن و خۆ دەدزنەوە لە «انفصالیة» وەک کوردەکە خۆی لە بەهەشت دەدزێتەوە بە خەبات کردن بۆ یەکبوون وەیا سەربەخۆیی کەرتەکان... نەشیدی «ئێمە کوردین نەتەوەی کوردین» کرایەوە

«ئێمە گورگین نەتەوەی گورگین» هەر هەتا هەستی بە کوردنازین بگۆڕێ بە هەستی شەرمەزاری و بەوەشدا کوردەکە ناچار بێت خۆ بداتە مەیلی تێکەڵبوون لەگەڵ بزووتنەوەی پرۆلیتاریای نەتەوەی زۆرینەی وڵاتەکە وەک پاشکۆی بێبایەخ و بێپێناسە... ئەم مەسخەرەیەی «کوردین گورگین» لە تەوژمدا بوو کەچی، ئەوسا هیچ یەکێک لە لەتەکانی کوردستان دروشمی جودابوونەوەی هەڵنەکردبوو نەک لەبەر عەیبی جودابوونەوە،کە دەزانین هەموو میللەتێکی ژێر دەست و زۆرلێکراو و مافخوراو و خانەوێران مافی ئەوەی هەیە وەک بەرخ لنگەفرتکێی سەربڕین بکات و بۆ دەربازبوون لە مەرگ. جودابوونەوە لە جغزی ئیمکانی کورددا نەبوو چ لە رووی ئاڵقەبەندبوونی سیاسەتی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست لەلایەن دەوڵەتەکانی لەتکەری کوردستان دژی هێوای گەش و پیرۆزی سەربەخۆیی، چ لە رووی وشاری ماددی و مەعنەوی دەوڵەت زلەکانی دۆست بە لەت کردنی کوردستان بۆ بەردەوامبوونی «حال راهن - باری رەخساو»ی قاڵب بەستوو لەگەڵ بەرژەوەندی ئەو دەوڵەتە زلانە هەم بە پێوانەی «نەوت» و هەم بە کێشانەی رەتاندنی سۆڤێت کە دیتمان «پەیمانی بەغدا» لە ناوەڕاستی پەنجاکاندا بەسترا بۆ ئەم دوو نیازە و بۆ راگرتنی سیاسەتی جیهانی دوور لە شەڕی سێیەمی جیهانی.

برا شیووعییەکان بەو بیرە چرووکەی وەها سەراوییەوە کە دژی بزووتنەوەی کوردایەتی رادەوەستان پتر یاریدەی «پەیمانی بەغدا» یان دەدا لەوەی بزووتنەوەی پرۆلیتاریا خەستتر بکەنەوە... سۆڤێت خۆی، بە هەموو فشەفشی دروشمە ساختەکانی «دۆستایەتیی گەلان»یەوە ویستی مەهاباد و تەورێز بکاتە نرخی رێککەوتن لەسەر نەوتی باکووری ئێران. بەڵام سەد شوکر بۆ تێشکانی ستالین لە ئاست قەوا-وسسەلتەنەدا هەر ئەوەندەی بۆ مایەوە بە مایەی ئابرووچوون کە، بە راستی، مەهاباد و تەورێز بوونە قوربانی...

برا شیووعییەکان پەلەنارێکی کۆنە فەلسەفەی عەرەبانەی «ئاشتیی جیهانی» یان لە نووسینەکانی ئەوسایان بزماڕێژ کرد گۆیا ستالینی پێغەمبەری ئاشتی و برایەتیی گەلان هەموو ئادەمیزادی چەپارەدا لە شەڕی ئاتۆم بەو وازهێنانە لە نەوتی ئێران... ئنجا کە ئەمە راست بێ راستییەکی لەمیان دزێوتر دووچاری ستالین دەبێت: بۆچی جیهانت هێنایە سەر لێوی شەڕی ئاتۆم بەو رێککەوتنەت لەگەڵ قەوام و دوو

نەتەوەی بێدەسەڵاتیشت دایە بەر هێرشی ڕق لە دڵی تاران؟ کوا پێغەمبەراتییە سەلماوەکەت لەلایەن سەدەها ملیۆن مرۆی ئەم جیهانە خۆ ئەوەی کردت کە بریتی بوو لە دۆڕاندن و حەیاچوون بە مردووی قەبرستانیش دەکرێت...

لێرەدا حیکایەتێکی خۆشکەڵەم بە بیردا دێت: پیاوێکی قسەخۆشی مەنگوڕان «خەمۆ» ناو، دوای تێشکانی سپای ڕەزاشا کە ویستی بەرانبەر ئینگلیز و ڕووس ڕاوەستێ لە ساڵی 1941 و هەر هیچ ڕانەوەستا، گوتی خەمۆ تەڵاقی کەوتبێ بە تەنێ پترم دەوام دەکرد لە سپای ڕەزاشا... گوتیان چۆناوچۆنی؟ گوتی خۆم دەشاردەوە هەتا دەیانگرتم سێ ڕۆژی دەویست!! قسەکەشی ڕاست بوو. منیش دەڵێم: خەمۆ تەڵاقی کەوتبێ لە ستالین چاکتر دەمتوانی ئاشتیی جیهان بپارێزم بە وەدا کە داوای نەوتەکە نەکەم و قوربانیشی تێدا نەدەم.

ماوە بڵێم تا ئێستاش، مامۆستا ئۆجەلانی لێ دەرچێ[33] چ لایەنێکی سیاسیی ناوداری کورد دروشمی جودابوونەوەی هەڵنەگرتوە: کوردی گوتەنی، کەنگر و ماستیش بە وەعدی خۆی. لەبارەی هەڵوەستی مامۆستا ئۆجەلان و هاوڕێکانییەوە هەڵکەوتێکی لەبار بۆتە یاریدەدەر و ڕەوابوونی خەباتەکەیان بەو جۆرەی دەیکەن ئەویش هەبوونی دەرفەت و کەلێنێک لە ڕووکاری ئەرمەنستانەوە کە نەیهێشتوە دوو سەری کەوانەی دوژمن بەدەورییەوە بگەنەوە یەکتر وەک کە لەبەشەکانی تری کوردستان دەدیترێت...

«کەنگر و ماست بە وەعدی خۆی... وەختی خۆی» ڕێم دەدات لە کولانەی مرۆڤ و دەوروبەروە زمانێک بگێڕم لە مەدلوولی ئەو پەندە سەبارەت بە هەموو ئادەمیزاد: هەر تاکێکی ئادەمی هەبێ بە دەم درێژەی تەمەنیەوە، بێ ئەوەی سەرنج بگرێت و هەڵوەستی لە ئاستدا بکات، گەشتێکی دەیان جار پتر لە حەفت سەفەرەکەی سەندەباد بەڕێوە دەبات. بەر لە هەنگاوی یەکەمی ژیانی نۆ مانگ لە منداڵدانی دایکیدا بێئاگا، ڕادەبوێرێ... زۆر جاران لەو بەینەدا، بەهۆی هەڵەیەکی دایکی وەیا ڕێکەوتێکی نالەبار دووچاری تەنگانە دێت و واش دەبێ لەبەر دایکی

---

[33]- گوێ بیستت بووم کە داوای جودابوونەوە دەکات. من ڕادیۆم لا نییە، ناشتوانم خەریک بم بە دۆزینەوەی شەپۆلی ئیستگەکانی.

دەچێت و مردەزاد دەبێت ئیتر خۆی بەسەردەچێت و خەفەت و پەژارە بۆ دایک و باوک و کەسوکاری، بۆ ماوەیەک، بەجێ دەهێڵێت... لە هێندەی حاڵی دەگمەندا ئەم مردەزادبوونە دوایین ئومێدی دایکی لە زگوزا دەبڕێت ئیتر کێشەی وەجاغکوێری ژیانی خێزان تاڵ دەکات مەگەر مێردەکە بەبەریەوە مابێ جارێ دوەم ژن بهێنێت و بشوێرێ...

بە زۆری 2 - 3 ساڵی تەمەنی منداڵ سڕاوەتەوە لە یادی منداڵەکە خۆی بەڵام هەموو سەروبەرێک و خواروژوورێکی لە دەفتەرخانەی ڕۆژگار و لیستەی ڕووداوەکانی ژیانی، بە وردی، تۆمارکراوە و تین تاوی بۆ سەر چۆنیەتی و چەندەتی لەشسازی و دەروونسازییەوەی شوێن قامکی خۆی نەقش بەستوو کردوە بە جۆرێک لە ئایندەدا لە ڕەفتار و کرداری بەدەر دەداتەوە. ئەم لایەنەی تاو و تەئسیری ڕووداوی دەوری ساوایی مرۆ لەلایەن زانای لەش و دەروون کە پزیشک و دەروونناسە بەهەند هەڵدەگیرێت و لە چارەسەر کردنی نەخۆشیی تێدەخوێنرێتەوە.

من خۆم بە منداڵیی دەوری سێ و چوار ساڵەم لە ڕادەبەدەر ترسی سەگم لە دڵدا بوو، هەر لەگەڵیشم ما تا ئەم ڕۆژگارەم بەڵام لەو تەمەنەوە کە هەستی «شەرم» بە خەبەر دێت بە هەموو توانامەوە ترسەکەم دەشاردەوە یان دوورەپارێزیم دەکرد لەوەی بکەومە ئیمتحانی ڕووبەڕووبوونی تەنهایی لەگەڵ سەگدا بەتایبەتی کە دەمزانی سەگەکە دڕە... لە حاڵی دەگمەندا، پاش تێپەڕین لە پلەی منداڵیم، وابوو لە لادێ ڕێکەوت خستوومیە ئەو ئیمتحانە بەڵام شەرمی ترسنۆکی زاڵ دەبوو بەسەر ترسەکەم و پێمەوە دیار نەدەبوو ئەمما بەزۆر لەخۆ کردنێکی پاڵەوانانە و تەمای ڕاگەیشتنی خاوەنی سەگ وەیا کەسانێکی لێم نزیک بە هانام... ترسی بروسکەم لە دڵدا بوو ئەمما چەندێکی لە نزیک باوکمەوە بووبێتم ئەو ترسەم نەدەهاتێ نەک تەمەنی منداڵیم و بەس بەڵکوو لە هەموو تەمەنێکی دواترم تا ساڵمەرگی لە 1943... تومەز خوشکی لە خۆم گەورەتر، یانەجیبە، ئەویش وەک من بوە، دوای مەرگی باوکم بۆمی گێڕایەوە... بێگومان ئەو ترس و لەرزەی تەمەنی ساوایی نرخی بە زیادەوەی لە هەموو کەسێک وەرگرتوە هەرچەند هەستیشی پێ نەکرابێ...

پاش پلەی ساوایی پلەی منداڵی نێوان ساوایی و سەرەتای خوێندنی قوتابخانە، جاران 2-3 ساڵی دەگرتەوە، بە خۆی و گیروگرفتی لەگەڵ هاوتەمەنان و فرەبوونی تەما و ئومێدی منداڵانەی و شەبەنگی هاوڕێیی بەهێزتر و کەموکورتیی خۆی لەتەک منداڵە دەوڵەمەند و ئەو جۆرە کاریگەرانەی نایەتی (نەرێتی)[34] دەوری هەست و نەست چەپێنی دەدیت و لەگەڵیدا بە پلیکانەی ژووررا یان ژێررا خشکە دەکات و کردوویەتی... خوولیای ئەو تەمەنەی دەڵەمەیی و تاو و تەئسیری باری نالەبار و لەباری لە ناخی منداڵدا چرنووک گیر دەکات و دادەڕووشێنێ [ئەگەر تەئسیرەکە بەد بێت، بەزۆریش بەدە]... تاڕادەیەک ئەو تەمەنە نەخشەکێشیی تەمەنی دواتری قۆناغی خوێندن دەکات و لەو باری شلکدا منداڵ کە نەمەییوە و مەنائەتی کەمە فەلاکەتی گەورەی دەروونی و ئاکاری دیار و ئاشکرای ناحەز شەڕ دەفرۆشن بە ئیرادەی لەڕزۆکی. ئەگەر زاڵ و مڵهوڕ بوو خۆی دەبێتە ملۆزمی بێدەسەڵاتان و خووی زێدە نامەردانەی تێدا دەڕسکێت... کتێبی فرانک هاریس *My Life and Loves* بخوێنەوە و بزانە لە بەشی داخیلیی قوتابخانەی کوڕانی بیستەکانی لە U.S.A چ ڕووی داوە... پێویست نابینم بە درێژی هەموو پلەی تەمەنی مرۆیەک بکەم بە نموونەی تێوەرامانی خوێنەر، ئەوەی لێرەدا مەبەستە دوو خاڵی سەرەکییە:

1. هۆی بەرهەم و ئامێری کشتوکاڵ و پیشەسازی، کە خۆیان دەسکردی مرۆن، لەو تەمەنانەی مرۆی تێدا دەڕسکێن و قاڵببەستوو دەبن دەخلێکی کەم و زۆریان نییە لە چارەنووسی ساوا، منداڵ، لاو... کە پتریش هەڵکشاو داڕێژرایە دوایین قاڵبی فراژووتنی ئیتر هۆی بەرهەم، مەگەر ببێتە ساحیر، بە جارێ لە تاوتەئسیر دەکەوێت کە پێشتریش هەر بێ تەئسیر بوە.

2. هەڵکشانی مرۆ لە ساوەییەوە بۆ تەمەنی قاڵبوونەوە، چ بە پێیان بڕوا بۆ قوتابخانە و چ بە ولاغ و چ بە گەڕۆک، هەر پابەندی ئەو کاریگەرانەیە کە هەبوون و دەمێنن بە تایبەتی لە تەمەنی شلکی ساوایی و منداڵی و هەرزەیی...

---

[34]- ئەرێتی، نەرێتی لە جێی خۆیدا نییە چونکە دەشێ «ئەرێ» لە هەندێ حاڵدا «سلب» بگەیەنێ وەک کە یەکێک شتێکی گوت جێی باوەڕ پێی بڵێنەوە: ئەرێ! بەلای منەوە ئایەتی، نایەتی یان ئایی، نایی لەبارترە.

مرۆ لەو گەشتە درێژ یان کورتەی تەمەنی چەندین جار باری ژیان و گوزەرانی دەگۆڕێت و پێبەپێ وردیاتی ڕەفتار و کردار و ئاکاری بێرە و بەوێیدا دەگێڕێت و هەزاران هەزار حاڵەتی جودا جودای بەسەردا دێت و هەزاران هەزار هەڵوەست و هەڵکەوتی لەبار و نالەباری تووش دێت و ڕووپەڕەی ژیانی پڕ دەکەنەوە و هەتا مردنی هەر پیریشی دەکەنەوە ئا لەو هەموو هەوڵ و تەقەڵاو کردار و ڕەفتار و گفتاری، وێڕای ژیانە پەردە پۆشکراوەکەی شەوانەی و ڕۆژانەی شەرمهێنی، تاکە یەک وشەی و یەک هەنگاوی و یەک کردەوەی ناگاتە تۆماری مێژوو و بەر سیاسەت و ئابووری ناکەوێت و ناشچێتە دەفتەرخانەی فەرهەنگ بە زانست و هونەرییەوە.

خولاسە سەرلەبەری تاکانی مرۆڤایەتی ژیانێک ڕادەبوێرن کە پتر لە 90%ی چەندوچۆنییەکەی پێوەندایەتیی بە مێژووی نووسراو و بە ئایدیۆلۆژیای ڕامیاری و بە ئابووریی ناو کتێبان و بە شەڕە دەندووکێی حیزبان... و... و... وە نییە و هەمووی لە خۆوە سڕاوەتەوە و مومکینیش نییە نەسڕێتەوە هەرچەند ژیانی مرۆ بەو چشتە خوێڕیلانە [کە زۆر جاران بایەخ وەردەگرن] پڕ دەبێتەوە. لە نموونەدا دەڵێم هەڵبژاردنی نوێنەران لە 3، 4، 5 ساڵدا جارێک ڕوودەدات و لە گەلێک وڵاتدا هەر بە ناویش هەڵبژاردنە کەچی هەڵبژاردنەکە و فێڵ و فەرەجەکەی و سوێند بە درۆ خواردنەکەی تا دەورەی بەسەر دەچێت یان نیوە و دووسێیەکی دەورەکەی هەڵدەوەشێتەوە، دەبێتە ڕواڵەتی ئیرادەی گەل و یاسادانان و سیاسەتی تەکنیک و ستراتیجی دەوڵەت، زۆرینەی نوێنەرەکانیش هەر تێنەگەیشتوون ئەو تاسوحەمامە چۆن دەبێتە زەریبە و تەجنید و قانوونی هەمەبابەت و بەرنامەی خوێندن - لە نموونەی بەرچاوی خۆم دەیگێڕمەوە:

دوایین نوێنەری کوێی بەر لە فرتەنەی تەمووزی 1958 دەیگێڕایەوە گوتی، لە هۆڵی کۆبوونەوەی نائیبان بووم نووری پاشا (نوري السعيد) هاتە ژوور بانگی کردم: فلاناغا! گوتم: هۆ و... گوتی: «نیساب حازر - النصاب حاضر؟» گوتم: نەعەم. گوتی: مجلس فاتحە! تومەز بێ ئەوەی بزانێ مەسەلە چییە دیتوەتی هەموو جاران سەرۆکی نوێنەران لە ڕۆژی کۆبوونەوەدا، لەسەر کورسی سەرۆکایەتی

دانیشتوە و چاوێکی بە هۆڵدا گێڕاوە و زانیویەتی ژمارەی پێویست لە نوێنەران حازرن ئیتر گوتوەتی: «النصاب حاصل. فتحت الجلسة».

هەر ئەم مەجلیسە بوو بڕیاری دا، دوای یەکبوونی سووریە و میسر، کە عێراق و ئوردونیش یەکتر بگرن. جارێکیان قانوونێک هات بۆ مەجلیس کە من تێیدا نوێنەر بووم (لە 1953) تومەز قانوونەکە بە مجێزی حکومەت نەبوو، لە دەنگ وەرگرتندا هەرچی نائیبی «معارض» بوو دەیگوت: «موافق»، نائیبی حکومەتیش دەیگوت: «مخالف». کە ناوی محموداغای زێباری خوێندرایەوە پەشۆکا نەیزانی چ بڵێ باشە... یەکێکی خێرەومەند گوتی: «موافق» - ئیتر بێ دوودڵی «موافق»ێکی زرینگەداری گوت... مەجلیسەکە کەوتە سەر گازەرای پشت...

دەڵێن شێخێکی عەرەبی لەم بابەتە جەریدەی سەرەوبن گرتبوو... لێیان پرسی چی تێدایە، گوتی: «ماكو غير سيارة مقلوبة» هەر ئەوەیە ئۆتۆمۆبێلێک وەرگەڕاوە...

بە ئیزنی خوێنەر ئەم نوکتەی مەجلسی نوێنەرانی میسری بیستەکانت بۆ دەڵێمەوە لە بابەتی «موافق» کەی محموداغا... سەعد زەغلوول سەرۆکی نوێنەران بوە، ئەندامان لەسەر هێندێ ماددەی دژوار دەمەتەقە و چەقەچەقیان بوە تا ئەوەی یەکێک مستی لە مێزی بەردەمی خۆی دا و گرمەی لێ هەڵستاند، نائیبێکی «صعید»ی میسر خەوی لێکەوتبوو ڕاچەنی و لە نائیبی تەنیشت خۆی پرسی: چ هەرایە، نائیبەکەش «صفي محمود پاشا» نوکتەباز بوە گوتوەتی: هەرایان لەسەر حەڵاڵ و حەرامبوونی گۆشتی حوشترە... صەعیدیەکە مستی لە مێز داوە و داوای قسەی کردوە... لە نۆرەی خۆیدا بە توندی لەو خەڵقەی ڕاخوڕیوە: ئێوە کاتی مەجلیس بە فێڕۆ دەدەن، لە هەموو مەزهەبەکانی ئیسلام گۆشتی حوشتر حەڵاڵە... ئیتر بوو بەو قاقایەی کە ناگوترێتەوە.

کە ئەمە حاڵی هەندێک لە نوێنەران بێت زۆر جاران وەزیری ئەوتۆش پەیدا دەبن وەک ئەوەی شاعیرێکی عێراقی لە بارەی وەزیری سەردەمی کۆنەوە دەڵێ:

يعدد أياما ويقبض راتبا

ڕۆژ دەژمێرێ و مانگانە دەستێنێ

بەهەمەحاڵ و بێ دوو دڵی دەڵێم: مێژووی میللەت کۆ بکەوە و بیکە یەک کتێب... کردە و گوتە و گەپ و کاری خوێڕیلەی بە درێژایی عومری یەک مرۆش بنووسە بە کتێب، گومان نییە لەوەدا کە کتێبی تاکە کابرا گەلێک قەبەتر دەبێت. ئنجا کە ئەمەت زانی و بە نیسبەت زوربەی هەرە زۆری ئادەمیزادیش هەمان باوەڕت بوو لێت ڕوون دەبێ کە تۆ سەیری Masquerade یێک دەکەیت لە دەفتەرخانەی مێژووی ئادەمیزاد نەک تۆماری ڕاستینەی فەرهەنگی ڕەسمی. کە ئەمە دەڵێم لە بیریشمە ئەگەر مرۆ خۆی ناچار کردبایە بە بیر کردنەوەی هەموو کردە و بردە و خەون و ورێنەیەکی زوو دەمرد چونکە مێشکی ئاخناو دەبێ و دەتۆقێ. دەشبێ بزانیت ئەو ڕەفتار و کردار و گفتارەی بێبایەخ بەشێکە لە «دەوروبەر» وەک کە ئەدەب و دین و هەڵپەرکێ و گۆرانی دەوروبەرن هەرچەند هیچیان بریتی نین لە ماددەی بە پۆز و کێش وەک بەرد و سەلکە پیاز. خۆ دیکتاتۆریەت و دیمۆکراسی و شیووعییەت و سەرمایەداری و چی و چی هیچیان وجوودی ماددییان نییە. بەزۆریش ئیشتراکیەت و شیووعیەتیش هەر بارتەقای گۆرانی و نوێژ و ڕۆژوو وجوودی سەربەخۆیان هەیە، بە ڕاستی وجوودە سەربەخۆیەکەشیان پتر لەگەڵ خۆی ڕاست دەکات تا ئەوەی دەکرێتە بەرنامەی ژیان کە هەر بابایە و ڕیسوا دەکرێت و وەرزێرە و دەکوژرێت و ستیخانۆڤە و دەشێوێت و خواستالینە و قەبربەدەر دەبێت و کێڵگەیە زەرد هەڵدەگەڕێت... و یێت... و یێت... ئەمە دەڵێم چونکە لە وڵاتی شیووعی ناشێ بگوترێ ناتەواوی و بێدادی و زوڵم و درۆ و ئەفسانە هەیە هەرچی وڵاتی بێئابڕووی «بۆرجوازی»یانە هەموو عەیبوعاری وەک پاشەڵی بزن بە دەرەوەیە ئیتر چی لەبارەیانەوە بڵێم ناگاتە سێیەک و پێنجیەکی ئەوەی خۆیان دەیڵێن و زۆر جارانیش لە زەمینەی ڕکابەری لێی زیاد دەکەن...

ئەو دەوروبەرەی بریتی بوو لە ڕەفتار و کردار و... و... تاکە یەک پیتی و یەک جووڵەی دەخلی نەبوو بەسەر چەکوچ و داس و هۆی بەرهەم بە گشتی و ئامێری بچووک و زلیەوە هەر لە دەرزی هەتا کەپسوولەی ئاسمانی... دەخلیشی هەبایە، کە نییەتی، ئامێری مردوو بە داس و گاجووت و چەکوچەوە زمانی نییە بگەڕێ بە داواکار مەگەر بابای ورێنەگۆ تەرجومانی بکا بۆی. ئەوساش ئامێرەفەندی هەر دەمێنێتەوە بە مەخلووقی مرۆ، بارتەقای قسە و هەنگاو و دامە و فووتبۆڵ... بگرە

هەتا تەیارە و مەیارە... ئەمە دەڵێم دەشزانم بابای مێشک ئاخناو بە قودسیەتی ئالەتی مردوو هەناوی قرچەقرچ دەکات کە دەبینێ بەو بێباکییە ڕووبەڕووی خوایە بێگیانەکەی دەبم... هەرچەند من لەو پلەیەدا نەماومەوە «ڕواڵەت» کارم تێبکا دیسانەوە هەر چونکە لەسەر خاکی بێدەسەڵاتی و بێسامانی و بێهێزییەوە دەنۆڕمە جیهانی جنجاڵ پتر قیزم لە تەیارەیە تا داس... عاتیفەم نەک هۆشم لێم خۆش دەهێنێت، کە هەر مومکین نەبێ بەرەوپێشەوە بگەمە تۆزی قافلەی پێشکەوتووان دڵەسورکێی ناچاری خەریکە ئاواتم بگۆڕێ بە پاشەکشە کردنی مرۆڤایەتی بەڵکوو لە کشانەوەیان بەیەکتر بگەینەوە... ئەوساش ئومێدێک هەیە ئەوان لە ئێمە خێراتر بەرەودوا بینەوە ئیتر بە کێشانەی ئێستاکەمان ئێمە پێشکەوتووتر دەردەچین... دەک ماڵی کۆست کەوتۆیی برمێت چۆن خەیاڵی بە دوای موستەحیلەوە دەبەستێتەوە.

بەداخەوە، ئەم لایەنەی سرانەوەی دێرکانی دەفتەری ژیانی تاک کە دەخلیان بە گرمە و زرمەی سیاسەت و هەرای ئایدیۆلۆجیانەوە نییە، نەبوو بە مەراقی خاوەن بیروڕای سەربە کۆمەڵایەتی و مێژوەوە، با بڵێم من نەمدیت کەسێک لەو بەرەیە هێمایەکی بۆ بکات و بایەخێکی بداتێ لە کاروباری کۆمەڵایەتیی بەرفرەوان کە دەزانین زۆر جاران ڕەفتاری نامەئلووفی مەیموونێکی باغی جانەوەران دەبێتە سەرەباسی ڕۆژنامان. بەڵێ، دەزانم ناوناوە شتێکی ئەوتۆییش لە حاڵوباری نامەئلووفی هەندێ کەس دەنگ و ڕەنگ دەداتەوە ئیتر لەبەر ناو و شۆرشی کەسەکە بێت یان زێدە سەیربوونی ڕەفتارەکە بێت بەمەشدا چ سوودێک بە فرەوان کردنی نیگای بیریار و مێژووناس ناگەیێنێت. ڕەنگە پزیشکەکان و سایکایەتریستەکان لە نوختە نیگای نەخۆشییەوە شتێک بنووسن، گومانم ناچێ کارەکە بگەیەننە مەیدانی بەربەرەکانیی فکر کە ئەگەر بیانکردایە تەووژمی دەدایە بیروڕای ئەو پەرۆشدارانەی بۆ مرۆ و مرۆڤایەتی تێدەکۆشن.

بەڕاست، ئایا جێی سەیر لێ هاتن نییە هەڵەشەییەکی نامەئلووفی کەمتیارێک، ڕێویەک لە باغی جانەوەران بە خێرایی بگاتە ڕۆژنامان کەچی ژیانی ڕۆژانەی سەرلەبەری ئادەمیزاد، کە دەخلی بەسەر سیاسەت و هەراومەزادەوە نەبێ، بە

نەبوو بکرێت و هیچ بایەخێکی پێ نەدرێت لە هیچ ڕوویەکەوە؟ لە وڵاتی دواکەوتوو سەدەها میلۆن کەس دەمرن و یەک شوێنەواریان لە پاش بەجێ نامێنێ.

بەر لە پەیدابوونی کامێرا و لازمبوونی وێنەی کەسان بۆ ناو کاغەزی ڕەسمی، ئەو ملیۆن و ملیارانە پاش مردنیان بە نەبوو دەبن:

تو گوئی کە أصلا ز مادر نەزاد

هەر دەڵێی لە دایکی نەزاوە

سەیر لەوەدایە کە پەرۆشخۆرانی حورمەتی هۆی بەرهەم بیر ناکەنەوە نەختێکیش پەرۆشداربن بۆ ئەو کەسانەی بەلایانەوە هەڵگری دروشمی چەکوچ و داسن و چاوێک خوار بکەنەوە بۆ بینینی ژیانی ڕۆژانەیان دوور لە بەرهەم و داس و تەڵە: لەو دەمەڕا کە خەرمان بەسەر دەچێت تا چەند ڕۆژێک پاش بارانی پەڵە وەرزیری دەغڵی دێمەکار دەمێنێتەوە لەگەڵ وردە مەشغەڵەتی خوێرپلەی باسکراو کە سەرلەبەری بریتییە لە فشەفش و تەقەوڕەقە و غەیبەتی ئەم و ئەو و لە پشووی پاش عەسری سەر سەرانگوێلکان و سەگەسەگەی چاوبرکێ لەگەڵ ئافرەتان... لەبەر نەداری، وەرزێری کوردستانی عێراق کە لێیان شارەزام ناتوانن تاژی ڕاگرن بۆ ڕاو هەر نەبێ لەو سێ مانگەی نێوان خەرمان و بارانی پەڵەدا گۆشت و چزە و بزەیەک ساز دەن. دیارە هەم ڕاهاتن لە بێ تاژیەتی و هەم بێدەفەتیی ڕاو لە بەشێکی بیندرێژی ساڵدا خەیاڵی تاژی ڕاگرتنی لە بیر وەرزێر بردۆتەوە...

هەروا لە مناسەبەدا دەڵێم: شیووعیی خۆمان و هی وڵاتی نزیک بە خۆمانیش تەنها وەرزێر (فلاح)ی تێخوێندۆتەوە لە کێشەی زەویدا کەچی پاڵە و گاوان و شوان و جووتیار ژمارەیان زۆر زیاترە لە فەلاح و لەویش هەژارترن، فەلاحیش بە تەما نییە بستێک ئەرز بدا بە غەیری خۆی کەچی پتر لە نیوەی بەرهەمی زەوی بۆ فەلاح دەچێتەوە... وا دایارە خەباتگێرانی سەربە چەپ نایانەوێ بە تێخوێندنەوەی ڕەنجبەر هەرا پەیدا بێ لە نێوان ئەمانە و فەلاحەکان ئیتر، ڕەنجبەر و فەلاح کە دەستی لە بینەقاقای یەکتر نا ملکدار دەحەسێتەوە، پرۆلیتاریاش کەرتک دەبێت [لە ڕاستیدا ڕەنجبەر و فەلاح کەرتک بوون، لە دەمێکیشەوە لەلایەن بەرژەوەندەوە،

بەڵام جارێ کەس پەیدا نەبووبوو بەشەڕیان بهێنێت] بێگومان ئەگەر بێدەنگبوونی ڕەنجبەر بە فرتوفێڵی زەویدار بایە ئەوسا خەباتگێڕی چەپ جۆرێکی دیکەی دەکرد، ئیتر چۆناوچۆنی دەلوێت با بلوێت، گرنگ ئەوەیە لە ئاشی خەباتی چینایەتیی ورد بهاڕێت؟

لەو چاو پێدا خشاندنەوەی جۆری ڕابواردنی ڕۆژانە و ساڵانەی تێکڕای مرۆ کە بەشی هەرەزۆری دوو تێبینی گەورەی تێدا دەکرێت:

1. بێبایەخی و بێسوودی
2. نەبوونی پێوەندیی نێوان هۆی بەرهەم و کار و گوتەی بێبایەخ

بۆت ڕوون دەبێتەوە دەورووبەر و هۆی بەرهەم لە چ بەتاڵاییەکی فش و بێئەنجام و چرووکدا دەخولێتەوە یان ڕەق هەڵدێت: ئەگەر هاتبایە مرۆ نیوە، سێیەک، چواریەکی خەریکبوونی بەو ڕەفتارە مەیموونانەی لە کاری بایەخدار و لە سێبەری ڕابەرایەتیی بەرژەوەندی گشتی [یان نیوەچڵ گشتی] خەرج کردبایە لە بنەڕەتەوە زۆرینەی هەرە زۆری زەرەر و پەژارە و فەلاکەت و پاشەکشە [یان داوەستان] ی کۆمەڵایەتی لە کیسەدا دەمایەوە، خۆ هەموو مانگ و ساڵێک تەیموور لەنگێک و ئەسکەندەرێک نایەت خاکی وڵاتان بە با بکات بەڵام کاری خوێڕیلەی بێلزومی نامەردانە و دوور لە سوود و پێویست وەک مووی لووت هەمیشەیی و بێوچان بوە، لەسەر قسەیەکی سووک کوشتن پەیدا بوو...

ساڵی 1953 لەسەر نۆرە ئاوێکی ڕەز سێ مەیت لە سماقووڵیی سەیدان هێنراوە کۆیێ هەمروشیان خزم بوون، ئاغا و ماغاشیان لە نێواندا نەبوو.

ئا لەم نموونەیدا ڕاستییەکی زەقی بەسفتوسۆ هەست دادەڕووشێنێ، لەخۆ بووردوویی ئەوتۆیی تا خۆ بەکوشتدان لەسەر شتێکی خوێڕوو لە دەروونەوە دەزێتەوە نەک ئازایی چونکە ئەو سێ قارەمانە و خزمانیان لەسەر دە نۆرە ئاویش بە دڵیاندا نەدەهات بوێرن چاو لە معاون پۆلیس یان مودیری ناحیە زەق بکەنەوە هەر چونکە لە ناخدا جووجکەترسێنی شکۆی حکومەت و دەسەڵاتن هەرچی دراوسێکەیەتی پرزۆڵێکە وەکوو خۆی چۆن دەشێ چاوی لەبەر دابهێنێت خۆ

لەلایەن مەترسییەوە نە معاون پۆلیس و نە مودیری ناحیە زات ناکەن نووکە چەقۆ لەکەس ڕاکەن نەکا بکێشیتەوە لێپرسینەوە...

ڕەنگە بگوترێ کاری ئەوتزیی، بەرتەسک و بێنموودن لەچاو هەرای زلی تەئریخی وەک شەڕەکان و شۆڕشەکان و هەراکانی عەقیدە و... هتد بێگومان تێکدانی ئاشوور لەلایەن میدیا و بابلەوە هەزاران جار گرنگترە لە هەڵگرتنی کچێکی عەشیرەت بەڵام لە نوختەنەزەری «دەوروبەر» و «هۆی بەرهەم» و «کاریگەرایەتی»ی تەئریخییەوە. تەئسیری ئەو کار و گوتە بێبایەخانەی لێیان دواین لە ماوەی هەزاران ساڵدا لە تەئسیری یەکسەری دەوروبەر و هۆی بەرهەم پتر دەبێتە کاریگەری مێژوویی وەک کە دەردێکی هەمیشەیی تووشی مرۆ بوو زەرەری وەها لێ دەدا زلتر و بە سفتوسۆتر دەبێ لە سووتانی دوو ژوور یان هەموو ماڵەکەی بۆ یەکجار هەرچەند لەماوەی سووتانەکەدا و تا چەند وەختێکیش پەرپۆشی ماڵەکە پتر بێ. جگە لەمەش، ڕووداوە زلەکان هیچیان دەخلی ئەوتۆیان نییە بەسەر هۆی بەرهەم و دەوروبەرەوە: چەندین بزووێنی ئەوتۆ هەیە لە کۆن و نوێدا [پتر لە کۆنەوە] هەرای زلی ناوەتەوە پێوەندی بە دەروونەوە هەیە... مەشوورە کە سوڵتانی تورکان [وابزانم بایەزید] گوتبووی: ئەگەر تەیمووری لەنگ بەلامدا بێت تێڵایەکی تێدەبرم. دەگوترێ لەو ڕۆژەوە تەیموور لابەلایی لەسەر زینی وڵاغ دادەنیشت گۆیا تێڵایەکەی بایەزید مانیعە، هەتا لە شەڕێکی گەورەدا شکاندی و ئەسیری کرد و ژنە هەرە جوانەکەی بایەزیدی بە ڕووتی دەکردە شەرابگێڕی مەجلیسی شەوانەی، بایەزیدیش بە دیارەوە...

لە کتێبێکی مێژووی دەوری صلاح الدین خوێندمەوە، دانەری کتێبەکەش خزمی صلاح الدین خۆیەتی، مەلیکێکی ئەو سەردەمانە لە هەلێکدا گەییشتە حەرەمی مەلیکێکی دیکە... دوای ساڵەها چوە داوەتی مەلیکە خەجاڵەتەکە... حەرەمی ئەمیان وەهای کرد کابرای مێوان بچێتە دەروونی قەسر... لە حەمام قەرەواشەکانی مەلیکە و مەلیک خۆی بە پاپووچان کوشتیان...

خالیدی کوڕی وەلید لە «حروب الردة»، «مالك بن نويرە»ی بە تۆمەتی «ردة - کافربوونەوە» کوشت و خێزانەکەی مارەکرد. عومەری کوڕی خەططاب داوای لە ئەبوبەکر کرد بە تۆمەتی زینا خالید ڕەجم بکات... ژیانی ئەسکەندەری مەکدۆنی و

شەڕە سەرکەوتوکانی، بگرە هەمووی زادەی مجێزی بوون. مێژوونووسەکانی بە دڵی ئەو، کارە بەدەکانیان بە جوانمەردی لە قەڵەم دەدا. یەکێکیان سەرپێچی کرد لەو ساختەکارییە، خێرا بە خێرا کوژرا... ئەو ساختەرکارییەی مێژوونوسەکانی ئەسکەندەر، کە تاج و تەختی هاخامەنشییەکانی تێک دا، کێشایەوە سەر هێندێ کە لە ئاکامی تەرجەمەی ئەو درۆ و دەلەسانە لە زمانی ئەورووپاییەوە بۆ سەر زمانی فارسی ناوی ئەسکەندەر ببێتە سەرامەدی پیاوچاک و خواپەرست و دلێران لە حاڵێکدا فارسی سەردەمی ئەسکەندەر وەسفی «گوجەستەک»یان وەپاڵ دەنا لە جیاتیی ئەو وشە خۆشکەڵانە. گوجەستەکیش بە واتای مەلعوون دێت...

بە جۆرێکی دەمەتەقە وەستێن دەڵێم [پێشتریش لە نووسینمدا بۆ نیازێکی تایبەت بەو دەمەوە گوتوومە]: گریمان[35] لەم جیهانەدا هەزار دین هەیە. لە باشترین حاڵدا دەشێ تەنها یەک دین لە نێوانیاندا ڕاست بێ مومکێنشە هەمووی ناڕاست بێ (بە پێی مەنتیقی دینەناسان) چونکە ناشێ دوو شتی لەیەک تر جودا و دژ بە یەکتر هەردوویان ڕاست بن ئەمما دەشێ هەردوویان هەڵە بن وەک ئەوەی کە یەکێک بڵێ 3+4= 5 یەکێکیش بڵێ نەخێر وانییە بەڵکوو 3+4= 15. ئنجا سەیری ئاکامی ئەم حەقیقەتە بکە کە 999 دین هەڵە بێت: ئادەمیزاد، مرۆڤایەتی چەند تێشکاو و ڕەنجەڕۆ و، ماڵکاول بوە کە بە درێژایی هەموو ڕابردووی هەزاران ساڵەی دینداریيەکەی نەک هەر ڕەنجی بێسوودی کێشاوە بەڵکوو لە داهاتەکە و چالاکیە بەرهەمهێنەکەی بەشێکی بە پۆزی خەرج کردوە دژی خۆی و غەیری خۆی کە دەزانین شەڕی کوشندە لەسەر جوداوازیی دین لە نێوان خەڵک هەڵایساوە...

شەڕی خاچپەرستان 200 ساڵێکی خایاند... فتوحاتی ئیسلام لە سنووری چینەوەی گرتەوە تا نزیک پاریس، لکێکیشی ڕۆیی بۆ جاوە و بەولاوە تریش. لە دین واز بێنە و بادەوە سەر عەقیدەی سیاسی: بێ زیاد و کەم هەموو دەستدرێژی و بگرەببەستەی «شۆڕش» تا دەگاتە کوشتنی بێتاوانان ئاکامی هەڵپەوکڵپەی خوێنکوڵاوان و فەرمودە ئاگرینەکانی هوتافلێدەران بوە. تاکە یەک شۆڕش نەبوە لە پاش سەرکەوتنی و دامەزاندنی حکومەت بەشی هەرە هەرە زۆری کەسانی

---

[35]- گریمان: وەهامان دانا. بە عەرەبی فرضنا. بە ئینگلیزی: We supposed.

چالاک و داخوازیکەری داد و پێشکەوتنی هێنمانەی لەلایەن ڕابەری حکومەتەکە و شۆڕشەکەوە تەفرووتوون نەکرابێت... دەتوانین بڵێین ڕابەری شۆڕش، کە شۆڕش خۆی توندوتیژییەکی بێ لغاوە، ڕازی نابێ بە کەمتر لە مافی «خوایەتی». ئەم دیاردەیەش دەچێتەوە بۆ وشاری دەروون پتر لەوەی بچێتەوە بۆ تەماعی سامان چونکە:

1. وا دەبێ ڕابەرەکە لەگەڵ داوای خوایەتیش دەستی دزین و ڕاووڕووت و تەماعی درێژنەکردوە.

2. ئەگەر تەماع بزوێنیش بێ دەشێ بە دەیەک و چلیەکی ڕاووڕووتەکە هەموو ئارەزۆیەک پێک بێت، دیارە زێدە تەماعەکە هی دەروونە نەک پێداویست و خۆتێرکردن.

3. ئەو دەروون و سیفەتانەی زگماک کە بەر لە چەندێک پێیاندا هاتینە خوار و دیتمان چ رووپێوێک لە ژیانی مرۆ پڕ دەکەنەوە هەر خۆیانن، نەک وشاری هۆشی دووربین و سوودی مرۆیانە، وا بە خێرایی و گەرماوگەرم و شیرازەی برایەتی و کۆنە هاوڕێیی نێوان سەرۆکی تازە بە دەستوپاوەندییەوە و نێوان ئاپۆرەی خەباتگێڕی بۆرەپیاوی ناو شۆڕش هەڵدەوەشێنن، ئیتر هەرچی شۆڕشگێڕی لێهاتو دەبێتە قوربانیی ترسی ڕابەرەکە لێیان.

زۆرینەی بۆرە خەباتگێڕانیش پشتگوێ دەخرێن، ئەگەرنا پیت و بەرەکەتی گەییشتن بە دەسەڵات بەشی هەمویان ناکات. هەرچی خەڵکی دەرەوەی جغزی دەسەڵاتیشە نان و فەلسەفەی پێداهەڵگوتنی شۆڕش و ژیانی بە سفتۆسۆی بێ ئیرادە میراتی حەڵاڵ و زەڵاڵیەتی... بە چاوی خۆت دەبینیت و بە گوێی خۆت دەبیست ئاپۆرەی گەل لە وڵاتی شۆڕشتێگەڕاودا بە سازی حکومەتەکەی هەڵدەپەڕێ و ناشتوانێ هەڵنەپەڕێ چونکە تۆمەتی بۆ ڕێکخراوە بە خزمەتکاریی بێگانە و خایەنی ناوخۆ ئیتر وێرای بێبەشی، حەپسخانە و پەتی مەرگ پاداشی دەبێت لە قودسییەتی شۆڕش.

هەر ئەم حاڵوبارەیە وەها دەکات شۆڕشگێڕان تۆمەتی بۆرجوازیەتی وەپاڵ ڕێژێمی دیمۆکرات بدەن بە نامەی ساختەبوونی هەڵبژاردن و دەنگدان و خۆ تەرشیح کردن. هەرچەند لەم ڕۆژگارەی تارادەیەک، زانستتێکەڕاو نسکۆی سۆڤێتستان شانازییە کۆنەکەی جاران بە گیانی شۆڕشگێڕایی چەپرۆیان گوڕی[36] بیست سی ساڵ لەمەوبەری نەماوە دیسانەوە دواکەوتوویی جیهانی چلوسییەم، لە پلەی یەکەم و دوەم و... پێنچەمدا، هەڵەشەیی سیاسەتی ئەمەریکا لە پلەی شەشەمدا [حەز دەکەیت بیکە بە سێیەم یا حەفتەم] وێڕای تێکهەڵدایی و گرێوگاڵی هەمەچەشنە و هەمەلایەنی «ژیان» خۆی و «پێکەوە ژیان» بە شێوەی گشتی و وزەی زیندە کزی و چارەسەرکردنی خۆ کردی گەلە دواکەوتوەکان لە هەژاری و نەزانی کە تێکەڵ دەبێتەوە بە دیاردەی هەناو ئاخناو بە ورێنە و ئەفسانە و خەریکبوون بە کار و گوتە و باوەڕی بێگەن و پووچەڵ، ئا ئەم پانۆرامایە زراوڕژێنە ئاوسە بە جۆرەها ساتمە لە هەر هەنگاوێکی بەرەو پێشەوە بچێت. چەندێکی خەیاڵ دەکەمەوە ئەم دەردە کوشندەیە دەرمانێکی نییە وەک کە بۆ سەرێشە دانەیەکی ئەسپرین دەرمانە. هەر چونکە لە بنەڕەتدا هۆیەکە و نەخۆشییەکە زادەی «مرۆڤ» و دەروونیەتی [هەموو جیهانی سێیەم بەڵگەی ئەم ڕاستییە] نە بە گەلەیەکگرتوەکان و نە بە ئەنجوومەنی هێمنایی چارە دەکرێت بە تەواوی وەک کە حکومەتی وڵات و ئیدارەی شار و پەندی پەندیار و دوعای مەلا و قەشە و دوعای چاک و پیران [لە قەبرەوە] دڕدۆنگیی نێوان بووک و خەسوو، برا و برا، هاوبەشانی یەک بەرژەوەند، دراوسێ و دراوسێ... ناتوانێ چارەسەر بکات.

وەها بوە دوژمنایەتی دوو فامیلیای یەک شار بۆ ماوەی پتر لە سەد ساڵ بەردەوام بوە هەتا ئەو دەمەی هێزی شەڕەچەقەیان نەماوە... بگەڕێوە بۆ مێژووی سەرەتای ئیسلام دەبینیت لێک تاسپبوونی بنەماڵەی «عبدالمطلب» و «أبو سفیان» لەسەر جۆری زەعامەت بە درێژایی تەمەنی دەوڵەتی ئیسلام لە پاش مردنی «عمر کوڕی خطاب»ەوە هەتا بەسەرچوونی دەوڵەتی «بني أمية» دژی و ناکۆکیی خوێناوی بەردەوام بوە. ئنجا کە عەباسییەکان [لە وەکالەتی نەوەی پێغەمبەر و عەلییەوە] هاتنە حوکم بە هەموو عومری دەوڵەتیان خەریکی سەرکوت کردن و، ناوناوە،

---

[36]- گوڕ: تین و تاو.

کوشتن و ڕەتاندن و قرتاندنی هاشمییەکان، وارسانی پێغەمبەر، بوون. بێگومان ئەو خزگرتنەی .بەرەی ماڵی پێغەمبەر لە ئاست ئومەوی و عەبباسییان بێ ئەوەی دەوڵەتیان هەبێ [جگە لە فاطمیەکان - مصر] دەچێتەوە بۆ قودسییەتی بنەماڵەکە کە شتێکی دەروونییە. عەبباسی و ئەمەوی و غەیری ئەوانیش ئاسەواریان بڕایەوە کەچی سەیدایەتی بەردەوامە و شینی حوسەین لای شیعە و حورمەتی ڕۆژی مەرگی لای سوننە لەم ڕۆژگارەدا گەشەدارترە تا ڕابردوو.

تێبینییەکی گرنگ هەیە لێرەدا لە پێکگرتنی دەروونی ئەفسانەپەرست بە دەروونی دروست و ڕووناک لە نوختە نیگای تێکهەڵقژانیانەوە: هەرچی ئەفسانەپەرستە یەکەندەردوو، بێ پەروا و پڕ بە دڵ ڕق هەڵگرتووانە، چەنگەوبازی نەهێشتنی بابای ڕووناک دەبێت: بە پێچەوانەوە، بابای ڕووناک چەندێکی بۆی بلوێت:

1. خەریکی خاوکردنەوە و ڕێنموونی ئەفسانە دۆست دەبێت.

2. دەستی ناچێتە ئازاردانی بابای گومڕا، چ جایی کوشتنی. کە هەر زانی سوود نییە لە هەوڵەکەی دوورەپارێز ڕادەوەستێ بۆ هەلێکی لەبارتر...

بۆ پتر ڕوونکردنەوە دەڵێم: ڕام کردنی پڵینگ و ورچ و مەیموون زۆر زۆر ئاسانترە لە سڕینەوەی ژەنگی گومڕایی لە مێشک و دەروونی بابای ئەفسانە و وڕێنەدۆست، تومەز جانەوەر ئەسیری غەریزەیە و بەس، هەرچی مرۆیە ئەسیری غەریزە و «هۆش»ە ئنجا بە پێی سادەیی بڕیارەکانی غەریزە لەچاو بڕیارەکانی هۆش ڕەها بوون لە غەریزە ئاسانترە بەڵکوو لە حاڵەتی ڕام کردندا سوودی جانەوەر لە کپ کردنی غەریزەکەیەتی نەک ڕەتکردنەوەی ڕامبوون. کەچی جێگیربوونی قودسییەتی ڕابەری درۆزن، چ دینی چ دنیایی، لە مێشک و دەروونی دەروێشی عەقیدە بزمارکوت دەبێ، ئەویش بە جۆرێکی سەرەکی لە دوو هۆی گرنگەوە:

1. ئەو هۆشە سادەی بەدەم هاندانی دەروونەوە بوو بە ئەسیری گومڕایی هۆشێکی زێدە برندەی دەوێت، وێڕای زانین و تەجرەبە، تا مومکین بێ لە چنگاڵی دەروێشایەتی ڕەها بێت. چەندێکی ئەسیربوونەکە ئاسانە ڕەهابوونەکە چەندان جار ئەستەمترە.

2. تینوتاوی گومڕایی مێشک و وڕێنەپەرستی دەروون یەکتر زاخاو دەدەن لەسەر ڕوحپەرەیی خوولیای شیرنکەڵەی واقوڕمان بەرانبەر، شکۆی شلوێ بە تریفەی شەبەنگی حاڵەتێکی ویژدانیی نامەئلووف[37]. من لە تەجرەبەی زیندوو دیتوومە حاڵ و جەزەبەی چەند سۆفییەک بەو سووران و کەفپژاندن و نرکەی سینە و بزرکانی شێوە... تا دەگاتە تیغ لە خۆدان تینوتاوی گەیاندۆتە ناخی چەند کەسانی دەمارکشت و ڕایکێشاون بۆ ناو ئاڵقەی حاڵەکە و جەزبە گرتوونی [سۆفیەتی بە تێکڕایی، چ هی ئیسلام چ هی غەیری ئیسلام، دیاردەیەکی سەربە مرۆیە پێوەندایەتیی زۆرتری بە دەروون و هەستی شەشەم و ئەو هەقوحسێبەوە هەیە، لێرەدا ڕێی بەبەر نیشتنیەوە نییە، ئەوەندەی تێدا دەگوترێ کە بە هیچ جۆرێک یاریدەی بیری ماددی نادات. بە پێچەوانەوە دژایەتی...] لێرەشدا پێویستە بگوترێ، ئەگەر جانەوەریش وێڕای غەریزە هەست و پێزانینێکی هەبوایە ڕام کردنی ئەستەمتر دەبوو چونکە ئەوسا دەبوو دوو لەمپەڕ تەخت بکرێت. پێویستە ئیشارەتێکیش بکرێت بۆ مرۆی هۆشڕووناک و تەیار بە زانست کە ئەویش بە بەریەوە هەیە لە حاڵەتی تەنگەتاوبوون بە وشاری باری نالەباری پەکخەری ئیرادە دروستەکەی تووشی تاوگیری و ڕیزپەڕی بێت چ لە هۆی دەرەکی و چ لە هۆی دەروونییەوە بێت خۆ مرۆ هەرچی ببێت نابێتە فرشتە مەگەر لە حاڵەتی دەروێشایەتیی زێدە زێدە خەستوخۆڵدا کە نەفەسەکەی پەککەوتە دەکات و حەزی «خۆ»ی تێدا دەمرێت...

---

[37]- مەبەست ئەوەیە گومڕایی مێشک لەلایەکەوە و وڕێنەپەرستیی دەروون لەلایەکی ترەوە تێک دەکەنەوە و یەکتر خەست دەکەن تا ئەوەی حاڵەتێکی ڕوحپەرەیی پەیدا دەبێ بە دیار خوولیای شیرنکەڵەی خۆ گوم کردن و واقوڕمان لە ئاست دەهشەت و شکۆی لێڵ و شلوێ کە لەو بارە خز و تەلەزگە بەستووی ویژدانی نامەئلووق تریفە دەداتەوە. بێگومان حاڵەتێکی جەزبەگرتووانە سواری هەست و هۆشی سۆفیی تەریقەت و دەروێشی سیاسەت دەبێت و پشتەوگازیان دەکاتە دژی هۆش و دژی بەرژەوەند و [لە حاڵەتی دەروێشەکەدا] دژی نیشتیمانیش.

خوێنەر لە بیری نەچێت کە ئێمە لەو پێداهاتنەمان بە حاڵی مرۆ هەم لە ڕووی بەتاڵیی زۆرینەی کاتی لە کار و گفتاری سوودبەخش و هەم لە ڕووی گۆڕانی مەراقەکانیەوە▪ لە تەمەنێکەوە بۆ تەمەنێک و هەم لە ڕووی سڕانەوەی پتر لە 90%ی چالاکییە بێبایەخەکانی لە دەفتەری ژیانی، هاتووچۆی لەگەڵدا دەکەین لە جغزی دەوروبەری کە دیتمان شوێن قامکی چەکوچ و داس ببڕای ببڕای دەرنەکەوت و ئەگەر عیشقی بەشێکی بە پۆزی ئادەمیزادی چالاک پێیانەوە خەریک نەبێت لە وەهم و خەیاڵیش دەرناکەوێت.

دەوروبەرەکەش کە لە داڕشتنی خەسڵەت و کەسایەتیی مرۆڤ بەشدار دەبێ تا ئەوەی کار دەکاتە سەر دەروونیش، ئا ئەو دەوروبەرەی مرۆداڕێژ هەمووی دەسکردی[38] مرۆکە خۆیەتی. بۆ ئەوەی خەتێک ڕاکێشیت لە نێوان تەئسیری دەوروبەری مرۆکرد و تەئسیری سروشتی لە مرۆ و لە کۆمەڵایەتی، تێوەڕامێنێ لەو شتانە و لەو چالاکییانەی مرۆ و جانەوەر تێیاندا بەشدارن وەک خواردن، زان، ترسان، ڕەق هەڵگرتن، ڕاو کردن... ئنجا خاک و هەواو و ئاو و ئاسمان و هەرچی هەیە: کە لێت مەعلووم بوو ئەو شتانە و دیاردانە کاری نەکردە جانەوەر بۆ بەرەوپێش بردنی بزانە، بە دڵی ئارامەوە، کە مرۆ لە بەرەوپێشچوونی قەرزداری شتێکی ترە کە لە جانەوەردا نییە ئەویش «هۆش»ی مرۆڤە...

ئەمەی دەیڵێم بەدیهیەیێکە تاقیکردنەوەی ناوێت، هەر فاکوفیکی ڕەپێش بکرێت بۆ دەوری هۆی بەرهەم و دەوروبەر بە جۆرێکی جودا لە کاریگەرایەتیی بنەڕەتی و یەکتابوونی خەسڵەتەکانی مرۆ لە گۆڕانی مێژوویی و کۆمەڵایەتی و زانست و هونەر و شەڕ و ئاشتی و هەرچی هەیە، یا ورێنەی نەزانییە یا تەڵەی فێڵبازییە یا کاری تاوگیری و بە خۆداشکانەوە و ترسی زیانە (زیانی ماددی و مەعنەوی)، مادەم هەرچی دیاردە و چالاکی و بوونەوەری بەرهەست و ماددەی مردوو و زیندوو هەیە و جانەوەر و مرۆی تێدا هاوپشکە و جانەوەرەکە پێی ناگۆڕێت دەبێ شتێکی تایبەت بە مرۆ بیگۆڕێت کە لە جانەوەردا نییە: ئنجا ئەگەر بابای چەپگر حەز

---

[38]- دەسکرد: هەموو چالاکییەکی مرۆ دەگریتەوە بە هی هۆش ▪ دەروونیشەوە، مەبەسیش کورت کردنەوەی تەعبیرە لە وشەی «دەسکرد» بۆ جودا کردنەوەی لە «سروشتکرد».

لە هۆش ناکات ببێتە هۆی بەرەوپێشچوون و کۆمەڵایەتی و مێژوو، زانیشمان چەکوچ و داس و چشتی ئەوتۆیی کە هەیە بە هیچ پێوانەیەک نابێتە بزوێنی مێژوو، لەسەریەتی هۆیەک بدۆزێتەوە تاکبوونی مرۆ لە بەرەوپێشچووندا تەفسیر بکات. بە چیدا فێربوو بنووسێت؟ نوێژ و رۆژووی زێدە ناحەزی چەپگەر و ئەرکقورس بەسەر بابای دیندارەوە لە کوێوەی بۆ هات؟ بۆچی نوێژ و رۆژوو لە خارجی دینە ئاسمانییەکان پەیدا نەبوو؟ لە جیاتی کەعبە و قودس چی بوو خەڵکێکی هێنایە سەر بوتپەرستی و سەگپەرستی و ئاژەڵپەرستی و ئاگرپەرستی؟ چەکوچ و داس کە فێری بوتپەرستیمان بکات لە کوێوە مجێزی ئەستێرەپەرستیمان لە مەڵاشووان دەسوێت؟

بەراست، بۆ لە خۆمان یان لە چەپگر بپرسین کە هۆی بەرهەمهێنت مامۆستای رابەر بێت بۆچی نەهات لە پێشەوە نووسین فێری مرۆ بکات و بۆچی هێندە دردۆنگ بوو لەگەڵ هەرچی فکری سەربە پێشرۆییەوە هەیە و تا ئێستاش بەرەی دۆستی هۆی بەرهەم دانووی لەگەڵ قۆناغی پاش ستالین ناکوڵێت و سڵە لە دێمۆکراسیی سەربە بازاڕی مەیلەو ئازاد و حەپسخانەی بێ شەق و شوللاق و مافی مانگرتن و نمایشت لە وڵاتی کۆمیونیست!

مەسەلەیەک هەیە سەر بەم نووسینە تا بڵێی خز و لەقە، بە زەحمەتێکی زل و فکرێکی برندە و هۆشێکی کرایەوە و دەستوقەڵەمێکی لە هی من پاراوتر و سەرچاوەی هەمەچەشنە نەبێ تێر بژێو نابێ و خۆیشی بەکاڵی دەمێنێتەوە و بەهەند هەڵناگیرێت کەچی لە گەلێک رووپەڕەی ئادەمیزادیەتی ئەسەری خۆی بە جێهێشتوە و ئاکامەکەی لەگەڵ رۆژگار سەرەژێر بۆتەوە وەهاش بوە بە پێی بابەتەکەی، ئادەمیزادی بەرز کردۆتەوە ئەویش لێکدانەوە و تێوەرامان و خوولیای بێ دەنگ و سەدایە دەربارەی بابەتێک و وەیا کێشەیەک کە دەشێ لەسەری زمان و نووکی قەڵەم و پەردەی مێشک بلەرزێتەوە یاخود قەتیس بمێنێتەوە بۆ ماوەیەک، واش دەبێ بۆ هەتاهەتایێ...

ئەم لایەنەی «تصورات» کەوا بەر هیچ کێشانە و پێوانە و ژمارە و سەرگورشتەیەک ناکەوێت و بەشی هەرە زۆری لە مێشک و دەروونی خاوەنیدا دەچێتە قەبرەوە و دەکوژێتەوە، سەرەڕای ئەوەی کە یەکێکە لەو خاسیەتانەی مرۆ

لە جانەوەر جودا دەکاتەوە، لە ژیانی تاکیش کاریگەرە. من نازانم زاناکانی دەروون لە بارەی ڕامان و لێکدانەوەی بێ دەنگ و جووڵە چییان گوتوە. چ بایەخێکیان پێ داوە لە دروست کردنی مەعقوولاتی ئادەمی و جۆری بۆچوون و باوەڕ و ڕەفتاری. ئایا کە خەیاڵ لەگەڵ بەژن و باڵای ناسک دڵی مرۆی هەژاند چ فەرقێکی دەبێ لەگەڵ بیر کردنەوە لە ڕووداوی بە سفتوسۆ... لەگەڵ هەڵکەوتی شەرمهێنەوە... لەگەڵ خۆ ڕازی کردن بە سازدانی هەڵوەستی ئازایانە، نیشتمانپەروەرانە، هەژاردۆستانە؟ جارێ دەبێ بزانین خەیاڵ و ڕێنەی سەپانێک، باغەوانێک، شوانێک تا بڵێی جودایە لە هی زانا فەلەک... ئەمیشیان جودایە لە هی زانای فیزیا و کیمیا و لە هی مەلا و شێخ و قەشە. خولاسە ئەم لایەنەش چەندین جۆر و تینوتاوی جودای هەیە تا ئەوەی دەشێ خەیاڵی دارکەر بەر لە نووستنی بریتی بێ لە تێر کردنی کەرەکەی یان پێڵاوێکی بسازێ لەگەڵ پووش و بەردی گرد و شاخ...

لێکدانەوە و خوولیا و پێکگرتن و ئاکام هەڵێنجان و کەلێن گرتنی ئاکامی ناتەواوی پێشووتر و دەمەتەقە لەگەڵ بیروڕای جودا و تووڕەبوون لە باوەڕی دڵشێوێن و ئەو جۆرە مەراقی وەها ئەریستۆکرات لەچاو شەپوتەپی نەخوێندەوار و سۆفیتەبیات ڕێبازێکە قەوغا و بە دەنگ و سەدای نەبیسراو کە لە مێشک و دەرووندا سەری خاوەنەکەیان کاس دەکەن... لێت مەعیەن بێ بەشێکی فکری ورد و فەلسەفەی بەرز و داهێنان و ئیبداع قەرزداری ئەو بوحرانەیە کە مرۆی لێهاتوو و پەرۆشدار مەلەی تێدا دەکات... دەڵێن ئەرخەمیدس لە حاڵی خۆ شووشتندا، کە ڕێی قسە و خوێندنەوەی بەسەرەوە نییە، دەستووری سووکبوونی قورسایی ناو ئاوی دۆزیەوە یان بۆی کەشف بوو (کەشفەکەش لە بارترە).

وەی کاشکی ئەو ڕۆژەمان دەدیت کە زانست دەتوانێ خەریتەی جنجاڵی مێشک و دەروون بگرێت. بێگومان هەزاران حاڵەتی وەک هینەکەی ئەرخەمیدس بە مێشکی زاناکاندا تێپەڕیوە و تۆمار نەکراوە و لە بیران چۆتەوە. نەختێک فەرامۆشی لەوەدا دێت کە بەشێکی ئەو خەیاڵانە لە دەرووندا، لە هۆشی وندا، کە گرێکوێرەیان تێدایە (واتە: خەیاڵەکان) شیتەڵ دەکرێن و لە دەرفەتدا بلق دەدەنەوە بۆ هۆشی ئاگادار و تەلیسمەکە حەل دەبێ... لە بیرمە، ساڵێکی سییەکان گۆڤارێکی میسری وێنەی ئەدیسۆنی لە حاڵەتی ڕاماندا نیشان دەدات و دەڵێ چەند ڕۆژێکە لەو ڕامانەدایە

هەڵبەت مەراقەکە هی دەمی ئاگا لە خۆ بوونە، چەندێکی لە خەو بەخەبەر هاتبێ مەراقەکە بەردەوام بوو.

ناپۆلیۆن کە پێی داگرت لەسەر داگیرکردنی مۆسکۆ بە تەما بوو بە داگیر کردنی، حکومەتەکەی ڕووس و لەشکرەکەی دێن سەری بۆ فروودێنن کەچی لێکدانەوەکەی و تەماکەی نەهاتنەجێ، تومەز بانگەوازی دەروونی جووت ڕێبیو لەگەڵ ئومێد و تەما و مجێزی، خۆ ئەگەر سووربوونی قوماندانەکەی ڕووس لەسەر دەوامەی جەنگ نەبوایە ناپۆلیۆن گرەوەکەی دەبردەوە و ڕۆگەی چانسی ئەورووپا و جیهانیش دەچوە بارێکی دیکە کە نازانین چۆناوچۆنی دەبوو.

بەلای باوەڕی منەوە، ئەگەر نەڵێم بەلای باوەڕی حەقیقەتیشەوە، کاریگەرترین وتووێژی دەروونی و سکالای خامۆش و ڕۆچوون لە ناخ بە خوولیا و مەراقێکی زلەوە لە غاری «حراء»دا بوە کە پێغەمبەری ئیسلام خڵوەی شەو و ڕۆژی تێدا کردوە... چەندێکی لایەنگیرانی تەفسیری ماددی بیانەوێت سروشبیستن و غەیبیزانی و خەونی ڕاست و پێشبینی و ئەو جۆرە دیاردەی دانسقە بستێننەوە لە «گیان» و بیدەنەوە بە «لەش»... لە قەبەڵ فیزیای بکەن نەک میتافیزیک، کەلێنی فەراخ و بەرین دەمێنێتەوە لەو بەڵگەبەندەی بە زیرەکی دەیکەن بۆ گێڕانی چارچێوی ماددی بە دەوری چشتی (بە زاهیر) ناماددییەوە، لەو کەلێنانەوە ناتەواویی بەڵگەکان زەنە دەکات و سەربەخۆیی دیاردەکان لە دەسەڵاتی ماددە (کە لە تەجرەبەی ڕۆژانە دەبینین، ماددە، چەند گێل و بێئاگایە) بەدەر دەداتەوە.

قورئان لە ماوەی پتر لە بیست ساڵدا بە کۆتایی گەییشت، لەو ماوەیەشدا چەندین حاڵوباری لێکتر جودا، زۆریشی بە سفتوسۆ، بەسەر پێغەمبەر و ئیسلامدا هات کەچی نەفەسی قورئان لە تەمەنی 40 ساڵی و 60 ساڵیدا نەگۆڕا. لە بیرت بێ گوتم «نەفەسی قورئان» نەگۆڕا نەک حاڵی مسڵمانان یاخود باری گوزەرانی پێغەمبەر. ئەگەر بە وردی لە شیعری شاعیران ڕامێنیت هەست دەکەیت لە ماوەی 15-20 ساڵدا دەموودوویان فەرق دەکات، مەبەسیشم «باوەڕ» نییە بەڵکوو شێوازی تەعبیر و داڕشتن و خوولیایە. ئنجا سەیری کاروباری جیهان بکە و بچۆوە بەر لە پێغەمبەرایەتیی «محمد» و لالغاوەی «احتمال» هەڵزڕێنە هەتا وەک دەربەندی بازیان سوپای پێدا تێپەڕ بێت و سیحر و جادووگەریش بە هانای تەفسیراتی

مادییەتەوە بخوازەوە، ئەششەدوبیللا بە وەهم و خەون و خەیاڵیشتدا نایەت کە گۆشەگیریی «محمد» لە غارە وشک و ڕەقەکەی «حرا» ڕێخۆشکەری تێکدانی عەرشی شاهەنشاهـ و ڕەتاندنی سپای قەیسەرە لەلایەن عەرەبێکی کە لەو دەمەدا هەموو عەرەب دەیکرد: «هیچ».

من مەبەستم نییە لێرەدا مێژوو لە «احتمالات» مارە بکەم هەرچەند گەلێک لەو شتانەی ڕوویان داوە دەشیا ڕوو نەدەن بەڵام ئەغلەب ئەوەی ڕوو دەدەن خزمی ئەو ئیحتماله دەبن کە ڕووی نەداوە وەک ئەوەی کە تیروپشکی لێ دەهاوێژن بۆ عەلۆ دەرچێت یان جەلۆ فەرقێک بە چارەنووسی کوێخای زەردیاوەش ناکات ▪ جایی قەیسەر و شاهەنشاهـ و ڕۆم و فارس...

لەو دیاردەیەی خەریکبوونی ئادەمی بە وتوویژ لەگەڵ خۆیدا ڕووپەڕەیەکی شکڵ «مزاش» هەیە کە لە تێکەڵبوونی خوولیا و مەراق لەگەڵ کەسبێک مرۆ پێی دەژیت پەیدا دەبێت وەک کە بابایەکی بەقاڵ بەدەم ئاڵوێر و هەڵکێش و داکێشەوە و لە ئاکامی تێکبەسترانی کردەوەی دەست و چاو لەگەڵ خەیاڵی دەروون مەهارەتێک پەیدا دەکات لە بەقاڵی لە هیچ مەیدانێکی تردا بە خۆیەوە نابیبنێت: بەڵێ، پشیلەش لە کێشکە گرتن مەعلانترە تا ئەوەی بە زێدە مەهارەت چاری لەکلەک و ڕێوی بکات بەڵام هەر چونکە توانای لێکدانەوە و تووێژی دەروونیی نییە ڕێ دەر ناکات بۆ فێڵێکی پەکی لەسەر نیگافرەوانی و برشتی دەماغ کەوتبێ. هەرچی بەقاڵە بە تەڕدەستی و ڕێکخستن و ڕازاندنەوە و قسەی شیرن و فەندی ئیقناع کردن و وێڕای نەبوونی گرفت لە نێوان قسە و ڕەفتاری کە بەدەم کەسبەکەوە وێکڕا مشتوماڵ دراون، هەمیشە ململانییەتی لەگەڵ هەموار کردنی ڕێی قازانج بێ ئەوەی شەڕ بە دراوسێ یان کڕیار بفرۆشێت وەک کە پشیلە دەیکات لەگەڵ «دراوسێ»ی ئەوتۆدا تەمای لە ئێسک و پێستێکی بەر دەستی خۆی کردبێت، چونکە بێگومان ئەگەر بەقاڵ بە شەڕەچەپەڵۆک کڕیار بۆ خۆی ڕابکێشێت ڕاپێچەک دەدرێت بۆ پۆلیسخانە و بە دووسێ جاری ئەوتۆیی ناوزڕاو و بێنان دەبێ. ڕاهاتن بە کەسابەت وەها لە مرۆ دەکات توانای کەسبێکی دیکەی نەبێ، هۆی یەکەمی ئەو هێزەی ڕاهاتن دەچێتەوە بۆ سازشی هۆش و لەش و دەروون لەسەر هەڵسووڕ و داسووڕی کەسبەکە تا ئەوەی دەڵێی لە منداڵدانی دایکیڕا پێی ئۆگر بوە.

لایەنێکی دیکەش هەیە لە مرۆدا ئاشکراتر و بنجیترە تا لە جانەوەردا: لە حاڵوباری مرۆدا کۆنەواری [روح المحافظة Conservatism] دەورێکی سەرەکی هەیە لە ئاست نەگۆڕینی خوو گرتن بە کارێکەوە یان ڕەوشتێکەوە [... یان ئایین و باوڕێکەوە کە ئەمیان ببڕای ببڕای لە جانەوەردا نییە] قسەشمان لەگەڵ غەریزە نییە کە سوانی تابلێی درێژخایینە. من لە گۆشەی لێکدانەوەی خۆمەوە بۆ دیاردەکە دەچم کە بەشێکە لە سەرجوملەی «دەوروبەر» وادەزانم پێوەندی هەیە بە فرەلایەنی خەریکبوونی مرۆ بە کاروباری ژیان و بەسەربردن و خۆپارێزی گۆڕانکاری [کە بەندە بە پلانی هۆشکردی سەربە زانست و تەکنیکەوە بە پێوانەی پلەی فراژووتنی ژیاری] و فەرمانی دەستووراتی ئاکار و ئایین و باوەڕ... خولاسە هەرچی تایبەتمەندییەکی مرۆ لە غەیری خۆی جودا دەکاتەوە، هەڵبەت لێرەدا ڕەچاوی هەموو سەروبەرێکی کۆمەڵایەتیی بەرفرەوان دەکرێت لەو هەرێمەی مرۆ تێیدا دەژیت[39]. بەر لە پەنجا ساڵ لادێیی تای دەهاتێ کە قوتابخانە لە دێیەکەی دەکرایەوە، هەم لەبەر ناوبەدیەکی بیدینی کە لە ئەفەندییان دەگوترایەوە، هەم لەبەر پەک کەوتنی هەندێ بەرژەوەندی کە منداڵەکەی بە مەکتەبەوە خەریک دەکرا. بەڵام کار گەییە جێگەیەکی بەرەواژ کە چەند قوتابییەک بوون بە مەئموور.

خولاسە خۆگیری و دوودڵی کردن لە داڕنینی پێستی نەریت و نرخی مەعنەویی ڕەگداکوتاو و جۆری خۆراک و پۆشاک تا دەگاتە گۆڕانی ناو لە مەریەمەوە بۆ ژاڵە و لە حەوڵاوە بۆ سەرتیپ، ئنجا زاڵبوونی شێوە خانووی نوێی ئەورووپایی بەسەر خانوە کۆنەکانی بێ لەمپەڕ دژی سەرما و گەرما و تۆز و سەگ و پشیلە و مریشکی جیران... ئەمانە هەمووی و هی دیکەش کە لە ئەژمار نایەن خەسڵەتی کۆنەواری و خۆگیری لە مرۆدا مەندتر دەکات لەچاو ئەوەی کە داوە مەعنەوی و

---

[39]- بە پەلە ئەم نموونەیە دەهێنمەوە بۆ ڕوون کردنەوەی مەبەست: چادرنشین کەمتر لە لادێی ئۆگری خاک و ئاو دەبێت کە بە نیو سەعات چادرەکەی دەخاتە سەرپشتی کەر و ئێستر بۆ لەوەڕگەیەکی زەنویرتر. لادێیش کەمتر لە شارنشین بەستراوەتەوە بە زێدی تێدا ژیانی، لەبەر کەمتربوونی ئەو داوانەی ژیاری کە مرۆ نیشتەجێ دەکات و ئاوارەبوون بەزەحمەت دەیەخێ وەک: مزگەوت، بازاڕ، قوتابخانە، پرۆژەی ئاو، کەسابەتی جۆراوجۆر، دایەرەکانی حکومەت و شارەوانی، خەستەخانە... کارەباش دەخلێکی پەیدا کردوە.

مادییەکان کەمتر بانایە چ جایی ئەوەی لە بنەڕەتەوە سەریان هەڵنەهێنابایە... تۆ سەیری ئەمە بکە: بەر لە پەیدابوونی گرامۆفۆن و ڕادیۆ و تەلەڤیژن هەر نەتەوەیەک بە گۆرانی ی شایی و خۆراکی خۆی ڕازی و تەسەل بوو تا ئەوەی کە نەیدەتوانی گوێ بگرێ لە گۆرانییەکی هەرە پێشکەوتووی نەتەوەیەکی تر... جلکی بێگانەی بەلاوە حەیاچوون بوو... بیدیتایە پیاو دەستی ئافرەت ماچ دەکات [مادەم خۆی ماچی ناکات] یەکسەر بە نامەردی دادەنا و ئافرەتەکەشی بە بێئابڕوو.

کە بچین بۆ سەر باوەڕی ئایینی [دواتر: سیاسی] دەگەینە مەیدانێک بریتییە لە ڕک و کینە و ڕەتاندن و کوشتن لەو ڕووەوە کە قووڵایی باوەڕی سەربە غەیب، بەتایبەتی دینە ئاسمانیەکان کە موژدەی بەهەشت و هەڕەشەی دۆزەخ و ژیانی بێبڕانەوەیان لەگەڵدایە هەموو ئەرک و جانفیدایی وماڵبەخشی لە دیندار دەکا بە نرخی کامەرانیی هەتاهەتایێ و دیندارەکەش بە هەڵگرتنی ئەم ئەرکە خۆی بەختیار و سوودمەند دەزانێت. ڕەنگە دیندارێکی ڕەزیل دڵی نەیهێنێ ئانەیەک بداتە هەژار بەڵام، بەزۆری، زەکات لە ماڵی «زەکاتی» دەر دەکات و دەشچێتە حەج مادەم بە بڕیاری شەرع حەجی لەسەر بێت [کە بشیەوێ لە دینەکەی بدزێتەوە] بە قیلەشەرع دڵی خۆی و عەقیدەش ڕازی دەکات]. لەوانەیە دیندارێکساڵی جارێ خۆی حاماملەمیش نەکات بەڵام لە شەیتانیبووندا خۆی لە حەوزی ئاوی مزگەوت هەڵدەکێشا [جاران] و پریشکێکی پێی دەڵێن «نەجاسة» بە لەشی هەڵپرژابایە دەبوو دڵێرانە شۆراندبای لەبەر خاتری نوێژ نەک بۆ پاکیی خۆی.

ڕەنگە من تاکەکەس بم لە دەوروبەری خۆمدا کە بەر لە 35 ساڵ بە «عقد نکاح»ێکی قاضی شەرعیی حکومەت ڕازی بم و نەنێرم بە دوای مەلادا بۆ مسۆگەربوونی دروستیی نیکاحەکە: سەرلەبەری خەڵک تا ئەمڕۆکەش [وەک بزانم] دوای نیکاحی ڕەسمی نیکاحی «شەرعی» یان لای مەلا تەواو دەکرد... بەڵام دوای ئەوەی کە نیکاحی بێ ئیزنی مەحکەمە لە قانووندا بایەخی نەما حاڵەتەکە فەرقێکی کرد و دینداریەکەش لای بەشێکی تازەپێگەییشتووان پسۆک بوە...

لێرەدا پێویستە ڕووناکییەک بخرێتە سەر بابەت: بە کورتی دەڵێم، بزووتنەوەی دینی، بەتایبەتی لای ئیسلام، وشاری پەیدا کردوە لەوەتەی سیاسەت تێکەڵ بە دروشم و ئامانجەکانی بوە. سێبەرێکی تۆخی ئەم دیاردەیە بەشێکی پۆزی خەڵکی

ناسیاسیشی گرتۆتەوە. بێ ئەوەی بمەوێ دینداران زویر بکەم و تەنها لە نوختە نیگای ڕاستیی بێفیڵەوە: بزووتنەوەکە بەرەو دەروێشایەتیی بێپلانی ڕووەو چاکەی ئادەمیزاد لە هەڵبەز هەڵبەزەدایە. بارەها و جارەهاش ع گەشاییەکی عومەری عەبدولعەزیز و ئیمامی عەلی پێوە نامێنێ. بە پێچەوانەوە، دڕندەیی بێلزوم و کوشتنی بێدەسەڵاتان و بۆمبا تەقاندنی شەقام و کۆڵانان بە جەڕ و مەنگەنەش نابردرێتەوە بۆ هیچ باوەڕ و ئامانجێکی پیرۆز... حاڵ گەییشتە ڕادەیەک، ئیسلامەکان لە پلەی گەییشتن بە دەسەڵاتی دەوڵەتی هەر لە تەمای دەوڵەتەکەوە یەخەی یەکتریان گرت. دەزانم تەعەسوبی دینی و مەزهەبی و قادری و نەقشی و چی و چی بە بەریەوە هەیە لە حاڵی هەڵچووندا بە کوتەک هەڵکوتێتە سەر تانک و سەر شێر و پڵینگ بەڵام شەڕ کردنی دوو لایەنی ئیسلامی بە تانک و فڕۆکە دژ بە یەکتر و بە نیازی قڕ تێخستن ڕەنگێکی ئاشکرای سیاسەت و دەست تێوەردانی بەرژەوەندی ماددی لە بەرنامەی دیندارەکانە بۆ مەبەستی خۆی، بە پانایی مەیدانەکانی شەڕ و تێکهەڵقژان، لە چاوان دەچەقێ. هەر ئەم لایەنەی تێکەڵبوونی سیاسەت لەگەڵ دین وەها دەکات دوو لایەنی ئیسلامی لەسەر گەییشتن بە دەسەڵات بە جۆرێک پاڵەوانەتیی دژ بە یەکتر دەنوێنن هەرگیز لەگەڵ «گومڕا!» یانیان نەنوا‌ندوە. بێگومان بەشێک لەو پارە و پوولەی بە شەڕکەرانی موسوڵمان دەگات سەرچاوەی لە ناموسوڵمانەوە دێت، تەنانەت دەوڵەتی ئیسلامیش هەیە بە ڕێدانی دەوڵەتی نائیسلام یاریدەی ئەم و ئەو دەدات...

لە هەرێمی سیاسەتیشدا بە شێوەیەکی گشتی ئەو مەیلەی خۆگیری[40] و مەندی بەدەر دەداتەوە. پلەی خەستوخۆڵی و دەمارکشتی لە مەندیی سیاسیدا بەندە بە پلەی دوور کەوتنەوەی بەرنامەی سیاسی لە ڕەفتار و گفتار و کرداری ئاسایی. بە تێکڕایی کەسەبەی بازاڕ و ڕەنجدەری گوریس بە کۆڵ و وەرزێری پەرێز و شوان و گاوان چ لە ماڵەوە پاڵی دابێتەوە و چ خەریکی کارەکەی بێت فەرقێکی بەرچاو لە سلوکیدا پەیدا نابێت چونکە دەمارکشتی لەگەڵ کەسبەکە ناگونجێ و لزومیشی نییە. کە بێینە جغزی سیاسەت حاڵوبارەکە دەگۆڕێت بەتایبەتی لە وڵاتی دواکەوتووی

---

40- خۆگیری بەر واتای کۆنەواری دەکەوێت. خۆگری بەرگە گرتنی شەڕ و سەغڵەتییە.

دابڕاو لە ژیاریی سەردەم کە بە دەگمەن نەبێ سیاسەت تێیدا خزمایەتییەکی نییە لەگەڵ کەسابەتی ڕۆژانە و ڕەفتاری عادەتی.

لە وڵاتی پێشکەوتوو سیاسەت و ئابووری دوو ڕووی یەک سککەن و سیاسەت تەرجەمە دەکرێ بە گوزەران و گوزەرانیش دەبێتەوە مەداری سیاسەت. هەڵبەت نابێ لە بیر بکەین، بابای سیاسی دەبێ تەیار بێ بەو فەند و چەرخودۆڵابەی کە خۆ تەرخان کردن بۆ سیاسەت داخوازیی دەکات وەک کە شوان دەبێ فەندی مەڕ ڕام کردن بزانێ. لە ڕژێمی دیمۆکرات مەرج نییە هەموو دەنگدەرانی بژاردە کردنی نوێنەرانی پەرلەمان شیاوی وەزارەت بن. بەڵکوو لزوم نییە لایەقی نوێنەرایەتیش بن. ڕەنگە لە حاڵوباری دەگمەندا سەهووش بکەن لە هەڵبژاردنی باشترین بەرنامەی حیزبەکان. بەڵام دیسانەوە کە قیاس بکرێن لە دەنگدارانی وڵاتی دواکەوتوو وەیا دیکتاتۆرپەرست، فەرقیان ئاسمان و ڕێسمانە. کە گوتم «وڵاتی دیکتاتۆرپەرست» یەکسەر و بەر لە هەموان وڵاتی کۆمیونیست دەگرێتەوە و ئنجا تورکیای ئەتاتورک و ئۆغەندەی عیدی ئەمین [ئەگەر هەڵەم نەکردبێ] چونکە لە کۆمیونیزمدا بەرنامەی حوکم هێندەی قورئان موقەددەسە و جێی دەمەتەقەش نییە هەرچی قورئانە تەئویل هەڵدەگرێ وەیا دەشێ چەندین بیروڕای لێکتر جودای لێ بەربێتەوە وەک دەگوترێت ئیسلام بوەتە حەفتا و ئەوەندە فیرقە.

لە کۆمیونیزمدا باوەڕە سیاسییەکە لەوە دەردەچێت یاسایەک بێ بۆ گوزەران بەڵکوو بە بەهانەی پاراستنی بەرژەوەندی پرۆلیتاریا بەولای قورئان و ئینجیلەوە تێهەڵدەکێشێت لە قودسییەت وێڕای ڕانواندنی خەفە کردنی پۆخڵەواتی سەرمایەداری. مارکسیزم لە صەدیەکی شیووعیی جیهان تێی ناگات، ناشتوانێ بیخوێنێتەوە، تەورات و ئینجیل و قورئانێکی مادديە لێی دەوەشێتەوە وەک نوشتە بۆ شیفای دەردان بەسەر شان و قۆڵ و باسکاندا بدوورێت.

لەم حەقیقەتەی وەپاڵ دانی قودسییەت بۆ بابەتێکی دنیایی و پشت لە غەیب، بۆت ڕوون دەبێتەوە [بە زۆر لای دیکەشدا هەر ڕوون دەبێتەوە] کە ئەوەی پێی دەڵێن «تناقض» بزوێنەری مێژوو لەبەر نەزانینی قوتابییەکانی، تەناقوزێک پەیدا دەکات دەبوو هەرگیز پەیدا نەبێ لەو ڕووەوە کە بەپێی فەلسەفەی ماددی فیکرەی قودسییەت بێ ئەسل و ئەساس دەردەچێت. چۆن دەشێ قودسییەت لە ماددیەت

بئاڵێ کە ماددیەت خۆی قاتڵی قودسییەتە: کە شیووعی بۆ شکۆی ستالین وەک سۆفی بۆ شکۆی شێخەکەی بزرکێت و چاوی بزەقێت و ڕایە پسۆکەکەی بپەرستێت چ دەمێنێتەوە لەگیانی عیلمانییەت و مرۆدۆستی شانازی پێوە بکات کە دەزانین سۆفی، بە دەگمەنێکی دەگمەن نەبێ، فەرمانی کوشتنی ئەم و ئەو بەجێ ناهێنێت، شێخەکەشی، بە دەگمەن نەبێ، ئەو داوایە ناکات. کەچی دەروێشی مارکسیزم لە دەمی جەزبە گرتنی شۆڕشگێڕیی سەربە پرۆلتاریا منداڵی ناو بێشکەش لە ماڵی بۆرجوازیدا بە دوژمن دەزانێت و زۆر بە مجێزەوە بە ئەمری حیزبی شیووعی پێشمەرگەی دەکوشت بۆ سەرخستنی سوپای حکومەت. دواتریش دەستبەتاڵترین سەپانی پووش دەرچوو لە خاکی عێراق. ئەگەر کوردستانەکە لە تاوانەکەی خۆش نەبایە یەک پێ ئەرزی دەست نەدەکەوت بەسەریەوە ڕاوەستێ.

ئەمە دەڵێم لە نوختە نەزەری دەروێشایەتیی سەربە مادییەت نەک بە نیازی شکاندنەوەی فلان و فلان. دەشزانم شکستەی سپای کۆمونیزمی کوردی ئەگەر بۆی بلوێتەوە جارێکی دیکەش هەروەها دادەبڕێت و دەدڕێت، بگرە دڕتریش دەبێت بە مەرجێک دنیاکەی بگەڕێتەوە بۆ باری ساڵانی پێشمەرگەکوشتن کە وا ڕەنگە بەلای حیسابی خۆیەوە فرسەتی ئەوسای لە چنگ خۆی دابێت.

دیاردەی قودسییەتی لینین و ماو و ستالین و سۆڤێتستان حیکایەتێکی ئەفساناوی لە جەرگەی دەوروبەری ئیلحاد و [بە زاهیر] عیلمانییەت و ماددیەت دەچڕێت کە ئەویش سەرلەنوێ زاتیبوونی مرۆ بەسەر ماددیبوونی زاڵ دەکات ئەمما بە جۆرێکی زێدە ڕوونکەرەوەی تەناقوزی فیکرەی ماددی لەگەڵ خۆیدا، ئەویش لە زۆر ڕووەوە:

1. تەقدیسی ئەو ناو و ناودارانە لەلایەن دەروێشەکانیانەوە بە هەنیسک و فرمێسک و بزرکان و وڕبوونەوە دوو جاران تەقلەیان پێ لێ دەدا: یەکیان، کە لە ماددیەتەوە دەگەڕێنەوە بۆ ڕۆحانییەت دوەمیان لە ڕۆحانییەتی دەروێشانەوە بۆ جێگیر کردنی ڕۆحانییەتی ماددی.

2. هەورازتر بردنی حورمەتی «تاکنەوازی» کە وەپاڵ بیری نامادری دەدرێن و گەیاندنی بە پلەی خوایەتی یان هەرنەبێ پلەی «تاکپەرستی».

3.کوێر کردنەوەی ڕێگەی موناقەشە کردن لە بارەی ئەو تەقدیسە سەرەوبنە بە تۆقاندن و تۆپاندن و وردوخاش کردن...

ئەگەر هاتبایە دەوروبەر کاری هۆی بەرهەم بوایە دەبوو هەموو ئەو وڵاتانەی بە گاسن و گاجووت جووت دەکەن و بە داس دەغڵ دەدروونەوە و بە ئاشی ئاو باراش دەهاڕن و بە چەکوچ ئاسنگەری دەکەن سەرلەبەریان یەک جۆر گوزەران و کۆمەڵایەتی و ئایین و داب و دەستووریان هەبێت کەچی دانیشتووی یەک شار لەبەر جوداوازیی دین دوو کەرت و سێ کەرت دەبێت تا ئەوەی دەستکوژی یەکتر ناخۆن، ژن لەیەکتر مارە ناکەن. ئەم دیاردەیە لە غاڵب شار و شارۆچکەکانی کوردستان بەردەوام بوو، تائێستاش بەردەوامە. تومەز مرۆ خۆی بنەمای هەموو دەوروبەر و بەرهەمهێن و دین و دەستووراتی ژیانەکەیە: کە بۆی ڕێککەوت دینێکی هەبێ غەیری دینی جیرانەکەی خەتی جوداوازیی بە نێواندا دێت بەڵام لەگەڵ هاودینی دوورەوڵات پێکەوە نان دەخۆن، ژن لێکتر دێنن، وێکڕا شوێنێکی گەردەنی کوشتی دەکەنە جێ دەمی چەقۆ و تەبەر. دەمدیت کۆیی لە بەخێرهێنانی دیان و جوو مەرحەبایان بەکار دەهێنا نەک سەلام تومەز ئەمیان بۆ موسوڵمانانە چونکە لە عەقیدەی ئیسلام وڵاتی غەیرەدین پێی دەگوترێ «دار الحرب» هی موسوڵمانانیش «دار السلم - السلام».

لەم تێبینییەی سەربە جوداوازیی دین تێوەرێخێکی کورت هەیە ڕاگەیێن و ڕوونکەرەوەیە لە بارەی زاتیبوونی مرۆوە: جۆرج بۆش، کۆنە سەرۆک کۆماری U.S.A لە یاداشتەکەی خۆیدا، کە لەو مانگ و نیوەی دوایی کەوتە لام، دەگێڕێتەوە کە لە دەمی سەردانی لە ماو و بە پێشنیازی ماو خۆی بەناو ئەو ژێرزەمینە تێک هەڵکێشانەی بنشاری پەکیندا گەڕا سەرسوڕکەی گەییشتێ. ماو پێی گوتوە: ئەمە لە ترسی بۆمبای ئەتۆمی ڕووسەکانە کە لە ناکاودا بەکاربهێنرێت، گلەییشی کردبوو کە چۆن U.S.A لەگەڵ چین ڕێک ناکەوێ بەرانبەر سۆڤیەت کە دوژمنی هەردوو لایە.

ئنجا ئەگەر فەرمانی «یەکیەتیی پرۆلیتاریای جیهان» ڕاست بایە دەبوو حاڵەکە بەرەواژ بێت و لە ترسی بۆمبای ئەمەریکا ژێر ساز درابێت. تومەز مرۆ خۆی خاوەنی بەرژەوەند و خالقی سوود و زەرەر و بڕیاری چەپخواز و ڕاستخوازە، ڕەنگە لەو خاوەنایەتییەش هەڵەی کوشندە بکات وەک کە ستالین بە ڕێککەوتنی لەگەڵ هیتلەر خەریک بوو ئاداری ڕووسیا لەسەر پاداری نەهێڵێ ئەگەر بەریتانیا مەرحەبای هیتلەری هەڵگرتبایەوە دوای کەوتنی فرانسە و بەر لە هێرشی ئەڵمانیا بۆ سەر سۆڤیەت... بە عادەت کە دوو دەوڵەت یان دوو شەریکەی بۆرجوازی دەکەونە کێبڕکێی بازاڕی ئاڵوگۆڕ بیریاری بەرەی چەپ ئەو تێکئاڵقانە بە ژەهری تەماعی خۆپەرستیی ڕژێمەکە دادەنێت، ئەمەش بیروڕایەکە بە دوو مەرج دەشێ حیسابی بۆ بکرێت:

1. دوو لایەنی شیووعی بە برایانە بەردەوام بن و تێک نەئاڵقێن [کە دەزانین ڕووسیای سۆڤیەت بۆ ماوەی چل ساڵ دوو لینگانە و سێ لینگانەی بەسەر هەموو ئەورووپای ڕۆژهەڵاتدا هێنا بوو: دیتمان چی کرد بە هەنگاریا و دواتریش بە چیکۆسلۆڤاکیا - ڕۆژەک لە ڕۆژانیش دوو دەوڵەتە زلەکەی شیووعی، ڕووسیا و چین، دۆستی ڕاستەقینە نەبوون].
2. قسەیێکی ڕۆشنبیرانەش بکات لە بارەی ئەو هەموو ئازادییە [مەیلەو لەڕادەبەدەر]ی جیهانی ناوزڕاوی بۆرجوازی تا ئەوەی، بە ڕاستی، حکومەتەکان تەنگەتاون بە دەست خەڵکی ناڕازییەوە...

کۆمەڵەهای ئەفەریقا و ئاسیا دەڕژێنە وڵاتی ناسۆشیالیست، بە هەموو عەیبوعاری هەزاران ساڵەیانەوە، بەشێکیشیان بۆ وێرانکاریی کرێگرتەیی ئەو حەجە ناموبارەکە دەکەن ئنجا خەڵکەکە لە حکومەتەکانیان بەدەنگ دێن لەسەر مەنع کردن وەیا دوورخستنەوەی پەنابەران.

ساڵی1979 لە چوون و هاتنەوەمدا بۆ لەندەن شەش[41] جاران بە تەیارەخانەیاندا ڕەت بووم، جانتاکەمیان نەکردەوە. لە لەندەن پرسییان چەندگیر دەبم گوتم یەک مانگ... دەرچوو شەش مانگیان بۆ نووسیووم... کە هاتمەوە بەغدا جانتایەکم کرایەوە، بەدەنگ هاتم بێگانە جانتام ناکاتەوە بۆ دەبێ لە ماڵی خۆم گومانم لێ بکرێ... جانتای دوەمیان خاڵەبەخش کرا. سەیر لەوەدا بوو کە من لە تەیارەخانەی هیثرۆ، لە لەندەن، لێیان پرسیم ئایە جانتاکەم هیچی وا تێدایە گومرگ بکرێت، گوتم نا! دواتر مەعلووم بوو کە من تۆچا و شتی تریشم پێیە هی گومرگی. ئەمما نەمدەزانی قاچاغن...

دەفتەرێک بگرێت بۆ حاڵوباری خەڵقی چل پەنجا ساڵی ڕابردووی جیهانی سێیەم و بیستەم بەتایبەتی هی خەباتگێران و، تایبەتتر هی شیووعییان، حیسابت لێ تێکدەچێت ئەو خەباتگێرانە چەند جاران پێستی سیاسییان داڕنیوە و تاکتیک و ستراتێجییان گۆڕیوە و ڕووی تفولەعنەتیان وەرگێراوە... چەندیان کۆڵی داو سڕ بوو تا ئەوەی نەدەپەرژانە کەسابەتیش... مولحید بوو بە نوێژکەر و وازی لە سیاسەت هێنا کەچی دەوروبەری کوردەواری بە هۆی بەرهەمیشەوە وەک خۆی مایەوە... بگرە لە شیووعیەت تا پارتەکانی سەربە قەومایەتی تا بزووتنەوەی ئیسلامی تا وردەپارتیی سەربە ئیشتراکییەت لەو کوردستانە بەرتەسکەی عێراق کە ژمارەی دانیشتووانی سێیەکی شارێک لە شارەکانی دنیا نەدەبوو داراییشی هی کولەمەرگی بوو، نە سەرمایەداری تێدا ڕسکابوو نە هیچ زانست و تەکنیک و پیشەسازی و هونەری هەبوو، تەنها لە ڕێی گوێبیستبوون و خوێندنەوەی هەندێ کتێب و نەشرەی نهێنی لەسەر ساجی عەلی و دەشتی کاکی بە کاکی تەراتێنی نەرەهۆڕ و توندوتیژیی دەکرد...

دەبێ بڵێم بزووتنەوەی سەربە قەومایەتیی کوردی ڕەنگی کۆنی هەبوو بەڵام واقیعێکی لێڵی لە سیاسەت دەکوتایەوە. وەک بڵێی جموجووڵی نەتەوە پێشکەوتوەکانی کۆتایی صەدەی نۆزدەم و سەرەتاکانی صەدەی بیستەم لەو مەیدانە

[41]- دابەزین لە فرانکفۆرت، فڕین لە کۆلن، دابەزین و فڕین لە پاریس، دابەزین و فڕین لە لەندەن.

پانوپۆڕەی زانست و هونەر و داهێنان و دارایی بەهاتوباتیان کە لە بەر گوێچکەی خەواڵووی کوردی ستەمدیدە دەزرینگایەوە حەز و تامەزرۆیی و تەمای بەخەبەر دەهێنا بۆ ئازادی بێ ئەوەی سەقافەتێکی زانستی و سیاسیی هەبێ تێی بگەیەنێ وەدەستهێنانی هێوا و ئاوات بەندە بە چەندین مەرجی ئەوتۆ کە هیچیان لە پزدانی مێژوو و حازری کورددا نەڕسکاوە.

تەنکی و سەرەتایی ڕۆشنبیریی نوێ لای ڕابەران و ئاپۆرەی خوێندەواری تازەپێگەییشتوو [کە زوربەیان قوتابی قوتابخانەی پلەی هەرە نزم بوون] کەللەی سەریان بە دوو پیتی تازە چاپدراوی دەرسەکانی قوتابخانە و چەند دێڕێکی ڕۆژنامەی ئێرەو ئەوێ وەها دەئاخنێ کە بە دەم نەشیدی گەرموگوڕەوە دنیایەکی خەیاڵکردی سازدەدا دڵی گەشبینانەی کوردپەروەری شلکی دەخستە فرکەوە و بەرەو بێباکی و لە خۆ سەهوو چوونیەوە دەبرد.

کەمزانی وەها لە کەمزان دەکات کە لە خۆی بایی بێت و کاری ئەستەم بە ئاسان دابنێت. چی لێرەدا لە حاڵوباری کوردی بەر لە 50-60 ساڵی دەڵێم [ئێستاش حاڵەتەکە لەچاو پێشکەوتنی ڕۆژگار هەر بەردەوامە] لە کۆمەڵەی «اتحاد وترقي»ی تورکی سەرەتای ئەم صەدەیەش ئاشکرا بوو هەرچەندە ڕابەری حکومەتێکی زەبەلاحیش بوون... شیعەی جنووبی عێراقیش هەرایەکیان نایەوە لە 1920 کۆتایەکەی بریتی بوو لە پێک هاتنی حکومەتێکی سوننی کە هەرگیز لە مجێزی شیعە خۆش نییە.

نیمچە خوێندوو کە ناتوانێ ڕاستیی شتان ساغ بکاتەوە [نایەتە بیریشیەوە کە بەرنامەی تەتەڵە کردنی درۆ و ڕاستیی خەبەر و ڕووداوان هەیە] پەراوێزی باوەڕهێنانی لێک دەکێشێتەوە. بێ پەروا هەڕەمەی خەیاڵ تێکەڵ بە ڕاست و درۆ دەسەلمێنێ و بە بەڵگەی زێدە زانایی خۆشی لە قەڵەم دەدات. تاڕادەیەک نەزان و منداڵ لەم ڕوانگەوە لێکتر نزیکن. زانای لایەنگیریش بۆی بلوێت شەکر و بادام بۆ خۆی دادەبڕێت و کەپک و بنبێژینگیش بە ناحەزەکەی دەبەخشێت.

من یان یەکێکی تر کە دێین بەبەر شیتەڵ کردنی دەوروبەرەوە دەنیشین و شتێکی تێدا دەڵێین تۆ پێت خۆش دەبێ یان نیگەران. لە فەرزی هیچ لایەنگیریمان لە

بیروڕای خۆماندا نەکرد و بەپێی توانا هەوڵمان دا نیشانە پێکاوبین دیسانەوە دەشێ هێندەی بەعزێک لایەنگیر دوور کەوینەوە لە حەقیقەت ئەویش لەبەر زۆر هۆی ئاشکرا:

1. ناتەواویی مەعلوومات.
2. ناتەواویی لێکدانەوە.
3. کۆمە کردن لە درکاندنی هەندێ ڕووداو وەیا بیروباوەڕ.
4. دەسخەڵەتاندنی کەسان یان سەرچاوەی هەڵە.
5. گلدانەوەی ڕاستیی ئەوتۆ، چ لە خەبەر چ لە ڕووداو و هەڵوەست زەرەر بەو شتە دەگەیەنێ کە بۆی دەخەبتین.
6. ڕەنگە کاریگەری سروشتی ئەوتۆ هەبێت بینینمان لێڵ بکات بێ ئەوەی هەستی پێ بکەین.

من کە ئەمانە دەڵێم و تاڕادەیەک نووسینی خۆمی تێدا گوماناوی دەکەم، لە خوێنەر ڕادەبینم پێم باوەڕ بکات کە ئەم تێبینییانەم لەوپەڕی دەروونپاکییەوە دێت: ئەوانەی خۆیان بە مریشتە دادەنێن لەلایەن دەستخاوێنییەوە و داوای نیمچە پێغەمبەرایەتی دەکەن بۆ زێدە زانین، بایی داوا زلەکەیان، دوورن لە نیازی بێلایەن، چ ئەوانەی خاوەن دەسەڵات دەم لە بیروڕا و فکر و فەلسەفە دەدەن و چ ئەوانەی کاوێژکەرەوەی فەرموودەکانی ئەوانن و مووچەیان لێ وەردەگرن هەموو ساختەکارییەکەیان یەکسەر دەبێتەوە پارە و پوول و زێدە دەسەڵات چ جایی ئەوەی ئەگەر بە ڕاستگۆیی خۆیان ڕیسوا بکەن، ڕەنگە، سەریشیان تێچێت.

هەتا ئێرە مەسەلەکە تاڕادەیەک مەنتیقی تێدایە کە پارێزی کردن لە ساختە دەسەڵات و پارەی پێوە بێت، ئەمما دەروێشە ڕووتوڕەجاڵەکەی بە خۆڕایی جانفیدایی دەکات لەو درۆ و دەلەسەیەی کە دەکێشێتەوە بۆ زێدە کەمحورمەتیی خۆی و حیزبەکەی بۆچی هێندەی بوتپەرست هێر و گێل بێت؟ لەم جۆرە حاڵەتەدا ئەندامی حیزبێکی باوەڕهێناو بە «ماددە» و هیچی تر، دەستبەتاڵترە لە سۆفی و

دەروێشی تەریقەت چونکە هەرنەبێ جەنابی شێخ سەروکارێکی لەگەڵ قیامەت و بەهەشت و دۆزەخ هەیە کە مام سۆفی دڵی خۆی پێ خۆش بکات... هەڵبەت رابەرپەرستی بیری ماددی کە گێلگێل ورێتەکانی رابەر دەپەرستێت لەوە دەرچوە، دە جارانیش دەرچووە، وەصفی ماددییەت و عیلمانییەت و. تەنانەت، نەزانیشی وەپاڵ بدرێت چونکە زاتی وەها گومڕا و خۆ گومکردوو ناگاتە پایەی «نەزانی» هەتا دەچێتەوە ریزی نەخوێندوەکی عادەتی کە گیانی کوێر و کاول نەبوە: نەزانی عادەتی دەشێ بە رێنموونی دەرچێت لەو نەزانییە بەڵام شاگردی رابەری مادییەتی وەرگەڕاو و تەقلەڵێداو و ئاوەژوو بوویەوە، خاک بەسەری، تا دەمرێ (مەگەر چۆنها) بەندی کەلەپچەی ئەو گرێکوێرەیە دەبێ کە لە تەقلە و بەرەواژبوونی ماددییەتەکە پەیدا دەبێ. لە نموونەدا دەشێ بڵێم ئەو تەرزە شاگردەی ماددییەت، تارادەیەک، لە تەشبیهدا وەکوو سۆفییەکە مێشک و دەروونی ئاخنابێت بە باوەڕی پێچەڵپێچ لەچاو نەزانێکی عادەتی سادە و بێ گرێکوێرە.

دنیایەکی بێسەروبنمان لە پێش چاوە بۆ تاقی کردنەوەی کاریگەرایەتیی مرۆ لەتەک دەوروبەر و هۆی بەرهەم و شەڕی چینایەتی و قەومایەتی و دینایەتی و بێدینایەتی نەک لە نوختە نیگای پاڵەوانەتی و هێزی رۆستەمانە و زولفەقاری ئیمامی عەلییەوە بەڵکوو لە ڕووی «زاتیبوون»ی مرۆڤەوە کە لە دید و دەروون و هەست و خوولیاشەوە، چ ئامانجی پێکابێت و چ بە هەڵەدا چووبێت [بەزۆریش هەڵە دەکات] قاڵب و شێوە و ناوەڕۆکیشی بۆ جیهانی ماددی و مەعنەویی دادەڕێژێت یاخود وەستا بۆی دادەڕێژێت: لە نوختەیەکی هەرەهەرە ناچیزەوە مرۆ تاقی دەکەینەوە بێ ئەوەی خۆمانی تێکەڵ بکەین بەڵکوو دەوری کامیرای تێدا دەبینین.

داماننا دینارێک کەوتە بەرچاوی «مرۆ» لە جێگەیەک کەسی دوەمی تێدا نەبێ. سۆفییەک دیتی و هووی کێشا و بردی بۆ بازاڕ بانگی لێ بدەن... سەرسەرییەک دۆزییەوە و ڕای کرد بۆ قومارخانە... پیاوێکی ژیری ئاسایی دینارەکەی برد بۆ لای مەلا یان قازی... شێتێک کردی بە ئاغزە جگەرە... هەژارێکی عادەتی بە مفتی زانی... شەهوانییەک کردی بە مزەی کەیف... منداڵ، نەفام، نەیزانی چی لێ بکات فێڵبازێک لە دەستیانی دەرهێنا... ئافرەتێک مریشکی پێ کڕی هێلکەی بۆ بکات... لاتەریکێک لێی سەڵمێوە و ئاگرسوورە لە خۆم دوورەی کردە پەند...

تۆ لەلای خۆتەوە خەیاڵگێڕی بکە لە حاڵەتی ئەوتۆیی کە ڕۆژانە دووچاری خەڵک دەبێت: بابڵێین نووسراوێکی گرنگی سیاسی وەیا بایەخداری سەربە کۆمەڵایەتی و حاڵوباری هەستیار [وەک نامەی دڵداری لە کچێکی دەوڵەمەندەوە بۆ هەر کەسێک بێت] کەوتە دەست مرۆی ئابڕووپارێز، مرۆی ئابڕووتکێن، مرۆی لە خوا ترساو، مرۆی تەماعکار، مرۆی شەهوانی، مرۆی دوژمن،... دۆست... بەهێز، بێهێز، مرۆی سیاسیی ناحەز... خولاسە چەندی بەبیرتدا دێت ئیحتیمالی هەمەچەشنە بخە بەر دەست و چاوی دەیەها و سەدەها مرۆی عادەتی کووچە و بازاڕ و قۆناغ و مزگەوت و دایرەی حکومەت و... منداڵ و جحێڵ و پیر و نێر و مێ... لەخۆت بکە بە مەرج کە بتوانیت ئەژماری ئەو ئیحتیمالانە بکەیت دەسا نە بە تۆ دەکرێت و نە بە کۆمەڵێک پسپۆڕ و لێزان. هەر لەوە تێفکرە کە «تاک» لە ساواییەوە تا دەگاتە پیری چەند جاران مجێز و تەبیات و بیروڕای دەگۆڕێت، ئنجا ئیحتیمالێک دانێ بۆ دووچاربوونی «مرۆ» بە کەسی لە خشتەبەر و جادووگەر و ئەفسووناوی کە هەڵیدەگێرێتەوە دژی هەموو ئەو شتانەی دڵی بۆی دەچوو... چەندین جحێڵی قوتابخانەی سانەویم دیتوە کەوتۆتە سەر باری دڕدۆنگی لەگەڵ باوکی هەر چونکە ڕەفتارێکی لەگەڵ ڕابەری حیزبەکەی تەوازوعکار نەبوە وەیا ئایەتێکی ئینجیلی ستالین شانی باوکەکەی گرتۆتەوە...

ڕەنگە بفەرموویت ئەم جۆرە تێبینییانەی بێبایەخ ناچنە تەرازووی هەڵسەنگاندنی سوودی گشتی و گۆڕانی تەئریخی و چارەنووسی ئادەمیزاد. منیش عەرزت دەکەم قسەمان لەسەر زاتیبوون و مەوزووعیبوونی ئادەمیزاد دەخولایەوە و من تێیدا لایەنگیری «زاتی» بووم تەنانەت مەوزووعیبوونیشی وەک تەرمۆمەتر نییە بێئیرادە هەڵکشێت و داکشێت. دەبێ کاریگەرێکی لاوەکی دەرەوەی دەروون و ئیرادە مرۆکە سڕ و بێهەست بکات هەتا ببێتە برای تەرمۆمەتر... مرۆی نەخوێندووش کە پڕی مێشکی مێردەزمەیە بە ئاسانی واز لە کپ کردنی جریوەجریویان ناهێنێ... تا ئەم دەمەش لادێی، بەزۆری هەرە زۆر، باوەڕی بە سوورانەوەی زەوی نییە هەرچەند ساڵەهایە لە دێیەکەی، مامۆستای دەرسبێژ ئەم ڕاستییە دەڵێتەوە، تەلەڤیزیۆنیش بێدەرێغە بەلام نەقشی هەڵکەندراو لە مەڕمەڕی مێشک و دەروونی مرۆ تەوش و تراشی دەوێ بۆ کوێر کردنەوەی...

بگەڕێینەوە بۆ گۆڕانی مێژوویی و چارەنووسی ئادەمی: لە پێشەوە دەبێ بڵێم بابای نەخوێندوو یاخود دەروون داگیرکراو بە ئەفسانە، بە ئایدیۆلۆجیا، بە پەندی ساحیرانە کە من دەیخەمە بەر تاقیکردنەوەی سادە و سافیلکە و بەزۆریش لە ئەزموون دەرناچێت، هەر خۆیەتی وەک گەنمی باراش لە ئاشی مێژوو و چارەنووس گۆڕانی تەئریخی دەهاڕدرێت و دەبێتە ئارد... ئەو مرۆیە سافییلکەیە کە لەو بارانەی وەها بێبایەخ دەورێک دەبینێت بەپێی بێبایەخی خۆی هەر بەجارێ موفلیس دەبێت و بوونی دەسڕێتەوە و بە نەبوو دەبێت لە چەرخوفەلەکی ڕووداوی زەبەللاح و مێژوویی و سەربە چارەنووس.

تاکی کەمبایەخ لە ڕووداو و هەڵکەوتی بایەخداردا دەبێتە بەرخێکی ناو مەڕگەل کە بە ئیرادەی غەیری خۆی دەڕوات و دەخوات و دەشمرێت: لەم حاڵەتانەی وەها گرنگ، دالەنگانی بایەخی «مرۆ»ی تاک دەبێتە قانوون و هەتا نزیک تۆقەڵەی دەسەڵاتی حکومەتی هەموان دەگرێتەوە، تۆقەڵە خۆی تاکە کاریگەر دەبێت. لە خۆی بەرەژێر پێبەپێ بایەخی زیاد دەکات تا دەگاتە تاکی بازاڕ و سەربازی سپا کە بایەخ نامێنێ و ڕەنگە لە گوێزەگوێزدا بایەخی کەر و ئێستر پتر بێت...

جەماوەری بێدەسەڵاتان لە زوربەی هەر زۆری جیهانی سێیەمدا تەنها لە کەوتورەوتی ژیانی ڕۆژانەی ئالۆوێر و سرکەوکورکەی فلان هات و فیسار مرد، شووتی گرانە و پاقلە هەرزانە... بەرخەکەم پسکەی لێیە... ڕۆژەکەی گەرم کرد... مەلای نیوەڕۆ بانگی دا... و ئەو جۆرە چالاکییەی زمان و لەش کە لەگەڵ کەنەفتیی ڕێک دەکەوێت خاوەن ئیرادەن... دەسەڵاتداریش بە خەون و خەیاڵیدا نایەت شتێک هەیە پێی دەڵێن هۆی بەرهەم و سەرێشەی کاریگەربوونی مرۆ یان ماددە و بەندبوونی بەرەوپێشچوونی کۆمەڵایەتی بە بەرەوپێشچوونی چەکوچ و داس و خەڕەک و کۆمپیوتەر. تەنانەت دەسەڵاتداری وەک ستالین کە پێغەمبەرایەتیی ئەو فەلسەفەیەی دەگێڕا هۆی بەرهەم و پرۆلیتاریا و زانای زەڕڕە و سەرلەبەری مردوو و زیندووی سۆڤێتستانی. بەستبۆوە بە ئیرادەی خۆی: لە کوشتنی بوخارین و تۆخاچێڤسکی خۆی پتر لەسەر حەق دەزانی تا ئەوەی خاوەن دابەستەی قاورمە مافی سەربڕینی هەبێ، یان باوکی کچ پرسی پێ بکرێ لە مارە بڕینی کچەکەی...

لێرەدا دەبێ بڵێم برێژنێڤ کە میراتگری ستالین بوو پاتەوپات خۆی بە خاوەن حەق دەزانی لە هەموو ئەو کیژانەی بە دەوربییەوە بوون و جوانکیلە بوون [نەمبیستوە ستالین مێبازیی زۆرەملێی کردبێت] سەیریش لەوەدا نییە کە بیر بکەینەوە بە چ شانازی و درندەییەکەوە چیکۆسڤاکیای شێلا... پێشتریش مەجەرستان سەربڕابوو... ڕام کردنی کیژی جوان بە زەبر و زۆر، هەرچەند بەڵگەی بێشەرەفی زۆردارەکەیە، دیسانەوە ناگاتەوە سەدیەکی خەفە کردنی میللەتێک...

لێرەشدا لە جیاتی خوێنەری ڕەخنەگر دەڵێم ئەو جۆرە حیزەفیعلانە لە دەفتەری مێژووی میللەتان و چارەنووسیان جێی نابێتەوە و چاویشم لێی دەپۆشی ئەگەر:

1- کیژی زۆرلێکراوە و پیاوی تێنەخوێندرایەوە دەستێکی هەبایە لە چارەنووس و مێژوو، ئەوسا دەمانگوت کیژەکە خۆی ڕازی بوە پیاوەکەش بە ئارەزۆ دوورەپارێزی کردوە لە کاری بە گرێوگاڵ.

2- خەڵکەی پرسی پێ نەکراوە لە چارەنووس دوای مسۆگەر کردنی چارەنووسەکە، بووبایە خاوەن ڕەئی لە چەندوچۆنی بەڕێوەبردنی کاروباری کۆمەڵ. ئەمما بەر لەوەی من و تۆ بگەینە باوەڕێکی بنجی لەم وتووێژە ساردوسڕە، دەسەڵاتداری میللەتخەسێن چەند بە مسۆگەر کردنی هەرای چارەنووس خەریک بوە هێندەش خەریکی خەفە کردنی دەنگی ناڕەزامەندیی دوای مسۆگەر کردنەکە دەبێت.

ئەو چڵێسانەی شەهوەت و ورگ و بریقوباق و خۆسەپاندن دەیانخەریکێنێت خۆیان تەیار دەکەن بە هەرچی چەکی هێرش و دیفاع هەیە، چ ماددی و چ مەعنەوی، بۆ بەردەوامبوون لە بەهەشتی مەزنایەتیی بێ لێپرسینەوە. لە سەرەتاوە بە ناوی بەربەست کردنی فڕوفێڵی نیازبەد و دوژمن بە مرۆڤایەتی و سوودی هەژار و خنکاندنی ئازادیی گەلان هەرچی ئازادیی تەعبیر و ڕێکخستنی حیزب و جەمعییەت و ئەو جۆرە چالاکییانە زیندەبەگۆڕ دەکەن و دەمێنێتەوە تاکە حیزبی خاوەن حکومەت کە قەپێلکێکی بێ ناوەڕۆک و بێ دەسەڵات نیشانەی هەبوونیەتی تەنها دەتوانی خزمەتی فەرمانی کەهەنووتی باڵا بکات...

لێرەدا دەبێ بڵێین نەک دەوروبەر و هۆی بەرهەم و پەری و تاووس چ دەوریان نابێ لە لێخورینی ڕەورەوی کۆمەڵایەتی و مێژوو بەڵکوو مرۆڤەکەش، کە زۆرینەی گەلە، وەک قورە چەورە بە دەستی سەرۆکەوە هەڵسوور و داسووری ناچاری دەکات واتە ئیرادەی «گەل» لە چارەنووس و شەر و ئاشتی و بەرنامەی ژیان و مردن و... و... هتد بە وەکالەت دراوەتە سەرۆک ئەمما چۆن وەکالەتێک! پێی ناوێ بڵێم، لەم دێڕانەی دوایی کە دیتمان مرۆکە خۆی بێ ئیرادەیە ئیتر لزوم نییە بڵێم پێمەرە و داس و چەکوچ و گارەش هەن یان نین، خۆ لە ڕاستیدا ئەم ئامێر و زیندەوەرانە لە هیچ حاڵێکدا دەوری سەربەخۆیان نییە، هەمووی هەر ماڵ و پێکهێنەری ئارەزۆی مرۆن وێرای ئەوەی کە دروستکراوی دەستی مرۆ خۆیەتی! یان کەویکراوی خۆیەتی!

شەوێکی زستانەی نێوان 1940-1941، لە مەجلیسی باوکم باسی هیتلەر هات، [باوکم خۆشی نەدەویست] و قسە گەیشتە دەوری «زەعیم» لە حاڵوباری میللەت. من بە تەقیەوە گوتم: میللەت ناتوانێ ئیعتیماد لەسەر زەعیم بکات... قسەکەم تەواو نەکرد باوکم گوتی: ڕۆڵە زەعیمێک بە کردەوە چاکەی میللەتی بوێت چۆن جێی ئیعتیماد نابێت... من شەرمم کرد بگەڕێمەوە بۆ تەواو کردنی مەبەستم لەوەی گوتم. من نیازم بوو بڵێم: میللەت ناتوانێ ئیعتیماد لەسەر هەبوونی زەعیم بکات... ئەو خەڵکە بێ زەعیم خەریکی گوزەرانە، ئەگەر ڕاوەستێ هەتا زەعیمێک پەیدا دەبێ پێستی دەچێتە دەباخانە... کە بە دووری سەیری ئەو وتووێژە قرتاوەی ئەوسا بکەیت دەبینیت چی باوکم گوتی وەک بەدیهییە وایە، چی منیش بەتەمابووم بیڵێم هەر ڕاستە بەڵام هەر یەکە بە بوارێکدا و لە جغزی ئەو نیازەی بنەمای بیروڕایەکە بوو...

بێگومان خۆشیی هەرە گەورە و گەش بۆ گەل ئەوەیە کە دەسەڵاتی هەیە سەروو خەریکی کامەرانی و هێمنی و ئازادیی گەل بێت. کە دەبێ بزانین ئەو ئامانجانە لە ڕژێمی دیمۆکرات نەبێ چنگ ناکەوێت. بەتایبەتی دروشمی ئازادی کە چرای نیشتمانە و دۆزەخی دیکتاتۆرە. دیمۆکراسیش، بە داخەوە سەد جاران بە داخەوە، نەقشێکە بە پەیکەری گەلی تێگەیشتوو و پێگەیشتووەوە... تا بڵێی بە فیز و نازە و تا بشڵێی ناسک و تەنک و «خێراشکست» ە. ئێمە بڵێین و نەڵێین، تا ئەم سەردەمە

کۆمەڵگەی ئادەمیزاد شکڵی هەرەم Pyramid ی پێوەیە لەگەڵ تێبینی ئەو ڕاستییە کە وڵاتی پێشکەوتوو هەرەمەکەی ناتەواوە بەو مەعنایە کە سەرووی بریتییە لە ڕووپێوێکی مناسب نەک نووکی دەرزی، بەدەم ڕۆژگاریشەوە ڕووپێوەکە پانوپۆڕتر دەبێت.

تا ئەو ڕۆژەی ئەنارکیزم Anarchismی دوای پلەی کۆمیونیزم، بە ناچاری و بە پێی بەرژەوەندی گشتی [و بە ڕواڵەتی فراژووتن. نمو، تطور] هەرەمی کۆمەڵایەتی بەردەوام دەبێ. لە ئیمکانیشدا نییە پێشبینی بکرێ لە تەمەنی دوارۆژی هەرەمەکە. ئایا صەد ساڵە، هەزاد ساڵە؟ بەڵام هەموو هێمایەکی بەرەوپێشچوون ڕادەگەیەنێ کە ئەنجامی کۆمەڵگەی ئادەمیزاد «یەکسانی» دەبێ... چاوسوورکەرەوە نامێنێ... من کە ئەم قسەی وا بنبزێوکە دەکەم لەبیرمە خۆم و خۆت چەند پلە لە بەرەژێری کەمەری هەرەمەکەداین، هەر لەوێشدا بەسەر دەچین... هەتا من لاپەڕەیەکی هەژارانە ڕەشنووس دەکەم هەزاران بەدبەختی نەومیدی ناکام هەڵدەوەرێن، لە برسان دەمرن... بە پەتەوە دەکرێن... زمانیان لە پشتەسەر دەردەکێشرێت و دەشکرێن بە چرای شۆرەتی جەللادەکانیان. هۆی بەرهەم و دەوروبەر و «زێدەنرخ» و نازانم چیش لە قەفەسی دەسکردی خاوەن خوولیایان جریوەجریویان دێت، ئەمما لە ناو قەفەس!! ئێمە لە سەردەمێکداین بە هۆی تێکبەستنی ئەمسەرەوسەری جیهان لە ڕێی ئەو ئامێرە زێدە چالاک و دروستانەوە کە زانست پەیتا پەیتا دەیانخاتە بازاڕی کڕین و فرۆشتن، بگرە لە ئەسکیمۆوە تا دەگاتە ئەسڵە دانیشتوەکانی ئوستورالیا، بە جیهانی یەکەم و دوەم و سێیەمیەوە کارنەڤاڵێکی هەرەمە دروست بوە. زۆر جاران، ئوستادی ئاتۆم و مەیموونپەرست تێیدا پێکەوە دانس دەکەن... ژنە ملیۆنێری نیویۆرک لێ ئەستوورێکی گەمژەڵ دەپەرستێت... تەیارە بە حەواوە دەفڕێت و سێبەری بە سەر پشتی کەر و ئێستری ئێلە کۆچەرەکاندا دەکشێت: لەم دەمەدا کە وڕێنەی تادار قەڵەمم دەبزێوێت، نیوەخوێندوو نەزەرییەی داروین دەکاتە بەڵگەی کەرامەتی مەرقەدی چاک و پیران... وا زەبانییەی دۆزەخی گومڕایی لە پێناو نووری قودسییەتی «ناموسپارێزی» ژن و منداڵ و پیر هەلابەهەلا دەکەن... لە نزیک وێنەی مەسیح

بۆمبای «پاککەرەوەی گوناهان» لە ناوەڕاستی نوێژی یەکشەمۆ دەتەقێنن... خواپەرست پارە لە ئەهریمەن وەردەگرێت بۆ لەناو بردنی ناحەزی بەهەشت...

ئەم هەرەمەیە بە هەموو لایەنی ڕوون و تاریکییەوە... چاک و بەدییەوە... دروست و شکستیەوە مەخلووقی هێزێکە لە مرۆڤدا کە پێی دەڵێن «هۆش» [هەندێ هێزی دەروونیی ون هەیە جارێ نەگەیشتۆتە ڕادەی تاقیکردنەوەی ئەزمووگە- وەک من بزانم- لەوانەیە دەستێکی هەبێ لە بەشداری کردنی ئەو مەخلووقە] غەریزەی سادە بەبەریەوە نییە لە یەک خێزانی پێنج کەسی پەنجا مجێزی لێکتر جودا بڕەخسێنێ، تۆ بڵێ صەد مجێز، وەک کە هەر یەکە حەز لە خواردنێکی جودا و پۆشاکێکی جودا و گۆرانییەکی جودا و سیاسەتێکی جودا و... جودا... و جودا بکات. غاڵب جاریش ئەو جوداییەی مجێزی دەکێشێتەوە بۆ ناکۆکی و لێک سریواندن تا سەر بە شەڕە چەپەڵۆکەوە دەگەیەنێ، ڕەنگە بەولاوەتریشەوە بچێت. من دیتوومە لەسەر هێلکەورۆن و هێلکە بە قاورمە خوشک و برا لێک تۆراون: لێرەدا زاتییەتی مرۆ، هەرچەند لە کاری خوێڕیلەش بێ، بە زیادەوە دەردەکەوێت کە دەبینین لە دەوروبەری یەک خێزان، دوور لە بەرژەوەند و تەماع، برا و خوشک لەسەر هیچە زویر دەبن، ڕەنگە لەسەر تەماع پێک بێن...

دەشێ لەیەک خێزاندا کیژ لایەنی پارتی بگرێت و براکەی سەربە ئیسلامەتی بێت و برای دیکەی سەربە یەکیەتی بێت و باوکەکە سۆفی و دایک دەروێش بێت... ئەم دابەشبوونە بە هیچ هۆیەکی «ماددی» تەفسیر ناکرێت... دەوروبەر ئەگەر لە خۆوە کاریگەر بایە [کە خۆیشی مەخلووقی مرۆیە] دەبوو هەموو ئەوانەی ئاو لە سەرچاوەیەوە دەخۆنەوە یەک مەشرەب و یەک نەوا بوونایە... نەختێک بەرەژووتر بچین بۆ مەڵبەندی قودسییەتی دنیایی و ئایینی: ڕۆبسپییێر یەک لە دوو سێ خواکەی شۆڕشی فرەنسە حەزی لە ئافرەتێک کرد، بۆی ڕام نەبوو، تۆمەتێکی هەکەزایی بۆ هەڵبەست و ملی بە گیۆتین پەڕاند... بەر لە دەیان ساڵ بەیتێکی «ألياس أبوشبكة» م کەوتە بەر چاو لە دیوانەکەی بە سەرناوی «أفاعي الفردوس» دەڵێ:

مغناك ملتهب وكأسك مترعة<br>
فأسقي أباك الخمر وأضطجعي معه

[شوێنی کەیفت هەڵایساوە و پیاڵەت پڕە
سا شەراب نۆشی باوکت بکە و لەگەڵیدا بخەوە]

من کە ئەمەم خوێندەوە شاعیرەکەم لەبەرچاو بێزا... دوای چەندین دەیان ساڵ زانیم ئەمە ڕیوایەتی تەوراتە لە بەرەی لووت پێغەمبەر و دوو کچەکەی کە پاش سەرەوبنبوونی سەدووم چوونە چۆڵی و کیژەکان مەیلی نێریان بوو... لە دوو شەودا دوو کچەکە، یەک لە دوای یەک، باوکی سەرخۆش کرد و لەگەڵیدا نووست. ئەم حیکایەتە دە جاران ڕووی خالیدی وەلید سپی دەکاتەوە کە دوای کوشتنی «مالک بن نويرة» ژنە نازدارەکەی لە خۆی مارە کرد، تاڕادەیەک پاکانەش بۆ فیرعەونی میسر دەکات کە کچی خۆی، زادەی خوشکی خۆی، مارە دەکرد بە نیازی خوێنپاکییەوە وەچەیەکی لەو مارە کردنە بەرهەم بێت...

حیکایەتی لووت پێغەمبەر قیلەشەرعی تێدایە بایی پاکانەی لووت بکات، گۆیا لە حاڵەتی سەرخۆشیدا نەیزانیوە چی دەکات... دەسا بە لووت پێغەمبەر، بەبێ ئاگا لەخۆبوون سمینی دوو کچ لە دوو شەودا موستەحیلە... بۆ شەویکیش هەر نامومکینە، پاکانەکەش هەر بۆ ئەو کەسانەیە حیکایەتەکەیان هەڵبەستوە و ئەو کەسانەش کە کاوێژی دەکەنەوە بێ ئەوەی هۆشیان بەخەبەر بێت لەو فاکوفیکە. تۆ سەیری ئەو نیگالیێلییە بکە کە وەستای حیکایەتساز بۆ ئیسپاتی قودرەتی خوا هێنای پێغەمبەرێکی بێئاگای لە دوو کچی خۆی بە زاوا کرد کە ئەمە بەلای ئەفسانەپەرستەوە ئەوپەڕی قودرەت و حیکمەتی خودای تێدایە... بەڵام وا پێدەچێ من و تۆ لە حیسابەکە بە هەڵەدا چووین بە بەڵگەی ئەوەی کە حیکایەتەکە بەردەوامە لە قودسییەتدا...

بێگومان ئەگەر حیکایەتەکە لەلایەن ئوستادێکی زانا و ئەدیب خراپایە قاڵبێکی ئەوتۆ کە بەر لە هەزاران ساڵ بە پێی مێژوو بیقیێڵ [ئەو قاڵبە] ڕەوا و ڕێزلێگیراو بوە چ تامێکی خۆشی لە مەلاشووی ئەفسانەپەرست نەدەگێڕا و هەر بە حوکمی شەریعەتی ڕۆژگاری خۆی بە کارێکی نامەردانەی دادەنا و ڕیسوای دەکرد!

قودسییەتی ڕێزگیراو لەلایەن ئەفسانەبەرستەوە دەبێ بە کلک و گوێ و فۆچ و «پێ لە جێی سەر» و «پشت لە بن هەنگر» بێت دەنا کەڵکی پێوە نامێنێ و بڕی بنیادەم ناشکێنێ...

هەرچەند ئەم نموونەیەی خەریکم بە عەرزی خوێنەری ڕابگەیەنم ناگاتە حیکایەتی لووت پێغەمبەر، بەڵام هەر چونکە هی ئەم سەردەمانەیە نەک هی چەندین هەزار ساڵ لەمەوبەر دەلالەتی لێ وەردەگیرێ: کە ڕەشید عالی، لە ساڵی 1941، یەخەی ئینگلیزی گرت و شەڕی پێ فرۆشت خەڵکەکەی مەفتوون بە ئەڵمانیا و ئیزاعەی «یونس بەحری» بۆی هاتنە حاڵی جەزبە گرتن. بەڵام کە ناوی وەزیران خوێنرایەوە و لە نێوانیاندا «یونس سبعاوي» هەبوو، پیاوە کامڵەکانی موصل ساردبوونەوە و بە نارەزامەندییەوە گوتبویان: «کوڕی سەعباوی بۆتە وەزیر؟ کارەکە بوە قەشمەری!»[42] تومەز دەبێ پیاوی حزقەلی و دەوڵەمەند و ماقووڵ وەزیری هەرای وەها گەورە بێ! ئاخر جەنابی کامڵەکانی موصل، هەرایەکی کە بەزۆریی هەرە زۆر ڕەشوڕووت و ئەهلی کووچە و بازاڕ پێوەی جەزبەگرتوو بوون و پیاوی تێروتەسەل و خاوەن حەشەم و خەدەم لە مەندی و مەستووریی خۆیان بانادەنەوە سەر چەپڵەڕێزان و هەڵپەڕکێ، ئیتر بۆ دەبێ پێ داگرن لەسەر بەشینەوەی وەزارەت و وەزیفەی بەرز بۆ ئەوانەی پاڵیان لێ داوەتەوە و بەتەماش نین دڵۆپێک خوێنی خۆیان بەهەدەر بدەن، کەچی تەنها یونس سەبعاوی داوای لە ئەرکانی حکومەت کردبوو کە عێراق بەجێ نەهێڵن با تێشیدا بکوژرێن!

بچینەوە بۆ نموونەی باسکراوی لووت پێغەمبەر: کاکی خوێنەر! ئیزنە لە من و لە بەرد و داریش خەریک بیت بۆ تێکبەستنی هەر هاندەر و هۆیەکی بشێ خودا بیهێنێتە سەر ئەو کارە ڕەجاڵە و پێغەمبەری خۆی و کچەکانی شەرمەزار و عەیبدار بکات بە مەرجێک کردارەکە لە بنیادەم بوەشێتەوە نەک لە خوا خۆی، لەو هەوڵەشت ئازادیت پەنا بۆ هۆی بەرهەم و دەوروبەر و شەیتان و فرشتە و تەیرەعەبابیلە بەریت دەسا پێت ناکری زەڕڕەیەک قەناعەت بە خۆت و بە کەس پەیدا بکەیت

[42]- ئەو موصلیانە لە جیاتی سەبعاوی دەیانگوت سەعباوی. قسەکەشیان بە تورکی کردبوو تومەز پەروەردەی سەردەمی تورکەکان بوون.

چونکە ئەگەر لەوەدا قەناعەت هەبێ لزوم نامێنێ بە دین و بە غەیری دین و بە هۆش و بە ناهۆش: هەموو ئینسانێک لە ڕەوابوونی ئەو کارە گڵاوەوە دەتوانێت چی بەدە ئەوە بکات شەرتیش نییە ئیللا و بیللان دەبێ پێغەمبەر بێت...

برای خوێنەر! من سەری ڕێ بە هۆش و گۆشت ناگرم لە ڕێی ئەم نموونە ئاسمانییەوەوە هەتا لە دینت نارەزا بکەم خۆ کورد بەزۆری موسوڵمانە و ناچاری سەلماندنی حیکایەتەکە نییە: ئەوەی مەبەستە لێرەدا نزیکخستنەوەی کاریگەرە ڕاستینەکانی ماددی و مەعنەوی و [ئەگەر هەبێ] میتافیزیکە لە قەناعەتت... من بڵێم و نەڵێم سەلماندنی ئەم حیکایەتە ڕەجاڵە تەنها لە حاڵێکدا مومکین دەبێ کە هۆشی مرۆ پەککەوتە کرابێت وەک کە لە هەزاران ئەفسانەی ئەوتۆیی پەکی دەکەوێت. تۆ کە هاتیت عەقڵی خەڵقەکەت بۆ خۆت دزیەوە دڵنیابە لەوەدا کە هەرچی بفەرموویت لە وڕێنە و خورافات و حیکایەتی بێبنەما دەنیشێتە دەروونە وێرانەکەیان و شەڕیش بە هەموو حەقیقەتێک دەفرۆشن کە لەگەڵ مەنتیقی جانەوەر ڕێک نەکەوێت. نابێ لە بیریشت بچێ ئەم فاکوفیکە نەک هەر لە مەڵبەندی قودسییەتی ئایین کاریگەرە: بابای دینایی و سەربە ماددە و زانستیش کە دڵی دزرایەوە و بوو بە تووتی، هەمان ئەفسانەپەرستی گومڕای لێ دێتەوە وەک کە بەرەی چەپی کورد کوردایەتییان بە خیانەت دادەنا.

لەم دەمەدا کە من بۆ ڕوون کردنەوەی قەناعەتی خۆم چەپی کورد بە بەڵگە دادەنێم، لەو ڕوەوە کە حاڵوباری کوردەکە بۆ خوێنەر ئاشکرایە، چەندەها تاک و کۆمەڵ و حیزب و حکومەت، چ لە کردەوەی خۆی بێت و چ لە پێوەندیی خۆی بێ لەگەڵ غەیر، ئەو ڕێگایە دەگرێتە بەر کە ناشێ بیگرێ و ئەو ڕێگایە کوێر دەکاتەوە کە پێویستە تێیڕا بڕوات. ئنجا ئەگەر هەمووشم لێ نەسەلمێنێت [وەک کە دەوڵەتە زلەکان بە هەڵەکردوو حیساب بکەم] خۆ بەپێی تەجرەبەی خۆت، لە دەوروپشتی خۆت نموونە زۆرن لەو بابەتەی من هێمای بۆ دەکەم. ئا ئەو تەرزە ڕەفتار و کرداری چەوت و چویر و پشت لە بەرژەوەند بە هیچ هۆیەکی دەرەوەی نەفسی مرۆ ڕاڤە ناکرێت. نە دەوروبەر و نە هۆی بەرهەم و نە بەرژەوەند و نە پەندی بەر ئاگردانی زستانە و نە هیچ یاسایەکی مەیموونانەش ناتوانێ تێم بگەیەنێت کەڕەکرمانجێکی نەخوێندوو جارێکیان ببێتە شێخپەرست جارێکیشیان ببێتە

ستالینپەرست لە هەردوو حاڵەتیشدا دژی خۆی و دژی دین و دژی ژین و دژی هۆش و کەرامەتی ئینسانیش شەپڵتەخۆری دەکات بۆ خزمەتی جادووگەرە لە خشتەبەرەکەی.

دەبوو، بەپێی ڕواڵەتی حاڵ، جانەوەرێکی ئەلفوبێی ئاخاوتنی بەسەر زماندا تێپەڕێت و ئاگر و ئاو لێکتر جودا بکاتەوە و ئەوەندە عەقڵەی پەیدا کردبێت کە بزانێت ڕەفتارێکی لە ئادەمی عەیب بێ دەبێ لە پێغەمبەر و خواکەی بە دوور بێت [مەسەلەکەی کچانی لوت]. تومەز لێرەدا مەسەلە بریتییە لە ئاڵقەبەند کردنی هۆش و، بە دوا ئەوەدا، ئیرادەی مرۆ بە هەر فەندێکی مومکین بێت چ ئایینی و چ دنیایی، وەک کە ورچەوانە لە لووتی ورچ دەکەن و زنجیرێکی تێهەڵدەکێشن، لەگەڵ ڕام کردن، بە ئارەزۆی خۆیان هەڵی دەپەڕێنن... فەرقێکیش دەمێنێ لە نێوان ڕام کردنی ورچ و بنیادەم کە ورچەکە نانی خاوەنی دەخوات هەرچی مرۆ لە خشتەبراوەکەیە نان بە ڕابەری باوەڕپێکراو دەدات کە لە جێی ورچەوانەکەیە، لە دین بێ یا لە دونیا.

ئێمە دەزانین لە خشتە بردن و هەڵخەڵەتاندن دیاردەیەکی جیهانییە، دەشزانین فەندەکە بە فێڵبازیی ساختەچییەکە و بە سافیلکەیی ساختەلێکراوەکە جێبەجێ دەبێ... لەمەش زیاتر: وا هەیە ساختە لە مرۆی خاوێن و کاری چاک لە مرۆی بەدەوە بە خەڵک دەگات بێ ئەوەی هەست بە خۆیان بکەن. ساختەلێکراویش لەوانەیە زانا بێت یاخود نەزان بێت چونکە هەر ساختەیەک حاڵوباری خۆی هەیە ڕاستەحیسابان دەشێوێنێ... لە هەموو حاڵێکیشدا تەنها نەفسی مرۆ دەبێت ئالەتی ساختە کردن و ساختە لێکران، ئەگەرنا مومکین نییە مرۆی ساختەلێکراو مل کەچ بکات بۆ دز و دۆزن و باغەڵبڕ، مرۆی چاکیش بە ئانقەست خەڵک هەڵناخڵەتێنێ... خەباتگێڕی خۆ بەختکردوو هەر وا بە بادی هەوا مل لە کاری بەد نانێت ئەگەر بە چاکی نەزانێ وەک ئەوەی کە قبوڵ کردنی ساختەکە زەرەری کەمتر بێت لە نەسەلماندنی یان لە ناچارییەوە چاوپۆشی بکات.

لێرەدا پێویستە زەینی خوێنەر بادەمەوە بۆ لای ڕاستییەکی گرنگ کەوا بیری لێ نەکردبێتەوە. من کە لە سەر سەکۆی پەندیارییەوە ڕێنموونی دەکەم، تۆش بە ڕواڵەت گوێگری پەندی پەسەند دەبیت هەردوومان پێکەوە لە ئاپۆرەی خەڵک

سەروپنتێکی تۆزاوی یان دڵۆپەی گۆمێکین، لە ئەنجامی پشکنینەوە دەفتەرگرتنی چاکە و خراپەمان پشکی لای نەریتیمان [نایەتیمان] پنۆکاویترە لەوەی هەستی پێ دەکەین نەک هەر چونکە دەگوترێ مرۆ عەیبی خۆی نابینێت بەڵکوو لەبەر هۆی هەمەچەشنەی وەک:

1. سەرەدەری نەکردن لە نێوان چاکە و خراپەی باری حاڵەتێکی دژوار کەوا ڕەنگە کەسێکی لەلاوە سەیری حاڵەتەکە بکات تێی دەگات.
2. لێڵی مەعلوومات بەدەم دەرفەتنەبوونی هەلی لێکدانەوەی ژیر.
3. بێهێزیی لایەنی هەست و پێزانین.
4. خۆ دانە پاڵ پرۆژەی کەسێکی خۆشت دەوێت دژی کەسێکی لێی بەگەییت.
5. هەر هۆیەکی دیکە هەبێ کە خەڵک تێوە دەگلێنێ، خۆ ئێمەش فرشتە نین.

من بەش بە حاڵی خۆم دڵم نەیهێنا، لەوەتەی تێکەڵ بە خەباتی سیاسی بووم. بەرپرسیاری تێوەگلان و زەدەبوونی کەس ببم: گوێ نەدان بە ئاکامی بڕیاری سیاسی لەلایەن سەلامەتی و تێچوونی خەباتکەران دڵ و دەروونێکی گەرەکە لە مندا نییە. ئەم مجێزی دوورەپارێزیم لە کاری «غەیر تێوەگلێن» چەپارەی دام لە هەڵگرتنی «ئۆباڵ» ی بێچاران هەرچەند پێوە هەڵستانم بە فەرمانی سەرشانم، پتر لە جارێک، نزیکی مردنی خستوومەتەوە... بێگومان ڕێگایەکی گرتمە بەر لە هەموو ڕەفتار و کردار و نووسیار[43] و گفتارم کە هیچ ئەرکێکی نەخستۆتە سە شانی کەس، تاکە ڕێ بوو بەکەڵکم بێت و من تێدا بە کەڵکی خەڵک بێم. لەگەڵ ئەمەشدا ئەگەر هاتبایە هەموو خەلقوڵڵا وەکوو منیان بکردایە بەتاڵایی گەلێک چالاکی و کردە و بردەی پێویست دەمایەوە بە خەسارەت.

کە گوتم «بە کەڵکی خەڵکیش بێم» ئاگام لە خۆمە ئەو کەڵکە چەند ناکەڵکە لەلای هەموو ئەوانەی لەگەڵمدا هاوباوەڕ نین هەرچەند لە تێکڕای جوداوازیی بیروڕام لە هی ئەوان نەمدیت پێویستم هەبێ بە هەڵگرتنەوەی هیچ یەکێک لەو بۆچوونانەیان کە

[43]- نووسیار وەک بڕیار، زانیار، پرسیار ناوی واتایە Abstract Noun بە واتای «كتابة» دێت نەک «كاتب».

ناجۆرە لەگەڵ هی من ئەگەر نەڵێم ئەوان لەسەریان بوو ئەو ڕایانەم کە بەڕاست دەرچوون وەک کە لە سەرەتای 1950 بە دوو حیزبی شیووعی و پارتیم ڕاگەیاند کە ستالین تاوانبارە و ڕۆژێک دێت کۆمیونیزم تاوانباری دەکات... قەبرەکەشی دەرهێنرا لەلایەن حیزبەکەوە کەچی هەر مایەوە پێغەمبەر لای مامە کوردی چەپڕۆ.

پانۆرامای جوداوازیی خەڵکی سەرزەمین لە بیروباوەڕی دینی و دونیایی تا ئەوەی لە ئەژمار نایەت حیکایەت و سەرێشەی بێبڕانەوەی لە دوایە. ئەگەر جوداوازیی زمان و لەهجە و پۆشاک و خۆراک و داب و دەستوور... و... چی بخەیتە سەر خەرمانی پێشووتر حیسابەکە بێسنوور دەبێت. کە هاتیت جوداوازیی تەبیات و حەز و گەشی و مۆنی و کورتی و درێژی و دزێوی... و... و... ئەمانەشت دەور کردەوە ئەوسا ڕەنگە بگەیتە نیوەڕێی سەرلەبەری جوداوازیی نێوان تاکانی مرۆ. ئەگەر هاتبایە یەخەگیربوون و لێکتر ژەنین لەسەر «نرخ» ی ئەوتۆ بایە شایانی ئەرکەکە بێت مایەی پەرۆش نەدەبوو. وەک کە دەچیتە ڕاوە کێوی لەسەرتە بە شاخ هەڵگەڕێیت و جەنگەچرە لەگەڵ سووری ماهی بکەیت بەڵام لەسەر نیشانە پێکانی بەرد کە مزەی تێدا نەبێ لێکتر مۆڕبوونەوەش زیادە لە پێویست...

ڕاستییەکەی مرۆ لە هەموو گیانلەبەرێک پتر لەسەر هیچە قەڵس دەبێت و دەمار دەیگرێت: لە ئافرەتێکیان پرسی، بۆچی بووکەکەت ناڕێکە لەگەڵت؟ گوتی: لە خواوە خۆشی ناوێم [ئەمە ڕوورداوە نەک هەڵبەست]. چەند سەیرە لێکتر دڕدۆنگبوون خوای تێدا سەبەب بێت. دەسا موختاری صابوونکەران لە سلێمانی تاقەتی نییە هێندە خەریکی کاری نابەجێ بێت...

لەم تێبینییەی قەڵسبوونی مرۆ بە بێ سەبەب، دەرحاڵ بیر بۆ ئەوە دەچێت کە زیندەوەر لە خۆڕایی قەڵس نابێت، بەڵکوو نازانێ قەڵس بێت. لە نموونەدا: چەندێکی پشیلە و دوو میاوەیان دەوام بکات پشیلەیەکی تر گوێی پێ نابزوێت بەڵام کابانی ماڵ بە قەپوقیڕی منداڵان سەغڵەت دەبێت چ جایی بابایەکی نووسەر یان نوێژکەر یان خەواڵووی بێ نووستنی شەو... تومەز لە خلقەتی مرۆدا، کە پێشکەوتووتر و گرێیاویترە لە هی زیندەوەر، ئەسبابی قەڵسبوون و تەنگەتاوی دەیان و صەدان جار لە هی زیندەوەر پترە.

ئەم ڕاستییە دەخلی هەیە لەسەرجوملەی ئیشکالاتی ئادەمی کە دەشێ بڵێین نیسبەتی هەڵکشانی ژمارەی هۆی قەڵسبوونی ئادەمی «هندسی» دەڕوات لەچاو هی جانەوەر کە «حیسابی» دەڕوات وەک ‹2-4-8-16-32 لەچاو 2-3-4-5-6 ڕەنگە زیاتریش بێت وەک 4-16-64-128 لەچاو 4-5-6-7...

ئەوەی ڕاستی بێ، بەرودوا و سەرجەمی حالاتی مرۆ، چ تاک بێت و چ کۆمەڵ، هەتا لێی وردبیتەوە پتر دەزێتەوە بە وێنەی تازەبەتازە کە بەشی هەرە زۆری وێنەکانیش ئەوانەن کە لایەنی نایەتی [نەرێتی] ی ژیانی تاک و کۆمەڵ پڕ دەکەنەوە. هەرچەند من یان یەکێکی دیکە گوێبیستی بیروڕای زانا زلەکان بووبێت لە بارەی هۆیەکانی زۆرتر کردنی جوداوازیی نێوان تاک و تاک و تاک و کۆمەڵ و کۆمەڵ و کۆمەڵدا، چەندێکیش لەگەڵ خۆیدا دوورەندێشیی کردبێت، بۆ دۆزینەوەی یاسایەکی هەمەگیر کە شەرحی ئەم دیاردەی وەها تێکەڵپێکەڵ بکات نەگەییشتۆتە ئەنجامێک بایی زڕەقەناعەت بکات...

ئێمە دەزانین، یاخود دەبێ بزانین، دیاردەی «جوداوازی»ی نێوان گیانلەبەران پێبەپێی تێهەڵکشینی گیانلەبەرەکە لە پێپلکەی فراژووتنی بایۆلۆگی زیاد دەکات و فرەبابەت دەبێت هەرچەند بە کزیش بێت، تا دەگەیتە مرۆ بە خۆی و تایبەتمەندییەکانیەوە کەوا هەروەک سی پیتی ئەلفوبێ میلۆنەها و ملیارەها وشەی لێ دروست دەبێت. مرۆش بەو کەرەستەی هەست و هۆش و غەریزەیەوە لە ڕادەبەدەر هۆی لێکتر جودابوونی دۆزیوەتەوە یاخود بڵێین بۆی ڕەخساوە: ئەگەر تایبەتمەندی هۆی جوداوازی نەبێ چۆن دەشێ دوو تاقمی یەک شار کە لە ماوەی هەزار ساڵ و دوو هەزار ساڵدا بەیەکەوە ژیاون یەکیان گاپەرست بێت و ئەوی دیکەیان ڕۆژپەرست... یەکیان گۆشتخۆر و ئەوی دیکە گۆشتنەخۆر... یەکیان تاکژنە ئەوەی تریان فرژنە... هتد بێت. وەک بە ئاشکرا دیاریشە هەتا مرۆ لە پلەی نزمی شارستانەتیدا بێت جوداوازیەکەی کەمتر دەبێت. بەتایبەتی کە ژمارەیان زۆر بوو، وەک خەڵکی دێی بیست ماڵی سادەترن لە شارێکی دوو هەزار ماڵی.

دەزانم کاریگەریی هۆش دەورێکی باڵای هەیە لە هەموو سەروبەرێکی کۆمەڵایەتی، بەپێی کاریگەرایەتیی برشتیشی لەچاو غەریزە پتر توانایە لە داهێنانی هۆی لێکتر جودابوون کە دەکشێتەوە بۆ لێکتر دڕدۆنگبوون. هەر ئەم برشتەشە دەتوانێ لە

کۆمەڵگەی قەوغادا کاریگەرتر بێت چونکە بارتەقای پیتەکانی ئەلفوبێی باسکراو فرەبوونی ناوەڕۆکی کۆمەڵیش کەرەستەی فرەبوونی گۆشەنیگا و بۆچوون و جۆری مێجز و پێوانەی چاکە و خراپە و مۆدێلی جلک و خواردەمەنی... و... پتر لەبەر دەستدا دەبێت... ئەسکیمۆ لە بەفرستان لەوەتەی هەیە قەپێلکی نەگۆڕی هەتا مرۆڤی گەرمیانی پێڕاگەییشت و جۆری ژیانەکەی تاڕادەیەک پێ گۆڕی. [دیاردەی سادەبوونی دەوروبەری بەفرستان و گرەی ناوەندی ئەفریقا لە کۆنەوە بەو جۆرەی دەڵێی گۆڕانکاریی تێدا پەیدا نەبوە باسێکە دێراوی بە دۆریخەیە و زۆر لایەنە، تاڕادەیەک دەشێ وەکوو ژیانی لادێ حیساب بکرێ لەچاو شارستان لە نوختە نیگای خەریکاندنی هەست و هۆشی مرۆڤەوە، لەگەڵ تێبینی ئەو لایەنە کە زێدە ساردی و زێدە گەرمی ئەو دوو شوێنە کاری سەلبی دەکات لە چالاکی مرۆ - هەڵبەت ناوەڕاستی ئەمەریکا و ئوستڕالیاش وەکوو ناوەڕاستی ئەفریقا حیساب دەکرێت].

خوێنەری ئازیز! من لە تەجرەبەی خۆمدا بارەها دووچاری پەشیمانی بورمەتەوە لە قسەیەک، لە ڕەفتارێک، لە کارێک کە کردوومە بێ ئەوەی پێویست بووبێت بەڵکوو پێویست بوو نەیکەم. ئەم دیاردەیە [کەوا ڕەنگە لە تۆشدا بەدەری دابێتەوە] بەر هیچ ڕاستە حیسابێکی هۆ و ئەنجام، تەک و بەرتەک[44]، ناچاری، بەرژەوەند ناکەوێت. زۆر جارانیش ئاکامی زێدە بە سفتوسۆی لێ دەکەوێتەوە کە هەرچی مەنتیقی ژیر و زانستی سیحراوی و گەییشتن بە تاقی فەلەک لە دەفتەری بلیمەتاندا خوێندبێتمەوە سەری موویەک لە مەینەتەکە کەم ناکاتەوە.

بەڵێ دەزانم چشتی ئەوتۆیی زستان ناگۆڕێ بە پاییز... جەنگی یەکەم و دوەم خامۆش ناکات، هەنار لە بازاڕ گران و هەرزان ناکات... نیسکی نەکوڵەکی پێ ناکوڵێت... مان گرتنی کرێکارانی کۆریای باشووری پێ ناوەستێندرێت [ئەمە لە 15-2-1997 دەنووسم] بگرە هەر هیچی لێ هەڵناستێتەوە مەگەر لە حاڵوباری خۆم کە تێدا سەغڵەت بووم و دەبم. بەڵام لێرەدا بەلای کەمەوە دوو تێبینی گرنگ و گرنگتر هەیە:

---

[44]- تەک و بەرتەک: فعل، رد فعل.

1. کە هەموو تاکێک دووچاری ئەم حاڵە نالەبارە ببێت باسەکە لەوە دەردەچێت بێبایەخ بێت. لە دەرووی زێدە ڕوونکردنەوەوە دەڵێم بڵاوبوونەوەی نەخۆشیی «ئیدز» یش، جاریێ، هەر لە جغزی نەخۆشەکان کاریگەرە... نەهاتیی ئۆگەندەش کار ناکاتە سەر ئابووری جیهان و قەومان و نەقەومانی جەنگی سێیەم و سیاسەتی ڕووسیا و ئەمەریکا و مریشک و جووجەڵەی دەراوسێکەم.
2. وا دەبێ ئەم دیاردەیە لە کاری گەورە دەور دەبینێت: نزیکترین نموونە، ڕووداوی کوژرانی «امام صدر» و دوو هاوڕێی بە هۆی هەڵەی تەرجەمەی وشەی «خلص» لەلایەن بەردەستەکەی سەرۆک قەذافی کە وایزانی دەڵێ «تەواویان بکە، کۆتاییان پێ بێنە» نەک «قسەکان تەواو بوون» کە مەبەستی قەذافی بوو، ئیتر بیانبەرنەوە بۆ تەیارەخانە و بەڕێیان بکەن... لە ڕیوایەتی سەردەمی عەبباسییەکان دەگێڕنەوە: خەلیفە بۆ قازی «قم» ی نووسی «أيها القاضي بقم قد عزلناك فقم»... زیرەکێک گوتبووی «عزلته القافية» واتە قافیە عەزلی کرد! دەڵێن کۆمەڵێکی دامەچی تەڵاقیان خوارد کە هیچ کەس لە تاماشاچیان دەخلی یارییەکەی نەبێ... یەکێکیان ئۆینێکی دیتەوە دامەچییەکە نایبینێت... کەمێک خۆی گرت ئۆقرەی پێ نەما، گوتی: ئەو داشەی بدەیێ و هۆوەیهێش دەچێتە دامەوە، وا منیش دەچم بۆ لای مەلا تەڵاقەکەم چاک دەکەمەوە...

دوورمەبینە لە کاری سەربە دەوڵەت قسەی نەکوڵاو بەزۆر وەستابێ لەسەر لایەنی قسەکەر... ئەم جۆرە دیاردەیە نە پێوەندی هەیە بە دەوروبەر و نە بە هۆی بەرهەم و نە بە دین و نە بە دنیاوە. ئەوەندە نەبێ کە تاکی مرۆ، یان کۆمەڵێ، لە «دەوروبەر» دا دەژین و بەرهەمهێنن، گاجووت و گاسن و داس و چەکوچیش هێندەی جریوەی چوێلکە و خوڕەی ئاو و فەلسەفەی ئەفلاتۆن [بۆ کەسێکی تێشی بگات] بێدەخلن لە قسەی نەکوڵاو و نەگووراو کە وا دەبێ ماڵکاولی بەدوادا دێت.

دەتوانم بڵێم، ئەوەندەی خەڵک لەسەر قسەی سووک و شتی بێبایەخ و بەخۆدا شکانەوە و لچکولیو بادان و توانجی بە توێکڵ [بەتایبەتی کە نامووسی گرتەوە]

کوژراون یاخود ئاوارەبوون یاخود ڕووتاونەتەوە. لە ماوەی بیست ساڵدا، ژمارەیان پتر بوە لە کوژراوی دەمی شەڕی ئەو ماوەیەدا کە وەها بوە شەڕیش نەقەوماوە. ئیتر نیسبەتەکە یەک بە دەش دەبێ؛ خۆ ئەگەر بە پێوانەیەکی دروستی لێکدانەوە کوژراوانی شەڕ بە تێکڕایی پتر دەچوون ئەوسا بارەها و جارەها وەها دەردەچێت کە شەڕەکە لە بنەڕەتەوە بێلزووم بوە ئیتر هەموو کوژراوەکان دەچنە نرخی گیسک و کاوڕی مردار لە شەڕەدا...

نموونەیەکی بێ تەفسیر لە چەندوچۆنی کۆمەڵایەتی پایە و حاڵوباری ئافرەتە: ئێمە دەزانین پیاو لە ژن بە بەژن و باهوو و هێز زووررووی دەکەویتەوە، تاڕادەیەک لەویش کاریگەرترە [لایەنی منداڵبوون و شیرەخۆریی و ئەرکی بەخێو کردنی دەبوو دەستەتەرازووی بۆ ئافرەت ڕاست ڕاگرتبایە بەڵام لایەنی خورتی و هێزی پیاو حیسابەکە بەو جۆرە لێک دەداتەوە کە عەیب نەیەتە سەر نێرایەتیەکەی] بەڵام لێرەدا قسەمان لە عەدالەت و ئینساف نییە. دەمانەوێ بزانین بۆچی پایەی ئافرەت لە گەلێک بۆ گەلێکی دیکە هێندە جودایە... لە دینێکەوە بۆ دینێک... لە شار بۆ لادێ... لە کۆمەڵی سەرەتایی تا ناوەندی تا پێشکەوتوو... کە دەڵێم «دەمانەوێ بزانین» ئەوەم مەبەستە کەوا بەڕاستی هیچی لێ نازانین.

لە حیجازی بەر لە نزیکەی 1400 ساڵ (قمري) دینێک پشکی ئافرەتی لە میرات دانا بە نیو هێندەی پشکی پیاو، چوار ژن و هەزاران جاریە حەڵاڵ بوو بۆ پیاو... کوردەواری بێ ئەوەی هیچ جۆرە پێوەندیی هەبووبێ بە حیجازەوە، لە ڕێی لەشکری سەحابانەوە بە هەموو جوداوازییەکی نێوان کورد و عەرەبەوە بوو بە پێڕەوی ئیسلام. نە دەوروبەر و نە چەکوچ و داس و نە داخوازیی حاڵوبار و نە یەکیەتیی زمان و نەریت و چی و چی هەبوو ورتەی لەبەرەوە هات. تەنانەت ناوی کەسان لە ژن و پیاو گۆڕا بە ناوی عەرەبی. بەزۆریش ناوی سەربە دین و پیاوچاکانی عەرەب... «عبدالله بن عمر» بەسەر زمانی کرمانجەوە بوو بە «حەولای حومەران»... چیای «بلفەت» ی بژدەر لە «ابو الفتح» ەوە گۆڕاوە... نووسراوە ناوی «بێتواتە» لە کاغەزێکی سەرۆکی لەشکری ئیسلام بۆ خەلیفە بە «بیت العبادة» هاتوە گۆیا مەرکەزی دینیی ئەوسای ناوچەکە بوە ئیتر بەسەر زمانی کوردەوە گۆڕا... خولاسە هەرچی پێی دەڵێن «ژوورخان»، بێ دەخلی

هەرچی کاریگەری ماددیی ئەوسای کورد بوو، گۆڕا بە هی عەرەب... ئێستاش بەشێکی ئێلە نیشتەجێی نێوان کۆیە و هەولێر و مەخموور دەڵێن «الحمد لله رب العالمین»... «من ربک-کێ خواتە»ی ناو قەبر بوو بە «مەڕنەمووکە» و شاعیر گوتی:

گەر مەڕنەمووکەی عارەب لێم پرسێ
وای تێڕا دەخورم کە ئەو بترسێ

کە ئەم بەرتەکە لە صەدەی بیستەم بەدەنگ هات... ماڵم حەقە کە کوردەکە بەر لە ئیسلامەتی نەیدەزانی نووسین چییە، دوای گەشەی ڕۆشنبیریی دەورانی عەبباسییەکان، بارتەقای فارس و تاجیک و ئەفغان، زانای وەهای لێ پەیدا بوو هاوشانی ڕیزی هەرە پێشەوەی زاناکانی ئەو سەردەمە بوون نەک بە نیازی پاراستنی بەرژەوەندی کوردی خۆی بەڵکوو بە نیازی ڕوون کردنەوەی:

1. ڕێی هیدایەت
2. فەرمانی شەریعەت لە مامەڵەتی دنیایی...

کوردێکی بەر لە هەزار ساڵ بە دەگمەن نەبێ لە سنەوە نەهاتوە بۆ هەولێر، ئەمما بۆ خوێندنی مەلایەتی بە پانایی و درێژایی کورستان گەشتی کردوە... بە هەزاران کورد چوون بۆ حەجی مەککە... بەشدارییان کردوە لە غەزای کافران... ئنجا تۆ سەیری ئەم مەتەڵە بکە: میللەتێک بۆ حاڵی خۆی لە گوزەران بەولاوە خەریک نەبوە بە سوودی گشتییەوە و بە دڵ و گیان ڕێی مەککەی کوتاوەتەوە بۆ بەهەشتی پاش مردن. بیریاری ماددییش دەڵێ: کە خەرەک و جەنجەڕ گۆڕان بە نازانم چی پێوەندیەتیی بەرهەم و یاساکانی دەگۆڕێن، ناشڵێ زانایەتی نافەللاح و ناکرێکار ئەمرازی بەرهەمهێنان دەگۆڕێت کە دەزانین لە ماوەی پتر لە دوو هەزار ساڵدا کورد نەیتوانی هۆی بەرهەم بگۆڕێت چونکە پلیشایەوەی شەپڕەی داگیرکەر بوو تا ئەوەی دەشێ بڵێین بە دەگمەنێکی زێدە دەگمەن نەبێ کوردی خاوەن قەسر و تەلار پەیدا نەبوو... سەیرێکی گەشتەکەی «ریچ» بکە و بخوێنەوە چۆن وەسفێکی هەژارانەی دەرباری میری بابان دەکات...

لێرەدا تێبینی و ڕوون کردنەوەیەک پێویستە: کوردەکە چونکە ژێرخانی ئەوتۆی نەبوو ئاوس بێت بە گۆڕانکاری تەنها توانیویەتی لە زانستی نەزەری پسپۆڕ بێت، چوونە حەج و غەزاش مەهارەتی ناوێت: ئەگەر بڵێین غەزا بە شەقوشوللاق بوە خۆ حەجەکە دڵخواز بوە مەسرەفەکەشی بە مل حاجییەو■ بوە نەک حکومەت کە ناچارە غەزاچییان نان بدات. لەگەڵ ئەم تێوەرێخەش دەبێ بڵێم لە غەزای قارس[45] و بایەزید، ساڵی 1294 ک. بەشی هەرە زۆری پیاوی دەسەڵاتدار و خاوەن ناو و شۆرەت لە کوردستانی عیراقەوە بە ئەرک و مەسرەفی خۆیان بۆ شەڕەکە چوون... لەلایەن نەبوونی «ژێرخان» ەوە نموونەیەک دەهێنمەو■ نەختێک سفتوسۆی تێدایە:

قسە لە باوکمەو■ دەگێڕمەو■ دەیگوت «مەستی ئەفەندی» زانایەکی پیشەناسی بەهرەدار بوو، دەیتوانی لە هەر شوێنێک خەتی تەلەفۆنی پێدا تێپەڕێت ئالەتێک دروست کات بە خەتەکەیەوە ببەستێیەوە و تووێژی پێ بکات بەو جۆرەی خۆی مەبەستی بێت نەک قسەکەی بۆ دوولای خەتەکە بچێت... لەمەش زیاتر دەگێڕایەوە کە مەستی ئەفەندی پرۆژەیەکی هەبوو کە بە هۆی عەدەسەکارییەوە تیشکی ڕۆژ بگەیەنێتە شوێنی تاریکەشەو ئیتر بۆ مەڵبەندێک بێت یان وڵاتێک یان هەموو جیهان [مەبەست زەوییە]. خوێنەر دەبێ بزانێ کە مەودای پرۆژەکە لە یەک کاتدا بۆ نیوەی زەوی لە کاردا دەبێت چونکە نیوەکەی دیکە ڕۆژە پێویستی بە ڕووناک کردن نییە، دیار■ قوتبەکانیش شەش مانگ لزومیان پێ دەبێ و بەبێ کوژانەوە، شەش مانگی دیکە ڕۆژ هەمیشە دیارە... حکومەتی عوسمانی خۆی شەپڕەدار بوو کاربەدەستانیشی پتر خەریکی قۆرەدەماغی بوون تا ئەوەی لە مەهارەتی پیاوێکی وەها بلیمەت سوود وەربگرن. بێگومان مرۆی ئاسایی ئەو سەردەمە سەیری هاتۆتەوە لەو «گەپ»ـەی مەستی ئەفەندی کردوویەتی لە جیاتی ئەوەی بە دامە و جۆرەبینێ کاتی خۆی بگوزەرێنێ... ڕەنگە لەوەشدا مرۆکە بێ ئەوەی هەست بە

---

[4■]- باپیرم کە بەشدار بوە لەو غەزایە، مێژووی شەڕەکەی بەم بەیتە دیار کردوە لە ڕێی حیسابی «جمل»ـەوە:

ئەنگوشتی قەدەر لە لەوحی نووسی

تەئریخی غەزا «غەزای ڕوسی■ [1294]

خۆی بکات حاڵوباری هەڵکەوتی ئەوسای کوردی پێکابێت وەک کە [ڕەنگە] هی ئێستاش بپێکێت.

جانەوەر کە هۆشی نییە ئاسوودەیە لە کێشەی ئافرەت [هی کرێکار و میللەتی ژێردەست و... هتد] مافی ئافرەت و هەوێباریی ئافرەت، مەلا و دادگەشی ناوێت بۆ مارەبڕین و تەڵاقدان، ئەو تێبینییەش دێتە پێش کە لە هەموو دینێک تەڵاقدان نییە، مارەبڕینیش قودسییەتی نییە کە بریتی بێت لە ڕەزامەندیی دوو لایەنی نێر و مێ بە یەکتر وەک کە قودسییەت لە مێوە کڕین و مامەڵەتی کڕینی ئۆتۆمبیل و... و... هتد یش نییە کە ڕازیبوونی کڕیار و فرۆشیار مەبەست بێت و بەس. لە مەڵبەندی مرۆ، تەنها مرۆ، هەندێ خۆراک و نۆشەمەنی و کەیفەمەنی لای کەسانێک حەڵاڵ و لای کەسانێکی دیکە حەرامە، تەنانەت خۆراکی حەڵاڵیش حەرام دەبێ ئەگەر کرایە بەرتیل یان دزرا...

خولاسە تایبەتمەندییەکانی مرۆ کە هۆش پێشەوای هەموویانە جیهانێکی ئاڵقەبەندی ژوورخان دەتەنێتەوە بە دەوری خۆیەوە کە کار لە ژێرخان و لە مرۆ خۆی و لە خۆشی و ناخۆشی و هەموو سەروبەرێکی دەکات، بگرە لە پشمین کە دەبێ «یرحمک الله»ی بەدوادا بێت هەتا بەرپا کردنی شەڕی ئاتۆم... لەو دەوروبەرە ئاڵقەبەندەی مرۆکرد کە هی میللەتانی دوور و نزیک لە یەکتر تا بڵێی جوداوازن، چەکوچ و داس و بەرهەم ورتەیان لەبەرەوە نایەت چونکە لایەنە لێکتر جوداکان ئەو داس و چەکوچ و بەرهەم و گەڕۆک و فرۆکە بەکاردەهێنین لە ناحەزییەکە و دردۆنگییەکە بەو پێیە چەکوچ و داسێکی بەلای مرۆی ماددییەوە ڕەوڕەوەی مێژوو دەگێڕێت دەچێتە جێی ئەو زەهرەی کە بە دەرمان دادەنرا لە نموونەی کار کردنی ژووخان لە ژێرخان، کە بەر لە چەند دێڕێک باس کرا مەسەلەی حەرامبوونی شەرابە لە ئیسلامەتی و هەندێ تیرێژی بەرتەسکی Teetotalism و کەمایەتیی دینی لێرە و لەوێ... ملیۆنەهای هیند و گۆشتنەخۆرەکانیش بە تێکڕایی پەکخەری مامەڵەتی گۆشتن... بەشێکی بەرچاوی تەیر و جانەوەری ئاوی و دڕندەکان [سەرلەبەر دڕندە] حەرامە لە موسوڵمان... پەڕەسێلکە بە هۆی جرەجرەکەیەوە کە گۆیا ئایەتی «اذ یتلقی المتلقیان عن الیمین وعن الشمال قعید» دەچڕن قودسییەتی پەیدا کردوە لای ئێمە... لەکلەک بە خۆی و وەقاریەوە بۆتە حاجی لەکلەک گۆیا لە

سەفەری زستانەی بەرەو گەرمێن دەچێتەوە بۆ مەککە و دەبێتە حاجی... دەبوو حیسابێک بکەن بۆ سووڕانی مانگەکانی عەرەبی کە وەها دەبێ کۆی حەج دێتە هاوین، بەو پێیە لەکلەک زڕەحاجی دەردەچێت.

لە مەسەلەی پەڕەسێلکە و لەکلەک ژوورخانەکە نهۆمی دووەمی هەڵناوە. کە قودسییەتی گەڕانەوە بۆ مەککە قودسییەتی بەخشیوە بەو دوو مەلە. سەیر لەوەدایە کە جۆرەها تەیر هەن گەرمێن و کوێستان دەکەن نەبوون بە موقەددەس... لەمانەش تەیرە عەبابیلە بە هۆی شۆڕەتێکی بەستوویەتی کە گۆیا ئەم تەیرە لەشکری ئەبرەهەی تەفرووتوونا کرد کە هات بۆ تێکدانی کەعبە لە مەککە. ئایەتی قورئان لە بارەی ئەو هەرایەوە دەفەرموێ: «وأرسلنا عليهم طيرا أبابيل ترميهم بحجارة من سجيل» ئیتر ناوەکە مایەوە بۆ ئەم مەلە بە تەیرە عەبابیلە (طيرا أبابيل). ئنجا ئەگەر بپرسیت لە خۆت بۆچی تەنها مامە کورد ئەو عەبایەی بەسەر شانی تەیرەکەدا دا؟ بۆچی عەرەبی خاوەن ئەسڵە وشەکان گوێی نەدا بە خەڵاتبەخشینی مەمنوونییەت لە جێی چاکەی ئەو مەلە؟ چ وەرامێک وەرناگریتەوە وەک کە کەزیی «عەیشێ و فاتم»انی خستە جێی پەلکەزێڕینە و عەرەبیش گوێی پێ نەبزووت!!

عەرەب نوێژەبارانەی هەیە بۆ ساڵی وشکان، کوردەکە وێڕای نوێژەکە «هەیاران و مەیاران، یاخوا بباریێ باران. گەنمی حەسەن و حوسێنان، هەمووی قڕبوو لە تێنان، لە بۆ ئاوی قولەتێنان...» ی کردە پاڕانەوەی ناو ئاوایی، پتریش هەرزەکان پێوەی دەزرووقانەوە، هەرچی نوێژەکەیە لە دەرەوەی ئاوایی دەکرا و دەکرێ... بۆرە دەلالەتێک لەو ڕەفتارەی کورد دەچێتەوە بۆ زێدە کەنەفتی و بێدەسەلاتی و هیچ نەداری ئەگەرنا بۆ، زێدە لە هەموو خەڵقوڵلا، مامە کوردەی «قوتەی مل نێرکەکاردوو» پەرۆشدار بێت لە پاڕانەوە؟ بەڵام مەسەلە لەوەندەدا ڕاناوەستێ! پەرۆشەکە لە بنەڕەتەوە سەربە دین و هەژارییە، کە چەسپا و بوو بە عادەت، بوو بە هۆی خۆخڵافاندنی بێئیشی و کات بەسەر بردن وێڕای ڕازی کردنی غەیب کە شەقڵەکەی بەوەدا دیارە کە گەپەکە لە دەمی بێبارانیدا دەکرێ نەک وەکوو هەڵمات و قاشۆیانی کە هی هەموو کۆێکن یان هی هەموو کۆێک بوون! لەبەر تیشکی ئەم تێبینیەدا دەچمەوە بۆ «میرمیرانێ»ی فەقێ و مەلایان کە لە دەمی کۆبوونەوەی

وەک موناسەبەی «أجازة» ی موستەعیدان شکڵ حکومەتێک ڕێک دەخرا و فەقێیەک دەبوو بە میر و فەرمانی بەسەر هەموو براگەورە و سەرۆک عەشیرەتاندا دەکشا.

لە نووسینی کۆنترم باسی ئەم لایەنەم کردوە و گوتوومە و، ئێستاش دەیڵێمەوە، ئەو ئاهەنگەی چەند ڕۆژێکی دەخایاند ڕەنگدانەوەی تامەزرۆیی بێحکومەتیی کوردی بوو: لە غەیری ئەم ئاهەنگەدا، کورد هەرگیز توانای نەبوە و بەبیریدا نەهاتوە تەمسیلێک بیەخێت دڵداریی مەم و زین، صالحی نسزی قاوەچی و کەژ... یان دوازدە سوارەی مەریوان زیندوو بکاتەوە بۆ بەرچاوی تەماشاچییان. ئەگەر بگوترێ ئەو تەرزە داستانانە کەرەستە و مەسرەفی زۆری دەوێت خۆ هەرای میرکوڕان و میرکچانی مەشووری سەردەمی حاجی قادر لە باڵەکەتی هەتا بڵێی بە هاتوبات و کێشە و دەوامە بوو تا سەری نا بە شەڕی نێوان کوڕان و کچان و لە ئاکامدا کۆمەڵی «هەمزە حیماری» و «مەلکەقۆڕ» و «داڵ واو دوو»... و موستەعیدەکانی تر بڵاوەیان لێ کرد و باڵەکەتییان بەجێ هێشت.[46] دوایین ئاهەنگی «میر» لە کوردستان عێراق کە خەبەری بە من گەییشتبێ لە کەرکووک و بە پشتیوانی سەید ئەحمەدی خانەقا بەرپا بوو، ئاهەنگەکەش هەر لەلایەن مەلا و فەقێیانەوە ڕێک خرابوو لە بیستەکان...

خوێنەری بەڕێز!

باسی ئافرەت کە بە لای کەمەوە نیوەی ئادەمیزاد دەگرێتەوە، لە نوختە نەزەری جوداوازیی پایە و ڕۆڵی لە هەڵسووراندنی کاروبار و پێداویستەکانی ژیان و مانەوە و بەرەوپێشچوونی کۆمەڵان و نەتەوان تابڵێی دوورە لە مەنتیقی لێکدانەوەی سادە و بێ گرێ و تەئویل کە دەبینین جارێکیان بە تەواوی کەسایەتییەکەی ڕەش دەکرێتەوە تا ئەوەی خۆی دەسەلمێنێ کە ئافرەت شەرمهێنە، جارێکیشیان دەبێتە سەرۆک وەزیران و سەرۆک دەوڵەتیش: هەڵبەت دەزانین بێحورمەتیی ئافرەت یان هی دەستوپێ یان هی بەعزە کەسێک بەرچاوتر لە وڵاتی دواکەوتوو کە تێیدا

[46]- وابزانم لە بەشی دووەمی یان سێیەمی *«حاجی قادری کۆیی»* ئەم هەرایە باس کراوە.

هەموو بێدەسەڵات و هەژارێک دەکەوێتە جێگەی بنکڕی مەنجەڵی پڵاو. لە حاڵەتی «بنکڕیی» دا هەژارەکەش بێحورمەتییەکەی بەلاوە سەیر نییە و لێشی گران نایەت، بەڵام سەیر لەوەدایە کە بابایەکی لچکولێو لە کەسانێک بادەدات کە بێحورمەتیان دادەنێت، بەرزەیێ ڕاست دەبێتەوە بۆ «بێحورمەتێکی» دەسەڵاتی وەزیفە وەیا پارەدار بێت بە خەیاڵیشیدا نایەت کارێکی نابەجێی کردوە. لە عەرەبی مەتەڵێک هەیە دەڵێ: «من یاخذ أمه یگول له عمي» (کێ دایکی مارە بکات پێی دەڵێ بابە) خۆش بێ و ناخۆش بێ ئەمە ڕاستییەکە لە ژیانماندا. نەتەوەی دیکەش لە ڕۆژگارانی بێدەسەڵاتیدا هەروەها بوە... دەگەڕێمەوە بۆ قسەی سەرەتام و دەڵێم باسی ئافرەت یەکجار[47] درێژخایەنە و زۆریش بە ئێش و بە ئازارە، لێرەدا چیتر دوای ناکەوم.

یەک تێبینی دەمێنێتەوە بە پەراوێزی بێدەسەڵاتییەوە [لە نێوان دەیان تێبینی ئەوتۆوە] دەمەوێ بیخەمە بەر نیگای خوێنەر بەلامەوە زۆر ئازاربەخشە: دەسەڵاتێکی دڕ و شەقوەشێن گەلێک پتر خاتری دەگیرێ لە یەکێکی دەسەڵاتداری بەناموس وەیا بلیمەتێکی بێپارە لەوەشدا خەڵکەکە وەکوو مەڕ ڕەفتار دەکات کە گورگی دیت تەسلیم دەبێت، کەچی دەبوو بەپێی فام و تێگەییشتنی «مرۆ» پیاوچاکەکە و خاوەن بەهرەکە هەرنەبێ بایی شیاویی خۆی و بارتەقای شەقوەشێنەکە ڕێزی لێ بنرێت. بەوەشدا لایەنی سەلامەتیی مەرگەلی ئادەمیزادی بێدەسەڵات سوودی وەردەگرت کە حورمەتی پیاوەچاکەکە پارسەنگی حورمەتی ناچاکەکەی دەدایەوە و، کوردی گوتەنی، تێیدا دەهێنشتەوە... تومەز لەخۆ دەرچوونی ستەمکار، جگە لە ئارەزۆی هێنانە دی نیازە مەزەدارەکانی، پاریدەدەرێکی گەورە لە ورە بەردانی ئاپۆرەی جەماوەر بەرانبەر دڕندەیی ستەمکار دەبینێت.

تاک و تەرایەک لە مرۆی هەژاری نەترساو، ناوناوە، پەیدا دەبن ستەمکار کۆمەیان لێ دەکات و دڵێشیان ڕادەگرێت: بەداخەوە ورەبەرداوەکان بە پێشەرمیان دادەنێن و پەندی سەرکزڵەیی «پێ لە بەڕەی خۆت پتر ڕامەکێشە» یان لێ بەدەنگ دەهێنن

---

[47]- وشەی «یەکجار» ڕاستە نەک «بەجگار» کە نووسەران بەکاری دەهێنن ■ هەڵەیەکی بێ بنەمایە.

و بەبیریاندا نایەت پەندی «مست لە درێشە دەگەڕێتەوە» هەیە سوودی خۆیان تێدایە. لەگەڵ ئەم تێبینییانەشدا دەبێ، بە ناچاری و بە بڕیاری واقیع، بسەلمێنین مرۆی عادەتی ئەوەیە کە قسەکانیان لێ بەڕاست دەگەڕێ و بە جۆرێکی ئاسایی و بێ مامۆستای دەرسدەر و عەزمشکێن زوربەی خەلق لە کۆمەڵی خۆمان ئاسایی حەز لە گۆمی مەندی نەشڵەقاو دەکات. تەنانەت لە حاڵی هەبوونی جموجووڵی سیاسیشدا کە خوێنگەرمەکان خەریکی شۆڕش و سەرپێچی دەبن کۆنە بێدەسەڵاتەکان مۆرکی خۆیان لە شۆڕشەکە نادەن و هەمان ملکەچی و بردەباریی جاران دەسەلمێنن و ئایەتەلکورسی [ئەگەر بیزانن] لە خۆیان و ماڵ و منداڵیان دەخوێنن... بەهەمەحاڵ پەک کەوتنی زوربەی میللەتی دواکەوتوو بەرانبەر هەرەشەی ستەم موشکیلێکی زێدە زێدە کۆنە دەچێتەوە بۆ ئەو ڕۆژگارانەی کە سەرەتای دەستدرێژی کردن پەیدا بوە.

ئەگەر ڕاست بایە کە دەگوترێ چینی چەوساوەیە کە لە هەموو مێژوودا خەریکی خەباتی چینایەتی بوە نەدەشیا زۆردار ببڕای ببڕای پەیدا بێت چونکە بەر لە شەش هەزار ساڵ زۆردار لە زۆرنەدار پتر چەکی شەڕ کردنی نەبوە، ژمارەشی دەیەکی زۆرنەداران نەبوە... چەکیش هەر گۆپاڵ و بەردەقانی و تیر و تیغی سادە بوە کە بۆ هەمووان بەردەست بوە، تەنانەت ئاپۆرەی زۆرنەدار [ئەگەر هەستی چینایەتی هەبوایە] دەیتوانی لە ڕۆژێکدا، لە سەعاتێکدا، زۆردار هەپروون بە هەپروون بکات. دەشێ بگوترێ زۆردار پتر لە شەش هەزار ساڵ توانیوەتی خزمەتکار ڕابگرێت و شەڕی پێ بکات لەمەشدا دوو تێبینی سەرەکی و بنجەکی هەیە قسە دەبڕێتەوە:

1- زۆردار لەپڕ نەبۆتە خاوەنی دە بەرە جووت [کە ئەوسا جارێ شار پەیدا نەبووبوون] ئەویش وەک خەڵق بەرە جووتێکی هەبوە و توانیوەتی لە ماوەی عومرا یەکێکی دیکەشی بخاتە سەر کە بەشی زۆر و ستەم ناکات.

2- ئەوانەی کە دەشبوونە ڕەنجبەر، لای ئەو، هەر لە تاقمەی زۆرنەدار بوون... تا ئێستاش زۆردار هەر ڕەشوڕووتی پڕۆلیتاریا بۆ کارە بەدەکانی ڕادەپەڕێنێ. بە داخەوە نەزەریە لە ئاست ئەو دیمەنە بەرەواژە کورت دێنێت کە دەبوو ڕەشووڕووتەکە لوولەی تفەنگ لە زۆردار بکات بەپێی «خەباتی چینایەتی» نەک فەلاحی بۆ بکوژێت.

هەڵبەتە حاڵەتی ئێستاکە زۆر جودایە لە هی پێنج شەش هەزار ساڵ لەمەوبەر، نەک لە سەرێکەوە بەڵکوو لە هەزار سەرەوە، ڕێی تێڕا ڕۆیشتنی ستەمکار و هەژاریش ئەو تاکە ڕێگەیەی بەر هەزاران ساڵ نەماوە... سەرچاوەی پێزانین و نەزان کردنیش بێئەژمار بوە... بەڵام دیسانەوە دەبوو بەپێی فەلسەفەی خەباتی چینایەتی مرۆی بەرهەمهێن پێبەپێی هۆشپژانی هەرگیز ڕێ نەدات بەرهەمهێنی چەوسێنەرەوە پەیدا بێت چونکە هەڵکشانی ڕێکاری ژیان بایی ئەوەی پێوەندیی هەبێ بە خەباتی چینایەتییەوە دەرسدەری ڕەنجدەرە وەک کە دەسدەری تەماعکارە. پەلەی ژیان و خۆویستی کە بزوێنی هەموو بوونەوەرێکی گیاندارە پتر هاندەری خۆ ڕزگار کردنی نێچیرە وەک لەوەی هاندەری ڕاوکەر بێت. هەمان موعادەلەی باسکراویش چ لە دێ بێت و چ لە شار بێت [دوای پەیدابوونی شار] باوە، بە تێبینی کردنی پەیدابوونی چینی ناوەند [کە دەزانین پەیدا بوە وەک حەقیقەتێکی مێژوویی نەک لە فتوحاتی بیردۆزیی خەباتی چینایەتییەوە پێک هاتوە یان بە ئێمە گەییشتوە] خۆ چینی ناوەندیش وەک هی ڕەنجدەر هەمان مەنتیقی وەرزێر و زەویداری بەملەوە دەبێ کە نەیەڵێ زۆرداری لێ پەیدا بێت...

خولاسە سەرلەبەری واقیعی مێژوویی کە بوە و بەسەر چوە و ئێستا ئێمە تێدا دەژین [من بەش بە حاڵی خۆم 77 ساڵ ژیاوم لە ڕۆژگاری بەسەرچوو...] دەبوو بەپێی تێڕادیتن لە تەووژمی «خەباتی چینایەتی» سەرلەبەری مێژوو جۆرێکی دیکە بێت... دەبوو فکرەی خەباتی چینایەتی لە پزدانی مێژوو نەڕسکێ...

هەڵبەت ئەو بڕیارە زەبەللاحانەی وا لە قەڵەمەکەوە هەڵدەوەرین گەردێکن لە مێژوویەکی بێچووی خەباتی چینایەتی نەک بە ئاسایی و بێ خەباتی زۆرینەی مرۆ دژی کەمینەی مرۆ بە تاڤگەی ژیاندا هاتبێتە خوار. ئنجا، ئەی خوێنەر، ئەگەر خەباتی چینایەتی حاکمی مێژووبایە نەک هەر چینەکان نەدەڕسکان، بەڵکوو نووسین سەری هەڵنەدەدا. سەرمایە و پارە و بانک و تیجارەت و هەزاران بەڵا و موسیبەتی وەک ئەوانیش لە پزدانی کۆمەڵایەتی مردەزاد دەبوون [چاکترە بڵێم مردەزاد نەدەبوون... نەدەڕسکان] مۆسیقای بەرز و پەیکەر و مەیکەر و قەسر و کەشتی و کەژاوەی بریقەدار و چی و چی نەدەهاتنە کایەوە چونکە نەدەشیا ژیانی

کۆمەڵایەتی چینێک بەرهەم بهێنێ دەوڵەمەندتر بێ لە چینی هەرە ژێر نەکا خوێنی خەڵک بمژێت... ئێمە دەبێ پشوو بدەین بە مێژوو خەوی لێ بکەوێت بۆ ماوەیەکی ئەوتۆ هاتوباتی چینە جوداکان و پارەداری و خوێنمشتن و فیزونازی ئەریستۆکراسی و قۆڕەدەماغیی شاعیر و هونەرمەندی و هونەرکاری و ئەو جۆرە پیشەی مێژووی ناپاک بە خۆی و هەموو زانست و تەکنیک و هەڵهێنان و دۆزینەوە و داهێنانی شێتانانەیەوە بکەونە پلانی خەساندنی وەرزێر و کرێکاری چەکوچ و داس...

ئەرێ ئەی هەموو ئادەمیزاد! ئەرێ ئەی تروسکەی هۆش! ئەی شەیدایانی حەقیقەت! ئەهریمەنانی پشت واقلواق! بە چاک و بەدیەوە! ئایا سەیرتر هەیە لەو حیکایەتەی پلانگێریی هەموو جیهانی ئادەمی دژی سۆفی بارامی وەرزێر و دەروێش مەولوودی کرێکار نەکا ڕزگار بن لە چەوسانەوە؟ من دنیا تەسک و تروسک دەکەمەوە هەتا ناکامیی پرۆلیتاریای تێدا زەق بنوێنێ بایی ئەو پایەیەی بۆ خەباتی چینایەتیی مێژوویی داندارەوە دەنا کارەساتی لەوە گەورەتر هێندە زۆرە نۆرە ناگاتە مەغدوورییەتی ڕەنجدەر پێوەی خەریک بین. وێڕای ئەو ڕاستییە تاڵەی کە پرۆلیتاریاش لە جغزی ئەو کارەساتانەدایە وەک حاڵەتی ئێستاکەی کوردی هەرێم یان خەڵکی ئەفغان و ناوەندی ئەفەریقا و کوێ و کوێ تێیدا دەژین...

لە بیرمە ساڵی 1959، کرێکارێک بە جاددە [جاددەی شاری کۆیە] دا دەهات بۆ لای بازاڕ بە دەنگی بەرز ئەم بەیتەی دەگوتەوە:

لەسەریان دە کەریم لە سەریان دە مەیانهێڵە
گەل و سپای مەزن لە خائینان دەپارێزی

مەبەستیشی پەڕاندنی کەللەی کوردی ناشیووعی بوو... چەند ساڵێکی دواتر ئەو خەباتگێڕە و هەزارانی وەک ئەو جێگە نەما خۆیانی تێدا بگرنەوە ئەو کوردستان نەبێ کە «خائینان» بەرگرییان لێ دەکرد. لەو تەرزە حاڵەتانەدا خەباتی چینایەتی بە ناچاری دەست بە دامەنی «خیانەت»ـەوە دەگرێت! دەک ماڵی شێوێ هێڕی و نەفامی، مێگەلی سەرشێواوان بەرەو چ هەڵدێرێک لێدەخوڕێت...؟!

ئەم گومڕاییە درێژەی ئەفسانەی خەباتی چینایەتیی بەر لە هەزاران ساڵە کە نەزەریە بە دەرسدان دەیخاتە مێشکی بەستەزمانێکی مێشک بەتاڵەوە کە بەبەریەوە هەیە لە ماوەی کورتدا جێگورکێ بکات و لە دوێنێی خۆی هەڵگەڕێتەوە. بە عادەت یان بە حوکمی مەنتیق سافیلکەی خواپەرست، یان هەر شتێکپەرست بێت، درەنگتر لە سافیلکەی دنیای دەست لە باوەڕەکەی بەر دەدات چونکە لە باوەڕی دینی تریفەی قودسییەت هەیە هەرچی فکرەی دنیاییە بە زەحمەتێکی دەرسدان و ڕاهێنان و تەما وەبەرنان دەنیشێتە دڵانەوە. دینداری بێ هاندان و بێ سوودی دنیایی، هەر لە ڕووانگەی باوەڕەکەوە، کە بە جۆرێک لە جۆرەکان سەر بەغەیبە، بەردەوامتر دەبێ لە سەر ئایینەکەی.

وردە تێبینییەک هەیە لێرەدا دەبێ ڕوون بکرێتەوە: باوەڕی سەربە ماددەش کە چەسپا لە دەروون بە ئاسانی ناشسرێتەوە ئیتر هەر جۆرە هۆیەک بێت لەو چەسپانەدا کاریگەر بووبێت. بەڵام و بەڵام باوەڕێکی ماددی مەزەی ڕق و کینی لەگەڵدا بێت پتر لە هی مام سەلامەتۆکە چنگاڵ لە ناخی مرۆ گیر دەکات تا ئەوەی لەناو بردنی ناحەزەکە کارێکی ڕەوا و بەولاتریش دەڕوات کە دەگاتە پلەی فەرمانی پیرۆز، بۆیەیە شۆڕشی سەرکەوتوو [بەتایبەتی لە کۆمەڵگەی دواکەوتوو] دەست ناپارێزێ لە کوشتن و ئیعدام کردن و چاو هەڵکۆڵین و ئەتک کردن... کرێکارەکەی «لە سەریان دە کەریم...» تاکێکی ئەو بابەتەیە...

ئێمە لە کێشەی ئافرەتەوە هاتین تا گەییشتینە ڕق و کینی «پیرۆز!» لەو ماوەیەشدا بە چەند قۆناغێکدا تێپەڕین بێ ئەوەی دەرفەت هەبێ بە درێژی و پڕ بە پێستی بابەت بە بەریەوە بنیشین لە ترسی زێدە خایاندن. دیتمان یاخود دیتم حاڵوباری ئافرەت لە چ ڕادەیەکی نالەبارە... دەمێنێتەوە لە خۆمان بپرسین: بۆچی ئافرەت پێوەی دیار نییە ناڕازی بێت؟ ئەو ئافرەتەی لە ڕێی سیاسەتەوە [بەتایبەتی لە ڕێی خەباتی چینایەتییەوە، یان لە دەمی کڵپەی سۆزی نیشتیمانپەروەرییەوە...] هێرش بۆ سەر ناحەزەکەی دەبات و دەکوژێت و دەشکوژرێت، بۆچی لە ئاست مافە ژێرپێ خراوەکانی بەدەست پیاوەوە ورتەی لەبەرەوە نایەت؟ هێندەی ئافرەت بردەباری مێردی دڕ و برای بێباک و لە خۆ گەورەتری چڵێس دەبێت و بە سەدان و هەزاران ساڵیش نافەرمانییان لێ ناکات، بە زاهیر، دەبوو لە ئاست تێکهەڵقژانی سەربە

چینایەتی و نەتەوایەتیش خەمسارد بێت یاخود ئەو ئازایەتییەی لە ئاست پیاوی بێگانەی دەنوێنێ لەسەر شتی کەمبایەخ لێی بەدەر نەکەوتایە. بەڵێ، دەزانین مەیلی «دایکایەتی» لە مێینەدا هێندە زاڵە لە هەموو زانێکدا بە ڕۆخی مەرگدا تێدەپەڕێت، واش دەبێ لە مەرگ ڕزگار نابێت، بەڵام دیسانەوە لە خەریکبوونی بە کاروباری خێزان و منداڵ بەخێو کردن و ئەرکی قورسی لێنان و شوشتن و خاوێنی و خزمەتی مێرد و وردە سەرێشەی بێکۆتایی بەڕێوە چوون، بە درێژایی دوانزە مانگەی ساڵ هەتا دەمی گەییشتنی بە لێوی قەبر، ئەو مافەی لێ ڕەوا دەبێ کە بە چاوی ڕێزەوە سەیری بکرێت و دڵێ ڕابگیرێت و قسەی ببیسترێت و بۆ کەیفی مێرد هەوێی بەسەر نەیەت...

خوێنەری بەڕێز! لە دەمێکەوە بیر دەکەمەوە [بە نووسینیش دەرمبڕیوە، ئەمما بە کورتی] لە واقیعی کۆمەڵایەتیی مرۆ و بارە نالەبارەکان و ڕەفتارە ڕەجاڵەکانی و گفتارە تفت و تاڵەکانی و کردارە گوناهبارەکانی کە بەشی هەرە زۆری ئاپۆرەی گەلە دواکەوتوەکانی تێیدا غەرق دەبن، لەو بیرکردنەوەمدا نەگەییشتوومە هۆکارێکی ئەوتۆ وەرامی هەموو پرسیارێک بداتەوە لە بارەی مرۆوە، بۆ وەها دەکات؟ بۆ وەهای نەکرد؟ چ بوو فڵانە مرۆی گێڕایەوە لە ئەنجامدا دانی ئەو بڕیارەی سوێندی لەسەر خواردبوو؟ بۆچی لەسەر غەدرێکی گەورە بەدەنگ نەهات کەچی لەسەر قسەیەکی خوێڕوو دەستی دایە خەنجەر؟ یەکێکی کوشت؟ تۆ لە وەکالەتی من باری وەها بە بیری خۆتدا بهێنە لە حاڵەتی مرۆ کەوا بە هیچ پێوانە و کێشانەیەکی ئاسایی ناکەوێت وەک کە ڕەفتاری جانەوەر بێ مێشک گوشین و فەلسەفە خەرج کردن بۆ بەرچاوی هەرزەکاریش مەفهوومە. جارەها لەگەڵ خۆمدا گوتوومە و دەڵێمەوە بەشێکی زەق و زۆپی کردەوەی ئادەمی هۆی ئاشکرای لەگەڵدا نییە، هەر دەڵێی کاریگەری نهێنی و نابەرچاو هەیە پەنجەی گەنجێکی قۆزی دەوڵەمەند دەباتە سەر پەلەپیتکەی دەمانچە و کەللەی خۆی پێ دەپرژێنێ[48].

---

[48]- بەر لە حەفت سەعات بە دەم وتووێژێکی سێ لایییەوە، لە زەمینەی ئەم باوەڕەوە گوتم: کێ بڕوا دەکات بە موعادەلەیەکی بڵێ: مارلین مۆنرۆ + شۆرەت + جوانی + گەنجایەتی + سامان = خۆکوژی؟ [سەعات چواری پاش نیوەشەوی ڕەمەزانی 1997 ز].

من لە نووسینی ئەم باسانە بووم برادەرێکم چەند کتێبێکی هێنا بیانخوێنمەوە یەکێکیان تەرجەمەی عەرەبیی کتێبێکی کۆلن ویلسن بوو لە ژێر سەرناوی «طفیلیات العقل». لەم کتێبەدا کە شکڵ وتووێژی یەکلاییە نووسەر هەمان ئەندێشەی من دەدرکێنێ کە چۆن گەلێک ڕووداو هەن هۆی ئاشکرایان نیە بەڵام لە قاڵبێکی [وابزانم] خەیاڵی دەڵێ: ئەو «طفیلیات...»ە کە نادیترین مرۆ بەرەو ڕەفتاری ئەوتۆوە دەبەن نایاتە حیسابی هۆش و مەنتیقەوە.

ئێمە دەزانین وەها بوە کاری زێدە گرنگ لە هۆیەکی ناچیز ڕووی داوە بەڵام ئاغڵەب ڕووداوی ئەوتۆیی هۆیەکی زانراوی هەیە وەک ڕووداوەکە لە کەسێکی «گرنگ» ەوە سەری هەڵدابێت. ئیتر تووڕەبوونی مرۆی ئەوتۆ ئەگەر لەسەر توولە و تاژیش بێت دەشێ بکێشێتەوە بۆ کوشتن و برین. بەهەمەحاڵ دیاردەی بە ڕواڵەت بێ هۆی نامەئلووف لە جۆری خەونی ڕاست و پێشبینی و دوورەسۆسە و حالاتی یووگا و جۆرەهای هەستی ئەوتۆ لە گوماندا نین و بەشێکیان بوونەتە جێی باوەڕی زانست تا ئەوەی ڕووسیای بۆلشەڤیکی مەلحید دوای ئینکار کردنیان بای دایەوە سەر خەریکبوون پێیانەوە بەڵام دیارەی ڕەفتاری نامەئلووفی بێ سەبەبی ئاشکرا و پەردەپۆش لە مرۆوە [ڕەنگە لە جانەوەریشەوە هەبێت] جودایە لەمانە چونکە ئەمیان بێ هاندەری بەرژەوەند وەیا لە ئاکامی هەڕەشە وەیا لە ناچاری وەیا لە فەرمانی بیروباوەڕەوە سواری ئیرادەی مرۆکە دەبێت و تێدا زەرەرمەند دەبێت وەیا، بابڵێین، بێلزوم غەیری خۆی زەرەرمەند دەکات. لەوانەیشە ئەرکێکی بێئاکام، نە بە چاک نە بە خراپ، لەو ڕەفتار و گفتار و کردارەو پەیدا نەبێت بۆ غەیری و گۆیا بەفرە و بەگەرما دەتوێتەو و نەبوو دەبێت.

حاڵەتی ئەوتۆ هەیە، لە «ئۆگرگرتن» بە عادەتێکەوە وەیا گرفتاربوونی مەراقێکی ڕەگداکوتاو، ڕوو دەدات ناشێ یەکسەر لە عەینی مرۆکەو دەرچێت: عادەت و مەراقەکە لە ماوەی پاش چەسپانیان دەزێنەوە بە مەراقی لە خۆیان سەیرتر: مرۆم دیتوە کە لایەکی لە دەمی ڕۆیشتن بە کۆڵاندا بە دیوار کەوتبایە دەبوو بیەڕێتەوە بۆ ئەوبەری کۆڵانەکە لایەنەکەی تری بەربکەوێت... یەکێکی دیکە فێر بوو پەیتا پەیتا

بزۆتی ناو ئاگردانی زستانەی تێک دەکردنەوە و جێ گۆڕکێی پێ دەکردن بە نیازی چاکتر سووتانیان. ئەگەر دەستیان گرتبایە، بە شان و بە چاو و بە سەر بزۆتەکانی دەخستنەوە سەر یەکتر و ڕێکی دەخستن... گەلێک لە نوێژکەران سەبەب بە زێدە خەریکبوون بە دروستایی دەستنوێژەکە و بە نوتقی دروستی ئایەتەکان بە زەحمەت و بە ئەرک لە هەردووکیان دەبوونەوە. من یەکێکی ئەوتۆم دیتوە، لە مەلابانگدانی بەیانی تا نزیکی ڕۆژهەڵات خەریکی دەستنوێژ بوە بەتایبەتی «مسح» ی مووی...

هەزاران هەزار حاڵەتی ئەوتۆیی لە دەوروبەری کۆمەڵەی مرۆڤ خەلەل بە بەرژەوەند و بە ژیانی کامەران و بە حەسانەوەی خەڵک دەگەیەنێ چ پێوەندییەکی نییە بەو لایەنە گرنگانەی گوزەران کە مرۆ ناچارە خۆی بۆ تەرخان بکات... مەراقی کۆتربازی وەها بوە سەری ناوە بە تەنگوچەڵەمەی ژیان و بە نارەحەتی خەڵکی دەوروبەر... سەیرترین حاڵەتێکی دیترابێت لەو جۆرەی پێوەی خەریکم بینووسم ئەوەیە کە هەندی کەس چی کردوویەتی و گوتوەتی بە ڕۆژ لە دەمی خەودا دووبارەی کردۆتەوە بە مەرجێک کەوتبێتە سەرپشت تا ئەوەی شتی ئەوتۆ دووبارە کراوەتەوە، کوردی گوتەنی، سەربەقوڕ دەهێنێتە پێکەنین...

وردە حیسابی ئەوتۆیی کە دەزانم کەس خۆی پێ مەشغوول ناکات، یاخود ژمارەیەکی زێدە زێدە کەم خەریکی دەبێ، بەڵگەی خەمساردیی ئاپۆرەی خەڵکە کە:

1- بەرپرسانی سیاسەت و خەبات پێیان وایە خەریکبوون بەو جۆرە لایەنەی بێبایەخی حالاتی ئەوتۆوە بریتییە لە خەساربوونی ئەرک و کات

2- زۆربەی ڕۆشنبیران گوێی نادەنێ مەگەر ئەو پسۆڕانەی لە مرۆ دەکۆڵنەوە

3- خەڵکی کووچە و بازاڕ نازانێ بیر بۆ ئەو لایەنە ببات...

بەلای منەوە تاقمی سیاسەت، بەتایبەتی خەباتگێڕی دڵگەرم، دەبێ لە بەرنامەیدا هەبێ سەرێک لە دەرەوە و هەناوی «مرۆ» خوار بکاتەوە و نەختێکی تێڕابمێنێت و خۆی ئاشناتر بکات بە «سروشت»ی مرۆ! وا لەم چەند دێڕەی ژێرەوە دوو

دیاردەی زێدە بەرچاوو و بەرهۆش بە عەرزی خوێنەر دەگەیەنم کە دەزانم ژمارەیەکی کەم نەبێ لە ئادەمی بە خەیاڵیدا نایەت، خەیاڵیش بۆی بچێت بەهەندی هەڵناگرێت:

یەکەمیان ئەوەیە کە مرۆ تەماشای رووی خۆی دەکات لە ئاوێنە بیر لەوە ناکاتەوە کە ئەو وێنەیەی دەیبینێت روە حەقیقییەکەی نییە چونکە لای راستی لەشی دەبێتە لای چەپی وێنەی، چەپیشی لە ئاوێنەدا دەبێتە راست، ئنجا هیچ کامێک لەو ئەندامانەی کە جووت بن، وەک چاو، برۆ، گوێ... وەکوو یەکتر نین... یەکێک تەماشای وێنەی خۆی و برادەرەکەی بکات وادەزانێ وێنەی خۆی دروست و هی هاورێکەی نا، چونکە جوداوازیی نێوان شکڵ و وێنەی هاورێکەی دەبینێت و هی خۆی نا...

دومیان ئەوەیە لە حیسابی مانگی هیجری کە دەگوترێ یەکی «رەمەزان» یا «صفر» یا «ذوالحجە»یە لە حەقیقەتدا دووی مانگە چونکە رۆژی پێشوو مانگی نوێ بوو بەڵام لەبەر باریکی مانگەکە و شەوقی رۆژ نەدەشیا بدیترێ هەتا لای ئێوارە. وابوە لەبەر هەور نەدیتاوە ئیتر سبەی ئێوارە بە شەوی یەکەمی مانگ دراوەتە قەڵەم کەچی هی دوەمە، سبەی کە بە یەکی مانگ دادەنرێ راستییەکەی سێی مانگە. واشبوە خزمێکی خۆم سبەینەی جەژنی رەمەزانی لە هەڵەجەی نزیک هەولێر بەسەر بردوە. دوای پڵاوی جەژن بەرێ کەوتوە بۆ کۆیێ، کە ئێوارە دەگاتە شار دەبینێ کۆیێ بەرۆژوە. سبەی دەوم پڵاوی جەژن لە کۆیێ دەخوات و دەروا بۆ بێتواتە دەبینێ جارێ بێتواتە بەرۆژوە. سێیەم پڵاوی جەژن نۆشی گیانی دەکات.

لێرەدا مەبەستم دیاردەی سەری مانگی هیجری بوو کە هەمیشە دوەم رۆژیەتی ئەگەر سێیەمی نەبێ. بەڵام هەر لە پەنا ئەم مەتەڵە یەکێکی دیکەی سەیرتر هەیە کە حاڵەتی زاناکانی ئیسلام بە دەست دەقی شەرعی کۆن چەند دوورە لە مەنتیق کە دیتنی مانگ مەرجە لە بۆ سەرەتای مانگی هیجری، کە لە 29 مانگ نەدیترا دەبێ 30 رۆژە تەواو بکرێت کەچی لە هەموو دنیادا زانراوە دەرچوونی مانگ لە «محاق» بەپێی زانستی فەلەک بە ثانیە مەعلوومە و دەزاندرێ بەسەر چ وڵاتێکەوە و چ نوختەیەکیەوە تیشکی رۆژی لێ بەر دەکەوێت. ئەمما هەر چونکە ئایەت باسی

دیتنی مانگ دەکات ئەو عیلمە یەقینەی لە هەزار چاوی بینەران ڕاستتر و دروستترە پاشگەز دەبێتەوە.

ڕێکەوتێکی بەختەوەرانەیە کە لە ئایەتی سەربە حەج باسی حوشتر و وڵاغی تر نەهاتوە بۆ کەسانی لە دوورەوە دێن بۆ کەعبە دەنا ئەویش دەبوە فەرز (فرض)، نە گەرۆک نە فرۆک نە کەشتی بە هانای کەس نەدەهات... باڵە ساختەکانی «عباس بن فرناس» یش نەکەوتە گەڕ حاجی پێ بحەسێتەوە... خۆ لە ڕاستیدا کابرا نەیویست بفڕێت، هەر هێندەی کرد بە هۆی باڵی دروستکراو لە بانەوە بۆ سەر زەوی دابەزێت. بەداخەوە کلێنجەی لەسەر دانا!

لە موناسەبەدا دەڵێم باوکم لە شایەدی دیتنی مانگ ئافرەتی وەک پیاو حیساب دەکرد چونکە دەیگوت لێرەدا هێزی دیتن حیسابە نەک لە بیرچوون کە لە ئایەتدا هاتوە دوو ئافرەت بە شایەدێک دادەنرێت تا ئەگەر یەکێکیان شتێکی لە بیر کرد ئەوەی تریان بیری بخاتەوە «فَتُذَكِّرَ إِحْدَاهُمَا الأُخْرَى». لە مەلایانی زێدە پێشڕۆی زەمانی خۆی ابن تیمیە [ئەگەر هەڵەم نەکردبێ] ڕێی بە قاضی داوە ئافرەتێک بە پیاوێک حیساب بکات، مادەم لێی مەعلوومە بیر کردنەوەی عادەتییە. دەڵێ: ئەم زێدە مەرجەی شەریعەت بۆ سەلامەتیی حوکم بوە نەک بەشێکە لە عەقیدە، کە قازی دڵنیا بوو دەتوانێ ئافرەتێک بە شایەدێک قبووڵ بکات.

لێرەدا هەرچەند کەمێک دوور دەکەومەوە لە ڕچەی وتوویژەکەمان بەڵام بە چاکی دەزانم بڵێم: دەقی هەر شتێکی سەربە حەقیقەتەوە بێ کە بوو بە دۆگما لەوانەیە ببێتە لەمپەر، دەشبێتە لەمپەڕ چونکە دنیا لەسەر هەلومەرجی زەمانی دەقەکە کورک نابێت، بەناچاری حاڵوبار دەگۆڕێن ئیتر یا دەبێ دەقەکان بگۆڕێن [هەرنەبێ تەعدیل بکرێن] یاخود دەبێ کۆمەڵایەتی بوەستێ. چ لە چەپ بێت چ لە ڕاست دەقی شەختەکردوو دوژمنی گۆڕانی بەرەو پێشەوەیە. بەداخەوە، صەد جاران بەداخەوە، پێڕەوانی دەقی دۆگماکەیان پتر لە مرۆی بێلایەن و بێسەودا سڕ و شەختەکردوو دەردەچن لە ئاست وشاری فراژووتنی کۆمەڵایەتی و نهێندۆزیی زانستەکانی و ئامێرە سیحراوییەکان کە دەستیان لە بنیادەم ستاندوە. ئەم شەختە کردنەش نموونەی ئاووسبوونی مەراق و ئۆگر گرتن بە باوەڕ و ڕەوشتەوەی تێدایە. لە نموونەدا دەڵێم کوردی سەربە چەپ و هەموو میللەتێکی دواکەوتووی وەک ئەو

شیرگیرەتر- لەسەر عیبادەتی ستالین و پەرستنی ئینتەرناشناڵ و دۆگما کۆنەکانی بەر لە هەرەسی سۆڤێتستان. هۆی هەرە سەرەکیش ئەوەیە، لە ئیفلاسی دنیایی کوردستان و کورد سەرەپەتکێکی چنگ ناکەوێت بیخافڵێنێ و دڵی بداتەوە: ئەو بەدبەختە ڕێی گەڕانەوەی بۆ کوردستان لەسەر خۆی داخستوە، یاخود لەخۆوە داخراوە لێی، وەک شایەری کورد گوتەنی: ئەو کچە لەو ماڵە وەعدی داوە پێم، دەرکی دەروازەی داخراوە لێم...

حاڵەتی ئەوتۆ کە ئیفلاسی زەخیرەی دەروونیی پێوە بێت و چ خۆشییەکی تێری و تەسەلیشی لەگەڵدا نەبێت نیوە مردن حیساب دەکرێت. کوردێکی شیووعی لە حاڵەتێکدا وەک کوردێکی نیشتیمانپەرست حیساب دەکرێ: کە وەک کوردەکەی بۆ کوردستان بە شانازییەوە دەمرێت ئەویش بۆ ئینتەرناشینال بمردایە. نموونەیەکی ناوداری ئەو جۆرە شیووعییە لە کتێبی *«کفاح واستشهاد البطل السوفيتي الكردي فيودور ليتكن»* نووسینی بوری سالنیکوف و وەرگێڕانی بۆ سەر کوردی لەلایەن باقی نازێ، ساڵژمێری دەرچوونی 1978 لەلایەن «الاعلام المركزي للپارتي الديموقراطي الكردي اليساري»[49] دەخوێنیتەوە کە بوو بە قوربانیی شەڕەکانی شۆڕشی بەلشەڤیکی ئۆکتۆبەر، لە سیبیریادا، دوور دوور لە کاولگەی گوندەکەی خۆی لە هەرێمی قەفقاس... تابڵێی شاعیرێکی شیرننەفەسە و تابشڵێی قوتابیی قاڵبوویەوەی بیروڕاکانی لینینە و چەندێکی بشتەوێ زێرەک و کۆڵنەدەر و خاوێن بوە. من بۆی بە پەرۆشم بەڵام داخم ناچێ لە تەرازووی بەرژەوەندی نەتەوایەتییدا لە هەموو ڕوویەکەوە دەستبەتاڵە چونکە شۆڕشی ئۆکتۆبەر ڕۆژێک لە ڕۆژان مەرحەبای لە نەتەوەی کورد نەکردوە نە لە سەردەمی لیتکین خۆی و نە دواتر هەتا هەرەسی سۆڤیەت.

---

[49]- خوزی ڕووپەڕەی دوایینی کتێبەکە (مەبەس کتێبەکەی سەربە فیودور لیتکینە) بە سپێیەتی مابایەوە نەک بەم جۆرە وشەی وەها زەهراوی و عەیبدار خۆی ڕووت کردبایەوە کە دەڵێ: «حين سقطت القيادة الكردية البرجوازية في مستنقع العمالة للمخابرات الامريكية و نظام الشاه...» کتێبەکە لە سەرەتای 1978 دەرچوە، دیارە مەبەستی لە چی و کێیە... بەداخەوە.

من گلەییم نییە لە ڕووس چونکە نە وەکیلی کوردە و نە قەرزدارە و نە بەڵێنی داوە. ئەوەندەم لە دڵدایە بڵێم نەدەبوو سۆڤیێتی سەردەمی لینین لایەنی ئەتاتورک بگرێت دژی کورد، تا ئەگەر بگوترێ بۆلشەڤیزم دەترسا لەوەی دەوڵەتێکی کوردی لەتەک تورکیاوە بڕسکێ دەبێتە داروەکازی ئینگلیز ئیتر حەقی هەیە دژی بوەستێت منیش لەو هەڵوەستەی سۆڤیێتستان مافی بۆرە گلەییم هەیە کە دۆستی بکوژەکەم بێت... دواتریش ستالین مەهاباد بەرەڵڵا بکات بۆ ڕقوکینی ڕەگەزپەرستانەی ئاریامیهر. ئنجا دەمێنێتەوە بڵێم گروگاڵی نەفامانەی کوردێکی وەکوو من لە ئاست دەریا دەریای نووسین و گوتن و نیشاندانی میلۆنەهای ڕووس لە بابەتی بێدەسەڵاتی و بێکەسی و بێدەرەتانیی قازی محەمەد و هاوڕێ شەهیدەکانیەتی، خۆ سایەی ئەمەکدارەکانی شیووعیی کورد بۆ ئنیتەرناشینال هەمیشە جانفیدایی ئەوان بۆ شیووعییەتی جیهان گوناهی ڕەخنەکانی من دەسڕێتەوە... ئەگەر هەموو جارانیش لە ڕەخنەکانمدا ڕاستیم نەپێکابێت هەرگیز بەلای بێئینسافی و دوژمنایەتی سۆڤیێتستانەوە نەچووم. ئەوەی «إلى العظيم گورباچیف» و دوو بەشەکەی «پیریسترویکا گورباچیف» ی خوێندبێتەوە لە نووسینی من دەزانی چەند پەرۆشدار بووم بۆ سەرکەوتنی لەو هەوڵەی دەیدا...

خوێنەر، لەم سەرگورشتەی لیتکین و ئەنجامی خەباتی بۆلشەڤیرم کە بەر لەوەی هەرەس بهێنێ بووبوە داردەستی ستالین و بریژنێڤ و دەسەڵاتدارانی حیزب و حکومەت، شەبەنگی لیتکین دەهێنمە بەرچاوم کە لەودیوی جیهانی زیندوان بە چاوی فرمێسک تێدا قەتیس ماو دەنوارێتە ڕەنجی بەفیڕۆدراو و ئاواتی وشکبووی و عومری بابردووی خۆی و خەیاڵاتی گوڵگوڵیی شۆڕشی ڕەشهەڵگەڕاو و میللەتە کوردەکەی بەهیچ حیساب نەکراوە یەک تروسکەی داد و یەک گەشەی ئومێد و یەک هێمای بەڵێنەکانی بەدی ناکات، بە هەردوو دەستان لە کەللەی خۆی ڕادەکێشیت و بە هاوار دەنگ هەڵدێنێ: وەی ماڵی کاولم... وەی کۆستی کەوتووم... وەی سەد کاشکی بە ڕەشەتایەک لە سەرانگوێلکی گوندەکەی کوردستانم دەمردم و دەنێژرام...!

ئەم وێنەیە و هەرچی نووسیومە و دەینووسم و تۆ و غەیری تۆ دەیڵێن و دەینووسن دەنگدانەوەی و ڕەنگدانەوەی دەوروبەری مرۆ و دەسکردی خوازی

خۆیەتی بە چاک و خراپییەوە چ بە مێشکی داخراو و چ بە فیکری مووقلاشی بێت. ئیمکان نییە دڵ و دین و باوەڕ و مرۆڤایەتی و چوونە ئاسمان و شەپڵتەخۆری لە چەکوچ و داس و خەڕەک و تەشیەوە کەوتبێتە کۆشی واقیع... ناشێ بە حوکمی تەیارە و کەشتی و گەڕۆک و بەردەقانی و تیروکەمان مرۆیەکی کوردی سەربە چەپ دەماری کشت بێت بە خوێندنەوەی ئەو دێڕانە، مرۆیەکی دیکەی کوردی بێ چەپ و ڕاست گوێی پێ نەبزوێت، یەکێکی دیکەی سەربە قەومایەتی ئافەرینی لێ بکێشێت هەمووشیان لەیەک ڕێکاری ئابووری تەنگەتاو دەژین و لە یەک پلەی خوێندن و یەک ئاووهەوا هەناسە هەڵدێنن... کوردێکی سەربە دینیش سڵای لێ هەڵدەستێ کە بزانێ کابرایەک لەبەر خوێندەوەی ئەم وتووێژە یەکلاییە نوێژی شێوانی چوە...

خوێنەری ئازیز!

کەسێکی بیەوێت لە جیهانی ماددی و جیهانی سەربە کۆمەڵایەتی [کە درێژەی بەرەژوورچوونی جیهانی گیانلەبەرە] بگات لە سەریەتی بە خوێندن و خوێندەوە و وردبوونەوەی چەندەها ساڵ، وێرای تەجرەبەی ئانقەست و ڕێکەوت، خەریتەیەکی سەرلەبەری بوونەوەری هەبێت لە مێشکیدا هەموو کەرت و برگە و ورد و درشتی لەگەڵ یەکتردا گونجاو بن و هیچ بەشێکی ناجۆر نەبێ لەگەڵ هیچ بەشێکی تری چ دوور بێ چ نێزیک، بە تەواوی وەکوو لەشی گیانلەبەران کە هەموو ئەندامەکانی هاودەنگ و هاوکاری یەکترن. ئنجا دەبێ باداتەوە سەر وردە حیساباتی «کۆمەڵ = مرۆ، تاک و گشتی» کە کاریگەری هۆشەکەی و ئیرادەیەکی دڵخوازی ئەو هۆشەی [بە ئازادی یان بە دیلی، بە ترساوی، بە پارە...] لە هەموو جیهانی دەرەوەی مرۆدا پەیدا نییە، زۆر بە قووڵی... یەکجار بە وردی... تا دەتوانێ بە ئازادی... بێ کۆمە کردن و بێ لایەنگیری شارەزای مرۆی تەنها و مرۆی کۆمەڵایەتی بێت... سیفەتی فرشتەیی و ئەهریمەنیی تێدا بدۆزێتەوە... نەخۆشییە نەفسییەکانی و خوە درەخشانەکانی و دەوری غەریزە بە تێکەڵبوونیەوە لەگەڵ ئیرادەی هۆشداری... مەیلی بۆ درۆ... عیشقی بۆ ڕاستی... کەتنی هێزی زایەند... دەوری زانست و

هونەر و ئیبداع لە تاکەکانی هەڵکەوتووی... سڕی و داماوی و داوەستاویی میلۆنەها...

خولاسە چەندێکی بۆی بکرێت ئاشنای تەبیات و کاریگەرەکانی و کەموکورتییەکانی و جۆری هەڵکردنی لەگەڵ غەیر... لەگەڵ ئاژەڵ... لەگەڵ باران و ڕەهێڵ و ئەستێرەی ئاسمان بێت و لە ئاشنایەتییەکەی زیاد بکات، چەندێکی زیادیشی بکات کەمە، تا دەگاتە ئەو پلەیەی شارەزایی لە مرۆ کە دەشوبهێتە شارەزایی دامەزان و شەترەنجزانی مەعلان و ناو دەرکردوو کە هەموو سووچ و سەروبەرێکی یارییەکەی لە بەرچاوە و داشەکانی یەک یەک بۆ ئۆینی ئۆستادانە ڕام کردوە [لە چاو بابای کەمزان و ناشی لە یارییەکە کە هەست بە نەزانیی خۆی ناکات] ئیتر کە کەوتە بەر پرسیاری چۆنیەتی نیشتەجێ کردنی کۆچەران وەیا ڕاکێشانی دڵی خەلق بۆ پرۆژەیەکی ئابووری، کشتوکاڵی، تیجارەتی... دانەمێنێ، یاخود بەسەر باسی دواکەوتوویی کورد... سوودان داکەوت چاوی ئەبڵق نەبێ... پێویستە لە خۆی بکاتە ئایین و باوەڕ کە کێشەی هەر ئێشکالێکی سەربە مرۆ بێت کۆمەڵێک ئەسبابی تێکهەڵکێشی تێیدا بەشدارە نەک تەنها: بەدیی خەڵک یان تەماعی بۆرجوازی یان شەیتانیی کوێخادێ یان بەرتیلخۆریی قائیمقام و حاکم یان دەستوەشاندنی جنۆکە...

کە گوترا هەژاریی خەڵک بریتییە لە زێدە تەماحی بۆرجوازی و بەس دەبێ بەبیریدا بێت ئەگەر هەموو بۆرجوازییەکانی بە خۆیان و پارەیان بسووتێندرێن هەژار تێر نابێت... یەکێکی لە سەری زمانییەوە بڵێ من ئیشتراکیم بێ ئەوەی وڵاتەکەی 200-300 ساڵێکی لە سێبەری ژیار و دیمۆکراسی ڕانەبواردبێ و ژێرخانی پتەوی نەبێ، فەرموودەکەی تاوانبارییە چونکە ئیشتراکییەت ئارەزۆ و کەیف نییە وەک جلک لەبەر بکرێت. دەتوانێ ناوی خۆی، دینی خۆی، مەفتەنی خۆی بگۆڕێ بێ ئەوەی لە مرۆڤایەتییەکەی کەم بێتەوە بەڵام هەروەک لە تەمەنی هەشت ساڵیدا پیاو ناتوانێ ژن بهێنێت وەیا ببێتە وەزیر هەروەهاش ئیشتراکییەت لە فراژووتنی بۆرجوازیەتی پێ دەگات، خۆ داوای شیووعییەت هەر بەجارێ جەهالەتە بۆ کورد و بلووچ و ئەفغانییەکی خۆی پێ هەڵداتەوە. دیتمان ڕووسیا بەدەست ئیشتراکیەتەوە بە کوێ گەییشت... بیستم هەیکەلی لینین لە شاری لینینگراد «پەترۆگراد» دابەزێنرا...

دەگەڕێمەوە بۆ قسەکەم: ڕۆشنبیر بەو مەرجەی نیگافرەوانی و قووڵی ڕۆچوون و بێترس و بێلایەنی دەشێ ڕابەری سیاسەت بێت، بە تێبینیی لایەنی ئامادەیی و وەستایی لە هونەری ڕابەریدا... ڕاستییەکەی ئەو مەرجە پشتگوێ ناخرێ لە هەرچی چالاکییەکی مرۆی تێدا بەرپرس بێت. مەبەستم ئەوەیە بڵێم وێرای درێژیی تێبینییەکانم کە هەمووی بەلای خۆمەوە پێویستن بۆ کەسێکی پێی بگوترێ ڕۆشنبیر، مەهارەتی مامەڵە کردن لەگەڵ خەڵکی سەربە سیاسەت و خەبات و ئاپۆرەی ڕەشوڕووت و ئەهلی بازاڕ لە پێویست پتر پێویستە. کە ناڵێم شارەزای مامەڵەی پیاوماقووڵان بێت، کە ئەویش هەر پێویستە، لەبەر خاتر ڕاگرتنی ئەو خوێنەرانەیە کە حەز لە چارەی ماقووڵان ناکەن... ماقووڵیش، جارێ، زەرەرمەند نییە لەو بارەی تێیدا دەژین بێ مەرجەبای ڕۆشنبیری کەمدەسەڵات...

خوێنەری ئازیز: بۆ دواجار دەڵێم ئامادە کردنی خەریتەی باسکراو بۆ جیهانی سروشت و جیهانی زیندەوەر و مرۆ مەرجی هەرە بنەڕەتییە بۆ نازناوی: ڕۆشنبیر، ئنجا ڕابەری سیاسی و خەباتگێر... ئەگەر نوسخەیەکی سپیپات بوویەوەی ئەو خەریتەیە لە چاو نیوە خەواڵوەکانی سەدەها ملیۆن شەیدای تۆپێنێ و «ڕۆک-ئەند-ڕۆڵ» نەخشبەستووبایە، بێگومان، بەدەم باوەشکەوە خەیاڵێکی خاوی بۆ لای دواڕۆژ و چارەنووسی مرۆڤایەتی دەچۆوە. مخابنە، گژڵێکی مەیلەو شارەزایانە لە فوتبۆڵەوانێکی ناو دەرکردوو دڵ و هەناوی ملیۆنەها گەنج و کامڵ و ڕیش ماشوبرنج و قژ بۆزبوویەوە بهێنێتە حاڵەتی جەزبەی دەروێشی، کەچی تەزووی پێدا نایەت بۆ حاڵوباری نالەباری هەموو جیهان... بۆ مەرگی سەدان هەزار قوربانیی شەڕ و برسییەتی و بێدادی... تۆ بڵێ ملیۆنەها! و بەولاتریش! دەسا سوێند بە شەرەفی ئەم قسانەم دەخۆم خانمێکی شیکپۆش توولە ڕوحپەرەکەی خۆی بەلاوە ئەفریقا و ئاسیا دەهێنێ... سەد جار خۆی قوربانی توولەکەی بێت.

دوور لە دڵگەرمی دەڵێم، هەرچەند لە واقیعی بەردەستدا، ڕەنگە من لە زوربەی خوێنەران پتر چووبێتم بۆ بنج و بناوانی دیارەی وەها بە سفتۆسۆ، هەرنەبێ لەبەر خوو گرتنم بە وردبوونەوە لە حاڵەتی ئادەمیزاد، هەر لە مولحیدەوە هەتا فەنافیللاکەی... هەر لە فەیلەسووفیەوە هەتا هێڕ و کەودەنەکەی... هەر لە داگیرکەریەوە هەتا داگیرکراوەکەی... هەر لە منداڵیەوە هەتا پیری ڕۆخ لێوی

گۆڕەکەی، ئیتر دەشێ من لە مرۆی بێمەراقی ئەوتۆیی نزیکتر بوومەتەوە لە هۆی بێباکی و بیئەندێشەیی خانمی شکیپۆش و شێتوویتی شەیدای شەقی تۆپێنێ! دیسانەوە خۆم پێ ناگیرێ لە پەرۆش بۆ خەمساردیی کەسانێکی ئیمکانی خەمخۆرییان لە من و تۆ پتر هەیە. چ قەیدێ دەکا کە خانم بۆ خاتری سەلامەتیی قاچی سەگەکەی کە ئاودز بووبێ چەکی سپی بۆ پزیشک ئیمزا بکات، ئەگەر بە دڵیدا بێت هەتیوێکی نەخۆش چارەسەر بکات... برسییەک تێر بکات: گوتم بە دڵیدا بێت نەک خوانەخواستە ئەرکەکە بە ملەوە بگرێت... لە قسەکەشم پەشیمان نیم، بەزەیی بۆ مرۆی تەنگەتاو چاکترە لە بێبەزەیی، بێبەزەیش سەلامەتترە لە ئازاردان. دەگەمە ئەوەی بڵێم مازۆخی بەشەرەفترە لە سادی!

ئەگەر نیگای مرۆی عادەتی بۆ ئەم وردە حیسابانە بانەدرێتەوە کە دەزانین ژیانی ملیارەها ئادەمیزادی عادەتی بریتییە لە خەرمانی ئەو بۆرە وردیلانە، گەلێک هەل و دەرفەتی پێکەوە هەڵکردنی ئادەمانە و ژیرانە لە دەست دەچێت، زۆر جارانیش تێکهەڵقژانی بێلزوم بەتووشەوە دەبێت. ئەوەی ڕاستی بێ مرۆی هەوراز، مرۆی عادەتیش، لە هەست نە کردن بەو وردیلانە ڕاهاتووی کەمتەرخەمی دەبێت لە کاری بایەخدار و لە ئاست هەڵگری بەپرسایەتی، چ لە سیاسەت چ لە ژیانی نێو خێزانی چ لە ڕەفتاری سەربە کۆمەڵایەتی بێت.

دەبێ بزانین ئێمەی نەداری دەسەڵاتی فەرمان و تێراخوڕین کە بەلای کەمەوە 70% ی سەرژماری نەتەوە دەبین هەر ئەوەندە هەستی هێز و دەسەڵات دەکەین کە خاوەن دەسەڵات کاری پێمان دەبێ. لەتەک ڕووداوی گرنگی شۆڕش و جەنگ و فیداکاری و شاڵاو و هەڵاتنیش خاوەنی 1/1000 ی هیچ شتێک نین [دەشێ لە بیری خۆت ببەیتەوە کە شەڕ و شۆڕش عەیارەی ڕەفتار و کردار بن چونکە حاڵەتی هەمیشەی نین. ئیجا ئەگەر هەمیشەییش بن هەر بە جارێ مەودا نادەن بە تۆ و من ناڕازی بین یان خاوەن بیروڕای...] ئیتر دەمێنێتەوە ئەو کاروباری وردیلە کە هەوڵ بدەین حەسایەوە بین لە سێبەریدا.

بەڵێ دەزانم، تۆش دەزانیت، ڕووداوی زەبەللاحی وەک شەڕ و شۆڕش دەسکردی زلهێز و خاوەن بڕیاری سیاسەتی ئاشتی و شۆڕشە... دەشزانم لەگەڵ بێدەسەڵاتیمان، بگرە لەبەر ئەو بێدەسەڵاتییە، پێمان ناکرێ لە ئاگری بەدور بین [لە

حالەتی باری ئێستاکەی کوردستانەکەمان، 20-1-1997 ز. خۆمان بەشێکین لە ئاگرەکە] پێشمان نەدەکرا مەنعی بکەین مەنعیش کرابایە لایەنێکی دیکەی ناکورد سواری ئیرادەمان دەبوو...

ئیتر کە ئەمە حاڵمان بێت لزوم نامێنێ بە بێباکی لەتەک یەکتردا نەختێک ناڕاحەتی بخەینە بان ئەرکە پشتشکێنەکە وەک کە مرۆی دیندار دوو ڕەکعەت سوننەت دەخاتە سەر جوار ڕەکعەتی نوێژ. جا ئەگەر بگوترێ ئەو درێژەدانە لە کاری وەها بێبایەخ چ سوودێکی هەیە بەرانبەر هەڕەشەی زلی وەک شەڕ و ڕووداوی زێدە گرنگی وەک شۆڕش و چارەنووسی مرۆ و بەرەوپێشچوونی مرۆڤایەتی، دەڵێم: ڕەخنەی ئەرتۆییش چ دەردان تیمار ناکات. نەک ئەوەندە و بەس، کەسێک ئاخنابێت بە گرمە و لرمەی کاری زل کە بە زۆری لە ئاکامی خەسڵەت و کردەوەی نائادەمانە ڕوویان داوە هۆیەکیش لە هۆیەکانی ڕووداویان بایەخ نەدان بوە بە وردیلەکانی ناوەڕۆکی ژیانی ئاپۆرەی خەڵک، ئائەو کەسە لە هیچ ڕوویێکەوە بەکەڵکی ئادەمی نایەت. خۆ لە مەیدانی ڕابەرایەتیی بزووتنەوەی سیاسی، کە شۆڕش لووتکەی سیاسەتە، هەر بەجارێ قومارباز دەبێت. قوڕبەسەر ئەو خەڵکەش لە مرۆی ئەوتۆیی دوولینگە بەسەر ملیاندا بهێنێت چونکە بە هەموو مەزهەبان دوورە لە ئازار و ئەندێشەی بێدەسەڵاتان. ئەو عیفریتانەی دەبن بە سەرۆکی شۆڕش و دەوڵەت و ڕابەری سیاسی لەو تەرزانەن نووزەی نەخۆش نابیەن!

بەداخەوە نموونەی ئەو عیفریتانە لە جیهانی سێیەم زۆرن... گوێش نادەنە شەپۆری تازیەی شەهیدی جوانەمەرگ... ئێستا بەسەر قسەیەکی زلدا دەکەوم: ئەو نەتەوانەی لە گۆمی بێسەودای و نەزانی و ئەفسانە و هەستی سڕ مەلە دەکەن، هەرچەندە لە کۆتایی سەدەی بیستەم دەژیێن بەڵام وەها پشتەوگاز بوونەوە لە ژیاری سەردەم خزمایەتییان نەماوە لەگەڵ نەتەوە پێشکەوتوەکان... تاران لە ڕووناکیی زانستی نوێ، تا ئەوەی دەتوانم بێ کۆمە کردن بڵێم، لەوە دەرچوون پێیان بگوترێ «نەخۆش» چونکە بەڕاستی خۆیان نەخۆشین واتە گرفتاری خۆیانن نەک تا و لەرز یان زگێشە و زوکام...

هەتا جیهانی پێشکەوتوو هێندە پێش نەکەوتبوو لە ئاسۆی دیار ئاودیو بێن و لەبەر چاوان نەمێنن، زمانێکی مامناوەنجی هەبوو پێشکەوتوو و پاشکەتوو لێکتر تێبگەن.

وا گەیشتینە دەورانێک دەبێ تەرجومانێک هەبێ لەبەیندا قسەی هەردوولا تەرجەمە بکات، تەرجومانیش پەیدا نییە. خۆ ئەوەی ڕاستی بێ. زانست و هونەرێکی کەوتە ئەودیوی ئاسۆی پێی دەچنە ئاسمان ناشێ تەرجەمە بکرێ بە زمانێک ئاپۆرەی بێسەواد و نیوەخوێندەواری پێ حاڵی بکرێت لە حاڵێکدا بەشێکی زانستە بەرزەکان بە کۆمپیوتەر شەرح دەدرێت.

دەڵێن بەر لە صەد ساڵێک ئاغایەکی کوردی سەر سنووری کوردستانی عێراق [ئەوسا هی عوسمانلی بوو] چوە سەردانی حاکمێکی ئێران... ناوەکەی پرسی و ئەزبەری کرد. کە چوە ژووری حاکمەکە گوتی: چۆنی موزەککەرەگەورە؟ تومەز ناوی «مظفر الدولة» بوو... حاکمەکە بەخێر هێنا بە وشەی «مەرحەبا»، ئاغا گوتی حەبام لە بیر کرد دەنا بێ حەبا نەدەهاتم... بڕوا دەکەم ئەم زمانەی سڵاو و خۆشامەدی گەلێک گەلێک ئاشناترە بۆ بەر گوێی ئاخێوەر و بیسەر هەرچەند لە یەکتریش نەگەن، لەچاو نەبوونی زمانی ئاخاوتن لە نێوان کۆمپیوتەر و مرۆی بێسەواد.

لێرەدا تێبینییەکی ڕارەویم بە دڵدا دێت نەختێک دڵدەرەوەیە بۆ دەروێشی هۆی بەرهەم کە دەبینین کۆمپیوتەری ئالەت لە دروستکەری ئالەتەکە وردپێوتر و بێهەڵەتر و لە زوربەی حاڵدا بێ یارمەتی لەوەوە، مرۆکە پەککەوتەیە بەڵام چ فایدە! ئاخ و سەد داخ لەبەر دوو خاڵی ئێسکقورس و بێئابڕوو: یەکێکیان ئەوەیە کە مرۆ خۆی ئالەتەکەی دروست کردوە. دوەمیان ئەوەیە کە ئالەتەکە سەکەت دەبێ مرۆ چاکی دەکاتەوە، خاڵێکی دیکەی بێشەرمیش سەرقوت دەکاتەوە و دەڵێ، مرۆ بە ئالەتی ئاخر مۆدێلیش ڕازی نییە، خەریکی هی چاکترە... بە دەست خۆم نییە مەتەڵۆکەکم بەبیردا دێت لەگەڵ گەشتی بەرەوپێشچوونی زانست مەیلەو خزمە. دەڵێن جارێکیان مانگ گیرا، کابرایەکی سافیلکەی ناو شاخ و کێوان گوتی: ماڵی شێوێ سبەینان لەو سەری دەیگوت قوت، ئێواران قوت، هەر قوتەقوتی بوو! زانیم بەڵایەکی بەسەر دێ... مرۆش خەریکی قوتەقوتی پێشخستنی ئامێرەکانیەتی، دەترسێم ڕۆژێک لە ڕۆژان لێی هەڵگەڕێنەوە و پەلکێشی بکەن بۆ پۆلیسخانە... ڕەنگە ئالەتەکان نان و ئاوی بۆ ببەنە بەندیخانە!!

یەکێک لەو یارمەتیدەرانەی مرۆ بۆ ئاسان کردنی ڕاپەڕاندنی کاروباری گوزەران، لە دەمێکی زۆر کۆنەوە، بەدیی کردنی هاوچوونبوونی هەندێ ئەرکە کە دەشێ تاکەکەس تێکیان ببەستێت و بە جارێک لێیان ڕەها بێت یاخود هەندێ ئەرک دەشێ کۆمەڵ تێیدا بەشدار بێت. ئەویش دوو جۆرە: یەکیان کاری سەختە بە تاکەکەس ناکرێ. یەکی تریان کاری دەوامەدارە[50] [وەک دروێنە] کە ئەگەر هەر کەسە لەلای خویەوە مل لێ بنێ سەر دەکێشێتەوە بۆ نارێکیی هەوڵی تێکراپان. ئیتر کەوتنە سەر باری هاریکاری. ڕاستییەکەی گیانی هاریکاری وزەی ڕەنجدەر فرەتر دەکات تا ئەوەی بەتەنهایی خەریک دەبێت. بێگومان تێبینی کردنی جوداوازیی «ڕەشەوڵاغ-گا» لە «خوردەماڵ - مەڕ و بزن»، گاوانی جودا کردەوە لە شوان. هەروەها ئێستر و بەرزە و کەری کرد بە ڕەوە وەک کە گاڕان و مێگەل هەر یەکەیان سەربەخۆ بوون. باوەڕ دەکەم ئەم ڕێکخستنەی وا سەرەتای لە دەورانی هەرە کۆنی «کۆمەڵایەتی» و لەگەڵ پەیدابوونی گوند [با بڵێین سێ چوار ماڵ] خۆی سەپاندوە و تا ئێستاش لە وڵاتی دواکەوتوو، تارادەیەک، دەستوورە.

ئەم ناچارییەی بۆ بەڕێوەچوون کە درووێنەی کۆمەڵی سەپاند و گا و یەکسم و خوردەماڵی لێکتر جودا کردنەوە، زووتریش بە ماوەیەکی کورت، گوندی ئافراند [نموونەی دیکە زۆرن لەم بابەتە. لزوم نابینم درێژە بە ئەژماریان بدەم - ئەگەر بە دیاردەی «ژن و مێردایەتی» بە مارە و تەلاق و بێ مارە و تەلاقەوە خەریک بین ڕەنگە بە ئەرکی وەڕەسکەر لێی بە کۆتایی بگەین، یان نەگەین...] خەستبوونەوەی گۆڕانکاییەکی مرۆڤانەی بەرەوپێشچوون و لێکترازانی لە خێزانی چمپانزی و گۆرێللا... کە بەپێی کتێبی *Peking Man* *«مرۆڤی پەکین»*- لە بڵاوکراوەکانی پارتی کۆمیونیستی چینە، ساڵی 1975 دەرچوە- بەر لە بیست ملیۆن ساڵێکەوە لە کاردایە [لاپەڕە22 ی کتێبەکە]. بەڵام کتێبەکە ڕادەگەیەنێ کە بەر لە چل هەزار ساڵێک مرۆ بوو بە خاوەن «ئادگار» (ملامح) و خاسیەتەکانی ئەمرۆکەی و بەر لە

---

[50]- دەوامەدار جوودایە لە «هەمیشەیی».

دەهەزار ساڵێکیش تیروکەوان و تەپکە و ڕمب و قولابە ئێسکی ڕاوەماسیی بەکار هێناوە.[51]

ئەم دیاردەیەی داسەپانی هاریکاری و تێکبەستنی ئەرکی هاوچوون بەرهەمی سەلیقەیەکی سروشتییە بە شێوەیەکی ڕێکتر لە هێندێ شێوەی هاریکاریی نێوان بەشێک لە جانەوەراندا. خۆ ئەگەر مرۆی بەر لە چل هەزار ساڵ و پێشتر و دواتریش ئەو ڕێگەیەی هاریکاری و ڕێکوپێکیی هەوڵدانی نەگرتبایە بەر دەچزوە ڕیزی گۆریللا دەشبوە بەڵگەی نەبوونی «هۆش» [دەزانم ئەگەر هۆش نەبوایە ڕێی ئەو قسەیەم نەدەهات باسی بەڵگە بکەم، قەڵەمیش پەیدا نەدەبوو بەسەر کاغەزەوە نەخشی نووسین بکات، کاغەز و نووسینیش نەدەبوون...] سەرەڕای ئەم ڕاستییە، دیاردەکە، ڕاستییەکی دیکەش دەسەپێنێ کە بەرەوپێشچوون و بەردەوامبوونی مرۆ لە مەیدانی پەلەی ژیان بەند بوە بەو هاریکارییە: نەدەشیا مرۆ وەک ڕێوی و کەروێشک خۆی و ژنێک ژیان بەسەر ببەن و منداڵ بەخێو بکەن کە گەورەبوون لە خۆیانیان بکەنەوە وەک کە جانەوەری زاوزێکەر بەچکەکانیان دەرەتێنن.

بەڵێ دەزانین دوای قەوغابوونی کۆمەڵگەی مرۆ و پەیدابوونی مامەڵەت و سوود و زەرەر کێبەرکێ کەوتە نێوان خەڵکەوە بۆ زێدە پاروو. بەڵام دیسانەوە گیانی هاریکاری یاردەدەری گەشەی ژیان بوە: ئەگەر مونافەسە و تەناقوز و یەکتر خواردن بناغەی شەخسییەتی مرۆ بوایە کۆمەڵگە و کۆمەڵایەتی لە ڕەحمی ڕۆژگار نەدەڕسکا، بەو مانایەی کە وەکوو ڕێوی و هەرس و پڵنگ ماوەی بەردەوامبوونی نەوعیان ئاشکرایە مرۆ ئەو دەرفەتەی نەدەبوو هەرنەبێ لەبەر پێستی نەرم و بێتووکی کە بەرگەی چەنبۆڵەی دڕندە ناگرێت... دەمێنێتەوە هۆشەکەی: ئا ئەو هۆشەی نەتوانێ بۆ مەبەستی هەوڵی مانەوە و پەلەی ژیان مرۆ بخاتە سەر ڕێبازی

---

[51]- من موناقەشەی مەودای نێوان چل هەزار و دە هەزار ساڵ ناکەم بۆ ڕەواندنەوەی تەگەرەیەکی زلی پێویستبوونی سی هەزار ساڵ بۆ گەیشتنی مرۆی تەواو مرۆ. بە قۆناغی تەپکەنانەوە: ئنجا لە ماوەی کەمتر لە پێنج هەزار ساڵدا گەیشتبێ بە ژیاری میسر و سۆمەر بە خۆیان و نووسین و... و... یانەوە. هەرچۆنێک بێت کتێبەکە ویستوویەتی بۆ لایەنە ڕاستییە سەلمێنراوەکانی مێژوو لەگەڵ تێکڕای بیروباوەڕی زانستەکیی سەردەم بێت...

هاریکاری و پێکەوە ژیان و بەردەوامبوونی نەسلەکەی چ بایەخێکی دەمێنێ لە زەمینەی خۆ دەرباز کردن بەرانبەر کەڵبە و چەنبۆڵە و هێز و چوستیی دڕندەکان!

تا ڕۆژگاری سەردەم، کە من لە چەند ڕۆژێکدا هێندێک لاپەڕە ڕەش دەکەمەوە چارەنووسی بنیادەم بەندە و بەند دەبێ بە هاریکاری و ڕێککەوتن و لێکتر ڕاوەستان و بەزەیی و داد و ئازادی، کە ئەمانە هەمووی کەرەستەی سەرەتایی ژیانی ئاسایی و سافیلکەیە، کۆسپی هەرە زلی بەر هەنگاوی تێکڕای مرۆ بەوەدا هەموار ناکرێت خەڵکی کووچە و بازاڕ و ئەفەندی و توجاڕ و میلیاردێر و عەمەلە و وەرزێر لە ڕۆژی جەژندا قۆڵی یەکتر ماچ بکەن و «عەییامی شەریفت لێ موبارەک بێ» ڕاماڵی بناگوێی یەکتر بکەن چونکە هەڕەشەی کوشندە و قڕتێخەری مرۆ، وەکوو عیفریتی ناو گومگمە، وا لە سمینی توێژی ئۆزۆن و تەقینەوەی بۆمبای نەوەوی... و چەکی بەرەو پێشترچووی دواڕۆژدایە.

زۆر بە سەیری، ڕۆشنبیرە ماددیەکان کە تایان دێتێ لە خەیاڵی مەغدوورییەتی کرێکار و وەرزێر بەدەست پارەدار و مڵکدارەوە [خۆ منیش و غەیری منیش هەوڵ دەدەین و دەدەن ڕەنجدەر بە مافی ڕەوای خۆی بگات ▪ مەعنەوی بێت و چ ماددی] ئەمما هیچ پەروای نەبوو. ڕەنگە ئێستاش نەیبێ، لە خۆش کردنی ئاگری نێوان جیهانی سەرمایە و ئیشتراکیەت لەگەڵ هەبوونی شیمانەی گۆڕانی شەڕی تەقلیدی بە ئاتۆمی و نەوەوی، خۆ ئەگەر شەڕەکە لە سنووری تەقلیدیشدا هەڵگیرسابایە هەر پێویست بوو هەوڵی مەنع کردنی بدرێت ئەمما نەک لە ڕێی بزووتنەوەی ئاشتیخوازییە بێناوەڕۆکەکەی کە بریتی بوو لە نازوفیزێکی شانۆگەرییانە و ڕاکێشانی مرۆی سافیلکە بۆ بەهەشتی کەمدەرامەدی ئیشتیراکییەتی سۆڤیتستان و ڕاکێشانی بۆ بەشداری کردنی لە پێدا هەڵگوتن بە سیاسەتی سۆڤێت دژی ڕۆژاوا. دواتریش دەچوو هەموو گەلانی ئەورووپای ڕۆژهەڵات خەفەکراو و دەستبەستراوی ڕووسیای میراتگری قەیسەرەکانن ئیتر لە دەرفەتدا بە کۆمەڵ لەو بەهەشتە بێ درەخت و حورییە دەرچوون بۆ جەهەندەمی سەربەخۆیی!!

کەسێکی لە خوێنەران سەریشی بە «إلى العظيم غورباتشوف» و دوو بەرگەکەی «بیریسترویکا غورباتشوف» دا گرتبێت دەزانێ من چەند بە پەرۆشم بۆ سەرکەوتنی ئەو کابرایە [دەبێ بڵێم «بە پەرۆش بووم»]- واشدەزانم ئەو ڕەخنانەی

لێم گرتوە لە چوونەوەی بۆ لینین و ئیشتیراکییەت کە گۆیا چاری تەنگوچەڵەمەی ڕووسیا دەکەن، لە حاڵێکدا تەنگوچەڵەمەکە هی ناواقیعیەتیی ڕاڕەوەکەیانە. ڕێم دەدا بڵێم ئەگەر ئەو سیاسەتەی گرتبایە کە لەو نووسینەدا بەباشم زانیوە زەرەرەکەی کەم دەکردەوە، هەرچەندە دەزانم چی نووسیومە نەگەیشتۆتە ئەو، چ جایی خوێندبێتییەوە. [دەزانم سەفارەتی سۆفێت لە بەغدا «إلى العظيم...» ی تەرجەمە کرد بۆ ڕووسی و هەناردی بۆ وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ڕووسیا، بەو حاڵیش نایەتە دڵمەوە سەری پێدا گرتبێ. لەوانەبوو ئەگەر «محمد حسنين هيكل» نووسەر بایە بە مجیزەوەی دەرس کردبایە...].

ئەو مەیلەی «هاریکاری» و «ڕێکخستن» لەلایەن مرۆی بەر لە دەیان هەزار ساڵ کە جارێ ملکداری و پاشەکەوت کردن و چەوساندنەوە پەیدا نەبووبوو لە هەموو قۆناغەکانی دواتر تا ئیمرۆکەش بەردەوامە و هێندەی ئەوساش، بگرە پتر لەوسا، پێویستترە چونکە لە ڕەوتی هەزاران ساڵەی بەرەوپێشچوونی مرۆ، بە هەموو باری لەبار و نالەبارییەوە... بەو قەوغای ملیارەهای... بە هەزاران زمان و دین و نەرێت و خواروژووری پلەی ژیاریەوە کە مێشک لە نێوان ڕامانیان هێر دەبێت، جۆرەها بێژمار لە دەرد و تەگوچەڵەمە و هەڕەشە و قاتوقڕی و شەڕ و نەزانی و گەمژەڵی پەیتا پەیتا لە زیاد کردندان کە چ پێوەندییان نەماوە بە سادەیی و تەنکی و کەمژمارەیی دەردی کۆنەمرۆی بەر لە هەزاران ساڵی ڕابردوەوە ئنجا کە ڕابمێنیت لەو چارەسەر کردنانەی دژ بە یەکتر کە ڕابەرانی بیروباوەڕی تیژڕۆ بەکاری دەهێنن لە ملانێی یەکتر بەزاندن بۆ پێکهێنانی «بەختیاری» و ئاسوودەیی هەر ئەوەندەت بۆ دەمێنێتەوە دەستەوەژنۆ ڕاقەنێیت و شیوەن بۆ مرۆڤایەتی بکەیت چونکە، بەڕاستی و پاتەوپات، دیمەنەکە هاواریەتی کە دەردەکە بێدەرمانە، یاخود جارێکی دیکەش بڵێمەوە، مرۆڤەکە خۆی بۆتە دەرد!!

ئنجا ئەگەر ئەم ڕەشبینییەش [کە واقیعبینییەکی بێ مەرایییە] بپێچینەوە و کۆمەڵگەیەکی ژیر و کارمەران بکەین بە عەیارە دیسانەوە ناچارە بۆ ڕاپەڕاندنی جۆرەها چالاکیی پێویست دەست توند بکات لە «هاریکاری و ڕێکخستن» و تێیدا ڕژدبێت نەک خەمسارد، ئیتر دەبێ کەسانی کارامە پەیدا بکات بۆ گێڕانی مەکینەی دەوڵەت و کۆمەڵ هەر لە سەرۆکەوە هەتا دەگاتە زبڵڕێژ. حاڵەتەکەش بەردەوام و

ناچاری دەبێ تا ئەو ڕۆژگارەی مرۆ دەگاتە پلەیەک لە بەرەوپێشچوون ئالەت تێیدا فەرمانی سەرشانی مرۆ دەبینێت. ئالەت بڕیار دەدا لە دادگە... ئالەت چێشت لێ دەنێت... ئالەت هاتووچۆی ناو شەقامان ڕێک دەیەخێت... ئالەت ئەندازەی ساختمان دەگرێت بەپێی مەبەست.ـ ئالەت تەنسازیت تاقی دەکاتەوە... هتد.

پێی ناوێ بڵێم، لەو پلەی وا بەرزدا تاوان و نافەرمانی و قۆرەدەماغی بەسەر خەڵکەوە و لە یاسا دەرچوون بنەبڕ کراوە دەنا دنیاکە دەبێتە دنیای بەدکار و دەروون نەخۆشان. بێگومان، ئەگەر دەروونمان نەخۆش نەبێ وەیا لە ڕێی لاساری وەیا پەرۆش بۆ «شۆڕشگێڕێ!!» و خستنەگەڕی شەڕی چینایەتی (و قرتێخستنی چینی نارەنجدەر و داهێنەر جوانکاری و زانستی ناپرۆلیتار) ەوە نەبێ هەر کۆمەڵگەیەکی لە تەمەنی «هەرزەکاریی سیاسی» تێپەڕێنێ بە خۆی ڕەوا نابینێت شەڕە چەپەڵۆک بکاتە یاسای چارەسەر کردنی کێشەی «مافی مرۆ». هەڵبەت جیهانەکەی خۆمان، هی سێیەم... دوای بیست... جارێ ماویەتی بە خەیاڵیدا بێت شتێک هەیە بۆ تیماری بڕینان پێی دەڵێن «مەسڵەتی» و تێکگەییشتن. وا تازەبەتازە بادەدەینەوە سەر خەفە کردنی ئافرەت لە «حریم» دا، بە زەبری چەقۆ و دەمانچە و نارنجۆک!

جا ئەگەر قسەمان ڕووبەڕووی مرۆی عادەتی بێت حەقمانە، بگرە لەسەرمانە، بڵێین فەرقێکی ئەوتۆ نییە لە نێوان چارەسەریی «بڕینکاری»و چارەسەریی «دەردەکانی کۆمەڵایەتی». هەرچی تەجرەبەی زێدە ئاشکرا و بەرچاو هەیە لە ماوەی سەد ساڵی ڕابردوودا دەسەلمێنێ کە کوشتن و بڕین و توندی و نەڕەنەڕ هەرگیزاو هەرگیز نەپەرژاوە و ناشپەرژێ «نان و حەسانەوە» بەرهەم بێنێ.

بەداخەوە خەباتگێڕانی کاری دنیایی بارتەقای موجاهیدانی ڕێی قیامەت هەموو کاری نارەوای خەفە کردن و ڕێی تەسک کردنەوە لە ڕووی مرۆی ناپرۆلیتار، تا ئێستاش، هەر بەچاک دەزانن. بابای سەربە باوەڕی ژیانەوەی دوای مەرگ، لە باوەڕدا، بەهەشتی داناوە بە پاداشتی موجاهید و جەهەنەمیش بۆ غەیرەدین. هەرچی بابای دنیایی سەربە سیاسەتە، چەنداوەکوو تەجرەبە نیشان دەدات کە بەرنامەی کوشتن و بڕین بەختەوەریی نەزاوەتەوە، تا ئێستاش سوورە لەسەر قاڵ کردنەوەی گەل بۆ چینی پرۆلیتاریا. لەوەشدا بەشێکی فەلسەفەکەی بریتییە لە

پەرۆش بۆ ڕابردووی خۆی کە ئەگەر توندوتیژی و شەڕی چینایەتی نەمێنێ ڕووت دەبێتەوە چونکە زوربەی تیژڕۆیەکان مرۆی عادەتی و پرشنگنەدارن، ئەگەر زمانیان لە هەرەشە ڕاوەستی ئیفلاس دەکەن. ئەو شایەدییەشیان بۆ دەدەم کە لە نێوان تیژڕۆیە عادەتییەکاندا ژمارەیەکی زۆر بە دڵ دەکۆشان و زەرەرمەند دەبوون [و دەشکوژران].

تەنها لە تەجرەبەی شیووعیی عیراق کە فەهد ئیعدام کرا و حێزبەکە لەبەر یەک هەڵوەشا زۆر کەسی چالاک و ناچالاکیان ڕمان... وا دەزانم کاسبوونی ئەندامانی حیزب لەو تەجرەبەیەی یەکەم نوشوستیی وەها گرنگ، کە پێشتر نەیاندیتبوو، ورەی پێ بەردان... دەبێ بڵێم یەکێک لەوانەی دوای هەرەسەکە و عەزابەکە و چەکمەسەرییەکە خۆی گرت کەریم ئەحمەد بوو کە دەستی دایە کەرەستەی عەمەلەیی و ملی نایە خۆژیاندن...

ئەم قسانەی سەربە توندوتیژی و خەباتی خوێناویی چینی پرۆلیتاریا کە دەورانی بەسەر چوە لە وڵاتی پێشکەوتوو، لەتەک باری سیاسیی کوردەوە هەر بەجارێ و لە هەموو ڕەوەوە، وەک چالاکییەکی سیاسی، قسەکان جێیان نابێتەوە و بێگانەن، ئەوەندە نەبێ کە بەسەر زاراندا دێن وەک کە حیکایەتی ئەرسەلان شەوی زستانی پێ ڕادەبوێردرا بێ ئەوەی کەس بەتامای شتێکی نرخدار بێ لێی. خاکی کوردستان لەتلەت و پەتپەت و میللەتە هەژارەکەی بێدەرەتانی و دیلیی 2500 ساڵەیی تاکە یەک مەرجی ئەو خەباتە چینایەتییەی لێ پەیدا نییە کە لە نەزەریەدا خەباتەکەی پێ ڕەوا دەبێت [زانیشمان وڵاتی پێشکەوتوو، لەگەڵ هەبوونی مەرجەهای نەزەریە، خەباتی خوێناوی ڕەش کردوە].

چەندی بمەوێ لە کاولگەی کوردستان سەرەداوێک بدۆزمەوە خەیاڵی ئیشتیراکییەت و شیووعییەتی پێوە لێدەم بۆم نالوێ. دامنا مەرجی «شۆڕش» لە خەباتی چینایەتیی کوردستان ڕەش کرایەوە و ڕێگەی هێمنی و یاسایی گرتە بەر، ئا ئەو خەباتە دەست بۆچی درێژ دەکات لە سەروەت و دارایی و ژێرخان و پیشەسازی و زانست و تەکنیک و چی و چی کە ناویشیان نازانم، تاکوو نییەتی میللی کردنی «تأمیم»ی لێ بهێنێ مەگەر بەو نییەتە کە بۆ نوێژ و ڕۆژوو بە زار و دڵاندا دێت و هیچی تێناچێت و سەلکە سیرێکی ڕزیویشی لێ بەرهەم نایەت.

ئنجا تەگەرەی مەیلەو بەگزادانە دێتە پێش کە بریتییە لە نەبوونی حکومەتێکی کوردیی سنووردار و خاوەن یاسا، شیووعییەت وەیا ناشیووعییەت وەیا گەپی منداڵانەی تێدا بخرێتە کار، دەمێنێتەوە شیووعیی کورد لە پەنا و پەسێوی دڵە دۆڕاوەکەی بۆ ئینتەرناشناڵ تارمایی ئومێدێکی پووچەڵی بە تێکبەستنی خەباتی کورد بە خەباتی پرۆلیتاریای حکومەتی بێگانەی کوردەوە، بە دڵدا بێت و مێشەکزە لە لووتی کورد دەرکات تا ڕۆژی مرادان، بە خێر و سلامەت، ئینتەرناشناڵ سەرلەنوێ گەشە دەکاتەوە... «بزن شیردا بۆ داپیردا، داپیر کلکەقوڵەی وێ دا...» دەسا سوێندی لەسەر بێت بزنیش شیری بدا و ئینتەرناشناڵیش گەشە بکاتەوە شیووعیەتی، حکومەتانی حاکم بەسەر کوردەوە ڕازی نابن کورد دەنگ هەڵبێنێ بۆ مافی خۆی...

لە «ماف» دەگەڕێم: ئەو جۆرە شیووعییەتەی وڵاتی چاوبرسی، سکبرسی، هەموو ئەندامێک برسی، نایەڵێ شیووعییەتی کورد دەسەڵاتی هەبێت بوێرێ بڵێ کوردم و شیووعیم... سەیریشت بەم قسەیەم نەیەت چونکە کوردە شیووعییەکە بەر لە دەیان ساڵ «کوردایەتی» ی تاوانبار دەکرد نەکا یەکیەتیی بزووتنەوەی ڕەنجدەران لەو وڵاتانەی کوردی تێدا دەژیت کەرتک بێت، یەکێکیش لە ئەدەبییاتی شیووعییەت ئەوەبوو کە «ڕەنجدەر بێ نیشتمانە». زۆر بەسەیری، بابای چەپخواز کورد و نەتەوە زلە حاکمەکەی بەسەر کوردەوەی بە برا دادەنا کەچی کورد و کورد نابێ برابن لەبەر جوداوازیی چینایەتی، خۆ نەتەوە زلەکەش فرەچین بوو کەچی شیووعیی کورد بۆ حیسابی کوردەکە دڵی چینی سەرووی نەتەوە زلەکەی نەدەیەشاند هەر چونکە بەلایەوە بیری نیشتیمانپەروەری تەرەشقۆی سەرمایەدارییە، کوردیش بە مەفهوومی سەردەم، جارێ، سەرمایە تێدا پەیدا نەبوە. وەی کە دۆگما چ گاڵتەیەک بە هۆشی مرۆ دەکات!

خوێنەری ئازیز! لە بارەی ناوەرۆک و سروشتی تەناقوزەوە، کە بەلای چەپڕۆ بزوێنی ژیان و ژیارە، حیکایەت بە کۆتایی ناگات چونکە تابڵێی جۆری فرەژمارە و فرەبابەتی هەیە. لە ماددەی مردوودا تەناقوز نییە تا ئەوەی جیهانیش سەرەوبن بێت هەر بە ڕووداوێکی ئاسایی و بە حوکمی ناچاری دەژمێردرێت و زەرەر و قازانجی تێدا ڕەچاو ناکرێت مومکینیش نییە بوەستێندرێت مادەم هۆی کاریگەری

ئەوتۆ هەبێت سەرەوبنبوونەکە داسەپێنێ، وەک کە نووسیمان «2*3+8-6/2=...» دەبێ ژمارە «11» بخەینە بەتاڵاییەکەوە...

لە جیهانی گیانلەبەراندا حیسابەکە و مەنتیقەکە دەگۆڕێت بەوەدا کە بەشی هەرە زۆر گیانلەبەری بێهۆش بریتییە لە «خۆرا» و «خۆراک»: هەرچی گۆشتخۆرە بە لەشی زیندەوەر دەژیت، ئیتر سوود و زەرەر دەردەکەوێت و لێ ڕزگاربوونیشی نییە: لەمیاندا تەناقوز هێندەی نوێژی نیوەڕۆ ئاشکرایە... تەناقوزی نێوان گیا و گیاخۆر تا ئەو ڕادەیە دڕ نییە چونکە ڕوەک دەژێتەوە، تەنانەت ئەگەر گیا و پەلک نەشخورێن لە خۆوە زەرد هەڵدەگەڕێن و وشک دەبن.

مرۆ بارێکی تایبەت بە خۆی هەیە لە کێشەی تەناقوز: چ لە ئاست ماددەی مردوو بێت چ لە ئاست زیندەوەر بێت لەگەڵ هێندێکیان لە تەناقوزدایە... وا دەبێ ماددە جارێکیان سوودبەخش و جارێکیان زەرەربەخش دەبێ بۆ مرۆ وەک ئاگر یان باران و با... هتد. دەمێنێتەوە مرۆ، چ تاکی ▪ کۆمەڵی، قسەی لێوە بکرێت لە گۆشەنیگای بوون و نەبوونی تەناقوز لە نێوانیاندا: ئەگەر بتوانین مەیلی تایبەتی بەلاوە بنێین و هۆش و گۆشێکی نەختێک بەبڕشت بکەینە بەریوان دوو کاریگەری سەرەکی و بنەڕەتی لە مرۆدا، یان لە کۆمەڵایەتیی مرۆدا، بەدی دەکەین کەوا ناشێ دەمەتەقەی لەسەر هەڵستێ. کاریگەریی یەکەم کە شیرازەی ڕستەی کۆمەڵگەی مرۆ دەتەنێتەوە ئەو هاریکاری و پێکەوە هەڵکردنەیە کە ئەگەر پوایەوە مرۆ دەچێتە ڕیزی مەیموونەوە.

هەڵبەت مرۆ کە ئۆگری بە «هاوژیانی» ی سەربە کۆمەڵایەتی گرت نەهات لە ڕاگوزەری میرخاسی و فرشتەئاکارییەوە بۆ ئەم ئامانجە نەشمیلانە و ئادەمانەوە بڕوات، ڕابەری «پەلەی ژیان»... پەلەکوتکەی بەردەوامبوون... ترسی برانەوە... فەرمانی ناچاری خستییە سەر ئەو ڕەوتە پەسەندە. لە بیرمە، کە منداڵی سەرەتاکانی خوێندنی مەکتەب بووم لە مامۆستای دەرسێک لە دەرسەکان

دەمبیست «الانسان مدني بالطبع - مرۆ بە سروشت شارستانییە»[52]، دواتر کە کەوتمە سەر لێکدانەوە و کێشانە و پێوانەی ژێربێژییەوە بۆم دەرکەوت کە «مرۆ بە ڕاهاتن و بەپێی بەرژەوەند شارستانییە» واتە مەیلی بۆ «هاوژیان» وەک مەیلی بۆ «زایەند» نییە کە ناچاری و سروشتییە. بەڵگەش لەسەر ئەم گوتەیە لەبەر دەستدایە: ئەگەر مرۆ سروشتەکی شارستانی بوایە خەریک نەدەبوو بە کاری ئەوتۆوە بیباتە پلەی گورگ،گورگی چی! بۆمبای ئاتۆمی دروست نەدەکرد... شایەدی درۆی نەدەدا لەسەر بێتاوان ملی بە پەتەوە بکرێت... خەرمانی هەژارانی نەدەسووتاند بۆ دابین کردنی مەیلێکی بێژۆک... بۆ مەرحەبایەکی لووتەلایانەی ستەمکارێک بێتاوانێکی نەدەکوشت.

ئەم نموونانە دەمانگەیەنێ بە خاڵی دوەم کاریگەر: ئەمیان بریتییە لە هاندەرێکی سروشتی هەرە بنەڕەتی و بەردەوامی مرۆ کە تێیدا هاوبەشە لەگەڵ هەموو گیانداران، ئەویش خەسڵەتی «خۆویستی»یە. بەڕاستی، لە سەرەتاوە پەیدابوونی کۆمەڵ و ژیانی هاریکاریی مرۆ لەو ماکەی خۆویستییەوە ڕسکاوە نەک لە ماکی جانفیدایی و تەبیاتی پاڵەوانانە.

ماکی خۆویستی، خۆپەرستی بە درێژایی ڕۆژگار و لە هەموو وڵاتێک و کەسێک لە کاردا بوە، لەوەشدا شوێن پەنجەی خۆپەرستی تەمغە بوە لە هەرچی چاکوبەدی ئاکار و کرداری مرۆیە. لە نموونەدا دەڵێم: کە مرۆ بۆ مەعشووقەکەی دەگاتە سنووری خۆکوژی، بەڕاستی، هاندەر مەیلی زێدە بەهێزی عیشقەکەی دڵی بۆ یارەکەی بوو، بە بەڵگەی ئەوەی کە لێی تێر بوو، یان ئاگری هەناوی دامرکا، بە تەنبەڵییەوە دەچێتە ژوانی زۆریش نابا لێی بێخەم دەبێ... بە هەمان گەرمییەوە تەڵاقیشی دەدات!

ئەم کاریگەرەی خۆویستی، زۆر بە سەیری، بنەمای زوربەی هەرە زۆری تەناقوزی نێوان ئادەمیزادە: خۆویستی لەلایەکەوە دەیخاتە سەر باری هاریکاری لەگەڵ غەیر

---

[52]- وام دێتە بیر کە لە پۆلی چواری سەرەتایی، دەرسێک بە ناوی «أشیاء» دەخوێندرا. ئەم دەرسە سەرەتای خوێندنی عەرەبیمان بوو جگە لە دەرسی «قراءة» کە لە پۆلی دووەمەوە دەستی پێ دەکرا.

هەتا بە گەلەکۆیی بتوانن بەردەوام بن. لەلایەکی دیکەوە بۆ حیسابی سوودی خۆی فێڵ لە هەڤاڵەکەی دەکات... لە پێویستدا خیانەت دەکات وەک کە لە پێویستدا جانبازی دەکات... کە تەمای بەهەشت و ترسی دۆزەخ نیشتە دڵیەوە نیشتمانەکەی و خەڵکوخواکەی لێ دەبێتە بێگانە تا دەبینین شاعیری «صوفی»دەڵێ:

ما در دو جیهان غیر خدا یار نداریم
واز نیک و بدی خلق بەکس کار نداریم

واتە:

ئێمە لە دوو جیهان [ی دنیا و قیامەت]، بێ لە خوا، دۆستمان نییە
لە چاکە و بەدیی خەڵک کارمان بەکەس نییە

نیشتیمانپەروەر و چینپەروەریش، کە بوو بە دەروێشی باوەڕ، وەک صۆفی دادەبڕێت لە مەیدانی عیشق و خوولیاکەی... ئەم کاریگەرەی خۆویستی، هەروەک تەفسیری حاڵوباری جانەوەری غەریزەدار دەکات لە هەمان کاتدا تەفسیری ڕەفتار و کردار و گفتاری مرۆ دەکات بەڵام بە جۆرێکی زێدە گرێیاوی و پڕاوپڕ لە دڕدۆنگی و هاریکاری... لە خۆشویستن و دزاندن... لەشەڕ و ئاشتی نەک لەبەر چرووکی ئەخلاق، بەڵکوو بە هۆی بەربڵاویی و تێکسمرانی ئەو بزوێنانەی لە زیاد کردندان لەو ڕۆژەوە کە ماکی هۆش لە کەللەی ڕسکا و بزوێنی غەریزەی بەجێ ما بۆ ئەو هەڵسوکەوتەی مەحکوومە بە غەریزە لە هەموو جیهانی غەریزەداردا بوونەوەری غەریزی کە هۆشی پژا [لە سەرەتاوە زۆر بە لێڵی، سەرەتاکەش ماوەی دەیان و پتر لە دەیان هەزار ساڵی خایاندوە، تا کە نەختێک نیگای فرەوان بوو، تارادەیەک، بە چاوی بیناوە لە جیهان ڕاما... خۆی ناسیەوە... قسەی فێر بوو...]. بۆ زێدە ڕوون کردنەوە دەڵێم: کە ئەلفوبێ بریتی بێ لە چوار پیت دەشێ سەد - دووسەد[53] وشەی هەمەجۆری لێ پێک بێت بە تێبینی ئەو ڕاستییە گرنگەی کە لە

[53]- ئەگەر پیتی تێدا دووبارە بکرێتەوە چەندین جار لە 100 و 200 وشە پتر پەیدا دەبن.

سەرەتای پەیدابوونی توانای ئاخاوتن وشەی دوو پیتی[54] دەربڕدراوە کە ئەلفوبێ بوە پێنج وشەیی بە نیسبەتێکی ئەندازەیی وشە زیاد دەکەن... ئیتر هەروەها تا کۆتایی 30-32 پیت کە لە ملیارەها تێدەپەڕێت...

بە قیاس لە ئەلفوبێ، کە سەیری زیاد کردنی هەست و هۆشی مرۆ بکەین دەبێ بگەینە ئەو باوەڕە کە تەنگوچەڵەمە و جۆری زانین و نەزانین و شکڵی «خێزان» لەگەڵ بوونەوەر و... چاندن و دروونەوە و سووتاندن و هەڵنان و ڕماندن و نەریت و خووی ئۆگر پێ گرتووی... و سەروبەری ژین و مردن و ڕەفتار و کردار و گفتاری بە نیسبەتی هەندەسی زیاد دەکات[55] تا ئەوەی لە هاریکاری و لە تەناقوز و لە هەموو جۆرە ڕەفتار و کرداری دەچێتە باری ئەوتۆوە، بابڵێین، تەناقوزەکەی لە زۆر باردا زاوزێ دەکات و بەچکەی بیژووی لێ دەکەوێتەوە: نموونەیەکی هەرە سادەی ئەوەیە کە لە سەرینایی ناڕێکی و یەکتر سەغڵەت کردن لایەنی باڵادەست کیژی لایەنی کەمدەست، بە تۆبزی، لە خۆی مارە دەکات بە نیشانەی شکاندنی دوژمن ئیتر زۆر نابا خۆشی دەوێت و منداڵیان دەبنە پردی بەیەکتر گەییشتنی دۆستانەی هەردوو لا...

بەسەرچوونی دوژمنایەتی نابێتە زانەوەی تەناقوز بە تەناقوز وەک کە بەسەرچوونی نەساغی نابێتە تەناقوزی تەناقوز، تەنانەت ئەگەر دەرمان چاری نەساغی نەکردبێ شتێک نامێنێ لە نێوان [لە چاکبوونەوەی عادەتی] تەناقوزی پێ بگوترێ: لەشە و شەکەت بوە لەبەر زێدە ماندوویی، پشوویەکی حەسانەوە... خۆ بواردن دەیهێنێتەوە حاڵی ئاسایی! زۆر جاران «هەڵە» حاڵەتێک پەیدا دەکات تەناقوزی تێدا بە گومان دەگیرێ وەک ئەوەی بە یەکێک ڕاگەیەندرێ کە فڵان

---

[54]- خوێندوومەتەوە لە کتێبی *Prehist South Africa* [وشەکە بە ناتەواوی نووسراوە، خۆی Prehistoric ـە] دەڵێ دانیشتووانی ناوەند ئەفریقا [وابزانم بە پێگمی ناویان دەبا] قامووسی وتوویژیان کەمتر لە 100 وشە بوە.

[55]- ناتوانم بریار لەسەر دواڕۆژی مرۆڤ بدەم لە ڕووی زۆربوون و کەمبوونی لایەنە هەمەچەشنەکانی کۆمەڵایەتییەوەی چونکە ئالەت وردە وردە وەکالەتی مرۆ دەکات... پێشتریش هێمام بۆ کردوە.

پاشملە قسەی سووکی پێ گوتووی، دواتر دەزاندرێ درۆی بوختانکەرێکە و دەسرپێتەوە لە دەفتەری دۆستایەتی.

من ئەم وردپێوییە دەکەم لە باسی تەناقوز مەبەسم روون کردنەوەی لایەنێکی زێدە گرنگە لە ئەفسانەی گوتە مەشوورەکەی کە دەڵێ تەناقوز بزوێنی کۆمەڵایەتی و مێژوو و زانست و هونەر و بەهەشتی سەر دنیایە... ڕاستیەکەی تەناقوزی مرۆ لەگەڵ مرۆ دەردی هەرە کوشندەی بەختیارییە: با لەگەڵ شیووعییەک بڵێم، تەناقوزی بەرژەوەندی وەرزێر و ملّکدار هەستی چینایەتی دروست دەکات و شۆڕش هەڵدایسێنێ و وەرزێر و کرێکار و ستەمدیدە ڕزگار دەبێت. ئەم قسەی وەها لووس و سادە بە خۆی و بە ئاکامە گەشەکەیەوە فەلاکەتێکە لە فەلاکەتەکانی تەناقوز چونکە ئەگەر زوڵمەکە نەبایە، تەناقوزەکە نەبایە، لە بنەڕەتەوە لزوم نەدەبوو بە شۆڕش و کوشتن و سووتاندن. شۆڕشیش [ئەگەر سەرکەوتووبێ] لەو پتر ناکات کە وەرزێر پارچە زەوییەکی دەبێ بۆ حیسابی خۆی بیکێڵێت. هەزاران دێ هەن هەمووی ملّکی وەرزێرە نە شۆڕش و نە ماندووبوون و کوشتن و برینیشی تێدا نەبوە پتریش لە وەزێری شۆڕشگێڕ حەسایەوەیە. خوێنەر و شیووعیش لێم بە سەهوو نەچن: من لەگەڵ وەزێرم خاوەن زەوی بێت، هەر ئەوەندەم مەبەسە بڵێم ئەو تەناقوزە مەعلووم و مەلعوونەی بە شۆڕش چارە کرا بزوێنی مێژوو نەبوو...

مێژوو بە وەرزێری نەخوێندووی جندۆکەپەرست بەرەوپێش ناڕوات. ڕەنگە پاشەکشە بکات وەک کە دەیکات لە وڵاتی پاشکەوتووی هەزار ساڵەیی... نەساغ کە بە دەرمان شیفای دێت، تەناقوزێک چارکراوە ئەگەر نەبوایە مێژوو خێراتر پێش دەکەوت. نەزانی، بێسەودای خۆی لە خۆیدا تەناقوزی تێدا نییە وەک کە منداڵ بە تەناقوز نەبۆتە نەفام، لەگەڵ ئەمەشدا کە نەخوێندووی بێ تەناقوز دەبێتە خوێندەوار مێژوو خێراتر دەسوورێت... هەژارای و نەداری و بێدادی و ئەو جۆرە دەردانە کە ناوی لێ دەنێن «تەناقوزەکانی کۆمەڵایەتی» و سمێڵە خنکەیان دێتێ بە چاوەنۆڕیی بەرەکەتەکانیانەوە، زۆر بە داخەوە، وەک هەلهەلەی بووک گوێستنەوەیە لە کۆڕی شین و شەپۆڕی ئازیز.

بەڵێ، من لەوان چاکتر دەزانم چ دەردی کوشندە هەیە لە لەش و هەناوی «کۆمەڵ» بەڵام ئەو خافڵاوە نیم کە زەهر بە تریاک بزانم... من بە سەهوو نەچووم لە ڕابەری بەهەڵەچووی لە خۆ ڕازی کە فیزوناز بەسەر تێر و برسییاندا دەکات لە ڕێی هەڵگرتنی ئنجیلێکی ماددی کە لە کوردستاندا بنەمای ماددی نییە و لە عەینی دەقەکانیشدا خەیاڵات بۆتە ناوەڕۆک: فەرقێک نییە لە نێوان نوێژ و ڕۆژووی ئەهلی قیامەت و نێوان موژدەی بەهەشتی سەر دنیا لەلایەن ڕابەری ماددیە و بۆ ڕووت و برسی لە کوردستانێکدا کە ئەگەر هەمووی لەقەبەڵ پرۆلیتاریا بکەیت، لەبەر زێدە بێ دەرامەدی و بێ تەکنیک و بێ ژێرخان و بێ زانست و بێ «هەر هیچ شتێک» پێی تێر و پۆشتە نابێت، تا ئەوەی ئەم دێڕانە، کە لووس و لێک بە دوا یەکتردا دەڕۆن، ڕێ دەرناکەن، لەسەر کاغەزیش، بۆ بەهەشتە خەیاڵییەکەی پرۆلیتاریای هەناسەسارد. کوردێکی خاوەنی گیانی خۆی نییە، بەدەست ڕابەری ماددییەوە، زۆرانبازی لەگەڵ خۆیدا دەکات بۆ زاڵبوون بەسەر داگیرکەردا.

خوێنەری ئازیز! برا کوردە ڕێگە گوم کردووی بەرەو هەڵدێری شەڕی چینایەتی... ئەی کۆمەڵەهای گەنجی کوردی عاشقە ئیفلاس بەدەم فینگوهۆڕی گریانەوە بۆ ڕەشوڕووت کە لە ماوەی پەنجا ساڵدا یەک سەلکە پیازی ڕزیوی نەهاتە کاسەوە لە بەرەکاتی بژی و بڕمێ و ڕاوە پێشمەرگە: ئەی برایان و خۆشەویستانم، چ لە ڕیزی سەربازی کوردایەتی بن ▪ لە خەندەقی ناجۆری شەڕی چینایەتیی بێئاکام بن! لەم ڕۆژەی 12-2-1997ز- نامەیەکم لە دۆستێکی کوردی ئەورووپانشینەوە ▪ پێگەییشت گلەییەکی کوردە شیووعییەکان بەرانبەر من دەگێڕێتەوە لەوەدا کە من واز ناهێنم لێیان بە ڕەخنە و سەرزەنشت...

با لە پێشەوە دەفتەری «قەرزداری» ی شیووعییەت و من لەتەک یەکتردا دەور بکەمەوە ▪ ئنجا بێمە ڕەخنەکارییەکی ئاڕاستەی شیووعییەت بە تێکڕایی و هی شیووعیەتی کورد بە تایبەتی:

1- لە ساڵە ڕەشەکەی 1959 بەرپرسی لکی حیزبی شیووعی لە کۆیە خەبەری ڕاگەیاند بە حکومەت کەوا علی عبدالله و کاکەسوور تاڵەبانی و من خەریکی موئامەرین دژی کۆیە بە هاریکاری عەباسی مامەنداغا، گۆیا، لە چنارۆکی مەلازادان بەودیوی چیای هەیبەسوڵتانەوە کۆبووینەتەوە پلان ڕێک

دەخەین. مەفرەزە بەڕێ کرا... لە جاددە گەییشتە کاکەسوور... چوون بۆ چنارۆکەکەی زستانەی حەتاڵ و بەتاڵ... دواتر لە کۆبوونەوەی لک حیزبی پارتی و شیووعی، علی عبد الله مەسەلەکەی هێنابوە ڕوو، نوێنەری حیزبی شیووعی، پاتەوپات، گوتبووی: بە شانازییەوە هەوڵێ فەوتانتان دەدەم.

2- لە سەدەمی عبدالکریم قاسمدا کە هەرای نێوان حکومەت و کوردستانی عێراق دەستی پێکرد شیووعیی ناوچەی کۆیێ، کە من شارەزاییم پێیان هەبوو، خەبەری ڕادەگەیاندە حکومەت کە پێشمەرگە لە فلان گوند کۆبوونەتەوە... دەرحاڵ فڕۆکەی میگ دەرچوو بۆ سڵاو لێکردنیان بە بۆمبای ڕووسی...

3- لە هەموو ئەو بارانەدا کە حیزبی شیووعی لەگەڵ حکومەتی بەغدا دۆست بوە، بێپەروا و بەوپەڕی ڕژدییەوە خەریکی لەناوبردنی بزووتنەوەی کوردایەتی بوە: دەسا بە کوردستان سوێند دەخۆم، جارێکیان دوو کۆمەڵ لە کوردی گوماناوی گیران، کۆمەڵەکەی کە جەیش گرتبوونی دوای موحاکەمە هاتنەوە مالی خۆیان، ئەوانی شیووعی گرتبوونی، هەر بە شایەدیی شیووعییەکان، جەزا دران بە حەبس و بە ئیعدام...

4- لە کۆڕی زانیاری کورد بووم بە ئەندام و دواتر نائیبی سەرۆکی کۆڕ: سەرلەبەری چەپ و، بە تایبەتی شیووعییەکان، شکاتیان بردە لای «مدیر أمن عام» کە من کۆڕم کردوە بە لکێکی ساڤاکی ئێران بە بەڵگەی ئەوەی کە هەمیشە «هێمن» و برا کوردە پەنابەرەکانی کوردستانی ئێران لە هاتوچۆدان بۆ کۆڕ و هەمووشیان جاسووسی ساڤاکن... دوو جاران لە ئەمنی عامەوە هاتن بۆ لێپرسینەوە.

5- موکەڕڕەم تاڵەبانی وەزیر بوو[56] شکاتێکی دڵیرانەی لێ کردم لای «مجلس قيادة الثورة» گۆیا لە کتێبێکم جنێوم پێ داوە [کە فڕی بەسەر ڕاستییەوە نەبوو]. بەدەم شکاتەکەوە تۆمەتی *«عميل الخائن البارزاني وعميل الخائن*

---

[56]- موکەڕڕەم یەک لە دوو وەزیری شیووعی بوو، ئەوی تریان عامر عبدالله. کە حیزبی شیووعی پەیمانی لەگەڵ بەعس نەما ئیستیقالەی دا و عیراقی بەجێ هێشت. موکەڕڕەم مایەوە بە قەسر و تەلار و پۆستەچی بەغدا بۆ هەندەران.

*جلال الطالباني وعميل الاستعمار وضد الثورة»*... و کۆنە نائیبی زەمانی مەلیک وەپاڵ دابووم. من لە بەشێکی *«مرۆڤ و دەوروبەر»* ڕەخنەم گرتبوو لە گوتارێکی نووسەرێک بە ناوی «دنیادیدە» کە قوتابییەکانی کوردی ئەورووپای شوبهاندبوو بە سەگی نێوان تەپەلۆ و لەیلان نەشمدەزانی دنیادیدە کێیە... لەلایەن «الهيئة التحقيقية المركزية»ی سەربە «مجلس قادة الثورة» وە وتووێژم لەگەڵدا کرا... من عێراقم بەجێ هێشت - ساڵی 1978- بۆ ئوردون. لە 11-6-1978 «إعفا» کرام. دوای چوار مانگێک گەڕامەوە بۆ بەغدا. تومەز «دنیادیدە» موکەڕڕەم بوو.

بەوەندە واز دەهێنم لە گێڕانەوەی سەرگورشتەی نێوان شیووعیی کورد و من. هەر ئەوەندە دەخەمە سەر قسەکانی ئەو چەند خاڵە کە من ڕۆژێک لە ڕۆژان فەرق و جودایی و هەڵاوێردیم نەکردوە لە نێوان شیووعی و غەیرە شووعی لەو مافە قانوونییەی کە جێی تاقی کردنەوە بوە و من تێیدا بەرپرس بووبێتم. شیووعیم لە حەبس دەرهێناوە... گێڕاومەتەوە بۆ وەزیفە بە ساختە لە ڕێی حیساب کردنی بە زەدەی بزووتنەوەی کوردایەتی لەو بارانەدا کە حکومەت لەگەڵ مەلا مستەفا ڕێک دەبوو... بە ئۆتۆمۆبیلی ژمارە «1» ی وەزیر دەولە شیووعیم گەیاندۆتە کۆیە و بەڕێم کردوە بۆ پژدەر...

بۆچی سوورم لەسەر ڕەخنە گرتن لە شیووعی و شیووعییەت؟

1. هەرچەند مارکس یەکێکە لە بلیمەتە هەرە هەرە هەرە زلەکانی مرۆڤایەتی تا ئەوەی ئەگەر بلیمەت دەکەس بن یەکیان مارکسە... نۆ کەس یەکیان مارکسە، کەمتر بن یەکیان مارکسە... و قورسایی ژمارەی ئەو ملیارەهای ئادەمیزاد کە بوون بە سوختەی مارکس لەنگەر سیاسەتی جیهانی بە بارێکدا گۆڕی... لەگەڵ ئەمەشدا بەپێی لێکدانەوەی خۆم بەرنامەی ڕزگاربوونی هەژاران بەپێی بیروڕای مارکس کە گۆیا لە حکومەتی پرۆلیتاریا دەست دەکەوێ شتێکە لە خانەی موستەحیلدایە چونکە وەرزێر و کرێکار و هەژاری عادەتی لە خەون و خەیاڵیشدا نابن بە حکومەت هەرنەبێ

لەبەر بێسەوادی کە ناتوانن ناوی خۆیان بنووسن چ جایی ئەوەی ببنە وەزیر و سەرۆک سپا و زانای زەڕڕە و پزیشکی شێرپەنجەو و... و... چوونە ئاسمان... هتد. ئەو قیلەشەرعەی کە ڕۆشنبیری چینی هەورازتر کاروباری دەوڵەت لە وەکالەتی پرۆلتاریا بەڕێوە دەبەن بریتییە لە گەپێکی منداڵانە چونکە وەرزێر و کرێکار لە قەپێلکی ڕەنجدەریدا هەرگیزاو هەرگیز نابن بە حکومەت مەگەر دەرچن لەو قەپێلکە و ببن بە بۆرجوازی. شیووعییەتیش، خۆی، کە وەک بڵێسە دنیای تەنیوە چ فەرقی نەبوو لەگەڵ دەروێشایەتی چونکە تاکێکی پرۆلیتاری و ئەهلی کووچە و بازاڕ نازانێ مارکس چ دەڵێ... لە قسەکانی حاڵی نابێ... هەمووی هەر، کوردی گۆتەنی، «بە گوێی مامۆستا» و تەمای حەسانەوەی بێمزە دروشمی چەکوچ و داسی بەرز کردەوە، لە تەجرەبەش دەرکەوت مەنهەجەکە ناتوانێ لەگەڵ خۆی ڕاستگۆ بێ... وەرزێری ڕووسیا داهێزرا و زوربەی خەلق مەحکوومی ڕژێمێک بوو نایەڵێ ورتەی لەبەرەوە بێت... دیمۆکراسی و مافی مرۆڤ و ئازادیی بیروباوەڕ و ڕەفتار و کردار و گفتار وەها خەفە کرا هەتا لە ئاکامدا سۆڤێتستان هەرەسی هێنا.

من باوەڕم هەیە بە یەکسانی و دادی کۆمەڵایەتیی بێ خواروژوور کە لە ڕێی بەرەوپێشبوونەوەی بێ شەڕ و دڕی و بکوژە و ببڕە دەگەشێتەوە، دواتریش پلەی بێحکومەتی Anarchism لە ئاکامی گۆڕانکاریی نێوان کۆمەڵ و سەرەژووچوونی زانست و تەکنیک، بێ هەڵپە و کوشتن و بڕین، خۆی دەسەپێنێ...

2. شیووعییەتی ناوچەیی و جیهانی و سۆڤیێتی مەرحەبای لە کورد نەکردوە.

3. شیووعیی کورد هەمیشە دژی بزووتنەوەی نەتەوایەتی بوە و بە زەنەی سەرمایەداری دادەنێت و، بە لایەوە، دەبێتە لەمپەری پێش کۆشەشی پرۆلیتاریای، ئەو وڵاتەی کوردی تێدا دەژیت، گۆیا، کوردایەتی بەشێکی پرۆلیتاریا لە خەباتی چینایەتی دادەبڕێت، مانیعی ئەوەش نەبوە شیووعیی

نەتەوەی باڵادەست خەریکی خەباتی نەتەوەیی بێت وەک کە ڕێی دەدا شیووعیی عەرەب لایەنگیری عەرەبی دوور و نزیک بێت.

4. گریمان شیووعییەت بزووتنەوەیەکی دروست و شیاوی ئومێد لێکردنە: لە حاڵەتی کورددا کە حکومەتی نییە و سنووور دانەندراوە بۆ وڵاتەکەی بە چ تەمایەک کوردەکە هەوڵی شیووعی کردنی کورد بدات؟ یان مەبەست نییە کورد دەوڵەتی هەبێ؟ من دەڵێم «مەبەست نییە» شیووعیە کوردەکە دەڵێ: ڕەوا نییە! خۆ لە سەردەمی ستالین «کورد ئوممەت نییە» بنێشتۆکەی زاری شیووعیی کورد بوو... هەر لە بیرمە شیووعیەکی مەیلەو بێبار، تووتنی دزراوی لە کیسە دەرهێنا و جگەرەی لێ پڕ دەکرد و دەیگوت: «دایکی ئەو کەسە وەها وەها لێ بکەم دەڵێ کورد ئوممەتە!» ئەمە حەقیقەتە نەک خەیاڵکرد کە من خوێنەری ڕادەگەیەنم!!

مامۆستا ئەمیری حەسەنپوور گوتبووی فلانەکەس باوەڕی بە خەباتی چینایەتی نییە! بە خێر و سەلامەت عومر باقی بێ دەگەینە ئەو باسەش! لە حاڵی حازردا شیووعیی کورد کە ئیمکان نییە بەردێک لەسەر بەردێک دانێت بۆ بینای شیووعییەت، کەوتۆتە بارێک فەرقی نییە لەگەڵ نوێژکەرێک کە بەتەمای پاداشی بەهەشتە. خوولیا و خەیاڵی پێش هەرەسهێنانی سۆڤێتستان لێی بۆتە بژێوی خۆگری.

لە نموونەدا دەڵێم مەلا ز. کوڕی مەلا ص. باوەڕی بە چوونە ناو مانگ نەبوو. پێم گوت: ئەی ئەگەر پەلکێشیان کردی بۆ ناو کەشتییەکی ئاسمانی و لەسەر مانگ دایانبەزاندی چ دەڵێی؟ گوتی: ئەو دەمەش تەئویلەکی لەبۆ دەبینمەوە. شیووعیەکەشی هەروەهایە، بە خۆ تەفرەدان باڵای لەرزۆکی باوەڕەکەی قیت ڕادەگرێ و ئافەرین لە خۆی دەکێشی. دۆگمای وەها خەست و خۆڵ کە کەلێن نادا بۆ هیچ تروسکەیەکی لاوەکی، بۆ ماوەیەکی بیندرێژ ملانێ لەگەڵ دەکات و بەسەر خۆیدا زاڵ دەبێت دژی ڕمان.

من کە عەبدی هیچ دۆگمایەکی قەرارداده نیم دەتوانم لە ترووکەیەکی چاودا واز لە باوەڕم بهێنم کە بە بەڵگە پووچایەوە. من «باوەڕم» بە خزمەتکارم دەناسم نەک بە ئاغام. خۆم باوەڕم لە فکر و تەجرەبە هەڵێنجاوە تا خزمەتم بکات نەک بیکەم بە بوت... شیووعییەت و هەر بیروباوەڕێکی دینی و دنیای هەبێ دەبێ قەناعەتبەخش و خزمەتگوزار و پەسەندی تەجرەبە بێت. کەسێکی ئەم بەداهەتە نەسەلمێنێ و بێفێڵ و زرەتەئویل نەیکاتە رابەر، یان نەفامێکە هەڕی لە بڕی ناکاتەوە یاخود بەخۆدا شکاوێکە تۆڵەی فشانەوەی باوەڕەکەی لە عینادی و نەسەلماندن وەردەگرێتەوە، تومەز هەناوی بەتاڵ بوە هانا دەباتە بەر«کوردە غیرەتی».

من تەنها لە یەک «دۆگما» پەنجە گیر دەکەم ئەویش کوردایەتییە چونکە ئیمکان نییە کورد نەبم. کوردبوونیش قسەی رووتی بێ ئەرک نییە، کە نەتوانم چەک هەڵبگرم دەبێ قەڵەم بخەمە کار مادەم بتوانم بنووسم. هەر لەم ڕاستییە بێفێڵەوە من قەرزارداری کوردی بەهەڵەداچووم کە بایی تێبڕ کردنی هۆشم و بە فەرمانی قەناعەتم نیگای بابدەمەوە بۆ لای حەقیقەت. نەک من، بگرە هەموو کوردێکی خاوەن ویژدانی پاک لەسەریەتی ئاهـ و نزای کوردی چارەڕەش بگەیەنێتە بەر گوێی هەڵەکردوان بەڵکوو هێزی مێشک و ماسوولکەکانیان لە کوردنەویستی و لە کوردکوژی و لە ڕەزامەندی ناحەز کوردەوە هەڵگێڕنەوە، بەرەو دوا، بۆ هەر ئیحتیمالێک بێ کە، بە یەقین، چاکترە لەوەی ئێستاکە لە کاردایە.

تۆ ئەگەر شیووعیت واز بێنە لە شەڕی چینایەتی، حەز دەکەیت بخەوە... خۆت سەرخۆش بکە... کۆکاین بەکاربهێنە... جنێو بە ئەرز و ئاسمان بدە و کوردەکە تێک بەرمەدە... تۆش ئەگەر پێشمەرگەیت لوولەی چەکەکەت لە سینگی پێشمەرگە دوژمنەکەت هەڵئەنگێوە بۆ بەتاڵایی، خزمەتکاری پێڵاوەکەتم! بە نیازێکی تایبەت بەخۆم لەگەڵ مستەفا بەگی کوردی ئەم نیوە بەیتە ئاگرینەی عیشق دەڵێم و دەڵێمەوە:

ئەمان مردم! عەلاجێ!<br>سا لە ڕێی پێغەمبەرا چارێ!

دوای شریتەی خۆ ئاخافتنم لەو چەند رووپەڕەی سەرەوەدا دەچمەوە بۆ باسی «هاریکاری و ڕێکخستن» کە لە سەرەتای پەیدابوونی «کۆمەڵایەتی» هێوێنی پەلەی ژیان و بەردەوامبوون و بەرەوپێشچوون بوە و ماوەتەوە بە میراتێکی زیندوو. ئەم ڕاستییە بێشوبهە و بەدیهی خۆی لەخۆیدا تێت دەگەیەنێ کە خەباتی چینایەتی لەو دەورانە کۆنانەدا منداڵێکی نەبوو تێیدا بەوەلەدا بێت یان، هەرنەبێ، بڕسکێت. دەزانین بەر لە «ملْکدار» ی خاوەن چەند بەرە جووتێک زەوی، کە دەشێ خەیاڵی مرۆی شەیدای «چینایەتی» ببزێوێ، وەرزێر و سەپان هەبوون... مەڕدار و شوان هەبوون کە خاوەن هۆی بەرهەم بوون و سەپان و شوانەکەش هیچ نەدار بوون کەچی نە ئەوسا و نە ئێساتش «ڕەنجدەر» ە کە بیری لەوە نەکردۆتەوە یەخەی خاوەن زەوی، کە وەرزێرەکەیە، بگرێت و داوای بەشی خۆی لێ بکات، لە کۆنی کۆنیشەوە پۆلیس و عەسکەر نەبوون ملْکی وەرزێر بۆ خاوەنەکەی بپارێزێت لە تەماعی سەپان و جووتیار یاخود یاریدەی سەپان بدات دژی وەرزێر.

کە ئەمە دەڵێم دەزانم تاڕادەیەک خاتری خەباتی چینایەتیم گرتوە کە باسی نەبوونی دەکەم، چونکە خەباتەکە وەک وشەی «عەدەم - نەبوونی» جۆرە هەبوونێکی ئیعتیباریی پێ دەبەخشێت لەو ناوهێنانەدا، وەک کە گوتت: فلانەکەس کەم دەدوێت نەکا قسەی ناجۆری لێ ببیسترێ، عەیبێکی بەرچاویت لێ دوور خستەوە بەوەدا کە کەمدوو بێت، قسەی چاکیش کەم دەکات یان نایکات لەبەر شەرم و شکۆی ڕواڵەتی...! قسەی خۆمان بێت، من لە بەیتەکەی شاعیرە سوفیەکەش ڕازی نیم کە هەر خۆی لە بیر بێت لەتەک خوادا و گوێ نەداتە حاڵوباری لێقەوماوان... بابڵێین گومڕایان کە بە کۆمەڵ دەچن بۆ دۆزەخ... ڕواڵەتی مەتینی بەیتەکە ئیعتیبارێکی زلی بۆ هەڵناوە... من لێی بە سەهوو نەچووم. ئەگەر ماکی خەباتی چینایەتی هەبوایە لەو دەورانە دوورەدا [جگە لەوەی کە هاریکاری و ڕێکخستن پەکی دەکەوت سەبارەت[57] بە زێدە سوودێکی بە ملْکدار دەگەیشت و ڕەنجدەر تێیدا

---

[57]- وشەی «سەبارەت» بە هەڵە بەکار دەهێندرێت لە واتای «بالنسبة الی» ڕاستییەکەی ئەوەیە کە «سەبەب بە»، «بە هۆی»، «لەبەر» فلانە شت. بەستە هەیە دەڵێ: «سەبارەت بە تۆ من لێرە بەندم» واتە «لەبەر تۆ» نەک «بە نیسبەت تۆ».

خەسارەکردوو دەبوو] هەرگیز نەدەشیا چینی ڕەنجدەر ڕازی بێ بە عەبدایەتی... ڕازی بێ کوڕی خۆی بفرۆشێ بۆ لوقمە نان و دەستووری عەبدایەتی حورمەت بگرێ.

تۆ وردبەوە لەو حیکایەتەی کە دەڵێ کابرایەک ویستی برادەرەکانی تاقی بکاتەوە. شەوێ کەلەشی بەرخێکی خستە خەرارێکەوە، سەرەی گرت لە ماڵی برادەرانی، یەک بە یەک تاقی کردنەوە کە دەیگوت یەکێکم لە دەست کوژراوە بۆم پەنهان بدەن... تا گەییشتە برادەرێکی حیکایەتەکەی بۆ کرد و گوتیشی با کەس لێت نەزانی... برادەرەکەی شیری هەڵکێشا و لە گەردەنی عەبدێکی خۆی دا، کە بە تەنیشتیانەوە ڕاوەستابوو، نەکا قسە بدەلێنێ ــ خاوەن کەلەش ویستی مەنعی بکات لە کوشتنی، کار لەکار ترازابوو. گۆیا پەندی «سبق السیف العذل» واتە «شیر خێراتر بوو لە دەنگ دان» لەم ڕووداوەوە هاتوە. خەڵکەکەی ئەم چیرۆکە دەگێرنەوە ئافەرین لە وەفای برادەرەکەی عەبدکوژ دەکێشن، لە کۆنیشەوە بە مەدحەوە حیکایەتەکەمان بۆ هاتوە کەچی بێویژدانییەکی وەها ئابڕووتکێنی تێدایە هەموو ئەو کەسانە تاوانبار دەکات کە خوێنی عەبدە بێگوناهەکە دەکەنە خەنەبەندانی ناو و ناوبانگی خاوەنەکەی.

لێرەدا، لەم حیکایەتەدا، سڕی و بێبەزەیی و بێباکیی سەرلەبەری کۆمەڵەهای خەڵک بەرانبەر گیانی بێتاوانێک دەردەکەوێت هەر چونکە عەبد بوە. ئنجا کە ئەمە حاڵی پشتاوپشتی چەندین نەتەوەی گوێبیستی «ألف لیلة» بێت لزوم نامێنێ من و تۆ باسی خەباتی چینایەتیی بەر لە دوو هەزار و سێ هەزار ساڵ بکەین...

دەخوێنییەوە لە نووسینی شەیداکانی چینایەتی. هەڵگەڕانەوەی سپارتاکۆس بە خەباتی چینایەتی دادەنێت. سپارتاکۆس وەک زانیبێتم ئەسیری شەڕ بوە نەک وەرزێری ژێر دەستی ملکدار یان کرێکاری کووچە و بازاڕ. بێگومان سپارتاکۆس، خۆی، لە شەڕ سەرکەوتبایە ئەسیرەکانی دەکردە بە عەبد، ئەگەر نەیکوشتبانایە. لە شەریعەتی ئیسلامدا، وڵاتێکی بە شەڕ گیرابایە، ڕەوا بوو ئافرەتەکانی ببنە جاریە و پیاوەکانیش عەبد، کەسیش لەو مامەڵەتە نارازی نەبوو مادەم تێیدا سوودمەند بن. بێگومان ڕۆمان و فورس و هەموو حاکمەکانی بەر لە هەزاران ساڵەهای ڕەفتاری ئیسلامیان کردوە لەگەڵ تێبینی ئەوەی کە لە سەرەتای فتوحاتی ئیسلام عەبد حاڵی

باشتر بوە بەدەست مسڵمانەوە، دواتر لە سەردەمی ئومەوی و عەبباسی حاڵەکە گۆڕا تا ئەوەی «هارون الرشید» لە دەرباری خۆی هێزی بازووی ئەهلی مەجلیسی تاقی دەکردەوە بە پەڕاندنی سەری سەرۆکێکی ئەسیر بە زەبری شمشێر، گۆیا مەئموونی کوڕی ئەو شەرەفەی بە نسیب بوە.

شۆڕشی قوڵەرەشەکان لە بەسرە چ پێوەندی نەبوە بە چینایەتی، ڕەش دژی سپی هەڵگەڕاوەتەوە لە ئاکامی بێڕەحمییەکی لەگەڵیاندا کراوە، سەرکردەشیان سپی بوە. دەشبێ بزانین، ئەگەر ڕەشەکان سەرکەوتبانایە و بووبانایە حکومەت گومانت نەبێ لەوەدا:

1. پتر لە سپییەکان خوێنڕێژییان دەکرد، بە هاندانی هەستی ستەمێکی لێیان کراوە.
2. کۆمەڵایەتی و ژیاری ئەو سەردەمە نسکۆی گەورەی دەهێنا وەک کە لە دەمی هۆلاکۆدا جیهانی ئەوسای ژیار و زانست و هونەر و بەرهەم و... هتد نسکۆی گەورەی هێنا.

وەک لە سەرچاوەکانی مێژووی ئەو سەردەمەوە پێمان گەییشتوە هۆلاکۆ فەرق و جودایی دەکرد لە نێوان سوننی و شیعی، بە چاکەی شیعەدا کە حوکم لە دەست سوننەدا بوە. لەم دیاردەیەشدا و لە حاڵی پەژارە و مەینەتێکی وەها وێرانکەردا سێبەری خەباتی و جوداوازیی و زیدەنرخ و تەقەی چەکوچ و خرمەی داسی دروێنەکەر نایەتە بەر چاوی بینەر و گوێی بیسەری ئەوسا و ئێستاکەش. بەڵام ماڵم حەقە جوداوازیی باوەڕی سوننە و شیعە لە خۆوە بێ ڕابەری سەربە چینایەتی و تەنها لە نوختە نەزەری دینایەتی خەندەکێکی هەڵدەکەند. مێژوو دەگێڕێتەوە، هۆلاکۆ مەلاکانی سوننە و غەیری سوننەشی کۆ کردەوە بۆ ئیمزا کردنی نووسینێک کە دەڵێ: حاکمی نامسڵمانی دادپەروەر لە حاکمی مسڵمانی ستەمکار چاکترە. مەلاکان، بەتایبەتی هی سوننی، نەیاندەسەلماند هەتا نەقیبی طالبیەکان کە شیعی بوو هات و بێپەروا ئیمزای کرد و خەڵکەکەش بەدوا ئەوەدا. باوەڕ دەکەم ئەگەر فەتواکە دژی خەلیفەیەکی شیعە وەیا ئیمامێکی شیعەی ناودار

بوایە نەقیب ئیمزای نەدەکرد، کە ئیمزاشی کرد بۆیە بوو فەتوایەکە خەلیفەی عەبباسی دەگرتەوە کە جارێ خوێنی لە قەبردا گەرم بوو... بەهەمەحاڵی خوا خێری بنووسێ!

بزووتنەوەی مزدەک لێم روون نییە، قسە لەبارەیەوە لێکتر دوورن. تا ئێستا لە بارەی «مانی» شەوە شتێکی متمانەبەخش لە دەستمدا نییە. ناشزانین تۆژەرەوەی کۆنە سۆڤێت چی تێدا دەڵێن!

شۆرشی بابەکی خورڕەمی ڕەنگێکی چینایەتی و تێکەڵ بە نەتەوایەتیی پێوە بوو. بەپێی خوێندنەوەم لەکتێبی مێژوونووسی ناعەرەب دەسەڵاتداری عەرەب عەبدیان هێناوە بۆ زەویی بەپیتیی سەرووی ئێران، وەرزێر و ملکداری غەیری عەرەبیان لێ دوورخستوونەتەوە و بەو عەبدانە کێڵاویانە... وایێ دەچێ ستەمی وەها خەست و داگیرکەری غەیری ئێرانی بوونەتە هۆی هەڵگەڕانەوەی بابوک، بەڵگەش لەوەدایە کە وەرزێری ئێران هەڵنەگەڕاونەتەوە دژی ملکداری ئێرانی. [فەترەی سەردەمی مزدەک بەر ئەو ڕاستییە ناکەوێت چ بەپێی لایەنگیرانی مزدەک و چ بە پێی ناحەزانی بێت].

بێمە سەر مەسەلەی باوەڕنەبوونم بە خەباتی چینایەتی.

ئەوەندەی لە حاڵوباری کۆنینە بە من گەییشتبێ خەباتێکی وەرزێر وەیا کرێکار دژی ملکدار و پارەدار لە بەرایی ڕینێسانس رووی نەداوە، قسەش لەسەر خەباتی چینایەتییە نەک سەغڵەتیی تاک بەدەست حاڵەتی نالەبارەوە کە دەزانین جانەوەریش لە سەغڵەتیدا ناڕازی دەبێت. ئەم ڕاستییە واقیعییە خۆی لە خۆیدا بەڵگەیە کە هەستی چینایەتی لە خودی «چین» ـەوە پەیدا نابێت ئەوەی شەڕ دروست بکات لە کۆمەڵدا، ڕینێسانس ڕووناکی و هۆشیاریی لەگەڵ خۆیدا هێنا بۆ ڕۆشنبیری شار و لەوەوە نارەزایی و نافەرمانی و دردۆنگیی بازار و، وەرزێر، کەوتە چالاکی. وڵاتی سڕ و هۆشتاریک ماوە بە دەقی کۆنی چونکە ڕۆشنبیری نەبوو... بنگەی ژیاری تێدا نەڕسکابوو... یەک پێپلکە لە پەیژەی هەزار و یەک پێپلکەی فراژووتنی ژیاری هەڵنەکشیبوو. هەڵبەت تەووژمی فیکر و لێکدانەوەی نوێ کە هەرای نایەوە پرشنگ دەهاوێژێ بۆ جیران... وردەوردە بەوڵاتریشەوە ئیتر تین و تاوی بە پێی حاڵوباری

ولاتەکان ڕەنگ و دەنگ دەداتەوە، لەوانەیشە پاش ماوەیەک بەپێچەوانەوە بەرتەک بداتەوە [وەک کە لە زۆر شوێنی جیهانی ناتەواو خەڵکەکە بەرەو دواوە هەڵگەڕێتەوە].

پەیدابوونی هەست و خەباتی چینایەتی وەک پەیدابوونی مەیلی زایەند نییە کە لە تەمەنێکدا بە فەرمانی سروشت ئۆقرە لە مرۆ و لە بەشی زۆری جانەوەر هەڵدەگرێ. لە گۆڕانی ئایین کە چۆن لە ماوەی مناسبدا ڕوودەدات، تەنانەت پەرۆشی لەدەست چوونی بەرژەوەند خێرایی دەکا لە ئاینگۆڕیی زوربەی خەڵکەکە بۆ سەر ئایینی تازەی فەرمانڕەوا. ئەم دیاردەیە [زۆری دیکەش] تارادەیەک تێیدەگەیەنێ کە وەرزێر لەو سەردەمانەدا کە ئایینی گۆڕیوە لە پێناو گوزەران، هاندەرێکی لە خۆیدا شک نەبردوە یەخەی ملّکدار بگرێت لەسەر ملّکایەتی زەوی چونکە ملّکداری و پارەداری و خانەداری و هەموو جۆرە داراییەکی ئەو ڕۆژگارانە جێی لێپێچانەوە و سۆئال و جەواب نەبوە، ئەمما وەرزێر خۆی کە بێگانەیەک ویستبێتی کیژەمامەکەی بخوازێت لێی بە دەنگ هاتوە هەرچەند کیژ ملّک نییە لە شوو کردن بە بێگانە هەستی «خەباتی چینایەتی» ببزێوێ تومەز خوولیای چەپی ئەم سەردەمە تاس و حەمامێک لە ڕۆژگاری کۆن ساز دەکات و بە زۆرەملێ بە مل مێژوویدا دەهێنێ کەچی واقیعی حاڵ «خەباتی خزمایەتی» و نامزەدبوونی کیژی مام بۆ ئامۆزاکەی هەرا دەنێتەوە لە ئاست داخوازیکەری بێگانە [قسەشمان لە ڕۆژگاری ڕابردوە].

لەکوردستانەکەی خۆمان خەباتی چینایەتی دوای شەڕی دوەمی جیهانی سەری هەڵدا، ئەویش لە ڕێی بڵاوبوونەوەی بیری کۆمیۆنیزم و ڕێکخراوی سیاسی سەربە شیووعییەتی سۆڤێت کە تین و تاوی بۆ سەر پارتی سەربە نەتەوایەتیشەوە هێنا و گەلێک لە ئەندامانی لەلایەن باوەڕەوە شیووعی تۆخ بوون تا ئەوەی هێندێکیان خۆیان بە کادری یارمەتیدەری حیزبی شیووعی حیساب دەکرد و پێشیەوە دەنازین. کوردەکە لە پێڕەوی کردنی شیووعییەت گەیاندییە پلەیەک کە کوڕە ئاغاش نازیان پێوە دەکرد هەرچەند دوای هەڵچوونی کەفوکوڵی هەوەڵی جۆشی جەزبەگەری گەڕانەوە لەو حەجەی سەربە ئیلحادەوە...

لەلایەن باوەڕم بە خەباتی چینایەتییەوە دەڵێم: سەرەڕای ئەوەی کە لە کۆندا خەباتی چینایەتی ئیمکانی ڕسکانی نەبوە هەتا دەورانی ڕێنیسانس، لەم ڕۆژگارە و دوا ڕۆژیشدا خەباتی چینایەتیی خوێناوی دژی داد و هۆش و بەرژەوەندی مرۆڤایەتییە، لە ناویاندا وەرزێر و کرێکاریش. ناشێ و نایەتە عەقڵەوە و ناچێتە دڵەوە ڕابەرانی خەباتی چینایەتی لە دەرەوەی چینی کرێکار بێن و شۆڕش بەرپا بکەن و بگەنە دەسەڵاتی حوکم و بە تەرازووی کۆمپیوتەری داد و خۆشی و دارایی و ڕۆشنبیری و هونەر ببەشنەوە... من باوەڕم بە ئیشتراکییەت و کۆمیونیزم [و ئەنارکیزمیش] هەیە کە مرۆڤایەتی بیانگاتێ و پێیاندا تێپەڕێت لە ڕێی دیمۆکراسییەوە...

شەیدا کۆنە قوتابییەکانی کۆمیونیزم [کەوا بەساڵیشدا چوون هەر شەیدان] بۆتە نەخۆشیی نەفسی و شەختە کردنی فکری. لە دوای هەرەسی سۆڤێتستان ئەو نەخۆشییە گەیشتۆتە پلەی «گرێی ناکامی» لای کەسانێکی پلە و پایەیەکیان هەبوو لە جیهانی مەزادخانەی شۆڕشگێڕیی سەربە چینایەتیدا.

ئنجا هەروەک کوردێکی بەر لە هەزار سیفەتی «کوردبوون» ی نەدەبوە خەباتی کوردایەتی، وەرزێر و کرێکاریش ملیان نەدەنایە خەباتی چینایەتی هەر چونکە هەژاربوون. پێوەندی مرۆ بە نەتەوە و بە چین، بەر لە بزووتنەوەی هەستی مرۆکە بە زوڵمێکی کە لە هەموو چینەکە و نەتەوەکە دەکرێ، ئا ئەو پێوەندییە سرە، تاڕادەیەک، وەک پێوەندیی جانەوەر کە نایگەیەنێتە «خەباتی جانەوەر بۆ جانەوەر» ئیتر مرۆکەش بەبیریدا نەهاتوە، لە ڕۆژگارە کۆنانەدا، قۆڵ و باسک هەڵماڵێ لە ستەمکاری نەتەوە و چین. تاکی مرۆ کە وزەی بەدەنگ هاتنی نەبوە لە زوڵمێکی بەسەر خۆیدا هاتوە چۆناوچۆنی دەبێتە محامی دراوسێکەی. پێوەندایەتیی دین کە بەند نییە بە گوزەران و کێڵگە و ڕاو و سەلەم و ڕبێدەوە و هەستێکی دەروونییە لە مرۆدا هەموو هاودینان بە تاکە باوەڕی پیرۆز دەبەستێتەوە و مزەی پاداشی دواڕۆژیشی فەرمانبەرداریی کردنە لە ڕاگەیاندنەکانی دین بە گیانبازیی بۆ قودسییەتی کردگار و حوکمە ئەزەلی و ئەبەدییەکانی، پێویست نامێنێ بە ئیمتیحانی شەهادە وەرگرتن لە دەرسی ئەمەکداری بۆ خوا کە ڕۆژانە چەند جاران کرنووی بۆ دەبات. دوای پێوەندیەتیی دیندار بە دیندار خودی باوەڕەکەوە شریتە دەکات و

پێکیان دەبەستێتەوە بۆ پشتگیری کردن لە عەقیدە. کە جنێو بە عەقیدەی مام لالۆ درا جنێوەکە هەموو هاوباوەڕەکانی مام لالۆ دەگرێتەوە. بەڵام کە ئەرزی مام لالۆ داگیرکرا وەیا بە خۆڕایی خرایە بەندیخانەوە زەرەرەکە بە خەڵک ناگات. نە هەستی چینایەتی و نە نەتەوایەتی لەوەدا بەخەبەر نایەت مەگەر لە دەورانێک بێت کە هۆشی چین و نەتەوە پشکووتبێ ئەوساش هەستەکە وەها داناڕووشێ وەک لە جنێودان بە مەلائیکەت دادەڕووشێ.

مامۆستا ئەمیر لە کەلێنێکی زێدە بەرتەسک و لە دەروونێکی بەر لە ڕمانی سۆڤێتستانەوە و بە دڵ و هەستێکی دیندارانەی سەربە غەیب و بەهەشتەوە یەخەی بیروباوەڕی من دەگرێت... لە نامەیەکی بیندرێژدا هەندێ ڕێنموونیی لێم کردبوو - بەر لە چەندساڵێک- دەتگوت دەرسی ئەلفوبێ بە منداڵی سەرەتایی دەڵێتەوە... من کە بێم لە تێڕوانینم، تەفسیرەکەی ماددی مارکس دابنێم بە تەفسیری ماسوولکەیی کە هیچ بایەخی بە ڕۆڵی هۆش نەداوە وەک تاکە هۆی هەرە بنەڕەتی لە گۆڕانکاریی مێژوویی [کۆمەڵایەتی]... من کە دەقی قسە مەشهورەکەی ئەنگلز «کار کردن خالقی مرۆیە» هەڵگێڕمەوە بۆ دەقی «مرۆ خالقی کردەوەی سەربە کۆمەڵایەتییە»... ئنجا ئەورووپایەکی سەربە چەپ تایبەتمەندییە هەرە بنچییەکەی خەباتی شۆڕشگێر لە بەرنامەی خۆی بسرێتەوە و باوەڕ بە دیمۆکراسی [بۆرجوازیانە] بهێنێ پێویستە لەسەر مامۆستا ئەمیر و هەموو شیووعییەکی کوردی واز لە شەرم و شکۆی خۆ تەعدیل کردن بهێنێت و باداتەوە سەر ئەو بیروڕایانەی لە مرۆی هێمن و دووری دەمارکشتی دەوەشێنەوە.

با لێرەدا تێبینییەکی ڕوونکەرەوە بە عەرزی ئەمیر و خوێنەران بگەیەنم: ئەو خەباتەی چینایەتی کە لە دیدی سوختەکانی مارکسەوە هەڵسووڕێنی چەرخ و دۆڵابی جیهانی مرۆ بوە و سەر دەگەیەنێ بە حکومەتی کرێکار و وەرزێر و ڕەشوڕووت، لە یەکەم تروووکەی چاوێکی حەقیقەتبین دەپووچێتەوە بەوەدا کە ئەگەر بۆچوونەکە و نەزەریەکەی ڕاست بایە لزوم بە شۆڕشی پرۆلیتاریا نەدەما بۆ گەییشتن بە حوکم چونکە لە هەموو دەنگدانێکی هەڵبژاردنی نوێنەران وەڵامی وەک ئینگلیز و فرەنسە و کوێ و کوێ کە ئیمکان نییە ساختەی تێدا بکرێت، ژمارەی چینی هەرە ژێری کۆمەڵ بەلای کەمەوە لە سەدی شەستی نائیبەکانی دەگەیاندە

مەجلیسی نوێنەران ئیتر خۆماندوو کردنی سەد ساڵ و دوو سەد ساڵی بۆچییە تا پارەدار و ملّکدار و زۆردار لە عەرشی خۆی دادەبەزێت جا ئەگەر بگوترێ عەمەلە و ڕەشوڕووت نەفامن و ڕەنگە بە پارە فریو بدرێن ئەوسا مەسەلەکە لەخۆوە هەڵدەوەشێتەوە چونکە ئەو فروفێڵە ڕێی لێ نابەسترێت، سەرەڕای ئەوەی کە فرۆشتنی شۆڕش بە پارە و بە خلیسکاندن نرخ و ناوەڕۆکی پێوە ناهێڵێ...

زەمانێک حیزبی شیووعیی ئینگلیز دوو نوێنەری دەردەچواند، وا بزانم لە دەمێکەوەیە ئەو هێزەی پێوە نەمایە. جاران دەگوترا سەروەت و دارایی موستەعمەرەکان بەشێکی دەبێتە بەرتیلی ئەو نیازانە کەچی دوای نەمانی مەستەعمەرەی وەک هیند و کوێ و کوێ حیزبی شیووعیی ئینگلیز بێهێزتر بوو تەنانەت حیزبی کرێکارانیش دوای هەرای «قەنال» کە موحافیزەکان دۆڕاندیان، بەزەحمەت دەگەنە حوکم، بە زاهیر دەبوو کۆنەوارەکان ئیفلاس بکەن، ئەمە دەڵێم و دەزانم تەبیاتی مرۆڤ و هەستی ئاشکرا و نهێنیی بەو لایەدا دەشکێتەوە کە مجێزی کوڕێنی و لەخۆ باییبوون و «پاڵەوانێتی»ی بێ مزە و مەسرەف لێی داوا دەکات مادەم فەرقی ئەوتۆ نەکا بە حاڵوباری گوزەران و سوود و بەرژەوەند.

ڕاستییەکەی، ئەوە بەتاڵاییەی گیانی و دەروونی کە هەرەسی سۆڤێتستان خستییە دەماری شیووعییەتی جیهانی، کێشەیەکی سیاسی - مرۆڤی - دەروونی ڕەخساند و بوو بە هۆی حاڵەتێکی دوور لە هەموو چاوەڕوانی و تێبینییەکی کە دەشێ بە وەهم و خەیاڵدا بێت: ملیۆنەها چاپوکسواری چەکوچ و داس لە چوارگۆشەی جیهان ڕۆژی ڕەش ڕادەبوێرن بە ئومێدی ڕووناک و دەستیشیان ناکەوێت...

فەلاکەتی ڕیسوابوونی ستالین لەچاو ئەم کارەساتە گەپی منداڵانیش دەرناچێت بۆ بەر مجێزی ئاپۆرەی شیووعییان بەتایبەتی شیووعیی ناودەرکردوو: ئەمە دەڵێم لە قووڵایی دەروونیشەوە خەفەتیان لێ دەخۆم بۆ دەخۆم بەتایبەتی مامەکورد کە لە زۆرینەی هەرە زۆری گەلان ڕەنجەڕۆتر و دەستبەتاڵتر و بێئومێدتری جێگرێکی خەیاڵی هەرەسکردووی بێت لەو هەرەسەی بۆلشەڤیزم و سۆڤیت. بێگومان بەێنێک، پێویستە، بەسەر ئەو حاڵەتەیدا تێپەڕێت هەتا بتوانێ: «جێگر» بە دڵەوە بگرێت. بەڵام ئەگەر خەیاڵی دژ بە «نەتەوایەتی» لە دەروونیدا ببەزێنێت و هەر بایی سەرخەوێک لە حاڵوباری کورد ڕامێنێت، باوەڕم هەیە، تاموشامێک لەو بیروباوەڕ

بێگەردەی کوردایەتی وەردەگرێت چ قیاسی نابێ لە خۆ بەستنەوە بە ڕاڕەوێک کە گومان نییە لە نەبوونی ئاکامێکی ڕوون پێیەوە.

مرۆڤایەتی لە ڕێی مارکسیزمی تەقلیدی ناگاتە ئەو ئاواتەی کە بە غەیری زانست و داد و هاریکاری ئیمکانی ڕسکانی نییە، ماسوولکەی پرۆلیتاریا کە خەلقی تەئریخی نەکردوە ڕێی نییە بەرەو دواڕۆژ هەنگاو هەڵبێنێ بەر لەوەی دەرچێت لە پرۆلیتاریەتی... دواڕۆژ [ئەگەر سەلامەت دەرچێت لە دەست ئەهریمەنی نەوەوی و بایۆلۆجی] قرغی بێشەرێکی هۆشە، مەیدانی زانست و تەکنیک و ئیبداعە... دیاردەی هەرە سەیر لە لێکدانەوەی سەربە کۆمەڵایەتی [و مێژوو] لەلایەن هەڵگرانی ئاڵای مارکسیزم و تەحلیلی ماددییەوە ئەو چاو نووقاندن و هۆش داخستنەیانە لە ئاست پشکووتنی هەست کردن بە «پێوەندەتیی نەتەوە» بەر لە هەست کردن بە «پێوەندیەتیی چین» بە هەزاران ساڵ، تا ئەوەی گرنگترین هەنگاوی مرۆڤایەتی بەرەو گەشە کردنی شارستانەتی بریتی بوە لە پێک هاتنی دەوڵەت. لەسەر بنەمای «نەتەوە» نەک چین یاخود دین یاخود هەر کاریگەرییەکی بەخەیاڵدا بێت.

بازدان لە سەرۆکایەتیی عەشرەت بۆ هەڵنانی دەوڵەت بەندبوە بە یەککردن و یەکگرتنی «هاوزمانان» واتە بەسەر پردی «زمان» خەڵکەکە بۆ لای یەکتر پەڕیونەتەوە با لەو حاڵەشدا «ئیرادەی سەرۆکایەتی» دەوری سەرەکی دیتبێ کە لە حەقیقەتدا ئیرادەکەی ئەسیری حوکمی «یەکزمانی» بوە، ئەگەرنا دەستی درێژ دەکرد بۆ «غەیرەزمان»: ئیمە دەزانین هەستی عەشیرەتایەتی وەهای کردوە تیرەیەکی سەرلەبەر فەرمانبەرداری سەرۆک عەشیرەتەکە بن، بەزۆریش لەهجەی عەشیرەت لە لەهجەی عەشیرەتی دراوسێی جودایە. لە نوختەنەزەری «بڕکێشی» و دەستدرێژیشەوە نەشیاوە سەرۆک عەشیرەت ڕەو بهێنێ بۆ سەر عەشیرەتەکەی خۆی، بارەها و جارەهاش ڕووی داوە دوو و سێ عەشیرەت لەگەڵ یەکتر بەشەڕ بێن. کە عەشیرەت پەرەی سەند لە ملک و چەک «تایفەگەری» تێدا پەیدا دەبێت وەک کە لە نێوان جاف و دزەیی و پژدەردا تایفە لەگەڵ تایفەیەکی هەمان عەشیرەت ناحەز و دڕدۆنگ بوە... دەوڵەتیش پاش دروستبوونی، ئەو دیاردەیەی تەمای «باڵادەستی» ی تێدا پەیدا دەبێت.

بەهەمەحاڵ. کاریگەریی یەکزمانی و یەکتیرەیی وا لە چاوان دەچەقێ کە:

1. دەوڵەتی پەیدا کردوە.
2. کێبەرکێی سەرۆکایەتیی دەوڵەت بێ یان عەشیرەت لە جغزی هاوزمانەکاندا هاتۆتە کایەوە.

ئەشەدوبیللا یەک هەرا و یەک دڕدۆنگیی بەرچاو لەسەر بنەمای «چینایەتی» بە درێژایی سەدان ساڵ لە خەودا بوە، تا ئەم دەمەی کە من قەڵەم دەبزێوم لەسەر کاغەز، پێوەندایەتیی بێ دەرسدان و تەما وەبەرنان لە نێوان هاوزمان و هاوتیرە و هاوعەشیرەت لە خۆوە کاریگەرە، هەرچی بزێوی چینایەتییە، لە پاش ڕێنیسانس، لە سیاسەتەوە و لە ئایدیۆلۆجی و فێر کردن و ڕاهێنان و مێشک ئاخنینەوە دەبێتە مەراق و هاندەر، واتە لە خوێن و ویژدانەوە هەڵناقوڵێت. ئیمکان نییە «هەژاری» وەک خزمایەتی و نەتەوایەتی ببێتە هەستێکی «فطري». دەوڵەمەندایەتیش نابێتە پێوەندایەتیی «عضوي». هەروەها ئەدەب و هونەر و زانست و فووتبۆڵ و چی و چی لەلاوە نەک لە هەناوی مرۆوە دەبێتە بەشێکی «معقولات». یەکێک نەخوێندوو بێت نازانێ و ناتوانێ ببێتە عاشقی کتێب کەچی کوڕە عەشیرەت بێ دەرسدان مەیلی عەشیرەتەکەی تێدا دەڕسکێت هەروەها مەیلی کورد بۆ کوردەواری و مەیلی عەرەب بۆ عروبە... و هتد. تۆ کە لە منداڵییەوە نەچیتە سەر دینی «د» یان «و» ڕقت لێیان دەبێتەوە چونکە لە منداڵییەوە دینی «ب» چۆتە دڵتەوە. دینەکانیش لێکتر جودان: ئەگەر «د» ڕاست بێ «و» و «ب» درۆزنن. هەژاری و دەوڵەمەندی وەک کوردایەتی و باوکەتی و دایکەتی نییە کە سروشتین: هەژار دەوڵەمەند دەبێ، دەوڵەمەند ئیفلاس دەکا. لە قاتوقڕی و ساڵی گرانیدا وابوە چینی ژووررووی هەژاریش بەشی زۆری لە برسان مردوون.

خولاسە شەڕی چینایەتی و هەستی چینایەتی بەدرەنگەوە دەستی پێکرد، لە ڕێی مەدرەسەی سیاسیشەوە سەقامگیر بوو. ئنجا ئەگەر لەگەڵ خۆمان و خەڵکدا بەئینساف بین و چاوی حەقیقەت بین، نەک چاویلکەی سیاسەت بەکار بهێنین، ناشێ جگە لە مەبدەئی «دادی کۆمەڵایەتی» قەید و بەندی فەلسەفی قەرارداده بە زۆر بسەپێنین. دادی کۆمەڵایەتیش چاکەی فراژیبوونی هەستی مرۆڤایەتی دەیکاتە دیاری بۆ کۆمەڵگەی ئادەمیزاد. ئەگەرنا لە منداڵدانی سروشت، لە دەرەوەی جیهانی مرۆ، ئەوەی پێی دەگوترێ «داد و بەزەیی» نەگووراوە و نەڕسکاوە: هەر بایی

ئەوەی نەسل بەردەوام بێت، ئەو جانەوەرانەی بەچکە بەخێو دەکەن خەریکیان دەبن بۆ چەند ڕۆژێک یان مانگێک [واش دەبێ لە ساڵ پتر] تا دەتوانن بژێو پەیدا بکەن ئیتر دایکەکە لێیان دڕدۆنگ دەبێت. نێرەکتک بەچکەی پشیلە دەخوات ئەگەر دایکەکە نەیپارێزێ. داد و بەزەیی لەگەڵ مرۆ پەیدا بوە. [لە نووسینی پێشووترمدا ئەم لایەنەم ڕوون کردۆتەوە، بەڵام لایەنی «سروشتیبوون» ی هەندێ دیاردە و «فێربوون» ی هەندێ دیاردەی تر لێرەدا پێویست بوو].

خوێنەر بزانێ بەردەوامبوونی پێکەوە ژیان و هاریکاریی نێوان ئادەمیزاد قەرزداری ئەو هەستە زگماکەی «داد و بەزەیی» ی مرۆیە نەک هەستی چینایەتی کە زۆر بە درەنگەوە ڕسکا، ئەویش لە ڕێی دەرسدانەوە. تۆ ماوەی چەند دەقیقەیەک بە خوێنی ساردەوە ئەم دێڕانەی ئایندە بخوێنەوە:

دەزانیت بەر لە هەزاران ساڵ کۆمەڵگەی ئادەمیزاد گەیشتە پلەی مامەڵە کردن و قازانج و تێشکان بێ ئەوەی: جارێ، هێزێکی شەیتانی لە ئادەمیزادەوە هێندێکان پەت بکات بۆ سوودی هێندێکان. حکومەتیش، جارێ وەها خەست و خۆڵ نەبووبوو باوەش بۆ دەوڵەمەند بکاتەوە... ڕاستییەکەی لە سەرەتاوە خەڵکەکە بەپێی بەرنامەی «بێ بەرنامەیی» خەریکی گوزەران بوو. سوود و زەرەری ئەم و ئەویش ڕێکەوتێکی سادە و ئاسایی بوو کە ئیمکان نییە جۆرێکی دیکە بووبێت. تۆ بڵێ ئەو جۆرە حاڵەتە، ئایا، بەبەریەوە هەبوە بتۆزێتەوە لە زیانی وەلی و سوودی حەلی؟ هێندە فێڵباز بوە پلان دابنێت بۆ نەقڵی خوێنی ئابووریی لە وەلیەوە بۆ حەلی لەو دەمە مەیلەو سەرەتای «کۆمەڵایەتی»ی ئادەمی کە هێشتا دارایی بایی چەوساندنەوە پەیدا نەبووبوو. خۆت ئادەمیزادی ئەو سەردەمە، بەخەیاڵ، بکە سەرپشک لە هەڵبژاردنی یەک لە دوو ڕێگە:

1. پێکەوە ژیان بە ئیحتیمال هەبوونی هەژاری و دەوڵەمەندی.
2. بڵاوە لێکردن بە نیازی مەنعی هەژاری و دەوڵەمەندی.

من ئەم وێنەیە دەخوازمەوە لەو سەرەتایانە بۆ بزاوتنی فکری مرۆی ئەمرۆ بەڵکوو بە ئینسافەوە بڕیار دەدات کە پێکەوەژیان تاکە ڕێگەیەک بوە مرۆ پێیدا بڕوا،

ڕێگەکەش بەناچاری و بە حوکمی هەموو واقیعێک سەر دەنێ بە دەوڵەمەندی و هەژاری و مامناوەندییەوە تا ئەگەر پێی ڕازی نیت فەرموو بڵاوەی لێ بکە!

لەبەر تیشکی لێکدانەوەی وەها بەدیهی بۆت دەردەکەوێ کە هەوڵی چەپی کورد بۆ کپ کردنی هەستی کوردایەتی بە نیازی چەسپاندنی هەستی چینایەتی دژ بە «نەتەوە» کارێک بوە دژ بە سروشتی مرۆ... دژ بە فەرمانی بوون و مان و فراژووتن... دژ بە بڕیاری کۆمەڵایەتی و هاوزمانی و هاوئاواتی و هاومجێزی و هاو «هەموو شتەکی» کە ئەگەر سەری گرتبایە نەتەوە دەخەسی و نەزۆک دەبوو... دەبڕایەوە، چونکە بە حوکمی ژێردەستایەتی بۆ نەتەوەی باڵادەست و بە فاکوفیکی چینی کرێکار و وەرزێر و یەکبوونی ڕەنجدەران دەماری «کوردایەتی» ی پسۆک دەبوو، مانگەشەویش سەر لە ئێوارەوە دیارە لەوەدا کە جارێ سەرەتای بەندوباوی خەباتی چینایەتی بوو برا چەپەکەکان «ئێمە گورگین» یان دەچڕی... «بڵێ کوردم هەتا بتکوژم» یان کردە ئەلحەمدی نوێژی چینایەتی. سەیریش لەوەدا بوو هەموو ڕابەر و پەندیار و دەرسدەر و مامۆستاکانیان، هی چینی ڕەنجدەری خەباتگێڕ، بریتی بوون لە خوێندەورای بۆرجوازی، هەر مابوو ڕەشوڕووتەکە بازدەن بۆ شوێنی دوکاندارەکان هەتا پرۆلیتاریاش ببێتە خوێنمژ!

چەپی کورد هەر نەتەوایەتیی کوردی ناوزڕاو دەکرد و جنێوی پێ دەدا. لێی نەبیستراوە قسەی سووکی بە عەرەب گوتبێ. هەڵبەت لەمەشدا تارادەیەک سیاسەتی سۆڤێتی ڕەچاو دەکرد کە مەبەستی بوو لەگەڵ عەرەب بێت دژی ڕۆژاوا، بەتایبەتی ئەمەریکا. کوردەکە ئەو حاڵوبارەی نەبوو زلهێزێکی وەکوو ڕووسیا بیست ئاڵای عەرەب لە نەتەوە یەکگرتوەکان بەگژ خوێدا بهێنێت بۆ مامەکوردی مێژووبەردەر کە لە گەپی منداڵانیش شرپەڕۆیەکی شکڵ ئاڵای بەسەر داردەستێکەوە شک نەدەبرد.

بەڕاست، ئەم دیاردەیەش نیگاراکێشە، لە سەردەمی بزووتنەوەی چینایەتیی نێوان کورد کە دەزانین پێشتر بەندباوی میرکوڕان و میرکچان هەبوە بەلاسایی کردنەوە لە دەوڵەتە عەلەمدارەکان، هەڵبەت لە ڕۆژگاری پەرەسەندنی «ئێمە گورگین نەتەوەی گورگین» ناشێ خەیاڵ بۆ هەڵکردنی شرەپەڕۆی گەپی منداڵان بە ڕەمزی ئاڵای کورد. چەپی کورد ئەو سەرێشەیەی لە کۆڵ دوژمنانی کورد کردبۆوە. ئەمە

دەڵێم بە نیازی دەور کردنەوەی واقیعی ڕەجاڵی کورد بەدەست بەشێکی چالاکی کوردەکە خۆی، ئەگەرنا شێتێش دەزانێ پەڕۆوپاڵی سەر چاک و پیران و هەڵکردنی شرە ئاڵای گەپئامێز سەربە وەهم و ورێنەوەش ناگەیەنێ.

دەبێ بزانین فەرق زۆرە لە نێوان کپبوونی دەنگی نەتەوەیی بە وشاری هێزی بێگانە و نێوان کپ کردنیەوە لە لایەن نەتەوە خۆیەوە. ئەو جۆرە گومراییە لە یەک سەرچاوە هەڵدەقوڵێ کە بریتییە لە سڕبوونی هەست بە «شت» کردن ئیتر لە سیاسەت بێ یان لە باوەڕی دینی و دنیایی بێ یان لە دەستخەڵەتدانەوە بێ، هەمووشیان دڵنیان لەوەدا کە حەق بەلای ئەوانەوەیە جگە لە کەسێکی بە پارە دەلاڵی بکات، گوێ ناداتە لایەنی بەرتیلدەر چ شیووعی بێت چ پارتی چ ئایینی، ئەوەندەی مەبەستە مزەکەی چەور بێت. خوای دەکرد لە ڕۆژێکدا سێ مزە وەرگرێت لە سێ لایەنی دژ بە یەکتر، دیاریشە ئەگەر بلوێ بابای بۆرجوازی بەپیتترە.

وا دەبێ بۆرە فێڵێک لەلایەن حکومەتەوە بە مەبەستی سەرلێشێواندن و تێکهەڵدایی، بۆ گروپێک دادەبڕێت، ئیتر بەپێی پێویست، لەوانەیە ئابڕووچوونی تێدا مەبەست بێت، لەوانەیشە بەڕێکەوت سوودی حکومەتی تێدا بێت... ئەگەر برا کۆمیونیستەکان لەبیریان نەکردبێت، عەبدولکەریم قاسم پشتگیریی لێکردن بە نیازی خستنی ناحەزە سیاسییەکانی، کاتێک ترسی لە ناحەزان نەما [بە حیسابی خۆی] نزیک بیست کەسێکی لێ مەحکوم کردن بە ئیعدام... دوای خۆی ئیعدامەکە تەنفیز کرا. وەی براینە، ئێمەی وەفدەی کوردستان لە قاوەشێکی سجنی مەرکەزی بەند کرابووین...[58] شیووعیە مەحکومەکان بە تەنیشت قاوشەکەمانەوە، لەودیوی سجنەکە، حەبس بوون. لە پەنجەرەی بەرزەوە دەنگ و بەنگیان دەهات... جارێکیان بردران بۆ کەرکووک و هاتنەوە، جاری دوەم چوون و نەهاتنەوە. ئەگەر بڵێم بۆیان بەپەرۆش بووم یان نەبووم قسەکەم بەسەر هیچ بنەمایەکەوە بەند نابێ چونکە من بەر لەوەی بە مردنیان وشک هەڵێم پێشتر بۆ هەموو شیووعییەکی کورد

---

[58]- بە سەرۆکایەتیی مامۆستا جەلال تاڵەبانی لە بەغدا سەرگەرمی موفاوەزەی «لامەرکەزی» بووین... شەڕەکە هەڵگیرسایەوە و ئێمەی تێدا حەبس بووین، تاڵەبانی چووبوو بۆ قاهیرە.

تازەیەداری عاتیفە بووم کە لە کیس کورد چوون و بوون بە ماڵی غەیر و ناحەزی کوردِ و کوردستان...!

کزە پشکۆیەکی بە جەرگەوە بنێت وەها پەرۆشدار بووم بۆ حسێن بەرزنجی، خاوەن گیانێکی پاک و سەدای ئاسمانی، کە «ئەی ڕەقیب»ی بەدەنگ دەهێنا یان ئەڵڵاوەیسی بەرەو ئاسمان بەرز دەکردەوە، دەیخستمە حاڵی جەزبەی دەروێشایەتی. هیچیشی لە هیچدا نەبوو، تەنها لەبەر کوردبوونی شایەدیی نابەحەقی لێدرا... لە هەست و نەستمدا ئەم جوانەمەرگەی خوێندۆڕاو لە نوختەی ناوەڕاستی کوردستان، لە بەهەشتی ژێر خاکی کوردستان چەندێکی گزنگی خۆرەتاوی سبەینان تۆقەڵەی پیرەمەگروون نوورانی بکات، شەهید حسێن ڕووی گەشی مەردانە و کوردانەی لە پەرچەمی فرشتە و حۆری دەماڵێت و لە کولانەی نەمرییەوە نیگایەک ڕاماڵی کوردستان دەکات سا بە هەر کوێیەکی کوردستان بکەوێت حەجستانە!! هاوار بەماڵم بۆت حسێن گیان... بۆ خۆت و هەڤاڵانت!

لە بارەی زەرەری نەتەوە بە تاربوونی بەشێک لە ڕۆڵەکانی و دەرچوونیان لە جغزی خەبات بۆ نەتەوە شەرحێکی کورتی ڕوونکەرەوە گەرەکە: بەشێک لەوان تاربوانەی خەبات بێسەواد و نەزان و بێئاگای سیاسەتن تا ئەوەی هەستیان لە ئاست چارەنووسی گەل وەها کول دەبێت هەموو پەرۆشییان ڕووی لە دەستخستنی سوودێک دەبێت پێی بگەشێنەوە. وەرزێری هەرێم نموونەی ئەم دیارەیەی سڕبوونی «هەست بەخۆ کردن» ـە لەوەدا کە نازانێ داگیرکەر▪ بێگانەکەی پارچە زەویەکی دەداتێ لەو خاکەی پێی دەڵێن کوردستان هەر بە ماڵی کوردەکە نامووسی لێ کڕیوە، بگرە بەولای نامووسەرە هەستی کەرامەت و مرۆڤایەتیشی، دیسان بەماڵی کورد، دەور کردۆتەوە بۆ سەر داهاتی تاڵان وێرانکاری و کوشت و بڕین و هەتک کردن لە جەرگەی کورد کوردستان.

ئاخنینی مێشکی وەرزێر بە ڕق و کین لەلایەن شیوعییە نەمەییوەکەی کوردەوە دژی چینی ناپرۆلیتاری کورد وەهای هێر کردوە و ڕۆشنایی حەقیقەتی لێ شاردۆتەوە داگیرکەرەکە پیاوکوژە ژنەتککردوەکەی قبووڵە بە چاکەخواز هەر چونکە دوو پینە زەویی گڵاوی پێ بەخشیوە بە دیار ڕۆژێکەوە [بە هاریکاریی

وەرزێرە کوردەکە] نەتەوەی کورد بە وەرزێر و مەرزێر و ناوزێر و دەرزێریەوە بخاتە چاڵێکەوە بە پانایی کوردستان.

شیووعیی کورد ئەگەر واز نەهێنێ لە دزێو کردنی هەستی نەتەوایەتی و نەیەتە سەر شەقامی بەرین و بێتەئویلی «چارەنووسی کورد» بە نیازی ڕزگار کورد لە «نەمان، توانە، پوانەوە، ڕەزیل بوون، ئابڕوو چوون، نامووس پایەماڵی» دە جار و سەد جار تاوانبارتر دەبێ لە تاوانی «ڕاوەپێشمەرگە» یەکی دەکرد بۆ حیسابی ڕەزامەندیی زلهێزی رووسیا کە لایەنگری بەرەی ڕاوەپێشمەرگە بوو چونکە کورد ئێستا [14-2-1997] تەنگەتاوتر و هەڕەشەلێکراوتر و ڕووەو ئاکامی مرۆ تۆقێنتره لەچاو سەردەمێکی شیووعییەکە فیکەی سمێڵی دەهات لە ڕاوەپێشمەرگە...

بەو پێیە چینی وەرزێر سڕ نیشانەی «-» و «+» ی پێوە نییە لە ڕاستە حیسابی خۆیدا. واتە نیشانەکەی بریتییە لە «هیچ» هەتا لە لاوە خێرومەندێک نیشانەیەکی لە تەوێڵی چەسپ دەکات ئیتر خواوڕستان...! وەک ڕێویەکەی ناو چیرۆک: کە هەڵیانداشتبوو، دوژمنەکەی دەیگوت: ئەڵڵا حەق لە جێی ڕەق. ڕێویش دەیگوت: ئەڵلای ورمان لە جێی نەرمان... من دەڵێم: ئۆباڵ بە ملی تیژکەرەوەی هەرای چینایەتی...

بەشێکی دیکە لە تاربوان ئەوانەن خەریکی ماڵ پێکەوەنان و پارە داکردنن. هەرچەند کەسبەکە گڵاوە بەڵام بە ملەوەیە و شەقڵێ زوربەی کۆمەڵگەکانی ئادەمیزادە، بە تێبینی کردن لە دەوری «ژیان» کە لە جغزی ئاڵووێری عادەتیی ناو کووچە و بازاڕدا ساختەکاری بەرتەسک دەبێت و، ئاغڵەب، ساختمانی دادگە و پۆلیس بەلای حورمەتی یاسادا دەشکێنەوە تا ئەوەی زێدە تەماعی هەلپەرستان کە دابین نابێ لە ئاستەنگیی دادگە و ئازادیی ڕەخنە و ناڕەزایی و زڕاندنی ناوی بەدکار و بەرتیلدەر و بەرتیلخۆر، پێداویستی هانابردن بۆ بەدکاری ناڕەوا لە چەندین سووچ و قوژبنی جیهاندا چەتەی شارستانەتیی وەک مافیای داڵدە داوە کە بە بەرژەوەندی ناجایەز بۆ ئەم و ئەو ڕەپێش دەخەن. بەڵام لەبیر بکەین کە کاری ئەو چەتانە هەرچەند بەدە دیسانەوە بە حوکمی دەوروبەری پێشکەوتوو، بەڵکوو لە نوختەنەزەری سوودی چەتەکانەوە، هەتا بلوێ بە ئەرکی کەم و کەمئازار کارە ناڕەوایەکە بە ئەنجام دەگەیەنن، واتە بێ کوشتن بێت ئاسوودەتر دەبن... یەک

کوژراو ناکەن بە دوو کوژراو مادەم بەرژەوەند داوای نەکردبێ، کەچی لەم جیهانە سەروبنەی سێیەم و بیستەمدا، سەرۆک دەوڵەت هەن ئاشقە کوشتن ئەویش لەبەر چەند هۆیەک:

1. هۆیەکی سەلبییە کە خەڵکەکە خاوەن ئیرادە نییە، دەنا لە ترسی نۆرە گەییشتن بە خۆی تووڕە دەبوو لە کوشتنی بێسەبەب.
2. سەرۆک دەوڵەت، لە زۆر حاڵەتدا، نەخۆشییەکی سەربە دەروونەوە [وەک سادیزم، میگالۆمانیا...] بەرەو خوێنڕێژییەوەی دەبات. نەخۆشیش نەبێ گەلێک جار، کێبەرکێ لە وڵاتی دواکەوتووی قالوبەلایێ هێندە دڕ و بێسنوورە لەسەر ناز و نیعمەتی سەرۆکایەتی، بە ئاسایی و بێ هەناسەسواری لە سەرۆکەوە بەندی کرن و بە دوا ئەودا کە بەند کاریگەری نەبوو، کوشتن هێندەی ئاوی دەستنوێژ حەڵاڵ، بەڵکوو ناچار دەبێت.
3. بە نیازی مسوگەر کردنی بەردەوامبوون لە سەرۆکایەتی، پەندە مەشوورەکەی «مردوو قسە ناکات» لە مێشکی سەرۆک بەدەنگ دێت ئیتر بە غافڵکوژی (اغتیال) بێت یان بە تۆمەت هەڵبەستن بێت هەمچەشمەکەی خۆی لەناو دەبات. هەڵبەت ئەو نیازە هەر لە جیهانی بێسەروبەردا دەتوانێ خۆ سەپێن بێت.
4. دەشێ تەما وەبەرنانی گەییشتن بە سەرۆکایەتی و بە یاریدەی ئەو تەمابەخشە زلهێزە، سەرلەبەری ڕژێمی دەسەڵاتداری وڵاتێکی دواکەوتوو هەرەس بهێنێ و هەرەسیشی هێناوە، نەک تەنها جارێک و بارێک بەڵکوو لە چەندین وڵاتدا و چەند جارێک لە یەک وڵاتدا.

کاسبکاری بازاڕ و جادە و شەقامەکان، بەزۆری و بەپێی هەڵسووڕاندنی کاروباری گوزەرانی ڕۆژانە کە ئەگەر لە گەڕ بکەوێت کۆمەڵ شەختە دەکات، ڕەنگە بە دەست خۆی نەبێت کە هەڵگری ئەرکێکی بەشەرەفە. لە سەردەمی نوێدا جیهانی دواکەوتووش بە وشاری تازەبابەت [ئەگەر شەڕ و هەڵلا نەبێ] ڕەنگێکی ئاماڵ مزاشی بە خۆیەوە گرتوە بەوەدا کە سنوور لە نێوان ئیشی ئازاد و وەزیفەی حکومەت لە چەندین مەیدانی سەربە پیشەسازی و خەڵک پێکتر بەستنەوەدا

هەڵستاوە وەک فیتەری جادده لەگەڵ مەئمووری لیژانی کارەبا وەیا گەڕۆک وەیا تراکتۆر... یەک جۆرن. لەوەشدا حکومەت بە لای جادە و بازاڕدا هاتوە کە لە کۆنەوە پیاوی میری «حکومەتی» بەزۆری، قەمچیوەشێن و خۆسەپێن بوە بەسەر خەڵقدا. لە هەموو مێژووی کۆمەڵگەی سەقامگیری ژیاری چینی «ناوەند» بەلای لەنگەر ڕاگرتنی هێمنایی و تەبایی و ئاسایشدا بۆتەوە ئەویش لەبەر دوو هۆی تێکبەستراوەوە:

1. بەرژەوەندی ناوەند هەمیشە لە خۆشیدا گەشەی کردوە و لە شێواویدا نسکۆی هێناوە، نەک لەبەر ترسنۆکیی سروشتکرد بەڵکوو لەبەر دژوەستانی کەسبەکەی بەرانبەر دزی و دڕی و ڕێگری و ستەم و بێبەزمی. تۆ بڵێ تاجرێکی قافڵە بنێرێ لە کرماشانەوە بۆ کەرکووک چ بێئۆقرەییەک دەیگرێ تا لە دەست جەردە و مەئمووری چلێس و ئاغای خوسەپێن خۆی و کوتاڵەکەی سەلامەت دەردەچن؟ کە ئاژاوە پەیدا دەبێت بەرەی ناوەڕاست پتر سەغڵەت دەبێ لە چینی سەروو و لە چینی خواروو چونکە کەسبەکەی بە هۆی گەشت و هاتووچۆی شاران و ئاڵوویێری کوتاڵ و کاڵای هەمەجۆر مومکینە بەردەوام بێت. کە ڕێگای قافڵەی تیجارەت بەسترا بەر لە هەموان خاوەن قافڵە و دوکانداری «چاو لە قافڵە»ی شارستان وەک بەزاز و ئاسنگەر و سنعەتکار و دوکاندار کڕین و فرۆشتن تا دەگاتە کاروانچی و چەرچی. پەکیان دەکەوێ. هەژارەکە درەنگتر تینی دەگاتێ چونکە سەرمایەی نییە لە ئاژاوەدا نەزۆک بێت. لە نموونەدا دەڵێم، کە دەوڵەمەند ماڵی دزرا گەلێک شتی لێ کەم دەبێتەوە تا ئەوەی ژنەکە و کیژەکە و خوشکەکەی خشڵیان نامێنێ پێوەی بچنە سەردانی ئاشنایان. کە هەژار ماڵی دزرا بەزەحمەت پێوەی دیار دەبێت لەچاو دەوڵەمەند... فایەق بێکەس لەسەر دەروازەی دەرەوەی ماڵەکەی ئیعلانێکی چەسپ کردبوو تێیدا نووسیبووی: «بۆ دز! مەیە ماڵەکەم خەجاڵەت دەبم»...
2. ئۆگر گرتن بە هێمنی و ئاسایش و حەسانەوە وزەی تەحەمول و خۆ گرتن لە ناڕەحەتی و هەڕەشەی زەدەبوون پسۆک دەکات. بە قیاس دەڵێم ئاغای عەشیرەت کەمتر سەغڵەت دەبێ بە شەڕ و گێچەڵ لەچاو ئاغای شارستان

کەوا خەریکە بچێتە ڕیزی مەئمووری حکومەت لەلایەن ئۆگر گرتنەوە بە ئاسوودەیی و تەنبەڵی. دەورانێک خاوەن قۆناغی شار سەغڵەت دەبوو بە نەبزووتنی سەعاتەهای شەو و ڕۆژان لە دیوەخانەکەی نەکا بڵێن تەبیات ژنانەیە. لە تەجرەبەی خۆم، وەها بوە لە هەشتی بەیانی هەتا نۆی شەو بە میوانەوە خەریک بووم بێ ئەوەی لە ژوورەوە دەربچم... ئاغا هەبوە لە سبەینەوە بەسەر چۆکەوە دانیشتوە تا نوێژی نیوەڕۆ بێ ئەوەی جووڵە بکات...

پێی ناوی بڵێم، لە خۆوە دیارە، کەسانێکی چەک هەڵدەگرن بۆ دوژمن، دژی میللەتەکەیان، وەک کە بابای فلەستینی چەک هەڵگرێت بۆ ئیسرائیل، ئا ئەو کەسانە ئەگەر هەزار بن بایی چوار هەزار و پێنج هەزار کەس لە میللەتەکەیان داشکاندوە چونکە بە عادەت ئەوەی چەک هەڵدەگرێ خێزانداره، خێزانیش بە حیسابی نێوەڕاستی شتان پێنج کەسێک دەبن ئەمە لەلایەن تێشکانی ژمارەییەوە، لە لایەنێکی گرنگتری سەربە وزەی نەتەوایەتییەوە هەر تاکێکی کورد یا عەرەب چەک هەڵگرێ بۆ دوژمن کاری 4-5 چەکهەڵگری نەتەوە دوژمنەکە دەکات چونکە بە شارەزایی و بە ڕەقوکینێکی لەعادەتبەدەر دەکەوێتە گیانی میللەتەکەی. ئەو دەمەی کەرامەتی شار و دێیەکەی خۆی پێشێل دەکات هەستێکی حەرامزادانەی ئارامیی لە خۆیدا دەدۆزێتەوە بایی تۆڵەسەندنەوە بکات لە ناو و ناتۆرەی خیانەتەکەی وەپاڵ درابێت.

لە نموونەدا دەڵێم ئافرەتی سۆزانی حەز لە چارەی ئافرەتی ڕووسوور ناکات، تەنانەت کەسێکی چیهرەی گەش و گۆڵی پێوە نەبێت نایەوێ لەتەک مرۆی قۆز و قەشەنگ ڕاوەستێت یان وێنەی لەگەڵدا بگرێت: لە شەڕی یەکەمی جیهانی گەنج [پیاو بە تێکڕایی] ڕەشبگیر کرابوون بە سەربازی، ژمارەیان دەگمەن بووبوو. لە گوندی پێبازۆک، «لطیف» ناوێکی کوێر مابۆوە، لەبەر بێپیاوی نازگیراو بوو لای ئافرەتان. لەتیف بە زمانە مەیلەو پسەکەیەوە کە دەنگی «ر» ی بە «غ» دەردەبڕی دەیگوت «خوایە وەهای غاگغی» واتە وەهای ڕاگری! دواتر ئەم «لەتیف»ە بوە «مام لەتیف» و بێچاو نیزاعی نێوان زەویەکانی دێ هەڵدەبڕییەوە کە دەیزانی سنووری هەموو زەویەکانی دێ چۆناو چۆنین... منیش یەکێک بووم لەوانەی حەزیان بە هاوەمەجلیسی مام لەتیف دەکرد!

خوێنەر ببەخشێت لەو تیۆەریخانەی ناوەناوە بە نیازی شل کردنەوەی ڕەقی و سەختیی بابەتی نووسینەکە. بە قاچاغیش بێ، زەردەخەنەیەک بخاتە سەر لێوان.

مەئمووری حکومەت تاقمێکن، لەگەڵ خوار و ژووریی نێوان سەرۆک دەوڵەت و گەسکلێدەری کۆڵانە، بە هەموو عەیب و عاریانەوە، لە نوختەنەزەری سەقامگیربوونی «کۆمەڵایەتی» و بەردەوامیی پێکەوە ژیان، وەک ئەو دارەن کە لاولاوە و ڕوەکی وەک ئەوی تێدەئاڵێت تا ئەگەر دارەکە لار بۆوە ڕوەکەکە لە ژێر پێیان تێدەچێ. بەو مانەیە کە «کۆمەڵ» پەڕاگەندی چۆڵوچیا دەبێت و دەگەڕێتەوە بۆ ژیانی سافیلکەی ئەشکەفت و دارستان. جا ئەگەر خەیاڵ بۆ ئەوە بڕوات کە دەشێ ئەهلی شار یان لادێ بێ حکومەت بتوانن ژیان بەسەر ببەن، پێویستە شتێک پتر درێژە بەو ڕستەیە بدەن و بڵێن خەڵکەکە لەناو خۆیدا بەپێی پێویست کەسانێک هەڵبژێرن بۆ سەروبەری کاردروستایی ژیانی بێحکومەت. ئەم ڕستەیە دەرگەیە بۆ ئەوەی لە ماوەدا جارێکی دیکە حکومەت پەیدا بێتەوە. هەرچی لادێیە لە کۆنەوە بێ حکومەت بوە بەڵام مەحکوومی حکومەتی شار بوە.

تاقمی خوێندەوار و شارەزای زانست و لکەکانی فرەلایەنی ڕۆشنبیری لە پێنج هەزار ساڵەوە هەڵگری ئەمانەتی ئەو داد و نەریت و چاکەخوازی و خراپەنەویستیی کۆمەڵایەتی بوە کە بێ ئەو ئەمانەتە پێکەوە هەڵکردن لە شار و لە دێ مومکین نەبوە. تۆ، من، یەکێکی تر ناتوانێ بە درێژایی ڕۆژگار ئێشک بکێشێ لە ماڵەکەی نەکا، شەوێ، دراوسێکەی گەسکی لێ بدات. بەڵێ، خوێندەواریی یەک بابەت نییە، بە درێژایی ڕۆژگار شەڕە دەندووک و لێک سریواندن و تاوانبار کردن لە نێوان ڕۆشنبیرانی خاوەن بیروباوەڕی جودادا بەرپا بوە، گەلێک جارانیش ڕووداوی بە سفتوسۆ و خوێنینی لێ پەیدا بوە بەڵام لەچاو هەرای نێوان ئاپۆرەی خەڵک گەلێک بێ پۆز خۆی دەنوێنێ... بەزۆری ئەو جۆرە لێک سریواندن و گاز لێکتر گرتنە لە بنەمای ئایینییەوە سەری هەڵداوە چونکە ئایین دوو جۆرە تەئویل ناسەلمێنێ بەتایبەتی ئایینێکی فکرەی بەهەشت و جەهەندەمی لە دواوە بێت. فەرقێکیش نییە لە نێوان خیلافی دوو ئایین لەگەڵ خیلافی دوو مەزهەب چونکە مەزهەبەکە خۆی بە نوێنەری ئایینەکە دادەنێت.

لەم دەور کردنەوەی هەرەمی کۆمەڵ دەگەین بەو ئەنجامە کە بەشێکیان پێویست و بنەڕەتین وەک وەرزێر، کرێکار دوکاندار، کاروانچی، توجار، حکومەت، خوێندەوار و [لە دەورانی عەشیرەتی] سەرۆک عەشیرەت بە خۆی دەستەودایەرەیەوە... بەشێکیان وەکوو نەخۆشی و دوومەڵ لە کۆمەڵ شین دەبن[59]. ئەگەر لە ئیمکاندا بوایە بنەبڕ کردنیان زێدە سوودبەخش دەبوو بەڵام بێگومان سەرلەنوێ وەکوو دوومەڵان لە درزی تەختی «کۆمەڵ» دەهاتنەوە دەرێ.

ئنجا ئەگەر بە دڵێکی ئارام و هۆشێکی حەسایەوە سەیری پانۆرامای مێژوو [= کۆمەڵایەتی] بکەین زۆر بە ئاسانی دەتوانین بڕیار لەسەر هێندێ بدەین کە پانۆراماکە کاری شەیتان و جنۆکە و پیاوخراپان نییە بەڵکوو بە فەرمانی ناچاری و حەتمیی «کۆمەڵایەتی» ئەوە بوە کە هەبوە. چ دەمارکشتیی لزوم نییە کە دەبینین ئاپۆرەی خەڵک نەیتوانیوە حکومەتی دادپەروەر بڕەخسێنێ یاخود ئاپۆرە خۆی ببێتە حکومەت. چی لە مێژووی کۆن ڕوویداوە بێ مەنهەج بوە و ناچاری بڕیاری ڕوودانی داوە. کە وەرزێر و ڕەنجدەر لە ژێرووی کۆمەڵ بوون نە خۆیان ئەو شوێنەیان هەڵبژاردوە نە چ لایەنێکیش هەڵیداشتوون بۆ ئەو نزمایییە.

ئەگەر ئاپۆرەی ڕەنجدەر لە دەستی هاتبایە دەسەڵات بگرێتە دەست بێگومان خۆی دەکردە خاوەن حوکم بەڵام نەدەشیا و مستەحیل بوو بەر لە سێ هەزار ساڵ سەدی نەوەدی خەڵک حوکمڕان بێت، چەند سەیرە تەنها دەیەکی خەڵک خزمەتی سەدی نەوەدی کۆمەڵ بکات و بشبێتە لەشکری شەڕکەر و پاسەوانی شەوانە و خەلە و خەرمان هەڵگرێت و بزن و مەڕ و ماڵات و وڵسات بلەوەڕێنێ و... و... هتد کە هەمووی هەر خەیاڵاتە... کە ڕەنجدەر نەیتوانی بەو مافەی بگات کە لەم ڕۆژگارەدا بەرەی چەپ بۆ ئەوسای ڕەوا دەبینێت، دیارە لە ئیمکاندا نەبوە دەنا ڕەنجدەرێکی لە جیاتی ڕۆژانەی یەک درهەم بتوانێ دوو درهەم وەربگرێ چ ئەفسوونەک چاوی نابینا دەکات و دەستی دەبەستێت؟ دەزانین بارەها و جارەها ڕەنجدەر بێمزە سوخرەی پێ کراوە و نەشیتوانیوە سەرپێچی بکات ئیتر لە کوێوە

---

[59]- مەبەست دز ‌، درۆزن ‌، دووڕوو ‌، بوختانکەر ‌، ئەو جۆرە میکرۆبانەن.

دەسەڵاتی ناچار کردنی سوخرەچی پەیدا بکات کە نرخی ڕۆژانەی زیاتر بسەلمێنێت.

ئێمە دەبینین لەم ڕۆژگارەدا ژمارەی کۆمەڵگەی داواکەتوو کە چەندین جار لە هی پێشکەوتوو پترە، ڕەنجدەرەکانی ناتوانن مافی ڕەوای خۆیان بسەپێنن بەسەر خاوەن بەرژەوەندا ئیتر چۆناوچۆنی بەر لە دوو سێ هەزار ساڵ دەیتوانی خەیاڵ بکات و خەون ببینێت بە زیادیی کرێ؟ من لەو باوەڕەدام کە کۆمەڵگەی مرۆ بەر لە هەزاران ساڵ تاکە ڕێگەیەکی لە پێش بوە کە لە واقیعدا تێیڕا ڕۆیشتوە و تاڕادەیەک وەک جانەوەری دەشتودەر کە بە حوکمی غەریزە یەک جۆرە ڕەفتار و کرداری لێ بەدەر دەداتەوە، ئەویش، واتە مرۆکە، لە واقیعی بەردەست و بەرهەستدا ڕۆژگاری بەسەر بردوە لەگەڵ تێبینیی ئەو ئیمکانەی کە مرۆ بە هۆی هەستی هۆشیەو■ پەلەی زێدە لوقمە بکات ئیتر بە فێڵ بێ یان بە ئیقناع کردن یان بە دزین و پەنادان و شاردنەوە [ستاندنی بە زۆرەملی نایەتە بەر ئەم حیسابە بەڵکوو تێکەڵ بە حیسابی جانەوەر دەبێتەوە].

هەڵبەت تاکەکانی کۆمەڵ لەلایەن هێز و زیرەکی و لێهاتوویییەوە چەندین پلەی خواروژووریان بوە کە ئەگەر لە ڕۆژگاری ئەشکەفت و دارستان قسە بکەین زێدە هێز و زێدە هۆشەکە بە قازانجی هەموویان دەبوو. دواتر کە «کۆمەڵایەتی» دەورانی مێژوو پەیدا بوو تاکی لێهاتووی بە لەش و هۆش توانیوەتی چاکتر بژیت لە تاکێکی عادەتی، مەبەسیش لە «تاک» خێزانی تاکەکەسە. لە دەورانی زووتر «زەناشۆیی» تێکەڵ هەبوە کە «پیاو» مێرد و «ژن» یش ژن بوە بۆ هەموان سەرلەبەر. دواتر زەناشۆیی «یەک پشت» تێکەڵ بوە و کۆمەڵگە دایکی خۆی ناسیوە و باوکی کەس نەناسراوە. گەورەییش بۆ دایک بوە. باوک مەعلووم نییە.

چەندێکی شەیدای خەباتی چینایەتی بیەوێ لەو دەورانەدا خوێنمژ جوداکاتەوە لە خوێنمژراو دەستی بە هیچ ڕاناگات. هەروەهاش لە سەرەتای پەیدابوونی «چین» ەوە هەتا سەردەمی ڕێنێسانس حاڵوبار هەر ئەوە دەبوو کە هەبوو چونکە هیچ ئیمکانێک نەبوە جۆرێکی دیکە بێت. بەڵێ دەشیا «سەرۆک دەوڵەت» لە بەدایەتی خوار و ژووریان هەبێت، بەوەشدا خەڵقەکە هەستی حەسانەوەیەک بکات لە سەردەمی سەرۆکی مەیلەو دادپەروەر. فەرقەکەش کەم نییە لە چاکەوە بۆ بەد.

بەڵام بنەماكانی كۆمەڵایەتی دەبایەوە بە دەقی خۆی چونكە سەرجوملەی دیارەكانی ماددی و مەعنەوی كاریگەر لە كۆمەڵایەتیدا دەبێ بگۆڕدرێت ئنجا زوڵملێكراو و ئومێدی داد و بەزەیی لە دەسەڵاتدار ببینێت... چاكتر ئەوەیە بڵێم هەروەک گۆڕانی زستان بە بەهار لە پڕ ڕوو نادات كۆمەڵایەتییش نە كوتوپڕ دەگۆڕدرێت نە هاتنی تاكە سەرۆكی چاک دەیگۆڕێت، فەرقێكیش دەمێنێ لە نێوان داهاتنی بەهار و ڕوودانی گۆڕانی كۆمەڵایەتی بەوەدا كە بەهار سەرلەبەری وڵات دەگرێتەوە هەرچی كۆمەڵایەتییە دەشێ، لەبەر زۆر هۆی جودا، تێكڕا بەهاریان لێ دانەیەت تا ئەوەی دوورمەبینە وڵاتێک بگاتە هاوین و دراوسێكەی جارێ لە نێوان زستان و بەهاردا بێت.

هەڵبەت نابێ خوێنەر لێم داوا بكات بەبەر ئەم بابەتەوە بنیشم هەموو لایەنێكی دەور بكەمەوە وەک ئەوەی كە دەورانێک بۆ وڵاتی «س» بە هێمنی تێپەڕێت، بۆ «ش» ئاژاوە و شەڕ بێت.... مەڵبەندی «ک» لافاو ڕامالێ بدات و «ن» نەرمەبارانی لەبار بۆ كێڵگەی لێ ببارێت... كلۆ... نەخۆشی... قاتوقڕی... نائەمینی دووچاری شوێنێک بێت و شوێنێكی دیكە سەلامەت دەرچێت... لەگەڵ ئەم ئیحتیمالانەش كە لە دەمی ڕوودانیاندا قورسایی خۆیان دەنوێنن دیسانەوە حاڵوباری گشتی لە ماوەی مناسبدا دەچێتەوە پلەی جارانی و دەكەوێتە بەر تاوی كاریگەرە بنەڕەتیەكانی...

لە سەردەمی زۆر كۆن ڕۆشنبیری و گیانی زانستی بە شەرمەوە دەوری بەرەوپێشچوونی دیتوە: وڵاتی یۆنان [اغریق] بەر لە ناوەڕاستی هەزارەی پێش ز. لە ئاستێكی بەرزی بیر كردنەوە و زانستدا بوو كە لە وڵاتی تردا نەدیتراوە. هەر لە یۆنانیشەوە فەلسەفە و زانست پەڕیوە بۆ ئەوبەری دەریای سپیی ناوەڕاست هەرچەند پێشتر لە ڕۆژهەڵاتی دەریای سپییەوە ئەلفوبێی فینیقی و ژمارەی حیساب بۆ یۆنان ڕۆییشت. ڕاستییەكەی زانست و فەلسەفەی یۆنان، لە ئاكامدا، دەورێكی زلی هەبوو لە ڕێنێیسانس... پێشتریش پرشنگی بۆ بەغدا و قەڵەمڕەوەی عەبباسییان و لەوێشەوە بۆ ئیسپانیای ژێر فەرمانی ئەمەویەكان ڕۆییبوو...

ئنجا ئەگەر پوختەیەكی ئەم درێژەیەی چاک و بەدی تاک و تیرێژ و چینی كۆمەڵایەتیی كۆنینە بژمێرین و لە سەرەوە بۆ بەرەوە بێین پێش هەموان دەگەینە حكومەت و سەرۆكایەتییەكەی [دەمی بێحكومەتی هەڵدەبوێرین]. ڕەنگە لە نزیكی

شەش هەزار ساڵەوە حکومەت ڕەخسا بێ، وەک بشزانین سۆمەری جنووبی عێراق و دانیشتوانی میسری فیرعەونی نوێنەری ئەو تەمەنە درێژەن. لەگەڵ ئەمەشدا دەبێ ئیحتیمالی دۆزینەوەی حکومەتی کۆنتر ڕەچاو بکەین هەرچەند وێنە و پانۆرامای شارستانەتی لەو ئاستەدا دەمێنێ کە لە مێشکاندا دەقی بەستوە.

بوونی حکومەت توێژێکی ئەریستۆکرات بە دەوری خۆیەوە هەڵدەنێ کە تۆقەڵەی کۆمەڵ پێک دەهێنێ. ئەم توێژە بەر لە هەموو توێژێک، بەپێی گۆڕانی چەقی «دەسەڵات» ئاکامی زیادبوونی دەوری ئابووری لە هەڵسووڕاندنی چەرخ و دۆلابی گوزەران و حوکم لە ئەریستۆکراتەوە بۆ «پارە» و «سنعەت» دەتوێتەوە، واتە پەککەوتە دەبێت... ئایین بەدەم هەڵسوکەوتێکی چاوەڕوان دەکرێ لە کۆمەڵایەتیدا ڕوو دەدات و بەپێی حاڵوبارێکی لەبار و نالەبار بۆ ئایین لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێک دەسەڵات پەیدا بکات و لێشی کەم بێتەوە. لە زەردەشتایەتی و مەسیحەت ئەم دەسەڵاتە و نشوستەکی دیتراوە، وا خەریکە لە ئیسلامیشدا ئایین بەو دەورەدا تێپەڕێت، بەڵام مەیدانی چۆڵ نییە لەبەر هەنگاوی و تاڕادەیەکیش، وەک دیاردەیەکی کاتەکی و بە پێی داخوازیی سیاسەتی جیهانی سەربە ئابوورییەوە، دەشێ گەشە بکات.

دیاردەی «ئێل، عەشیرەت» بەپێی سستبوونی «خۆ بەستنەوە بە شکۆ» ی دەسەڵاتی عەشیرەت لە ئاکامی پەرەسەندن و چەسپانی حکومەت و تەنینەوەی تەکنیک و زانست، وا لە گیانەلاوەدایە. لە وڵاتی پێشکەوتوو دێرزەمانێکە عەشرەتایەتی بەسەرچووە. لە حاڵی ئیستاکەدا، بە دەوری حکومەتەوە کە زۆری ماوە بۆ ئەو ڕۆژەی بەسەر دەچێت، کۆمەڵگەیەکی سەربە ئابووری و تاقمەی زانست و تەکنیک نوێنەری دەسەڵاتی سەردەمن. جارێ ئابووری لە پێشترە بەڵام دواڕۆژ هی زانستە، بە تێبینیی ئەو ڕاستییە کە زانست، ژیار قەمچی ناوەشێنێ، چرا بە دەستەوە دەگرێت. ڕۆژێک دێت زانست دەبێتە دایانی شیردەری بێشکەی کۆمەڵایەتی و پارێزگاری مەلۆتکە...

چینی ناوەند، کە بەڕاستی لزوم نەماوە بەدانانی سنووری جوداکەرەوە بە دەورییەوە، وەک بڵێی دوو دوژمن لێکتر دوورەشەڕ دەکەیت، لەم ڕۆژەدا کاکڵی بەرچاوی کۆمەڵە. هەر ئەویشە دەزێتەوە بە زانست و تەکنیک و ئابووری... بە

درێژایی مێژووش سەرچاوەی ژیان و پێشکەوتن و پێوەندیی نێوان گەلانی جیهان بوە. کەسانێکی دەنگ بەرز دەکەنەوە بە مەرگی بۆرژوازی، ئەگەر دۆعاکەیان قبووڵ بوایە دەگەڕاینەوە لای بەهەشتی ئەشکەفت و دارستان کە بەپێی دەروونی ئەو خاوەن دۆعایانە «چەوساندنەوە» نەدەما. هەڵبەت فڕۆک و پاسکیلیش نەدەما... ئیتر تێر بە دڵ و پڕ بە دەم و لەگەڵ فیکەی سمێڵ دەمانچڕی: دانیشتن چەند خۆشە بەرانبەر چاوی لەیلایێ!

حیکایەتی زێدە بە سفتوسۆی گەلە ژێردەستەکان و دواکەوتوەکان، کە خۆت و خۆم پێوەی دەناڵێن، لەککەیەکی ڕەشە بە تەوێڵی سەدەی بیستەم و بە ژێرپێی سەدەی بیستویەکەمەوە، کە جارێ ماویەتی لە پزدانی ڕۆژگار بەربێتەوە. لە توێژی ئەو حیکایەتەدا ستەمێکی بەسەر ئافرەتەوەیە بێبنەماترە لە ستەمی بێگانە، چونکە ئافرەت کەرتێکی دوو کەرتی ئادەمیزادە، تەواوکەری پیاوە، ئافرێنەری مرۆڤایەتییە. لێرەشدا خواروژووری ئەو ستەمە لە گەلێکەوە بۆ گەلێک فەرقێکی فرەوانی هەیە. لە پلەی یەکەمدا گیانی بەخۆنازین و خۆلەسەر حەق زانین بە ئەستۆی ئافرەتەکەوەیە، ناشی من و تۆ شەڕی پێ بفرۆشین لەپێناو گەییشتنی بە ناتەواوی مافەکانی، بەڵام واوەی شەڕپێفرۆشتن، لە دوو سووچەوە، دەتوانین کارەکەی بۆ هەموار بکەین:

1. بەدڵ حورمەتی ئافرەت بگرین
2. هێندەی پیاو بە خاوەن ماڵی بزانین لە هەموو سەروبەرێکی ژیان و ناوماڵ و نێو وڵات.

ئەم لایەنەی ڕێز گرتنی ئافرەت لە هۆش و گۆشی مندا دەستپێنی باوکمە کە یەکەم پیاو بوو لە کوردستان و عەرەبستان کیژی خۆی بخاتە بەر خوێندن لە قوتابخانەی کوڕاندا. من ساڵێک دوای خوشکە گەورەم بوومە قوتابی، ئەو لە ساڵخوێندنی 1925-26 ەوە دەستی کرد بە خوێندن.

چینی هەژار بە سواڵکەر و وەرزێر و شوان و گاوان و سەپانییەوە، بە کرێکار و پاسەوان و زبڵڕێژیەوە، هەموو یەک قوماشە. بەعادەت سواڵکەر شارنشینە چونکە

سەدەقەدەر لە لادێ چنگ ناکەوێ جگە لە بوونی دەرفەتی گوزەرانە بێنازەکەی لادێ کە وا غەیری نەساغ و پەککەوتە هەموو خەڵکەکە تێیدا هاوپایەن.

برا شیووعی نابێ لەم قسەیەم تورە بێ بە نامەی یەکسان کردنی سواڵکەر و وەرزێر لە قسەکەمدا کە سواڵکەر خۆی تەقاعود کردبێت لە بەرهەڵستی کردنی چەوساندنەوە و خوێنمشتن. بەزاهیر سواڵکەر دەبێتە خوێنمژی خێرەوەمەند کە فلس و دوو فلس، بێ ئەرک، لەویان دەچێتە باخەڵی ئەمیان. ئەمما من دڵدەرەوەی شیووعیم بە پەندێکی بێمەسرەف: «سواڵکەر شۆڕشگێڕی ڕاستەقینەیە» کە وا بێ عەرەقڕشتن چەند فلسێک لە داهاتی پارەداری خوێنمژ کەم دەکاتەوە.

ڕەنجدەر لە هەزاران ساڵەوە خەریکی کولەمەرگییە، چ چاریشی نییە بۆ ڕزگاربوون لە نەداری و هەژاری جگە لەوەی کۆمەڵایەتیی پێش بکەوێ بە زانست و دیموکراسی و ئابووری تەسەل و لە ڕێی دادی کۆمەڵایەتییەوە ژیانێکی شیاو بە مرۆڤ ڕابوێرێت، نەک بە زەبری کوتەک و کوشتن و برینەوە خۆ تێر و تەسەل بکات. چونکە دە جاران بە تەجرەبە ساغ بۆتەوە، شڕی و دڕی بەبەریەوە نییە تێری و ئاسوودەیی برەخسێنێت مەگەر بۆ توێژاڵی سەرەوەی دەسەڵاتدار. زانست و تەکنیک، کە کاری چینی پێگەیشتوو و تێکەیشتووی کۆمەڵە، تەنها زانست و تەکنیک فریای ڕەنجدەر دەکەوێت نەک شۆڕشێ دەمی برسێتی کە لە پێشەوە تێرییەکی درۆزنی کاتەکی دروست دەکات و دواتر برسییەتییەکی قورستر لە هی پێشوو دەتەنێتەوە...

بەهەمەحاڵ، لەم سەردەمەدا کە جیهانی سێیەم خەریکە بەلادا بێت، و بەلاشدا هاتوە، لەبەر بێنانی و بێپۆشاک و بێدەرامەدی ملیارەها ڕەشوڕووت، زێدە سەرباری خەباتی ئازادی و ڕزگاربوون لە ستەمی داگیرکەر ئەرکی پشتشکێنی داوەتە پاڵ ئەسڵە دەردە مێژووییەکەی. بەڵام دەبێ بزانین دەردێکی نەزاو لە پزدانی دواڕۆژی لە سەرەتاتکەدایە ئاخۆ کەی جیهانە کۆستکەوتوەکە بە مافی ئازادیی خۆی دەگات و لە داگیرکەر ڕزگار دەبێت. بەخێر و سلامەت، کە ئەو ڕۆژە ڕۆژە بەیانی دا ئنجا گەشتێکی هێندەی حەفت گەشتەکەی سەندبادی لە پێشدایە بۆ ڕزگاربوون لە دەست زوڵمی بێ سامان و ئامانی ئەو ڕۆڵانەی دەبن بە دەسەڵاتداری حکومەتی چونکە خەباتگێڕێکی لە حاڵی بێحکومەتی و لە دەمی هەوڵی

ڕزگار کردنی میللەتەکەی ئەو تەپڵیتۆپانەیەی پێ دەکات ئاخۆ کە بێگانەی لەکۆڵ بۆوە چ نەوعە زەهراوێک بە خەڵکوخواکەی نەتەوەی خۆی دەنۆشێت؟

ئەمە دەڵێم بەنیازی کراندنی زەنگی بێئاگایی لە هۆش و گۆشی کەسێکی ئەم نووسینە بخوێنێتەوە نەکا سبەیرۆژ، ڕۆژی گەییشتنە ئاواتی ئازادی، خەیاڵە خۆشکەڵەکانی هەرەس بهێنن. چاکتر بۆ ئاپۆرەی هاونیشتمانییەکان ئەوەیە خەون بە پەلکەزێڕینەی بەهار و نەورۆز نەبینن چونکە دەبێ بە خەباتێکی زێدە سەختی زێدە دڕی خوێناوی تازەحاکمەکان پەککەوتە بکات. ئەمەش ڕاستییەکە - بەداخەوە - ئەگەر بەرەوپێشچوونی «ئادەمیزاد»ی زانست و تەکنیک و داد و شارستانەتی یاریدەر نەبێت، لەوانەیە خەباتەکەی خۆڕزگار کردن لە تازەحاکم پێویستی دەبێ بە خەباتێکی دوەم و سێیەم، هەر جارە، بۆ ڕزگاربوون لە دەست تازەحاکم...

چەند لەسەر حەق بووم کە دەمگوت، ئەگەر چارەنووسی کورد لە دەست مندا بێت حکومەتی کوردی بە قۆنتەرات دەدەمە شەریکەیەکی سویدی، نەرویجی، سویسرەیی... بە نیوەمەسرەف دەمحەسێنێتەوە. لەگەڵ ئەم ڕاستییە تفتوتاڵەشدا «دەوروبەر»ی کوردەواری پێم دەسەلمێنێ دوعاگۆ و ئاواتەخوازی ئەو پێشمەرگانە بم کە خەریکن بە خوێنی خۆیان دەماری «کورد» هەڵدەبڕنەوە.

تا هەلێکی چوارەم، بە ئاواتی خەونبینانەوە ئاوڕێکی دوعاخوازی لە خوێنەر دەدەمەوە بەڵکوو لەسەر ڕووپەڕی گەشتر بەیەک دەگەینەوە.

بەغدا 21-2-1997

«...»